


ناوی کتێب: الطب النبوي به کوردی

نووسینی: ابن قيم الجوزيّة

وەرگێڕانی: نوری هەمەوەند

نەخشەسازی ناوەوە: کۆمپیوتەری نارین(کامران رفیق)

ساڵی چاپ: چاپی یەکەم ۲۰۱۲ز

ژمارەی سپاردن: (۱۰۲۲)ی ساڵی (۲۰۱۲)ی پێدراوە.

---

نارین

بۆ چاپو بڵاوکردنەوە

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

Website: www.nareenpub.com

E-mail: info@nareenpub.com

تەلەفۆن: ۲۵۱۱۹۸۲ ٦٦ (۰۰۹٦٤)

مۆبایل: ۰۰۹٦٤ ۷٥۰٤۰٦٤٦١۰

# الطب النبوي
# به كوردى


نوسينى

ابن قيم الجوزيّة

وەرگێڕانى

نورى هەمەوەند



نارين

## پێشەكی وەرگێڕ

سوپاس و ستایشی بێ پایان شایستەی خوای بەدیهێنەری بوونەوەرەو ، صەلات و سەلامی بەردەوامیش بەهاوشێوەی لێزەمەی باران بەسەر گیانی پاكی پێغەمبەری نازدارو سەرجەم ئال و كەس و كارو هاوەڵە دڵسۆزەكانیدا بڕژێت ٠
پاشان : كتێبی ( الطب النبوي ) بەشێكە لە كتێبی ( زاد المعاد )ی بەناوبانگی پێشەوای ئیسلام ( ابن القيم ) ، كە دەمێكە بە تەنها چاپ كراوەو خراوەتە بەر دیدی خوێنەرانی عەرەب و ئەوانەی زمانی عەرەبی دەزانن ، بەڵام بەداخەوە كوردی بەشەرەفی موسڵمان لەم كتێبەو ، هەزارەها كتێبی عەرەبی دیكەش ، كە بەڕاستی زانستی پاك و ڕێگای ڕاستی بەرەو بەهەشتی تێدایە بێ بەشە ، بۆیە براتان كە تا ڕادەیەكی باش زمانی عەرەبی دەزانم ، بە ئەركی سەر شانی خۆمم زانی بەم كارە هەستم و ، كوردی بەشەرەفی موسڵمانی پێ ئاشنا بكەم ، پەیمانیشم بەخوای خۆم داوە درێغی نەكەم لە وەرگێڕانی كتێبە زانستیە بەناوبانگەكانی پێشەوایانی ئیسلام تا لە توانامدا بێت ٠
ئاشكرایە پەیامی پێغەمبەری نازدار ﷺ زۆر تەواو و ڕێك و پێك بوو لە هەموو بوارەكاندا ، بواری پزیشكێتیش یەكێك بوو لەو بوارانەی كە پێغەمبەری نازدار ﷺ گرنگی پێداوەو ، بەجوانترین شێوە چارەسەرو دەرمانەكانی بۆ هاوەڵ و كەس و كارو ڕەمەكی خەڵك وەسف كردووەو ، ئەو شتەش بۆ تێكڕای مرۆڤایەتیە ، تا ڕۆژی قیامەت ، بۆیە پەیامەكەی تەواوترین پەیام بوو ، لەم كتێبەدا پێشەوای ئیسلام ( ابن القيم ) زۆر بەجوانی زنجیرەی چارەسەریەكانی پێغەمبەرایەتی دەخاتەڕوو ، تا ئەو ڕادەیەی ئاقڵ و ژیران لە ئاستیدا سەرسام دەبن ٠
سەرەڕای ئەو پەرەسەندنە گەورەیەی كە دەرمانسازی بە خۆیەوە بینیویەتی و ، ژمارەیەكی زۆری دەرمان لە زۆربەی بوارەكاندا دەبینرێت ، كەچی لەم ساڵانەی دوایدا گەڕانەوەیەكی بەرچاو هەست پێ دەكرێت ، بۆ سەر لە نوێ گەڕانەوە بۆ بەكارهێنانی دەرمانە سروشتیەكان ، چاكترین شتیش كە هەستی پێ دەكرێت خەڵكی گرنگی پێ دەدا بۆرای

پزیشکایەتی پێغەمبەری خۆشەویستە ﷺ، بۆیە خەڵکێکی زۆر دەبینرێت بە کەڵەشاخ خۆیان چارەسەر دەکەن ، کەچی ئەم شتە تەنها یەك بوارە لە چارەسەریەکانی پێغەمبەری نازدار ﷺ ، بۆیە بە پێویستم زانی هەموو بوارەکانی پزیشکایەتی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بەرچاوی کوردی بەشەرفی موسڵمان بکەوێت و ، لە هەموو بوارەکانی پزیشکایەتی پێغەمبەری نازدار ئاشنا بن و سوودی لێ وەرگرن ٠

کە هەستام بە وەرگێڕانی کتێبی پزیشکێتی پێغەمبەری نازدار ﷺ، دوو کتێبم لابوو ، یەکەمیان کتێبی پزیشکێتی پێغەمبەر بە ( تخریج )کردنی مامۆستا ( محمد محمد تامر ) و ، دووەمیش بە ( تخریج )کردنی ( أبو عبدالرحمن عادل بن سعد ) ، بۆیە بۆ ( تخریج )کردن سوودم لە هەردوو کتێبەکە وەرگرتووە ٠ پاشان براتان وەکو تێکڕای مرۆڤایەتی لە کەم و کوڕی بەدەر نی یەو ، لەوانەیە من کەم و کوڕیم زیاتر بێت ، سەرەڕای ئەوەش لە هیچ کەسی ناشرمەوەو دەڵێم من لە بواری پزیشکایەتی و ڕووەك ناسیدا وەکو هەموو خەڵکم و هیچم لەوان زیاتر نی یە ، بەڵام لە زمانی عەرەبیدا سوپاست بەخوا باشم ، بۆیە دەستم دایە وەرگێڕانی ئەم کتێبە ، بۆ وێنەو زانیاری لە سەر ئەو ڕووەکانەی لە کتێبەکەدا هاتوون ، سووودم لە ئینتەرنێت و کتێبەکان بینیوەو ، کە هەر شتێکیشم وەرگرتبێ ئاماژەم بە سەرچاوەکەی داوە بۆ زیاتر دڵنیایی جەماوەری خەڵك و ، ئەو کەسانەی دەیانەوێ زیاتر بزانن ، حەزیشم بەوەیە هەرکەس هەڵەیەکی بەرچاوکەت با لە ڕێگای کتێبخانەی نارینەوە ئاگادارم بکاتەوە.

نوری هەمەوەند

پێنجوێن : ٢٠١٢

# بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحَمْدَ لله، نَحْمَدُه، ونستعينُه، ونستغفرُهُ، ونعوذُ به من شُرُورِ أنفُسِنَا، وَمِنْ سيئاتِ أعْمَالنا، مَنْ يَهْدِه الله فَلا مُضِلَّ لَهُ، ومن يُضْلِلْ، فَلا هَادِيَ لَهُ. وأشْهَدُ أنْ لا إلَهَ إلا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ وأشهدُ أنَّ مُحَمَّدًا عبْدُه ورَسُولُه · أرسله بشيراً ونذيراً ، وداعياً إلى الله بإذنه وسراجاً منيراً .

پاشان : ئەمە کتێبی ( الطب النبوي )یە دانراوی پێشەوای بەناوبانگ ( شمس الدين ابن القيم )ە _ ڕەحمەتی خوای لێبێت _ ، دانەر هەوڵی داوە کتێبەکەی ڕێنمایەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەخۆ بگرێت سەبارەت بە پاراستنی جەستەی مرۆڤ لە نەخۆشی و دەردەکان · زانراویشە مەبەستی سەرەکی و بنەڕەتی لە ئاینی ئیسلام بونیادنانی ڕوحیی جەستەی مرۆڤەو بەرزکردنەوەیەتی بۆ ئاسۆی پاك و تەندروستان ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم شەریعەتە جەستەی مرۆڤ و پاراستنی پشت گوێ نەخستووە ، لەبەر ئەوەی جەستە هۆکارە بۆ هەستانی مرۆڤ بە سەپاندنە شەرعیەکان و نوێکردنەوەو ئاوەدانکردنەوەی گەردوون و هەستان بە بارقورسیەکانی ژیان ، پاشانیش ئەم شەریعەتە پڕکراوە بە ڕێنمایی و ئامۆژگاری پزیشکی ، تا موسڵمان لە ئاینەکەیدا بەهێزبێ و لە جەستەشیدا بەهێز بێ ، لەم بارەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللهِ تَعَالَى مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ ، وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ ، احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ ، وَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَلا تَعْجَزْ )) رَوَاهُ مُسْلِمٌ فِي ( الصَّحِيحِ ) ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي شَيْبَةَ))·

واتە : (( بەلای خوای تعالاوە بڕواداری بەهێز لە بڕواداری لاواز خێردارترو خۆشەویسترە ، بەڵام هەردوکیشیان خێریان تێدایە ، کۆشش بکە بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی سوودی بۆت هەیەو ، پشت بەخوا ببەستەو ، بیتواناى مەنوێنە )) ·

دواى ئەوەش ، ئێمە دەبینین ئەو ڕێنمایانەی کە پێویست کراوە بۆ پاراستنی جەستەی مرۆڤ لە قورئان و ، سونەتی پێغەمبەردا _ علی صاحبها أفضل الصلاة والسلام _ پەرش وبڵاو بۆتەوە ٠

هەر کەسێ ئەم کتێبە پیرۆزە بخوێنێتەوە بەڵگەی سەلمێنەری ئەوەی لە نێودا بەرچاو دەکەوێت ، بەڵکو لە سەرەتاوە تا کۆتاکەی ئەوە دەبینێت ٠ ئەمەش لە گەورەترینی ئەو بەڵگەکانەیە کە هەستاوە بە پوچکردنەوەی پیلانی کەسە ڕەقاوی و دڵپیسەکان بەرامبەر بە ئیسلام و نەویستارانی شەریعەتەکەی و بانگەشەکارانی ئەوەی کە گوایە ئیسلام تەنها بریتیە لە کۆمەڵێك ڕێوڕەسمی خواپەرستی و هیچ پەیوەندیەکی بەژیانەوە نی یە ، ئای کە خراپە ئەو بڕیارەی کە دەیدەن ، خوای تعالی دەفەرمێت : ﴿ يُرِيدُونَ أَنْ يُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَيَأْبَى اللَّهُ إِلَّا أَنْ يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ ﴾ [ التوبة : ٣٢ ] واتە : ﴿ يُرِيدُونَ أَنْ يُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ ﴾ دەیانەوێت ڕووناکی ( ئاینیی ) خوا بکوژێننەوە ﴿ بِأَفْوَاهِهِمْ ﴾ بەفووی دەمیان ﴿ وَيَأْبَى اللَّهُ ﴾ وە خوا نایەوێ ﴿ إِلَّا أَنْ يُتِمَّ نُورَهُ ﴾ بێجگە لە ڕووناکی خۆی تەواو بکات و سەرکەوێ ﴿ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ ﴾ هەرچەند بێباوەڕان پێیان ناخۆش بێ[١]

محمد محمد تامر

مامۆستای یاریدەدەر لە کۆلیجی ( دار العلوم )

---

١ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

## ژیانی پێشەوای بەناوبانگ ( ابن القیم الجوزیه ) _ ڕەحمەتی خوای لێبێت _

## ناوی و ڕەچەڵەکی و لەدایك بوونی :

( محمد )ی کوڕی ( أبي بكر )ی کوڕی ( سعد الزرعي )یە چونکە دەگەڕێتەوە بۆ شاری ( أزرع )و ، پاشان دیمەشق : ( أبوعبدالله شمس الدین )یشی پێ دەگوترێت · خوای لێ ڕازی بێت لە گەورەترینی زانایان بوو ، هەروەها باییشی کە سەرپەرشتیارو چاودێری ( الجوزیة ) بوو ، کە خوێندنگایەك بوو لە دیمەشق ، بۆیە بە ( ابن القیم الجوزیة ) ناسرا ، واتە کوڕەکەی سەرپەرشتیاری خوێندنگەی ( الجوزیة ) · لە حەوتی مانگی ( صفر )ی ساڵی شەش سەدو نەوەدو یەکی کۆچی چاوی بەدونیا هەڵهێناوە ·

مامۆستاو فێرکاری گەورەی _ کە بەدرێژای ژیانی دەستی پێوە گرت و لێی جیانەبۆوە _ شێخ و زانای درەوشاوە ( تقي الدین ابن تیمیة ) بوو ·

مامۆستاکەی کاری تێکرد بەگەورەترین کاتێکردن ، بۆیە لەسەر مەنهەجەکەی دەچوو ، ڕێگەکەی ئەویشی پەیڕەو دەکرد کاتێ دژبە لادەران لە ئاین دەجەنگا ، هۆکارێکی گەورەش بوو بۆ بڵاوکردنەوەی زانستی ( ابن تیمیة ) بەو کتێبە چاکە قبوڵکراوانەی داینابوو ، بەڵام زۆر جار پێچەوانەی ئەوی پەیڕەو دەکرد ئەگەر هەقی بۆ دەرکەوتایەو بەڵگەی بۆ ڕوون بوایەتەوە·

خوێندکارانی زۆرن ، لەوانە : ( عبدالله )ی کوڕی ، ( ابن کثیر )ی خاوەنی تەفسیری بەناوبانگ ، پێشەواو زانا ( عبدالرحمن )ی کوڕی ( رجب البغدادي الحنبلي ) خاوەنی کتێبی ( طبقات الحنابلة ) ، ( ابن عبدالهادي ) ، ( شمس الدین محمد )ی کوڕی ( عبدالقادر النابلسي ).

## كتێبه دانراوەكانى :

( ابن القيم الجوزية ) _ ڕەحمەتى خواى لێبێت _ ديوانێكى زانيارى زيندوو بوو ، خاوەنى بيروباوەڕى خۆى بوو كە حەزى بە بڵاوكردنەوەى دەكرد ، لە پێناو سوود گەياندن بە موسڵمانان كارى دەكرد ، بۆيە تەماشا دەكەين كتێبێكى زۆرى داناوە ·

پێشەوا ( ابن الحجر العسقلاني ) دەربارەى ( ابن القيم الجوزية ) لە كتێبى ( الدرر الكامنة )دا فەرموويەتى : لە دانراوەكانيدا بەحەوسەڵە بوو ، ئەوپەڕى تواناى خۆى بۆ ڕوونكردنەوە بەكاردەهێنا ، بۆيە زۆر درێژەى بە گوفتارەكانى دەدا ، بەهرەو توانايەكى بەهێزى هەبوو ، بەردەوام ورتەورتى ( دندن ) بەدەور ووشەكانيدا دەكردو سەرى دەخست و دەيسەلمان و بەڵگەى بۆ دەهێنايەوە ·

پێشەوا ( الشوكاني )يش فەرموويەتى : چاكى ڕەفتارو دەستكارى و تام و چێژێكى زيادى هەيە ، وە شێوازێكى چاك و جوانى دەربڕينى گوفتارى هەيە ، كە زۆربەى دانەرانى تر لەو بوارەدا بێتوانابوون ، بەجۆرێك ئەقڵ و ژيرى ئاشقى گوفتارەكانى دەبن و ، بيروهۆشيش مەيلى دەكەن و ، دڵانيش خۆشى دەوێ ، بەزۆرى بەبەڵگەى سەلمێنەر نەبێ پشت بەشتى تر نابەستێ ، هەندێ جارو بەدەگمەن مەيلى لاى ئەو ڕێباوەڕە دەكات كە لە سەرى پەروەردە بووە ، بەڵام ناوێرێت بەڵگەى سەلمێنەر دوور بخاتەوە بەهەندێ لێكدانەوەو هەڵگرتنى سارد وەكو ئەوەى كەسانى تر دەيكەن ، بەڵكو پشت بەسەرچاوەو بەڵگە دەبەستێ لەو بوارەدا ، لە زۆربەى دانراوەكانيدا دادپەروەرى و ميانڕەوى پيادەكات ، لە گەڵ بەڵگەدا دەسوڕێتەوە بۆ هەر كوێ سوڕايەوەو ، پشت بە قسەى دەماودەم و دەڵێن نابەستێت ، ئەگەر لە توێژينەوەيەكدا هەموو گوفتارەكان وەرگرێت و درێژە بە پەراوێزەكانى بدات زانشتێك باس دەكات كەسانى تر باسيان نەكردبێ ، قسانێك باس دەكات كە دەبێ بەهۆى شادومانبوونى سينگى ئەو كەسانەى ئارەزومەندن ڕێباوەڕەكانيان وەرگيرێت ·

**( ابن القيم )_ رەحمەتى خواى لێبێت _ كتێبێكى زۆرى داناوه وەكو :**

١_ تهذيب سنن أبي داود وإيضاح علله ومشكلاته ٢ _ طريق الهجرتين وباب السعادتين ٣ _ مدارك السالكين بين منازل ﴿ إياك نعبد وإياك نستعين ﴾ وهو شرح كتاب منازل السائرين لشيخ الإسلام الأنصاري ٤ _ كتاب عقد محكم الأحباء ، بين الكلم الطيب والعمل الصالح المرفوع الى رب السماء ٥ _ أخبار النساء ٦ _ علم البيان ٧ _ شفاء العليل في القضاء والقدر ٨ _ شرح أسماء الكتاب العزيز ٩ _ زاد المسافرين الى منازل السعداء في هدي خاتم الأنبياء ١٠_ جلاء الأفهام في ذكر الصلاة والسلام على خير الأنام ١١ _ بيان الأستدلال على بطلان اشتراط محلل السباق والنضال ١٢ _ نقد المنقول ، والمحك المميز بين المردود والمقبول ١٣ _ بدائع الفوائد ١٤ _ الشافية الكافية في الأنتصار للفرق الناجية ، وهي القصيدة النونية في السنة نحو ثلاث آلاف بيت ١٥ _ الصواعق المنزلة على الجهمية والمعطلة ١٦ _ حادي الأرواح الى بلاد الأفراح ١٧ _ نزهة المشتاقين وروضة المحبين ١٨ _ الداء والدواء ١٩ _ تحفة الودود في أحكام المولود ٢٠ _ مفتاح دار السعادة ، ومنشور لواء أهل العلم والإرادة ٢١ _ اجتماع الجيوش الإسلامية على غزو فرق الجهمية ٢٢ _ رفع اليدين في الصلاة ٢٣ _ نكاح المحرم ٢٤ _ تفضيل مكة على المدينة ٢٥ _ فضل العلم ٢٦ _ عدة الصابرين ٢٧ _ جوابات عابدي الصلبان وأن ماهم عليه دين الشيطان ٢٨ _ كتاب الكبائر ٢٩ _ كشف الغطاء عن حكم سماع الغناء ٣٠ _ معاني الأدوات والحروف ٣١ _ الرسالة الشافية في أسرار المعوذتين ٣٢ _ اقتضاء الصراط المستقيم في مخالفة أصحاب الجحيم ٣٣ _ إغاثة اللهفان في حكم طلاق الغضبان ٣٤ _ حكم تارك الصلاة ٣٥ _ نور المؤمن وحياته ٣٦ _ حكم إغمام هلال رمضان ٣٧ _ التحرير في ما يحل ويحرم من لباس الحرير ٣٨ _ بطلان الكيمياء من أربعين وجهاً ٣٩ _ الفرق بين الخلة والمحبة ، ومناظرة الخليل لقومه ٤٠ _ الكلم الطيب والعمل الصالح ٤١ _ الفتح القدسي ٤٢ _ المسائل الطرابلسية ٤٣ _ أعلام الموقعين عن رب العالمين ٤٤ _ التحفة المكية ٤٥ _ أمثال القرآن ٤٦ _ تفسير الفاتحة ٤٧ _ الرسالة التبوذكية ٤٨ _ إيمان القرآن ٤٩ _ شرح الأسماء الحسنى ٥٠ _ الفروسية الشرعية ٥١ _ الطرق الحكمية في السياسة الشرعية ٥٢ _ كتاب الروح

٥٣ _ إغاثة اللهفان من مصايد الشيطان ٥٤ _ اقتضاء الذكر بحصول الخير ودفع الشر ٥٥ _ روضة المحبين و نزهة المشتاقين ٥٦ _ تفسير أسماء القرآن ٥٧ _ الجواب الكافي عن ثمرة الدعاء ٥٨ _ التبيان في مسائل القرآن ٥٩ _ زاد المعاد في هدي خير العباد ٦٠ _ المنار المنيف في الصحيح والضعيف ٠

**مردنەكەی :** _ خوای لیٚ رازی بیٚت _ كاتی نویٚژی عیشای شەوی پیٚنج شەمەی ، سیازدەی مانگی رەجەبی سالّی حەوت سەدو پەنجاو يەكی كۆچی مردوە ٠

# پزیشكیٚتی پیٚغەمبەرﷺ

كۆمەلّیٚك لە ریٚنومايەكانی پیٚغەمبەری خوامان ﷺ بۆ باسكراوە لە هەموو بوارەكانی غەزاو پیٚشكەوتن و بەریٚوەبردنی كاروفرمانەكانی و چونیەتی بەریٚخستنی نیٚردراوەكانيی و سریەكان و نامەكانيدا ، هەروەها ئەو نووسراوانەی بۆ پادشاو جیٚگرەكانيان دەینووسی ٠

ئیٚمەش لیٚرەدا هەمان ریٚرەو دەگرینە بەرو چەند بەشیٚكی بە سوود لە ریٚنومايەكانی دیكەی لە بواری پزیشكیٚتیدا باس دەكەین ، كە خۆی پیٚ تیماردەكردو ، بۆ خەلّكی تریشی وەسف دەكرد ، گرنگترین ئەو حیكمەتانەش كە تیایدایە دەخەینەروو ، كەوا ئەقلّی زۆربەی پزیشكان بیٚ توانان پیٚی بگەن ، چونكە پزیشكیٚتی ئەوان لە چاو پزشكیٚتی پیٚغەمبەری خوادا بە هاوشیٚوەی پزشكیٚتی پەككەوتوانە لە چاو پزشكیٚتی ئەواندا ، بۆیە داوای يارمەتی لە خوای پەروەردگار دەكەین هیٚزو توانامان پیٚبەخشیٚت و دەلّیٚین :

نەخۆشی دوو جۆرە : نەخۆشی دلّان و ، نەخۆشی جەستەكان ٠ هەردووكیشيان لە قورئاندا باسكراون ٠

نەخۆشی دڵانیش دوو جۆرە : نەخۆشی ناپاکی و گومان و ، نەخۆشی ئارەزوو گومڕایی ، هەردوکیشیان لە قورئاندان · خوای تعالی سەبارەت بە نەخۆشی ناپاکی فەرموویەتی : ﴿ في قُلوبِهم مرض فَزَادَهُمُ اللهُ مَرَضاً ﴾ [ البقرة : ١٠ ] واتە : ﴿ في قُلوبِهم مرض ﴾ لە دڵیاندا نەخۆشی ( ناپاکی ) هەیە ﴿ فَزَادَهُمُ اللهُ مَرَضاً ﴾ خواش نەخۆشیەکەی زۆرترکردن ( بە هاتنی قورئان )[٢] ، هەروەها خوای تعالی دەفەرمێت : ﴿ وَلِيَقُولَ الذينَ في قُلُوبِهِمْ مَرضٌ والكافرون مَاذا أرَادَ اللهُ بِهَذَا مَثَلاً ﴾ [ المدثر : ٣١ ] واتە : ﴿ وَلِيَقُولَ الذينَ في قُلُوبِهِمْ مَرضٌ ﴾ تا بڵێن ئەوانەی کە نەخۆشی ( ناپاکی )یان لە دڵایە ﴿ والكافرون ﴾ وە بێ بڕواکان ﴿ مَاذا أرَادَ اللهُ بِهَذَا مَثَلاً ﴾ خوا چی مەبەستە بەم ژمارەیە کە لە غەیبیدا وەك مەسەل وایە[٣] ·

هەروەها خوای تعالی لە ڕاستی ئەوانەی بۆ حوکم پێکردنی قورئان و سوونەت بانگ کران ، بەڵام بە قایلنەبوون و بە ڕوو وەرگێڕان وەڵامیان دایەوە فەرموویەتی : ﴿ وَإذا دُعُوا إلى اللهِ وَرَسُولِه لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إذا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ * وَإن يَكُن لَهُمُ الحَقُّ يأتُوا إلَيْهِ مُذْعِنِينَ * أفَي قُلُوبِهِم مَّرضٌ أَمِ ارْتَابُوا أمْ يَخَافونَ أنْ يَحِيفَ اللهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُ ، بَلْ أُولَئكَ هُمُ الظالمونَ ﴾ النور : ٤٨ _ ٥٠ واتە : ﴿ وإذَا دُعُوا ﴾ کاتێ بانگ بکرێن ﴿ إلى اللهِ وَرَسُولِه ﴾ بۆ لای ( شەریعەتی ) خواو پێغەمبەر ﷺ ﴿ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ﴾ بۆ ئەوەی حوکم بکات لە نێوانیاندا ﴿ إذا فَرِيقٌ مِنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴾ یەکسەر کۆمەڵێك لەوانە ڕوو وەردەگێڕن · ﴿ وَإن يَكُن لَّهُمُ الحَقُّ ﴾ بەڵام ئەگەر لە ( حوکمدانەکەدا ) حەقەکە بۆ ئەوان بێت ﴿ يَأتُوا إلَيْهِ مُذْعِنِينَ ﴾ دێن بۆ لای ( حوکمەکە ) بەو پەڕی ملکەچی یەوە · ﴿ أفي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ﴾ ئایا دڵەکانیان نەخۆشی تێدایە ﴿ أمِ ارْتَابُوا ﴾ یا لە گوماندا بوون ﴿ أمْ يَخَافُونَ أنْ يَحِيفَ اللهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُ ﴾ یان دەترسن

٢ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ·

٣ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ·

خولو پێغەمبەرەکەی ﷺ ستەمیان لیّ بکەن ﴿ بَلْ أُولَئِكَ هُمُ الظالِمُونَ ﴾ ( نەخێر هیچ لەوانە نی یە ) بەڵکو ئەوانە هەر خۆیان ستەمکارن [٤] ٠ ئا ئەمە نەخۆشی ناپاکی و دوودڵی گومانە.

هەروەها خوای تعالی سەبارەت بە نەخۆشی هەواو ئارەزوو فەرموویەتی : ﴿ يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِن النِّسَاءِ إنِ اتَّقَيْتُنَّ فَلا تَخْضَعْنَ بِالقَولِ فَيَطمَعَ الذي في قَلبِهِ مَرضٌ ﴾ [ الأحزاب : ٣٢ ] واتە : ﴿ يا نِسَاءَ النَبي ﴾ ئەی ژنانی پێغەمبەر ﷺ ﴿ لَستُنَ كَأحَدٍ منَ النِسَاء ﴾ ئێوە وەك هیچ یەك لە ئافرەتانی دیکە نین ﴿ إنَ اتَّقَيْتُنَّ ﴾ ئەگەر خۆتان بپارێزن و لە خوا بترسن ﴿ فَلا تَخْضَعْنَ بِالقوْلِ ﴾ کەواتە بە خەمزەو نازەوە قسە مەکەن ( وەك ئافرەتانی ڕەوشت نزم ) ﴿ فَيَطمَعَ الذي قلبهِ مرضُ ﴾ نەوەکو ئەوەی کە دڵی نەخۆشە ( دەرون نزمە ) نیازی خراپ بکات ﴾[٥] ، ئا ئەمە نەخۆشی هەولو ئارەزووی دلوێن پیسی یە ٠

## بەشێك : سەبارەت بە نەخۆشیەکانی جەستە

سەبارەت بە نەخۆشی جەستەیی ، خوای تعالی فەرموویەتی : ﴿ لَيْسَ عَلَى الأَعْمَى حَرَجٌ وَلا عَلَى الأعْرَجِ حَرَجٌ ولا على المَرِيضِ حَرَجٌ ﴾ [ الفتح : ١٧ ] ، [ النور : ٦١ ] واتە : ﴿ لَيْسَ عَلَى الأعْمَى حَرَج ﴾ بۆ کوێر گوناه نی یە ( بەشداری جیهاد نەکات ) ﴿ وَلا عَلَى الأعْرَجِ حَرَج ﴾ بۆ شەلیش گوناه نی یە ﴿ ولا على المَريضِ حَرَجٌ ﴾ هەروەها بۆ نەخۆشیش گوناه نی یە[٦] ٠ خوای گەورە نەخۆشی جەستەیی لە باسەکانی حەج و ڕۆژوو و دەستنوێژدا باسکردووە ، لە بەر نهێنیەکی سەرسوڕمێن کە گەورەیی قورئانت بۆ ڕوون دەکاتەوە ، ئەمەش بەسە بۆ ئەوانەی لێی تێدەگەن و بە ئەقلیش پەسەندی دەکەن بۆ ئەوەی پێویستیان بە شتی تر نەبێت ، چونکە مەبەستەکانی پزشکێتی جەستەیی سیّ شتە : پاراستنی تەندروستی ، خۆ

٤ ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

٥ ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

٦ ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

پارێزی له شتی زیانكار ، هه‌ڵهێنانه‌وه‌و كردنه ده‌ره‌وه‌ی ماده خراپ بووه‌كان . خوای تعالی ئه‌م سێ بنه‌مایه له‌م سێ شوێنه‌ی قورئاندا باس ده‌كات ، له ئایه‌تی ڕۆژوودا ده‌فه‌رمێت : ﴿ فَمَنْ كَانَ مِنكُم مَّرِيضاً أَو عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴾ [البقرة : ١٨٤ ] واته : ﴿ فَمَنْ كَانَ مِنكُم مَّرِيضاً ﴾ جا هه‌ر كه‌سێك له ئێوه نه‌خۆش بوو ﴿ أَوْ عَلَى سَفَرٍ ﴾ یا له سه‌فه‌ردا بوو ( وه به ڕۆژوو نه‌بوو ) ﴿ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴾ ئه‌وه پێویسته به ئه‌ندازه‌ی ئه‌و ڕۆژانه‌ی ( به ڕۆژوو نه‌بووه ) قه‌زای بكاته‌وه له ڕۆژانی تردا[٧] ، لێره‌دا ڕێی داوه به نه‌خۆش ڕۆژوو بشكێنێت " به بههانه‌ی نه‌خۆشیه‌كه‌وه‌و ، هه‌روه‌ها به ڕێبواریش بۆ پاراستنی ته‌ندروستیی و هێزیی نه‌وه‌كو ڕۆژوو لایانبه‌رێت له سه‌فه‌ره‌كه‌دا كه جموجۆڵێكی زۆری تێدا كۆده‌بێته‌وه‌و ، ئه‌و چابوكی و چالاكیه‌ی پێویستی ده‌كات ، چونكه نه‌بوونی خۆراكی پێویست بۆ ئه‌وه‌ی جێگه‌ی ئه‌و خۆراكانه‌ی شیی بۆته‌وه بگرێته‌وه ، هێزیی مرۆڤ كه‌م ده‌كاته‌وه‌و لاواز ده‌بێت ، بۆیه ڕێی داوه به ڕێبوار ڕۆژوو بشكێنێت بۆ پاراستنی ته‌ندروستی و هێزیی به‌رامبه‌ر به‌وانه‌ی لاوازی ده‌كه‌ن.

له ئایه‌تی حه‌جیشدا خوای تعالی فه‌رموویه‌تی : ﴿ فَمَنْ كَانَ مِنكُمْ مَّرِيضاً أَو بِهِ أَذى مِن رَّأسِهِ فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُك ﴾ [ البقرة : ١٩٦ ] واته : ﴿ فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضاً ﴾ ئینجا هه‌ر كامێك له ئێوه نه‌خۆش بوو ﴿ أَوْ بِهِ أَذىً مِنْ رَأسِهِ ﴾ یان ئازارێك له سه‌ریدا بوو ﴿ فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيامٍ ﴾ ( ئه‌گه‌ر سه‌ری تاشی ) بریتی یه‌ك بدات كه ڕۆژووی ( سێ ڕۆژه ) ﴿ أَوْ صَدَقَةٍ أَو نُسُكٍ ﴾ یان خێرێك یان قوربانیه‌ك بكات[٨] ، لێره‌دا ڕێی داوه به نه‌خۆش و ، ئه‌و كه‌سه‌ی سه‌ری هه‌ر ئازارێكی پێ گه‌شتبێت ، وه‌كو ئه‌سپێ ، یا ئاڵووشی وخوراندن ، یا هه‌ر شتێكی تر ، له ئیحرامدا سه‌ری بتاشێت بۆ كردنه ده‌ره‌وه‌ی ئه‌و بۆخ و هه‌ڵماتكه خراپه‌ی كه ئازاری له سه‌ریدا دروست كردبوو ، به لرگ به‌ستن ( أحتقان ) له ژێر پرچیدا ، چونكه كه

---

٧ _ مه‌لا محمد مه‌لا صالح ، پوخته‌ی ته‌فسیری قورئان .

٨ _ مه‌لا محمد مه‌لا صالح ، پوخته‌ی ته‌فسیری قورئان .

سەری تاشی ، كونیلـەكان دەكرێنـەوەو ، ئـەو بـۆخ و هەڵماتكـە دەچـنە دەرەوە ، بۆیـە ئـەم جۆرەی دەرهاوێشتنە تێكڕای دەهاوێشتنەكانی تری لە سەر ( قیاس ) دەكرێت كـە گیربـوونی لە جەستەدا ئازار بەمرۆڤـ دەگەیەنێت ٠

ئەو شتانەش كە گیربوونیی و پێشگریكردنی ئازاردەرن دە شتەن : خوێن ئەگـەر هـەژی و جولا ، ( مني ) ئاوی نێرینە ئەگەر ئارەزووی هەستا ، میز ، پیسی ، با ، ڕشـانەوە ، پـژمین ، نووستن ، برسێتی ، تینوویـوون ٠ هـەر یـەكێكیش لـەم دە شـتە ئەگـەر گـیردرا ، دەبـێ بـە هۆكاری دروستبوونی نەخۆشیەك لە نەخۆشیەكان ٠

خوای تعالی ووشیاری كردوینەتەوە بە كردنە دەرەوەی نزمترینیان ، كە بریتی یە لە بـۆخ و هەڵماتكی لرگ بەستوو ( المحتقن ) لـە سـەردا بـۆ كردنـە دەرەوەی لـەوە سـەخترو دژوارتـر ، ئەمەش ڕێبازی قورئانە : ووشیاریی دەدا بە نزمترین لە سەر گەورەترین ٠

بەڵام پارێزكردن : خوای تعالی لە ئایەتی دەستنوێژدا فەرموویەتی : ﴿ وإن كُنتُم مَّرضـى أَوْ عَلى سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنكُم مِنَ الغَائطِ أَوْ لَمَستُمُ النِسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيداً طَيِّبَـاً ﴾ [ النساء : ٤٣ ] [ المائدة : ٦ ] واتە : ﴿ وَإن كُنتُم مَّرضى ﴾ وە ئەگـەر نـەخۆش بـوون ﴿ أَوْ عَلى سَفَرٍ ﴾ یان لە سەفەردا بوون ﴿ أَوْ جاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الغـائطِ ﴾ یـان كەسـێكتان هاتـەوە لە شوێنی پێویستی سەرئاو ﴿ أَوْ لَمَستُم النِسَاءَ ﴾ یـان جـووت بـوون ( یـا پێسـتان بـەر یـەك كەوت ) لـە گـەڵ خێزانەكانتانـدا ﴿ فَلَـمْ تَجِـدوا مَـاءً ﴾ و ئاوتـان دەسـت نەكـەوت ﴿ فَتَيَمَمُـوا صَعِيداً طَيباً ﴾ ئەو تەیموم بكەن بە خۆڵێكی پاك[٩] ، خوای تعالی ڕێی داوە بە نـەخۆش لـە ئـاو لادات بۆ بەكارهێنانی خۆڵێكی پاك وەكو پارێزكردنێـك نـەوەكو جەسـتەی شـتێكی ئـازاردەری بەركـەوێت ، ئەمـەش ووشـیاردانێكە بـە خۆپـارێزیی لـە هـەموو زیانكارێـك زیـانی پێگەیـەنێت دێوەكی بێت یان دەرەكـی ، خـوای پـەروەردگار ڕێنـوێنی بەنـدەكانی كـردووە بـۆ شـێوەكانی

٩ ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

تیمارگەری و ، کۆزانینی دەستوورەکانی و ، ئێمەش لێرەدا ڕێنیشاندەریەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەم بارەوە باس دەکەین و ، ڕوونی دەکەینەوە کە ڕێنیشاندەریەکانی لەم بارەوە تەواترین ڕابەرکاریە.

## پزشکێتی دڵان :

ئەم جۆرە سپێردراوە بە پێغەمبەران _ صلوات الله وسلامە علیهم _ هیچ ڕێگایەکی کاریگەریش بەدینەکراوە بۆ بەدەستکەوتنیی تەنها لە ڕێگەی ئەوانەوە نەبێت و لە سەر دەستی ئەوانەوە نەبێت ، چونکە چاکێتی دڵان لەوەدایە خواکەی ، دروستکاری ، ناوەجوانەکانی ، سیفەتە بەرزەکانی ، کردەوەکانی ، حوکمەکانی بناسێت ، کارتێکراوی ڕەزابوون و خواستەکانی پەروەردگاری بێت ، خۆدوورخەرەوە بێت لە قەدەغەکراو و ڕق لێبووەکانیەوە ، بۆیە دڵیش هەرگیز تەندروستی و ژیانێکی باشی نابێت تەنها بە پەیوەندیەکی بە تینی ئەوانەوە نەبێت ، هیچ ڕێوازێکی وەرگرتنیشی نی یە تەنها لە لایەن پێغەمبەرانەوە نەبێت ، گومانیش نابرێت تەندروستی دڵان بەدەست بهێنرێت بەبێ پەیڕەوکردن و وەدووکەوتنیان بە تەواوی ، بۆیە زۆر بە هەڵەدا چوون ئەو کەسانەی واگومان دەبن کە تەندروستی دڵان بەدەست دەهێنرێت بەبێ شوێنکەوتنی پێغەمبەران ، لە ڕاستیدا هەرکەسیش گومانی وابێت ئەوا لە ژیان و بۆچونێکی ئاژەڵیی هەواو ئارەزووی خۆیەوە دەڕوانێت ، بۆیە دەبێ بزانین تەندروستی و هێزی دڵان و ، تەندروستی و هێزی ژیان لەوانە بەدوور نی یە ، هەر کەسێکیش توانای جیاوازیکردنی نێوان ئەمەو ئەمەی نەبێت ، با بگری بۆ ژیانی دڵی ، چونکە لە مردووانە ، با بشگری بۆ ڕووناکی و نووری دڵی ، چونکە لە دەریای تاریکی و گومڕاییدا نقووم بووە .

## پیشەکی دانەر

# بەشێك : سەبارەت بە جۆرەکانی پزیشکێتی جەستە

## پزیشکێتی جەستە : دوو جۆرە :

یەکەم : جۆرێکە خوای تعالی هەموو زیندەواری لە سەر بەدیهێناوە مرۆڤ و ئاژەڵ ، ئەم جۆرە پێویستی بە چارەسەری پزیشك نی یە ، وەکو چارەسەرکردنی برسێتی ، تینویەتی ، سەرما ، ماندوویەتی بە دژکارەکانیەوەو ئەوەی لایاندەبات ٠

دووەم : ئەوەی پێویستی بە بیرو تێوورد بوونەوە دەبێت ، وەکو بەرگریاریی نەخۆشیە وێکچووەکان( المتشابهة ) کە لە میزاجدا پەیدا دەبن ، بە جۆرێك لە میانەیی دەیباتە دەرەوە ، بۆ گەرمی ، یا بۆ ساردی ، یا بۆ ووشکێتی ، یا بۆ تەڕێتی ، یا بۆ پێکهاتنێك لە دووان لەوانەی سەرەوە ، ئەمەش دوو جۆرە : ماددی ، یا چۆنیەتی ( کیفیة ) ، مەبەستیشم یا بە تێرژانی ماددەیەك دەبێت ، یا بە پەیدابوونی چۆنیەتیەك ، جیاوازی نێوانیشیان ئەوەیە کە نەخۆشی یە چۆنیەتیەکان پاش نەمانی ئەو ماددانەی کە بەدیهێناون دروست دەبێت ، بۆیە ماددەکانیان نامێنێت و ، شوێنەوارەکانیان بە چۆنیەتی یەك لە میزاجدا دەمێنێتەوە ٠

نەخۆشیەکانی ماددەش هۆکارەکانی لە گەڵ خۆیدایە یارمەتی درێژبوونەوەی دەدات ، بۆیە ئەگەر هۆکاری نەخۆشی یەکە لە گەڵ خۆیدا بێت ، پێویستە یەکەم جار تەماشای هۆکار بکرێت ، دووەم نەخۆشیەکە ، سێ یەمیش : دەرمانەکەی ٠ بەڵام نەخۆشیە ئەندامیەکان ( الآلية ) ئەوانەن کە ئەندامەکە لە رووخساری خۆی دەباتە دەرەوە ، یا لە شێوەدا ، یا بۆشایی ( تجويف ) ، یا ڕێڕەوێك ، یا زبری ، یا لووسی ، یا ژمارەیەك ، یا ئیسکێك ، یا بارێك ، ئەم ئەندامانە ئەگەر هۆگری یەکتر بوون و جەستەیان پێکهێنا ئەوا بە هۆگربوونیان دەگوترێت پەیوەستبوون و ، دەرچوونیش لە باری میانەیی بە جیابوونەوەی

پەیوەستبوون ناودەبرێت ، بەڵام نەخۆشی یە گشتیەکان تێکڕای نەخۆشی یە وێکچووەکان و ئەندامیەکان دەگرێتەوە.

نەخۆشی یە وێکچووەکانیش : ئەوانەن کە میزاج لە میانەیی دەبەنە دەرەوە ، ئەم چوونە دەرەوەیەش بە نەخۆشی ناودەبرێت دوای ئەوەی کە زیانێکی هەستپێکراو بە کردار دەگەیەنن ٠

ئەمەش هەشت جۆرە : چواری سادەو ، چواری پێکهاتوو ، چوارە سادەکە : ساردو ، گەرم و ، تەڕو ، ووشکە ٠ چوارە پێکهاتووەکەش : گەرمی تەڕو ، گەرمی ووشك و ، ساردی تەڕو ، ساردی ووشکە ، ئەمەش یا بە تێڕژانی ماددەیەك دەبێت ، یا بە بێ تێرژانی ماددە ، بەڵام ئەگەر نەخۆشی یەکە ئازاری بە کردار نەگەیاند ئەوا چوونە دەرەوەکە لە میانەیی بە تەندروستی ناودەبرێت ٠

## بارەکانی جەستە :

جەستەش سێ باری هەیە : بارێکی ئاسایی و ، بارێکی دەرچوو لە ئاسایی و ، بارێکی نێوەندی هەردووکیان:

یەکەم : بەم بارە جەستە تەندروست دەبێت ٠

دووەم : بەم بارە جەستە نەخۆش دەبێت ٠

باری سێ یەمیش : نێوەندی هەردوو بارەکەی پێشووە ، چونکە دژ ناگواسترێتەوە بۆ دژەکەی تەنها بە نێوەندێك نەبێت ، هۆکاری دەرچوونی جەستەش لە سروشتی خۆی ، یا لە نێو خۆیەوە دەبێت ، چونکە پێکهاتووە لە گەرم و ساردو ، تەڕو ووشك ، یا لە دەرەوە دەبێت ، چونکە ئەوەی لە دەرەوە تووشی دەبێت پێدەچێت سازگاری لەشی بێت یا

سازگاریی نەبێت ، ئەو زیانەش بە مرۆڤ دەگات پێدەچێت لە خراپبوونی میزاجەوە بێت کە لە میانەیی دەردەچێت ، یا بە هۆی خراپبوونی ئەندامەوە دەبێت یا بە هۆی لاوازبوونی هێزەکانەوە دەبێت ، یا ئەو گیانانەی هەلگرتوون ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ زیادبوونی میانەیی و کەمی زیادبوونی ، یا کورتی میانەیی و نەبوونی کورتی ، یا جوێ بوونەوەو جووتبوونی میانەیی ، یا کشان و کرژبوونی میانەیی ، یا چوونەدەرەوەی جەستەی هەلگری بارو شێوەیەك لە بارو شێوەکەی خۆی بە جۆرێك لە میانەیی بیباتە دەرەوە ٠

بۆیە پزیشکی شارەزا : تەنها کەسێکە هەڵدەستێت بە جوێکردنەوەی ئەوانەی کە کۆبوونەوەیان زیان بە مرۆڤ دەگەیەنێت ، یا هەڵدەستێت بە کۆکرنەوەی ئەوانەی کە جوێکردنەوەیان زیان بە مرۆڤ دەگەیەنێت ، یا هەڵدەستێت بە کەمکردنەوەی ئەوەی کە زیادبوونی زیان بە مرۆڤ دەگەیەنێت ، یا زیادکردنی ئەوەی کە کەمبوونی زیان بە مرۆڤ دەگەیەنێت ، بەو جۆرە تەندروستی ونبوو دەهێنێتەوە ، یا تەندروستی بە شێوەو چەشن ( الشکل و الشبە ) دەپارێزێت و بە دژو پێچەوانەش کەموکوڕیەکانی لادەبات ، یا دەری دەهێنێت ، یا بە پارێزکردن هەڵدەستێت بە لابردنی بە جۆرێك بەربەستی ڕوودانی بکات ، هەموو ئەمانەش لە ڕێنمویەکانی پێغەمبەری خوادا ﷺ بە شێوەیەکی چاکەرەوەی سارێژکاری یەکلاکەرەوە دەبینیت بە هێزو تواناو چاکەو یارمەتیدانی خوای پەروەردگار ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێگەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەركردنداو فەرمانپێكردنی :

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەكانی چارەسەركردنی لە خودی خۆیدا بەكاردەهێناو ، فەرمانی بەكارهێنانی بە ئەو كەس و كارو هاوەڵانەشی دەكرد كە تووشی نەخۆشیەك بووبوون ، بەڵام لە باس و خواسی ژیانی خۆی و هاوەڵانیشیدا نەهاتووە ئەو دەرمانە ئاوێتانە بەكاربێنن كە بە ( أقرباذين ) ناسراوە ، بەڵكو زۆربەی دەرمانەكانیان بە تاكەكان بوو ، پێدەچێت هەندێ مادەی یارمەتیدەریشیان تێكەڵ بە دەرمانە تاكەكان بكردایە ، یا هەندێ مادەی تر لە تیژیەكەی كەم بكاتەوە ، ئەمەش پزیشكێتی باوی نەتەوەكانە بە جیاوازی ڕەگەزەكانی عەرەب و تورك و ، خەڵكی بیابان سەراپا ، لە ڕاستیدا ڕۆم و یونانیەكان سەرقاڵبوون بە دەرمانە ئاوێتەكانەوە ، بەڵام زۆربەی پزیشكێتی هند بە دەرمانە تاكەكانە ٠

پزیشكان ڕێكەوتووبوون سەبارەت بەوەی هەركات توانرا چارەسەر بە خۆراك بكرێت وازی لێناهێنرێت و ناگۆڕدرێت بە دەرمان ، هەركاتیش توانرا بە سادە چارەسەر بكرێت وازی لێناهێنرێت و ناگۆڕدرێت بە ئاوێتەكان ٠

گوتوویانە : هەر نەخۆشیەك توانرا بە خواردەمەنی و پارێزكردن لابرێت ، هەوڵ نادرێت بە دەرمانەكان لابدرێت گوتوویانە : پێویستە پزیشك هۆگری فەرماندان بەنەخۆش نەبێت كە هەموو كاتێك دەرمان بخواتەوە ، چونكە دەرمان ئەگەر نەخۆشیەك لە جەستەدا بەدینەكات ئەوا شیی دەكاتەوەو هەڵیدەوەشێنێ ٠ یا ئەگەر دەرمانەكە نەخۆشیەكی بەدیكردو لەبارو گونجاوی نەبوو ، یا نەخۆشیەكی بەدیكرد لەبارو گونجاوی بوو بەڵام بڕیی لە نەخۆشیەكە زیاتر بوو ، یا چۆنیەتیەكەی ، ئەوا دەستەوداوێنی تەندروستی دەگرێت و ، دەیشێوێنێت ٠

پزیشکه به ئەزموونەکان پزیشکێتیان به تاکەکانه به زۆری ، کە ئەمانەش یەکێکن لە سێ دەستەکەی پزیشکێتی ٠

بۆ سەلماندنی ئەوەش دەگوترێت دەرمانەکان لە ڕەگەزی خۆراکەکانه ، بۆیه ئەو ئومەت و تایەفەی کە زۆربەی خۆراکیان بە تاکەکانە ، نەخۆشیەکانیان زۆر کەمەو ، پزیشکێتیشیان بە تاکەکانە ، بەڵام دانیشتوانی شارەکان ئەوانەی خۆراکە ئاوێتەکانیان بەسەردا زاڵە ، پێویستیان بە دەرمانە ئاوێتەکانە ، بە هۆکاری ئەوەی نەخۆشیەکانیان ئاوێتەیە ، دەرمانە ئاوێتەکانیان بۆ بەسوودترە ، نەخۆشیەکانی دانیشتوانی بیابان تاکە ، بۆیه دەرمانە تاکەکان بەسە بۆ چارەسەرکردنیان ٠ ئەمەش سەلماندنێکە بە گوێرەی پزیشکسازی ٠

## فەزڵ و چاکێتی پزیشکێتی پێغەمبەری خوا ﷺ بە سەر پزیشکایەتی پزیشکەکاندا :

ئێمەش دەڵێین : لێرەدا شتێکی تر دێتە پێشەوە ، کەوا بەراوردی پزیشکێتی پزیشکان بە پزیشکێتی پێغەمبەر وەکو بەراوردی پزیشکێتی هەندێ لە صوفیەکانە کە شارەزایان لە پزیشکێتیدا نی یە و بەساڵاچووانە بە پزیشکێتی پزیشکان ، ئەمەش بەڕوونی دانی پێدانراوە لە لایەن لێهاتووان و پێشەواکانیانەوە ، چونکە سەبارەت بەو زانستە پزیشکێتیەی هەیانە هەندێکیان دەڵێن : ( قیاس )ە ٠ هەندێکی تریشیان دەڵێن : ئەزموون وتاقیکردنەوەیە ٠ هەندیکیشیان دەڵێن : نیگاو بۆهاتنە ، خەوبینینە ، پەی پێبردنێکی ڕاستە ٠ هەندێکیشیان دەڵێن : زۆربەی لە ڕەفتاری ئاژەڵانەوە وەرگیراوە ، وەکو ئەوەی دەبینین پشیلەکان ئەگەر ژەهردارەکان بخۆن دەچنە لای چراکەو ، زەیتەکە لە دەمیدا هەڵدەسوڕێنی و پاشان فڕێی دەدا ، هەروەها بینراوە مارەکان کاتێك لە کونەکانی زەمین دێنەدەرەوەو ، چاوەکانیان کوێر بووە دەچێتە لای گەڵاکانی ڕازیانەو چاوەکانی بە سەرادادەهێنێت ، هەروەها زانراوە باڵندەکان ئاوی دەریا بە زۆری دەخۆنەوەلە کاتی بێزاربووندا و ، چەندین نموونەی تریش کە لە بنەماکانی پزیشکێتیدا باسکراوە ٠

بەڵام ئەمەو هاوشێوەکانی لە چ ئاستێکی ئەو سروشەدان کە خوای پەروەردگار بۆ پێغەمبەرەکەی ناردویەتی سەبارەت بە هەموو ئەوانەی بە سوودو زەرەردارێشە بۆی ، بۆیە بەراوردی پزیشکێتیان بەو سروشە وەکو بەراوردی زانەستەکانی ئەوانە بەوەی پێغەمبەران هێناویانە ، بەڵکو ئێرە دەرمانگەلێکی چارەسەرکاری تێدایە کە چەندین نەخۆشی چارەسەر دەکات کە ئەقڵ و ژیری گەورەترین پزیشکان پێی نەگەشتووەو ، زانست و ئەزموون و تاقیکردنەوەو ( قیاس ) ەکانیشیان پێی نەگەشتووە ، لێرەدا دەرمانە دڵی و ، ڕوحیەکانی تێدایە ، سەرەڕای بە هێزی بیروباوەڕو دڵ و ، پەشت ئەستووورکردن بە خواو ، پشت بەستن بە خواو ، خۆهاوێشتن و خۆشکانەوە لە پێش دەستی خوای پەروەردگارداو ، مل کەچکردن بۆ خوای تعالی و ، خێروچاکەداری و ، نزاکردن و ، پەشیمان بوونەوە لە تاوانەکان و ، داوای لێخۆشبوون لە خوای تعالی و ، چاکەداری بەرامبەر بە بەدیهێنراوان و ، بەهانەوەچوونی لێقەوماوو ، لابردنی خەم و خەفتی پەست و ناڕەحەتبووەکانی تێدایە ، ئەم دەرمانانە لە لایەن تێکڕای نەتەوەکانەوە بە جیاوازی ئاین و ڕیبازەکانیانەوە تاقیکراوەتەوە ، بۆشیان دەرکەوتووە کە کاریگەریەکی بەتینیان لە چاکبوونەوەدا هەیە کە نە زانست و ، نە نەتاقیکردنەوەو ، نە ( قیاس )ی زاناترینی پزیشکان پێی نەگەشتووە ٠

ئێمەو کەسانی تریش لەمانەمان زۆر بەکارهیناو ، بینیشمان کردەوانێکی کاریگەری ئەوتۆی هەیە کە هیچ دەرمانێکی هەستی پێی ناگات ، بەڵکو دەرمانە هەستیەکان لە ئاستیدا وەکو پلەی دەمانی صوفیە ناشارەزاکانی لێدێت بەلای پزیشکانەوە ، ئەمەش ڕیکەوتووی یاسای خواوەندەو لێی بەدەر نی یە ، بەڵام هۆکارەکان جۆراوجۆرن ، چونکە دڵ هەرکات پەیوەندبوو بە خوای جیهانیانەوەو ، بەجوانی تێکەڵی نەخۆشی و دەرمانەکەی بوو ، ئەگەر ڕێکخەری سروشت و هەڵسووڕێنەری ئارەزووی لێبێت ئەوا چەندین دەرمانی تری دەبێت بەدەر لەو دەرمانانەی کە دڵانی دوورکەوتوو ڕوو وەرگێڕ لە خوای تعالاوە پێویستیان پێیەتی و دەیچێژن ، زانراویشە کە ڕۆح هەرکات بە هێزبوو ، نەفس و سروشتی مرۆڤیش بەهێزبوو ئەوا هاوکاری یەکتر دەبن بۆ لادانی نەخۆشیەکەو بەزاندنی ٠ ئیتر چۆن نکۆڵیی بکرێت لەو

کەسانەی کە _ نەفس و سروشتی لەشیان بەهێز بووەو ، دڵخۆش بووە بە نزیکیی لە خوای چارەسەردەریەوەو ، شادومانە بە خواکەی و ، خۆشیی دەوێ و ، چێژ لە یادکردنەوەی وەردەگرێ و ، هەموو هێزو توانەکانی بۆ خواکەی ئاڕاستەکردووەو ، بۆ ئەوی کۆکردۆتەوەو ، داوای کۆمەك خواستن بە تەنها لە خواکەی دەکات و ، پشتی پێ دەبەستێ _ هەموو ئەمانە لە گەورەترین دەرمانەکان و چارەسەرەکان بێت و ئەم هێزە گەورەیە هۆکاری لادانی نەخۆشیەکەی بێت بە تەواوی ، بۆیە هیچ کەسێك نکۆڵیی لەمە ناکات جگە لە نەفامترینی کەسانێك ، کە ئەستوورترین پەردەیان بە سەر چاودا دراوەو ، ناپاکترین نەفسیان هەیەو ، زۆر دوریشن لە حەقیقەتی مرۆڤایەتیەوە ، دواتریش _ إن شاء الله _ ئەو هۆکارە باس دەکەین کە بە هۆیەوە خوێندنی سورەتی ( الفاتحة ) نەخۆشی پێوەدان و گەستنەکەی لە کەسی گەستراو لابرد کاتێ وەکو نووشتە بەسەریدا خوێندرا ، تا هەستا وەکو ئەوەی هیچ نەخۆشی و ئازارێکی نەبێت ٠

ئەمەش دوو جۆری پزیشکێتی پێغەمبەرە ﷺ، ئێمەش بە یارمەتی خوای تعالى لە سەر هەردووکیان دەدوێین بە گوێرەی هێزو توانا ، ڕادەو بڕی زانستەکەشمان کورتەو ، زانیاریشمان زۆر پەرش و بڵاوو کەمەو ، کەلوپەلیشمان تێکەڵ و پێکەڵە ، بەڵام داوای پێ بەخشین لەو زاتە دەکەین کە هەموو خێرێکی بە دەستەو ، لە چاکەشی وەردەگرین ، فإنە العزیز الوهاب.

## بەشێك : سەبارەت بەو فەرموودانەی كە هانی تیماركردن و بەستنەوەی هۆ بە مایەی هۆوە دەدەن :

روى مسلم في صحيحه : من حديث أبي الزُّبَير عن جابر بن عبدالله عن النبيِّ ﷺ أنه قـال : (( لِكلِّ داءٍ دواءٌ ، فإذا أُصِيبَ دَوَاءُ الدَّاءِ ، برأ بإذنِ اللهِ عَزَّوجَلَّ ))[10] ٠

واتە ئیمامی ( مسلم ) لە ( صحیح )ەكەیدا : لە ( أبي الزُّبَير )ەوە لە ( جابر )ی كوڕی ( عبدالله )وە دەگێڕێتەوە كەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( بۆ هەر نەخۆشیەك دەرمان و چارەسەرێك هەیە ، بۆیە هەركات دەرمانەكە نەخۆشیەكەی پێكا ، بە ئیزنی خوای _ عَزَّوجَلَّ _چاك دەبێتەوە )) ٠

وفي الصحيحين :عن عطاءٍ ، عن أبي هريرة قال : قال رسول الله ﷺ : (( ما أنزل اللهُ مِنْ داءٍ إلا أنْزَلَ لَهُ شِفَاءً ))[11] ٠

واتە لە ( الصحیحین )دا هاتووە : لە ( عطاء )ەوە لە ( أبي هريرة )ەوە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( خوای گەورە هەر نەخۆشیەكی دابەزاندبێ مەگەر ( إلا ) چارەسەرەكشی دابەزاندووە )) ٠

---

١٠ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣٣٥/٣ ) ، ومسلم ( ٢١/٧ )عن عبد ربه بن سعيد عن أبي الزبير عن جابر فذكره مرفوعاً ٠

١١ _ صحيح : أخرجه البخاري ( ١٥٨/٧ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٣٩ ) ، عن أبي أحمد الزبيري قال : حدثنا عمر بن سعيد بن أبي حسين ، قال : حدثني عطاء بن أبي رباح عن أبي خريرة مرفوعاً ٠ ولم أجده في صحيح مسلم ٠ ولعل عزوه للصحيحين وهم من المصنف ٠

وفي مسند الإمام أحمد : من حديث زياد بن علاقة عن أُسامة بن شَريك ، قال : كنتُ عندَ النبيِّ ﷺ ، وجاءت الأعرابُ ، فقالوا : يا رسول الله أَنَتَدَاوَى ؟ فقال : نَعَمْ يا عبادَ الله تَدَاوَوا ، فإنَّ اللهَ عَزَّوجَلَّ لم يضَعَ داءً إلا وَضَعَ لَهُ شفاءً غيرَ داءٍ واحدٍ ، قالوا : ما هو ؟ قال : الهَرَمُ . وفي لفظٍ : إنَّ اللهَ لم يُنْزِلْ دَاءً إلا أنزل له شِفَاءً ، عَلِمَهُ مَنْ عَلِمَهُ وجَهِلَهُ مَنْ جَهِلَهُ[١٢] .

واته ئیمامی ( أحمد ) له ( المسند )دا : له ( زیاد )ی کوڕی ( علاقة )ەوه له ( أُسامة )ی کوڕی ( شَریك )ەوه دەگێڕێتەوەو فەرموویەتی : له خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووم ﷺ که دەشتەکیەکان هاتنه خزمەتی و ، گوتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ئایا خۆمان تیماریکەین ؟ ئەویش فەرمووی : بەڵێ ئەی بەندەکانی خوا خۆتان تیماریکەن ، چونکه خوای _ عزوجل _ هەر نەخۆشیەکی دانابێت چارەسەرەکەشی داناوه جگه له یەك نەخۆشی ، گوتیان : ئەوه چی یه ؟ ئەویش فەرمووی : پیربوون . له بێژەیەکی تریشدا : خوای گەوره هەر نەخۆشیەکی دابەزاندبێت مەگەر چارەسەرەکەشی دابەزاندووه ، هەرکەس زانیبێتی دەیزانێ و هەرکەسیش نەیزانیبێت نایزانێ .

وفي المسند : من حديث ابن مسعود يرفعه : إنَّ اللهَ عَزَّوجَلَّ لم يُنْـزِلْ داءً إلا أنـزَلَ لَـهُ شِـفاءً ، عَلِمَهُ مَنْ عَلِمَهُ ، وَجَهِلَهُ مَنْ جَهِلَهُ[١٣] .

واته لـه ( المسـند )دا : لـه ( ابـن مسـعود )ەوه لـه پێغەمبـەری خـواوه ﷺ فەرموویـەتی : خوای _ عزوجل _ هەر نەخۆشیەکی دابەزاندبێت مەگەر ( إلا ) چارەسەرەکەشـی دابەزانـدووه ، هەرکەس زانیبێتی دەیزانێ و هەرکەسیش نەیزانیبێت نایزانێ .

---

١٢ _ صحيح : أخرجه الحميدي ( ٨٢٤ ) ، وأحمد ( ٢٧٨/٤ ) ، وأبوداود ( ٣٨٥٥ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٣٦ ) والترمذي ( ٢٠٣٨ ) ، كلهم عن زياد بن علاقة عن أسامة بن شريك فذكره .

١٣ _ صحيح : أخرجه الحميدي ( ٩٠ ) ، وأحمد ( ٣٧٧/١ ، ٤١٣ ، ٤٤٣ ، ٤٤٦ ، ٤٥٣ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٣٨ ) كلهم من طريق عطاء بن السائب عن أبي عبدالرحمن عبدالله بن حبيب ، فذكره عن ابن مسعود مرفوعاً .

وفي المسند والسنن : عن أبي خِزَامَةَ ، قـال : قلـتُ : يـا رسـول الله أرأيـتَ رُقـىً نَسْـتَرْقِيهَا ، ودواءً نتداوى به ، وتُقَاةً نَتَقِهَا ، هل تَرُدُّ من قَدَرِ الله شيئاً ؟ فقال : هي من قَدَرِ الله[١٤] .

واته له ( المسند ) و ( السنن )دا هاتووه : له ( أبـي خِزَامـة )هوه ، فهرموويـهتی : گـوتم : ئهی پێغهمبهری خوا چ دهڵێـی دهربـارهی نووشـتهگهلێك دهیخـوێنین بـۆ چـاكبوونهوهمان و ، دهرمانێك خۆمانی پێ تیماردهكهین و ، پارێزگاریهك خۆمانی پـێ دهپـارێزین ، ئایا شـتێك لـه قهدهرو چارهنووسی خوا دهگهڕێنێتهوه ؟ ئهویش فهرمووی : ئهوهش له قهدهرو چارهنووسـی خوای گهورهوهیه.

## مانـای فهرمایشتی پێغهمبهری خوا ﷺ (( لِكلِّ داءٍ دواءٌ )):

ئهم فهرموودانـه جێگیربـوونی هـۆو مایـهی هـۆو ، هـهروهها پوچـكردنهوهی گوفتـاری ئـهو كهسانهی نكوڵیی لێدهكهن دهسهلمێنێت ، دهگونجێت فهرمایشـتی پێغهمبـهری خـوا ﷺ : بـۆ هـهر نهخۆشـیهك دهرمـان و چارهسـهرێك ههیـه ، بـۆ گشـتی بێـت و هـهموو نهخۆشـیه كوشـندهكانیش بگرێتـهوه ، سـهرهڕای ئـهو نهخۆشـیانهش كـه پزیشـك بێتوانایـه لـه چاكبوونهوهیدا ، دهشێ خوای _ عزوجـل _ دهرمانگـهلێكی بـۆ دانابێـت چارهسـهری بكـات ، بهڵام زانینی ئهوهی له مرۆڤایهتی پهنهان كردبێت و ، هیچ ڕێگهیهكی پێگهشتنی بۆ دانـهنابێت ، چـونكه مـرۆڤ هـیچ زانسـتێكی نـی یه بـهدهر لـهوهی خـوای گـهوره فێـری كـردووه ، بۆیـه پێغهمبـهری خـوا ﷺ چـاكبوونهوهی نهخۆشـی بهسـتووه بـه ڕێكـهوتبوونی دهرمـان بـه نهخۆشیهكه ، ههموو بهدیهێنراوهكانی خـوای گـهورهش دژێكـی ههیـهو ، هـهر نهخۆشـیهكیش ئهوه دهرمـانێكی ههیـه پێـی چارهسـهر دهكرێـت ، بۆیـه پێغهمبـهری خـوا ﷺ چـاكبوونهوهی بهستووه به سازیاربوونی نهخۆشی به دهرمانهكـهوه ، لێـرهدا بـوونی دهرمـان و سـازیاربوونی

---

١٤ _ أخرجه أحمد ( ٣/٤٢١ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٣٧ ) ، والترمذي ( ٢٠٦٥ ) ، ( ٢١٤٨ ) كلهم عن الزهري عن ابن أبي خزامة ، عن أبيه فذكره . قال الترمذي : هذا حديث حسن صحيح ، وضعفه الشيخ الألباني .

پێکەوە هاوکار دەبن لە چاکبوونەوەدا ، چونکە دەرمان هەرکات پلەی نەخۆشیەکەی تێپەڕاند لە چۆنیەتیدا ، یا بڕی دەرمانەکە لە پێویست زۆرتر بوو ، نەخۆشیەکە دەگوازێتەوە بۆ نەخۆشیەکی تر ، هەرکاتیش بڕی دەرمانەکە لە نەخۆشیەکە کەمتربوو بەشی بەرگری ئەو نەخۆشیە ناکات و ، لێرەدا چارەسەرەکەش کورتی دەهێنێ ، هەرکاتیش کەسی چارەسەرکار ڕێکەوتی دەرمانەکەی نەکرد ، یا دەرمانەکە نەخۆشیەکەی بە چاکی نەپێکا ، چاکبوونەوە ڕوونادات ، هەرکات زەمانیش گونجاوی ئەو دەرمانە نەبوو ، کەڵك و سوودی نابێت ، هەرکات جەستەش قبوڵی دەرمانەکە نەکات ، یا هێز بێتوانابێ لە هەڵگرتنی دەرمانەکەدا ، یا لەویدا کۆسپ و تەگەرەیەك هەبێ کە پێشگریی لە کاریگەری دەرمانەکە بکات ، چاکبوونەوە ڕوونادات لەبەر ڕوونەدانی ڕێکەوتبوونی تەواو لە نێوان دەرمان و نەخۆشیەکەدا ، هەرکاتیش ڕێکەوتبوونی تەواو لە نێوان دەرمان و نەخۆشیدا ڕوویدا ، ئەوا بەدڵنیایی چاکبوونەوەی تەواو بە ئیزنی خوای گەورە دێتەدی ، ئەمەش چاکترینی دوو تێگەیشتنە لە فەرموودەکە ٠

دوومیش : دەگونجێت لەو فەرمودە گشتیانە بێت کە بۆ مەبەستی تایبەت بەکار بێت ، چونکە ئەوەی دەچێتە چوارچێوەی بێژەی فەرموودەکەوە چەندەهاو چەندەها ئەوەندەی ئەوانەیە کەلە دەرەوەیدایە ، ئەمەش لە تێکڕای زمانەکاندا بەکارهاتووە ، بۆیە مەبەستی فەرموودەکەش بەم جۆرە دەبێت : خوای گەورە هەر نەخۆشیەکی دانابێت قبوڵی چاکبوونەوە بکات مەگەر دەرمان و چارەسەریشی بۆ داناوە ، بۆیە لێرەدا ئەو نەخۆشیانەی قبوڵی دەرمان و چارەسەر ناکات لێی بەدەر دەبێت ، ئەمەش بەهاوشێوەی فەرمایشتی خوای گەورەیە سەبارەت بە با تووندەکە کە بە سەر قەومەکەی ( عاد )دا زاڵی کرد فەرمووی : ﴿ تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا ﴾ [ الأحقاف : ٢٥ ] واتە : بە فەرمانی پەروەردگاری هەموو شتێ دەڕۆخێنێ(١٥)« واتە هەموو شتێك گونجاوی تێکشکان بێت و ، بای توندیش توانای تێکشکانی ئەوەی هەبێ ٠

---

١٥ ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

هەركەس بەووردى تێڕوانینـی بـەدیهێنانی دژەكـان بكـات لـەم جیهانـەداو ، بـەرگریكردنی هەندێكیان بەرامبەر بە هەندێكی تریان و ، لابردنی هەندێكیان بە هەندێكی تریان و ، زاڵكردنـی هەندێكیان بە سـەر هەنـدێكی تریانـدا ، تـەواوی توانـای پـەروەردگارو ، دانـایی و ، كـارزانی و كارچاكی تەواوی ئەوەی دروستی كردووەو ، تاكبوونەوەی لـە پـەروەردگارێتی و ، یـەكێتیی و ، زاڵبوونیی ، بە تەواوی بۆی ڕوون دەبێتەوە ، بـەدەر لـە خـوای گـەورەش هـەموو شـتێك دژو پێشـگرێكی هەیـە ، هـەروەها پێویسـتی بـە هـیچ بـەدیهێنراوێك نـی یـەو ، هـەموو شـتێكیش پێویستی پێیەتی .

لە فەرمووده ( صحيح )ەكاندا فەرمان دراوە بـە خۆتیمـاركردن و ، خۆتیمـاركردنیش دژبـە پشتبەسـتن نـی یـە ، وەكـو چۆن لابردنـی برسـێتی و ، تینویـەتی و ، گـەرما و ، سـەرما بـە دژەكانیان دژبە پشتبەستنی تێدا نی یە ، بەڵكو حەقیقەتی یەكتاپەرستی تـەواو نابێـت تـەنها بـە بـەكارهێنانی هۆكـان نـەبێت كـە خـوای گـەورە دانـاون وەكـو پێویسـتیەكی شـەرعی و چارەنووسی بۆ گەیشتن بە مایـەی هۆكـان ، بۆیـە كارنـەكردن بـە هۆكـان خـودی پشتبەسـتن لەكەدار دەكات ، وەكو چۆن فەرمان و حیكمەتەكەشی لەكەدار دەكـات و ، لاوازیشـی دەكـات چونكە ئەو كەسەی كار بـە هۆكـان ناكـات ، واگومـان دەبـات ئەگـەر واز لـە هۆكـان بهێنێـت ، پشتبەستنەكەی بە هێزتر دەبێ ، بەڵام لێرەدا دەبێ بزانین ئەگەر بە كەمتەرخەمیـەوە هۆكـان بـەكار نـەهێنرێت ئـەوا دەبێـت بـە پێچـەوانەكاری پشتبەسـتن كـە حەقیقەتەكـەی پشـت ئەستووركردنی دڵە بـە خـوای گـەورە بـۆ بەدەسـتهێنانی بەرژەوەندیـەكانی بەنـدە لـە دیـن و دونیایداو ، لابردنی ئەوەی ئازاری پێدەگەیەنێت لـە دیـن و دونیـادا ، بـەڵام لـە گـەڵ ئەوەشـدا دەبێ خۆی پشت ئەستوور بكات بە بەكارهێنانی هۆكان ، بە پێچەوانەوە ئەو كەسـە حیكمـەت و شەرع لە كاردەخات ، بۆیە پێویستە بەندەكانی خوا كەمتەرخەمی خۆیـان بـە پشـت بەسـتن دانەنێن و ، پشت بەستنی خۆشیان بە كەمتەرخەمی دانەنێن .

هەروەها وەڵامدانەوەی ئەو کەسانەشی تێدایە کە نکوڵیی لە تیمارکردن دەکەن و ، دەڵێن : ئەگەر چاکبوونەوە لە نەخۆشیەکان خوای تعالی نووسیبێتی ، ئەوا خۆ تیمارکردن هیچ سوودێکی نی یەو هەر خۆی چاك دەبێتەوە ، ئەگەر خوای تعالی چاکبوونەوەشی لە نەخۆشیەکان نەنوسیبێت ، ئەوا دیسان خۆ تیمارکردن هیچ سوودێکی نابێت · سەرەڕای ئەوەش ، نەخۆشیەکە بە قەدەری خوای تعالی ڕوویداوە ، قەدەری خوای پەروەردگاریش دوورناخرێتەوەو لانابرێت ، لێرەدا شایانی باسکردنە بگوترێت ئەم پرسیارە بوو کە دەشتەکیەکان لە پێغەمبەری خوایان ﷺ پرسی · بەڵام دەبێ ئاگاداربین هاوەڵە بەڕێزەکان ، زۆر زاناو شارەزان بە خوای تعالی و دانایی و سیفاتەکانی بۆیە ئەوان خاوەنی ئەو پرسیارە نەبوون ، پێغەمبەری خواش ﷺ وەڵامی دەشتەکیەکانی دایەوە بەو ئاستەی کە بوبە هۆی سارێژبوونی دڵیان سەبارەت بە پرسیارەکەیان و ، فەرمووی : ئەم دەرمان و نووشتەو خۆپارێزیەش بە قەدەری خوای پەروەردگارە ، بۆیە هیچ شتێك لە قەدەرو چارەنوسی خوای تعالی نەچۆتە دەرەوە ، بەڵکو قەدەرو چارەنووسی خوای تعالی بە قەدەرو چارەنووسی لادەبرێت ، هەروەها کرداری دوورخستنەوەکەش دیسان بە قەدەرو چارەنووسی خوای پەروەردگارە · بۆیە لێرەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بە هیچ شێوەیەك ناتوانین لە قەدەرو چارەنووسی خوای تعالی بچینە دەرەوە ، نموونەی ئەوەش بە هاوشێوەی لابردنی قەدەری برسێتی و ، تینویەتی و ، گەرمی و ، ساردیە بە دژەکانیان ، بە هاوشێوەی دوورخستنەوەی قەدەری دوژمنە بە تێکۆشان ، بۆیە تەماشا دەکەیت هەموو شتێك بە قەدەرو چارەنووسی خوای پەروەردگارە : لابەرو ، لادراو و، لادانیش ·

بە خاوەنی ئەو پرسیارە دەگووترێت : قسەکانت ئەوەت بە سەردا دەسەپێنێت کە چیتر هۆیەك لە هۆکان بەکار نەهێنیت بۆ ئەوەی سوودو کەڵکێکی پێ فەراهام بکەیت ، یا زیانێکی پێ لابەریت ، چونکە سوودو زیانیش ئەگەر خوای تعالی نووسیبێتی و تەقدیری کردبێت ، هەر ڕوودەدات و ، ئەگەر نەشینووسیبێت و تەقدیری نەکردبێت ئەوا هیچ ڕێگەیەك بەدیناکرێت بۆ ڕوودانی ، دیسان لێرەدا دەتوانرێت بگووترێت قسەکانی ئەو کەسە وێرانبوونی دین و دونیاو ،

خراپبوونی جیهانی تێدایەو ، هیچ کەسێکیش ئەو قسانە نالێت جگە لەو کەسانەی دیانەوێت خۆیان لە ئاستی هەقدا گێل بکەن و ، لێی یاخی بن ، بۆیە باسی قەدەر دەکەن بۆ ئەوەی بیانو و بەلگەی _ کەسی لەسەر هەق _ لە سەر خۆی دوورخاتەوە ، قسەکانی ئەویش وەکو گوفتاری بێباوەڕەکان بوو کە دەیانگووت : ﴿ لَوْ شاءَ اللهُ ما أشْرَكنا ولا آباؤُنا ﴾ [ الأنعام : ١٤٨ ] واتە : ئەگەر خوا بیویستایە ئێمەو باوباپیرانمان هاوبەشمان ( بۆ خوا ) دانەدەنا(١٦) ، ﴿ وَلَوْ شاءَ اللهُ مَا عَبَدْنا مِن دُونِه مِن شَيءٍ نَحْنُ ولا آباؤُنا ﴾ [ النحل : ٣٥ ] واتە : ﴿ وَلَو شاءَ اللهُ ﴾ ئەگەر خوا بیویستایە ﴿ ما عَبَدْنا مِن دُونِه مِن شَيءٍ ﴾ بێجگە ئەو ( خوا ) هیچ شتێکمان نەدەپەرست ﴿ نَحْنُ ولا آباؤُنا ﴾ نە ئێمەو نە باوباپیرانمان(١٧)، بێباوەڕان ئەمەیان گووت بۆ ئەوەی بەرهەڵستی بەلگەی خوای تعالی بکەن و لە سەر خۆیانی دوورخەنەوە ٠

بۆ وەڵامدانەوەی کەسی پرسیارکاری پێشوو دیسان دەگووترێت : بەشێکی سێ یەم ماوەو باست نەکردووە ، بریتیە لەوەی کە خوای تعالی بەو هۆیەوە ئاوەهاو ئاوەهای نووسی و تەقدیری کرد بۆیە ئەگەر هۆکە بەکار بێنیت مایەی هۆکە ( المُسَبَّب ) دیتە ئاراوەو ڕوودەدات ، ئەگەر ئاوەهاشت نەکرد ئەوا ڕوونادات ٠

لە کاتێکیشدا گووتی : ئەگەر خوای تعالی هۆی بۆ نووسیبێتم و تەقدیری کردبێت ، ئەنجامی دەدەم و ، ئەگەر تەقدیریشی نەکردبێت لە توانامدا نابێت ئەنجامی بدەم ٠

پێی دەگووترێت : ئایا تۆ ئەم بیانووە لە بەندەکەت ، لە کوڕەکەت ، لە کرێکارەکەت قبوڵ دەکەی ئەگەر تۆ فەرمانی کارێکت پێ کرد ، یا قەدەغەت کردو ئەویش ئەو بیانووەی بۆ هێنایەوە ؟ ، ئەگەر قبوڵت بوو ، ئەوا سەرزەنشت و لۆمەی ئەو کەسانە مەکە کە سەرپێچی فەرمانەکانت دەکەن ، یا ماڵەکەت دەبن ، یا بە داوین پیسی تاوانبارت دەکەن ، یا مافەکانت

---

١٦ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

١٧ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

پێشێل دەكەن ، ئەگەر قبوڵیشت نەبوو ، ئەی باشە چۆن لە تۆ قبوڵ بكرێت كاتێك بەو بیانوانە مافەكانی خوای پەروەردگار لە سەر خۆت لادەبەی ٠ لە ( أثر )ێكی ئیسرائیلیدا باسكراوە كە ( إبراهیم الخلیل ) فەرمووی : ئەی پەروەردگارم نەخۆشی لە كێوەیە ؟ فەرمووی : لە منەوەیە ٠ فەرمووی : ئەی دەرمان و چارەسەری لە كێوەیە ؟ فەرمووی : لە منەوەیە ٠ فەرمووی : كەوابوو ئەم پزیشكە چی یە ؟ فەرمووی : پیاوێكە لە گەڵ دەستێدا دەرمان و چارەسەرەكە دەنێرم ٠

پێغەمبەری خوا ﷺ كە دەفەرمێت : بۆ هەر نەخۆشیەك چارەسەرو دەرمانێك هەیە ، ئەم فەرمایشتەی دەبێت بە هۆی بەهێزبوونی نەفسی نەخۆش و پزیشك و ، هانیشیان دەدات بۆ داواكردنی ئەو دەرمانەو گەڕان بە دوایدا ، چونكە نەفسی نەخۆش ئەگەر هەستی بەوە كرد كە نەخۆشیەكەی دەرمانێكی هەیەو لایدەبات ، ئەوا دڵیشی بە هیواوە پەیوەست دەبێت و ، تینی نائومێدیشی سارد دەبێتەوەو ، دەروازەی هیوای بۆ دەكرێتەوە ، هەركاتیش نەفسی بەهێز بوو تینی سروشتیی ناخیشی ڕادەپەڕێت و ، دەبێت بە هۆكارێكی چالاك بۆ بەهێزبوونی گیانی ژیاریی و نەفسانی و سروشتی و ، هەركاتیش ئەم ڕۆحانە بەهێز بوو ، دەبێت بە هۆی چالاكبوونی ئەو هێزانەی هەڵیاندەگرێت و ، ئیتر نەخۆشیەكە دەبەزێنێت و دووری دەخاتەوە ، هەروەها پزیشكیش ئەگەر هەستی بەوە كرد ئەم نەخۆشیە دەرمانێكی هەیە ئەوا ئەو هەستەی خۆی یارمەتی دەدات بۆ ئەوەی داوای بكات و بە دوایدا بگەڕێت ٠ نەخۆشی جەستەش هاوتای نەخۆشیەكانی دڵانە ، كە خوای تعالی بۆ دڵ هەر نەخۆشیەكی دانابێت ئەوا چارەسەریەكیشی بۆ داناوە بە دژەكەی ، بۆیە ئەگەر كەسی هەڵگری نەخۆشیەكە پێی زانی و بەكاریهێناو ، ڕێكەوتی نەخۆشی دڵی بوو ، بە ئیزنی خوای تعالی چاكی دەكاتەوە٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خۆپارێزیی بەرامبەر بە زۆرخواردن و ، خواردنی زیاد لە ئەندازەی پێویست و ئەو یاسایەی کە پێویستە ڕەچاو بکرێت لە خواردن و خواردنەوەدا :

في المسند وغيره : عنه ﷺأنه قال : (( ما ملأ آدَمِيٌّ وعاءً شَرّاً مِنْ بطنٍ ، بِحَسْبِ ابنِ آدمَ لُقَيْماتٌ يُقِمْنَ صُلْبَه ، فإنْ كان لابُدَّ فاعلاً ، فَثُلُثٌ لِطعامِهِ ، وثُلُثٌ لِشَرَابِهِ ، وثُلُثٌ لِنَفَسِهِ ))[١٨].

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ئادەمیی هیچ توورەکەیەکی پڕ نەکردووە لە سك خراپتر بێت ، چەند پاروویەك بەسە بۆ ئەوەی ئادەم پشتی پێ ڕاست بکاتەوە ، بەڵام ئەگەر حەزی بە خۆراکی زیاتر بوو ، با سێ یەکی سکی بۆ خواردەمەنی بێت و ، سێ یەکیشی بۆ خواردنەوەی بێت و ، سێ یەکیشی بەتاڵ بێت بۆ ئەوەی کرداری هەناسەدانی ئاسان بێت )) ٠

نەخۆشیەکان دوو جۆرن : نەخۆشیگەلێکی ماددی کە هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ زیادبوونی مادەیەکی لە ئەندازە دەرچوو لە جەستەدا تا ئەو ئاستەی زیانی بە کردەوە سروشتیەکانی لەش گەیاندووە ، کە نەخۆشیەکانی زۆرینەیەو ، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ خواردنی زیادی تر پێش ئەوەی خواردنی یەکەم هەرس کرابێت و ، زیادبوون لە ئاستی ئەو ئەندازەیەی لەش پێویستێتی و ، خواردنی خۆراکی کەم سوودی ، درەنگ هەرس و ، زۆر خواردنی خۆراکی جیاوازی پێکهاتە جۆراوجۆر ، بۆیە ئەگەر مرۆڤ سکی بەم خۆراکانە پڕکردو ، لە سەری ڕاهات ، تووشی چەندین نەخۆشی جۆراوجۆری دەکات ، هەندێك لەو نەخۆشیانە

---

١٨ ـ صحيح : أخرجه أحمد ( ٤ / ١٣٢ ) ، والترمذي ( ٢٢٨٠ ) ، من طريق يحيى بن جابر عن المقدام بن معدي كرب فذكره مرفوعاً ، وأخرجه ابن ماجة ( ٣٣٤٩ ) من طريق محمد بن حرب قال : حدثني أمي ، عن أمها أنها سمعت المقدام ابن معدي كرب فذكره مرفوعاً ٠

درەنگ نامێنن و هەندێکیشیان خێرا ، شایانی باسە ئەگەر مرۆڤ مام ناوەندێتی پاراست لە خواردنداو ، بە ئەندازەی پێویستی لەشی بەکاریهێناو ، لە چەندایەتی و چۆنایەتی خۆراک خواردندا مام ناوەند بوو ، لەش سوودو قازانجێکی زیاتری لێوەردگرێت بە بەراوردی ئەو سوودو قازانجەی کە لە خواردنی زۆر وەریدەگرێت ، پلەکانی خۆراکیش سێ پلەیە :

یەکەم : پلەی پێویستی ٠

دووەم : پلەی تێربوون ٠

سێ یەم : پلەی زیاتری ٠

پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێداوین : کە مرۆڤ چەند پارویەکی بەسە بۆ ئەوەی پشتی پێ ڕاست بکاتەوەو ، تووشی داڕۆخانی هێز نەبێت و ، لە گەڵیشیدا لاواز نەبێت ، بەڵام ئەگەر مرۆڤ حەزی بە خۆراک خواردنی زیاتر هەبوو ، با لە سێ یەکی سکیدا بخوات و ، سێ یەکی تریشی بەجێ بێڵێت بۆ خواردنەوەو ، سێ یەکی تریشی بەتاڵ بێت بۆ ئەوەی کرداری هەناسەدانی ئاسان بێت ، ئەمە بەسوودترین شتێکە بۆ لەش و بۆ دڵیش ، چونکە ئەگەر سک پڕبوو بە خۆراک ئەوا بۆ خواردنەوە تەسک دەبێتەوە ، بۆیە ئەگەر خواردنەوەشی بەسەردا کرد زیاتر تەسک دەبێتەوە بۆ هەناسەدان و ، ئیتر تووشی ئێش و ئازارو ماندووبوون دەبێت وەکو ئەوەی بارێکی قورسی هەڵگرتبێت ، جگە لەوەش مرۆڤ تووشی خراپبوونی دڵ دەکات ، سەرەڕای تەمبەڵی ئەندامەکانی لەش بۆ بەجێهێنانی پەرستنەکان ، هەروەها ئەو تێربوونە دەیجوڵێنێت بەرەو هەواو ئارەزووکان ، لێرەدا ڕوون دەبێتەوە کە پڕکردنی سک بە خواردەمەنی زیان بە دڵ و بە لەشیش دەگەیەنێت ، ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر بە بەردەوامی یا بە زۆری بوو ، بەڵام ئەگەر جار بە جار بوو ، ئەوا هیچی تێدا نی یە ، چونکە هاوەڵی بەڕێز ( أبوهريرة ) لە ئامادەبوونی خوودی پێغەمبەری خوادا ﷺ لە شیرو دۆکەی خواردەوە ، تا

فەرمووی : (( والذي بعثكَ بالحقِّ لا أجدُ لهُ مَسْلَكاً ))[١٩] واته : (( سوێند بەو خوایەی کە تۆی بە هەق ناردووە ، هیچ ڕێ وشوێنێکی تری بۆ نادۆزمەوە )) · هاوەڵانی تریش چەندین جار لە ئامادەبوونی پێغەمبەری خوادا ﷺ تاوەکو تێربوون خواردویانە ·

تێربوونی زۆری لە ڕادەبەدەریش هێزو جەستەی مرۆڤ لاواز دەکات ، ئەگەرچی سەرەتا سوودی پێ گەیەنێت ، لە ڕاستیدا جەستەی مرۆڤ بە هێز دەبێت بە گوێرەی ئەو خواردەمەنیەی قبوڵی دەکات ، نەك بە گوێرەی زۆرێتی ·

لە بەر ئەوەی لە مرۆڤدا بەشێکی خاکی و ، بەشێکی هەوایی و ، بەشێکی ئاوی هەیە ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆراك و خواردنەوەو هەناسەدانیشی کرد بە سێ بەشەوە ، ئەگەریش گووترا : بەرکەوتی بەشی ئاگریی لە کوێ یە ؟

دەگووترێت : ئەمە مەسەلەیەکە پزیشکان تیایدا دواون و ، گووتویانە : لە جەستەدا بەشێکی ئاگریی هەیە بە کرداریی ، کە یەکێکە لە پایەکان و بنچینەکانی ·

بەڵام ئاقلّ و ژیری پزیشکانی دیکەو و کەسانێکی تریش مشتومڕیان لە گەڵدا کردوون و گووتویانە : لە جەستەدا بەشێکی ئاگریی نی یە بە کرداریی و ، بەڵگەشیان ئەمانەی خوارەوەیە :

یەکەمیان : سەبارەت بەو بەشە ئاگری یە یا دەگووترێت لە بۆشایی ئاسمانەوە دابەزیووەو ، تێکەڵ بەم بەشە ئاویی و خاکیە بووە ، یا دەگووترێت : تیایدا پێکهات و دروست بوو ، یەکەم بۆچونیش بەدوور دادەنرێت لە دوو ڕووە : یەکەمیان : ئاگر بە سروشت بەرز دەبێتەوە ، ئەگەر دابەزێت ، ئەوا بە هۆی فشار بۆ هێنەرێکەوە دەست بە دابەزین دەکات لە سەنتەری

١٩ ــ صحيح : أخرجه أحمد ( ٢ / ٥١٥ ) ، والبخاري ( ٨ / ٦٧ ، ١١٩ ) ، والترمذي ( ٢٤٧٧ ) ، كلهم عن عمر بن ذر قال : حدثنا مجاهد عن أبي هريرة فذكر الحديث ، وهو حديث طويل·

خۆیەوە بۆ ئەم جیهانە . دووەمیش : ئەو بەشە ئاگرییە کە دادەبەزێت دەبێ بە ناچاری بە تۆپی ساردەسێردا دا تێپەڕ بێت کە لەو پەڕی ساردیدایەو ، ئێمەش لەم جیهانەدا تەماشا دەکەین ئاگرێکی گەورە بە ئاوێکی کەم دەکوژێتەوە ، بۆیە ئەو بەشە ئاگرییە بچوکانە کە دەبێ بە تۆپی ساردەسێردا تێپەڕ بێت و لەو پەڕی ساردیدایە ، شایستەترە بە کوژانەوە .

دووەمیان : ئەوەیە کە بگووترێت : ئالێرەدا پێکهات ئەمەش زۆر دوورە ، چونکە ئەو تەنەی کە دەبێت بە ئاگرو پێشتر ئاوەها نەبوو ، پێش بوونی بە ئاگریش یا خاك بوو ، یا ئاو بوو ، یا هەوا بوو لە بەر سنووردارەبوونی پایەکان لەمانەدا ، ئەمەش کە وامان داناوە بوە بە ئاگر ، خۆی لە بنچینەدا تێکەڵ بە یەکێك لەو تەنانەی سەرەوە بوو و ، پەیوەند بوو پێوەی ، تەنێکیش کە ئاگر نەبێت و تێکەڵ بە تەنگەلێکی گەورە بێت کە ئاگر نەبێت و بەشێکیش نەبێت لەو تەنە گەورانە ، ئامادە نابێت بگۆڕێت بۆ ئاگر چونکە لە خوودی خۆیدا ئاگر نی یە و ، تەنە تێکەڵاوەکانیش ساردن ، ئیتر چۆن ئامادە دەبێت بگۆڕێت بە ئاگر ؟

ئەگەر بڵێن : ئەی بۆ تەنگەلێکی ئاگرین نی یە ئەو تەنانە بگۆڕێت و ، بیگات بە ئاگر بە هۆی تێکەڵبوونیانەوە ؟

دەڵێین : قسەکردن سەبارەت بە دەستکەوتنی ئەو تەنە ئاگرینانە هەر قسەکانی سەروەیە.

ئەگەر گووتتان : ئێمە دەبینین کاتێ ئاو بە سەر مادەی ( النَّوَرَة )ی[20] کوژاوەدا دەکرێت ئاگری لێ جیا دەبێتەوە ، ئەگەر تیشکی خۆر بەر ( البِلّورة )[21] کەوت ئاگری لێ

---

٢٠ ــ النَّوَرَة : مادەی قسڵە و هەندێ مادەی تری تێکەڵ دەکرێ . بۆ لابردنی توکی جەستەش بەکار دێت . وەرگێڕ .

٢١ ــ البِلّورة : جۆرە بەردێکی سپی یەو دەدرەوشێتەوە ، بە بلوور ناو دەبرێت و ، لە بەر زۆر سپێتی بریسك دەداتەوە ، بڕوانە (( شرح شافية ابن حاجب )) ، الجزء الأول ، ص ٢٢ ، وەرگێڕ .

دەردەکەوێت ، ئەگەر بەردێکمان کیشا بە ئاسنێکدا ئاگری لێ دەردەکەوێت ، هەموو ئەم ئاگرەش لە ئەنجامی تێکەڵبوونەوە دروست بوو ، ئەمەش دیسان ئەوانە پووچ دەکاتەوە کە لە بەشی یەکمدا جێگیرتان کرد ٠

بەڵام کەسانی دیکەی نکۆڵیکار گوتوویانە : ئێمە نکۆڵی ناکەین کە لێکخشاندنی بەهێز دروستکاری ئاگر بێت ، وەکو ئەوەی بەردێك بە سەر ئاسنێکدا بکێشی ، یا هێزی گەرمکردنی هەتاو دروستکاری ئاگر بێت ، وەکو بلوور ، بەڵام زۆر بەدوری دادەنێین ئەوە لە لەشی ئاژەڵ و ڕووەکدا ڕووبدات ، چونکە لەشی ئاژەڵ و ڕووەك ئەو لێکخشاندنە بەهێزەی تێدا نی یە کە ببێت بە هۆی دروستبوونی ئاگر ، وە ئەو ئەندازە ڕوون و ساف و پاك و بێگەردیەشی نی یە بگات بە ئاستی ڕوون و ساف بلوور ، بەشی دەرەوەشیان تیشکی خۆری بەردەکەوێت ، بەڵام بەهیچ شێوەیەك ئاگر دروست ناکات ، ئیتر ئەو تیشکەی دەگاتە بەشی ناوەوە چۆن ئاگر دروست بکات ؟

ڕووی دووەم : لە بنچینەی مەسەلەکەدا : پزیشکان کۆڕان کە شەرابی کۆنە بە سروشت لەو پەڕی گەرمیدایە ، مەحاڵیشە ئەو گەرمیە بەهۆی بەشە ئاگرینەکانەوە بێت ، چونکە بەلای مرۆڤەوە ماقوڵ نی یە ئەو بەشە ئاگرینانە هەرچەند کەم بن لە بەشە ئاویەکاندا بمێننەوە ماوەیەکی درێژ ، نەشکوژێتەوە کەچی ئێمە تەماشا دەکەین ئاگرێکی گەورە بە ئاوێکی کەم دەکوژێتەوە ٠

ڕووی سێ یەم : ئەگەر لە ئاژەڵ و ڕووەکدا بەشێکی ئاگریی هەبووایە بە کرداریی ، ئەوا بەشە ئاویەکە دەیبەزاندو بە سەریدا زاڵ دەبوو ، بەشە ئاگریەکەش دادەمرکاو دەکوژایەوە ، چونکە زاڵ بوونی هەندێ ماددەو توخم بە سەر هەندێکی تردا هۆکارێکی گرنگە بۆ گۆڕینی سروشتی ماددەی بەزێنراو بۆ سروشتی ماددەی بەزێنەر ، بۆیە ئەو بەشە ئاگریە زۆر کەمە دەگۆڕا بۆ سروشتی ماددە ئاویە بەزێنەرەکە کە دژی ئاگرە ٠

ڕووی چوارەم : خوای تعالی لە قورئانە پیرۆزەکەیداو لە چەندین ئایەتدا باسی خوڵقاندنی مرۆڤ دەکات ، لە هەندێ ئایەتدا پێی ڕاگەیاندوین کە لە ئاو خوڵقاندویەتی ، لە هەندێکی تریشدا لە خاك ، لە هەندێکی تریشدا لە تێکەڵەیەکی هەردوکیان کە قوڕە ، لە هەندێکی تریشدا لە قوڕێکی ووشکەوەبووی وەکو سواڵەت ، کاتێ بەر تیشکی هەتاو با دەکەوێت ، کەچی تەنها لە ئایەتێکیشدا پێی ڕانەگەیاندوین لە ئاگر دروستی کردبێت ، بەڵکو ئەوەی بە خاسیەتی ئیبلیس داناوە ٠

ثبت في صحيح مسلم : عن النبي ﷺ قال : (( خُلِقَتْ الملائكةُ من نُور ، وخُلِقَ الجانَ من مارجٍ من نارٍ ، وخُلِقَ آدمُ مما وُصِفَ لكم ))[٢٢]

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :(( پەریەکان لە نورو ڕوناکی خوڵقێنران ، جنۆکەش لە بڵێسەی ئاگرێکی بێ دووکەڵ خوڵقێنران ، ئادەمیش خوڵقێنراوە لەوەی بۆتان وەسفکراوە )) ٠

ئەمەش زۆر بە ڕوونی ئاشکەرای دەکات کە خوڵقێنراوە لەو ماددەیەی خوای تعالی وەسفی دەکات لە قورئانەکەیداو هیچی تر ، بەڵام وەسفی بۆ نەکردوین لە ئاگر دروستی کردبێت ، یا لە ماددەکەیدا شتێك لە ئاگر هەبێت ٠

ڕووی پێنجەم : ئەوپەڕی بەڵگەکانیان کە بەکاریدەهێنن ئەو گەرمیەی لەشی گیانەوەرانە کە دەیبینن ، ئەمەش لە خودی خۆیدا بەڵگەی بوونی بەشە ئاگریەکانە ، بەڵام ئەمە بەڵگە نی یە ، چونکە هۆی گەرمی لە ئاگر گشتیترە ، بۆیە جار بە جار هۆی گەرمی ئاگرە ، جار بە جاریش جوڵانەوەیە ، جار بە جاریش تیشکدانەوەیە ، جار بە جاریش گەرمبوونی هەوایە ،

---

٢٢ ــ صحيح : أخرجه أحمد ( ٦ / ١٥٣ ، ١٦٨ ) ، وعبد بن حميد ( ١٤٧٩ ) ، ومسلم ( ٨ / ٢٢٦ ) ، كلهم من طريق عبدالرزاق قال : أخبرنا معمر عن الزهري عن عروة عن عائشة فذكره مرفوعاً ٠

جار بـه جـاريش نزيكبوونه‌وه‌يـه لـه ئـاگر ، كـه ديسـان هۆكاره‌كـه‌ى هه‌وايـه كـه گه‌رميه‌كـه هه‌ڵده‌گرێت ، وه چه‌ندين هۆكارى ديكه‌ش ، بۆيه مه‌رج نى يه گه‌رمى ته‌نها له ئاگره‌وه بێت ٠

هاوه‌ڵانى ئاگر ده‌ڵێن : زانراوه ئه‌گه‌ر خاك و ئاو تێكه‌ڵ بوون پێويستيان بـه گه‌رميه‌كـه بـۆ ئه‌وه‌ى هه‌ردوكيان پێگه‌يه‌نێت و به باشـى تێكـه‌ڵيان بكـات ، بـه پێچه‌وانه‌شـه‌وه هه‌ريـه‌ك لـه‌و مادانه به باشى تێكه‌ڵ به‌ويتر نابێت و ، له گه‌ڵيشـيدا يـه‌ك ناگرێـت ، هـه‌روه‌ها ئه‌گـه‌ر تۆومـان فرێدايه نێو قوڕه‌وه به جۆرێك نه هه‌واو نه تيشكى هه‌تاويشى نه‌گاتێ ، بۆگـه‌ن ده‌بێـت ، بۆيـه له‌وه به‌ده‌ر نابێت ، كه ئايا لـه تێكه‌ڵاوه‌كـه‌دا تـه‌نێكى پێگه‌يه‌نـه‌رى بـاش دروسـت ده‌بێـت بـه سروشت يا نه‌ء ؟ ئه‌گه‌ر دروست بوو ، ئه‌وا به‌شه ئاگريه‌كه‌يه ، ئه‌گه‌ر دروستيش نـه‌بوو ، ئـه‌وا تێكه‌ڵاو به سروشتى خۆى گه‌رمكار نى يه ، به‌ڵكو ئه‌گه‌ر گه‌رميش بێت گه‌رمبوونه‌كه كـاتى يـه ، بۆيه ئه‌گه‌ر گه‌رمبوونه كاتيه‌كه نه‌ما ، شته‌كه گه‌رم نى يه ، نه به سروشتى خۆى و ، نـه بـه چۆنيه‌تيشى ، به‌ڵكو سارد ده‌بێت به ڕه‌هايى ، بـه‌ڵام هه‌نـدێك لـه خوارده‌مـه‌نى و ده‌رمـان بـه سروشت گه‌رمن ، چونكه گه‌وهه‌رێكى ئاگريى تێدايه.

بۆيه ئه‌گه‌ر له جه‌سته‌دا به‌شێكى گه‌رمكار نه‌بێت ئه‌و جه‌سته‌يه له‌وپه‌ڕى ساردیدا ده‌بێـت ، چونكه ئه‌گـه‌ر سروشـت سـاردى پێويسـت بكـات ، هـيچ يارمه‌تيـده‌رو ڕێگرێكيشـى نـه‌بێت ، پێويسته ئه‌و سـارديه بگـا بـه لووتكـه ، ئه‌گـه‌ر واش بـوو چيتر هه‌سـت بـه سـاردى ناكـات ، چونكه ئه‌و سارديه‌ى پێى ده‌گات ئه‌گه‌ر له لووتكـه‌دا بـوو يه‌كسـانى سـارديه زۆره‌كـه‌ى خـۆى ده‌بێت ، شتيش به هاوشێوه‌ى خۆى كارتێكراو نابێت و هيچ كاردانه‌وه‌يه‌كى به‌رامبـه‌ر نابێـت ، ئه‌گه‌ر به‌و شيوه‌ش بـوو ئـه‌وا هه‌سـتى پـێ ناكـات ، ئه‌گـه‌ر هه‌ستيشـى پـێ نـه‌كات ئـه‌وا هـيچ ئازارێكى به هۆيه‌وه تووش نابێت ، ديسان ئه‌گه‌ر سـارديه‌كه‌ش لـه سـاردى له‌شـى كـه‌متر بـوو ئه‌وا هيچ كاردانه‌وه‌يه‌كى به‌رامبه‌ر نابێت ، لێره‌دا ده‌گه‌ينه ئه‌و ئه‌نجامه‌ى كه ئه‌گـه‌ر لـه له‌شدا به سروشت به‌شێكى گه‌رمكار نه‌بێت ئه‌وا هيچ هه‌سـت و كاردانه‌وه‌يـه‌كى به‌رامبـه‌ر بـه سـاردى نابێت و ، به‌و هۆيه‌شه‌وه هيچ ئازارێكى پـێ ناگـات ٠ گووتيـان : لـه ڕاسـتيدا به‌ڵگـه‌كانى ئێـوه

گوفتاری ئەو کەسانە پووچ دەکاتەوە کە دەڵێن : بەشە ئاگرینەکان لە سەر باری خۆی و سروشتە ئاگریەکەی لەم تێکەڵاوانەدا دەمێنێتەوە ، بەڵام ئێمە ئەوە ناڵێین ، بەڵکو دەڵێین : شێوە جۆریەکەی ( صورتها النوعية ) لە کاتی تێکەڵ بووندا خراپ دەبێت و نامێنێت ٠

کەسانی تریش دەڵێن : بۆ شیاو نەبێت بگوترێت : زەوی و ئاو هەوا ئەگەر تێکەڵ بن ئەوا ئەو گەرمیەی پێیاندەگەیەنێت و تێکەڵاویان دەکات گەرمی تیشکی خۆرو هەسارەکانی ترین ، پاشان تێکەڵاوەکە لە کاتی تەواو پێگەشتنیدا ئامادەی قبوڵبوونی شێوە پێکهێنانەکە دەبێت بە هۆی گەرمیەوە ڕووەك بێت یا گیانەوەر بێت یا کانزا بێت ، پاشان هیچ ڕێگرێکیش نی یە بەرامبەر بەوەی کە ئەو تین و گەرمیەی لە تێکەڵاوەکاندا بەدیدەکرێت بەهۆی خاسیەت و هێزێکەوە بێت کە خوای تعالی بەدیدەهێنێت لە کاتی ئەو تێکەڵاوبونەدا نەك بە هۆی بەشە ئاگرینەکانەوە بە کرداری ، ئێوەش چیتر توانای پوچکردنەوەی ئەم ئیحتمالەتان نابێت ، چونکە کۆمەڵێك لە پزیشکە بەڕێزەکان دانیان بەمەدا ناوە ٠

بەڵام سەبارەت بە باس و خواسی هەستکردنی لەش بە سەردی ، دەڵێین : ئەمە بەڵگەیە کە لە لەشدا تین و گەرمی هەیە ، هیچ کەسیش نی یە نکۆڵی لەمە بکات ، بەڵام بەڵگە چیە بۆ سنورداربوونی گەرمکردن بە ئاگر بە تەنها ؟ چونکە ئەگەرچی هەموو ئاگرێك گەرمکارە ، بەڵام مەسەلەکە ئاوەها نی یە بە گشتی ، بەڵکو پێچەوانەکەی ڕاستە: هەندێ گەرمکار ئاگرە ٠

بەڵام سەبارەت بەو گوفتارەتان کە دەڵێن شێوەی جۆریی ئاگرەکە خراپ دەبێت و نامێنێت ، زۆرێك لە پزیشکان کۆڕان لە سەر ئەوەی شێوە جۆریەکەی دەمێنێتەوە ، لە لایەکی تریشەوە کە دەڵێن شێوە جۆریەکەی خراپ دەبێت و نامێنێت گوفتارێکی پووچەو

چاكترين پزيشكانتان له كتێبه‌كه‌يدا به ناوى (( الشفاء ))[٢٣] دانى پێدا ناوه‌و ، سه‌لماندويه‌تى كه هه‌موو پايه‌كان له سه‌ر سروشتى خۆيان ده‌مێننه‌وه له تێكه‌ڵاوه‌كاندا · وباالله التوفيق.

## به‌شێك : سه‌باره‌ت به ڕێبازى پێغه‌مبه‌رى خوا ﷺ له چاره‌سه‌ركردنى نه‌خۆشيدا

**پێغه‌مبه‌ر خوا ﷺ چارسه‌رى نه‌خۆشه‌كانى به سێ جۆر ده‌كرد :**

يه‌كه‌م : به ده‌رمانه سروشتيه‌كان ·

دووه‌م : به ده‌رمانه خواوه‌نديه‌كان ·

سێ يه‌م : به تێكه‌ڵه‌يه‌ك له هه‌ردووكيان ·

ئێمه‌ش باسى ئه‌و سێ جۆره له ڕێنومايه‌كانى پێغه‌مبه‌رى خوا ﷺ ده‌كه‌ين ، بۆيه به باسكردنى ده‌رمانه سروشتيه‌كان ده‌ست پێ ده‌كه‌ين ، كه وه‌سفى ده‌كردو به كاريده‌هێنا بۆ نه‌خۆشه‌كان ، پاشان باسى ده‌رمانه خواوه‌نديه‌كان ده‌كه‌ين و ، پاشانيش باسى تێكه‌ڵه‌كه ده‌كه‌ين ·

ئه‌مه‌ش به ئاماژه‌دان ئاماژه‌ى بۆ ده‌كه‌ين ، چونكه پێغه‌مبه‌رى خوا ﷺ له ڕاستيدا وه‌كو ڕێنومايكارێك و ، بانگه‌وازكارێك بۆ خواو ، ناسيارێك بۆ خوا نێردراوه ، بۆ ئه‌وه‌ى ئه‌و كارانه‌ى كه جێگه‌ى ڕه‌زامه‌ندبوونى خواى تعالايه به ئومه‌ته‌كه‌ى ڕاگه‌يه‌نێت و فه‌رمانيان پێ بكات و ، ئه‌و كرده‌وانه‌ش كه خواى تعالى ڕقى لێ ده‌بێته‌وه ڕوون بكاته‌وه‌و قه‌ده‌غه‌يان لێ بكات ، هه‌واڵى پێغه‌مبه‌ران و فرستاده‌كان و بارودۆخ و ڕه‌فتاريان له گه‌ڵ ئومه‌ته‌كانى خۆياندا پێيان

---

٢٣ ـ ئه‌و پياوه ناوى ( ابن سينا أبوعلي حسين )ى كوڕى ( عبدالله )يه‌و ناونراوه به ( الشيخ الرئيس ) ، يه‌كێكه له‌و فه‌يله‌سوفانه‌ى ده‌درێنه پاڵ ئيسلام ، ساڵى ( ٤٢٨ ) كۆچى مردووه ، بۆ زياتر شاره‌زابوون بڕوانه كتێبى ( كشف الظنون ) ( ١ / ٣٦ ) ·

ڕاگەیەنێت ، هـەواڵی خولْقاندنی جیهـان و ، سـەرەتای دەستپێکردن و گەڕانـەوەو ( المبـدأ و المعاد ) چۆنیەتی بەدبەختی و کامەرانیی نەفس و هۆیەکانیان بۆ ڕوون بکاتەوە ٠

بـەڵام پزیشـکێتی جەسـتە : وەکـو بەشـێك بـۆ تـەواوکردنی شـەریعەتەکەی هـاتووەو ، مەبەستداریشە بۆ جەماوەری خەڵك ، بە جۆرێك لە کاتی پێویسـت بووندا بـە کاردەهێنرێـت ، بەڵام ئەگەر لە کاتی تەندروستیدا توانرا دەستی لێهـەڵگیرێت ، ئـەوا هیمـەت و هێـز ئاراسـتەی چارەسـازی دڵ و گیـان و ، پاراسـتنی تەندروسـتیان و ، لابردنـی نەخۆشـیەکانیان دەکرێـت ، هەروەها پاراستنی بەرامبەر بە هۆکارەکانی خراپبوونی مەبەستە بە پلـەی یەکـەم ، چاککردنی جەستە بەبێ چاککردنی دڵ بێ سوودە ، خراپبوونی جەستەش لە گەڵ چاککردنی دڵدا زیـانی زۆر کەمەو ، زیانێکی لاچووە بەدوایدا سوودو قازانجی بەردەوامی تەواو دێت ٠ وبالله التوفيق.

# بەشى يەكەم

# چارەسەركردن بە دەرمانە سروشتيەكان

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازى پێغەمبەرى خوا ﷺ لە چارەسەركردنى ( تا ) دا :

ثبت في الصحيحين : عن نافع ، عن أبن عمرَ ، أن النبي ﷺ قال : (( إنَّما الحُمَّى _ أو شِدَّةُ الحُمَّى _ مِنْ فَيحِ جَهَنمَ ، فأبرِدُوهَا بِالماءِ ))(٢٤)

واتە : پێغەمبەرى خوا ﷺفەرموويەتى : (( لە ڕاستيدا( تا ) _ يا توندى ( تا ) _ لە كڵپ و كۆى دۆزەخەوەيە ، بە ئاو ساردى بكەنەوە )) ٠

ئەم فەرموودە بەلاى زۆرێك لە پزيشكە نەفامەكانەوە ئالۆز بوو ( أشكلَ ) ، وايان بە خەياڵدا هات كە دژكارەو ڕێك ناكەوێت لە گەڵ دەرمانى ( تا ) و چارەسەرەكەيدا ، ئێمەش بە يارمەتى خواى پەروەردگار مەبەست و فيقهى فەرموودەكە ڕوون دەكەينەوەو ، دەڵێين :

فەرمايشتەكانى پێغەمبەرى خوا ﷺدوو جۆرە : گشتى بۆ هەموو دانشتوانى سەر زەمين و ، تايبەت بە هەندێكيانەوە ٠

٢٤ _ صحيح : أخرجه مالك في موطئه ( ص ٥٨٧ ) ، وأحمد ( ٢ / ٢١ ) ، والبخاري ( ٤ / ١٤٧ ) ( ٧ / ١٦٧ ) ومسلم ( ٧ / ٢٣ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٧٢ ) ، كلهم من طريق نافع عن ابن عمر به ٠

**نموونەی یەکەم : وەکو فەرمایشتەکانیەتی بە گشتی ٠**

**نموونەی دووەم** : وەکو فەرمایشتی : (( لا تَسْتَقْبِلُوا القِبلَةَ بغائطٍ ولا بَولٍ ، ولا تَسْتَدْبِروها ، ولكنْ شرِّقوا ، أوْ غرِّبوا ))[٢٥]

واتە : (( بۆ میزو پیسی کردن نە ڕوو لە قیبلە بکەن و ، نە پشتیشی تێبکەن ، بەڵکو ڕوو بکەنە ڕۆژهەڵات ، یا ڕۆژئاوا )) ٠ لێرەدا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ نە بۆ خەڵکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایەو نە بۆ خەڵکی عێراقیشە ، بەڵکو بۆ خەڵکی مەدینەو شوێنانی تری هەمان ئاراستەشە وەکو وەڵاتی شام و شوێنانی تر ٠ هەروەها فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ: (( مَا بينَ المَشرِقِ والمَغرِبِ قبلة ))[٢٦] واتە : (( نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا قیبلەیە )) ٠

ئەگەر ئەوە زانرا ، ئینجا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە گوفتارەکانی پێغەمبەری خوا ﷺلە فەرموودەکەی سەرەوەدا تایبەتە بە خەڵکی ( الحِجاز )و ، ئەو شوێنانەی هەمان بارودۆخیان هەیە ، چونکە زۆربەی ئەو ( تا )یانەی تووشیان دەبوو لە جۆری ( تا )ی ڕۆژانەی کاتی بوو بە هۆی هێزی گەرمی هەتاوەوە ، ئەمەش ئاوی ساردی بۆ بەکەڵکە چ بە خواردنەوە بێت یا بە خۆشتن ، چونکە ( تا ) گەرمیەکی نامۆیە لە دڵ بەردەبێ و ، لە گەڵ ڕوح و خوێنداو بە ڕێگای خوێنبەرەکاندا بە هەموو جەستەدا بڵاو دەبێتەوە ، تیایدا بە گڕگرتن گڕدەگرێت بە جۆرێك زیان بە کردەوە سروشتیەکان جەستە دەگەیەنێت ٠

---

٢٥ ـ صحيح : أخرجه الحميدي ( ٣٧٨ ) ، وأحمد ( ٥ / ٤١٦ ـ ٤٢١ ) والدارمي ( ٦٧١ ) ، والبخاري ( ١ / ٤٨ ، ١٠٩ ) ، ومسلم ( ١ / ١٥٤ ) ، وأبوداود ( ٩ ) ، وابن ماجة ( ٣١٨ ) ، والترمذي ( ٨ ) ، والنسائي ( ١ / ٢٢ ، ٢٣ ) ، وابن خزيمة ( ٥٧ ) كلهم من طريق الزهري عن عطاء بن يزيد عن أبي أيوب الأنصاري فذكره مرفوعاً ٠

٢٦ ـ صحيح : أخرجه ابن ماجة ( ١٠١١ ) ، والترمذي ( ٣٤٢ ) كلاهما عن أبي معشر عن محمد بن عمرو عن أبي سلمة عن أبي هريرة فذكره مرفوعاً ٠ وأخرجه الترمذي ( ٣٤٤ ) من طريق عثمان بن محمد الأخنسي عن سعيد المقبري عن أبي هريرة فذكره مرفوعاً ٠

## هۆیەکانی ( تا ) کە دەکرێت بە دوو جۆرەوە :

**کاتی** : هۆکاری دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ ئاوسان ، یا جوڵانەوە ، یا بە هۆی لێدانی گەرمی هەتاوەوە ، یا بەهۆی جەو گەرمیەکی لە ڕادەبەدەرەوەو بەو هاوشێوانە ٠

**نەخۆشی** : ئەمەش سێ جۆرە ، سەرەتا لە ماددەیەکی یەکەمەوە ( مادة أولى ) دەست پێ دەکات و ، پاشان هەموو جەستە گەرم دەبێت ٠ بۆیە ئەگەر سەرەتای پەیوەندی بە روحەوە هەبێت ئەوا بە ڕۆژەتا ناو دەبرێت ، چونکە بەزۆری لە ماوەی ڕۆژێکدا نامێنێت و ، ئەوپەڕی درێژبوونەوەشی سێ ڕۆژە ، ئەگەر سەرەتای پەیوەندیشی بە خەڵتەکانی جەستەوە بێت ئەوا بە بۆگەنەتا ( عفنية ) ناودەبرێت ، ئەوانەش چوار جۆرن : ( زەردوای ، ڕەشکاوی ، بەڵغەمی ، خوێنی ٠ ئەگەر سەرەتای پەیوەندیشی بە ئەندامە ڕەقە بنەڕەتیەکانەوە بێت ( الأعضاء الصلبة الأصلية ) ، ئەوا بە سووکەتا ( حُمى دِق ) ناودەبرێت ، ئەم جۆرانەش چەندین چەشنی تر لە خۆ دەگرێت ٠

پێدەچێ جەستە سوودێکی ئەوتۆ لە ( تا ) وەرگرێت کە لە دەرمان وەری ناگرێت ، زۆر جاریش ڕۆژەتاو بۆگەنەتا هۆکارێکی سەرەکی دەبن بۆ پێگەیاندنی چەندین ماددەی چڕ کە بەبێ بوونی ئەوانە پێنەدەگەشت ، هۆکارێکی کارێگەریش دەبن بۆ کردنەوەی چەندها کونیلەی داخراو ( السُدد ) کە ئەو دەرمانانەی تایبەتن بە کردنەوەوە نەیاندەتوانی بێکەنەوە.

## ( تا ) زۆرێك لە نەخۆشیەکان چارەسەر دەکات :

بەڵام چاو هەوکردنی نوێ و کۆن ( الرَّمدُ الحديثُ والمتقادمُ ) ، ( تا ) هۆکارێکی گاریگرە بۆ چاکبوونەوەی زۆربەی جۆرکانی بە شێوەیەکی سەرسوڕمێنی خێرا ، بەسوودیشە بۆ نەخۆشیەکانی ئیفلیجی و ، دەم خواربوون و ، گرژبوونی زۆرخواردن و ، چەندین نەخۆشی تر کە هۆکاری دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ زێدە ماددەی چڕ ٠

## پزیشكانێك ئەو گوفتارەی دانەر دەسەلمێنن :

هەندێ لە پزیشكە بەڕێزەكان پێیان ڕاگەیاندم و گووتیان : دڵخۆش دەبین كاتێ زۆرێك لە نەخۆشەكان ( تا )ی لێدێت ، وەكو چۆن بە چاكبوونەوەی نەخۆشەكە دڵخۆش دەبین ، چونكە ( تا ) سودێكی زیاتری پێ دەگەیەنێت بە بەراوردی خواردنەوەی دەرمان ، چونكە ( تا )كە زۆرێك لە خەڵتەو و ماددە بۆگەنە زیان بەخشەكانی جەستە پێدەگەیەنێت و بەوەش ئامادەی دەرچوون دەبێت ، پاشان ئەگەر ڕێكەوتی دەرمانەكان بوو ئەوا دەردەچێت و ، بەوەش چاكبوونەوە ڕوودەدات ٠

ئەگەر ئەمە زانرا ، ئینجا دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە دەشێ مەبەستی فەرموودەكە بەشەكانی ( تا )ی كاتی بێت ، چونكە بە خۆهەڵكێشان لە ئاوی ساردو ، خواردنەوەی ئاوی ساردی سهۆڵاو ئەو ( تا )یە لە شوینەكانی جەستە لادەچێت و ، چیتر نەخۆش پێویستی بە چارەسەری دیكە نابێت ، چونكە ئەو ( تا )یە تەنها چۆنیەتیەكی گەرمەو بە ڕوحەوە پەیوەندە ، تەنها گەیاندنی چۆنیەتیەكی ساردی بەسە بۆ لادانیی ، بەوەش گڕی ( تا )كە دادەمركێتەوە بەبێ ئەوەی واپێویست بكات مادەیەك بكرێتە دەرەوە ، یا چاوەڕێكردنی پێگەیاندنی ماددەیەك بۆ ئەوەی دەربچێت ٠

هەروەها دەشێ مەبەستی فەرموودەكە سەراپای جۆرەكانی ( تا ) بێت ، چاكترینی پزیشكان ( جالینوس )[٢٧] دانی بەوەدا ناوە كە : ئاوی سارد بۆ ( تا ) بەسوودە ، لە بەشی دەیەمی كتێبەكەیدا ( حیلة البرء ) دەڵێت : ئەگەر پیاوێكی لاوی ، چاك گۆشتی ، تەندروست لە كاتی قەرچەی گەرماداو ، لە كاتی ( تا )ی زۆرداو ، هیچ ئاوسانێك لە هەناویدا نەبێت ، لە ئاوی ساردا خۆی شت ، یا مەلەی تێدا كرد ، بەدڵنیایی سودی لێدەبینێت ٠ دەڵێت : ئێمەش فەرمان بەوە دەكەین بەبێ وەستان ٠

---

٢٧ ـ یەكێكە لە پزیشكە یونانیەكان ، ساڵی ( ٢٠١ )ی زاینی مردووە ٠

( الرازيُّ )[٢٨] له كتێبه گه‌وره‌كه‌یدا ده‌ڵێت : ئه‌گه‌ر هێز به‌هێزبوو ، ( تا )ش زۆر توند بوو ، پێگه‌یاندن ئاشكه‌رابوو ، هیچ ئاوسانێك له‌ هه‌ناودا نه‌بوو ، هیچ هه‌ناودڕان یا گه‌ده‌وڵیه‌كیش ( فتق ) نه‌بێت ، ئه‌وا خواردنه‌وه‌ی ئاوی سارد به‌سووده‌ ، ئه‌گه‌ر نه‌خۆش ته‌ندروست بوو ، قه‌رچه‌ی گه‌رماش بوو ، له‌ سه‌ر به‌كارهێنانی ئاوی ساردیش ڕاهاتبوو بۆ ئه‌ندامه‌كانی ده‌ره‌وه‌ی له‌شی ، با ئیزنی بدرێت ٠

فه‌رمایشتی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ: (( الحُمَّى مَنْ فَيْحِ جهنم )) واته‌ ( تا ) له‌ گڕو بڵێسه‌ی دۆزه‌خ و ، بڵاوبوونه‌وه‌یه‌تی ، هاوتاشی فه‌رمایشتێتی : (( شَدَّةُ الحرِّ مِن فَيحِ جَهَنمَ )) واته‌ : زۆر گه‌رمی له‌ گڕو بڵێسه‌ی دۆزه‌خه‌وه‌یه‌ ، ئه‌مه‌ش به‌ دوو ڕوو لێكده‌درێته‌وه‌ :

یه‌كه‌میان : ئه‌وه‌ نموونه‌و توێژاڵێكه‌ له‌ دۆزه‌خ داتاشراوه‌ ، بۆ ئه‌وه‌ی به‌لای به‌نده‌كانی خواوه‌ به‌ڵگه‌یه‌ك بێت له‌ سه‌ر ناڕه‌حه‌تیه‌كانی ئاگرو ، په‌ندیشی لێ وه‌ربگرن ، پاشان خوای تعالى فه‌رمانی داوه‌ له‌ جه‌سته‌ی مرۆڤدا ده‌ركه‌وێت به‌ چه‌ند هۆكارێك پێویستی ده‌كات وه‌كو به‌رزی پله‌ی گه‌رماو هیتر ، هه‌روه‌كو چۆن خۆشی و شادی ئاره‌زوو له‌ نیعمه‌ته‌كانی به‌هه‌شته‌و ، خوای تعالى له‌م دونیایدا به‌ده‌ری خستووه‌ ، وه‌كو په‌ندو ئامۆژگاریه‌ك و ، به‌ڵگه‌یه‌كیش بێت به‌لای به‌نده‌كانی خواوه‌ بۆ خۆشیه‌كانی به‌هه‌شت ، خوای تعالى فه‌رمانی ده‌ركه‌وتنی ئه‌مه‌شی داوه‌ له‌ نێوان به‌نده‌كانیدا به‌ چه‌ند هۆكارێك پێویستی ده‌كات ٠

دووه‌م : پێده‌چێ مه‌به‌ست چواندن بێت ، بۆیه‌ توندی ( تا )ی به‌ گڕو بڵێسه‌ی دۆزه‌خ چواندووه‌ ، وه‌ توندی گه‌رمیشی پێ چواندووه‌ ، بۆ ئاگاداركردنه‌وه‌ی نه‌فسی به‌نده‌كان

---

٢٨ ـ مامۆستاو فه‌یله‌سوف ( أبوبكر محمد )ی كوڕی ( زكريا الرازي )یه‌ ، پزیشكه‌و ، خاوه‌ن چه‌ندین دانراوه‌ ، یه‌كێك بووه‌ له‌ هه‌ره‌ زیره‌كه‌كانی زه‌مه‌نی خۆی ، كتێبی ( الحاوي ) به‌ سی به‌رگ له‌ بواری پزیشكیداو ، كتێبی ( الأعصاب )و چه‌ندین كتێبی تریشی داناوه‌ ، ساڵی ( ٣١١ )ی كۆچی له‌ شاری ( بغداد ) مردووه‌ ٠ بڕوانه‌ : ( سیر أعلام النبلاء ) ( ٤ / ٣٥٤ ) ٠ ( وكشف الظنون ) ( ٢ / ١٢١٥ ) ٠

سەبارەت بە توندی سزای ئاگر ، وە توندی ئەم گەرمیەش لـە گـڕو بڵێسـەی دۆزەخ دەچـێت ، کە ئەو هێندە گەرمیەیە کەسێك بەریدەکەوێت ئەگەر نزیکی بێتەوە ۰

فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ: (( فأبْرِدُوها )) ، بە دوو ڕوو ( ریواية ) کراوە:

یەکـەم : لـە : ( أبْـرَدَ الشـيءَ )ەوە وەرگـیراوە واتـە : بارەکـەی گـۆڕی بـۆ سـاردی ، بـە هاوشێوەی ( أسْخَنَه ) واتە : بارەکەی گۆڕی بۆ گەرمی ۰

دووەم : لـەم ڕسـتەیەوە وەرگـیراوە ( بَـرَدَ الشـيءَ يَبْـرُدُه ) واتـە : شـتەکەی سـارد کـردو ساردی دەکا ، ئەمەش زمانێکی پاراوترو بەکارهێنراوترە ، لەم بارەشەوە شاعیرێك دەڵێت:

إذا وَجدْتُ لَهيبَ الحُبِّ في كَبِدي أقبَلْتُ نَحْوَ سِقاءِ القَومِ أبتَرِدُ
هَبْنِي بَرَدْتُ بِبَرْدِ المـاءَ ظاهِرَهُ فمَنْ لِنارِ على الأحشـاءِ تَتَقِدُ

واتە :

ئەگەر لە جەرگمدا هەستم بە گڕی خوشەویستی کرد
دێم بەرەو لای بیرە ئاوی قەومەکەو خۆم فێنك دەکەمەوە
با بە سـاردی ئـاوەکە ڕووکەشـی فێنك بکەمەوە
بەڵام ئەو ئاگرەی لە هەناومدا گڕی گرتووە کێ بکوژێنێتەوە

فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ (( بِالماء )) بەدوو ڕوو لێکدراوەتەوە :

یەکەمیان : مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ئاوێکە ، ئەمەش ڕاستترە ۰

دووەم : مەبەستی ئاوی زەمزەم بوو ، لایەنگرانی ئەم بۆچۆنە ئەو فەرموودەیە دەکـەن بـە بەڵگە کە پێشەوا ( البخاري ) لە ( صـحيح )ەکەیـدا لـە ( أبـي جَمْـرَةَ نَصْـر )ی کـوڕی ( عمـرانَ

الضُّبَعيّ )وه دەيگێڕێتەوەو دەڵێت : (( كُنْتُ أُجالِسُ ابن عباس بمكةَ ، فأخَذَتْني الحُمَّى فقال : أبردها عنك بماءِ زمزمَ ، فإنَّ رَسولَ الله ﷺ قال : إن الحُمَّى من فَيْحِ جهَنَّم ، فأبْرِدوها بالماء ، أو قال : بماءِ زَمْزَمَ ))(٢٩)

واته : ( أبي جَمْرَةَ نَصْر )ى كوڕى ( عمران الضُّبَعيُّ ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت : (( لە مەككە لە خزمەتى ( ابن عباس )دا دادەنيشتم ، ئەوەبوو ( تا ) دايگرتم و ئەويش فەرمووى : بە ئاوى زەمزەم ئيش و گەرمى سارد لابەرە ، چونكە پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : ( تا ) لە گڕو بلێسەى دۆزەخەوەيە ، بە ئاو ئێش و گەرمى سارد بكەنەوە ، يا فەرمووى: بە ئاوى زەمزەم )) ٠ ئەو كەسەى فەرموودەكە دەگێڕێتەوە گومانى هەبوو ، ئەگينا ئەگەر يەكلاى بكردايەتەوە كە بە ئاوى زەمزەمە ، ئەوا فەرمانێك دەبوو بۆ خەڵكى مەككە لە كاتى ( تا )دا ئەو ئاوە بەكاربێنن ، چونكە لاى ئەوان زۆرەو بە ئاسانى دەست دەكەوێت ، بۆ شوێنانى ديكەى جگە لەوانيش بەو ئاوەى دەست دەكەوێت ٠

پاشان ئەو كەسانەش كە دەڵێن مەبەستى پێغەمبەرى خوا ﷺ هەموو ئاوێك بوو جياوازيان تێكەوت سەبارەت بەوەى ئايا ئاوەكە بكرێت بە خێرو صەدەقە ، يا بەكاربهێنرێت ؟ بەدوو بۆچوون ٠ بۆچوونى ڕاست : ئاوەكە بەكاربهێنرێت ، واش گوومان دەبەم ئەو شتەى هانى ئەو كەسانەى داوە بڵێن : مەبەست ئەوەبوو ئاوەكە بكرێت بە خێر ، ئەوەبوو كە ئاڵۆزيەكيان بۆ دروست بوو سەبارەت بە چۆنيەتى بەكارهێنانى ئاوى سارد لە بوارى ( تا )داو ، ڕووى بەكارهێنانيان نەزانيوە ، ئەگەرچى گوفتارەكانيان ڕوويەكى چاكى هەيە ، كاتێ بۆچونيان وابووە كە پاداشت لە جۆرى كردەوەيە ، بۆيە وەكو چۆن سەلمێندراوە كە گڕى تينويەتى لە سەر كەسى تينو بە ئاوى سارد دەكوژێنرێتەوە ، ئاوهاش خواى تعالى گڕى ( تا ) لە سەر كەسى نەخۆش دەكوژێنێتەوە وەكو پاداشتێكى

---

٢٩ ـ صحيح : أخرجه أحمد ( ١ / ٢٩١ ) ، والبخاري ( ٤ / ١٤٦ ) ، من طريق همام قال : أخبرنا أبوحمزة الضبعي فذكر الحديث ٠

بەرامبەر بە بەخشینی ئاوەکە ، ئەم شتە لە فیقهو ئامـاژەی فەموودەکەوە وەردەگیرێـت ، ئەگینا مەبەستی سەرەکی بەکارهێنانی ئاوەکەیە ٠

وقد ذكر أبونعيم وغيره من حديث أنَسٍ يَرفعه : (( إذا حُمَّ أحَدُكم ، فَلْيُرَشَّ عليهِ الماءَ البارِدَ ثلاثَ ليالٍ مِنَ السَّحَرِ ))[٣٠]

واتە : ( أنَس ) دەفەرمێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ئەگەر کەسێکتان ( تـا )ی بەرزبۆوە ، با سێ شەو لە کاتی شەبەقی بەرەبەیاندا ئاوی ساردی بە سەردا بکرێت )) ٠

وفي سنن ابن ماجة عن أبي هريرة يرفعه : (( الحُمَّى كِيرٌ مِن كِيرِ جُهَنَّمَ فَنَحُّوهَا عَنْكُمْ بالماءِ البَارِدِ ))[٣١]

واتە : ( أبي هريرة ) دەفـەرمێت : پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی : (( ( تـا ) گڕوبڵێسـەی موشەدەمەیەکە _ ئەو ئامێرەیە کە ئاسنگەر فووی پێ دەکات لە ئـاگر _ لـە موشـەدەمەکانی دۆزەخ بۆیە بە ئاوی سارد ناڕەحەتی و گەرمی لە سەر خۆتان لابەرن )) ٠

وفي المسند وغيره ، من حديث الحسن ، عن سَمُرَةَ يرفعه : (( الحُمَّى قطعةٌ مِن النَّارِ ، فأبْرِدوُها عَنْكُم بالماءِ البارِدِ ، وكان رسولُ الله ﷺ إذا حُمَّ دَعَا بِقِرْبَةٍ من ماءٍ ، فأفْرَغَهَا عَلَى رأسِه فاغْتَسَلَ[٣٢] .

---

٣٠ ـ صحيح : أورده الألباني في صحيح الجامع ( ٤٩٧ ) ، وانظر السلسلة الصحيحة ( ١٣١٠ )

٣١ ـ صحيح : أخرجه ابن ماجة ( ٣٤٧٥ ) من طريق قتادة عن الحسن عن أبي هريرة فذكره مرفوعاً ، وصححه الألباني في صحيح الجامع ( ٣١٨٩ ) ، والصحيحة ( ١٨٢٢ ) ٠

٣٢ ـ ليس في مسند أحمد ٠ ورواه الطبراني في الكبير ( ٧ / ٢٢٧ ) من حديث إسماعيل بن مسلم المكي عن الحسن عن سمرة بن جندب مرفوعاً ٠

واته : ( سَمُرَة ) دەفەرمێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( ( تا ) بەشێکە لە ئاگر ، بۆیە بە ئاوی سارد گڕو گەرمی لە سەر خۆتان سارد بکەنەوە ، دەفەرمیّ : پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ( تا )ی بەرز بوایەتەوە فەرمانی دەدا کونەیەکی ئاوی بۆ بێنن و ، ئینجا دەیکرد بە سەر سەری خوێدا و خۆی پیّ دەشت )) ۰

وفي السنن : من حديث أبي هريرة _ رضي الله عنه _ قال : ذُكِرَت الحُمَّى عِندَ رسول الله ﷺ فَسَبَّهَا رجلٌ ، فقال رسولُ الله ﷺ : (( لا تَسُبُّهَا فإنَّها تَنفِي الذُّنُوبَ ، كما تَنْفِي النَّارُ خَبَثَ الحَدِيدِ ))[٣٣]

واته: ( أبي هريرة ) _ ڕەزای خوای لێبێت _ دەفەرمێت : باسی ( تا ) کرا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ پیاوێکیش جوێنی پێدا ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( جوێنی پێمەدە چونکە تاوان پاك دەكاتەوە ، وەکو چۆن ئاگر پیسی ئاسن پاك دەكاتەوە )).

لە بەر ئەوەی کاتیّ مرۆڤ ( تا )ی لێدێت یەکسەر پەیڕەوی خۆپارێزی دەکات لە خواردەمەنیە خراپەکان و ، هەڵدەستێت بە خواردنی خۆراك و دەرمانی بەسوود ، کە ڕۆڵێکی کاریگەر دەبینێت لە پاکردنەوەی جەستەو ، کردنە دەرەوەی پیسیە زیادەکانی و ، پاکردنەوەی لە ماددە خراپەکانی و ، کارێکی ئەوتۆی تێدەکات بە هاوشێوەی کاری ئاگر کە پیسیەکانی ئاسن دەکاتە دەرەوەو ، ئاسنە پوختەکەی پاك دەکاتەوە ، بۆیە (تا ) نزیکترین شتێکە کە لە ئاگری موشەدەمەی ئاسنگەر دەچێت کە پوختەی ئاسنەکە پاك دەکاتەوە ، ئەم ئەندازەیەیە کە بەلای پزیشکانی جەستەوە زانراوە ۰

---

٣٣ _ إسناده ضعيف : أخرجه ابن ماجة ( ٣٤٦٩ ) ، وضعفه الألباني ۰ الطب النبوي ، بتحقيق أبي عبدالرحمن عادل بن سعد ۰

بـەڵام سـەبارەت بـەوەی ( تـا ) ڕۆڵـیّ هـەبێت لـە خـاوێن کردنـەوەی دڵ لـە پیسـی و گەرداوەکانی ، کارێکە پزیشکانی دڵان دەیزانن و ، بـەو جـۆرە دەبیـنن کـە پێغەمبەرەکـەیان ﷺ هەواڵی پێداون ، بەڵام ئەگەر مرۆڤ لە چاکبوونەوەی نەخۆشی دڵ نائومێد بوو ، ئەوا ئـەم چارەسەرە هیچ سوودێکی پیّ ناگەیەنێت ٠

( تا ) سوود بە دڵ و جەستە دەگەیەنێت ، بۆیە جوێن پێدانی ستەم و دژایەتی دەربڕینە. جارێکیان ( تا )م لێهاتبوو ، گوفتاری هەندیّ شاعیرم بیرکەوتەوە کە جوێنی پـیّ دەدەن و دەڵێن :

| | |
|---|---|
| زارتْ مُـــكَفِّرَةُ الذُّنوبِ وَوَدَّعَــتْ | تبّاً لهـــــا مـِن زائـــرٍ وَمُوَدِّعِ |
| قالتْ وقدْ عَزَمَتْ على تَرْحَلَهـــا | مــاذا تريدُ ؟ فقلتُ : أن لا تَرجِعي |

واتە :

| | |
|---|---|
| سەردانی کردین لابەری تاوان و ماڵئاوایی کرد | لەناوچێت چ سەردانیکارو چ ماڵئاویکارێکە |
| کاتـیّ سـوووربوو لـــە سەر ڕۆشـتن گوتی | چیت دەویّ ؟ گووتم : چیـتر نەگەڕێیتەوە |

گووتم _ ( ابن القيم ) _ تۆ لەناوچـێت چـونکە جـوێن بـە شـتێك دەدەی پێغەمبـەری خـوا ﷺجوێن پێدانی قەدەغە کردووە ٠ بەڵام ئەگەر ئەو شاعیرە بیگوتبا:

| | |
|---|---|
| زارَتْ مُكَفِّـرَةُ الذُّنوبِ لـــصَبِّهـا | أهـــلا بهـــا مِـن زائـرٍ وَمُـوَدِّعِ |
| قالَتْ وَقَدْ عَزَمَتْ عَلـى تَرْحَالِها | ماذا تريدُ ؟ فقلتُ : أن لا تُقْلَعي |

واتە :

| | |
|---|---|
| ســـەردانی کردین لابەری تاوان بە دارژان | یاخوا بە خێر بێت چ سەردانیکارو چ ماڵئاوایکارێکـە |
| کاتیّ سووربوو لــــە سەر ڕۆشتن گووتی | چیت دەویّ ؟ گووتم : هەرگیز لانەچیت و نەنشیتەوە |

شايستەتر دەبوو بۆی ، ( تا )كەش لە سەری لادەچو و دەنیشتەوە ، ئەوەبوو بە خێرا لە سەری منیش نیشتەوە ٠ لە فەرموودەیەكدا كە ( صحیح )ی و ( ضعیف )یم بۆ دەنەكەوتووە باسكراوە كە : (( حُمَّى يَوْمٍ كَفَّارَةُ سَنَةٍ ))[٣٤] واتە : (( ( تا )ی ڕۆژێك لابەری تاوانی ساڵێكە )) ، ئەمەش بە دوو شێوە لێك دەدرێتەوە:

یەكەمیان : ( تا ) دەچێتە نێو هەموو ئەندام و جومگەكانی لەشەوە ، كە ژمارەیان سێ سەدو شەصت جومگەیە ، بۆیە بە هەر جومگەیەك تاوانی ڕۆژێكی لە سەر لادەبات ٠

دووەم : ( تا ) كاریگەریەكی ئەوتۆ لە سەر جەستە بەجێ دەهێڵێت كە بە گشتی تاوەكو ساڵێك لاناچێت ، لێرەدا ئەم فەرموودەیە وەكو فەرموودەكەی تری پێغەمبەری خوا ﷺ لێك دراوەتەوە كە دەفەرمێت : (( مَنْ شَرِبَ الخَمْرَ لَمْ تُقْبَلَ لَهُ صَلاةٌ أربعينَ يوماً ))[٣٥] واتە : (( هەركەس مەی بخواتەوە چل ڕۆژ هیچ نوێژێكی لێ وەرناگیرێت )) ٠ چونكە شوێنەواری مەی لە ناخی بەندەو ، خوێنبەرو دەمارو ، ئەندامەكانی لەشیدا چل ڕۆژ دەمێنێتەوە ٠ خواش زاناترە ٠

---

٣٤ ــ ضعيف جداً : رواه تمام في فوائده ( ٢ / ١٢١ ) ، وابن أبي الدنيا في كتاب المرض والكفارات ( ١٩٥ )٠ والحديث ضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٢٧٩٦ ) : (( الحُمَّى حظ كل مؤمن من النار ، وحمى ليلة تكفر خطايا سنة مُجَرَّمة )) ٠ وانظر الضعيفة ( ٣٥٣٢ ) ٠

٣٥ ــ صحيح : أخرجه الترمذي ( ١٨٦٢ ) من طريق عبدالله بن عبيد بن عمير عن أبيه عن ابن عمر فذكره مرفوعاً ، وأخرجه أحمد ( ٢ / ٣٥ ) عن عبدالله بن عبيد بن عمير عن ابن عمر فذكره ليس فيه : عن أبيه ٠ وأخرجه أحمد ( ٢ / ١٧٦ ) والدارمي ( ٢٠٩٧ ) ، وابن ماجة ( ٣٣٧٦ ) ، والنسائي ( ٨ / ٣١٤ ، ٣١٧ ) ، وابن خزيمة ( ٩٣٩ ) من طريق عبدالله بن الديلمي عن ابن عمرو فذكره مرفوعاً ٠ والحديث صححه الألباني في صحيح الجامع ( ٢ / ٦٣ ) ٠

( أبو هريرة ) _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموویەتى : بەلامەوە ( تا ) لە هەموو ئەو نەخۆشيانەى تووشم دەبێت خۆشەويستره ، چونكە دەچێتە نێو هەموو ئەندامێكمەوەو ، هەموو ئەندامێكيش خواى پەروەردگار بەشى خۆى پاداشتى دەداتىٚ ٠

وقد روى الترمذي في جامعه من حديث رافع بن خَديج يرفعُه : (( إِذَا أَصَابَتْ أَحَدَكُمْ الْحُمَّى – وَإِنَّ الْحُمَّى قِطْعَةٌ مِنْ النَّارِ – فَلْيُطْفِئْهَا بِالْمَاءِ الْبَارِدِ ، وَيَسْتَقْبِلْ نَهرًا جَارِيًا ، فَلْيَسْتَقْبِلْ جَرْيَةَ الْمَاءِ بَعْدَ الْفَجْرِ وَقَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ ، وَلْيَقُلْ : بِسْمِ اللَّهِ اللَّهُمَّ ، اشْفِ عَبْدَك ، وَصَدِّقْ رَسُولَك ٠ وَيَنْغَمِسُ فِيهِ ثَلَاثَ غَمَسَاتٍ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ ، فَإِنْ بَرِئَ ، وَإِلَّا فَفِي خَمْسٍ ، فَإِنْ لَمْ يَبْرَأْ فِي خَمْسٍ ، فَسَبْعٌ ، فَإِنْ لَمْ يَبْرَأْ فِي سَبْعٍ فَتِسْعٌ ، فَإِنَّهَا لَا تَكَادُ تُجَاوِزُ تِسْعًا بِإِذْنِ اللَّهِ ))[٣٦]

واتە : پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : (( هەركات كەسێكتان ( تا )ى لێهات _ كە ( تا )ش بەشێكە لە ئاگر _ با بە ئاوى سارد بيكوژێنێتەوەو ، ڕوو بكات لە ڕووبارێكى لەبەر ڕۆيشتو ، دواى بەرەبەيان و پێش خۆرهەڵاتن ڕوو لە ئاراستەى ڕۆشتنى ئاوەكە بكات و ، با بڵێت : بە ناوى خوا ، پەروەردگارا ، بەندەكەت چاك بكەرەوەو ، پێغەمبەرەكەت بە ڕاست دابنىٚ و ، ئينجا سىٚ ڕۆژ بە سىٚ جار خۆهەڵكێشان خۆى لە ئاوەكە هەڵكێشێت ، ئەوا چاك دەبێتەوە ، ئەگەر چاك نەبۆوە با پێنج ڕۆژ ئەوە دووبارە بكاتەوە ، ئەگەر چاك نەبۆوە ئەوا بە حەوت ، ئەگەر بە حەوت چاك نەبۆوە ئەوا بە ئيزنى خواى تعالى لە نۆ تێپەڕ نابێت )) ٠

دەڵێم _ ( ابن القيم ) _ ئەمە لە ڕۆژانى هاوين و لە وەڵاتە گەرمەكاندا بە سوود دەبێت بە پێى ئەو مەرجانەى كە پێشتر ئامازمان پێدا ، لەو كاتەدا ئاو لە ساردترين بارێدايە چونكە لە

---

٣٦ _ ضعيف : أخرجه أحمد ( ٥ / ٢٨١ ) ، والترمذي ( ٢٠٨٤ ) كلاهما من طريق روح بن عبادة قال : حدثنا مرزوق أبو عبدالله الشامي ، قال : حدثنا سعيد _ رجل من أهل الشام _ كما في رواية أحمد قال : أخبرنا ثوبان عن النبي _ صلى الله عليه وسلم _ فذكر الحديث ٠ ولم أجده من طريق رافع بن خديج ولعله وهم من المصنف ، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٣٧٥ ) ، وانظر الضعيفة ( ٢٣٣٩ ) ٠

تیشکی هەتاوەوە بەدوورە ، هەروەها لەو کاتەدا هەموو هێزەکان بۆ مرۆڤ فەراهام بووە ، بۆ نموونە سوود لە نووستن و ، کپی و ، فێنکی هەواکە وەردگرێت و ، بەوەش بەهێزی هەموو ئەو هێزانەی بۆ کۆدەبێتەوە ، لە گەڵ بەهێزی دەرمانەکەش ، کە بریتیە لە ئاوە ساردەکەو ، کاریگەریەکی ئەوتۆ دەخەنە سەر ( تا ) کاتیەکە ، یا ( تا ) بچڕبچڕە پوختەکە ، مەبەستم بە پوورخت ئەوەیە کە هیچ ئاوسانێکی ئەندامەکانی لەشی لەگەڵدا نەبێت و ، هیچ نیشانەیەکی خراپ و ماددەیەکی بۆگەنیش لە جەستەدا نەبێت ، لەو کاتەدا هەموو ئەو هۆکارانە دەبن بە هۆی کپبوونەوەو نیشتنەوەی ( تا )کە ، بە تایبەت ئەگەر لە یەکێك لەو ڕۆژانەدا بێت کە لە فەرموودەکەدا هاتووە ، چونکە ئەو ڕۆژانە بە زۆری ( تا )کەی تێدا توند دەبێتەوە ، بەتایبەت لەو وەڵاتانەدا کە ئاماژەی پێدرا ، لەبەر شلی و نەرمی خەڵتەی دانیشتوانەکانیان و ، خێرا کاردانەوەی چاکیان بەرامبەر بە دەرمانە بە سوودەکە.

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەرکردنی سکچووندا :

### چارەسەرکردنی بە هەنگوێن :

في الصحيحين : من حديث أبي المتوكِّل ، عن أبي سعيد الخُدْرِيِّ ، (( أنَّ رجلا أتى النبيَّ ﷺ فقال : إنَّ أخي يشتكي بطنَه _ وفي رواية : استطلقَ بطنُهُ _ فقال : اسقِه عسلاً ، فذهب ثم رجع ، فقال : قد سقيتُه ، فلم يُغنِ عنه شيئاً ، وفي لفْظ : فلم يزِدْه إلا استِطلاقاً ، مرتين أو ثلاثاً ، كل ذلك يقولُ له : اسقِه عَسَلا · فقال لهُ في الثالثةِ أو الرابعةِ : صَدَقَ اللهُ ، وكذَبَ بَطنُ أخيكَ ))(٣٧)

---

٣٧ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ١٩ ، ٩٢ ) ، وعبد بن حميد ( ٩٣٨ ) ، والبخاري ( ٧ / ١٥٩ ، ١٦٥ ) ، ومسلم ( ٧ / ٢٦ ) ، والترمذي ( ٢٠٨٢ ) ، كلهم من طريق قتادة عن أبي المتوكل عن أبي سعيد الخدري فذكر الحديث ·

واتـه : ( أبـي سـعيد الخـدري ) _ خـواى لـێ ڕازى بێـت _ دهفـهرمێت : (( پياوێـك هاتـه خزمهتى پێغهمبهرى خوا ﷺ و ، گووتى : براكهم هاوار له سكى دهكات _ لـه ( ريوايـه )تێكدا : سـكى دهچـێت _ ئـهويش فـهرمووى : هـهنگوێنى بـدهرێ ، پياوهكـهش ڕۆشـت و پاشـان گهڕايـهوهو ، گـووتى : هـهنگوێنم پێدا ، هـيچ سـووديكى بـۆ نـهبوو ، لـه بێژهيهكـدا : تـهنها سكچونهكهى زياد كرد ، دووجار يا سێ جار ، له ههموو جارێكيشدا پێغهمبـهرى خـوا ﷺ پێـى دهفهرموو : ههنگوێنى بدهرێ · بهڵام بۆ سێ يهم جار يا بۆ چوارهم جار پێى فـهرموو : خـواى پهروهردگار ڕاست دهفهرمێت و ، سكى براكهت درۆ دهكات )) ·

وفي صحيح مسلم في لفظ له : (( إنَّ أخي عَرِبَ بطنُه ))

واته : واته ههرسكردنى خۆراكى خراپ بووهو ، گهدهى نهخۆش كهوتووه ·

## سوودهكانى ههنگوێن :

ههنگوێن سـودوو كـهڵكێكى يـهكجار گـهورهى تێدايـه دهتـوانين بهمانـهى خـوارهوه ڕوونـى بكهينهوه :

١. ههنگوێن پاكهرهوهى ئهو پيسيانهيه كه له خوێنبهرو گهدهو هيتريشدا كۆبۆتهوه·
٢. ههڵوهشێن و شيكهرهوهى بۆخ و شێدارهكانه ( رطوبات ) به خواردن و چهوركردن
٣. بهسووده بۆ كهسه به تهمهنهكان و كهسانى بهڵغهمدار ·
٤. به سووده بۆ ئهو كهسانهى ميزاجيان شێدارو سارده ·
٥. ههنگوێن ژێيهره نهرمكاره بۆ سروشتى مرۆڤ ·
٦. هێزى ئهو دايكانه دهپارێزێت كه شـير بـه منداڵـهكانيان دهدهن زيـاتر لـه دوو سـاڵ و شيرهكهشيان زياد دهكات ( المعاجين ) ·
٧. لابهرى چۆنيهتيهكانى دهرمانه بۆن ناخۆشهكانه ·

٨. سنگ و جگەر پاك دەكاتەوە ·

٩. ميزهێنەرە · گونجاوە بۆ ئەو كۆكانەی لە بەڵغەمەوە ڕوودەدات · ئەگەر تێكەڵ بە ڕۆنی گوڵ بكرێت و بە گەرمی بخورێتەوە ، ئەوا بۆ گەزتنی جرۆجانەوەرو ، خواردنەوەی ئەفیون بە سوودە · گونجاوە بۆ ئەو كۆكانەی لە بەڵغەمەوە ڕوودەدات ·

١٠. ئەگەر تێكەڵ بە ئاو بكرێت و بخورێتەوە بۆ گەزتنی سەگی هار بە سوودە ، هەروەها بۆ خواردنی جۆری دۆمەڵانی بكوژ بە سوودە ·

١١. ئەگەر گۆشتی نەرم و تازەو هەروەها كاليارو خەيارو كولەكەو بايجان لە نێو هەنگوێندا هەڵگريت بۆ ماوەی شەش مانگ دەيپارێزێت ·

١٢. تەرمی مردوان دەپارێزێت ·

١٣. بۆيە پێی گووتراوە پارێزەری ئاسوودەی بێ ترس ·

١٤. ئەگەر جەستەو پرچی ئەسپێونی پێ چەوەر بكرێت ، ئەوا ئەسپێ و ڕشك و كرێشكەكەی دەكوژێت ، پرچ درێژ دەكات و ، جوانی دەكات و ، نەرمی دەكات ·

١٥. ئەگەر چاوی پێ بڕێژيت ، تارێكی چاو لادەبات ·

١٦. ئەگەر ددانەكانی پێ پاك بكەيتەوە سپيان دەكاتەوەو ساف و لوسيان دەكات و ، تەندروستيان دەپارێزێت و ، پوكيش دەپارێزێت ·

١٧. دەمی خوێنبەرەكان دەكاتەوە ·

١٨. خوێنی بێنوێژی ئافرەتان زياد دەكات ·

١٩. لستنەوەی پێش نان خواردنی بەيانی بەڵغەم ناهێڵێت و ، ڕێشووەكانی نێو گەدە دەشواتەوەو ، پاشماوەكانی دەكاتە دەرەوەو ، گەرمی دەكات بە گەرميەكی مام ناوەندو ، كونيلە داخراوەكانی دەكاتەوەو ، هەمان كاريش بۆ جگەرو گورچيلەو ميزڵدان ئەنجام دەدات و ، كەمترين زيانيش بە كونيلە داخراوەكانی جگەرو سپڵ دەگەيەنێت بە بەراوردی هەموو شيرينيەكانی ديكە ·

له گەڵ هەموو ئەمانەشدا جێی متمانەیەو ، زیانی زۆر کەمە ، بەڵام بە شێوەیەکی کاتی زیان بەو کەسانە دەگەیەنێت کە زردوویان هەیە ( للصفراويين ) ، بەڵام دەتوانرێت تێکەڵ بە سرکەو شتی تری لەو جۆرە بکرێت و ، ئیتر سوودێکی زۆری بۆ دەبێت ٠

بۆیە هەنگوێن خواردنێکە لە گەڵ خواردنەکاندا ، دەرمانێکە لە گەڵ دەرمانەکاندا ، خواردنەوەیەکە لە گەڵ خواردنەوەکاندا ، شیرینە لە گەڵ حەلواو شیرینیەکاندا ، چەورکارێکە لە گەڵ چەورکارەکاندا ، دڵخۆشکارێکە لە گەڵ دڵخۆشکارەکاندا ، هیچ شتێکمان بۆ بەدینەهێنراوە لەو چاکتر بێت ، یا لەو بچێت ، یا نزیك بەو بێت ، کەسانی دیرینیش پشتیان بە هیچ شتێك نەدەست تەنها بە هەنگوێن نەبێت ٠ زۆربەی کتێبە دیرنەکان بە هیچ جۆرێك باسی شەکری تێدا نی یەو ، نەشیان دەناسی ، بەڵکو شتێکی نوێ یە ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو بەیانیەك پێش نان خواردن لێی دەخواردەوە ، ئەوەش نهێنیەکی سەرسوڕمێنی تێدایە سەبارەت بە پاراستنی تەندروستی کە جگە لە کەسە زرنگە بەڕێزەکان پەی پێ نابەن و ، بە پشتیوانی خوای تعالى لە کاتی باسکردنی ڕێبازی پێغەمبەری خوادا ﷺ لە بواری پاراستنی تەندروستیدا بە یادی دەهێنینەوە ٠

وفي سنن ابن ماجة مرفوعاً من حديث أبي هريرة : (( مَن لَعِقَ العَسَلَ ثَلاثَ غَدَوَاتٍ كلَّ شَهرٍ ، لَمْ يُصِبْهُ عَظيمٌ مَنَ البَلاءِ ))[٣٨]

واتە : لە ( أبي هريرة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ دەفەرمێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( هەرکەسێك سێ بەیانیان لە هەموو مانگێکدا هەنگوێن بلێسێتەوە ، ئەوا توشی هیچ بەڵایەکی گەورە نابێت)).

---

٣٨ _ ضعيف : أخرجه ابن ماجة ( ٣٤٥٠ ) من طريق عبدالحميد بن سالم عن أبي هريرة فذكره مرفوعاً ٠ وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٥٨٣١ ) وانظر الضعيفة ( ٧٦٢ )٠

وفي أثر آخر : (( علَيكُم بالشِفاءَيْنِ العَسَلَ والقُرآنِ ))[٣٩] واتـه : پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموويەتی : (( هەردوو چارەسەرەکە بەکار بێنن کە هەنگوێن و قورئانە )) ٠

لێردا پێغەمبەری خوا ﷺ هەستاوە بە کۆکردنەوەی نێوان پزیشکێتی مرۆڤی و پزیشکێتی خوایی ، لـە نێوان پزیشـکێتی جەسـتەو ، پزیشـکێتی ڕوح ، لـە نێـوان دەرمـانی زەمینـی و دەرمانی ئاسمانی ٠

ئەگەر ئەمە زانرا ، ئینجا بۆمان ڕووندەبێتەوە کە ئەو کەسەی پێغەمبەری خـوا ﷺ وەسـفی هەنگوێنەکەی بۆ کرد ، سکچونەکەی لە ئەنجامی زۆر خواردنێکەوە بوو کە هەموو گـەدەی پـڕ کردبوو ، ئەویش وەسفی هەنگوێنی بـۆ کـرد بـۆ پـاڵ پێوەنـانی ئـەو زیادەیـەی کۆبوبـۆوە لـە لاکانی گەدەو ڕیخۆڵەکانیدا ، چونکە هەنگوێن پاککەرەوەیەو ، ڕۆڵێکـی کاریگـەریش دەبینێـت لە پاڵ پێوەنانی زێدە خۆراکەکاندا ، گەدەی ئەو کەسەش توشی چەند خەڵتەیـەکی لیـنج بـوو ، نەیدەهێڵا خواردەمەنی لە سەر جێگیربێ لـە بـەر زۆر لینجیەکـەی ، چـونکە گـەدە ڕێشـووی هەیە وەکو قەدیفە ، بۆیە ئەگەر ئەو ڕێشووانە خەڵتەی زۆر لینجی لە سەر کۆببێتـەوە ، خراپـی دەکات و خۆراکەکەش بۆگەن دەکات ، بۆیە دەرمانەکەی بریتیە لەو دەرمانانەی کـە تێکـەڵاوە لینجەکەی لە سەر لادەبات ، هەنگوێنیش چاکترین پاکەرەوەو لابـەرە ، کـە چـاکترین دەرمـان بووە ئەم نەخۆشیەی پێ چارەسەر کرابێت ، بەتایبەت ئەگەر تێکەڵ بە ئاوی گەرم کرا ٠

## سوودی دوبارەکردنەوەی پێدانی هەنگوێن بەنەخۆش :

لە چەند جار دووبارەکردنەوەی پێدانی هەنگوێندا مانایەکی پزیشکی سەرسـوڕمێنی تێدایـە ، بریتیـە لـەوەی کـە دەرمانەکـە پێویسـتە بـڕو ، ئەندازەیـەکی هـەبێت بـە گـوێرەی بـاری

---

٣٩ ــ ضعيف : أخرجه ابن ماجة ( ٣٤٥٢ ) من طريق أبي إسحاق عن أبي الأحوص عن ابن مسعود فذكره مرفوعاً وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٣٧٦٥ ) وانظر الضعيفة ( ١٥١٤ ) ٠

نەخۆشیەکە ، ئەگەر بڕی دەرمانەکە لە نەخۆشیەکە کەمتر بوو ، ئەوا بە یەکجاری لاینابات ، ئەگەر بڕی دەرمانەکە لە نەخۆشیەکەش زیاتر بوو ، ئەوا کاریگەری خراپی دەبێت و هێز لاواز دەکات و ، زیانی تریش دروست دەکات ، بۆیە کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا هەنگوینی بداتێ ، بڕێکی پێدا بەشی بەرنگاربوونەوەی نەخۆشیەکەی نەکردو ، نەگەشتە ئاستی مەبەست ، کاتێ پیاوەکە پێغەمبەری خوای ﷺ ئاگادارکردەوە ، تێگەشت ئەو بڕەی پێی داوە نەگەشتۆتە ئاستی پێویست ، کاتێ پیاوەکە چەند جارێك هاتەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، جەختی دووبارە پێدانی هەنگوینەکەی پێ دەکرد بۆ ئەوەی بکات بەو ئەندازەیەی توانای بەرەنگاربوونەوەی نەخۆشیەکەی دەبێت ، ئەوەبوو کاتێ خواردنەوەی هەنگوینەکە دووبارە بۆوە بە گوێرەی مادەو جۆری نەخۆشیەکە ، بە ئیزنی خوای تعالی ، چاك بۆوە ، بۆیە گرنگیدان بە : بڕو ئەندازەی دەرمان ، چۆنیەتیەکانیان ، ئەندازەی هێزی نەخۆش ، نەخۆشیەکە ، لە گرنگترین یاساکانی پزیشکێتیە ٠

فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ: (( صدقَ الله وكذَبَ بطنُ أخيكَ )) ئاماژەیەکی تێدایە بۆ جێگیربوونی سودو کەڵکی دەرمانەکە ، مانەوەی نەخۆشیەکەش ناگەڕێتەوە بۆ خراپی و کورت هێنانی خودی دەرمانەکە ، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ درۆزنی سك و ، زۆریی مادە بۆگەنەکان تیایدا ، بۆیە فەرمانیدا چەند جارێك دەرمانەکەی بۆ دووبارە بکاتەوە لە بەر زۆری ئەو مادانەی لە گەدەیدا بوو ٠

پزیشکێتی پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو پزیشکێتی پزیشکانی تر نی یە ، چونکە پزیشکێتی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومانە ، کۆتای پێهێنەرە ، لە لایەن خواوەیە ، لە سروشی خواوەیە ، لە نورو ڕوناکی پێغەمبەرایەتی و ، عەقڵێکی تەواوە وەرگیراوە ، بەڵام پزیشکێتی کەسانی تر زۆربەی گومان و ، سووسەبردن و ، تاقیکردنەوەیە ، لێرەدا نکۆڵی لەوە ناکرێت کە زۆرێك لە نەخۆشەکان سودو کەڵك لە پزیشکێتی پێغەمبەرایەتی وەرناگرن ، چونکە لە ڕاستیدا ئەو کەسانە سودی لێوەردگرن کە قبوڵی دەکەن و ، بڕوایان وایە کە ئەگەر بەکاری بهێنن

نەخۆشیەکەیان چاك دەکاتەوەو ، قبوڵیشی دەکەن بەو پەڕی باوەڕو ئیمان و ملکەچیەوە ، ئەو قورئانەی کە نەخۆشیەکان لە سنگدا چاك دەکاتەوە ، ئەگەر بەو باوەڕەوە وەرنەگیرێت هەرگیز سنگەکان لە نەخۆشیەکان چاك ناکاتەوە ، بەڵکو بۆ دووڕووەکان تاوانی زیاتر دەخاتە سەر تاوانیان و ، نەخۆشی زیاتر دەخاتە سەر نەخۆشیەکانیان ، لێرەدا پزیشکێتی ئاسایی پزیشکانی جەستە هەرگیز ناگات بە ئاستی پزیشکێتی پێغەمبەرایەتی ، چونکە پزیشکێتی پێغەمبەرایەتی تەنها گونجاوی لاشە چاك و ساغەکانە ، هەروەها چاکبوونە بە قورئان تەنها گونجاوی ڕوحە چاك و ساغەکانەو ، گونجاوی دڵە زیندووەکانە بە خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی ، بۆیە ڕوو وەرگێڕانی خەڵك لە پزیشکێتی پێغەمبەر وەکو ئەوەیە ڕووی خۆیان لە چاکبوونەوە بە قورئان وەرگێڕن ، کە بێ گومان چاکترین چارەسەری بە سوودە ، ئەوەش ناگەڕێتەوە بۆ خراپبوون و کورت هێنانی دەرمانەکە ، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ بەدی سروشتی مرۆڤ و ، بۆگەنی جێگەو ، قبوڵنەبوونی . والله الموفق .

## بەشێك سەبارەت بەوە کە هەنگوێن شیفا بەخشە بە خەڵك :

جەماوەری خەڵك بە دوو بۆچوون جیاوازیان تێکەوت سەبارەت بە گوفتاری خوای تعالى ﴿ يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ ﴾ [ النحل : ٦٩ ] واتە : ﴿ يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا ﴾ لە سکی ئەو ( هەنگانەوە ) دێتە دەر ﴿ شَرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ ﴾ خواردنەوەیەك کە ڕەنگەکانی جیاوازە ﴿ فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ ﴾ کە شیفای تێدایە بۆ خەڵکی[٤٠] ، بەوەی ئایا ڕاناو لە ووشەی ( فيه )دا دەگەڕێتەوە بۆ ووشەی ( الشراب ) ، یا دەگەڕێتەوە بۆ ووشەی ( القرآن ) ؟ ڕاست : دەگەڕێتەوە بۆ ووشەی ( الشراب ) ، ئەمەش بۆچونی ( ابن مسعود ) و ( ابن عباس ) و ( الحسن ) و ( قتادة ) و ، زۆرینەیە ، چونکە ئەمە باسکراوەو ، مەبەستی ئایەتەکەش ئەوەیە کە چاکبوونەوە لە ووشەی ( الشراب )دایە کە مەبەستی هەنگوێنەکەیە ،

٤٠ ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان .

بەڵام لە ئایەتەکەدا باسی قورئان نەکراوە ، فەرمووده ( صحیح )ەکەی سەرەوەش کە پێغەمبەری خوا ﷺ تیایدا دەفەرمێت : (( صَدَقَ الله )) ئاشکەرایە کە مەبەستی هەنگوێنەکەیە ٠ والله تعالی أعلم٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشی چاوەقوڵەداو ( الطاعون ) ، چارەسەرکردنی و چونیەتی خۆپاراستن لەم نەخۆشیە :

في الصحيحين عن عامر بن سعد بن أبي وقاص ، عن أبيه ، أنه سَمِعَهُ يسألُ أسامةَ بن زيدٍ : ماذا سمعتَ من رسول الله ﷺ في الطاعونِ ؟ فقال أسامةُ : قال رسول الله ﷺ (( الطاعونُ رِجزٌ أرسِلَ على طائفةٍ من بني إسرائيلَ ، و على من كان قبلكم ، فإذا سَمِعتُم به بأرضٍ فلا تدخلوا عيه ، وإذا وقعَ بأرضٍ وأنتم بها فلا تخرُجُوا فرارا مِنهُ ))[٤١] ٠

واته لە ( عامر )ی کوڕی ( سعد )ی کوڕی ( أبي وقاص )ەوە ، کە کوێبیستی بابی بوو لە ( أسامة )ی کوڕی ( زید )ی دەپرسی : سەبارەت بە نەخۆشی چاوەقوڵە چیت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوو ؟ ( أسامة )ش فەرمووی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( نەخۆشی چاوەقوڵە سزایەکە نێردرا بۆ کۆمەڵێك لە ( بني إسرائيل )و ، ئەوانەی پێشی ئێوە ، بۆیە هەرکات گویستی بڵاوبوونەوەی بوون لە زەویەکدا ڕوویداوە ، مەچنە ئەو جێگەیە ، ئەگەر لە زەویەکیشدا ڕوویداو ئێوەی تیابوو ئەوا لەو زەویە دەرمەچن وەکو هەڵهاتنێك لە نەخۆشیەکە )) ٠

٤١ ــ صحيح : أخرجه مالك في موطئه ( ٥٥٨ ) ، والحميدي ( ٥٤٤ ) ، وأحمد ( ٥ / ٢٠٠ ، ٢٠٢ ، ٢٠٧ ، ٢٠٨ ) ، والبخاري ( ٤ / ٢١٢ ) ، ومسلم ( ٧ / ٢٦ ، ٢٧ ) ، والترمذي ( ١٠٦٥ ) ، كلهم من طريق عامر بن سعد عن أبيه فذكره ٠

وفي الصحيحين أيضا : عن حَفصَةَ بنت سِيرينَ ، قالت : قال أنسُ بن مالكٍ : قال رسول الله ﷺ : (( الطَّاعُونُ شهادةٌ لكلِّ مُسْلِم ))(٤٢)

واته : ( أنس )ى كوڕى ( مالك ) _ خواى لىّ ڕازى بيّت _ دەفەرميّت : پيّغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : (( نەخۆشى چاوەقوڵە شەهيديە بۆ هەموو موسڵمانيّك )) ٠

## تاعون چى يە ؟

نەخۆشى چاوەقوڵە ( الطاعون ) لە ڕووى زمانەوە : جۆريّكە لە پەتا ، خاونى كتيّبى( الصحاح ) ئەمەى فەرمووە ٠ بەلاى پزيشكانيشەوە : ئاوسانيّكى پيسى بكوژە لە گەڵيدا گڕيّكى توندى زۆر بە ئيّش دەردەچيّت كە لە ئەندازە بەدەر دەبيّت ، بە زۆرى دەوروبەريشى ڕەش يا سەوز ، يا تاريك و ديّز دەبيّت ، لە ئەنجاميشدا بە خيّرايى بۆ برين و زام و كيّم دەگۆڕيّت ، بە زۆريش ، لە سىّ جيّگەدا دەردەكەويت : بن هەنگڵ ، پشتەوەى گوىّ ، سەرەوەى لووت ( الأرنبة ) ، ولە گۆشتە نەرم و شلەكاندا ٠

وَفِي أَثَرٍ عَنْ عَائِشَةَ : أَنَّهَا قَالَتْ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : الطَّعْنُ قَدْ عَرَفْنَاهُ ، فَمَا الطَّاعُونُ ؟ (( قَالَ غُدَّةٌ كَغُدَّةِ الْبَعِيرِ يَخْرُجُ فِي الْمَرَاقِّ وَالْإِبْطِ ))(٤٣)

واتە : خاتوو ( عائشة ) _ خواى لىّ ڕازى بيّت _ لە پيّغەمبەرى خواى ﷺ پرسى : دەزانين ( الطعن ) واتە : ليّدان و پياچەقان چى يە ، ئەى ( الطاعون ) چى يە ؟ ئەويش فەرمووى : (( لوويەكە بە هاوشيّوەى لووى ووشتر لە شويّنانى ورگ و سك و بن هەنگڵدا دەردەچيّت )) ٠

---

٤٢ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ١٥٠ ، ٢٢٠ ، ٢٢٣ ، ٢٥٨ ، ٢٦٥ ) ، والبخاري ( ٤ / ٥٩ ) ، ومسلم ( ٦ / ٥٢ ) كلهم من طريق عاصم بن سليمان الأحول عن حفصة بنت سيرين عن أنس فذكره مرفوعاً٠

٤٣ _ إسناده صحيح : أخرجه أحمد ( ٦ / ١٣٣ ، ١٤٥ ، ٢٥٥ ) عن عائشة فذكرته ٠

پزیشکان دەڵێن : ئەگەر دومەڵ لە گووشتە نەرم و شلەکان و ، بن هەنگل و شوێنە پێچ و پەنای جەستەو ، پشتەوەی گوێ و سەروەی لووت ( الأرنبة ) دەرچوو ، لە ڕەگەزێکی بۆگەنیش بوو ، بە چاوەقوڵە ناو دەبرێت ، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ خوێنێکی پیس مەیلی گەنین و خراپبوون دەکات و ، دەگۆڕێت بۆ ناوەڕۆکێکی ژەهرین بە جۆرێك ئەو ئەندامەی لەش بۆگەن و خراپ دەکات و گۆڕنکاری دەهێنێت بە سەر ئەندامەکانی دەوروبەریشیدا ، ڕەنگە خوێن و کێمیشی لێ بتکێت و ، چۆنیەتیەکی خراپیش بۆ دڵ بەرێت و ، ڕشانەوەو دڵە کوتێ و بورانەوە بۆ نەخۆش دروست بکات ، ئەگەچی ناوی تاعون گشتی یە بۆ هەموو ئاوسانێك کە چۆنیەتیەکی خراپ بۆ دڵ بنێرێت و دەرەنجام بگاتە ئاستی کوشتن ، بەڵام لە بنچینەدا تایبەتکراوە بەو گۆشتە لووەی لە جەستەدا دێتەدەر ، چونکە ئەوەندە خراپە هیچ ئەندامێکی لەش قبوڵی ناکات تەنها ئەو شوێنانە نەبێت کە زۆر لاوازە بە سروشت ، لە هەمووشیان خراپتر ئەو جۆرانەیە کە لە بن هەنگڵ و پشتەوەی گوێدا دێتەدەر لە بەر زۆر نزیکیان لە ئەندامە گرنگەکانەوە کە سەرە ، لە هەمووشیان بێوەی تر جۆرە سورەکانە ، پاشان زەردەکانە ، بەڵام جۆرە ڕەشەکان هیچ کەس لێی ڕزگاری نابێت ٠

لە بەر ئەوەی تاعون لە کاتی پەتادا زۆر دەبێت ، لەو وەڵاتانەدا کە دەرداویەو نەخۆشی زۆرە ، بۆیە ناوی بە پەتا بڵاوبۆتەوە وەکو ئەوەی ( الخليل ) دەفەرمێت : پەتا : واتە تاعون ٠ گوتراویشە : هەموو نەخۆشیەکە بڵاوبێتەوەو هەموو خەڵك تووشی بن ٠

بەڵام بۆ سەلماندن دەڵێین لە نێوان پەتاو تاعوندا گشتی و تایبەت هەیە ، بۆیە هەموو تاعونێك پەتایە ، بەڵام هەموو پەتایەك تاعون نی یە ، هەروەها نەخۆشیە گشتی یەکان لە تاعون گشتی ترە ، چونکە تاعون تەنها یەکێکە لە نەخۆشیە گشتی یەکان ، تاعونیش بریتیە لە دومەڵ و برین و زام و ئاوسانێك لەو شوێنانەدا دێتەدەر کە باسکران ٠

## شوێنەوارەكانی تاعون :

دەڵێم _ ( ابن القيم ) _ ئەم برين و زام و ، ئاوسان و ، دومەڵانە ، شوێنەواری تاعونن و خودی تاعون نين ، بەڵام لە بەر ئەوەی پزيشكان تەنها شوێنەوارە ڕووكەشەكەی دەزانن ، بۆيە ئەوانەی سەرەوەيان كردووە بە خودی تاعون ٠

## كەچی ناوی تاعون بۆ سێ شت بەكار دێت :

**يەكەميان** : ئەو شوێنەوارە دەركەوتووانەی لە ڕووكەشدا ديارن و پزيشكان باسيان كردووە.

**دووەم** : ئەو مردنەی بە هۆی ئەوەوە ڕوو دەدات ، ئەمەش مەبەستە بەو فەرموودە ( صحيح )ەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمێت : (( الطاعونُ شَهادةٌ لكلِّ مَسلمٌ )) واتە : (( تاعون شهيديە بۆ هەموو موسڵمانێك )) ٠

**سێيەم** : ئەو هۆيەی كە لە پێناويدا ئەم نەخۆشيە نێردراوە ، لە فەرموودە ( صحيح )ەكەدا هۆی ناردنی هاتووە كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمێت : (( بقيةُ رِجزٍ أُرسَلَ على بَني إسرائيلَ ))[٤٤] واتە : (( پاشماوەی سزايەكە نێردراوە بۆ ( بني إسرائيل ) )) وورد فيه : (( أنهُ وَخْزُ الجنِّ ))[٤٥] واتە : (( تێوەژەنينی جنە )) ، وجاء : (( أنهُ دَعوةُ نبيّ ))[٤٦] واتە : (( نزاليكردنی پێغەمبەرێكە ))٠

---

٤٤ _ تقدم تخريجه ٠

٤٥ _ صحيح : رواه أحمد ( ٤ / ٣٩٥ ) ورواه الطبراني في المعجم الصغير ( ١ / ٩٥ ) بلفظ (( وخز أعدائكم من الجن )) عن أبي موسى ، وصححه الألباني في صحيح الجامع ( ٣٩٥١ ) ، وانظر الضعيفة ( ١٨٦ ) ، والإرواء ( ١٦٣٧ ) ، ( ١٦٣٨ ) ٠ وفي صحيح الجامع ( ٣٩٤٦) وحسنه الألباني : (( الطاعون شهادة لأمتي ، ووخز أعدائكم من الجن ··· )) ، وانظر الصحيحة ( ١٩٢٨ ) ٠

## ڕوونكردنەوەی كارتێكردنەكانی جن لە نەخۆشی تاعونداو _ چۆنیەتی لادانی

هـیچ شـتێك بـەلای پزیشـكانەوە نـی یـە بـۆ ئـەوەی بتـوانن هۆكارەكـانی دروسـتبوونی نەخۆشیەكە لابەرن ، یا توانـای دەستنیشـانكردنی هـۆی سـەرەكی نەخۆشیەكەیان هـەبێت ، پێغەمبەرانیش هەواڵی كارە نادیارەكەنمان دەدەنـیٚ ، هیچیشـیان بەدەسـتەوە نـی یـە نكـۆڵی لەوە بكات كە ئەو نەخۆشیانە بە هۆی كاری ڕوحـە خراپەكانـەوە نـەبێت ، چـونكە كاریگـەری ڕوحە خراپەكان لە سروشت و ، نەخۆشیەكان و ، فەوتاندنی مرۆڤ شتێكە هـیچ كـەس نـاتوانیٚ نكۆڵی لێبكات ، بەدەر لە كەسانی نەفام بە ڕوحە خراپەكان و كاریگەریەكانی و ، كاردانـەوەی جەستەو خوو سروشتی مرۆڤ بەرامبەر بەو كاریگەریانـە ، پێدەچـیٚ خـوای پـەروەردگار ڕێگـە بەم ڕوحە خراپانە بدات هەندیٚ تەصـەروف بـە جەسـتەی مرۆڤـەوە بكـەن لـە كـاتی ڕوودانـی پەتاو ، خراپبوونی هەوادا ، هەروەها ڕێگەی پێدەدا تەصروف بـە هەنـدیٚ مـادە خراپەكانـەوە بكات كە شێوازێكی خراپ بۆ جەستە دروست دەكات ، بەتایبەت لە كـاتی وروژانـی خـوێن و ( المـرَّةُ السـوداء )و ، لـە كـاتی وروژانـی ئـاوی نێرینـەدا ، لێـرەدا ڕوحـە خراپـە شـەیتانیەكان ڕۆڵێكی گاریگەر دەبینن بۆ هاندنی خـاوەنی ئـەم ڕوداوانـە بـۆ ئەنجامـدانی كردەوەكانیـان كـە هەرگیز تواناى هاندانی كەسانی ئاسایی دیكەی نی یـە هـەمان ئـەو كردەوانـە ئـەنجام بـدەن ، بۆیە پێویستە كەسەكان پاڵنەرێكی زۆر بەهێزی تر بەكاربێنن بۆ لادانـی كاریگـەری ئـەو ڕوحـە خراپانـەو ، لـە هـەمان كاتیشـدا دەتـوانن كـردەوە چـاكەكان كـە بریتیـە لـە زیكـرو ، دوعـاو ، پاڕانەوەو ، بەخشین و ، خوێندنی قورئان بەكاربێنن بۆ دابەزاندنی ڕوحی فریشـتە چاكەكان و بەزاندنی ڕوحە خراپەكان و ، پوچكردنەوەی شەڕیان و ، دووخستنەوەی كاریگەریان ٠

ئێمە_ ( ابن القیم ) _و كەسانی دیكەی جگە لە ئێمەش ئـەوەمان چـەندین جـار كـە خـوای تعـالی نـەبێت هـیچ كـەس ژمارەیـان نازانێـت تـاقیی كردۆتـەوەو ، بۆمـان دەركـەوتووە كـە دابەزاندنی ئەم ڕوحە چاكانەو لە خـۆ نزیكردنـەوەی كاریگەریـەكی ئیجـابی گـەورەی هەیـە بـۆ

---

٤٦ _ لم أجده ٠

بەهێزکردنی سروشت و ، دوورخستنەوەی مادە خراپەکان ۰ بەڵام دەبێت ئەو کردارە پێش پتەوبوون و قایمبوونی نەخۆشیەکە لە لەشدا ئەنجام بدرێت و ، لە کاتێکدا بێت بتوانرێت کاری تێبکرێت و کون بکرێت ، بۆیە هەرکەس خوای پەروەردگار سەرکەوتووی بکات ، ئەوا لە کاتی هەست کردنیدا بە هۆکارە خراپەکان یەکسەر پەنا دەباتە بەر بەکارهێنانی هۆکارە چاکەکان بۆ لە خۆ دوورخستنەوەی ، ئەمەش چاکترین دەرمانە بۆی ، بەڵام ئەگەر خوای تعالی ویستی بەجێهێنانی قەدەرو چارەنووسی خۆی هەبێت ، دڵی بەندەکەی خۆی بەرامبەر بە ناسین و بەبیرداهاتن و داواکردن و بەکارهێنانی هۆکارە چاکەکان بێئاگا دەکات و ، چیتر هەستی پێ ناکات و ، نایەوێت بەکاری بێنێت ، ئەو کاتە خوای پەروەردگاریش فەرمانی خۆی لە سەر بەندەکەی جێبەجێ دەکات ۰

پاشان ــ إن شاء الله ــ ئەم مانایە بە درێژی باس دەکەین لە میانەی باسەکەماندا سەبارەت بە خۆ چارەسەرکردن بە نووشتەو ، پەناگرتنەکانی پێغەمبەرایەتی و ( العوذ النبوية ) ، زیکرو ، نزاو ، بەخشیندا ، لەوێشدا ڕوونی دەکەینەوە کە بەراوردکردنی پزیشکێتی پزیشکان بە پزیشکێتی پێغەمبەر ، وەکو بەراوردکردنی پزیشکێتی سۆفی و بەساڵاچوانە بە پزیشکێتی ئەوان ، وەکو ئەوەی زیرەکەکان و پێشەواکانیان دانیان پێدا ناوە ، هەروەها ڕوونی دەکەینەوە کە سروشتی مرڤایەتی بەهێزترین شتێکە کە کاردانەوەی خۆی هەیە بەرامبەر بە ڕوحەکان ، وە هێزی پەناگرتنەکان و ، نووشتەو ، نزاکان ، لە سەرووی هەموو هێزێکەوەیە ، تا ئەو ئاستەی هێزی ژەهرە کوشندەکانیش پوچ دەکاتەوە.

مەبەستیش ئەوەیە کە : خراپبوونی هەوا بەشێکە لە بەشەکانی هۆی تەواو ، کە تاعون دروست دەکات ، چونکە خراپبوونی ناوەڕۆکی هەوا هۆیەکی کاریگەری دروستبوونی پەتاو بۆگەن بوونیەتی ، چونکە ناوەڕۆکی ئەو هەوایە دەگۆڕێت و یەکێك لە چۆنیەتیە خراپەکانی بە سەردا زاڵ دەبێت وەکو گەنین و ، بۆنکردن و ژەهراوی بوون لە هەر کاتێکدا بێت لە کاتەکانی ساڵ ، ئەگەچی زۆرترین ڕوودانی لە کۆتایی هاویندایە ، هەروەها

له پایزیشیدا بەزۆری ڕوودەدات بەهۆی کۆبوونەوەی پاشماوە تاڵ و سەختە تیژەکان و هیتریش لە هاویندا و، شینەبوونەوەی لە کۆتایدا، هەروەها لە پایزیشدا ڕوودەدات بە هۆی ساردبوونی هەوا، قورپاویبونی بۆخ و شێ و ئەو پاشماوانەی کە لە وەرزی هاویندا شی دەبۆوە، دەرەنجام پەنگ دەخواتەوەو، گەرم دەبێت و، بۆگەن دەبێت و، ئینجا نەخۆشی بۆگەن دروست دەکات، بە تایبەت ئەگەر ڕێکەوتی جەستەیەکی ئامادەبووی، گونجاوی، خاوی، سستی، کەم جوولەی، زۆر مادە بوو، ئەوجا ئەم جۆرە مرۆڤە بە زۆری دەفەوتیت و تووش دەبێت ٠

تەندروستیترین وەرزیش لەم بوارەدا وەرزی بەهارە ٠ ( أبقراط )[٤٧] دەڵێت : زۆرترین نەخۆشیەکان و، کوشندەترینیان، لە وەرزی پایزدایە، بەڵان وەرزی بەهار، تەندروستیترین وەرزەکانەو لە هەمووشیان کەمتر مردنی تێدا ڕوو دەدات، بۆیە لە وەرزەکانی بەهارو هاویندا دەرمانسازان و، ئامادەکاری مردووان خۆیان ئامادەدەکەن و قەرزیش دەکەن بۆ کۆکردنەوەی دەرمانە پێویستەکان بۆ ئەوەی لە وەرزی پایزدا بەکاری بێنن، لێرەدا وەرزی پایز وەکو بەهاری ئەمانە چونکە ئیش و کاریان زۆر دەبێت، بۆیە بیری دەکەن و، بە هاتنی دەڵخۆشیش دەبن ٠

وقد روى في حديث : (( إذا طَلَعَ النَّجْمُ ارْتَفَعَت العاهَةُ عن كلِّ بَلَدٍ ))[٤٨]

واتە : لە فەرموودەیەکدا هاتووە : (( هەرکات ئەستێرەکە هەڵهات ئەوا دەردو نەخۆشی لە سەر هەموو وەڵاتێك بەرز دەبێتەوەو نامێنێت )) ، ئەستێرەی نێو ئەم فەرموودەیە بە کۆمەڵە

---

٤٧ ــ لە بەناوبانگترین پزیشکەکانی یونانەو، ساڵی ( ٣٧٧ )ی پێش زاین مردووە ٠

٤٨ ــ أسناده ضعيف : أخرجه أحمد ( ٢ / ٣٤١ ، ٣٨٨ ) من طريق وهيب قال : حدثنا عِسْل بن سفيان ، عن عطاء بن أبي رباح عن أبي هريرة فذكره مرفوعاً ٠ فيه عسل بن سفيان وهو ضعيف ٠

ئەستێرەی ( الثریا )[٤٩] لێکدراوەتەوە ، هەروەها بە دەچوونی ڕووەك لە وەرزی بەهاردا لێك دراوەتەوە ، لەم بارەشەوە خوای تعالی دەفەمێت : ﴿ وَالنَّجْمُ وَالشَّجَرُ يَسْجُدَانِ ﴾ [ الرحمن : ٦] واتە : ئەستێرەو گژوگیاو درەخت ( بۆ خوا ) سوژدە دەبەن [٥٠] چونکە دەرچوونی تەواوی لە وەرزی بەهاردایەو ، ئەو وەرزەشە کە نەخۆشی و دەردو بەڵای تێدا نامێنێت.

بەڵام لە بارەی کۆمەڵە ئەستێرەی ( الثریا )وە ، لە گەڵ هەڵهاتنی لە بەرەبەیاندو لە ئاوابوونیدا نەخۆشیەکان زۆر دەبن ٠

( التَّمِيمِيُّ ) لە کتێبی (( مادة البقاء ))دا دەڵێت : خراپترین کاتەکانی ساڵ ، کە گەورەترین دەردو بەڵا بە سەر جەستەدا دێنێت دوو کاتە :

یەکەمیان : کاتێ کۆمەڵە ئەستێرەی ( الثُریا ) بەرەو ئاوابوون دەچێ لە کاتی دەرکەوتنی بەرەبەیاندا ٠ دووەمیان : کاتی هەڵهاتنی لە ڕۆژهەڵاتەوە پێش دەرکەوتنی خۆر بە سەر جیهاندا ، لە شوێنگەیەك لە شوێنگەیەك مانگدا ( منازل القمر )[٥١] ، کە بریتیە لە کاتی تێپەڕبوونی وەرزی بەهارو کۆتایی هاتنی ، بەڵام ئەو خراپی و نەخۆشیانەی لە کاتی هەڵهاتنیدا ڕوودەدن زیانی کەمترە لەو خراپی و نەخۆشیانەی لە کاتی ئاوابوونیدا ڕوودەدات.

---

٤٩ ــ الثریا : کۆمەڵە ئەستێرەیەکی پرشنگدارە لە نێو گەردەنی ئەستێرەی گادا ، بۆیە واناونراون چونکە لە ڕووبەرێکی زۆر کەمدا ئەستێرەیەکی زۆر کۆبونەتەوە ، بڕوانە : عبدالله جبار ، فەرهەنگی شارا ٠ وەرگێر ٠

٥٠ ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

٥١ ــ شوێنگەی مانگ : مەوداو شوێن و ڕێڕەوی مانگە ، بریتیە لە ڕێڕەوی مانگ کە پێیاندا دەڕواو بە دەوری زەویدا دەخولێتەوە ، هەرشەوە لە ڕێڕەوێکیاندایەو هەڵە ناکات و بەمو لە ڕێڕەوی خۆی لانادات ، مانگ بیست شوێنگەی هەیەو ، هەر شوێنگەیەکیش ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە وەکو : ( السرطان ، البطین ، الثریا ، الدّبران ٠٠٠ ) ، بڕوانە : مەلا محمودی کەلالەیی ، قامووسی ڕستە ٠ وەرگێڕ ٠

( أبومحمد )ى كوڕى ( قتيبة ) دەڵێت : گووتراوە : هەر كاتێك كۆمەڵە ئەستێرەى ( الثريا ) هەڵهاتوەو ئاوابووە مەگەر ( إلا ) دەردو نەخۆشيەك لە نێو خەڵكى و ووشتردا بڵاوبۆتەوە ، بەڵام لە كاتى ئاوابوونيدا نەخۆشى و دەردەكان زياترو توندتر دەبنەوە بە بەراوردى هەڵهاتنى

سەبارەت بە فەرموودەكە گوفتارێكى سێ يەم هەيەو _ پێدەچێ شايستەترين گوفتارەكانيش بێت _ : كەوا مەبەست بە ووشەى ( النجم ) ئەستێرەى ( الثريا ) بێت بەڵام مەبەست بە ووشەى ( العاهة ) ئەو دەردو بەڵاو نەخۆشيانە بێت كە تووشى ڕووەك و كشتوكاڵ و بەروبوومەكان دەبێت لە وەرزى زستان و سەرەتاى وەرزى بەهاردا ، بۆيە مرۆڤ لە كاتى هەڵهاتنى ئەستێرەى ( الثريا )دا بێوەى دەبێ ، بەتايبەت لە كاتە ئامازەپێكراوەكاندا ، بەو هۆيەوە پێغەمبەرى خوا ﷺ قەدەغەى فرۆشتن و كڕينى بەروبوومى كردووە پێش دەركەوتنى چاكيەتيەكەى · مەستيش : دووانە سەبارەت بە ڕێبازى پێغەمبەرى خوا ﷺلە كاتى ڕوودان و بڵاوبوونەوەى تاعوندا ·

## بەشێك : پێغەمبەرى خوا ﷺ قەدەغەى چوونە نێو ئەو زەويانەى كردووە كە تاعونى تێدا بڵاوبۆتەوە يا دەرچوون لەو زەويانەى كە تاعونى تێدا بڵاوبۆتەوە :

پێغەمبەرى خوا ﷺئومەتەكەى خۆى قەدەغە دەكات بچنە نێو ئەو كۆمەڵگايانەوە كە تاعونيان تێدا بڵاوبۆتەوە يا لە كۆمەڵگايەك بچنە دەرەوە پاش بڵاوبوونەوەى تاعون تيايانـدا ، بۆ ئەوەى بە تەواوى خۆيان لەو نەخۆشيە بپارێزن ، چونكە چونە نێو ئەو كۆمەڵگايانەوە كە تاعونيان تێدا بڵاوبۆتەوە ماناى خۆ تووشكردنە بەو دەردو بەڵايەو ، خۆ خستنە نێو شوێنێكيشەوەيە كە جێگەى فەرمانڕەواى نەخۆشيەكەيەو ، يارمەتيدانى نەفسيشە بۆ تووشبوون بەو نەخۆشيە ، ئەمەش پێچەوانەى شەرع و ئەقڵ و ژيريە ، بەڵكو خۆ

دوورخستنەوە لەو شوێنانەی نەخۆشیەکەی تێدا بڵاوبۆتەوە گوێڕایەڵی خوای پەروەردگارە کە فەرمانی بە خۆپارێزی کردووە لە هەندێ شوێن و ، هەوای زیانبەخش ٠

## مانای قەدەغەکردنی دەرچوون لەو وەڵاتە :

بەڵام کە قەدەغەی چوونە دەرەوە دەکات لەو شوێنەی نەخۆشیەکەی تیایدا بڵاوبۆتەوە ، دوو مانای تێدایە :

یەکەمیان : هاندانی نەفسە بۆ باوەڕبوونی تەواو بە خوای تعالی ، پشت پێ بستنیی ، ئارامگرتن لە سەر قەدەرو حوکم و چارەنووسی و ، پێ ڕازیبوونی ٠

دووەم : ئەوەیە کە پێشەوایانی پزیشکێتی گوتوویانە : بەوەی پێویستە هەموو کەسێکی خۆپارێز لە پەتا ، هەوڵی دەرهێنانی بۆخ و شێدارە ( الرطوبات ) زیادەکانی لەشی بدات و ، خۆراك کەم بکاتەوەو ، حەزی بە چارەسازی توند ( التدبیر المجفّف ) بێت لە هەموو ڕوویەکەوە ، بەدەر لە وەرزش و خۆشتن ، کە پێویستە مرۆڤ وریایان بیت ، چونکە بە زۆری جەستە بەتاڵ نابێت لە زیادە مادەیەکی خراپ کە تیایدا دەمێنێتەوەو ، پاشان وەرزش و خۆشتن دەیانوروژێنێت و ، لە گەڵ کیمۆسی [٥٢] باشدا تێکەڵیان دەکات و ، بەوەش مرۆڤ تۆشی نەخۆشیەکی گەورە دەبێت ، بۆیە لە کاتی بڵاوبونەوەی تاعوندا پێویستە مرۆڤ سرەوتن و لە سەرخۆیی خۆی زیاد بکات و ، ئارامپێدانێکی تەواو بدات بە هەڵچونی تێکەڵاوەکانی لەشی ، لە لایەکی تریشەوە چوونە دەرەوە لەو شوێنەی پەتاکەی تێدا بڵاوبۆتەوەو سەفەرکردن پێویستی بە جوڵانەوەیەکی بەهێزەو ، ئەمەش زیانێکی گەورە بە جەستە دەگەیەنێت ، ئەمە گوفتاری چاکترین پزیشکانی پاشینانە ، بەمەش مانای پزیشکێتی

٥٢ ــ کیمۆس : مادەیەکی شیری یەو لە خواردنەوە پەیدا دەبێ ، ئامادەیە بۆ هەڵمژین و ، ڕیخۆڵەکان لە کاتی تێپەڕینیدا هەڵی دەمژن ٠ بڕوانە : پزگار کریم ، فەرهەنگی دەریا ، وەرگێڕ ٠

تەواو لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاشکەرا دەبێت و ، ئەو چارەسەرەی تێیدایە بۆ دڵ و جەستەو چاکبوونیان .

ئەگەر گوترا : فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ: (( لا تخرجوا فِراراً مِنهُ )) واتە : (( لێی دەرمەچن وەکو هەڵاتنێك لە نەخۆشیەکە )) ، گوفتارەکانی ئێوە پووچ دەکاتەوە کە گوایە مەبەست بە فەرموودەکە ئەوە بێت کە لە سەروە ئاماژەتان پێدا ، چونکە فەرموودەکە قەدەغەی چوونە دەروە ناکات لە بەر ڕووداوێکی ناکاو ، هەروەها کەسی موسافیر قەدەغە ناکات لە سەفەرەکەی؟

بەو کەسە دەگوترێت : هیچ کەسێك نەیگووتوە _ پزیشك بێت یا کەسیکی تر _ خەلکی واز لە جوڵانەوە بێنن لە کاتی بڵاوبونەوەی تاعونداو ، خۆیان بکەن بە شتیکی بێ روح و گیان ، بەڵکو پێویستە بە پێی توانا جوڵانەوەی خۆی کەم بکاتەوە ، چونکە کەسی هەڵاتوو تەنها مەبەستی هەڵاتنە ، کەچی ئەگەر سرەوتن و لە سەرخۆیی بەکاربێنێت و هەڵنەیەت سوودێکی زۆری بۆ دڵ و جەستەی دەبێت و ، پشتبەستنێکی تەواویشی بۆ دەستەبەر دەبێت و ، بە تەواوی ملکەچی قەدەرو چارنووسی خوای تعالاش دەبێت . بەڵام سەبارەت بەو کەسانەی ناتوانن واز لە جوڵانەوە بێنن وەکو پیشەکاران و ، کرێکاران و ، مسافیران و ، دروستکاری جل و ، کەسانی دیکە ، پێیان ناگوترێت بە تەواوی واز لە جوڵانەوەکانتان بێنن ، ئەگەرچی فەرمانیان پێ دەکرێت واز لە جوڵانەوە ناپێویستەکان بێنن ، وەکو جوڵانەوەی موسافیر بۆ هەڵهاتن . خوای تعالاش زاناترە .

کاتێ قەدەغەی چوونە نێو ئەو شوێنانە کراوە کە نەخۆشیەکەی تێدا بڵاوبۆتەوە ، ئەمە چەند دانایی و حیکمەتێکی تێدایە :

یەکەم : خۆ دوورخستنەوە لە هۆی زیانبەخش .

دووەم : وەرگرتن و دەستگرتن بە تەندروستیەوە کە هۆکاری بژێوی و ژیان و گەڕانەوەیە.

سىَ يەم : بۆ هەڵنەمژینی ئەو هەوایەی كە بۆگەن و خراپبووە ئەگینا نەخۆش دەكەون ٠

چوارەم : بۆ خۆ نزیك نەكردنەوە لەو كەسانی بەو نەخۆشیە نەخۆش كەوتوون ، ئەگینا ڕەگەزی نەخۆشیەكانی ئەوانیان تووش دەبێت ٠

وفي سنن أبي داود مرفوعاً : (( إنَّ مِن القرفِ التلفَ ))(٥٣)

واتە : (( خۆ نزیككردنەوە هۆكاری تووشبوونە بە زیان )) ، ( ابن قتیبة ) دەڵێت : ووشەی ( القرفُ ) واتە نزیكبوونەوە لە پەتاو ، نزیكبوونەوە لە نەخۆش ٠

پێنجەم : پاراستنی نەفس لەوەی بە نیشانەی شوم و بەدی دادەنرێت و ، خۆپاراستن لە تەنینەوەو بڵاوبونەوەی نەخۆشی ، چونكە شوم و بەدی بۆ كەسێكە شتكە بە شوم و بەد دابنێت ٠

بە گشتی كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی چوونە نێو ئەو شوێنە دەكات واتە فەرمان بە وریایی و خۆپاراستن دەكات و ، قەدەغەی خۆ تووشبوون دەكات بە هۆكارەكانی زیان پێگەشتن٠ كاتێكیش قەدەغەی هەڵهاتن دەكات واتە فەرمان بە پشتبەستن و ، ملكەچبوون و ، كاروباری خۆ سپاردن دەكات بە خوای تعالى ، بۆیە باری یەكەم : ئەدەبدان و فێركردنە ، باری دووەمیش : ملكەچبوون و كاروباری خۆ سپاردنە بە خوای تعالى ٠

وفي الصّحيح : أنّ عمر بن الخطّاب _ رضي الله عنه _ خرج إلى الشّام ، حتّى إذا كان بسرغ لقيه أبو عبيدة بن الجرّاح _ رضي الله عنه _ وأصحابه ، فأخبروه أنّ الوباء قد وقع بالشّام ، فاختلفوا ، فقال لابن عبّاس رضي الله عنهما : ادع لي المهاجرين الأوّلين ، قال : فدعوتهم ، فاستشارهم وأخبرهم أنّ الوباء قد وقع بالشّام ، فاختلفوا ، فقال له بعضهم : خرجت لأمر ، فلا نرى أن ترجع عنه ، وقال آخرون : معك بقيّة النّاس وأصحاب رسول الله ﷺ

---

٥٣ _ إسناده ضعيف : أخرجه أبوداود ( ٣٩٢٣ ) ، وأحمد ( ٣ / ٤٥١ ) وضعفه الألباني في الضعيفة ( ١٧٢٠ )٠

فلا نرى أن تقدّمهم على هذا الوباء ، فقال عمر : ارتفعوا عنّي ، ثمّ قال : ادع لي الأنصار ، فدعوتهم له فاستشارهم ، فسلكوا سبيل المهاجرين ، واختلفوا كاختلافهم ، فقال : ارتفعوا عنّي ، ثمّ قال : ادع لي من هاهنا من مشيخة قريش من مهاجرة الفتح ، فدعوتهم له ، فلم يختلف عليه منهم رجلان ، قالوا : نرى أن ترجع بالنّاس ولا تقدّمهم على هذا الوباء ، فأذّن عمر في النّاس : إنّي مصبح على ظهر ، فأصبحوا عليه ، فقال أبو عبيدة بن الجرّاح : يا أمير المؤمنين أفراراً من قدر اللّه ؟ قال : لو غيرك قالها يا أبا عبيدة ، نعم نفرّ من قدر اللّه تعالى إلى قدر اللّه تعالى ، أرأيت لو كان لك إبل فهبطت وادياً له عدوتان ، إحداها خصبة ، والأخرى جدبة ألست إن رعيتها الخصبة رعيتها بقدر اللّه تعالى ، وإن رعيتها الجدبة رعيتها بقدر اللّه تعالى ؟ قال : فجاء عبد الرّحمن بن عوف وكان متغيّباً في بعض حاجاته ، فقال : إنّ عندي في هذا علماً ، سمعت رسول اللّه ﷺ يقول : (( إذا كان بأرض وأنتم بها فلا تخرجوا فراراً منه ، وإذا سمعتم به بأرض فلا تقدموا عليه ))[٥٤] .

واته : له فەرموودەيەكى ( صحيح )دا هاتووه كەوا ( عمر )ى كوڕى ( خطاب ) چوو بۆ وەڵاتى شام ، كه گەشته ( سرغ ) سەركردەكانى جەنگ ( أبوعبيدة )ى كوڕى ( الجراح )و هاوەڵانى پێگەشت و ، هەواڵيان دايه كه تاعون له وەڵاتى شام بڵاوبۆتەوه ، ئەوەبوو جياوازيان تێكەوت و ، ئيمامى ( عمر ) به ( ابن عباس )ى فەرموو : كۆچبەرانى پێشينم بۆ بانگ بكه ، فەرمووى : بانگم كردن و ، ئەويش ڕاوێژى پێكردن و پێى ڕاگەياندن كه پەتاى تاعون له وەڵاتى شام بڵاوبۆتەوه · ئەوانيش جياوازيان تێكەوت و ، هەندێكيان پێيان فەرموو : تۆ به نيازى كارێك دەرچوێت و وامان پێ باشه لێى پەشيمان نەبيتەوه ، كەسانێكى ديكەش فەرموويان ، ئەوەى ماوه له خەڵك و هاوەڵانى پێغەمبەرى خوات ﷺ له گەڵدايه بۆيه پێمان باش نى يه بيانخەيته نێو ئەم پەتايەوه ، ئەوەبوو ئيمامى ( عمر ) فەرمووى : هەستن لام ، پاشان فەرمووى : پشتيوانانم بۆ بانگ بكه ، منيش بانگم كردن ، ئەوەبوو ڕاويژى پێكردن و

٥٤ ــ صحيح : البخاري ( ٧ / ١٦٩ ) ، ( ٣٤١٩ ) ، ومسلم ( ٧ / ٣٠ ) .

ئەولنيش هەمان ڕێگەی كۆچبەرلنيان گرتوو وەكو ئەوان جياوازبوون ، بۆيە ئيمامی ( عمر ) پێی فەرموون : هەستن لام ، پاشان فەرمووی : هەركەس لێرەيە لە گەورەپياوانی قورەيش ئەوانەی سالّی ڕزگاركردنی مەككە كۆچيان كردووە هەموويانم بۆ بانگ بكە ، منيش بانگم كردن ، دوو كەسيان نەبوو جياوازيان لە نێواندا بێت ، بەلّكو هەموويان گوتيان : ئێمە وامان پێ باشە ئەم خەلّكە بگەڕێنيتەوەو نەيانخەيتە نێو ئەم پەتايەوە ، بۆيە ئيمامی ( عمر ) بانگەوازی بە نێو خەلّكيدا كرد : من سبەينێ لە سەر زينم ، ئەوەبوو بەيانی هەموويان سواربوون ، ( أبوعبيدة )ی كوڕی ( الجراح ) فەرمووی : ئايا لە قەدەرو چارەنووسی خوا هەلّدێن ئەی ميری موسلّمانان ؟ ئيمامی ( عمر )يش فەرمووی : ئەگەر كەسێكی تر ئەمەی بگوتايە ئەی ( أباعبيدة ) ، بەلّێ ئێمە لە قەدەرو چارەنووسی خوا هەلّدێين بۆ قەدەرو چارەنوسی خوا ، ئايا ئەگەر تۆ كۆمەلّێك ووشترت هەبێ و لە شيوێكدا دابەزيت كە دوو بەری هەبێت ، بەرێكيان سەوزەلاّن و بە پيت و ، بەرەكەی تريشيان دێم و بێ لەوەڕ بێت ، ئەگەر ووشترەكانت لە هەر بەرێكياندا بلەوەڕێنی بە چارەنووسی خوا نی يە ؟

( ابن عباس ) دەفەرميت : لەو كاتەدا ( عبدالرحمن )ی كوڕی ( عوف ) هات كە پێشتر لەوێ نەبوو ، چووبوو بۆ هەندێ پێويستی خۆی ، فەرمووی : من لەم بارەوە زانياريم پێ يە ، گوێبيستی پێغەمبەری خوا بووم ﷺ دەيفەرموو : (( ئەگەر بيستتان تاعون پەيدابووە لە خاكێكدا مەچن بۆ ئەوێ ، ئەگەر لە خاكێكيشدا بلاّوبۆوە ئێوەی تێدا بوو لێی ڕامەكەن )).

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ
## لە نەخۆشی ئاوبەنگ( داءِ الإستسقاءِ ) و چارەسەركردنيدا :

في الصحيحين : من حديث أنس بن مالك ، قال : قدمَ رَهَطٌ من عُرَيْنَةَ وَعُكَل على النَّبيِّ ﷺ فاجْتَوَوا المدينة ، فشكوا ذلك إلى النبيِّ ﷺ، فقالَ : (( لو خرجتُم إلى إبل الصدقة فشربتم من أبوالها وألبانها )) ، ففعلوا ، فلما صحُّوا ، عمدوا إلى الرُّعاةِ فقتلوهم ، واستاقُوا الإبل ، وحاربوا

الله ورسوله ، فبعث رسولُ الله ﷺ في آثارهم ، فأُخِذُوا ، فقطعَ أيديَهُم ، وأرجُلهُم ، وسَمَلَ أعيُنَهُم ، وألقاهم في الشمسِ حتى ماتوا[٥٥].

واته : ( أنس )ى كوڕى ( مالك ) _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ دەفەرمێت : چەند كەسێك لە هۆزەكانى ( عُرَيْنَةَ ) و ( عُكَل ) هاتنە خزمەتى پێغەمبەرى خوا ﷺ پاشان مانەوەيان لە شارى مەدينە بە لاوە ناخۆش بوو چونكە تووشى نەخۆشى گەدەترشان بوون ، ئەوەبوو سكاڵايان بردە خزمەتى پێغەمبەرى خوا ﷺ، ئەويش پێى فەرموون : (( ئەگەر بچونايەتە دەرەوە بۆ لاى ووشترەكانى بەخشين لە شيرەمەنيەكانيتان بخوارديايەتەوە )) ، ئەوانيش ئەو كارەيان بە ئەنجام گەياند ، كە تەندروستيان چاك بۆوە ، چوون بۆ لاى شوانەكان و كوشتنيان و ، ووشترەكانيشيان دايەبەرو بردنيان ، ئەوەبوو پێغەمبەرى خوا ﷺ ناردى بە شوێنياندا ، بۆيە بران و ، دەست و ، قاچيانى بڕى و ، چاويانى دەرهێنا و ، فڕێى دانە بەر هەتاوەكە تاوەكو مردن ٠

بەڵگەش لە سەر ئەوەى نەخۆشيەكەيان ئاوبەنگ بوو ، ئەوەيە كە ئيمامى ( مسلم ) لە ( صحيح )ەكەيدا دەيگێڕێتەوە كەوا ئەو كەسانە گووتيان : حەزمان بە مەدينە نەماوە ، چونكە سكمان گەورە بووەو ، ئەندامەكانمان سست و خاو بووە ( أرتهشت أعضاؤنا ) و پاشان تەواوى فەرموودەكە باس دەكات ٠

الجَوَى : نەخۆشيەكە لە نەخۆشيەكانى سك ، ئاوبەنگيش : نەخۆشيەكى ماددية هۆكارەكەكەشى مادەيەكى نامۆيە دەچێتە نێو ئەندامەكانى لەشەوەو بەرزى دەكاتەوە _ يا هەموو ئەو ئەندامانەى بەدەرەوەن و ديارن ، يا جێگە بۆش و بەتاڵەكانى ئەو

---

٥٥ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ١٦١ ، ١٨٦ ، ١٩٨ ) والبخاري ( ١ / ٦٧ ) ، ( ٤ / ٧٥ ) ، ( ٥ / ١٦٥ ) ، ( ٦ / ٦٥ ) ، ( ٨ / ٢٠١ ، ٢٠٢ ) ، ( ٩ / ١١ ) ، ومسلم ( ٥ / ١٠٢ ، ١٠٣ ) ، وأبوداود ( ٤٣٦٤ ) ، ( ٤٣٦٥ ) ، والنسائي ( ٧ / ٩٣ ، ٩٤ ، ٩٥ ) كلهم من طريق أبي كلابة عن أنس مرفوعاً فذكره ٠

شوێنانەی کە چارەسازی خۆراك و تێکەڵاوەکانی تێدا دەکرێت _ ، سێ جۆریشی هەیە : گۆشتی و ، ( زقيٌ )و ، تەپڵی[٥٦] ·

لەبەر ئەوەی ئەو دەرمانانەی کە پێویستن بۆ چارەسەریی ئەم نەخۆشیە بریتین لەوانەی کە کردنەوەیەکی مامناوەندو ، بەردانێك بە پێی پێویست دەستەبەر بکات ، ئەم شتانەش لە شیرەمەنیەکانی ووشتردا هەن بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی خواردنەوەی شیری ووشترەکانی پێکردن ، چونکە شیری ووشتر لابەرو و ڕەوان و نەرمکارە ، بەردارو سووکارو هێمن کارە ، هۆیە بۆ کرانەوەی کونیلە داخراوەکان ، چونکە زۆربەی لەوەڕینی ووشتر لە سەر تاڵیشك ( الشيح )و ، ( القيصوم )و[٥٧] ، بابوونە ( البابونج )[٥٨]( الأقحوان )و[٥٩] ( الإذخِر )و[٦٠] چەندین ڕووەکی دیکە کە وەکو دەرمانێکی بەسوود بەکار دێت ·

---

٥٦ _ گۆشتی : هۆکاری دروستبونی مادەیەکی ئاوی بەڵغەمیەو ، لە گەڵ خوێندا بە نێو ئەندامەکانی لەشدا بڵاو دەبێتەوە ، بە جۆرێك لە ئەندامەکانی لەشدا ئاوسانێکی نەرم دروست دەکات ، هەروەها ئەندامەکانی زاوزێی پیاو ئافرەت دەئاوسێنێت و ، دەم و چاو لەش بە گشتی خاو دەبێتەوە ·

( زقيٌ ) : هۆکارەکەی مادەیەکی ئاویە دەپاڵێورێتە نێو بۆشای سکی خوارەوەو ئەندامەکانی تریش کە لە دوایەوە دێن ، لێرەدا سك دەئاوسێت و ناوك کێم و زوخاو دەکات و ، ئەگەر سك بجوڵێنیتەوە شلەقە شلقەکەی دەبیستیت ·

تەپڵی : هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مادەیەك با دروست دەکات و لە گەڵیدا سك دەئاوسێت و ئەگەر لە لێی بدەی وەکو تەپڵ دەنگی دێت ، بۆ دڵنیابوون لە هەموو ئەوانە بگەڕێرەوە بۆ ، مفاتيح العلوم ، الخوارزمي ل٣١ · وەرگێڕ ·

٥٧ _ القيصوم : جۆرە ڕووەکێکە لە دەشتەکانی دوورەگەی عەرەب دەڕوێ و وەکو دەرمان بەکاردەبرێ · بڕوانە : ڕزگار کریم ، فەرهەنگی دەریا ، وەرگێڕ ·

٥٨ _ البابونج : گوڵێکی سپی یە لە بیابانی عەرەبیشدا دەڕوێ ، مەلا محمودی گەلالەیی ، قامووسی ڕستە ، وەرگێڕ ·

٥٩ _ الأقحوان : ناوە بۆ چەند جۆرە ڕوەکێك لە پێڕی ( أنتاميس ) و ( کریزینتوم ) ، بڕوانە : مەلا محمودی گەلالەیی ، قامووسی ڕستە ، وەرگێڕ ·

ئەم نەخۆشیەش لە كاتی بوونی نەخۆشیەك لە جگەردا دەردەكەوێت بە تایبەت ، یا بە هاوبەشی نەخۆشی دیكەی لەش ، ئەمەش بە هۆی ئەو كونیلە داخراوانەوەیە ( السُدد ) كە لە جگەردا دەبێت ، شیری ووشتری عەرەبیش بە سوودە بۆ كردنەوەی ئەو داخراوانە ، چونكە بۆ خۆی مادەیەكی كردنەوەیەو ، هەروەها سوودو كەڵكێكی زۆریشی هەیە ٠

( الرازي ) دەفەرمێت : شیری ووشتری عەرەبی ئێش و ئازاری جگەرو ، خراپبوونی باری میزاج چارەسەر دەكات ، هەروەها ( الإسرائیلي ) دەڵێت : شیری ووشتری عەرەبی ناسكترین شیرەو ، لە هەمووشیان ئاودارترو تیژترەو ، كەمترین خۆراكیشی تێدایە ٠ بۆیە بۆتە بەهێزترین شیرەكان بۆ نەرمكردنەوەی زێدە مادەكان و ، ڕەوانكردنی سك و ، كردنەوەی كونیلە داخراوەكان ( السُدد ) ، ئەو شتەش كە ئەوانەی سەروە دەسلمێنن هێندە كەمە سوێریەكەیەتی كە دەگەڕێتەوە بۆ زیدە گەرمی ئاژەڵەكە بە سروشت ، بۆیە بۆتە تایبەترین شیرەكان بۆ نەرم و ناسكی جگەرو ، كردنەوەی كونیلە داخراوەكانی و ، شیكردنەوەی ڕەقێتی سپڵ ئەگەر نوێ بوو ، بەسوودیشە بۆ نەخۆشی ئاوبەنگ بە تایبەت ، ئەگەر بەكارهێنرا لە گەڵ ئەو گەرمیەدا كە لە گوان دێتەدەر ، لە گەڵ میزی بچكە ووشتری لە شیر بڕاوەدا ، كە گەرمە كاتی هاتنەدەری لە ئاژەڵەكە ، بەوەش سوێرێتی شیركە زیاتر دەبێت و ، توانای لەت لەتكردنی زێدە مادەو ، ڕەوان كردنی سكی زیاتر دەبێ ، بەڵام ئەگەر نەتوانرا دابەزێنرێت و سك ڕەوان بكرێت ، ئەوجا پێویستە بە دەرمانێكی ڕەوانكەر دابەزێنرێت ٠

دانەری كتێبی ( القانون )[٦١] دەڵێت : ئاوڕ نادرێتەوە لە گوفتاری ئەو كەسانەی دەڵێن : سروشتی شیر دژبە چارەسەری نەخۆشی ئاوبەنگە ٠ دەڵێت : بزانە كە شیری ووشتر دەرمانێكی بە سوودە ، چونكە لە سەرخۆ مادە زیانبەخشەكان دەكاتە دەرەوەو ، چەندین

٦٠ ــ الإذخر : جۆرە ڕووەكێكی گوڵ سپی یەو لە بیابانی عەرەب دەروێ ، بڕوانە : مەلا محمودی كەلالەیی ، قامووسی ڕستە ٠ وەرگێڕ ٠

٦١ ــ دانەرەكەی ( ابن سینا )یە ، كە پێشتر ئاماژەی پێدراوە ٠

تایبەتمەندی تریشی تێدایەو ، زۆریش بە سوودە ، بۆیە ئەگەر مرۆڤێك لە جیاتی ئاو خۆراك تەنها شیری ووشتر بخوات بە ئیزنی خوای تعالی چاك دەبێتەوە ، چونکە ئەمە لە سەر کۆمەڵێك تاقیکراوەتەوە ، نێردران بۆ وەڵاتی عەرەب و ، ناچاری پاڵی پێوەنان بۆ خواردنەوەی شیری ووشترو ، چاکبوونەوە · بەسوودترین میزیش : میزی ووشتری دەشتەکیە ، کە ووشتری ڕەسەنە · تەواوبو ·

چیرۆکی نێو فەرموودەکە : بەڵگەی خۆ چارەسەرکردن و پزیشکێتی نەفسە ، هەروەها بەڵگەشە بۆ پاکێتی میزی ئاژڵێکی گۆشت خوراو ، چونکە لە بنچینەدا چارەسەرکردن بە حەرامکراوەکان شیاو نی یە ، لێرەدا دەبینین ئەگەچی تازە موسڵمان بوبون بەڵام فەرمانیان پێنەکرا بە شتنی دەمیان ، یا ئەوەی پیس بوبو لە جل و بەرگەکانیان بەو میزانە بۆ نوێژکردن ، چونکە دواخستنی ڕوونکردنەوە لە کاتی پێویستدا شیاو نی یە·

هەروەها ئەو چیرۆکە بەڵگەیە بۆ کوشتنی تاوانباری بکوژ بە هاوشێوەی ڕەفتارەکەی خۆی ، چونکە ئەو کەسانە شوانەکەیان کوشت و ، چاویشیان دەرهێنا ، وەکو ئەوەی لە ( صحیح )ی ئیمامی ( مسلم )دا جێگیربووە ·

هەروەها بەڵگەشە بۆ کوشتنی کۆمەڵێك و ، برینی دەست و قاچیان ئەگەر هەموویان کۆبوبونەوە لە سەر کوشتنی تەنها کەسێك ·

هەروەها بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە ئەگەر لە سەر تاوانباری بکوژ ( الحدّ )[٦٢] ( القصاص)[٦٣] لە یەك کاتدا کۆبۆوە ئەوا هەردوو مافەکەی لێوەردەگیرێتەوە ، چونکە

---

٦٢ ـ الحد : ئەو سازایانەیە کە لە شەرعدا دانراون بۆ ئەو کەسانەی تاونێك ئەنجام دەدەن وەکو بەرهەڵستیەك بۆ ئەوەی دووبارەی نەکەنەوەو نەیکەن ، بڕوانە : التعاریف المهمة لطلاب الهمة · وەرگێڕ ·

٦٣ ـ القصاص : واتە دابەزینی سزا بە سەر کەسی تاوانکاردا بە چەشنی سزاو تاوانەکەی خۆی ، چاو بە چاو نەفس بە نەفس ، بڕوانە : التعاریف المهمة لطلاب الهمة · وەرگێڕ ·

پێغەمبەری خوا ﷺ دەست و قاچی برین وەکو جێبەجێکردنی سنووردانانێك بۆ ئەو کەسانەی لە گەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا دەجەنگن و بە تاوانی دەست و قاچ برینی شوانەکە هەستان و ، کوشتنیشی وەکو تۆڵەسەندنەوەیەك بەرامبەر بە هەستنیان بە کوشتنی شوانەکە ٠

هەروەها بەڵگەشە کە ئەگەر کەسی جەنگاوەر لە گەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا ماڵ و سامانی بردو ، بە تاوانی کوشتنیش هەستا ، ئەوا دەست و قاچی لە یەك کاتدا دەبڕدرێت و ، دەشکوژرێت ٠

هەروەها بەڵگەشە کە ئەگەر تاوانەکان زۆرو جۆراوجۆر بوون ، سزاکانیش سەختتر دەبێتەوە ، چونکە ئەمانە پاش موسڵمان بوونیان پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام ، خەڵکیان کوشت ، سوکایەتیان بە کوژراوەکە کرد ، ماڵ و سامانیان برد ، هەستان بە ئاشکەراکردنی جەنگان لە خواو پێغەمبەرەکەیدا ، بۆیە سزای ئەمانە زۆر سەخت بوو ٠

هەروەها بەڵگەشە کە حوکمی هەموو جەنگاوەران لە گەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا وەکو حوکمی ئەو کەسەیانە کە بە ڕاسەوخۆ کارەکەی ئەنجام داوە ، چونکە زانراوە کە هەموویان بە خودی خۆیان بە ڕاسەوخۆ کارەکەیان ئەنجام نەدابوو ، کەچی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ سەبارەت بەوە لێی نەپرسینەوەو هەمووی کوشتن ٠

هەروەها بەڵگەشە کە کوشتنی خەڵەتاندن ( قتل الغيلة ) پێویست دەکات کەسی تاوانکاری بکوژ بکوژرێتەوە وەکو ( الحد ) ، لێخۆشبوونیش لاینابات ، پێدان و بەخشینی پارەش لێرەدا هیچ بایەخێکی پێ نادرێت ، ئەمە ڕێباوەڕی خەڵکی مەدینەیەو ، ڕوویەکە لە ڕێباوەڕی ئیمامی ( أحمد )و هەڵبژاردنی ( شيخ الإسلام ابن تيمية )شەو ، فەتوای لە سەر داوە ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەری برین و خوێن بەربونی لووتدا :

في الصحيحين : ﴿ عن أبي حازم أنه سمع سهل بن سعد يُسألُ عما دُوويَ به جُرحُ رسول الله ﷺيوم أحدٍ فقال : جُرِحَ وجهُه وكُسرت رَباعيتهُ وهُشمت البَيضةُ على رأسه وكانت فاطمة بنت رسول الله ﷺ تغسلُ الدمَ وكان عليٌّ بن أبي طالب يسكُب عليها بالمِجَنّ فلما رأت فاطمة الدمَ لا يزيد إلا كَثرةً أخذت قطعةَ حصير فأحرقتها حتى إذا صارت رماداً ألصقتهُ بالجُرحِ فاستمسك الدمُ ﴾ برمادِ الحصيرِ المعمول من البَرْديَ ٠

واتە : لە ( أبي حازم )ەوە ، كە گوێبیستی ( سَهْل )ی كوڕی ( سعد ) بوو لێیان دەپرسی سەبارەت بەوەی بە چ شتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ( أُحد )دا تیماركرا ٠ فەرمووی : ڕووی پیرۆزی بریندار بوو ، چوار ددانەكانی ناوەڕاستی نێوان بڕندەو كەلْپەی شكان ، كڵاو ئاسنەكە بە سەریەوە شكێندرا ، ئەوەبوو ( فاطمة )ی كچی ( محمد ) خوێنەكەی دەشت و ، ( علي ) كوڕی ( أبي طالب ) بە قەڵغانەكەی ئاوی بە سەردا دەرژاند ، كاتێ ( فاطمة ) تەماشای خوێنەكەی كرد بەردەوام زیاد دەكات ، پارچەیەك حەسیری بردو ، سوتاندی تا بوبە خۆڵەمێش پاشان لكاندی بە برینەكەوەو ئەوەبوو خوێنەكە وەستایەوە ، بە خۆڵەمێشی ئەو حەسیرەی لە زەل دروستكرابوو ٠

چونكە كاریگەریەكی بەهێزی هەیە بۆ خوێن وەستاندن ، توانای ووشكردنێكی بە هێزی تێدایە ، سوتان و چووزانەوەیەكی كەمی تێدایە ، بەڵام دەرمانە بەهێزەكانی ووشكردن ئەگەر برینەكە بستوتێنێتەوەو بچوزێنێتەوە ، ئەوا خوێنەكە دەووروژێنێت و دوبارە دەریدەهێنێتە دەرەوە ، هەروەها ئەگەر ئەم خۆڵەمێشە بەتەنها ، یا بە تێكەڵاوكردنی سركە بكرێتە نێو لووتی ئەو كەسەوە كە خوێنی بەربووە خوێنەكەی دەوەستێنێت ٠

دانەری کتێبی ( القانون ) دەڵێت : ڕووەکی زەل ( البردي ) به سووده بۆ خوێن بەربوون ، قەدەغەی هاتنە دەرەوەی دەکات ، خۆڵەمێشەکەی بە سەر برینی نەرم و تەڕدا بڵاودەکرێتەوەو ، سارێژی دەکاتەوە ، کاغەزی میسری کۆن لە زەل دروست دەکرا ، میزاجێکی ساردی ووشکی هەیە ، خۆڵەمێشەکەی بە سوودە بۆ دەم کولی ( أكلَةِ الفمِ ) ، هاتنە دەروەی خوێن دەوەستێنێت ، قەدەغەی زیاتر بڵاوبونەوەی برینە پیسەکان دەکات ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بواری چارەسەرکردندا بە خواردنەوەی هەنگوێن و هەروەها بە کەڵەشاخ و داخکردن :

في صحيح البخاري :عن سعيد بن جُبيرٍ ، عن ابن عباس ، عن النبيِّ ﷺ قال : (( الشِّفاءُ في ثلاثٍ : شربةِ عسلٍ ، وشَرْطةِ مِحْجَمٍ ، وكَيَّةِ نارٍ ، وأنا أنهى أمَّتي عن الكَيِّ ))[٦٤]

واتە : لە ( سعید )ی کوڕی ( جُبیر )ەوە ، لە ( ابن عباس )ەوە ، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی : (( چارەسەر لە سێ شتدایە ، خواردنەوەی هەنگوێن ، کەڵەشاخ گرتن ، داخکردن بە ئاگر ، بەڵام من قەدەغەی ئومەتەکەی خۆم دەکەم داخکردن بەکاربێنن )) ٠

( أبو عبدالله المازَري ) دەڵێت : ( الأمراض الأمتلائية ) واتە ئەو نەخۆشیانەی کە هۆکاری دەرکەوتنی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە جێگەیەکی جەستە بە مادەیەك پڕبووە: یا خوێنین ، یا زرداوین ، یا بەڵغەمین ، یا ڕەشکاوین ، بەڵام خوێنیەکە : چارەسەری بە دەرهێنانی خوێنەکە دەکرێت ، وە ئەگەر لەو سێ بەشەکەی تریش بوون : چارەسەری بە ڕەوانبوونێکە ( الإسهال ) کە لە گەڵ هەر تێکەڵەیەکیاندا بێت بگونجێت ٠ لێرەدا وەکو ئەوە وایە کە

---

٦٤ ـ صحيح : أخرجه أحمد ( ١١ / ٢٤٥ ) ، والبخاري ( ٧ / ١٥٨ ، ١٥٩ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٩١ ) كلهم من طريق مروان بن شجاع عن سالم الأفطس ، عن سعيد بن جبير عن ابن عباس فذكره مرفوعاً ٠

پێغەمبەری خوا ﷺ ووشیاری پێ دابێتین ، سەبارەت بە بەکارهێنانی هەنگوین بۆ ڕەوانبوون و، بەکارهێنانی کەڵەشاخ بۆ خوێن بەردان ، هەندێ خەڵك دەڵێن : خوێن بەردان دەچێتە چوارچێوەی فەرمایشتەکانیەوە کە دەفەرمێت : (( وشَرْطَة مِحْجَم )) واتە (( ڕووشاندنێك بۆ کەڵەشاخ گرتن )) ٠ لێرەدا تەماشا دەکەین کەڵەشاخ گرتنی لە میانەی دەرمانەکاندا باس کردووە ، ، چونکە کاتێك بەکاردەهێنرێت کە سروشتی نەخۆشیەکان زاڵ بن بە سەر هێزی دەرمانەکانداو ، ئەو کاتەی کە دەرمانی خوراوە سوودی نەبێت ٠ فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ (( وأنا أنهى أمَّتي عن الكيِّ )) واتە : (( من قەدەغەی ئومەتەکەی خۆم دەکەم داخکردن بەکاربێنن )) و لە فەرموودەکەی دیکەشدا : (( وما أحبُّ أن أكْتَويَ ))[٦٥] واتە : (( حەزم بەوە نی یە داخ بکرێم )) ، لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژە بە دواخستنی چارەسەر بە داخکردن دەکات تاوەکو کاتی ناچاربوون ، بۆیە پێویستە پەلەی چارەسەرکردن بە داخکردن نەکرێت ، چونکە لە ڕاستیدا پەلە دەکرێت بۆ بەکارهێنانی ئێشێکی زۆر لە پێناو لادانی ئێشێکدا ڕەنگە لە داخکردنەکە ئێشی کەمتر بێت ٠ گوفتارەکانی تەواو بوو ٠

هەندێ لە پزیشکان گووتویانە : نەخۆشیە میزاجیەکان : یا بە هۆی مادەیەکەوە دەبێت ، یا بە بێ مادە ، مادیەکانیش ، یا گەرمن ، یا ساردن ، یا شێدارو تەڕن ، یا ووشکن ، یا بە تێکەڵەیەکی ئەوانە دەبێ ، ئەم چوار بارو چۆنیەتیە ، دوو بارو چۆنیەتیان بکەرن : کە بریتین لە گەرمی و ساردی و ، دوو بارو چۆنیەتیەکەی تریش کارلێکراون کە بریتین لە تەڕێتی و ووشکێتی ، بۆیە لە کاتی زاڵ بوونی یەکێك لە بارو چۆنیەتیە بکەرەکانی گەرمی یا ساردی لە جەستەی مرۆڤدا دانەیەکیش لە بارو چۆنیەتیە کارلێکراوەکانی تەڕی یا ووشکی لە گەڵ خۆیدا ڕاکێش دەکات و پێکەوە لە جەستەدا کار دەکەن ، هەروەها هەموو خەڵتەکانی جەستە دوو بارو چۆنیەتی هەیە : بکەرو کارلێکراو ٠

---

٦٥ ــ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ٣٤٣ ) ، والبخاري ( ٧ / ١٥٩ ، ١٦٢ ، ١٦٣ ) ، ومسلم ( ٧ / ٢١ ) كلهم من طريق عبدالرحمن بن سليمان بن الغسيل ، عن عاصم بن عمر بن قتادة فذكره عن جابر مرفوعاً ٠

## چارەسەرکردن بە دەرهێنانی خوێن :

بۆیە لێرەدا ڕوون دەبێتەوە کە بنچینەی هەموو نەخۆشیە میزاجیەکان شوێنکەوتەی بە هێزترین بارو چۆنیەتیەکانی خەڵتەکانی لەشن کە گەرمی و ساردیە ، بۆیە گوفتاری پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە بنەڕەتی چارەسەرکردنی نەخۆشیەکان کە گەرم و ساردە بە ڕێگەی نموونە باسکراوە ، بۆیە ئەگەر نەخۆشیەکە گەرم بوو ، بە دەرکردنی خوێنەکە بە ڕێگەی خوێن بەردان یا بە کەڵەشاخ گرتن چارەسەری دەکەین ، چونکە بەو شێوەیە مادەکە دەکرێتە دەرەوەو ، میزاجی مرۆڤیش سارد دەبێتەوە ، بەڵام ئەگەر نەخۆشیەکە سارد بوو ، بە گەرمکردن چارەسەری دەکەین ، ئەوەش لە هەنگوێندا هەیە ، ئەگەر سەرباری ئەوەش پێویستی بە دەرکردنی ماددەیەك بوو ، ئەوا دیسان هەنگوێن ئەو کارە دەکات ، چونکە هۆکارێکی کاریگەرە بۆ پێگەیاندن و ، لەت لەتکردن و ، هێمن کردنەوەو ، لابردن و ، نەرم کردنی ماددەکان ، بەوەش زۆر بە ئارامی و بێوەیی ئەو مادانە دەکرێنە دەرەوە بە زاڵبوونی دەرمانە ڕەوانکارە بەهێزەکان.

## چارەسەر بە داخکردن :

بەڵام داخکردن : لەبەر ئەوەی هەر یەك لە نەخۆشیە ماددەکان ، یا زۆر تیژ دەبێت و بە خێرا دەچێتە سەر یەکێك لەو دوو لایە کە گەرمی یە یا ساردیە ، بۆیە بە ڕیگەکانی سەرەوە چارەسەر دەکرێن ، یا نەخۆشیەکی درێژخایەن دەبێت و چاکترین چارەسەری پاش کردنە دەروەی مادەکە داخکردنی ئەو ئەندامانەیە کە گونجاوە بۆ داخکردن · چونکە ئەو نەخۆشیە درێژخایەن نابێت تەنها بە هۆی ئەوەوە نەبێت کە مادەیەکی ساردی چڕ لەو ئەندامەدا جێگیربووەو ، میزاجی ئەندامەکەی خراپ کردووە ، هەموو ئەو جێگانەش کە پێی دەگات دەیگۆڕێت بۆ بارێکی هاوشێوەی ناوەڕۆکە خراپەکەی خۆی و ، لە نێو ئەو ئەندامەی لەشدا

گڕ دەگرێت ، لێرەدا داخكردن بەكاردەهێنرێت بۆ دەرهێنانی مادده خراپەكە لەو شوێنەی لەش كە تیایدا جێگیربووە ئەوەش بە لە ناوبردنی بەشە ئاگریەكەی ئەو مادەیە بە داخكردن.

بەم فەرمودە پیرۆزە چۆنیەتی چارەسەركردنی هەموو نەخۆشیە ماددیەكان فێربووین ، هەروەها لە فەرمایشتەكەی پێغەمبەری خواوە ﷺ: (( إنَّ الحُمَّى مِن فَيحِ جَهَنَّمَ فأبرِدوها بالماءِ ))(٦٦)

واتە : (( ( تا ) لە گڕوبڵێسەی دۆزەخەوەیە بۆیە بە ئاو ساردی بكەنەوە )) چۆنیەتی چارەسەركردنی نەخۆشیە سووكەكانیش فێر بووین ٠

## بەشی چارەسەركردن بە كەڵەشاخ گرتن :

بەڵام كەڵەشاخ گرتن : ففي سنن ابن ماجة من حديث جُبَارَةَ بن المُغَلِّس _ وهو ضعيف _ عن كثير بن سَليم ، قال : سَمعتُ انَسَ بن مالكٍ يقولُ : قال رسول الله ﷺ : (( ما مَرَرْتُ ليلةَ أُسْرِيَ بي بملإٍ إلا قالوا : يا محمدُ مُرْ أُمَّتَكَ بِالحِجَامةِ ))(٦٧)

واتە : لە ( جُبَارَة )ی كوڕی ( المُغَلِّس )ەوە لە ( كثير )ی كوڕی ( سَليم )ەوە فەرموویەتی : گوێبیستی ( أنس )ی كوڕی ( مالك ) بووم دەیفەرموو : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لە شەوڕەویەكدا بە لای هەر كۆمەڵێك لە پەریەكاندا تێپەڕ دەبووم پێیان دەگووتم : ئەی محمد فەرمانی كەڵەشاخ گرتن بە ئومەتەكەت بكە )) ٠

---

٦٦ _ تقدم تخريجه ٠

٦٧ _ صحيح : أخرجه ابن ماجة ( ٣٤٧٩ ) قال : حدثنا جبارة بن المغلس ، قال : حدثنا كثير بن سليم ، فذكره عن أنس مرفوعاً ٠ وأخرجه الترمذي ( ٢٠٥٢ ) من طريق القاسم بن عبدالرحمن عن أبيه عبدالله بن مسعود عن أبيه قال : (( حدث رسول الله _ صلى الله عليه وسلم _ عن ليلة أسري به ، أنه لم يمر على ملأ من الملائكة إلا أمروه ؛ أن مُرْ أمتك بالحجامة )) ٠ وصححه الألباني في صحيح الجامع ( ٥٦٧١ ) ٠

وروى الترمذي في جامعه من حديث ابن عباس : أن النبيَّ ﷺ هذا الحديث ، وقال فيه : (( عليكَ بالحِجامَةِ يا مُحَمَّدُ ))(٦٨)

واته : له ( ابن عباس )ەوه له پێغەمبەری خواوه ﷺ فەرموویەتی : (( ئەی محمد کەڵەشاخ گرتن به کاربێنه )) ٠

وفي الصحيحين من حديث طاووس ، عن ابن عباس : (( أنَّ النبيَّ ﷺ احتجَمَ وأعْطى الحَجَّامَ أجْرَه ))(٦٩)

واته : له ( ابن عباس )ەوه دەفەرمێت : (( پێغەمبەری خوا ﷺ کەڵەشاخی گرت و کرێی کەڵەشاخگرەکەشیدا )) ٠

وفي الصحيحين أيضا ، عن حُمَيدٍ الطويل ، عن أنس ، أنَّ رسول الله ﷺ حجمَهُ أبو طَيْبَةَ ، فأمَرَ لهُ بصَاعينِ من طعام ، وكلَّمَ مواليهُ ، فخفَّفُوا عنهُ من ضريبتِهِ ، وقال : (( خَيْرُ ما تَدَاوَيْتُمْ بهِ الحِجَامَةَ ))(٧٠)

---

٦٨ ـ صحيح : أخرجه أحمد ( ١ / ٣٥٤ ) ، وعبد بن حميد ( ٥٧٤ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٧٧ ) ، والترمذي ( ٢٠٥٣ ) كلهم من طريق عباد بن منصور عن كرمة عن ابن عباس عن النبي ـ صلى الله عليه وسلم ـ قال : خير يوم تحتجمون فيه سبع عشرة ، وتسع عشرة ، وإحدى وعشرين ، وقال : (( وما مررت بملأ من الملائكة ليلة أسري بي إلا قالوا : عليك بالحجامة يا محمد )) واته : له ( ابن عباس )ەوه له پێغەمبەری خواوه ـ صلى الله عليه وسلم ـ دەفەرمێت : چاکترین ڕۆژێك کەڵەشاخی تێدا بگرن ڕۆژانی حەڤدەو ، نۆزدەو ، بیست ویەکی مانگە ، هەروەها فەرمووی : (( له شەوڕەویەکدا بەلای هەر کۆمەڵێك له پەریەکاندا تێپەڕ دەبووم پێیان دەگووتم : کەڵەشاخ گرتن به کاربێنه ئەی محمد )) ٠ وصححه الألباني رواية الترمذي وابن ماجة في صحيح الجامع ( ٥٦٧٢ ) ٠

٦٩ ـ صحيح : أخرجه أحمد ( ١ / ٢٥٠ ، ٢٥٨ ، ٢٩٢ ، ٢٩٣ ، ٣٣٧ ) ، والبخاري ( ٣ / ١٢٢ ) ، ( ٧ / ١٦١ ) ، ومسلم ( ٥ / ٣٩ ) ، ( ٧ / ٢٢ ) ، وأبوداود ( ٣٨٦٧ ) ، وابن ماجة ( ٢١٦٢ ) ، كلهم من طريق عبدالله بن طاووس عن أبيه عن ابن عباس فذكره ٠

واته : له ( حُمَيدِ الطويل )ەوه ، له ( أنس )ەوه فەرموويەتى : ( أبو طَيبة ) كەڵەشاخى بۆ پێغەمبەرى خوا ﷺ گرت ، ئەوەبوو پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمانیدا دوو ( صاع )[٧١] خواردەمەنى بدرێتىٚ و ، لە گەڵ سەگەورەكانیشیدا دواو لە سەرانەكەشیان سووكردەوە ، فەرمووشى : (( چاكترین شتێك خۆتانى پىٚ چارەسەر بكەن كەڵەشاخ گرتنه )) ٠

وفي جامع الترمذي عن عَبَّادُ بْنُ مَنْصُورٍ ، قَال : سَمِعْتُ عِكْرِمَـةَ يَقُولُ : كَانَ لِـابْنِ عَبَّاسٍ غِلْمَةٌ ثَلَاثَةٌ حَجَّامُونَ ، فَكَانَ اثْنَانِ مِنْهُمْ يُغِلَّانِ عَلَيْهِ ، وَعَلَى أَهْلِهِ ، وَوَاحِدٌ لحجمه ، وَحجمِ أَهْلَهُ ، قَالَ : وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ : قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ نِعْمَ الْعَبْدُ الْحَجَّامُ يُذْهِبُ الدَّمَ وَيُخِفُّ الصُّلْبَ وَيَجْلُو الْبَصَرَ[٧٢]

واته : لە ( عَبَّادُ )ى كوڕى ( مَنصُور )ەوه ، فەرموويەتى : گوێبیستى ( عِكْرِمَة ) بووم دەيفەرموو : ( ابن عباس ) سىٚ لاوى ئیشكەرى خزمەتكارى كەڵەشاخ گرى هەبوو ، دوانیان ئیش و كارو بژێويان بۆ خۆى و ، ماڵ و منداڵى پەیدا دەكردو ، يەكێكیشیان ، كەڵەشاخى بۆ خۆىٚ و ، بۆ ماڵ و منداڵەكانى دەگرت ٠ ( عِكرِمَة ) دەفەمێت : ( ابن عباس ) فەرمووى : پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى : زۆر چاكە بەندەى كەڵەشاخ گر كە خوێن لادەبات و ، پشت سووك دەكاتەوەو ، چاو ڕوون دەكاتەوه ٠

وقال : إنَّ رسولَ اللهِ ﷺ حيثُ عُرِجَ بهِ ، ما مرَّ على مَلأٍ مِنَ الملائكةِ إلا قالُوا : عليكَ بالحِجَامَةِ[٧٣]

٧٠ ـ تقدم تخريجه ٠

٧١ ـ الصاع : پێوانەيەكى خەڵكى مەدینەبوو چوار گوێلى دەگرت ، بڕوانه : لسان العرب ٠ وەرگێڕ ٠

٧٢ ـ ضعيف : أخرجه ابن ماجة ( ٣٤٧٨ ) ، والترمذي ( ٢٠٥٣ ) ٠ وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٥٩٦٦ ) ، وانظر الضعيفة (٢٠٣٦ ) ، وضعيف ابن ماجة ( ٧٦٢ ) ٠

٧٣ ـ تقدم تخريجه ٠

واته : هەروەها ( ابن عباس ) دەفەرمێت : پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شەوەی بەرزكرایەوە ، بەلای هەر كۆمەڵێكی پەریەكاندا دەڕۆشت پێیان دەگووت : كەڵەشاخ گرتن بە كاربێنە.

وقال : (( إنَّ خيرَ مَا تحْتَجِمُونَ فيه يَوْمَ سَبْعَ عَشْرَةَ ، ويَوْمَ تِسْعَ عَشْرَةَ ، ويَومَ إحدى وعِشرينَ ))[٧٤]

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( چاكترین ئەو ڕۆژانەی كەڵەشاخی تێدا دەگرن ڕۆژانی حەڤدەو ، نۆزدەو ، بیست و یەكن )) .

وقالَ : (( إنَّ خَيْرَ ما تَدَاوَيْتُمْ بِه السَّعُوطُ واللَّدُودُ والحِجَامَةُ والمَشِيُّ ))[٧٥] ، وإنَّ رسولَ الله ﷺ لُدَّ ، فقالَ : مَن لَدَّنِي ؟ فَكُلُّهُمْ أمسكُوا . فقال : لا يبقى أحدٌ في البَيْتِ إلا لُدَّ ، إلا العباسَ )) . قال : هذا حديث غريب ، ورواه ابن ماجة[٧٦]

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( چاكترین شتێك خۆتانی پێ چارەسەر بكەن دەرمانێكە بكرێتە لووت و ، دەرمانێكە بكرێتە زارو ، كەڵەشاخ گرتن و ، ڕێكردنە ، وە دەرمان كرایە زاری موبارەكی پێغەمبەرەوە ﷺ لە نەخۆشی مردنەكەیدا ، ئەوەبوو فەرمووی : كێ بوو دەرمانی لە زار كردم ؟ هیچ كەس وەڵامی نەدایەوە . بۆیە فەرمووی : هیچ كەس لەم ماڵەدا نامێنێت مەگەر دەرمانی لە زار دەكرێت ، جگە لە ( العباس ) )) .

---

٧٤ _ تقدم تخريجه .

٧٥ _ إسناده حسن : أخرجه ابن ماجة ( ٣٤٧٨ ) . الطب النبوى ، بتحقيق أبي عبدالرحمن عادل بن سعد .

٧٦ _ إسناده صحيح : أخرجه الترمذي ( ٢٠٥٤ ) ، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ( ١٦٧٥ ) . الطب النبوي ، بتحقيق أبي عبدالرحمن عادل بن سعد .

## بەشێك : سەبارەت بە سوودەكانی كەڵەشاخ گرتن :

كەڵەشاخ گرتن : ڕووی جەستە پاك دەكاتەوە زۆر زیاتر لە خوێن بەردان ، خوێن بەردانیش بۆ قوڵای جەستە چاكترە ، كەڵەشاخ گرتن ڕۆڵێكی كاریگەر دەبینێت بۆ دەرهێنانی خوێن لە لاكانی پیسی مرۆڤدا ٠

دەڵێم _ ( ابن القيم ) _ بۆ لێكۆڵینەوە سەبارەت بە كەڵەشاخ و خوێن بەردان ، زانراوە كە هەردوكیان بە گوێرەی زەمەن و ، شوێن و ، تەمەن و ، میزاج دەگۆڕێت ، بۆیە وەڵاتە گەرمەكان و ، زەمەنە گەرمەكان و ، میزاجە گەرمەكان ئەوانەی كە خوێنی دانیشتوانی لەو پەڕی پێگەیندا دەبێت ، كەڵەشاخ گرتنی زۆر بۆ بە سوودترە بە بەراوردی خوێن بەردان ، چونكە خوێنەكە پێدەگات و تەنك و ناسك دەبێت و دێتە دەروە بۆ ڕووی جەستەو ژێرەوەی پیست ، بۆیە كەڵەشاخ دەتوانێت خوێنێكی ئەوتۆ دەربهێنێت كە خوێن بەردان توانای ئەوەی نابێت ، بۆیە بۆ لاوەكان لە خوێن بەردان باشترە ، هەروەها بۆ ئەو كەسانەش كە بێ هێزن و توانای بەرگەگرتنی خوێن بەردانیان نی یە ٠

پزیشكان جەخت لە سەر ئەوە دەكەنەوە كە بۆ وەڵاتە گەرمەكان كەڵەشاخگرتن بە سوودترەو ، لە خوێن بەردان ( الفصد ) چاكترە ، كەڵەشاخگرتن لە ناوەڕاستی مانگ و ، پاش ناوەڕاست خێرترە ٠ بە گشتی ، لە بەشی سێ یەمی چوار بەشەكەی مانگدا بكرێت ، چونكە خوێن لە سەرەتای مانگدا هێشتا نەوروژاوەو فشاری بەرز نەبۆتەوە ، لە كۆتای مانگیشدا تەواو هێمن بۆتەوە ، بەڵام لە ناوەڕاست و دوای ناوەڕاستیدا ، لەو پەڕی زیادبوون و وورووژاندا دەبێت بۆیە لەم كاتەدا كەڵەشاخ گرتن باشترە ٠

دانەری كتێبی ( القانون ) دەڵێت : لە سەرەتای مانگدا فەرمان بە كەڵەشاخ گرتن ناكرێت ، چونكە خەڵتەكان لەم كاتەدا هێشتا نەجوڵاون و نەوروژاون ، هەروەها فەرمان ناكرێت لە

كۆتای مانگدا کەڵەشاخ بگیرێت چونکە خوێن هێمن و کەم بۆتەوە ، بەڵکو فەرمان دەکرێت لە ناوەڕاستی مانگدا کەڵەشاخ گرتن ئەنجام بدرێت ئەو کاتەی خەڵتەکان وروژاون و لەو پەڕی زیاد بووندایە بە هۆی زیادبوونی ڕووناکی لە ئەستیرەی مانگدا ۰

وقد رُويَ عن النبيِّ ﷺ أنه قال : (( خَيْرُ ما تداويتم به الحِجَامَة والفَصْدُ ))(٧٧)

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( چاکترین شتێك خۆتانی پێ چارەسەر بکەن کەڵەشاخ و خوێن بەردانە )) ۰ تەواوبوو ۰

فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ (( خير ما تداويتم به الحجامة )).

واتە :چاکترین شتێك خۆتانی پێ چارەسەر بکەن کەڵەشاخە ، لە ڕاستیدا ئاماژە بۆ وەڵاتی حیجاز دەکات ، چونکە خوێنەکانیان تەنك و ناسکە ، هەروەها خوێنەکە لە ڕووی جەستەیانەوە نزیکە چونکە گەرما ئەو خوێنە ڕادەکێشێت و دەریدەهێنێتە دەرەوە بۆ ڕووی جەستەیان ، لە لاکانی پێستدا کۆدەبێتەوە ، سەرەڕای ئەوەش کونیلەی پیستیان فراوانەو ، هێزیشیان شلۆقە ، بۆیە بەکارهێنانی خوێن بەردان مەترسیەکی گەورەی تێدایە بۆ ئەوان ، کەڵەشاخ گرتنیش بڵاوپێکردنەوەیەکی پەیوەندی خۆویستە بەدوایدا هەموو خوێنەکە لە خوێنبەرەکاندا دەکرێتە دەرەوە ، بە تایبەت ئەو خوێنبەرانەی ناتوانرێت کرداری خوێن بەربوونی بۆ ئەنجام بدرێت ، خوێن لێدەرهێنانی هەر جێگەیەکیش سوودی تایبەتی خۆی هەیە ، بۆیە خوێن لێدەرهێنانی ( الباسليق )(٧٨) : بەسوودە بۆ چارەسەری گەرمی جگەرو سپڵ و ئەو ئاوسانانەی تیایاندا دروست دەبێت بە هۆی خوێنەوە ، بە

---

٧٧ ــ ضعيف : أورده في ضعيف الجامع ( ٢٩٢٤ ) بلفظ : (( خير ما تداويتم به الحجم والفصد )) ۰ أخرجه أبونعيم في (( الطب )) عن علي ــ رضي الله عنه ــ ۰ والحديث صحيح بغير قوله (( والفصد )) وهو مروي في الصحيحين ۰

٧٨ ــ الباسليق : خوێنبەرێکە لە دەستدا ، نزیك بە ئانێشك ، لە لای چەپەوە دەست پێ دەکات تا ئەو جێگایانەی لە دوای بن هەنگڵەوەن ، بڕوانە : فقه اللغة ، الثعالبي ، وەرگێڕ ۰

سووده بۆ چارەسەری ئاوسانەکانی سی ، بە سوودە بۆ چارەسەری نەخۆشیەکانی ( الشَّوْصَة )و[٧٩] بۆ نەخۆشی ( ذات الجنب )[٨٠] هەروەها هەر هەموو نەخۆشیە خوێنیە کاتیەکان لە نێوان خوارووی ئەژنۆوە بۆ ڕان ٠

وە خۆین دەرهێنانی ( الأكحل )[٨١] بە سوودە بۆ چارەسەکردنی هەر پڕبوونێکی کاتی لە هەموو جەستەدا ئەگەر ئەو پڕبوونە خوێنی بوو ، هەروەها ئەگەر خوێن بۆگەن بوبو لە هەموو جەستەدا ٠

وە خوێن دەرهێنانی ( القيفال )[٨٢]: بەسوودە بۆچارەسەری نەخۆشیە کاتیەکان لە سەرو ملدا بە هۆی زۆری خوێنەوە یا بۆگەنی خوێنەوە ٠

وە خوێن دەرهێنانی ( الوَدْجيْن )[٨٣] : بە سوودە بۆ چارەسەرکردنی ئێشی سپڵ و ، ڕەبو و ، هەناسە بڕکێ و ، ئیشانی تەوێڵ ٠

کەڵەشاخ گرتن لە سەر شان ( الكاهل ) : بەسوودە بۆ چارەسەری ئیشانی هەردوو شان و گەروو ٠

---

٧٩ ـ الشَّوْصة : ئازارێکە لە سکدا پەیدا دەبێت بە هۆی بایەکەوە کە لە نێو ماسولکەکاندا کۆدەبێتەوەو بە هۆی دەمارلێدانێکەوە ، بڕوانە : الفائق في غريب الحديث والأثر ، الزمخشري * وەرگێڕ ٠

٨٠ ـ ذات الجنب : برین و تڵۆقێکی پیسە توشی مرۆڤ دەبێت و سك کون دەکات ، بڕوانە : لسان العرب ٠ وەرگێڕ ٠

٨١ ـ الأكحل : خوێنبەرێکە لە ناوەڕاستی قۆڵدایەو لە ناوەراستی خوێنبەرەکانی ( الباسليق ) و ( القيفال )دایە ، بڕوانە : مشكل الأثار للطحاوي * وەرگێڕ ٠

٨٢ ـ القيفال : خوێنبەرێکە لە دەستدا ، دیسان نزیك بە ئانیشکە ، کەوتۆتە لای ڕاستی دەست ، بڕوانە : المعجم الوسيط : إبراهيم الزيات ، وەرگێڕ ٠

٨٣ ـ الوَدْجيْن : دوو خوێنبەری ئەم لاو ئەو لای ملە ، بڕوانە : قاموسی ڕستە ، مەلا محمودی کەلالەیی ٠ وەرگێڕ ٠

كەڵەشاخ گرتن لە سەر ( الأخدعين )[٨٤] بە سوودە بۆ چارەسەری نەخۆشیەکانی سەرو ، بەشەکانی ، وەکو دەم و چاو ، ددانەکان و ، هەردوو گوێ و ، هەردوو چاو و ، لووت و ، گەروو ئەگەر هۆی ڕوودانی ئەوانە بگەڕێتەوە بۆ زۆری خوێن یا بۆگەن بوونی یا هەردووکیان پێکەوە ٠

وقال أنس _ رضي الله عنه _ : كان رسول الله ﷺ يحتجم في الأَخْدَعَيْن والكاهل[٨٥]

واتە : ( أنس ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ دەفەرمێت : پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەر هەردوو ڕەگی لای ملی و لە نێوان هەردوو شانیدا کەڵەشاخی گرت ٠

وفي الصحيحين عنه : كان رسولُ الله ﷺ يحتجم ثلاثاً : واحدةً على كاهله ، واثنين على الأَخْدَعَيْن[٨٦]

واتە : لە ( الصحيحين )دا هاتووە کە : پێغەمبەری خوا ﷺ سێ کەڵەشاخی دەگرت : یەکێك لە نێوان هەردوو شانیداو ، دووانیشیان لە سەر هەردوو ڕەگی لای مل ٠

وفي الصحيح عنه : أنه احتجم وهو محرمٌ في رأسه لِصداع كان به[٨٧]

واتە : لە فەرموودەیەکی ( صحيح )دا هاتووە : پێغەمبەری خوا ﷺ ئیحرامی بەستبوو کە کەڵەشاخی لە سەریدا گرت بە هۆی ئازارێکەوە هەیبوو ٠

---

٨٤ _ الأخدعين : دوو ڕەگە بەلای ملەوەیە ، بڕوانە : قاموسی ڕستە ، مەلا محمودی گەلالەیی ٠ وەرگێڕ ٠

٨٥ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ١١٩ ، ١٩٢ ) وأبوداود ( ٣٨٦٠ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٨٣ ) ، والترمذي ( ٢٠٥١ ) ، وفي الشمائل ( ٣٦٤ ) ٠ كلهم من طريق قتادة عن أنس فذكره ٠

٨٦ _ هو السابق ، ولم أجده في الصحيحين ولعله وهم من المصنف ٠

٨٧ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٥ / ٣٤٥ ) ، والبخاري ( ٣ / ١٩ ) ، ( ٧ / ١٦٢ ) ، ومسلم ( ٤ / ٢٢ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٨١ ) ، والنسائي ( ٥ / ١٩٤ ) كلهم من طريق سليمان بن بلال عن علقمة بن أبي علقمة ، عن الأعرج عن عبدالله بن بجينة قال : (( احتجم رسول الله _ صلى الله عليه وسلم _ بلحي جمل ، وهو محرم ، وسط رأسه ٠ واتە : پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ لە شوێنی ( لحي جمل ) ٠ کە ئیحرامیشی بەستبوو ، لە ناوەڕاستی سەریدا کەڵەشاخی گرت ٠ ولم أجده عن أنس ٠

وفي سنن ابن ماجة عن عليّ : نزل جبريل على النبي ﷺ بحجامة الأَخْدَعَيْنِ والكاهِلِ[٨٨]

واتـه : ( علـي ) _ خـواى لـىّ ڕازى بێـت _ فەرموويـەتى : ( جبريـل ) دابەزيـە خزمـەتى پێغەمبەرى خوا ﷺ و فەرمانى كەڵەشـاخ گرتنـى پێكـرد لـە سـەر دوو ڕەگـى لاى مـل و نێـوان هەردوو شان ٠

وفي سنن أبي داود من حديث جابر : أنَّ النبيَّ ﷺ احتجم في وَرِكه من وثءٍ كان به[٨٩]

واتـه : ( جـابر ) _ خـواى لـىّ ڕازى بێـت _ فەرموويـەتى : پێغەمبـەرى خـوا ﷺ لـە سـەر سەرووى ڕانى كەڵەشاخى گرت بە هۆى شينبوونەوەو كوترانێكەوە هەيبوو ٠

## بەشێك : سەبارەت بە جياوازى پزيشكان لە بارەى كەڵەشاخ گرتنەوە لە سەر ( نقرة القفا ):

پزيشـكان جيـاوازبوون سـەبارەت بـە كەڵەشـاخ گـرتن لـەو چـاڵايەى كـە دەكەوێتـە پشـتى مێشـكەوە ( نقـرة القفـا ) ، وذكـر أبـونعيم في كتـاب الطـب النبـوي حـديثا مرفوعـاً : (( عَلَـيْكم بالحِجَامَة في جَوْزَةِ القَمَحْدُوة ، فإنها تشفي من خمسة أدواءٍ ذكر منها الجُذام[٩٠]

واتـه : ( أبونعيم ) لە كتێبى ( الطب النبوي )دا ئـەم فـەرموودە دەگێڕێتـەوە : (( كەڵەشـاخ بگرن لە كۆتايى سەرو پشتە سەردا ، چونكە پێنج نەخۆشى چاك دەكاتەوە ، لەوانە نەخۆشـى گولى باسكردووە )) ٠

---

٨٨ _ ضعيف جداً : أخرجه ابن ماجة ( ٣٤٨٢ ) ٠

٨٩ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ٣٠٥ ، ٣٥٧ ، ٣٨٢ ) ، وأبوداود ( ٣٨٦٣ ) وابن ماجة ( ٣٠٨٢ ) ، والنسائي ( ٥ / ١٩٣ ) ، وابن خزيمة ( ٢٦٦٠ ) ، ( ٢٦٦١ ) كلهم عن أبي الزبير عن جابر ٠

٩٠ _ إسناده ضعيف : ضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٣٧٥٨ ) ٠ الطب النبوي ، بتحقيق أبي عبدالرحمن عادل بن سعد ٠

وفي حديث آخر : (( عليكم بالحِجَامَة في جَوْزَةِ القَمَحْدُوة ، فإنها شفاءٌ من اثْنَيْن وسَبْعين داءً ))[٩١].

له فه‌رمووده‌یه‌كی دیكدا : (( كه‌ڵه‌شاخ بگرن له كۆتایی سه‌رو پشته سه‌ردا ، چونكه حه‌فتاو دوو نه‌خۆشی چاك ده‌كاته‌وه )) ٠

كۆمه‌ڵێكیان به چاكیان داناوه‌و گووتویانه : به سووده بۆ چاكبوونه‌وه‌ی چاو ده‌رتۆقین ، ئه‌و گرێ یانه‌ی تیایدا دروست ده‌بێت ، زۆر له نه‌خۆشیه‌كانیی ، قورسبوونی برۆ پێڵوو ، گه‌ڕۆڵیی چاو ٠

باسكراوه كه‌وا پێشه‌وا ( أحمد )ی كوڕی ( حنبل ) پێویستی به كه‌ڵه‌شاخ بوو ، بۆیه كه‌ڵه‌شاخی بۆ گیرا له هه‌ردوو لای ملیداو ، له ( نقرة القفا )دا نه‌یگرت ٠

هه‌روه‌ها له‌و كه‌سانه‌ش حه‌زیان پێ نه‌بووه دانه‌ری كتێبی ( القانون )ه‌و ، ده‌ڵێت : نه‌خۆشی له بیرچوونه‌وه دروست ده‌كات به دڵنیایی ، چونكه پێشه‌وامان محمد ﷺ فه‌رموویه‌تی كۆتایی ده‌ماغ جێگه‌ی پاراستنی زانیاریه‌كانه‌و ، كه‌ڵه‌شاخ گرتن ده‌یفه‌وتێنێت ٠ ته‌واوبوو ٠

كه‌سانی تریش به‌رپه‌چیان داوه‌ته‌وه‌و ، ده‌ڵێن : فه‌رمووده‌كه جێگیر نه‌بووه‌و ، ئه‌گه‌ر جێگیریش بێت له ڕاستیدا كه‌ڵه‌شاخێك كۆتای مێشك بێ هێز ده‌كات ئه‌گه‌ر به‌بێ زه‌رووره‌ت گیرا ، به‌ڵام ئه‌گه‌ر له كاتی زاڵبوونی خوێن به‌سه‌ر مێشكدا گیرا ، به سوود ده‌بێت له ڕووی پزیشكی و شه‌رعیشه‌وه ، چونكه جێگیر بووه كه‌وا پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له چه‌ندین جێگه‌ی پشته‌وه‌ی ملێدا كه‌ڵه‌شاخی گرتووه به گویره‌ی بارودۆخێك پێویستی به‌وه بوایه ، له جێگه‌ی تریش جگه له پشته‌وه‌ی مل كه‌له‌شاخی گرتبوو به گوێره‌ی پێویست ٠

---

٩١ ــ إسناده ضعيف : ضعفه الألباني في السلسلة الضعيفة ( ٣٨٩٤ ) ، الطب النبوي ، بتحقيق أبي عبدالرحمن عادل بن سعد ٠

## بەشێك سەبارەت بە كەڵەشاخ گرتن لە ژێر چەناكەدا :

كەڵەشاخ گرتن لە ژێر چەناگەدا بۆ چارەسەری ئێش و ئازاری ددان و دەم و چاو گەروو بەسوودە ، ئەگەر لە كاتی خۆیدا بە كارهێنرا ، هەروەها سەرو شەویلگەش پاك دەكاتەوە.

دەتوانرێت كەڵەشاخ گرتن لە سەر پێ لە جیاتی خوین دەرهێنان بەكاربهێنرێت لە ( الصَّافن )دا كە ڕەگێكی گەورەیەو نزیك بە پاژنەیەو لە بەری قاچەوە درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە شا دەماری ران ٠ بۆ چارەسەركردنی برینەكانی ڕان و لاق و پێ و ، بچڕانی بێنوێژی و ، ئاڵۆشی و خورووی كاتی لە ئەندامەكانی زاوزێی پیاو ئافرەتدا بەسوودە ٠

كەڵەشاخگرتن لە ژێرەوەی سنگدا بۆ چارەسەری ئەو ئاوسان و ڕزینە سنوردارەی كە لە پێستی سەر ڕان بە دەردێن و كێم و زوخاوی لێ پەیدا دەبێت بەسوودەو ، بەرگری لە گولبوونی دەكات و ، بۆ چارەسەی ئەو زیپكەو بلۆقانەی لە سەری بە دەردێن بەسوودە ، هەروەها بۆ جومگەژانی و ، بۆ مایەسیری و ، بۆ ئاوساوی قاچ و پێ و ، خووروی پشت باشە.

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە كاتەكانی كەڵەشاخ گرتندا :

روى الترمذي في جامعه من حديث ابن عباس يرفعه : (( إنَّ خيرَ ما تَحتَجِمونَ فيهِ سابِعَ عَشَرَةَ ، أو تاسِعَ عشرةَ ، ويومُ إحدى وعَشْرينَ ))[٩٢]

واتە : ( ابن عباس ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( چاكترین ئەو ڕۆژانەی كەڵەشاخی تێدا بگرن حەڤدەو ، نۆزدەو ، بیست و یەكن )).

٩٢ _ تقدم تخريجه ٠

وفيه عن أنس : كان رسولُ الله ﷺ يَحْتَجِمُ في الأخدَعَين والكاهل ، وكان يَحتَجِم لِسَبْعَةَ عشَرَ ، وتِسْعَةَ عَشَرَ ، وإحدى وعِشرين[٩٣]

واته : له ( أنس )ەوه _ خوای لیّ ڕازی بیّت _ فەرموویەتی : پیّغەمبەری خوا ﷺ له سەر دوو ڕەگی لای ملی و له نیّوان هەردوو شانیدا کەڵەشاخی دەگرت ، له ڕۆژانی حەڤدەو ، نۆزدەو ، بیست و یەك ٠

وفي سنن ابن ماجة مرفوعاً : (( مَن أراد الحِجَامَة فَلْيَتَحَرَّ سَبْعَةَ عشَرَ ، أو تِسْعَةَ عشَرَ ، وفي إحدى وعِشرِينَ ، لا يَتَبَيَّغْ بأحَدِكُم الدَّمُ ، فيقتلَه ))[٩٤]

واته : ( أنس ) _ خوای لیّ ڕازی بیّت _ فەرموویەتی : پیّغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( هەرکەس ویستی کەڵەشاخ گرتنی هەبوو با بەدوای ڕۆژانی حەڤدەو ، نۆزدەو ، بیست و یەکدا بگەڕیّت ، بۆ ئەوەی فشاری خویّنی یەکیّکتان بەرز نەبیّتەوەو ، بمریّت )) ٠

وفي سنن أبي داود من حديث أبي هريرة مرفوعاً : (( مَن احْتَجَمَ لِسَبْعَ عَشْرَةَ ، أو تِسْعَ عَشْرَةَ ، أو إحدى وعِشْرِينَ ، كانَتْ شِفاءً من كلِّ داءٍ ))[٩٥]

واته : ( أبي هريرة ) _ خوای لیّ ڕازی بیّت_ فەرموویەتی : پیّغەمبەری خوا ﷺفەرمووی : (( هەرکەس له ڕۆژانی حەڤدەو ، نۆزدەو ، بیست و یەکی مانگدا کەڵەشاخ بگریّت ، دەبیّت بە هۆکاری چاکبوونەوەی هەموو نەخۆشیەکانی )) ٠ واته : ئەو نەخۆشیانەی هۆکاری دەگەڕیّتەوە بۆ زاڵبوونی خویّن بە سەر شویّنیّکی جەستەدا ٠

---

٩٣ _ تقدم تخريجه ٠

٩٤ _ صحيح : أخرجه ابن ماجة ( ٣٤٨٦ ) عن النهاس بن قهم عن أنس فذكره مرفوعاً ٠

٩٥ _ حسن : أخرجه أبوداود ( ٣٨٦١ ) عن أبي صالح عن أبي هريرة مرفوعاً ٠

هەموو ئەم فەرموودانە گونجاوی کۆڕایەتی پزیشکانە ، بەوەی کەڵەشاخ گرتن لە نیوەی دووەم و ، بەشی سێیەمی چوار بەشەکەی مانگدا بە سوودتر دەبێت بە بەراوردی سەرەتاو کۆتایی مانگ ، بەڵام ئەگەر لە کاتی پێویستبوونیدا بەکارهێنرا ، بە سوود دەبێت ئەگەر لە سەرەتاو کۆتای مانگیشەوە بێت ٠

( الخَلال ) دەڵێت : ( عصمةُ )ی کوڕی ( عصام ) پێی ڕاگەیاندم و گووتی : ( حنبل ) بۆی باسکردین و ، گووتی : ( أبو عبدالله أحمد )ی کوڕی ( حنبل ) کەڵەشاخی دەگرت هەرکاتێك خوێنی هەڵچوبا و ، هەر کاتێکیش بوایە ٠

دانەری کتێبی ( القانون ) دەڵێت : کاتەکانی لە ڕۆژدایە : کاتژمێر دوو و سێ ، پێویستە مرۆڤ خۆی لێ بەدوور بگرێت پاش خۆشتن بەدەر لەو کەسانەی خوێنیان چڕە ، پێویستە ئەم کەسە خۆی بشوات ، پاشان کاتژمێرێك پشوو بدات ، پاشان کەڵەشاخ بگرێت ٠ تەواوبوو ٠

بەلایانەوە کەڵەشاخ گرتن لە سەر تێربوون باش نی یە ، چونکە پێدەچێ چەندین کونیلەی داخراو و چەندین نەخۆشی دروست بکات ، بە تایبەت ئەگەر خۆراکەکە خراپ و چڕ بێت ٠ لە ( أثر )ێکدا هاتووە : (( کەڵەشاخ گرتن پێش نانی بەیانی دەرمانە ، لە سەر تێربوون نەخۆشی یەو ، لە حەڤدەی مانگدا چاکبوونەوەیە )) ٠

هەڵبژاردنی ئەم کاتانە بۆ کەڵەشاخ گرتن ، لە بنەڕەتدا بۆ پارێزکردن و ، خۆپاراستنە ، بۆ ئەوەی مرۆڤ هیچ زیانێکی پێ نەگاو ، بۆ پاراستنی تەندروستیە ، بەڵام بۆ چارەسەری نەخۆشیەکان ، لە هەر کاتێکدا پێویستترا بەکاردەهێنرێت ٠

فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوادا ﷺ (( لا يَتَبَيَّغْ بأحدِكم الدَّمُ فيقتلَهُ )).
واتە : بۆ ئەوەی فشاری خوینی یەکیکتان بەرز نەبێتـەوەو بمرێت ٠ بەڵگـەی گوفتارەکـانی سـەرەوەمانە ٠ پێشـتریش ئامـاژمـان پێـدا کـەوا ئیمـامی ( أحمـد ) لـە هـەر کـاتێکی مانگـدا پێویستی بە کەڵەشاخ هەبوایە دەیگرت ٠

## بەشێك سەبارەت بەو ڕۆژانەی کە کەڵەشاخی تێدا ( مکروه )ە :

سـەبارەت بـە هەڵبـژاردنی ڕۆژەکـانی هەفتـە بـۆ کەڵەشـاخ گـرتن ، ( الخَـلّال ) لـە ( جـامع )ەکەیدا دەڵێت : ( حرب )ی کوڕی ( إسماعیـل ) پێـی ڕاگەیانـدین و ، گـووتی : بـە پێشـەوا ( أحمد )م گووت : ئایا هیچ ڕۆژێك هەیە لە هەفتەدا بەلاتـەوە کەڵەشـاخ گرتنـی تێـدا ( مکـروه ) بێت ؟ فەرمووی : ڕۆژانی شەمەو چوارشەم هاتووە ٠

هەروەها لە هەمان کتێبی ( الجامع )ی ( الخَلّال )دا هاتووە : ( الحسین )ی کـوڕی ( حسّـان ) سەبارەت بە کەڵەشاخ گرتن لە ( أبا عبدالله )ی پرسی : لە چ کاتێکدا ( مکـروه )ە ؟ گـووتی : لە ڕۆژانی شەمەو ، چوارشەم و گووتیانە ڕۆژی هەینیش ٠

وروى الخَلال ، عن أبي سلمةَ وأبي سعيد المقبُري ، عن أبـي هريـرة مرفوعـاً : (( مَـن احْـتَجَمَ يومَ الأبِعاء أو يومَ السبتِ ، فأصابَهُ بياضٌ أو بَرَصٌ ، فلا يَلُومَنَّ إلا نَفسَهُ ))[٩٦]

واتە : ( أبي هريرة )_ خوای لێ ڕازی بێت_ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فـەرمووی : (( هەرکەس ڕۆژانی شەمەو چوارشەمە کەڵەشاخ بگرێت و ، سپێتیەك یـا نەخۆشـی بەڵـەکی لـە جەستەیدا پەیدا بوو ، با تەنها سەرزەنشتی خۆی بکات )) ٠

---

٩٦ _ إسناده ضعيف : أخرجه الحاكم ( ٤ / ٤٠٩ ) ، والبيهقي ( ٩ / ٣٤٠ ) ، وضعفه في الضعيفة ( ١٥٢٤ ).

( الخَلال ) دەڵێت : ( محمد )ی کوڕی ( علی ) کوڕی ( جعفر ) پێی ڕاگەیاندین ، کەوا ( یعقوب )ی کوڕی ( بختان ) بۆی باسکردبوون و ، گوتبووی : سەبارەت بە بەکارهێنانی ( النُّورة )و کەڵەشاخ گرتن لە ڕۆژانی شەمەو چوارشەمەدا لە ( أحمد )یان پرسی ؟ ئەوەبوو بە ( مکروه )ی داناو ، فەرمووی : هەواڵم پێ گەشتووە کەوا پیاوێك ( النُّورة )ی بەکارهێناو ، پاشان کەڵەشاخی گرت بۆیە تووشی نەخۆشی بەڵەکی بوو منیش بە ( أحمد )م گووت : وەکو ئەوەی پیاوەکە بە سووك تەماشای فەرموودەکەی کردبێت ؟ فەرمووی : بەڵێ ٠

وفي كتاب الأفراد للدَّارَقُطنيِّ ، من حديث نافع قال : قال لي عبدالله بن عمر : تَبَيَّغَ بي الدم ، فابْغِ لي حجَّاماً ولا يكن صبيّاً ولا شيخاً كبيراً ، فإني سمعتُ رسول الله يقول : (( الحِجَامَة تَزيدُ الحَافظَ حِفْظاً ، والعاقلَ عقلاً ، فاحْتَجِمُوا على اسم الله تعالى ، ولا تَحْتَجِمُوا الخَميسَ ، والجُمُعةَ ، والسَّبْتَ ، ولا الأحَدَ ، واحْتَجِمُوا الإثْنَيْن ، وما كان من جُذامٍ ولا بَرَصٍ ، إلا نزلَ الأربِعاء٠ قال الدَّارَقُطنيِّ : تَفَرَّدَ به زيادُ بن يحيى ، وقد رواه أيوب عن نافع ، وقال فيه : (( واحْتَجِمُوا يومَ الإثْنَيْن والثُّلاثاء ، ولا تَحْتَجِمُوا يوم الأربِعاء ))[٩٧].

واتە : ( نافع ) فەرموویەتی : ( عبدالله )ی کوڕی ( عمر ) پێی گووتم : خوێنم هەڵچووەو فشاری بەرز بۆتەوە ، کەڵەشاخ گرێکم بۆ بانگ بکە با منداڵ نەبێت و پیاوێکی بە تەمەنیش نەبێت ، چونکە گوێبیستی پێغەمبەری خوابووم ﷺ دەیفەرموو : (( کەڵەشاخ گرتن توانای لەبەرکردنی کەسی لەبەرکار زیاد دەکات و ، ئەقڵ و ژیری کەسی ئاقڵ و ژیر زیاد دەکات ، بۆیە بە ناوی خواوە کەڵەشاخ بگرن و ، ڕۆژانی پێنج شەم و ، هەینی و ، شەمەو ، یەك شەم کەڵەشاخ مەگرن ، بەڵکو ڕۆژی دووشەم کەڵەشاخ بگرن ، چونکە هەموو گولی و بەڵەکیەك ڕۆژی چوارشەم دادەبەزێت ٠ پێشەوا ( الدَّارقُطنيِّ ) فەرموویەتی : ( زیاد )ی کوڕی ( یحیی ) تاك بۆتەوە لە گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیەدا ، ( أیوب ) لە ( نافع )ەوە فەرموودەکە

---

٩٧ ـ إسناده صحيح : أخرجه ابن ماجة ( ٣٤٧٨ ) ، والحاكم ( ٤ / ٤٠٩ ) ، وصححه الألباني في صحيح ابن ماجة ( ٢٨١٠ ) ٠

دەگێڕێتـەوەو ، تیایـدا دەڵێـت : (( ڕۆژانـی دووشـەم و سـێ شـەم کەڵەشـاخ بگـرن و ، ڕۆژی چوارشەم کەڵەشاخ مەگرن )) ٠

وقد روى أبوداود في سننه من حديث أبي بكرةَ ، أنه كان يكره الحِجَامَةَ يَـومَ الثُلاثـاءِ ، وقـال : إنَّ رسول الله ﷺ، قال : يومُ الثُلاثاءِ يوم الدَّمِ وفيه ساعةٌ لا يَرْقَأُ فِيهَا الدَّمُ [٩٨]

واتە : ( أبـي بكرة ) حـەزی بـە کەڵەشـاخ گرتن نـەبوو ڕۆژی سـێ شـەم و ، دەیفـەرموو : پێغەمبەری خوا ﷺ فـەرمووی : ڕۆژی سـێ شـەم ڕۆژی خوێنـەو کـاتێکی تێدایـە خـوێنی تێدا خوێنەکەی تێدا ناوەستێ ٠

## بەشێك سەبارەت بە شیاوێتی کەڵەشاخ گرتنی کەسی بەڕۆژو جیاوازبوون سەبارەت بەوەی کە ئایا بەو هۆیەوە ڕۆژوەکەی دەشکێت ؟

**چەندین سوودی گرنگ لە فەرموودەکانی پێشوەوە وەردەگیرێت :**

١. خۆ چارەسەکردن ( مستحب )ە ٠

٢. کەڵەشاخ گرتن ( مستحب )ەو ، لەو شوێنەشدا ئەنجام دەدرێت کە بارودۆخ پێویستی بکات ٠

٣. شیاوێتی کەڵەشاخ گرتنی ئەو کەسەی ئیحرامی بەستووە ، ئەگەرچی ببێ بە هۆکـاری بڕینی کەمێك لە توکی لەش ، چونکە لەم بارەدا ئەوە شیاوە ، بەڵام بۆ ئەوەی ( فدیـة ) بـدات بۆ لادانی تووکەکە ، هێشتا جێی تێڕوانینەو ، ( واجب )بوونی بەهێز نی یە ٠

٤. شیاوێتی کەڵەشاخ گرتنی کەسی بە ڕۆژوو ، چونکە لە ( صحیح )ی ئیمامی ( البخـاري )دا هـاتووە : (( أنَّ رسـول الله ﷺ احْـتَجَمَ وهـو صـائم )) [٩٩] واتـە : (( پێغەمبـەری خـوا ﷺ

---

٩٨ ـ ضعيف : أخرجه أبوداود ( ٣٨٦٢ ) ، وضعفه الألباني في الضعيفة ( ٦٤٦٦ ) ٠

كەڵەشاخی گرت و لەو کاتەشدا بەڕۆژوو بوو )) ، بەڵام: ئایا بەو کەڵەشاخ گرتنە ڕۆژووەکەی دەشکێت ، یاخود نە ء؟ مەسەلەیەکی ترە ، ڕاست : شکاندنی ڕۆژووە بە کەڵەشاخ گرتن ، چونکە ئەوە بە ( صحيح )ی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتووە بەبێ هیچ بەرهەڵستکارێك و ، ڕاسترین شتێکیشە کە بەرهەڵستکاری فەرموودەکەی سەرەوەی پێ دەکرێت ، بەڵام ئەو شتە ئاماژە بۆ نەشکاندنی ڕۆژوو ناکات مەگەر پاش چوار شت : یەکەم : ڕۆژووەکە فەرز بوو . دووەم : نیشتەجێ بوو . سێ یەم : هیچ نەخۆشیەکی نەبوو پێویست بە کەڵەشاخ گرتن بکات . چوارەم : ئەم فەرموودە دواکەوتوترە لەو فەرموودەیەی کە تیایدا دەفەرمێت : (( أفطرَ الحاجِمُ والمحجُومُ ))[100] واتە : (( ئەو کەسەی کە کەڵەشاخی بۆ دەگیرێت و ئەو کەسەش کە کەڵەشاخ دەگرێت هەردووکیان ڕۆژوویان شکاوە )) . بۆیە چ کاتێك ئەو چوار پێشەکیانە جێگیربوون ، ئەوجا دەتوانرێت کرداری پێغەمبەری خوا ﷺ بکرێت بە بەڵگە بۆ مانەوەی ڕۆژوو لە گەڵ کەڵەشاخ گرتندا ، لە لایەکی تریشەوە ئەگەر ڕۆژووەکە سوونەت بوو شیاوە مرۆڤ لێی بچێتە دەرەوەو بیشکێنێت بە کەڵەشاخ گرتن و هیتر ، یا ئەگەر ئەو کەسە لە مانگی ڕەمەزانیشدا بێت بەڵام لە سەفەردا بوو ، یا ئەگەر لە ڕەمەزانیشدا بێت و لە ماڵی خۆیدا بێت ، بەڵام پێویستی ناچاری بکات ، وەکو ئەو کەسەی کە نەخۆشیەکی هەیەو پێویستی ناچاری شکاندنی ڕۆژووەکەی پێ دەکات ، یا فەرزێکی ڕەمەزان بێت و لە ماڵی خۆیدا بێت و هیچ پێویستیەك ناچاری نەکردبێت ، بەڵام لە سەر بنەرەتەکە بمێنێتەوە . وە

---

٩٩ ــ صحيح : أخرجه أحمد ( ١ / ٢٣٦ ، ٢٤٩ ، ٢٥٩ ، ٣٥١ ، ٣٧٢ ) ، والبخاري ( ٣ / ٤٢ ، ٤٣ ) ، ( ٧ / ١٦١ ، ١٦٢ ) ، وأبوداود ( ١٨٣٦ ) ، ( ٢٣٧٢ ) ، والترمذي ( ٧٧٥ ) ، والنسائي في الكبرى ( ٢٠٢٠ تحفة ) ، ( ٦٢٢٦ ) ، ( ٦٢٣١ ) عن عكرمة عن ابن عباس فذكره .

١٠٠ ــ صحيح : أخرجه أحمد ( ٤ / ١٢٣ ، ١٢٤ ) ، والدارمي ( ١٧٣٧ ) ، من طريق عبدالله بن زيد أبي قلابة ، عن أبي الأشعث الصنعاني ، عن أبي أسماء الرحبي عن شداد بن أوس فذكر الحديث وفيه قصة ، وأخرجه أحمد ( ٤ / ١٢٤ ) ، به ، وليس فيه أبو الأشعث الصنعاني ، وأخرجه أحمد ( ٤ / ١٢٢ ، ١٢٤ ) ، وأبوداود ( ٢٣٦٩ ) ، وليس فيه أبوأسماء الرحبي ، وأخرجه أبوداود ( ٢٣٦٨ ) ، وابن خزيمة ( ١٦٨١ ) ، وليس فيه أبو الأشعث ولا أبوأسماء .

فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ: (( أفطر الحاجم والمحجوم )) ناقیل و موتەئەخیرەو ، پێویستە کاری پێ بکرێت ٠

٥. بەڵگەیە لە سەر ئەوەی دەتوانرێت پزیشك بە کرێ بهێنرێت بەبێ بەستنی گرێبەستی کرێ گرتەی ، بەڵکو بەهاوشیوەی کرێی هاوەڵانی خۆی کە لەم بوارەدا کاردەکەن کرێی دەدرێتێ ، یا ئەو کرێیەی بدرێتێ کە پێی ڕازی دەبێ ٠

٦. شیاوێتی بژێوی پەیداکردن بە پیشەی کەڵەشاخ گرتنەوە ٠ ئەگەرچی کەسی ئازاد حەزی بە خواردنی کرێی کەڵەشاخ گرتن نی یە بەبێ ئەوەی لێی حەرام بکرێت ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ کرێکەی خۆی پێداو ، خۆاردنیشی لە سەر حەرام نەکرد ، کە پێشی دەڵێت پیس بە هاوشێوەی فەرمایشتێتی بەرامبەر بە پیازو سیر کە پێیان دەڵێ پیس ، بەڵام گوفتارەکانی نەبووە بە بەڵگە بۆ حەرامکردنی ٠

٧. شیاوێتی سەپاندنی باجێکی ڕۆژانەی دیاری کراو بە سەر بەندەی خۆدا بە گوێرەی توانای بۆ کارکردن ، مافی بەندەکەشە تەصرڕوف بکات بەو پارەیەوە کە لە باجە سەپێنراوەکەی سەرشانی زیاد دەبێت ، چونکە ئەگەر نەهێلرێت تەصرڕوف بە زیادەیەوە بکات ئەوا کارەکەی هەمووی دەبێ بە باج و هیچ سودێکی دەست ناکەوێت ، بەڵکو ئەوەی لە باجە سەپێنراوەکەی سەر شانی زیاد دەبێ ، لەلایەن سەرگەورەکەیەوە کراوە بە موڵکی ئەو بەندەیەو مافی خۆیەتی تەصەڕوفی پێوە بکات ٠ والله أعلم ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بڕینی ڕەگەكان و داخكردندا :

ثبت في الصحيح من حديث جابر بن عبدالله ، أنَّ النبيَّ ﷺ بعثَ الى أُبَيٍّ بن كعب طبيباً ، فقَطَعَ له عِرْقاً وكَواه عليه[١٠١]

واتە : ( جابر )ی كوڕی ( عبدالله ) فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ پزیشكێكی نارد بۆ ( أُبَيٍّ ) كوڕی ( كَعب ) ، ئەوەبوو ڕەگێكی بۆ بڕی و داخیشی كرد ٠

ولما رُمِي سعدُ بن معاذٍ في أَكْحَلِه حسَمَهُ النبيُّ ﷺ ، ثم ورِمَت ، فحسَمَهُ الثانية.

واتە : كاتێ ( سعد )ی كوڕی ( مُعاذ ) خوێنبەری ناوەڕاستی دەستی پێكرا پێغەمبەری خوا ﷺ داخیكرد ، بەڵام ئاوسا ، ئەوەبوو دیسان بۆ جاری دووم داخیكردەوە ٠

وفي طريق آخر : أنَّ النبيَّ ﷺ كَوَى سعدَ بنَ مُعاذٍ في أَكْحَلِه بِمِشْقَصٍ ، ثم حسَمَهُ سعد بن مُعاذٍ أو غيرُه من أصحابه[١٠٢]

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ ( سعد )ی كوڕی ( مُعاذ )ی بە سەرە ڕمێكی درێژ لە سەر خوێنبەری ناوەراستی دەستی داخكرد ، پاشان ( سعد ) خۆی داخێكرد یا هاوەڵانیی بۆیان داخكرد ٠

---

١٠١ ــ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ٣٠٣ ، ٣٠٤ ، ٣١٥ ، ٣٧١ ) وعبد بن حميد ( ١٠١٩٨ ) ، ومسلم ( ٧ / ٢٢ ) وأبوداود ( ٣٨٦٤ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٩٣ ) كلهم عن الأعمش عن أبي سفيان عن جابر فذكره ٠

١٠٢ ــ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ٣١٢ ، ٣٥٠ ، ٣٦٣ ، ٣٨٦ ) ، الدارمي ( ٢٥١٢ ) ، ومسلم ( ٧ / ٢٢ ) وابن ماجة ( ٣٤٩٤ ) ، والترمذي ( ١٥٨٢ ) ، كلهم عن أبي الزبير عن جابر فذكره في قصة ٠

وفي لفظ آخر : أنّ رجلاً من الأنصار رُمِي في أكْحَلِه بِمشْقَص ، فأمر النبيُّ ﷺ به فكُوِيَ.

واته : لـه بێژەیـەکی دیکـەدا : پیاوێك لـه پشتیوانان بـه سـەره ڕمێکـی درێژ خوێنبـەری ناوەڕاستی دەستی پێکرا ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیداو ئێتربۆی داخکرا ٠

( أبوعُبيد ) دەفەرمێت : پیاوێك هێنرایـه خزمـەتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ داخکردنـی بۆ وەسف کرابوو ، ئەوەبوو فەرمووی : داخی بکەن و پاشان بەرد گەرم بکەن و بیخەنە سەری ٠

( الفضل )ی کوڕی ( دُكَين ) دەفـەرمێت : ( سُفيان ) لـه ( أبـي الـزبير )ەوه لـه ( جـابر )ەوه بـۆی باسـکردین : کـەوا پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـه سـەر خوێنبـەری ناوەڕاسـتی دەسـتی هەستا به داخکردنی ٠

وفي صحيح البخاري من حديث أنس ، أنه كُوِيَ من ذات الجَنْبِ والنَّبيُّ ﷺ حَيٌّ[(١٠٣)]

واته : ( أنس ) فەرموویەتی : بەهۆی نەخۆشی ( ذات الجنـب )ەوه داخکـرام و پێغەمبـەری خواش ﷺ زیندو بو ٠

وفي الترمذي عن أنسٍ أنَّ ﷺ كَوَى أسْعَدَ بن زُرَارَةَ من الشَّوْكَةِ[(١٠٤)]

واته : ( أنس ) _ خوای لـێ ڕازی بێـت _ فەرموویـەتی : پێغەمبـەری خـوا ﷺ ( أسْعَد )ی کوڕی ( زُرارة )ی به هۆی نەخۆشی ( الشوكة )ەوه داخ کرد ٠

---

١٠٣ _ ذكره البخاري تعليقاً عن أنس كتاب (( الطب )) باب (( ذات الجنب ) ، وأخرجه أحمد ( ٣ / ١٣٩ ) عن أنس قال : (( كواني أبوطلحة ورسول الله _ صلى الله عليه وسلم _ بين أظهرنا ، فما نهيت عنه )) ٠واته : ( أنس ) _ خوای لیّ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : (( ( أبو طلحة ) داخی کردم و ، پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ له نێوانماندا دەژیاو ، قەدەغەی نەکردم )) ٠

١٠٤ _ صحيح : أخرجه الترمذي ( ٢٠٥٠ ) من طريق معمر عن الزهري عن أنس فذكره ٠

الشَوْكة : نەخۆشیەکە به هۆی سنکەگوشیەوه توشی مرۆڤ دەبێت و سورایەك هەموو جەستەو دەم و چاو دادەپۆشێ ، بڕوانه : نيل الأوطار ، ج٩ ، ص٧٩ ٠

وقد تقدَّم الحديث المتفَقُ عليه وفيه : ومَا أُحِبُ أن أكْتوِي[١٠٥]

واته : پێشتر ئەم فەرموودەیەمان باس کرد کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : حەزم بە خۆ داخ کردن نی یە ·

وفي لفظ آخر : وأنا أنْهَى أُمَّتِي عن الكَيّ[١٠٦]

واته: لە بێژەیەکی تردا : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : من قەدەغەی ئومەتەکەم دەکەم لە خۆ داخ کردن.

وفي جامع الترمذي وغيره عن عِمران بن حصين ، أنَّ النَّبيَّ _ صلى الله عليه وسلم _ نَهَى عن الكَيِّ قال : فابْتُلِينا فاكْتوينَا فما أفلحْنا ، ولا أنجحنا[١٠٧]· وفي لفظ : نُهِينا عن الكَيِّ ··· وقال : فما أفْلَحْنَ ولا أنْجَحْنَ[١٠٨]

واته : ( عِمران )ی کوڕی ( حصین ) فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی خۆ داخکردنی کردووەو فەرمووی : توشبوین ، خۆمان داخ کرد ، نەڕزگارمان بوو ، نە دەریشچوین · لە بێژەیەکی تردا : قەدەغەی خۆ داخکردنمان لێکراوەو ··· فەرمووی : نە ڕزگاری کردو نەش دەریچاند ·

---

١٠٥ _ تقدم تخريجه ·

١٠٦ _ تقدم تخريجه ·

١٠٧ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٤ / ٤٢٧ ، ٤٣٠ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٩٠ ) ، والترمذي ( ٢٠٤٩ ) ، كلهم عن الحسن عن عمران بن حصين فذكره

١٠٨ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٤ / ٤٤٤ ، ٤٤٦ ) ، وأبوداود ( ٣٨٦٥ ) كلاهما عن مطرف عن عمران بن حصين فذكره ·

پێشەوا ( الخطابي ) فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ ( سعد )ی داخکرد بۆ ئەوەی خوێنەکەی بوەستێتەوە ، چونکە لەوە ترسا خوێنی زۆری لێ بچێت و تیابچێت · داخکردنیش لەم دەروازەیدا بەکارهێنراوە ، وەکو ئەو کەسانەی داخ دەکرێن کاتێ دەستیان یا قاچیان دەبڕدرێت ·

بەڵام سەبارەت بە قەدەغەی داخکردن ، ئەوەیە کەسێك خۆی داخ بکات بۆ شیفا ، وایان دەزانی ئەگەر خۆی داخ نەکات ، تیادەچیت ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردن لە بەر ئەم نێتە·

گووتراوە : لە ڕاستیدا ( عمران )ی کوڕی ( حُصَیْن ) بە تایبەت قەدەغەی لێکرا ، چونکە نەخۆشی مایەسیری هەبوو ، جێگەشی مەترسیدار بوو ، بۆیە قەدەغەی داخکردنی لێکرد ، وەکو ئەوەی ڕاستی قەدەغەکردنەکە بگەڕێتەوە بۆ جێگە مەترسیدارەکە · خواش زاناترە ·

( ابن قتیبة ) دەڵێت : داخکردن دوو جۆرە :

١. داخکردنی کەسی تەندروست بۆ ئەوەی نەخۆش نەکەوێ ، سەبارەت بەم جۆرە گووتراوە : ئەو کەسەی داخ دەکات پەیڕەوی پشت بەستن ناکات ، چونکە دەیەوێت قەدەرو چارەنووس لە خۆی دورخاتەوە ·

٢. داخکردنی برین ئەگەر کێمی تێزا ، وە ئەندام ئەگەر بڕرا ، لەمەدا شیفا هەیە ·

بەڵام ئەگەر داخکردن بۆ تیمارکردن بوو کە پێدەچێ سودبەخش بێت و کاری تێبکات ، پێشدەچێ کاری تێنەکات ، ئەوە لە ( الكراهة )وە نزیکە · تەواوبوو ·

وثبت في الصحيح في حديث السبعين ألفاً الذين يدخلون الجنَّة بغير حساب أنهم الذين لا يَسْتَرقُونَ ، ولا يكتوُون ، ولا يتطيَّرونَ ، وعلى ربهَم يتوكَّلون[١٠٩] .

واته : له فه‌رمووده‌یه‌کی ( صحیح )دا هاتووه که ئه‌و حه‌فتا هه‌زاره‌ی ده‌چنه به‌هه‌شته‌وه به‌بێ لێپرسینه‌وه ئه‌وانه‌ن که داوا له که‌س ناکه‌ن نزای چاکبوونه‌وه‌یان به سه‌ردا بخوێنێ ، داوا له که‌س ناکه‌ن داخیان بکات ، ڕه‌شبین نین ، پشتیش به‌خوای خۆیان ده‌به‌ستن ·

ده‌ره‌نجام ده‌گه‌ینه ئه‌و ڕاستیه‌ی که فه‌رمووده‌کانی داخکردن چوار جۆر شت له خۆ ده‌گرێت :

یه‌که‌م : ئه‌نجامدانی داخکردن ·

دووه‌م : حه‌ز پێنه‌کردنی ·

سێ یه‌م : ستایشکردنی ئه‌و که‌سه‌ی وازی لێهێناوه ·

چواره‌م : قه‌ده‌غه‌کردنی ·

سوپاست بۆ خوا هیچ دژبه‌یه‌کبوونێك له نێوان فه‌رمووده‌کاندا به‌دیناکرێت ، چونکه ئه‌نجامدانی به‌ڵگه‌ی شیاو بونیه‌تی · حه‌زپێنه‌کردنی به‌ڵگه‌ی قه‌ده‌غه‌کردنی نی یه · ستایشکردنی ئه‌و که‌سه‌ی وازی لێهێناوه ، به‌ڵگه‌یه له سه‌ر ئه‌وه‌ی که وازلێهێنانی شایسته‌ترو چاکتره · قه‌ده‌غه‌کردنیشی ده‌چێته بواری هه‌ڵبژاردن و ( الكراهة )وه ، یا ئه‌و جۆره‌یه که پێویست نی یه ، به‌ڵکو به‌کارده‌هێنرێت له ترسی تووشبوون به نه‌خۆشی · خواش زاناتره ·

---

١٠٩ ـ صحيح : أخرجه أحمد ( ١ / ٢٧١ ، ٣٢١ ) ، والبخاري ( ٤ / ١٩٢ ) ، ( ٧ / ١٧٤ ) ، ( ٨ / ١٢٤ ، ١٤٠ ) ، ومسلم ( ١ / ١٣٧ ، ١٣٨ ) ، والترمذي ( ٢٤٤٦ ) ، كلهم عن حصين بن عبدالرحمن ، عن سعيد بن جبير عن ابن عباس فذكره في حديث طويل ·

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەرکردنی فێدا :

أخرجا في الصحيحين من حديث عطاء بن أبي رباح ، قال : قال ابن عباسٍ : ألا أُرِيكَ امْرَأَةً من أهلِ الجَنَّة ؟ قلتُ : بَلى · قالَ : هذهِ المرْأةِ السَّوْداءُ ، أتَت النبيَّ ﷺ فقالتْ : إنِّي أُصْرَعُ ، وَإنِّي أتَكَشَّفُ فادْعُ الله لي ، فقالَ : إنْ شِئْتِ صَبَرْتِ ولَكِ الجَنَّةُ ، وإنْ شِئْتِ دعوتُ الله لكِ أن يُعافِيَكِ ، فقالت : أصبرُ · قالتْ : فإني أتكشَّفُ ، فَادعُ الله أن لا أتكشَّف ، فدعا لها(110) ·

واته : ( عطاء )ی کوڕی ( أبي رباح ) دەڵێت : ( ابن عباس ) پێی گووتم : ئایا ژنێکی بەهەشتیت پیشان بدەم ؟ گووتم : بەڵێ · فەرمووی : ئەو ژنە ڕەش پێستەیە ، هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وگوتی : من فێ دەمگرێ و خۆم دەردەخەم بۆم بپاڕێرەوە ، ئەویش فەرمووی : ئەگەر دەتەوێت ئارام بگرە بەهەشتی دەبیت ، ئەگەر دەشتەوێت بۆت دەپاڕێمەوە لە خوای تعالی چارەسەرت دەکات ، گوتی : ئارام دەگرم ، بەڵام خۆم دەردەخەم بۆم بپاڕێرەوە بۆ ئەوەی خۆم دەرنەخەم ، ئەویش بۆی پاڕایەوە ·

دەڵێم _ (ابن القیم ) _ فێ دوو فێیە : فێیەك بە هۆی ڕوحە پیسە زیانفرۆشە دڕندەکانی سەر زەویەوەیە ، فێیەکیش بە هۆی نەخۆشی و خەڵتە خراپەکانی لەشەوە · لێرەدا ئەم بەشەی دووەمە کە پزیشکان تیایدا سەرقاڵن و بەدوای هۆو چارەسەریدا دەگەڕێن ·

بەڵام فێی ڕوحە پیسەکان ، پێشەواو ئاقڵ و ژیریان دانی پێدا دەنێن و ، بەدووری دانانێن ، دانیشی پێدا دەنێن کە چارەسەری دەگەڕێتەوە بۆ ڕوو بە ڕوو بوونەوەی ڕوحە شەرفە

---

110 _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٧ / ١٥٠ ، ١٥١ ) ، ومسلم ( ٨ / ١٦ ) ·

خێرداره بەرزەکان لە گەڵ ئەو ڕوحە پیسە بە گێچەڵە زیان فرۆشە دڕندانەدا ، بە شێوەیەك پاڵ بە شوێنەوارەکانیانەوە بنێن و ، بەرهەڵستی کردەوەکانیان بکەن و پوچیان بکەنەوە ، ئەمەش لە لایەن ( بقراط )ەوە لە هەندێ لە کتێبەکانیدا باسکراوە ، ئینجا باسی هەندێ چارەسەر بۆ ڤێ دەکات و ، دەڵێت لە ڕاستیدا ئەمە بۆ ئەو فێیەی هۆکاری دەگەڕێتەوە بۆ تێکەڵاوو ماددە خراپەکانی لەش بە سوودە ، بەڵام ئەو فێیەی بە هۆی ڕوحە پیسە زیانفرۆشە دڕندەکانەوە دروست دەبێت ، ئەو چارەسەرەی سەرەوەمانی بۆ بە سوود نابێت ٠

بەڵام پزیشکە نەفام و سەقەت و سووکەکان و ، ئەوانەی بەلایانەوە ئاینداریتی ڕووکەشی بە ڕواڵەت ( الزندقة ) فەزیڵەت و چاکەداریە ، ئەوانە نکۆڵیی لە فێی ڕوحە زیانفرۆشە دڕندەکان دەکەن و ، دانی پێدا نانێن کە کاریگەری لە جەستەی کەسی ڤێ لێکراو بکات و ، هیچ بەڵگەیەکیشیان بە دەستەوە نی یە بەدەر لە نەفامی ، ئەگینا لە بواری پزیشکایەتیدا هیچ شتێك نی یە ئەوە بە دوور دابنێت و نکۆڵیی لێ بکات ، هەست و بوونیش شایەتی بۆ دەدات ، کاتێکیش هۆکاری هەموو فێیەکان دەگەڕێننەوە بۆ زاڵبوونی هەندێ لە خەڵتە خراپەکان بە سەر لەشدا ، بە هەڵەدا چوونە ، چونکە بۆچوونەکانیان بە ڕاست دادەنرێت بۆ هەندێ لە جۆرەکانی ڤێ نەك هەمووی بە تێکڕا ٠

پزیشکە کۆنەکان ناوی ئەم جۆرە فێیەیان نابوو بە : نەخۆشی ئیلاهی و ، دەشیانگووت : بە هۆی ڕوحە زیانفرۆشە دڕندەکانەوەیە ٠

بەڵام ( جالینوس )و کەسانی تریش ، هەستاون بە لێکدانەوەی ناونانەکەی پزیشکان کۆن و ، دەڵێن : لە ڕاستیدا پێیان گووتوە نەخۆشی ئیلاهی چونکە ئەم نەخۆشیە لە سەردا ڕوودەدات و ، زیان بە بەشە ئلاهیە پاکەکە دەگەیەنێت کە جێگەکەی دەماغە ٠

هۆکاری ئەو لێکدانەوەشیان دەگەڕێتەوە بۆ نەفامیان بەرامبەر بەو ڕوحە زیانفرۆشە دڕندانەو ، حوکمەکانی و ، کاریگەریەکانیان ، پاشان پزیشکە ئاینداره بە ڕواڵەتەکانیش هاتن و تەنها جۆری یەکەمی فێیان سەلماند کە بە هۆی تێکەڵاوە خراپەکانی لەشەوە دروست دەبێت ٠

هەرکەسێکیش ژیرێتی و زانیاری هەبێت بەرامبەر بەو ڕوحە زیانفرۆشە دڕندانە پێدەکەنێ بە نەفامی ئەو کەسانەو لاوازی ئەقلّ و ژیریان ٠

## خۆچارەسەرکردن لە فێی ڕوحە دڕندە زیان فرۆشەکان :

چارەسەری ئەم جۆرەشیان بە دوو کار دەکرێت : کارێکیان لە لایەن کەسە فێدارەکەوەیە ، کارێکیشیان لە لایەن کەسی چارەسەرکارەوەیە ، بۆیە کاری کەسی فێدار بریتیە لەوەی دەبێت نەفسی بەهێز بێت ، بە ڕاستگۆیی ڕوو لە دروستکارو داهێنری ئەم ڕوحە زیانفرۆشانە بکات و ، بەو دوعاو نزا ( صحیح )انەی کە لە سوونەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە دوعاو نزا بکات و پەنا بەخوای پەروەردگار بگرێت ، بە جۆرێك ڕێکەوتن و پێکهاتنی دلّ و زمانی تێدا بەرجەستە ببێت ، چونکە ئەمە جۆرێکە لە جەنگان و ، جەنگاوەریش ناتوانێت تۆلّە لە دوژمنەکەی بکاتەوە مەگەر بە دوو کردار : یەکەمیان پێویستە خودی چەکەکە ڕاست بێت و کەموکوڕی تێدا نەبێت و چاکیش بێت ، دووەمیان دەبێ بالّی ئەو کەسەش بە هێز بێت ، هەرکاتیش دانەیەکیان دواکەوت ئەوا چەکەکە بە تەنها سوودو هێزێکی ئەوتۆی نابێت ، ئەی ئەگەر هەردوو شتەکە نەبوو دەبێ چۆن بێ : ئەو کاتە دلّ کاولّ دەبێت و جۆرەکانی یەکتاپەرستی و ، پشت بەستن و ، لە خوا ترسان و ، ڕووکردنە خواو ، پاڕانەوەی تێدا نابێت و ، هیچ چەکێکیشی بەدەستەوە نابێت ٠

کەسی چارەسازیش : دیسان دەبێ هەردوو چەکەکەی پێ بێت ، چونکە هەندێ لە چارەسازان تەنها دەلّێن :

( أخرج منهُ ) واته لێی بچۆ دەرەوە ، یا دەڵێت : ( بسم الله ) ، یا دەڵێت : ( لا حول ولا قُوَّة إلا بالله ) ، کەچی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەیفەرموو : (( اخْرُجْ عَدُوَّ اللهِ ، أنا رَسُولُ اللهِ ))[111] .

واته : ( لێی بچۆ دەروە ئەی دوژمنی خوا ، من پێغەمبەری خوام )) ٠

## پێشەوا ( ابن تیمیه ) فێدار چارەسەر دەکات :

شێخی پایەبەرزی خۆشمان دەبینی _ مەبەستی ( شیخ الإسلام ابن تیمیة )بوو _ کەسێکی دەنارد بۆ لای کەسی ڤ لێکراو بۆ ئەوەی لە گەڵ ئەو ڕوحەدا بدوێ کە چۆتە جەستەیەوەو ، ئەو کەسەش دەیگووت : شێخ پێت دەڵێ بچۆ دەروە ، ئەمە حەڵاڵ نی یە بۆ تۆ ، ئیتر کەسی ڤ لێکراو بە هۆشی خۆی دەهاتەوەو ، ڕەنگە خۆشی قسەی لە گەڵ بکردایە ، لەوانەش بوو ڕوحەکە سەرکەش و بێ گوێ بوایەو بە لێدان دەیکردە دەروە ، ئەو کاتە ڤ لێکراوەکە بە هۆشی خۆی دەهاتەوەو هەستی بە ئازار نەدەکرد ، ئێمەو کەسانی تری جگە لە ئێمەش چەندین جار ئەوەمان لێوە بینیوە ٠

بەزۆری ئەم ئایەتەی بە گوێی کەسی ڤ لێکراودا دەخوێند ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لا تُرْجَعُونَ ﴾ [ المؤمنون : ١١٥ ] واتە : ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا ﴾ ئایا ئێوە گومانتان وابووە کە بێگومان ئێوەمان بەبێ هودە دروست کردووە ﴿ وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لا تُرْجَعُونَ ﴾ وە بێگومان ئێوە ناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە[112] .

بۆی باسکردم _ واتە ( شیخ الإسلام ابن تیمیة ) _ کە جارێکیان ئەو ئایەتەی بە گوێی کەسێکی ڤ لێکراودا خوێند ، ڕوحەکە گووتی : بەڵێ و لە گەڵ گوتنیشیدا دەنگی درێژ کردەوە ٠ دارێکم بۆ هەڵگرت و ئەمەندەم بەو دارە بە ڕەگەکانی لای ملیدا کێشا ، تا دەستم

١١١ _ إسناده صحيح : أخرجه أحمد ( ٤ / ١٧٠ ) ، وابن ماجة ( ٣٥٤٨ ) وصححه الألباني في الصحيحة ( ٨٧٥ ) ٠

١١٢ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

ماندوو بوو به هۆی زۆری ئەو لێدانەوە ، ئامادەبوانیش هیچ گومانێکیان بەلاوە نەما کە بە هۆی ئەو لێدانەوە دەمرێت · لە کاتی لێدانەکدا گووتی : من خۆشم دەویێ ، منیش پێم گووت : ئەو خۆشی ناوێی · گووتی : من دەمەوێ حەجی پیێ بکەم ، منیش پێم گووت : ئەو نایەوێ حەج لە گەڵێ تۆدا بکات ، ئەوجا گووتی : لە بەر ڕێزی تۆ وازی لێدەهێنم ، شێخ فەرمووی : گووتم : بەڵکو بۆ گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی وازی لێبێنە ، گووتی : ئەوا لێی دەچمە دەرەوە ، شێخ فەرمووی : کەسە ڤێ لێکراوەکە هەستاو ئاوڕێکی بە ڕاست و چەپێ خۆیدا دایەوەو ، گووتی : چ منی هێناوەتە خزمەتی شێخ ؟ ئامادەبوانیش پێیان گووت : ئەی ئەم هەموو لێدانە ؟ گووتی : ئەی لە سەر چ لێی داوم کە هیچ تاوانێکم نی یە ، ئەوەبوو بە هیچ شێوەیەك هەستی بەو لێدانە نەکرد ·

هەروەها ( شَیخُ الإسلام ) بە خوێندنی ( آیة الکرسي ) چارەسەری فێداری دەکردو ، فەرمانیشی بە زۆر خوێندنی دەکرد بۆ _ هەردوو کەسی ڤێ لێکراو کەسی چارەسەرکاریش _ هەروەها بە خوێندنی ﴿ قُلْ أعوذُ بِرَبِ الفلقِ ﴾ و ﴿ قُلْ أعوذُ بِرَبِ الناسِ ﴾ چارەسەری نەخۆشی دەکرد ·

بەگشتی · ئەم جۆرە لە ڤێ و ، هەروەها چارەسەرەکەشی هیچ کەس نکۆڵیی لیێ ناکات جگە لە کەسێکی کەم زانست و کەم ئەقڵێ ، زۆربەی زاڵبونی ڕوحە پیسە زیانفرۆشەکان بە سەر کەسانی گونجاودا دەگەڕێتەوە بۆ کەمی خواپەرستی و کەمی ئاینیان ، خراپبوونی دڵێ و زمانیان سەبارەت بە ڕاستیەکانی زیکرو ، نزاکانی خۆپەنادان بە خواو ، قەڵابەندیەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ و قەڵابەندیە ئیمانیەکان ، بۆیە ئەو ڕوحە پیسە زیانفرۆشە دڕندانە ڕوو بە ڕووی پیاو بیێ چەك دەبێتەوەو ، ڕەنگە بە ڕووتی بیبینیت و کاری تێبکات ·

ئەگـەر پـەردە لادەيتـەوە ، دەبينـى زۆربـەى نەفسـى مرڤـەكان فێدارى ئـەو ڕوحـە پيسـە زيانفرۆشانەن و ، بوونە بە ديلى ژێر دەستيان و ئەويش دەيانبات بۆ هەر جێگەيـەك ئـارەزووى لێبێت ، كەچى تواناى خۆپاراستن و هـەروەها سەپێچيكردنى فەرمانەكانيشـى نـى يـە ، ئەمـە گەورەترين فێيە كە كەسـى تـووش بـوو خەبـەرى نابێتـەوە تـا كـاتى ماڵئـاوايى ، لـەوێ دڵنيـا دەبێت كە ئەو فێدارى ڕاستەقينە بوو ، والله المستعان ٠

چارەسەرى ئەم جۆرە فێيە بە جووتبوونى ئەقڵى تەندروست دەبێت لە گـەڵ ئـەو ئيمانـەدا كە پێغەمبەران هێناويانە ، بەهشت و ئاگر بخاتە بەرچاوى خۆى و بەردەوام لە دڵيدا بـن ، بـير بكاتەوە لە خەڵكى دونياو ، ئەو تۆڵەو سزاو بەڵايانەى بە سـەرياندا دێـت و ، لـە جێگەكانيانـدا دادەبەزێت وەكو لێزمەى باران و ، ئەوان فێ گرتوونى و خەبەريان نابێتەوە ٠ چەند ئـەم جـۆرە فێيە بە هێزە ، بەڵام لە بەر گشتيبوونى بەڵاكە تا ئەو ئاستەى تـەنها فێـدار دەبينرێـت ، ئـيتر شتەكە بە نائاسـايى و نكۆڵيلێكرو تەماشـا ناكرێـت ، بۆيـە بـە هـۆى زۆربـوونى فێدارەكانـەوە خۆيان بوون بە نكۆلێكارى ئەو كەسە چاكانەى كە ڕەوشتى ئەو خەڵكـە بـە شـتێكى نائاسـايى تەماشا دەكەن و نكۆليى لێدەكەن و كەسى چاكيش بوو بە غەريبە ٠

ئەگەر خواى تعالى ويستى هەبێ چاكەى خۆى بەرامبەر بە بەندەكەى خۆى دەربڕێت ، ئـەوا لەم فێيە بە خەبەر دێتەوەو ، تەماشاى كەسانى دونيا ويست دەكات كـە فێ گرتـوونى بەڕاسـت و چەپدا بە جياوازى چينەكانيانەوە ، كەوا كەسـانێك شـێتى بـە تـەواوى كەنـەفتى كـردووەو ، كەسانێكيشيان جار بەجاريكى زۆر كەم بە خەبەر دێتەوەو ، دواى دەچێتەوە سەر شـێتيەكەى خۆى ، كەسانێكيشيان جاريك بەخەبر دێتەوەو جـاريكيش شـێت دەبێتـەوە ، ئـەو كاتـەى بـە خەبەر دێتەوە كردەوەكانى خەڵكانى بە خـەبرو ئاقـڵ ئـەنجام دەدات ، پاشـان جـارێكى ديكـە فێكە دەيگرێتەوەو تووشى سەرلێشێوان دەبێت ٠

## بەشێك : سەبارەت بەو فێیانەی بە هۆی خەڵتەكانی لەشەوە دروست دەبن :

بەڵام فیی خەڵتەكان ، جۆرە فێیەكە ڕێگریی لە ئەندامە نەفسیەكان دەكات كە بە كردەوەو جوڵانەوەو ڕاگرتنی ڕێكێتی لەش هەستێت بە ڕێگرتنێكی ناتەواو نیوە ، هۆكارەكەشی دەگەڕێتەوە بۆ خەڵتەیەكی لینج كە ڕێڕەوەكانی ناوەڕۆكی مێشك دادەخات بە داخستنێكی ناتەواو ، بۆیە ڕێگری دەكات هەست و جووڵەی پێدا تێپەڕ بێت و ، هەروەها بە شێوەیەكی تەواو و بەبێ بچڕان و بە بەردەوامی ڕێگری تێپەڕبوونیشی بە نێو ئەندامەكانی تریشدا دەكات ، ڕەنگە هۆكاری تریشی هەبێ وەكو بایەكی چڕ كە لە ڕێڕەوەكانیدا دەوەستێت ، یا هەندێ لە هەڵم و بۆخی خراپ كە لە هەندێ ئەندامەكانی ترەوە بۆی بەرز دەبێتەوە ، یا هەر چۆنیەتیەكی تری توندو تیژ ، بۆیە مێشك كرژ دەبێتەوەو دێتەوەیەك ، بۆ كردنەدەروەی ئەو شتە زیانبەخشانە ، لە گەڵیشیدا كرژبوون و هاتنەوەیەك هەموو ئەندامەكانی لەش دەگرێتەوە ، بۆیە چیتر مرۆڤ توانای نامێنێت بە ڕێكیی بوەستێت ، بەڵكو دەكەوێت و ، بە زۆری كەف لە زاریدا دەردەكەوێت ٠

ئەم نەخۆشیە بە یەكێك لە نەخۆشیە توندەكان دادەنرێت بە گوێرەی كاتی ڕوودانی زۆر بە ئازاری بە تایبەت ، هەروەها بە یەكێك لە نەخۆشیە درێژخایەنەكان دادەنرێت بە گوێرەی درێژی مانەوەی و ، قورسی و ناڕەحەتی چاكبوونەوەی ، بە تایبەت ئەگەر ئەو كەسە تەمەنی بیست و پێنج ساڵی تێپەڕێنێت و ، ئەم نەخۆشیەی لە مێشكدا بێت ، بەتایبەت ئەگەر لە ناوەڕۆكیشیدا بێت ، ئەو كاتە فێیەكە لێی جیا نابێتەوەو بەردەوام لە گەڵیدا دەبێت ، ( بِقراط ) دەڵێت : فێ لەم جۆرە كەسانەدا دەمێنێتەوە تا دەمرن ٠

پاش زانینی ئەمە ، بۆمان ڕوون دەبێتـەوە ئـەو ژنـەی کـە فەرموودەکـەی سـەرەوە باسـی دەکات ، کەوا فێ دەیگرت و خـۆی دەردەخسـت ، پێدەچـێ فێکـەی لـەم جـۆرە فێیـە بێـت ، پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی بەهەشتی دایـە ئەگـەر لـە سـەر نەخۆشـیەکەی ئـارام بگرێـت و ، بۆشی پاڕایەوە چیتر لە کاتی فێکەیدا خۆی دەرنەخات ، مافی هەڵبـژاردنی دایـە دەسـت خـۆی لـە نێـوان ئـارام گـرتن وبەهەشـت و ، لـە نێـوان ئـەوەی دوعـای شـیفای بـۆ بکـات بـەبێ دەستەبەریەك بۆ چاکبوونەوەی ، بۆیە ژنەکە ئارامگرتن و بەهەشتی هەڵبژارد ٠

ئەوەش بەلگەی شیاوێتی وازلێهێنانی خۆچارەسەرکردن و خۆتیمارکردنە ، وە چارەسـەری ڕوحە زیانفرۆشەکان بە نزاو دوعاو ڕووکردنە خوای تعـالی ، کردەوانیکـی ئـەوتۆ ئـەنجام دەدات کـە هـەرگیز چارەسـەری پزیشـکان پێـی ناگـات ، کاریگـەری و کردەوەکـانی و ، کاردانـەوەی سروشت بەرامبەر بەوانە لە کاریگەری دەرمانە جەستەیەکان بەهێزترە ، ئێمەو کەسانی تـریش چەندین جار ئەوەمان تاقی کردۆتەوە ، پزیشکانی ئاقـلێ و ژیـر دانیـان بـەوەدا نـاوە کـە کـاری هێزە نەفسیەکان و ، کاردانەوەی چاکیان لە چاکبوونەوەی نەخۆشـیکاندا ڕۆڵێکـی زۆر بـەهێزو سەرسوڕمێن دەبینێـت ، لـەم بـوارەدا ئاینـداره بـە ڕواڵەتـەکان( زنادقـة )و خـەڵکانی سـووك و ڕیسواو ، نەفامەکان زۆرترین زیان بە پیشەی پزیشکێتی دەگەیەنن ٠

وادەردەکـەوێت فێـی ئـەو ژنـەی لـە فەرمووده‌کـەی سـەروەدا باسـکرا لـەم جـۆرە بێـت ، لەوانەشە لە لایـەن ڕوحـە بـە گێچـەڵەکانەوە بێـت ، پێغەمبـەری خـواش ﷺ مـافی هەڵبـژاردنی نیوان دوو شتی دایە دەست خۆی ، بریتی بوون لـە ئـارامگرتن لـە سـەر نەخۆشـیەکەو چـوونە بەهەشتەوە ، یا بۆی دەپاڕێتەوە خوای تعالی شیفای بـدات ، ئـەویش ئـارامگرتن و داپۆشـینی جەستەی هەڵبژارد ٠ والله أعلم ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەركردنی نەخۆشی دەردەلاقەدا ( عِرْقُ النَّسَا ) :

روى ابن ماجة في سننه من حديث محمد بن سِيرين ، عن أنس بن مالك ، قال : سمعتُ رسول الله _ صلى الله عليه وسلم _ يقول : (( دواءُ عِرْقِ النَّسَا أليَةُ شاةٍ أعْرَابِيَّةٍ تُذابُ ، ثمَّ تُجَزَّأُ ثلاثةَ أجزاءٍ ، ثمَّ يُشْرَبُ على الرِّيقِ في كلِّ يومٍ جُزْءٌ ))(١١٣).

واتە : ( أنس )ی كوڕی ( مالك ) _ خوای لێ ڕازی بێت_ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( دەرمانی دەردەلاقە دوگێكی مەڕی دەشتەكیە دەتوێنرێتەوە ، پاشان دەكرێتە سێ بەشەوەو ، هەموو ڕۆژێك پێش خواردنی بەیانی بەشێكی دەخورێتەوە )) ٠

دەردەلاقە : ئازارێكە لە جومگەی كلۆتەوە دەست پێدەكات و ، لە پشتەوە دادەبەزێتە سەر ڕان و پێدەچێ دابەزێتە سەر پاژنەی پێ ، چەند ماوەكەشی درێژە بكێشێت ، دابەزینی زۆرتر دەبێ ، لە گەڵیدا هەموو لاق و ڕان لاواز دەبێت ٠ فەرموودەكەی سەرەوە مانایەكی زمانی و ، مانایەكی پزیشكیش دەبەخشێت ٠

مانا زمانیەكەی : بەڵگەی شیاوێتی ناونای ئەم نەخۆشیەیە بە ( عِرْقِ النَّسَا ) واتە دەردەلاقە بە پێچەوانەی ئەو كەسانەوە كە ڕێگری لەم ناونانە دەكەن و ، دەڵێن : ووشەی ( النَّسَا ) خودی ڕەگەكەیەو ، نابێت شت ( إضافة ) بكرێتە سەر خۆی لە زمانی عەرەبیدا ٠

وەڵامی ئەم بێژەرە بە دوو ڕوو دەدەینەوە : یەكەمیان : ووشەی ( العِرْق ) واتە ڕەگ و دەمار لە ووشەی ( النَّسا ) گشتیترە ، بۆیە ئەم ناونانە لە ڕووی ( إضافة )كردنی ( العام

---

١١٣ _ إسناده صحيح : أخرجه ابن ماجة ( ٣٤٦٣ ) ، وصححه الألباني في الصحيحه ( ١٨٩٩ ) ٠

)ەوەیە بۆ سەر ( الخاص )واتە گشت بۆ سەر تایبەت : وەکو دەڵێی:( كل الدارهم أو بعضـها)، هەموو دیرهەمەکان یا هەندێکی ·

دووەمیان : ووشەی ( النَّسَا ) بریتیە لەو نەخۆشیەی چۆتە نێو ( العِرْق )ەوە بۆیە ئـەم ( إضـافة )یـە لـە ڕووی ( إضـافة )کردنـی شـتێکەوەیە بـۆ جێگەکـەی خـۆی · گـووتراوە : ناونراوە بە ( النَّسا ) چونکە ووشەکە مانای بیرچوونەوە دەبەخشێت لە زمـانی عەرەبیـداو ئەمەندە ئازارەکەی زۆرە هەموو شتێکی تـر بـیر دەباتـەوەو ، ئـەم ڕەگـەش لـە جومگـەی کلۆتەوە دەست پێ دەکات و ، بە خواروویی لاق لە پشـتی پاژنـەی پێـوە کۆتـای دێـت لـە بەری ڕاستەوە لە نێوان ئێسکی لاق و ژێیەکاندا ( الوتر ) · بـەڵام مانـا پزیشـکیەتیەکەی : پێشتر ئاماژمان پێدا کە گوفتاری پێغەمبەری خوا ﷺ دوو جۆرە : یەکـەمیان : گشـتی یـە بـە گـوێرەی زەمـەن و ، شـوێن و ، کەسـەکان و ، بارودۆخـەکان · دووەم : تایبـەت بـە گوێرەی ئەم شتانەوە یا هەنـدێکیان ، بۆیـە ئـەم فـەرموودە دەکەوێتـە چوارچێوەی ئـەم بەشەیانەوە ، چونکە فەرموودەکە گوفتارێکە بۆ عەرەب و ، خەڵکی حیجازو ، دەوربەریان ، بەتایبەت عەرەبە دەشتەکیەکان ، کە ئەم چارەسەرە بە سوودترین چارەسەرە بۆیـان ، چونکە ئەم نەخۆشیە بە هۆی ووشکێتیەوە ڕوودەدات ، لەوانەشە بە هۆی مادەیەکی چڕی لینجەوە تووشیان بێت ، بۆیە چارەسەرەکەی بە ڕەوانکردنـەو ، دووگـیش دوو خاسـیەتی تێدایە : پێگەیانـدن و ، نـەرم وشـل کردنـەوە ، ئەمـەش هۆکـارە بـۆ پێگەیانـدن و کردنـە دەرەوەی مادەکە ، ئەم نەخۆشیەش پێویستی بەم دوو شتەیە ·

سەبارەت بە دەستنیشانکردنی مەڕی دەشتەکیش لە بەر زۆر کەمێتی کـەم و کوڕیـەکانی و ، بچوکی بڕیی و ، پاکێتی و نەرم و نیانی ناوەڕۆکی بوو ، بە تایبەت لەوەڕگاکەی کە لـە سـەر ڕووەکە دەشتەکیە گەرمەکان دەڵـەوەڕێت ، وەکـو ( الشـيح ) و ( القيصـوم )و ، ڕووەکـەکانی دیکـە ، چـونکە ئەگـەر ئـاژەڵ لـە سـەر ئـەم ڕووەکانـە لـەوەڕا ، خـووی سروشـتی پـاکی ئـەو ڕووەکانـە دەچـێتە نێـو گۆشـتەکەیەوەو نـەرم و نیـانی و چـاکێتیەکەی زیـاتر دەکـات و ،

خوویەکی سروشتی چاکیش بە گۆشتی ئاژەڵەکە دەبەخشێت ، بەتایبەت دووگ ، دەرکەوتنی کاریگەری ئەم ڕووەکانە لە شیردا زۆرترە بە بەراوردی گۆشتەکەی ، بەڵام دووگ خاسیەتی پێگەیاندن و شلْ کردنەوەی لە شیر زۆرترە · وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا دەرمانی زۆربەی نەتەوەکان و دەشتەکان بە دەرمانە تاکەکانەو پزیشکە هیندیەکانیش لە سەر ئەم بۆچونەن.

بەڵام نەتەوەکانی ڕۆم و یونان ، دەرمانە تێکەڵەکان بەکار دەهێنن ، بەڵام کۆڕان لە سەر ئەوەی کە کارامەیی پزیشك لەوەدایە بە خۆراك چارەسەر بکات ، ئەگەر بێتوانا بوو ئەوجا بە دەرمانە تاکەکان ، ئەگەر دیسان بێتوانابوو ئینجا بە دەرمانە زۆر کەم تێکەڵاوەکان ·

پێشتریش ئاماژەمان پێدا کە بە زۆری عەرەب و خەڵکە دەشتەکیەکان تووشی نەخۆشیە سووکەکان دەبن ، بۆیە دەرمانە سووکەکانیان بۆ دەشێ ، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خواردنەکانیان بە زۆری سادەیە · بەڵام نەخۆشیە تێکەڵاوەکان ، بە زۆری بەهۆی تێکەڵاوکردنی خۆراکەکان و جۆراوجۆربوونی و جیاوازیانەوە ڕوودەدات ، بۆیە دەرمانە ئاوێتەکانی بۆ هەڵبژێردراوە · والله تعالى أعلم ·

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەرکردنی وشکیی خوو وە چۆنیەتی نەرم و نیان کردنەوەی :

رَوَى التِّرْمِذِيّ فِي " جَامعه " وَابْنُ مَاجَهْ فِي " سُنَنه " مِنْ حَدِيثِ أَسْمَاء بِنْت عُمَيْسٍ قَالَتْ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ _ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم _ : بِمَاذَا كُنْتِ تَسْتَمْشِينَ ؟ قَالَتْ : بِالشُّبْرُمِ ، قَالَ: حَارٌ جَارٌ · قَالَتْ : ثُمَّ اسْتَمْشَيْتُ بِالسَّنَا : فَقَالَ : لَوْ كَانَ شَيْءٌ يَشْفِي مِنْ الْمَوْتِ لَكَانَ السَّنَا(١١٤).

١١٤ _ إسناده حسن : أخرجه الترمذي ( ٢٠٨٢ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٠١ ) ·

واته : ( أسماء )ی كچی ( عُمَيْس ) _ خوای لیٚ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم : بە چ شتێك خووی خۆت نەرم ونیان دەكەیتەوە ؟ ( أسماء ) فەرمووی : بە ( الشُّبْرُم ) ، ئەویش فەرمووی : گەرم و توونە · ( أسماء ) فەرمووی : پاشان خووی خۆمم بە ڕووەكی ( السّنا ) نەرم و نیان دەكردەوە : پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم : ئەگەر شتێك هەبوایە مردنی چاك بكردایەوە ڕووەكی ( السّنا ) دەبوو.

وفِي سُنَنِ ابْنِ مَاجَهْ " عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ أَبِي عَبْلَةَ قَالَ سَمِعْت عَبْدَ اللّهِ بْنَ أُمّ حَرَامٍ ، وَكَانَ قَدْ صَلّى مَعَ رَسُولِ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ الْقِبْلَتَيْنِ يَقُولُ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِ ﷺ يَقُولُ : عَلَيْكُمْ بِالسّنَا وَالسّنُوتِ ، فَإِنّ فِيهِمَا شِفَاءً مِنْ كُلّ دَاءٍ إِلّا السّامَ ، قِيلَ يَا رَسُولَ اللّهِ وَمَا السّامُ ؟ قَالَ الْمَوْتُ .

واته : لە ( عبدالله )ی كوڕی ( أم حرام )ەوە _ خوای لیٚ ڕازی بێت _ كە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بوو ﷺ ئەو ڕۆژەی نوێژیان بۆ هەردوو قیبلەكە كرد دەفەرمێت : گوێبیستی پێغەمبەری خوابووم ﷺ دەیفەرموو : ( السّنا ) و ( السّنُوت ) بەكاربێنن ، چونكە ئەو دوانە شیفان بۆ هەموو نەخۆشیەك جگە لە ( السّام ) ، گوترا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ( السّام ) چی یە ؟ ئەویش فەرمووی : مردنە ·

فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ ( بماذا كُنتِ تستمشين ؟ ) واته : بە چ شتێك خووی خۆت نەرم و نیان دەكەیتەوە تاوەكو ڕێبكات و ئاسایی بێتەوە ، بۆ ئەوەی نەچێتە باری وەستانەوەو ، تووشی زیان بێت بە بەندبوون و نەتوانایی دەربڕینی ڕازو نیاز · بۆیە لێرەدا بە دەرمانی ڕەوانكار گوتراوە ڕێكار · كەسانێكی تریش دەڵێن : چونكە كە خووی ئەو كەسە ڕەوان دەبێتەوەو ، بە زۆری ڕێدەكات بۆ جێبەجێكردنی پێداویستیەكانی ·

فەرمایشتەكەی سەروە بەم شێوەش ( ریوایە )ت كراوە : ( بماذا تستشفين ؟ ) واته بە چ شتێك چارەسەری خۆت دەكەیت ، ئەویش فەرمووی : بە ( الشُّبْرُم ) ، كە سەر بە كۆمەڵی

دەرمانە ( اليتوعية )كانـە[١١٥] ، ئـەم دەرمانـە بريتيـە لـە: تـوێكلى ڕەگـى دارێك ، كـە گـەرم و ووشكە لە پلە چواردا ، چاكترينيان ئەوەيـە كـە بـۆ سـورايى دەڕوانێـت و ، سـووك و ناسـك و تەنكە لە پێستى پێچراوە دەچێت ، بـە گشـتى لـە كۆمـەڵى ئـەو دەرمانانەيـە كـە پزيشـكان ئامۆژگـارى وازلێهێنـانى دەكـەن لـە بـەر ترسـناكى و ، لـە بـەر ئـەوەى لـە ڕادەبـەدەر ڕەوان دەكاتەوە ٠

فەرمايشتى پێغەمبـەرى خـوا ﷺ ( حَـارٌ جَـارٌ ) بـەم شـێوەش هـاتووە : ( حَـارٌ يـارٌ ) _ ( أبوعُبَيد ) دەڵێت : عەرەب زۆربەى گوفتارەكانيان بە ( ياء ) دەردەبڕن بۆيـە گووتوويانـە : ( يارٌ )٠

دەڵێم _ ( ابن القيم ) _ : بە دوو شێوە لێكدراوەتەوە : يەكـەميان : كـە پێغەمبـەرى خـوا ﷺ فەرموويەتى : ( حارٌ جارٌ ) بە _ جيم _ : واتە زۆر ڕەوانكار بۆيە پێغەمبـەرى خـوا ﷺ بـە زۆر گەرم و زۆر ڕەوانكار وەسفى دەكات ، لە بنچينەشدا هەر ئاوەهايە ٠ ( أبو حنيفةَ الـدِّينوَرِيٌ ) ئەمـەى فـەرمووە ٠ دووەميـان : _ ئەمـەش ڕاسـتە _ ئـەو دەربڕينـە لـە زمـانى عەرەبيـدا ( الإتباع )ە ، مەبەستى سەرەكيان بەو شێوازى دەربڕينە ( تأكيد )كردنى ووشەى يەكەمـە كـە ( حارٌ )ە بە ووشەى دووەم كە ( جارٌ )ە ٠ لێرەدا شـێوازى ووشـەيى مانـايى بـەكاردەهێنن بـۆ ( تأكيد )كردن ، بۆيە چاودێرى ئەوە دەكەن كە زۆربەى پيتەكانى هەردوو ووەشە لێك بچن بـۆ نموونە دەڵێن : ( حَسَنٌ بَسَنٌ ) واتە : چاكێكى تـەواو ، هـەروەها گووتويانـە : ( حَسَنٌ قَسَنٌ ) بە قاف ، هەروەها گووتويانە : ( شَيْطانٌ لَيْطانٌ ) واتە : شـەيتانێكى پێـوە نوسـاو ، هـەروەها گووتويانە : ( حارٌ جارٌ ) ووشەى ( الجارٌ )يش ئـەم مانايـە دەبەخشێت : واتـە ئـەوەى شـتێك ڕادەكێشێت ، كاتێ پێوەى دەنوسێت ، بە هۆى زۆر گەرميەكەى و هێزى ڕاكێشانيەوە ، وەكـو ئەوەى دايماڵێت و لێى بكاتەوە ٠ ووشەى ( يارٌ )يـش يـا شـێوازە زمـانێكى تـرى ( جـارٌ )ە بـە

١١٥ _ اليتوعية : هەموو ڕووەكێكە شيرى هەبێت ، بڕوانە : القاموس المحيط للفيروزئابادى ٠ وەرگێڕ

نموونەی هەندێ گوفتاری دیکەیان وەکو ( صِهری صِهریج ) ، ( الصهاری والصهاريج ) ، وە یا ( إتباع )ێکی سەربەخۆیە لە زمانی عەرەبیدا ·

## ڕووەکی ( السّنا ) :

بـەڵام ووشـەی ( السَّـنا ) ، بـە دوو شـێوە دەردەبڕدرێـت : ( المـد والقصـر ) واتـە : درێژکردنەوەو کورتکردنەوە ، خۆشی ڕووەکێکی حیجازیەو چاکترینیشیان مەککیەکەیـەتی ، دەرمانێکی شەریفەو هیچ دەرنجامێکی خراپیشی نی یە ، نزیکە لە میانجێتیەوە ، گـەرم و ووشکە لە پلەی یەکەمدا ، بۆ ڕەوانکردنی هەردوو سەفراو سەودا بە سوودە ، دڵ بە هێز دەکـات ، ئەمـەش چـاکێتیەکی ڕەسـەنە بـۆ ئـەم ڕووەکـە ، بـە سـوودە بـۆ نەخۆشـی ( الوسواس السـوداوي )[١١٦] ، بەسـوودە بـۆ قڵشـانی کـاتیی پیسـتی دەسـت و قـاچ ، دەرد دەکاتەوە ، بەسوودە بۆ ڕێگریی لە بڵاوبونەوەی تووك ، بە سوودە بۆ نەهێشتنی ئەسپێ و ، کۆنـە ژان ( الصُـداع العتيـق )و ، گـولی و ، زیپکـەو ، ئاڵووشـی وخـورووی و ، قێ ، خواردنـەوەی ئاوەکـەی دوای کوڵـان لـەوە چـاکترە بـە کـوتراوی بخورێـت ، ئەنـدازەی خواردنـەوەی بـە قورسـی سـێ دیرهەمـەو ، لـە ئاوەکەشـی بـە ئەنـدازەی قورسـیی پێـنج دیرهەمە · ئەگەر هەندێك لە گوڵە وونەوشەو ( زهرة البنفسج ) مێوژی سووری بێ نـاوکی ( الزبيب الأحمر ) لە گەڵدا بکوڵێنرێت ، چاکتر دەبێ ·

١١٦ ــ الوَسواس السوداوي : نەخۆشیەکە بە هۆی زاڵبوونی ( السوداء )ەوە بە سەر جەستەدا ڕوودەدات بە ئاستێك بیروهۆشی لە گەڵدا تێك دەچێت ، بڕوانە : المصباح المنير في غريب الشرح الكبير ، كتاب الواو ، ج٢ ، ل ٦٥٨ · وەرگێڕ ·

( الرازي ) فەرموویەتی : ( السَّنا )و ( الشاهترج )[١١٧] خەڵتە سوتاوەکان نەرم و ئاسان دەکەنەوە ، بە سوودە بۆ گولی و خورویی ٠ ئەندازەی خواردنەوەی هەر دانەیەکیشیان بە ئەندازەی قورسی چوار بۆ حەوت دیرهەمە ٠

**بەڵام ( السَّنوت ) بە هەشت شێوە مانای لێکدراوەتەوە :**

یەکەم : هەنگوێنە ٠

دووەم : خۆشاوی هیزەی ڕۆنە کە بە شێوەی خەتگەلێکی ڕەش بە سەر ڕۆنەکەوە دەردەکەوێت ٠ ( عَمْرو )ی کوڕی ( بَکر السَکسَکي ) باسی کردووە ٠

سێ یەم : تۆوێکە لە تۆوی ڕەشکە ( کمون ) دەچێت بەڵام کەمێك جیاوازی هەیە ، ( ابن الأعرابي ) باسی کردووە ٠

چوارەم : ( الکمون الکرمانی ) یە ٠

پێنجەم : ( الرازیانج ) ، ( أبوحنیفة الدَّینَوَري ) لە زاری هەندێ لە دەشتەکیەکانەوە باسی کردووە ٠

شەشەم : شویتە ٠

حەوتەم : خورمایە ، ( أبوبکر )ی کوڕی ( السُّنی ) زاناو پێشەوا باسی کردووە ٠

هەشتەم : ئەو هەنگوێنەیە کە لە نێو هیزەی ڕۆندایە ٠ ( عبداللطیف البغدادي ) باسی کردووە ٠

هەندێ پزیشکان گوتویانە : ئەمە شایستەیە بە ماناکەی و ، نزیکیشە لە ڕاستیەوە واتە : ( السَّنا )ی کوتراو تێکەڵ بە هەنگوێنی تێکەڵاوبووی ڕۆن دەکرێت ، پاشان دەلسرێتەوەو ئەمەش باشترە لەوەی بە تەنها بەکاربهێنرێت ، چونکە ئەو دووانە ڕۆڵێکی کاریگەریان دەبێت لە چاکردنی ( السَّنا )داو ، یارمەتیشی دەدەن بۆ ڕەوانکردن ٠ والله أعلم ٠

---

١١٧ ــ الشاهترج : گیایەکی عەلەفی و گوڵەکانی سپی مەیلەو سورە ٠ وەرگێڕ ٠

وَقَدْ رَوَى التِّرْمِذِيُّ وَغَيْرُهُ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عَبَّاسٍ يَرْفَعُهُ : (( إنّ خَيْرَ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ السَّعُوطُ وَاللَّدُودُ وَالْحِجَامَةُ وَالْمَشْيُ )) واته : ( ابن عباس ) _ خوا له خۆى وبابيشى ڕازى بێت _ فەرموويەتى : پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : (( چاكترين شتێك خۆتانى پێ چارەسەر بكەن دەرمانێكە بكرێتە لووت و دەرمانێكە بكرێتە زارو كەڵەشاخ گرتن و ڕێكردنە )) ٠

فەرمايشتى پێغەمبەرى خوا ﷺ ( والمشيُّ ) : واته ڕێكردن : چونكه ڕێكردن خووى مرۆڤ بەڕێ دەەخات و نەرم و نيانى دەكات و ئاسانكارى بۆ پاشماوەكانيش دەكات بچنه دەرەوە٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازى پێغەمبەرى خوا ﷺ له چارەسەركردنى ئاڵووشى وخوروى و ئەوەى ئەسپێ دروست دەكات :

في الصحيحين من حديث قَتادةَ ، عن أنس بن مالك قال : رخَّص رسولُ الله ﷺ لعبدالرَّحمن بن عَوْفٍ ، والزُّبَيْر بن العوَّام _ رضي الله تعالى عنهما _ في لُبْسِ الحريرِ لِحكَّةٍ كانت بهما ٠

وفي رواية : أنَّ عبدَالرحمن بن عَوْف ، والزُّبَير بن العوَّام _ رضي الله تعالى عنهما _ ، شكَوْا القمْلَ إلى النبي ﷺ ، في غزاةٍ لهما ، فَرَخَّص لهما في قُمُصِ الحرير ، ورأيتُه عليهما(١١٨)

واته : له ( أنس )ى كوڕى ( مالك )ەوه _ خواى لێ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : پێغەمبەرى خوا ﷺ مۆڵەتى دايه ( عبدالرحمن )ى كوڕى ( عوف )و ، ( الزُّبَير )ى كوڕى ( العوَّام ) بەوەى ئاورێشم بپۆشن ، لەبەر ئاڵۆشيى و خورويەك كه تووشيان بوو ٠

له ( ريوايه )تێكى ديكەدا : ( عبدالرحمن )ى كوڕى ( عَوْف )و ( الزُّبَير )ى كوڕى ( العوَّام ) _ خوايان لێ ڕازى بێت _ له غەزايەكدا ، بە هۆى ئەسپێوه سكالآيان بردە خزمەتى

---

١١٨ _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٤ / ٥٠ ) ، ومسلم ( ٦ / ١٤٣ ) ٠

پێغەمبەری خوا ﷺ، ئـەوەبوو ئـەویش مۆڵەتیـدان کراسـی ئاورێشـم بپۆشـن و ، خۆشـم بینـیم کراسە ئاورێشمەکەیان پۆشیبوو ٠

ئەم فەرموودەیە دوو لایەن لە خۆ دەگرێت ، یەکەمیان : فیقهی و ، ئەویتریان : پزیشکی ٠

بـۆ لایەنـە فیقهێکـەی : ئـەوەی سـوونەتی پێغەمبـەری خـوای ﷺ لـە سـەر جێگیربـووە ڕێپێدراویەتی پۆشینێتی بۆ ژنان بە ڕەهایی و ، حەرامبوونیەتی بۆ پیاوان مەگەر بـۆ پێویسـتی و بەرژەوەندیەکی بە پەسەند دانـراو ، ئـەو پێویسـتیەش یا بـۆ زۆر ساردیەکەو ، ئـەو مرۆڤـە هیچی تر بەدیناکات بۆ پۆشین ، یا جگە لەو جلە شـتێکی تـری نـی یـە ٠ هـەروەها شیاوە لـە کـاتی نەخۆشـیەکانی گـولی و ، خـوروی و ، زۆریـی ئەسـپێدا بپۆشـرێت ، وەکـو ئـەوەی فەرموودەکەی ( أنس ) ئاماژەی بۆ دەکات کە فەرموودەیەکی ( صحیح )ە ٠

بەڵام ڕێپێـدراو : ( صـحیح )ترینـی دوو ( ریوایـە )تەکـەی ئیمـامی ( أحمـد )ەو ، ( صـحیح )ترینی دوو گوفتارەکەی ئیمامی ( الشافعي )یـە ، چـونکە بنـەڕەت تایبـەت نەکردنـە ، ئەگـەر ئەنجامدانی کارێکیش بۆ کەسانێك لە ئومەت ڕێی پێدرا ، لە بەر هەر هۆ و مانایەك بێـت ، ئـەوا لە سنووری ئەو هێندە دەچیتە دەرەوەو هەموو ئەوانەش دەگرێتەوە کە هەمان هـۆ و مانایـان تێدا بەدیدەکرێت ، چونکە حوکم گشتی دەبێت بە هۆی گشتیبوونی هۆکارەکەیەوە ٠

ئەو کەسانەش قەدەغـەی دەکـەن ، گوتویانـە : فـەرموودەکانی حـەرامکردن گشـتی یـەو ، فەرموودەکانی ڕێگەپێدانیش ئیحتیماله تایبەت بێت بـە ( عبـدالرحمن )ی کـوڕی ( عَـوْف ) و ( الزُّبَيْـر )ەوە ، بـەڵام پێدەچـیّ لـە سـنوری ئـەو دووانـە بچـێتە دەرەوەو کەسـانی تـری جگـە لەوانیش بگرێتەوە ، لێرەدا ئەگەر ئیحتیمـالی هـەردوو شـتەکە کـرا ، ئـەوا گشـتێکە شایسـتەتر دەبیّ بە وەرگرتن ، بۆیە هەنـدیّ لەوانـەی فـەرموودە دەگێڕنـەوە گوتویانـە : ئـیتر نـازانم ئایـا ڕێگەپێدانەکە لە پاشی ئەوان هەموو کەسانی تر دەگرێتەوە ، یاخود نـەء ؟

بۆچونی ڕاست : گشتیبونی موڵەتدانەکەیەو ، هەموو کەسێکی تریش دەگرێتەوە ئەگەر هەمان بەهانەیان هەبێ ، چونکە بۆ گشتاندن نەریتی شەرع بەو جۆرەیە ، بەڵام شەرع ئەگەر حوکمەکەی تایبەت کرد بە کەسێکەوە ئاشکەرای دەکات ، بۆنموونە پێغەمبەری خوا ﷺ کە هاوەڵی بەڕێز ( أبوبُرْدة ) ویستی قوربانی بە بزنێکی تەمەن هەشت یا نۆ مانگەوە بکات ، پێی فەرموو : (( تجزيكَ ولن تَجْزيَ عن أحدٍ بَعْدَك ))[119] واتە : (( بۆ تۆ ئەو بزنە جێگەی مەڕەکە دەگرێتەوە بەڵام بۆ کەسێکی تر جێگەی ناگرێتەوە )) ٠ هەروەها وەکو فەرمایشتی خوای تعالایە بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ سەبارەت بە خواستنی ئەو ژنانەی خۆیان پێ دەبەخشی : ﴿ خَالِصَةً لكَ مِن دونِ المُؤْمنينَ ﴾ [ الأحزاب : ٥٠ ] واتە : ( ئەمەیان ) تەنیا بۆ تۆ دروستە بە جیا لە ئیماندارانی تر[120]

حەرامکردنی ئاوریشم : لە ڕاستیدا دەچێتە بۆاری داخستنی دەرگای بەهانەوە[121] ، بۆیە بۆ ژنان ڕێگەی پێداوە ، هەروەها بۆ پڕکردنەوەی پێویستیەك و ، لە بەر بەرژەوەندیەکی پەسەندکراو ، ئەمەش یاسایەکی گشتیە بۆ داخستنی دەرگای بەهانە ، چونکە لە کاتی پێویستی و بەرژەوەندیەکی پەسەندکراودا ڕێگەی پێدەدرێ ، بە هاوشێوەی حەرامکردنی تەماشاکردن بۆ داخستنی دەرگای بەهانە بەرامبەر بەو کەسانەی ویستی ئەنجامدانی

---

١١٩ ــ صحيح : أخرجه أحمد ( ٤ / ٤٥ ) عن البراء عن خاله أبي بردة فذكره ، وأخرجه مالك في موطئه ( ٢٩٨ ) ، وأحمد ( ٣ / ٤٦٦ ) ، ( ٤ / ٤٥ ) والدارمي ( ١٩٦٩ ) ، والنسائي ( ٧ / ٢٢٤ ) كلهم عن بشير بن يسار عن أبي بردة فذكره ٠

١٢٠ ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

١٢١ ــ الذرائع : واتە بەهانە کە وسیلەو ڕێگەیەکە بۆ گەشتن بە شت ، ئیتر پێدەچێ ئەو شتەی دەیەوێ پێی بگات خراپەیەك بێت یا بەرژەوەندیەك بێت ، گوفتارێك بێت یا کردارێك بێت ، بەڵام پاشان ناوی ( الذرائع ) بەزۆری بەکارهێنرا بۆ ئەو وەسیلانەی دەبێت بە مایەی دروستبوونی خراپەیەك ٠ لێرەدا ئەگەر گوترا : ئەوە بواری داخستنی دەرگای بەهانەیە ، ئەوە مانای وایە : دەچێتە بواری قەدەغەکردنی ئەو وەسیلانەوە کە مایەی دروستبوونی خراپەکە ، بڕوانە کتێبی ( الوجيز في أصول الفقه ) ، الدكتور عبدالكريم زيدان ٠ وەرگێڕ

كردەوەكـەیان هەیـە ، بـەڵام ڕێگـە بـە هەنـدێكی دراوە كـە پێویسـتی و بەرژەوەندیـەكی پەسەندكراو داوای دەكات وەكو تەماشاكردنی ژن بە نیازی خواستنی ، هـەروەها حـەرامكردنی نوێژی سوونەت لـە كاتـە قەدەغەكراوەكانـدا بـۆ داخسـتنی دەرگـای بەهانـە تـاوەكو وێچـون و شـوباهاندنێكی ڕواڵـەتی نبێـت بەوانـەی خـۆر دەپەسـتن ، بـەڵام ئەگـەر بەرژەوەندیـەكی پەسەندكراو هاتە پێش ئاسایە لەو كاتانەدا ئەنجام بدرێت ، هەروەها ( ربا الفضل )[١٢٢] حـەرام دەكرێت بۆ داخستنی دەرگای بەهانە بەرامبەر بە كارنـەهێنانی جۆری ( ربـا النَّسـیئة )[١٢٣] ، بەڵام هەندیكی لە بەر پێویستی ڕێـی پێدراوە وەكـو ( العَرَایـا )[١٢٤] ، ئێمـەش بـە تیروتەسـەلی باسی لایەنە حەرام و حەڵاڵەكانی ئاورێشممان كردووە لە كتێبی ( التَّخْییرِ لِمـا یَحِـلُّ وَیَحْـرُمُ مـن لباس الحریر ).

## بەشێك : سەبارەت بە بواری پزیشكی ئاورێشم :

لەم بوارەدا ئاورێشـم لـەو دەرمانانەیـە كـە لـە ئاژەڵـەوە وەردەگیرێـت ، بۆیـە بـە دەرمانـە ئاژەڵەیەكان دادەنرێت ، چونكە لە ئاژەڵ دێتە دەرەوە ، سوودو كـەڵكی زۆرە ، پلـەو پایـەكی

١٢٢ ـ ربا الفضل : فرۆشتنی پارەیەكە بە پارەیەكی جۆری خۆی بە زیاتر ، یا فرۆشتنی خواردنێكە بە خواردنێكی جۆری خۆی بە زیاتر ، بۆ نموونە ملوانكەیەكی ئاڵتون ( ١٢ ) ( مثقال ) پاك دەربكات بفرۆشرێتەوە بە ( ١٣ ) دیناری ئاڵتونی ، ئەو ( مثقال )ە زیادەیە ( ربا الفضل )ە ، یا كیلۆیەكی گەنمی كەڵەتی بدرێ بە دوو كیلۆ گەنمی مەكسی ، بڕوانە : پوختەی فیقهی شەریعەت ، مامۆستا طارق هەمەوەندی . وەرگێڕ .

١٢٣ ـ ربا النَّسیئة : ئەو زیادەیەیە كە قەرزدەر وەریدەگرێت لەو كەسەی قەرزەكەی دەداتێ بەرامبەر بەو ماوەیەی كە لایەتی بۆ نموونە ( ١٠٠٠٠٠٠ ) دیناری دەداتێ بە قەرز بۆ ماوەی مانگێك پاش مانگەكە ( ١٢٠٠٠٠٠ ) دیناری لێ دەوێت ، بۆیە ئەو ( ٢٠٠٠٠٠ ) دینارە زیادەیە ( ربا النسیئة )یە ، بڕوانە : پوختەی فیقهی شەریعەت ، مامۆستا طارق هەمەوەندی . وەرگێڕ .

١٢٤ ـ العَرَایا : بریتی بوو لە بەری دەرخورماگەلێك كە خاوەنەكەی دەیبەخشیە هەژاران ، بەڵام هەندێ جار هەژاران توانای چاوەڕێكردنی پێگەشتنی بەرەكەیان نەدەكرد ، بۆیە دەیانفرۆشت بە خورما ، بڕوانە پوختەی فیقهی شەریعەت ، مامۆستا طارق هەمەوەندی . وەرگێڕ .

گەورەی هەیە ، یەكێك لە خاسیەتەكانی بەهێزكردنی دڵە ، شادومانی دەكات ، بە سوودە بۆ زۆرێك لە نەخۆشیەكانی ، بە سوودە بۆ زاڵبونی ( المِرَّة السوداء )و ، ئەو نەخۆشیانەی بە هۆیەوە تووشی مرۆڤ دەبێت ، ئەگەر چاوی پێ بەرِژێت بەهێزی دەكات ، خاوەكەی كە لە پیشەسازی پزیشكیدا بەكاردێت _ گەرم و ووشكە لە پلەی یەكدا · دەگوترێت : گەرم و شێدارە لەو پلەیەدا · دەشگوترێت : مام ناوەندە · ئەگەر وەكو پۆشاك بەكار بهێنرێت گەرمیەكی مام ناوەند وەكو میزاجی مادەكە دەبەخشێت و جەستەش گەرم دەكات ، لەوانەشە ساردیەك بە جەستە ببەخشێت كاتێ كە چەوری دەكات و تەندروستی دەكات ·

( الرازي ) دەڵێت : ئاورێشم لە كەتان گەرمترەو ، لە لۆكە ساردترە ، گۆشت زیاد دەكات ، هەموو پۆشاكێكی زبریش ، جەستە لاواز دەكات و ، پیست ئەستور دەكات و بە پێچەوانەشەوە ·

دەڵێم _ ( ابن القيم ) _ پۆشاك سێ بەشە : بەشێك جەستە گەرم دەكات و فێنكیشی دەكاتەوە ، بەشێكیش : فێنكی دەكاتەوە بەڵام گەرمی ناكات ، بەشێكی تریش : نەفێنكی دەكاتەوو نەش گەرمی دەكات ، هیچ شتێكیش نی یە نەگەرمی بكات و نەش فێنكی بكاتەوە ، چونكە ئەوەی گەرمی دەكات شایستەترە بە فێنكردنەوەی ، بۆیە پۆشاكەكانی تووك و خوری گەرم دەكاتەوەو فێنكیش دەكاتەوە ، پۆشاكی كەتان و ئاورێشم و لۆكە فێنك دەكاتەوەو گەرم ناكاتەوە ، پۆشاكی كەتان ساردو ووشكە ، پۆشاكی خوری گەرم و ووشكە ، پۆشاكی لۆكە گەرمیەكەی مام ناوەندە ، پۆشاكی ئاورێشم لە لۆكە نەرمترەو گەرمیشی لە ئەو كەمترە ·

دانەری كتێبی ( المنهاج ) دەڵێت : پۆشینی ئاورێشم وەكو لۆكە جەستە گەرم ناكات ، بەڵكو گەرمیەكی مام ناوەندی هەیە ، هەموو پۆشاكێكی ساف و لووسیش ، جەستە كەمتر

گـەرم دەكـات ، هـەروەها كـەمتريش يارمـەتى دەدات بـۆ شـيكردنەوەى ئـەوەى لـە جەسـتە شيدەبێتەوە ، بە پێشتريش دادەنرێت لە هاوين و ، لە وەڵاتە گەرمەكاندا بپۆشرێت ٠

لە بەر ئەوەى ئەوە سيفەتى ئاورێشمەو ، هەروەها هيچ شتێك لە ووشكى و زبرى تێدا نـى يە بە بـەراوردى ئـەوانى تـر ، بۆيـە بـە سـوود بـوو بـۆ خـورويى ، چـونكە ئاڵۆشـى و خـورويى دروست نابێت مەگەر لە گەرمى و ووشكى و زبريەوە ، بۆيە پێغەمبەرى خوا ﷺ مۆڵـەتى دايـە( عبـدالرحمن )ى كـوڕى ( عَـوْف ) و ( الزُّبَيْـر ) بيپۆشـن بـۆ چارەسـەركردنى ئـەو ئاڵۆشـى و خورويەى هەيانبوو ، وە پۆشاكى ئاورێشم دوورترين شتە لە دروسـتكردنى ئەسـپێوە ، چـونكە ميزاجى ئاورێشم جياوازە لە مادەكانى تر كە ئەسپێ دروست دەكەن ٠

بەڵام ئەو بەشەى كە نەفێنك دەكەنەوەو نەش گەرم دەكەنەوە ، ئەوانەن كـە لـە ئاسـن و ، قوڕقۆشم و ، دارو ، گڵ و شتى ديكـەى بـەو هاوشـێوانە دروسـتكراوە ، ئەگـەر گـوترا : ئەگـەر پۆشاكى ئاورێشم نێونجێتيترين و گونجاوترين شت بێ بۆ جەستە ، بۆ شەرعى تەواو كـە شـتە چاكەكانى حەڵاڵ كردووەو ، شتە پيسەكانيشى حەرام كردووە ئاورێشميشى حەرام كردووە ؟

دەگوترێت : هەر تايەفەيەك لە موسڵمانان وەڵامێكى جياواز بۆ ئەم مەسـەلە دەخاتـە ڕوو ، بۆيـە ئـەو كەسـانەى كـە نكـۆڵيى لـە حيكمـەت و پاسـاوهێنانەوە دەكـەن كـاتێ ياسـاى پاساوهێنانەوە لە بنەرەتەكەيەوە هەڵگيرا ، چيتر پێويستيان بە وەڵامى ئەو پرسيارە نەبوو ٠

بەڵام جێگيركارانى حيكمەت و پاساوهێنانەوە _ كە زۆرينـەن _ كەسـانێكيان وەڵـامى ئـەو پرسيارە دەداتەوە بەوەى شـەريعەت حـەرامى كـردووە بـۆ ئـەوەى نەفسـەكان بەرامبـەرى بـە ئـارام بـن و ، لـە بـەر خـاترى خـواى تعـالى وازى لێبێـنن ، خـواى پـەروەردگاريش پاداشـتيان دەداتەوە بە تايبەت لە جێگەى ئاورێشم شتى تر هەيە بۆ پۆشين٠

کەسانێکیشیان وەڵامی دەداتەوە بەوەی کە لە بنەڕتدا خولقێنراوە بۆ ژنان ، بە هاوشێوەی خۆ ڕازاندنەوە بە زێڕ ، لە سەر پیاوان حەرام کرا لە بەر ئەو خراپەی دروستی دەکات و بریتیە لە خۆچواندن بە ژنان ·

کەسانێکیش دەڵێن : حەرام کراوە چونکە لە خۆبایبون و خۆ هەڵکێشان بەخۆوە شانیزیکرن دروست دەکات·

کەسانێکیش دەڵێن : حەرامکراوە چونکە کاتێ بەر جەستە دەکەوێت مێیەتی و ژنانی بوون دروست دەکات و دژبە دلاوەریی و مێردایەتی و پیاوەتیە · بۆیە ئەگەر بپۆشرێت سیفەتێك لە سیفاتەکانی ژنان دەخاتە دڵەوە ، بۆیە تەماشا دەکەیت هەرکەس پۆشیبێتی بێگومان شتێك لە مێیەتی و ژنانی بوون و نەرم وسستی بە خوو ڕەوشتیەوە بەدەردەکەوێت و ناشاردرێتەوە ، بەڕادەیەك ئەگەر لە دلاوەرترین و کەڵترین پیاوەکانیش بێت ، پۆشینی ئاورێشم کەمی دەکاتەوە ، ئەگەر بە یەکجاری نەیبات ، هەرکەسیش توانای تێگەشتنی ئەوەی نەبوو ، با ملکەچی شەرع بێت ، بۆیە ڕاسترین گوفتار : حەرامە بۆ بە خێوکاران بیکەن بە بەری مندالْ بۆ ئەوەی لە سەر سیفاتی مێنەو ژنانی بوون پەروەردە نەبێت ·

وقد روى النسائيُّ من حديث أبي موسى الأشعريِّ _ رضي الله عنه _ عن النبيِّ ﷺ أنه قال : (( إنَّ اللهَ أحلَّ لإناث أُمَّتي الحريرَ والذَّهبَ ، وحَرَّمَه على ذُكورها )) · وفي لفظٍ : (( حُرِّمَ لِباسُ الحَريرِ والذَّهبِ على ذُكورِ أُمَّتي ، وأُحِلَّ لإناثِهِم ))(١٢٥)

واتە :( أبي موسى الأشعَري )_ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( خوای تعالى ئاورێشم و زێڕی بۆ مێینەکانی ئومەتەکەم حەڵاڵ کردووەو ، بۆ

١٢٥ _ إسناده صحيح : أخرجه الترمذي ( ١٧٢٠ ) ، والنسائي ( ٨ / ١٦١ ) ، وصححه الألباني في الإرواء ( ٢٧٧ ) ·

نێرەکانیش حەرامی کردووە )) ٠ لە بێژەیەکی تردا : (( پۆشینی ئاورێشم و زێڕ بۆ نێرەکانی ئومەتەکەم حەرام کراوەو ، بۆ مێینەکانیش حەڵاڵ کراوە )) ٠

وفي صحيح البخاري عن حُذيفة قال : نهى رسولُ الله ﷺ لُبْسَ الحريرِ والدِّيباجِ ، وأن يُجلَسَ عليه وقال : (( هُو لهم في الدُّنيا ، ولكم في الآخِرة ))[١٢٦]

واتە : ( حُذيفة ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی پۆشینی ئاورێشم و دیباج کردووە ، هەروەها لە سەر دانیشتنیشی قەدەغەکردووەو فەرمووی : (( لە دونیادا بۆ ئەوانەو ، لە ڕۆژی دوایشدا بۆ ئێوەیە )).

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەرکردنی نەخۆشی ( ذات الجنب )دا :

روى الترمذي في جامعه من حديث زيد بن أرقمَ أنَّ النبيَّ ﷺ قال : (( تَداوَوا مَنْ ذاتِ الجَنْبِ بالقُسْطِ البَحْري والزَّيتِ ))[١٢٧]

واتە : ( زيد )ی کوڕی ( أرقم ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( خۆتان لە نەخۆشی ( ذات الجنب ) بە ( القسط البحري )و زەیت چارەسەر بکەن)).

١٢٦ _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٧ / ٩٩ ، ١٤٦ ، ١٩٣ ، ١٩٤ ) ، ومسلم ( ٦ / ١٣٦ ، ١٣٧ ) كلاهما عن عبدالرحمن بن أبي ليلى فذكر الحديث عن حذيفة ٠

١٢٧ _ ضعيف : أخرجه أحمد ( ٤ / ٣٦٩ ، ٣٧٢ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٦٧ ) ، والترمذي ( ٢٠٧٨ ) ، ( ٢٠٧٩ ) كلهم عن ميمون أبي عبدالله عن زيد بن أرقم مرفوعاً ، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٢٤١٨ ) ، وانظر الضعيفة ( ٣٣٩٦ ) ٠

( القسط البحري ) جۆرە ڕووەکێکە لە هند دەڕوێت بەتایبەت لە کشمیر بازرگانانی عەرەب لە ڕێگەی دەریاوە دەیانهێنایە دورگەی عەرەب بۆیە ( القسط البحري ) پێ دەگوترا ، هەروەها جۆرێکە لە بخوور بۆ دەرمان بەکاردێت بڕوانە کتێبی (( تهذيب الآثار)) للطبري ، ج٦ ، ل٣٢٦ ٠ وەرگێڕ ٠

نەخۆشی ( ذات الجنب ) بەلای پزیشكانەوە دوو جۆرە : حەقیقی و نا حـەقیقی ، حـەقیقی : ئاوسانێكی گەرمە لە لایەكانی جەستەدا پەیدا دەبێت لە پەردەی ناوەوەی پەراسـووەكاندا ٠ ناحەقیقی : ئـیش و ئازارێكـە لـە لایـەكانی جەسـتەدا پەیـدا دەبێـت ، بـە هـۆی بایـەكی چـڕی زیانبەخشەوە دەچێتە نێوان پێستەكانی سەرەوەو ژێرەوەدا ، یا لە نێـوان پیسـت و ڕیخۆڵـەدا دەوستێت و( الصفاقات ) ، ئازارێك دروست دەكات نزیك

بە ئازاری شێوە حەقیقیەكەیە ، بەڵام ئێش و ئازاری ئـەم بەشـە بـەرین و گوشـادە كـە لـە ڕاستیدا ژانێكی تیژە وەكو ئەوەی دەرزی بچەقێتە شتێك ٠

دانەری كتێبی ( القانون )فەرموویـەتی : پێدەچـێ لایـەكان و ، نێـوان پیسـتەو پـەردەكانی ژێرەوەو ، ماسولكەكانی سنگ و ، پەراسووەكان و ، دەوروبـەریان تووشـی چـەندین ئاوسـانی بەئازاری زیانبەخش ببێت ، بە ( الشَوْصة )و ، ( البرسـام )و[١٢٨] ، ( ذات الجنـب ) ناودەبرێـت ٠ پێدەچێ هەندێ ئازاری تر لەم ئەندامانەدا هـەبێت بـەڵام بـە هـۆی ئاوسـانەوە نـەبێت ، بـەڵكو دەگەڕێتەوە بۆ بایەكی چڕ ، واگومان دەبرێت لەم نەخۆشیەیە ، بەڵام لە ئەویش نی یە ٠

فەرموویەتی : بزانە هەموو ئێش و ئازارێك لە لایەكانی جەسـتەدا ڕەنگـە بـە ( ذات الجنـب ) ناوبرێـت وەكـو داتاشـانێك لـە جێگـەی ئازارەكـەوە ، چـونكە مانـای ( ذات الجنـب ) واتـە : ( صاحبة الجنب ) ، مەبەستیش لێرەدا ئازاری لایەكی مرۆڤە ، بۆیە ئەگـەر هـەر ئـێش و ئازارێـك لە لایەكانی مرۆڤدا ڕوویـدات دەدرێتـە پـاڵ ئـەو نەخۆشـیەو پێـی دەگوترێـت ( ذات الجنـب ) ، بۆیە كە ( بِقـراط ) گوتویـەتی : نەخۆشـەكانی ( ذات الجنـب ) سـوودلە خۆشـتن وەردەگـرن ٠

---

١٢٨ ـ برسام : نەخۆشیەكە خاوەنەكەی تووشی وڕێنە دەكات ، گوترلوە ئاوسانێكی گەرمە تووشی پەردەی نێوان جگەرو ڕیخۆڵە دەبێت ، بڕوانە : تفسیر الطبري ، ج٣ ، ص ٤٥٤ ، وەرگێڕ ٠

هەروەها برسام : ئاوسانی ئەو پەردەیەیە كە دەوری سیەكان دەدات ، بڕوانە : قاموس فرنسي عربي إنكليزي ، ج١ ، ص ٨٤٠ ٠ وەرگێڕ

گوتراوه : مەبەستی ( بِقراط ) هەموو ئەو کەسانە بوو کە هەست بە هەر ئێش و ئازارێك لە لایەکانی جەستەیاندا دەکەن ، یا هەست بە ئازاری سیەکانیان دەکەن بە هۆی تێکچونی میزاجەوە ، یا بە هۆی خەڵتەیەکی چڕەوە ، یا چووزێنەروە بەبێ ئاوسان و بەبێ ( تا ) ٠

هەندێ لە پزیشکان گووتویانە : مانای ( ذات الجنب ) لە زمانی یونانیەکاندا ، بریتیە لە ئاوسانی گەرمی لای مرۆڤ ، هەروەها ئاوسانێکی یەك بە یەکی ئەندامەکانی سکی مرۆڤ دەگرێتەوە ، لە ڕاستیدا ( ذات الجنب ) بە ئاوسانی ئەو ئەندامە ناودەبرێت ئەگەر تەنها ئاوسانێکی گەرم بوو.

( ذات الجنب )ی حەقیقی پینج نیشانەی هەیە : بریتین لە ( تا )و ، کۆکین و ، ژانی تیژ وەکو ئەوەی دەرزی بچەقێتە شتێك ، تەنگە نەفەسی و ، لێدانی خوێن بەری قوڵ ٠

ئەو چارەسەرەی لە فەرموودەکەی سەرەوەدا هاتووە ، تایبەت نی یە بەم بە شەوە ، بەڵکو تایبەتە بە بەشی دووەمەوە کە لە ئەنجامی بایەکی چڕەوە دروست دەبێت ، لێرەدا داری هندی ئەگەر بە شێوەیەکی زۆر وردی نەرم بکوترێت و ، تێکەڵ بە زەیتی گەرم بکرێت و ، شوێنی باکەی بە جوانی تێگریت و بیشێلیت ، یا بلێسرێتەوە ، دەرمانێکی گونجاوی ئەو نەخۆشیە دەبێت ، بۆی بە سوود دەبێت ، مادەکانی شیدەکاتەوەو ، لایدەبات ، بەهێزە بۆ ئەندامەکانی نێو سك ، کونیلە داخراوەکان دەکاتەوە ، لە گەڵ چەندین سوودی تر کە ئەو دارە هیندیە ( القسط البحري ) بەدیدەهێنێت ٠

( المسبحيُّ ) دەڵێت : ( القسط البحري ) : گەرم و ووشکە ، قەبزکاری سکە ، ئەندامەکانی ناوەوەی سك بەهێز دەکات ، با ناهێڵێت ، کونیلە داخراوەکان دەکاتەوە ، بە سوودە بۆ نەخۆشی ( ذات الجنب ) ، زیادەی شێ و تەڕی ناهێڵێت ، بۆ مێشك بەسوودە ٠ دەڵێت : پێدەچێ ( القسط البحري ) بۆ ( ذات الجنب )ی حەقیقیش بە سوود بێ ، ئەگەر هۆکاری دروستبوونەکەی مادەیەکی بەڵغەمی بوو ، بە تایبەت لە کاتی کەمبوونەوەی نەخۆشیەکەدا ٠

والله أعلم.

( ذات الجنب ) نەخۆشیەكی مەترسیدارە، وَفِي الْحَدِيثِ الصَّحِيحِ : عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ، أَنَّهَا قَالَتْ : بَدَأَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَرَضِهِ فِي بَيْتِ مَيْمُونَةَ : وَكَانَ كُلَّمَا خَفَّ عَلَيْهِ ، خَرَجَ وَصَلَّى بِالنَّاسِ ، وَكَانَ كُلَّمَا وَجَدَ ثِقَلًا قَالَ : مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ[١٢٩] ، وَاشْتَدَّ شَكْوَاهُ حَتَّى غُمِرَ عَلَيْهِ مِنْ شِدَّةِ الْوَجَعِ ، فَاجْتَمَعَ عِنْدَهُ نِسَاؤُهُ ، وَعَمُّهُ الْعَبَّاسُ ، وَأُمُّ الْفَضْلِ بِنْتُ الْحَارِثِ ، وَأَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ ، فَتَشَاوَرُوا فِي لَدِّهِ ، فَلَدُّوهُ وَهُوَ مَغْمُورٌ ، فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ ، مَنْ فَعَلَ بِي هَذَا ، هَذَا مِنْ عَمَلِ نِسَاءٍ جِئْنَ مِنْ هَا هُنَا ، وَأَشَارَ بِيَدِهِ إِلَى أَرْضِ الْحَبَشَةِ ، وَكَانَتْ أُمُّ سَلَمَةَ وَأَسْمَاءُ لَدَّتَاهُ، فَقَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ خَشِينَا أَنْ يَكُونَ بِكَ ذَاتُ الْجَنْبِ . قَالَ " فَبِمَ لَدَدْتُمُونِي " ؟ قَالُوا : بِالْعُودِ الْهِنْدِيِّ وَشَيْءٍ مِنْ وَرْسٍ وَقَطَرَاتٍ مِنْ زَيْتٍ . فَقَالَ " مَا كَانَ اللَّهُ لِيَقْذِفَنِي بِذَلِكَ الدَّاءِ " ثُمَّ قَالَ " عَزَمْتُ عَلَيْكُمْ أَنْ لَا يَبْقَى فِي الْبَيْتِ أَحَدٌ إِلَّا لُدَّ إِلَّا عَمِّي[١٣٠] .

واته : ( أمّ سلَمة ) _ خوای لیّ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی ( میمونة )دا نەخۆش کەوت ، ئەوەبوو هەرکاتێك نەخۆشیەکەی سووك بوایەتەوە ، دەچووە دەرەوەو نوێژی بە خەڵکەکە دەکرد ، چ کاتێکیش هەستی بەلەش قورسی بکردایە ، دەیفەرموو :فەرمان بدەن با ( أبابکر ) نوێژ بە خەڵکەکە بکات ، پاشان ئازارەکەی توونم بۆوە تا لە بەر زۆری ئێش و ئازار بورایەوە ، خێزانەکانی لە خزمەتیدا کۆبوونەوە ، ( العباس )ی مامی و ، ( أُمَ الفضْل )ی کچی ( الحارث )و ، ( أسماء )ی کچی ( عُمَیس )یش هاتنە خزمەتی ، ڕاوێژیان کرد سەبارەت بەوەی دەرمانی بتکێنە زار ، ئەوەبوو دەرمانیان تکانە زاری موبارەکی کاتێك بورابۆوە ، کە بە هۆش خۆی هاتەوە ، فەرمووی : کیّ ئەمەی پێکردوم ، ئەمە کاری ژنانێکە لێرەوە هاتوون و ، بەدەستی ئاماژەی بۆ خاکی حەبەشە کرد ، ئەوەبوو ( أمُّ سلَمة )و ( أسماء ) دەرمانەکەیان تکاندبووە زاری ، فەرموویان : ئەی پێغەمبەری خوا لەوە ترساین نەخۆشی ( ذات الجنب )ت تووش بوبیّ ٠ فەرمووی: دەرمانەکە چ بوو لە زارتان

---

١٢٩ _ سبق تخريجه ٠

١٣٠ _ سبق تخريجه ٠

كردم ؟ فەرموويان : به ( القسط البحري )و ، هەندێك له گژوگیای ئەسپەك و( الورس ) چەند دلۆپەیەك له زەیت · فەرمووی : خوای تعالی تووشی ئەو نەخۆشیەم ناكات ، ئینجا فەرمووی: بڕیارم داوه جگه له ( العباس )ی مامم هەركەسێك لەم ماڵەدا بێ دەرمانی بتكێنرێته زار ·

وفي الصحيحين عن عائشة _ رضي الله عنها _ قالت : لَدَدْنا رسولَ الله ﷺ ، فأشار أن لا تَلُدُّوني ، فقلنا : كراهيةُ المريض للدواء ، فلما أفاق قال : ألم أنْهَكُمْ أن تَلُدُّنِي ، لا يَبقَى منكم أحدٌ إلا لُدَّ غَيْرَ عمِّي العباس ، فإنَّه لم يَشْهدْكُم(١٣١)

واته : له خاتوو ( عائشة )ەوه _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : دەرمانمان تكاندە زاری موبارەكی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئاماژەی بۆ كردین كه دەرمان مەتكێنه زارم ، ئێمەش گوتمان : هەرگیز نەخۆش حەزی به دەمان نەبووه ، كه به هۆش خۆی هاتەوه فەرمووی : ئەی قەدەغەم نەكردن كه دەرمانم نەتكێنه زار ، به دەر له ( عباس )ی مامم ، كه هاوبەشی نەكردن ، هەركەس لەم ماڵەدا بێ دەرمانی دەكێنرێته زار ·

( أبوعبيد ) له ( الأصمعيِّ ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت : ووشەی ( اللَّدُودُ ) : ئەو دەرمانەیە كە دەتكێنرێتە لایەكی زاری نەخۆش ، ووشەكەش لە ( لَدِيدَي الوادي )وە وەرگیراوە واتە : هەردوو لای چەمێك · بەلام ووشەی ( الوَجُورُ ) واته : دەرمانێك كه بتكێنرێته ناوەڕاستی زار ·

دەڵێم _ ( ابن القيم ) _ ووشەی ( اللَّدود ) ، بالفتح : ئەو دەرمانەیە كە دەتكێنرێتە زار · بەڵام ( السَّعوطُ ) : ئەو دەرمانەیه كه دەكرێته لووتی نەخۆش ·

ئەو فیقهەی لەم فەرموودەیەوە دەستگیرمان دەبێت بریتیە لە سزادانی تاوانكار بە هاوشێوەی ئەو كردارەی خۆی ئەنجامی داوه ، ئەگەر كردوەكەی حەرام نەبێت و مافی خوای نەشكاندبێت ، ئەمەیە ڕاستی بڕیار له سەر دراو لەبەر زیاتر له ده بەڵگە كه له شوێنێكی تردا

١٣١ _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ١٠ / ١٤٠ ) ، ومسلم ( ٢٢١٣ ) ·

ئاماژەمان پێداوە ، هەروەها ئیمامی ( أحمد )یش بڕیاری لە سەر داوەو ، جێگیریش بووە لە هەر چوار جێنشینەکەی پێغەمبەری خواوە ﷺ، هەروەها مەسەلەکە بە ( القصاص ) لێك دەدرێتەوەو بەکاردەهێنرێت لە بواری شەپازللەو لێداندا ، بە بەڵگەی چەند فەرموودەیەك کە لەم بارەوە هاتوون و بەبێ هیچ بەرهەڵستکارێك ، بۆیە پێویستە کار بەم گوفتارە بکرێت ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێنمایەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بواری چارەسەرکردنی سەرئێشەو نیوەسەر ئێشەدا ( الشقیقه ):

روى ابن ماجة في سننه حديثاً في صحته نظر : أن النبي ﷺ كان إذا صُدِعَ ، غَلَّفَ رأسَه بالحنَّاءِ ، ويقول : : (( إنَّهُ نافعٌ بإذنِ الله من الصُّداعِ ))[١٣٢]

واتە : پێشەوا ( ابن ماجة ) لە ( سنن )ەکەیدا فەرموودەیەك لە دەگێڕێتەوە کەوا : پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر سەرئێشە بیگرتایە ، سەری لە خەنە دەگرت و ، دەیفەرموو : (( بە ئیزنی خوای تعالی بەسوودە بۆ سەرئێشە )) ٠

سەرئێشە : ئێش و ئازارێکە هەندێکی سەر یا هەمووی دەگرێتەوە ، بۆیە ئەگەر سەرئێشەکە لایەکی سەر بگرێتەوەو ئازارەکەی بەردەوام بوو ئەوا بە ( الشقیقة ) ناودەبرێت ، بەڵام ئەگەر سەرئێشەکە تێکڕای سەر بگرێتەوەو ئازارەکەی بەردەوام بوو بە ( بَیضَةً ) و ( خُودَةً ) ناودەبرێت ، چونکە چوێندراوە بە ئەو خودە ئاسنینەی کە سەرباز بە سەری دەکات و هەموو سەر دادەپۆشێت ، پێدەچێ جاربەجار ئازارەکە پشتەوە یا پێشەوەی سەر بگرێتەوە ٠

١٣٢ ــ إسناده حسن : أخرجه أبوداود ( ٣٨٥٨ ) ، وابن ماجة ( ٣٥٠٢ ) ، وحسنه الألباني في صحيح الجامع ( ٤٨٦٠ ) ٠

سەرئيشـە جـۆرى زۆرەو هۆكـارى دروستبوونيشـى جيـاوازە · حەقيقـەتى سەرئێشـەش : گەرم بوونى سەرە ، بە هـۆى ئـەو هەڵمانـەى لـە سـەردا دەخولێتـەوەو دەيـەوێت لێـى بچێتە دەرەوەو ، ڕاڕەوێك نادۆزيتـەوە بـۆ چـوونەدەر ، بۆيـە سـەر دەيئێشـێنێت و هۆشـياريش لاواز دەكات ، كاتىٚ كە هەموو شتێك لە سـەردا گـەرم دەكـات و يسـتى چـوونە دەرەوەى دەكـات ، چونكە هەموو شتێكى تەڕو شێدار ئەگەر گەرم بـوو ئـەوا ويسـتى جێگەيـەكى فـراوانتر دەكـات لەو جێگەيەى تيايدايە ، بۆيە ئەگەر هەڵمەكە تێكڕاى سەرى داپۆشى بە جۆرێك چيتر توانـاى نيشتنەوەو شيبوونەوەى نەبێت و ، لە سەردا سوڕايەوە ، بە ( السَّدر ) ناودەبرێت.

سەرئێشەش لە ئەنجامى هۆكارەوە ڕوودەدات :

يەكـەم : بـە هـۆى زاڵبـوونى يـەكێك لـە مادەكـانى ( الصـفراء ) ، ( السـوداء ) ، خـوێنى ، بەڵغەمى بە سەر جەستەدا ·

دووەم : لە ئەنجامى چەند برينێكەوە كە لە گەدەدا دروسـت دەبێـت ، بۆيـە بـە هـۆى ئـەو برين هەڵتۆقانـەوە سـەر دەئێشـێت چـونكە ئـەو دەمـارەى لـە سـەرەوە شـۆڕبۆتەوە لـە گـەڵ گەدەدا پەيوەندە ·

سـىٚ يـەم : لـە ئـەنجامى بايـەكى چـڕەوە كـە لـە گـەدەدا دروسـت دەبێـت ، بـۆ سـەر بەرزدەبێتەوەو دەيئێشێنێت ·

چوارەم : سەرئێشەيەك لە ئەنجامى پڕبوونى گەدەوە بەخواردن دروسـت دەبێـت ، پاشـان دادەبەزێت و هەندێكيشى بەبىٚ پێنەگەشـتن و بـەبىٚ هەرسـبوونى تـەواو دادەبـەزىٚ ، ئـەوەش سەردەئێشێنێت و قورسى دەكات ·

پێنجەم : سەرئێشەيەك دواى جووتبوونى خێزان دروست دەبـىٚ لەبـەر شـلۆق بـوونى بـارى جەستە ، وە گەرمى هەواكەى زياد لە ئەندازەى پيويست پێدەگات ·

شەشەم : سەئێشەيەك پاش ڕشانەوەو بەتاڵبوونى سك دروست دەبىٚ ، يا بەهۆى زاڵبـوونى بارى ووشكێتى بەسەر جەستەدا ، يابەهۆى بەرزبوونەوەى شىٚ و بۆخى نێو گەدەوە بۆ سەر.

حەوتەم : سەرئێشەيەك بەهۆى زۆرگەرمى بارى گەش و هەواوە ·

هەشتەم : سەرمابوونی زۆرو ، چرپوونەوەی شێ و بۆخ لە سەرداو شینەبوونەوەی ٠

نۆیەم : بەهۆی شەونخونی و شەو دانیشتنەوە تا کاتێکی درەنگ ٠

دەیەم : بەهۆی پەستانێکی زۆرەوە کە دەخرێتە سەر سەرو هەڵگرتنی شتی قورس بەسەر ٠

یازدەیەم : بەهۆی زۆر قسەکردنەوە ، هێزی دەماغ لاواز دەبێت ٠

دوازدەیەم : بەهۆی زۆر جەڵانەوەو وەرزشی لەڕادەبەدەرەوە ٠

سیازدەیەم : بەهۆی نەخۆشیە نەفسیەکانەوە وەکو خەم و ، پەژارەو ، خەفەت خواردن و ، دودڵیی و ، بیرکردنەوەی خراپ ٠

چواردەیەم : بەهۆی زۆر برسێتیەوە ، چونکە هەڵم و بۆخەکان شتێك نادۆزنەوە کاری لێ بکات ، ئیتر زۆر دەبێت و ، بەرزدەبێتەوە بۆ مێشك ٠

پازدەیەم : هۆی ئاوسانی پەردەکانی مێشکەوە ، تووشبوو بەم نەخۆشیە هەست دەکات یەکیك بە چەکوش بە سەریدا دەکێشێت ٠

شازدەیەم : بەهۆی ( تا ) بەرزبوونەوەوە بۆیە هەست بە ئازار دەکات ٠ والله أعلم ٠

## بەشێك : سەبارەت بە هۆکارەکانی سەرئێشەی ( الشقيقة ) :

هۆکاری سەرئێشەی ( الشقيقة ) مادەیەکە لە خوێنبەرەکانی سەردا هەر خودی خۆی دروست بووە ، یا بۆی بەرزبۆتەوەو ، لایەکی لاوازی سەر وەریدەگرێت ، ئەو مادەش یا هەڵمیە ، یا تێکەڵاوگەلێکی گەرم یا ساردە ، نیشانە تایبەتیەکەشی لێدانی خوێنەرەکانە ، بە تایبەت ئەگەر هۆکارەکەی خۆینی بوو ، بۆیە ئەگەر بە شتێك سەر بە توندی ببەسترێت و ، لێدانی خوێنبەرەکان قەدەغە بکرێت ، ئێشەکە دەوەستێت ٠

( أبونعيم )لە کتێبی (الطب النبوي )دا فەرموویەتی: ئەم جۆرە تووشی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبوو ، ڕۆژو دوو ڕۆژ دەمایەوەو نەدەچووە دەرەوە ٠

وفيه : عن ابن عباس قال : خطبنا رسول الله ﷺ وقد عَصَبَ رأسه بِعِصَابةٍ .

واته ( أبونعيم ) له كتێبى ( الطب النبوي )دا دەگێڕێتەوە كەوا : ( ابن عباس ) _ خواى لێ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : پێغەمبەرى خوا ﷺ ووتارى بۆ دەداين و بە سەرپێچێك سەرى بەسبوو ٠

وفي الصحيح : أنه قال في مرض موته : (( وَارَأْسَاهُ ))[١٣٣].

واتە : پێغەمبەرى خوا ﷺ لە نەخۆشى مردنەكەيدا فەرمووى : (( ئاى سەرم )) ٠ لە نەخۆشيەكەيدا بە سەرپێچێك سەرى دەبەستەوە ، سەربەستنيش بەسوودە بۆ ئازارى ( الشقيقة )و جۆرەكانى ترى ئازارەكانى سەر ٠

## بەشێك : سەبارەت بە چارەسەركردنى سەرئێشەى ( الشقيقة ) :

چارەسەرى ( الشقيقة ) جياوازە بەپێى جياوازى جۆرەكانى و ئەو هۆكارانەى دروستيان دەكات ، بۆيە هەندێكيان بە بەتاڵكردنەوەى مادەيەك دەبێت ، هەندێكى تريان بەخۆراك خواردن دەبێت ، هەشە چارەسەركردنى بە سرەوتن و پشودانە ، هەشە چارەسەركردنى بە بەستنە ، هەشە چارەسەركردنى بە فێنك كردنەوەيە ، هەشە چارەسەركردنى بە گەرم كردنە ، هەندێكيشيان چارەسەركردنى بە دووركەوتنەوەيە لە بيستنى دەنگ و غەڵبەغەڵب و جوڵانەوە ٠

پاش زانينى ئەوانە ، دەبێ بزانين چارەسەرى سەرئێشە لەو فەرموودەيەدا بە خەنەيە ، ئەمەش چارەسەرێكى جوزئيە نەك گشتى ، چارەسەرى جۆرێكە لە جۆرەكانى ، چونكە سەرئێشە ئەگەر لە گەرمابونێكى زۆرەوە بێت و ، لە مادەيەكەوە نەبێت پێويست بە بەتاڵكردنەوە بكات ، ئەوا خەنەى زۆر بۆ بەسوودە دەبێت ، ئەگەر گياى خەنە بكوترێت و لە

١٣٣ _ صحيح : أخرجه البخاري ( ١٠ / ١٠٥ ) ٠

گەڵ سرکەدا ( الخل ) بە تەوێڵەوە ببەسترێت ، ئێشـەکەی دەنیشـێتەوە ، وە هێزێکـی باشـی تێدایەو گونجاوی دەمارە کە ئەگەر بۆی بەکاربێت ، ئێشەکەی دەوەستێنێت ، خەنـەش تـەنها تایبەت نـی یـە بـە سەرئێشـەوە ، بەڵکو بۆ هـەموو ئەندامـەکان بـەکاردێت ، چـونکە گـرتن و گوشینێکی تێدایە کە ئەندامەکانی پـێ بـەهێزو پتـەو دەکرێـت ، ئەگـەر بخرێتـە سـەر شـوێنی ئاوسانی گەرم ، دەنیشێنێتەوەو ئازاری نامێنێت ٠

وقد روى البخاري في تاريخه ، وأبوداود في السـنن أنَّ رسـولَ الله ﷺ مـا شـكا إليـه أحـدٌ وجَعاً في رأسه إلا قـال لـه : (( احْـتَجِمْ )) ، ولا شَـكى إليـه وجَعـاً في رجلَيـه إلا قـال لـه : (( اخْتَضِبْ بالحَنَّاء ))[١٣٤].

واتـە : ئیمـامی ( البخـاري ) لـە ( تـاريخ )ەكەيـداو ، ئیمـامی ( أبـوداود )یش لـە ( سـنن )ەكەیـدا دەگێڕنـەوە کـەوا پێغەمبـەری خـوا ﷺ هەرکەسێك سەرئێشـانێکی خـۆی لەخزمـەتی پێغەمبەری خوادا سکاڵا بکردایە پێـی دەفـەموو : (( کەڵەشـاخ بگـرە )) ، هەرکەسـیش باسـی قاچ ئێشەیەکی خۆی لە خزمەتیدا بکردایە پێی دەفەرموو : (( خەنەی تێگرە )) ٠

وفي الترمذي عن سلمى أمّ رافـعٍ خادمـةِ الـنّبيّ ﷺ قالـت كـانَ لا يصـيبُ الـنّبيَ ﷺ قرحـةٌ ولا شوكةٌ إلا وضعَ عليها الحنّاء ٠

واتە : لە ( سـلْمَى أُم رافـع )ی خزمـەتکاری خـواوە ﷺفەرموويـەتی : پێغەمبـەری خـوا ﷺ هەر برینێك یا دڕکێکی تووش بوایە ، خەنەی تێدەگرت ٠

١٣٤ _ إسناده صحيح : أخرجه أبوداود ( ٣٨٥٨ ) ، وأحمد ( ٦ / ٤٦٢ ) ، وصححه الألباني في صحيح أبي داود ( ٣٢٦٧ ) ٠

## بەشیك : سەبارەت بە خەنەو سوودو خاسیەتەکانی :

خەنە سازدە لە یەکەمدا ، ووشکە لە دووەمدا ، هێزی داری خەنەو لقەکانی پێکاتووە لە هێزێکی شیکەرەوە لە ناوەڕۆکێکی ئاویەوە وەریگرتوە کە تیایدایەو ، گەرمە بە مام ناوەند ، هەروەها هێزیی بریتیە لە هێزێکی گرتن و گوشین لە ناوەڕۆکێکی خاکیەوە وەریگرتووە کە تیایدایە ٠

لە گرنگترین سوودەکانی ئەوەیە کە ئەو ئاوسان و هەڵتۆقانەی بەهۆی ئاگر سووتاندنەوە دروست دەبێت دەینیشێنێتەوەو نایهێڵێت ، هەروەها هێزێکی گونجاوی هەیە بۆ دەمار ئەگەر تێی هەڵسوێنرێت ، ئەگەر بجوێنرێت بەسوود دەبێت بۆ برینی زارو ئەو پیزۆکانەی تووشی دەبێت ٠ ئەو زیپکانەی لە نێو زاری منداڵاندا دەردەچن چاك دەکاتەوە ، ئەگەر بخرێتە سەر ئاوسانی گەرمی بە ئازار بۆی بە سوود دەبێت ، لە سارێژکردنەوەی برینەکاندا بە هاوشێوەی ( دم الأخوَين )[١٣٥] کاریگەری دەبێت ، ئەگەر گوڵ و خونچەی ( نورهُ ) لە گەڵ مێوی پاڵێوراو ( الشّمع المصفّى ) ، لە گەڵ ڕۆنی کوڵدا ( دهنِ الوردِ ) تێکەڵ بۆ ئازاری هەردوو لای مرۆڤ بەسوود دەبێت ٠

---

١٣٥ _ دم الأخوَين : چەندین ناوی دیکەشی هەیە وەکو ( دم الغزال ، دم الثعبان ، صمغ البلاط ، دم التنين ، عروق حمراء ، الشيان ، الأيدع ) ، بەڵام لە ڕاستیدا ماددەیەکی صمغیەو ، لە درختێکەوە دەردەهێنرێت کە بەزۆری لە دورگەی ( سوقطري ) سەر بە وەڵاتی یەمەن دەڕوێت ، ئەم درەختە نزیکەی هەشت متر بەرزەو ، ملی درەختەکە درێژەو دڕکی درێژی ڕەشی پێوەیە ، گوڵگەلێکی بچوکی هەیەو ، بەرەکەشی بچوکەو بە بەرگێکی ڕەشی درەوشاوە داپۆشراوەو ، هەر بەرێك یەك دانە تۆوی شێوە هێلکەیی و ڕەنگ ڕەشی تێدایە ، ئەو بەشەی لەم درەختە بەکاردێت ، ماددە صمغیەکەیەتی کە لە توێکڵی درەختەکەو بەرگی تۆوەکەوە دەردەهێنرێت و ، ڕەنگی سورێکی تێرە ٠ بڕوانە :www khym a net

لە خاسیەتەکانی دیکەی ئەگەر سەرەتای نەخۆشی ئاولە لە منداڵدا بەدەرکەوت و ، ژێرەوەی پێکانی خەنەی تێهەڵسوێنرێت دڵنیا دەبێت کە چیتر لە چاوەکەنیدا بەدەرنایەت ، ئەمەش ڕاستەوە تاقیکراوەتەوە بەبێ هیچ گومانێك ٠ ئەگەر گوڵ و خونچەی ( نورەُ ) لە نێو لوچ و پێچەکانی پۆشاکی خوریدا دابنرێت بۆن خۆشی دەکات و ، مۆرانەی لێ قەدەغە دەکات ، ئەگەر گەڵاکانی بخرێتە نێو ئاوێکەوە دابپۆشێت ، پاشان بگوشرێت و لە روون و ساف و چاکەکەی چل ڕۆژ بە ئەندازەی قورسی بیست دیرهەم و لەگەڵ دە دیرهەم شەکردا بخورێتەوەو ، پاشان بە سەریدا گۆشتی بەرخی بچوك ( الضأن الصغير ) بخورێت ، ئەوا بە خاسیەتێکی سەرسوڕمێن بە سوود دەبێت بۆ قەدەغەکردنی دەستپێکردنی نەخۆشی گولیی ٠

باسکراوە پیاوێك نینۆکی پەنجەکانی دەستی درزی بردبوو ، پارەیەکیشی تەرخان کردبوو بۆ ئەو کەسەی چاکی بکاتەوە ، پاشان ژنێك وەسفی بۆ کرد ، هەموو ڕۆژێك لە ئاوی خەنە بخواتەوە ، سەرەتا کاری بە وەسفەکەی نەکرد ، پاشان کە گەڵاکانی خستە نێو ئاوەوەو هەستا بە خواردنەوەی ، چاك بویەوەو نینۆکەکانیشی گەرایەوە بۆ چاکیەکەی جاران ٠

ئەگەر نینۆکەکان هەویری خەنەی تێگیرێت چاکی دەکات و بۆی بەسوود دەبێت ، ئەگەر لە گەڵ ڕۆندا بشێلرێت و بخرێتە سەر ئەو هەڵتۆقاوانەی کە ئاوی زەرد دەردەهێنن بۆی بەسوود دەبێت ، بەسوودە بۆ گەڕیەکی بریناوی هەوکردووی درێژخایەن ئەوپەڕی سوود ، پرچ دەردەچێنێت و بەهێزی دەکات و ، چاك و جوانی دەکات ، سەر بەهێز دەکات ، بەسوودە بۆ ئەو پیزۆکەو تلۆقانەی لە سەر پێست دەردەچێت و هەروەها بۆ ئەو بلقە پڕ ئاوانەی بەهۆی ئیش و کاری زۆرەوە لە دەستدا هەڵدەتۆقێن ، بەسوودە بۆ ئەو زیپکانەی لە دەست وقاچ و سەراپای جەستەدا دەردەچێت ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەرکردنی نەخۆشیدا بە وازهێنان لەوەی ئەو خواردن و خواردنەوانەوە بدرێ بە نەخۆش کە حەزی پێ نی یەو ، ناچاریشی ناکرێت بە خواردنی :

روى الترمذي في جامعه ، وابن ماجة ، عن عقبة بن عامر الجُهَني ، قال : قال رسـول الله ﷺ : (( لا تُكْرِهوا مَرضاكُم على الطَّعامِ والشَّرابِ ، فإنَّ الله _ عَزَّوجلَّ _ يُطْعِمُهُم ويَسْقِيهم ))[١٣٦] .

واتـە : ( عقبـة )ی کـوڕی ( عـامر الجُهَـني ) _ خـوای لـێ ڕازی بێـت _ فەرموویـەتی : پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی : (( نەخۆشـەکانتان ناچاری خـواردن و خواردنـەوە مەکـەن ، چونکە خوای _ عَزَّوجلَّ _ خواردن و خواردنەوەیان دەداتێ )) ٠

هەندێ لە پزیشکە بەڕێزەکان دەڵێن : چەند بە سـوودە ئـەم گوفتـارە پێغەمبەرایەتیـە کـە دانایی و حیکمەتگەلێکی ئیلاهی زۆر دەبەخشێت ، بەتایبەت بـۆ پزیشـکان و ، ئـەو کەسـانەی نەخۆش چارەسەر دەکەن ، چونکە نەخۆش ئەگەر وازی لە خواردن یـا خواردنـەوە هێنـا ، لـە بەر ئەوەیە سروشتی نەخۆشەکە سەرقاڵە بە تێکۆشان بەرامبەر بە نەخۆشیەکە ، یـا ئـارەزوی خـواردنی نومـاوە ، یـا کـەم بۆتـەوە بـەهۆی لاوازبـوونی حـەزو ویسـتەوە یـا هـەر نـەماوە ، هەرچۆنێك بێت ، لەم کاتەدا پێویستە خۆراکی نەدرێتێ ٠

بزانە برسێتی لە ڕاستیدا داواکردنی خواردەمەنیە لە لایەن ئەندامەکانەوە بـۆ ئـەوەی جێگەی ئەو خۆراکانەی پێ پڕکاتـەوە کە شیی بونەتـەوە ، لەم کاتەدا ئەندامە دوورەکان لە ئەندامە نزیکەکانەوە ڕادەکێشن تا ڕاکێشانەکە بـە گـەدە کۆتـایی دێـت و ، مـرۆڤیش هەست بە برسێتی دەکات ، بۆیە هەرکات نەخۆش نارەحەت بـوو ، سروشـتی نەخۆشـەکە

---

١٣٦ _ إسناده ضعيف : أخرجه الترمذي ( ٢٠٤١ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٤٤ ) ، وضعفه الألباني ٠

کاردەکات بۆ پێگەیاندن و هاوێشتنە دەرەوەی ماددە زیانبەخشەکان و داوای خـۆراك و ، خواردنەوە ناکات ، ئەگەر نەخۆش ناچاری خواردنی شتێك لەوانە کرا ، ئـەوا دەبێتـە هۆکارێك بۆ ئەوەی سروشت کاری پێگەیاندن و هاوێشتنە دەرەوەی مادە زیانبەخشـەکان نـەکات و ، سـەرقاڵ دەبێـت بـە هەرسـکردن و چارەسـازی خۆراکەکانـەوەو ئـاوڕ لـە نەخۆشیەکە ناداتەوە ، ئـەوەش نـەخۆش تووشـی زیـان دەکـات ، بـە تایبـەت لـە کـاتی توندبوونی نەخۆشیەکەدا ، یا لە کاتی لاوازبوونی حەزو ویستی خواردندا یا هـەر نـەمانی ، بەمەش بەڵاکە زیاتر دەبێت و ، پەلەش لە دابـەزینی کارەسـاتی دڵتـەزێنتر دەکرێـت ، پێویستە لەم کات و بارەدا بەدەر لەوەی هێزی دەپارێزێت و بەهێزی دەکـات هـیچ تـری نەدرێتیّ ، بەبیّ بیزارکردنی سروشت بەهێچ شێوەیەك ، وەکو ئـەو خـۆراك و خواردنـەوە نەرم و ناسکانەی بەشی مرۆڤ دەکات و ، ئەوانەی میزاجێکی مام ناوەنـدی هەیـە وەکـو شـەربەتی ( لینـوفر )و[١٣٧] ، سـێوو ، گـوڵی ناسـك و ، بەهاوشـێوەی ئەوانـە ، لـە خۆراکەکانیشدا شلەیەکی مام ناوەندی مریشکە باڕۆکەیـەکی بـەتام و هیچـی تـر ، هێـزو تواناشی بە بۆنە خۆشە گونجاوەکان و ، هەواڵە دڵخۆشکارەکان ببوژێنرێتـەوە ، چـونکە پزیشك خزمەتکاری سروشت و یارمەتیدەریەتی نەك تەگەرەی بهێنێتە پێش ٠

بزانە خوێنی چاك خۆراك بەخشی جەستەیە ، بەڵغەمیش خوێنێکی کاڵەو کەمێك پێگـەیووە ، هەندیّ لە نەخۆشەکان ئەگەر بەڵغەمێکی زۆری لە جەستەدا کۆبۆوەو ، خۆراکی باشی نـەبوو ، سروشت بەزەی پێدا دێتەوەو ، ئەو خوێنە پێدەگەیەنێت و ، دیسانەوە دەیکـات بـە خـوێنی پاك و ، دەیکات بەخۆراك بـۆ ئەندامـەکان و ، هیچـی تـری پێویسـت نابێـت ، سروشـتیش ئـەو هێزەیە کە خـوای پـەروەردگار کردویـەتی بـە بریکـار بـۆ چارەسـازی جەسـتەو پاراسـتنی و ، چاودێریکردنی بە درێژای تەمەنی ٠

---

١٣٧ ــ لیونفر : ڕووەکێکی بە تەمەنەو ، قەدی لە ئاودا ڕۆچووەو ، گەڵاکانی بە سەر ئاوەکەدا ڕاکشاوە ، گوڵەکانی بۆنێکی خۆشیان هەیەو ، هەموو ڕووەکەکە بەکار دێت بەتایبەت ڕەگەکەی ٠ بڕوانە : www alhayrh.com /vb/

بزانـه هەنـدێ جـار نـەخۆش ناچـاری خـۆراك و خواردنـەوە دەكرێـت ، بەتايبـەت لـەو نەخۆشيانەدا كە تێكچونی ئەقڵی لـە گەڵدايـە ، لێـرەدا فەرموودەكـە سـيفەتێكی گشـتی هەيـە بەڵام تايبەت كراوە ، يـا لـە فـەرموودە ڕەهاكانـەو بەڵگەيـەك تايبـەت و سـنورداری كـردووە ، مانای فەرموودەكەش : پێدەچێ نەخۆش بەبێ خۆراك چەند ڕۆژێـك بـژێت لـە كاتێكـدا مرۆڤـی تەندروست ئەو ماوەيە بەبێ خۆراك توانای ژيانی نابێت ٠

لە فەرمايشـتەكەی پێغەمبـەری خـوادا ﷺ (( فـإنَّ الله يُطعِمُهـم ويَسْقِهِم )) مانايـەكی ووردو ناسـكی تـر بەديـدەكرێت ، سـەرەڕای ئـەوی پزيشـكان باسـيان كـردووەو ، هـيچ كەسـێكيش بەديناكات بەدەر لە كەسانێك كە گرنگی دەدەن بە حوكمـەكانی دڵ و ڕوح و ، كاريگـەريان لـە سروشتی جەستەداو ، كاردانەوەی سروشت بەرامبەری ، وەكو چۆن خودی خۆی كاردانـەوەی بەرامبەر بە سروشت دەبێت ٠ ئێمەش ئاماژەيـەكی پـێ دەدەيـن و ، دەڵـێين : نەفسـی مرۆڤـ ئەگەر شتێك هەبوو وەكـو حـەزلێكراوێك يـا ناپەسـەندێك يـا ترسـێنەرێك سـەرقاڵی بكـات ئـەوا پێوەی خەريك دەبێت و ئاوڕيك لـە داواكردنـی خـۆراك و خواردنـەوە نـادات ، بۆيـە هەسـت بـە برسێتی و تينويەتی ناكات ، بەڵكو هەست بە گەرماو سەرماش ناكات ، بـەڵكو پێـوەی خـەرێك دەبێت و هيچ كاردانەوەيەكيشی بەرامبەر بە هەستی ئازاردەری زۆر بە ئـازاريش نابێـت ، بۆيـە هەستی پێ ناكات ، هيچ كەسێكيشمان نـی يـە هەسـتی بەوانـە نـەكردبێت ، وە ئەگـەر نـەفس سەرقاڵ بوو بەوەی كە هێرشی بۆ هێناوە ، بۆ ئەوەی بەرپەرچی بداتـەوە ، چـيتر هەسـت بـە برسـێتی و تينويـەتی ناكـات ، بۆيـە ئەگـەر ئـەو هێرشـبەرە دڵخۆشـكارێكی ئـەو پـەڕی دڵخۆشـكاربوو ، ئـەوا جێگـەی خـواردن دەگرێتـەوە ، نەفسـی پـێ تێـر دەبێـت ، پشـويەكی دەرونی بـۆ دەهێنێـت ، دوو ئەوەنـدەش دەبێتـەوەو ، لـە گـەڵ خوێنـدا بـە هـەموو جەسـتەدا بەڵاودەبێتـــەوە تـــا لـــە پيستيشـــدا دەردەكـــەوێت ، بـــەوەش ڕووی دەگەشـــێتەوەو ، خوێنگەرميەكەی دەردەكەوێت، چونكە دڵخۆشبوون خوێنی دڵ زۆرترو فراوانتر دەكـات و ، بـە هـەموو دەمارەكانـدا بڵـاو دەبێتـەوە ، پڕيـان دەكـات ، بۆيـە ئەندامـەكانی لـەش داوای بەشـە خۆراكەكـەی خۆيـان ناكـەن كـە پێـی ڕاهـاتووبوون بـە هـۆی سـەرقاڵبوونيانەوە بـەوەی زۆر

خۆشەویسترە بەلایانەوە ، وەخۆشەویستیشە بەلای سروشتەوە ، چونکە سروشت ئەگەر خۆشەویستی خۆی دەستکەوت ، پەسەندێتی دەکات و ئاوڕ لە شتی تر ناداتەوە ٠

بەڵام ئەگەر هێرشبەرەکە ئازاردەربێت یا خەفەتکاربێت یا ترسێنەربێت ، جەستە بە جەنگردن و بەرهەڵستی و دوورخستنەوەی ئەو دوژمنەوە سەرقاڵ دەبێت و ئاوڕ لە داواکردنی خۆراك ناداتەوە ، چونکە لە باری جەنگاندا ئەو خەریك بووەو داوای خواردن و خواردنەوە ناکات ٠ دەرەنجام ئەگەر لە جەنگەکەدا سەرکەوتوو بوو ، هێزی دەبوژێتەوەو ، جێگەی هێزی ئەو خۆراك و خواردنەوانەی بۆ دەگرێتەوە کە لە دەستی چووە ، بەڵام ئەگەر نەخۆش بەرامبەر بەو هێرشبەرە دۆڕاو بوو ، هێزی تێك دەشکێت بە گوێرەی ئەو کارەساتەی بە سەریدا هاتووە ، بەڵام ئەگەر جەنگی نێوان خۆی و دوژمنەکەی پێشبڕکێ بوو هەرجارەی یەکێکیان سەرکەوتوو دەبوو ، ئەو هێزیش جاربەجار دەردەکەوێت و جەربەجاریش نامێنێت ، بەگشتی جەنگی نێوانیان بە هاوشێوەی جەنگی نێوان دوو دوژمنە ، سەرکەوتنیش بۆ کەسی براوەیە ، دوڕاویش یا کوژراوە ، یا بریندارە ، یا دیلە ٠

نەخۆش : لە لایەن خوای تعالاوە یارمەتی دەدرێت و پشتگیری لێ دەکرێت و بەوانە خۆراکی بەسوودی دەداتێ ، سەرەڕای ئەوەی پزیشکان باسیان کردووە کە خوێنیش ڕۆڵی کاریگەری لەو بواردا دەبێت ، ئەم یارمەتیدانەش بەگوێرەی خۆ بەلاواز دانان و خۆ شکاندنەوەو خۆ فرێدانە لە پیش دەستی خواکەی خۆیدا ــ عَزَّ وجلَّ ــ بەوەش نزیکبوونەوەیەك لە خواکەی خۆیەوە دەستەبەر دەکات ، چونکە بەندە ئەو کاتە زۆر نزیك دەبێتەوە لە خواکەی خۆیەوە کە دڵی بەرامبەر بە خواکەی دەشکێنێتەوە ، بۆیە لەو کاتانەدا ڕەحمەت و بەزەیی پەروەردگاری لێوە نزیك دەبێت ، ئەگەر مرۆڤێکی خواپەرست بوو ، خۆراکێکی دڵیی ئەوتۆی دەست دەکەوێت هێزە سروشتیەکانی پێ بە هێز دەبێت و ، هێزەکانی پێ دەبوژێتەوە زۆر زیاتر لە خۆراکە ئاسایەکەی خۆی ، هەرچەندیش باوەڕو خۆشەویستی و ، دڵخۆشبوون و ، کەیفخۆشبوون و ، دڵنیابوون و بێ گومانی بەرامبەر بە

پەروەردگارەکەی بەهێزبوو ، ئارەزووی کردو قایل بوو بە خواکەی و بە هیوای ڕەزابوونی بوو ، ئەوا هێزێکی ئەوتۆ لە خۆیدا بەدیدەکات کە هەرگیز وەسف ناکرێت و ، وەسفە دەرمانەکانیەکانی پزیشکیش ناگات بە ئاستی و · زانستەکەشی پەی پێ نابات ·

هەرکەسیش کە دڵڕق دەبێ و ، نەفسی توانای تێگەشتن و باوەڕپێکردنی ئەمەی نابێ ، با تەماشای باری زۆرێك لە عاشقانی دیمەن و ڕواڵەت بکەن ، ئەوانەی دڵیان پڕبووە لە عێشقی دیمەن و ڕواڵەتی دونیا و ، شان و شەوکەت و ، سەروەت و سامان و ، زانست ، خڵکانیش سەبارەت بەمە شتانێکی سەسوڕمێنیان لە خۆیان و لە کەسانی دیکەشدا بینیوە ·

وقد ثبت في الصحيح : عن النبي ﷺ ، أنه كان يُواصلُ في الصِّيام الأيام ذواتِ العددِ ، وينهَى أصحابه عن الوصل ويقول : (( لستُ كَهَيْئَتِكُمْ إني أظَلُّ يُطعِمُني ربِّي ويَسْقِيني ))[١٣٨].

واتە لە ( الصحيح )دا هاتووە : کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژەسپیەکانی مانگدا ( وصال )ی[١٣٩] دەکرد، بەڵام قەدەغەی هاوەڵانیشی دەکرد لەو کارەو دەیفەرموو : (( من وەکو نیم چونکە دەمێنمەوە پەروەردگارم خواردن و خواردنەوەم دەداتێ )) ·

زانراویشە ئەم خۆراك و خواردنەوەیە هەمان خواردن نەبوو کە مرۆڤ بە زاری دەیخوات ، چونکە ئەگەر وابوایە یەکبینە شەو ڕۆژ بە ڕۆژوو نەدەبوو ، هەروەها جیاوازیەکەش لە نێوان خۆی و هاوەڵاندا ڕوی نەدەدا ، بەڵکو هەر بە ڕۆژووش نەدبوو ، چونکە دەفەرمێت : (( أظَلُّ يُطْعِمُني ربِّي ويَسْقِيني )) ·

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ جیاوازی لە نێوان خۆی و هاوەڵانیدا کرد لە خودی ( وصال )ەکەدا ، بەوەی خۆی توانای بەجێهێنانی هەندێ کاری پێدراوە کە هاوەڵان توانای

١٣٨ ــ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ٤ / ١٧٩ ) ، ومسلم ( ١١٠٣ ) ·

١٣٩ ــ وصال : واتە ڕۆژوو شەو بە یەکبینەو بە بەردەوامی ڕۆژووگرتن و نەشکاندنی · وەرگێڕ

ئەنجامـدانى ئـەوەيان نـى يـە ، چـونكە ئەگـەر بـەزارى خـۆراك و خواردنـەوەى بخواردايـە نەيدەفەرموو : (( لَسْتُ كَهَيْئَتِكُم )) واتە من وەكو ئێوە نيم ٠ لە ڕاستيدا كەسانيك بە جۆرێكى تر لە فەرموودەكە تێدەگەن بە تايبەت ئەوانەى بەشيان لە خۆراكى دڵ و ڕوح كـەم بۆتـەوەو ، چيتر مێشكيان توانـاى وەرگرتنـى ئـەوەى نـەماوە كـە ئـەو خۆراكـە ڕوحيانـە كاريگەريـەكى ئەوتۆى هـەبێت لـە بـەهێزكردن دڵ و بوژانەوەيـداو ، خـۆراكێكى ديكـەى بـداتێ كاريگەريـەكى بەهێزترى هەبێ لە خۆراكە جەستەيەكە ٠ والله الموفق ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازى پێغەمبەرى خوا ﷺ لە چارەسەركردنى نەخۆشى ( العُذرة ) و چارەسەركردن بە دەرمان كردنە لووت :

ثُبتَ عَنْهُ فِي " الصّحِيحَيْنِ أنّهُ قَالَ : (( خَيْرُ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الْحِجَامَةُ ، وَالْقُسْطُ الْبَحْرِيّ ، وَلَا تُعَذّبُوا صِبْيَانَكُمْ بِالْغَمْزِ مِنْ الْعُذْرَةِ ))[١٤٠]

واتە لـە ( الصـحيحين )دا هـاتووە : كـەوا پێغەمبـەرى خـوا ﷺ فەرموويـەتى : (( چـاكترين شتێك بەكارى بێـنن بـۆ چارەسـەركردنى خۆتـان كەڵەشـاخ گـرتن و ، ( القُسْـطُ البَحْـري )يـە ، منداڵەكانيشتان ئازار مەدەن بە دەست لێدانى زمانە چكۆلەى منداڵەكەنتان ئەگـەر نەخۆشـى ( العُذرة ) تووش بوبون )) ٠

" وَفِي " السّنَنِ " و " الْمُسْنَدِ " عَنْهُ مِنْ حَدِيثِ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّهِ قَالَ : دَخَلَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ عَلَى عَائِشَةَ ، وَعِنْدَهَا صَبِيّ يُسِيلُ مَنْخَرَاهُ دَمًا ، فَقَالَ مَا هَذَا ؟ فَقَالُوا : بِهِ الْعُذْرَةُ ، أَوْ وَجَعٌ فِي رَأْسِهِ ، فَقَالَ : (( وَيْلَكُنّ لَا تَقْتُلْنَ أَوْلَادَكُنّ ، أَيّمَا امْرَأَةٍ أَصَابَ وَلَدَهَا عُذْرَةٌ أَوْ وَجَعٌ

---

١٤٠ ــ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ١٠ / ١٢٧ ) ، ومسلم ( ١٥٧٧ ) ٠

فِي رَأْسِهِ ، فَلْتَأْخُذْ قُسْطًا هِنْدِيًا فَلْتَحُكَّهُ بِمَاءٍ ، ثُمّ تُسْعِطْهُ إِيّاهُ فَأَمَرَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا فَصُنِعَ ذَلِكَ بِالصّبِيّ فَبَرَأَ ))[١٤١] .

واته ( جابر )ى كورِى ( عبدالله ) _ خواى لىّ رِازى بيّت _ فەرموويەتى : پيّغەمبەرى خوا ﷺ چووە ديدەنى خاتوو ( عائشة ) _ خواى لىّ رِازى بيّت _ ، تەماشاى كرد منداڵيّكى لايە خويّن لە هەردوو لووتى دەرِوات ، فەرمووى ئەمە چى يە ؟ گوتيان : نەخۆشى ( العُذرة )ى تووشبووە ، يا سەرئيّشەى هەيە ، ئەوەبوو فەرمووى : (( وەى بۆ ئيّوە منداڵەكانتان مەكوژن ، هەر ژنيّك منداڵەكەى تووشى نەخۆشى ( العُذرة ) بوو ، با ( القُسْط الهندى ) بەريّت و لە نيّو ئاودا بيكرِيّنيّت و ، بيكاتە لووتى منداڵەكەيەوە ، ئەوەبوو خاتوو ( عائشة ) _ خواى لىّ رِازى بيّت _ فەرمانيدا ئەوەيان بۆ منداڵەكە ئەنجامداو ئيتر چاك بوويەوە.

( أبوعُبيد ) لە ( أبوعُبيدُة )ەوە باس دەكات و دەڵيّت : نەخۆشى ( العُذرة ) ورووژان و ئاوسانى گەروە بە هۆى خويّنەوە ، ئەگەر چارەسەر كرا لە زمانى عەرەبيدا پيّى دەگوتريت ( قد عُذِرَ به ) ، فهو معذورٌ ، قسەكانى تەواوبو .

گوتراوە : ( العُذرة ) : برينيّكە لە نيّوان گوىّ و گەرودا دەردەچيّت ، بەزۆريش منداڵان تووشى دەبن .

بەڵام ( القُسْط الهندى ) كرِيّنراو ئەگەر وەكو دەرمانيّك بكريّت بە لووتيەوە بەسوودە ، چونكە مادەى نەخۆشى ( العُذرة ) خويّنيّكە بەڵغەمى بەسەردا زاڵەو ، بەزۆرى لە جەستەى منداڵدا دروست دەبيّت ، ( القُسْط الهندي )يش سيفەتيّكى ووشكيّتى تيّدايە زمانە بجولە بتەو دەكات و بەرزى دەكاتەوە بۆ جيّگەكەى خۆى ، پيّدەچى بە تايبەت سوودى بۆ ئەم نەخۆشيە هەبيّت و ، لەوانەشە سوودى بۆ نەخۆشيە گەرمەكانيش هەبىّ ،

---

١٤١ _ إسناده صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ٣١٥ ) وصححه الألباني رحمه الله .

هەروەها لەوانەیە جاربەجار ئەو دەرمانانەی کە هەر خۆی گەرمەو ، هەندێ جاریش بەکاتی گەرمە بەکاربێت . دانەری کتێبی ( القانون ) لە بارەی چارەسەرکردنی نەخۆشی کەوتن و هەوکردنی زمانە بچولەوە دەڵێت : ( القُسط ) لە گەڵ ( الشَّيب اليماني )و لە گەڵ تۆوی ڕەیحانەدا ( بذور المرو ) بەکاردێت.

ئەو ( القُسْط البحري )یەی لە فەرموودەکەدا باسکراوە : بریتیە لە ( العود الهندي ) ، کە جۆرە سپێکەیەتی ، شیرینەو ، چەندین سوودی هەیە . پێشتر منداڵەکانیان کە تووشی کەوتن و هەوکردنی زمانە بچولە ( العُذرة ) بهاتبا بە دەستیان کەمێك تێیانەوە دەژەنی و دەیانجولاند ، یا شتێکیان بە منداڵەوە هەڵدەواسی ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردن و ، ڕێنمای کردن بۆ شتێکی زۆر لەوە بەسوودتر بۆ منداڵەکانیان و ، زۆر ئاسانتریش .

بەڵام ( السَّعوطُ ) : ئەو دەرمانەیە لە لووت دەکرێت ، لەوانەیە ئەو کارە بە دەمانە تاکەکان یا بە ئاوێتەکانیش ئەنجام بدرێت ، دەرمانە سروشتیەکە دەکوترێت و لە هێڵەك دەدرێت و دەکرێت بە هەویرو ووشك دەکرێتەوە ، پاشان لەکاتی پێویستیدا شل دەکرێتەوەو ، دەکرێتە لووتی مرۆڤەوە ، کاتێ لە سەر پشتی ڕاکشاوەو ، نێوان هەردوو شانی بە پشتیەك بەرزدەکرێتەوە بۆ ئەوەی سەری تەواو نزم بێتەوە ، بۆیە کە دەرمانەکە کرایە لووتی دەکاتە مێشکی و ، بە پژمین نەخۆشیەکەی لێدەردەهێنرێت ، پێغەمبەری خوا ﷺ ستایشی خۆ چارەسەرکردنی بە ( السَّعوط ) کردووەو ئەوەی پیویستە لەم بارەوە ئەنجام بدرێت .

وذكر أبوداود في سننه : أن النبيَّ ﷺ استَعطَ[١٤٢].

واتە پێشەوا ( أبوداود ) لە ( سنن )ەکەیدا دەگێڕتەوە : کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ دەرمانی دەکردە لووتی .

١٤٢ ـ صحيح : أخرجه أبوداود ( ٣٨٦٧ ) عن ابن عباس .

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەرکردنی دڵ ئێشەدا ( المفؤود ):

رَوَى أَبُو دَاوُدَ فِي " سُنَنِه " مِنْ حَدِيثِ مُجَاهِدٍ ، عَنْ سَعْدٍ ، قَالَ ، مَرِضْتُ مَرَضًا، فَأَتَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُودُنِي ، فَوَضَعَ يَدَهُ بَيْنَ ثَدْيَيَّ حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَهَا عَلَى فُؤَادِي، وَقَالَ لِي : (( إِنَّكَ رَجُلٌ مَفْئُودٌ فَأْتِ الْحَارِثَ بْنَ كَلَدَةَ مِنْ ثَقِيفٍ ، فَإِنَّهُ رَجُلٌ يَتَطَبَّبُ ، فَلْيَأْخُذْ سَبْعَ تَمَرَاتٍ مِنْ عَجْوَةِ الْمَدِينَةِ ، فَلْيَجَأْهُنَّ بِنَوَاهُنَّ ، ثُمَّ لِيَلُدَّكَ بِهِنَّ ))[١٤٣].

واتە ( سعد ) _ خوای لیٚ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : نەخۆش کەوتم و ، پێغەمبەری خواش ﷺ تەشریفی هێنایە دیدەنیم ، دەستەکانی لە نێوان هەردوو مەمکمدا دانا تا هەستم بە ساردی دەستەکانی کرد لە سەر دڵم ، پێی فەرموودم : (( تۆ پیاویکیت هەست بە ئازاری دڵت دەکەی بۆیە بچۆرە لای ( الحارثَ )ی کوڕی ( كَلدَة ) لە هۆزی ( ثَقيف ) ، پزیشکێتی دەکات ، با حەوت خورما لە( عَجْوَة )ی مەدینە بەرێت و بە ناوکەکەیەوە بیکوتێت و ، پاشان بیکا بە دەمتەوە )) ٠

( المفؤود ): ئەو کەسەیە دڵی تووش بووەو ، هاوار لە ئازارەکەی دەکا ، وەکو( المبطون ) کە هاوار لە ئازاری سکی دەکات ٠

( واللَّدود ) : ئەو دەرمانەیە کە نەخۆش لە لایەکی زاریەوە دەیخواتەوە ٠

خورما خاسیەتێکی سەرسوڕمێنی تێدایە ، بەتایبەت خورمای مەدینەی پیرۆز ، بەتایبەتریش جۆری ( العَجوة )ەکەی ، بە حەوت دانەش بخورێت خاسیەتێکی ترە ، بە

١٤٣ _ إسناده ضعيف : أخرجه أبوداود ( ٣٨٧٥ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٢٠٣٣ ) ٠

سروشى خوايى دەرك دەكرێت ، وَفِي " الصَّحِيحَيْنِ " : مِنْ حَدِيثِ عَامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ (( مَنْ تَصَبَّحَ بِسَبْعِ تَمَرَاتٍ مِنْ تَمْرِ الْعَالِيَةِ لَمْ يَضُرَّهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ سَمٌّ وَلَا سِحْرٌ ))[١٤٤] .

وَفِي لَفْظٍ (( مَنْ أَكَلَ سَبْعَ تَمَرَاتٍ مِمَّا بَيْنَ لَابَتَيْهَا حِينَ يُصْبِحُ لَمْ يَضُرَّهُ سَمٌّ حَتَّى يُمْسِيَ ))[١٤٥].

واتە ( عامر )ى كوڕى ( سعد )ى كوڕى ( أبي وقاص ) لە بابيەوە دەگێڕێتەوەو دفەرمێت : پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : (( هەركەس ژەمى بەيانيانى حەوت خورما بێت لە خورماى ( العالية ) ـــ شوێنێكە لە مەدينەى پيرۆز ـــ ئەو ڕۆژە ژەهرو جادوو زيانى پێ ناكەيەنن )) .

لە بێژەيەكى تردا (( هەركەس بەيانيان حەوت خورماى نێوانى دوو ( اللابة )كە[١٤٦] بخوات ژەهر زيانى پێ ناگەيەنێت تا ئێوارەى بەسەردا دێت )) .

خورما گەرمە لە دووەمدا ، ووشكە لە يەكەمدا . گوتراوە : شێدارو تەڕە تيايدا . گوتراويشە : مام ناوەندە ، خواردنێكى بەڕێزەو پارێزگارێكى باشى تەندروستيە بە تايبەت بۆ ئەوانەى پێى ڕاهاتوون ، وەكو خەڵكى مەدينەو جگە لە خەڵكى مەدينەش ، چاكترين خواردەمەنيە بۆ ئەوان بە بەراوردى خەڵكى وەڵاتە ساردەكان ، لەبەر ساردى ناوەڕۆكى دانيشتوانى مەدينەو ، گەرمى ناوەڕۆكى خەڵكى وەلاتە ساردەكان ، بۆيە دانيشتوانى وەڵاتانى حيجازو يەمەن و تائيف و وەڵاتەكانى ترى هاوشێوەشيان بە زۆرى خواردەمەنيە گەرمەكان بەكاردەهێنن كە ناچێت بۆ خەڵكانى تر وەكو خورماو ، هەنگوێن ، بينيومانيشن

---

١٤٤ ـــ سبق تخريجه .

١٤٥ ـــ أخرجه البخاري ( ٩ / ٤٩٣ ) ، ومسلم ( ٢٠٤٧ ) .

١٤٦ ـــ اللابتين : دوو پارچە زەوين لە مەدينەى پيرۆز كە بەردى ڕەشى تێدايە . وەرگێڕ .

بيبەرو زەنجەفيل[١٤٧] لە خواردەمەنيەكانياندا بەكاردەهێنن بە ئاستێك كە دەئەوەندەو يا زياترى خەڵكى وەڵاتانى ديكەيە ، زەنجەفيليش دەخۆن وەكو ئەوەى حەلوا بخۆن ، خۆشم _ ( ابن القيم ) _ كەسانێكم بينيوە خۆى پێوە خەرێك دەكات و دانە دانە دەيخوات وەكو ئەوەى نوقڵ و ميوەو چەرەسات بخوات و كاتەكەى خۆى پێوە بەسەر دەبات ، ئەوەش بەسوودە بۆيان و زيانيان پێ ناگەيەنێت لەبەر ساردى ناوەڕۆكيان و ، هاتنە دەروەى گەرماكە بۆ دەروەى جەستەيان ، نموومەى ئەوەش وەكو نموونەى ئەو بيرانەيە كە ئاوەكەنيان لە هاويندا سارد دەبێت و ، لە زستانيشدا گەرم دەبێت ، بۆيە لە زستاندا گەدە لە خۆراكە چڕەكان پێدەگەيەنێت بە ئاستێك لە هاويندا ئەو كارە ناكات و پێى ناگەيەنێت ٠

بەڵام خورما بۆ خەڵكى مەدينە ، بە هاوشێوەى پلەى گەنمە كە كەسانى ديكە بەكارى دێنن ، چونكە مادەى خۆراكيانە ، خورماى ( العالية )ش چاكترين جۆرى خورمايانە ، چونكە تەنێكى بتەوو ، تاميكى خۆش و ، شيرينيەكى ڕاستى هەيە ، خورما بەشدار دەبێت لە پێكاتەى خواردن و دەرمان و ميوەشدا ، گونجاوە بۆ زۆربەى جەستەكان ، بەهێزكارى گەرمى سروشتيە ، ئەو پاشماوە خراپانەى كە خۆراك و ميوەكانى تر لە جەستەى مرۆڤدا دروستى دەكەن خورما دروست ناكات ، بەڵكو قەدەغەى بۆگەنبوونى تێكەڵاوەكان دەكات بۆ ئەو كەسانەى پێى ڕاهاتوون ٠

ئەم فەرموودە پەيامێكەو مەبەستدارە بۆ كارپێكردنى تايبەت ، وەكو دانيشتوانى مەدينەو دەوروبەريان ، گومانى تێدا نى يە كە هەر شوێنێك پسپۆڕە بە سوود وەرگرتن لە زۆرێك لە دەرمانەكان بەبێ هيتر ، بۆيە هەندێ ڕووەكى دەرمانى كەلەو شوێنەدا دەڕوێن بە سوود دەبن

---

١٤٧ _ زنجبيل : ڕووەكێكى گيايە بە ڕايزۆم دەڕوێت و زۆر دەبێ هەروەكو پەتاتە ، نزيكەى ( ٧٠ سم ) لە زمينەوە بەرز دەبێتەوە ، گەڵاڵەكانى پانن و ، بەسەر زەويدا خۆى ڕادەخات ، لق و پۆپى وردن ، گوڵەكانى كەمێك مەيلەو زەردن و ، چەندين جۆرى هەيەو ، ڕەگەكانى بەكاردێت ٠ بروانە : ئينتەرنێت : سايتى : ( سنابل الخير للأعشاب ) ٠

بۆ نەخۆشی ، کەچی ئەگەر ئەو ڕووەکە دەرمانیە لە جێگەیەکی دیکەدا بڕوێ ئەو سوودەی نابێت چونکە خاك و هەوا کاریگەریان لەوەدا دەبێ ، یا رووەك و خاك و هەوا پێکەوە کارتێکراو دەبن بەو ژینگەیە ، چونکە زەوی سیفات و خاسیەتیەکی هەیە جیاواز دەبێت لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر وەکو چۆن خوو و سیفاتی مرۆڤ لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاواز دەبێت ، زۆریك لە ڕووەکەکان بۆ هەندێ وەڵات خۆراکێکەو دەخورێت ، بەڵام بۆ هەندێ وەڵاتی دیکە ژەهرێکی کوشندەیە ، زۆر جار دەرمانی کۆمەڵێك بەلای کۆمەڵێکی ترەوە خۆراکە ، هەندێ دەرمان کە بۆ کۆمەڵێك چارەسەری نەخۆشیگەلێکە بۆ کۆمەڵێکی تر چارەسەری نەخۆشیگەلێکی دیکە دەبێت، دەرمانی خەڵکی وەڵاتێك بۆ وەڵاتێکی دیکە گونجاو نابێت و ، سوودیشی نەبێت ٠

بەڵام کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : با حەوت خورما بخوات ، ئەوە خاسیەتێکە وەکو قەدەرو وەکو شەرعیش چەسپاوە ، بۆیە تەماشا دەکەین خوای تعالى ئاسمانەکانی بە حەوت دروست کردووە ، زەویەکان حەوتن ، ڕۆژەکان حەوتن ، خولقاندنی مرۆڤ بە حەوت دۆخ تەواو بوو ، خوای تعالى بۆ بەندەکانی خۆی تەواف و سوڕانەوەی بە دەوری کەعبەدا بە حەوت داناوە ، سەعی کردنی نێوان صەفاو مروەی بە حەوت داناوە ، ڕەجمکردنی شەیتانەکانی بە حەوت حەوت داناوە ، ( الله أكبر )ەکانی نوێژەکانی جەژنی لە ڕەکاتی یەکەمدا بە حەوت داناوە ٠ پێغەمبەری خوا ﷺ فەموویەتی : (( مُرُوهم بالصَّلاةِ لسَبعٍ ))(١٤٨) واتە : (( کە منداڵەکانتان بوون بە حەوت ساڵ فەرمانی نوێژکردنیان پێ بکەن )) ، ئەگەر دایك وباب جیابوونەوەو منداڵەکەیان تەمەنی بوو حەوت ساڵ مافی هەڵبژاردنی پێ دەدرێ لە نێوان دایك و بابیدا ، هەر کامیانی هەڵبژارد لە گەڵ ئەودا دەچێت ٠ لە ( ریوایە )تێکی تردا : بابی لە دایکی مافدارترە بە منداڵەکە ، لە ( ریوایە )تێکی تریشدا : دایکی مافدارترە ، وأمر

---

١٤٨ ـ إسناده صحيح : أخرجه أبوداود ( ٤٩٤ ) ، والترمذي ( ٤٠٧ ) ، وصححه الألباني في صحيح أبي داود ( ٤٦٥ ) ٠

النبي ﷺ في مرضه أن يُصَبَ عليه من سبعِ قِرَبٍ[١٤٩] واته پێغەمبەری خوا ﷺ لە كاتی نەخۆشیەكەیدا فەرمانیدا لە حەوت كونە ئاوی بەسەردا بكرێت ، خوای تعالی حەوت ڕۆژ باكەی باڵا دەست كرد بە سەر قەومەكەی ( عاد )دا ، ودعا النبيُّ ﷺ أن يُعينَه اللهُ على قومه بسبعٍ كسبعِ يوسف[١٥٠] واتە پێغەمبەری خوا ﷺ لە خوای تعالی پاڕایەوە یارمەتی بدات بۆ سەر قەومەكەی بە حەوت ساڵی نەهاتی وەكو ساڵەكانی یوسف پێغەمبەر ، خوای تعالی سەبارەت بەو كەسانەی خێریان بۆ زیاد دەكات نموونەیەكی هیناوەتەوە بە تۆویەك بوبە حەوت گوڵە گەنم هەر گوڵێك صەد تۆوی تێدابوو ، ئەو گولە گەنمانەش كە هاوەڵەكەی یوسف لە خەویدا بینیبووی حەوت بوون ، ئەو ساڵانەش كشتوكاڵیان تێدا كرد حەوت بوون ، خێروچاكەداریش زیاد دەكرێت بە ئەندازەی حەوصەد ئەوەندە و زیاتریش ، لەم ئومەتەش حەفتا هەزار دەچنە بەهشتەوە بەبێ حیساب ٠

بێ گومان ئەم ژمارە خاسیەت و تایبەتمەندیەكی تێدایە لە جگە ئەم ژمارەیدا بەدیناكرێت ، حەوتیش مانای ژمارەی كۆكردۆتەوە گشتیەكەی و تایبەتیەكەی ، چونكە ژمارە جووت و تاكە ٠ جووتیش : یەكەم و دووەمە ٠ تاكیش : هەر ئاوەهایە ، ئەمە بوبە چوار پلە : جووتی یەكەم و ، دووەم ٠ تاكی یەكەم و ، دووەم ، ئەم پلانەش لە كەمتر لە ژمارە حەوتدا كۆنابێتەوە ، چونكە حەوت ژمارەیەكی تەواوە ئەم چوار پلەیە لە خۆدەگرێت ، مەبەستم جووت و تاكەكەو ، یەكەمەكان و دووەمەكانە ، مەبەستیشم بە تاكی یەكەم ، سێ یە ، بە دووەمیش پێنجە ، وە مەبەستیشم بە جووتی یەكەم دووە ، بە دووەمیش چوارە ، پزیشكان

---

١٤٩ ـ صحيح : أخرجه البخاري ( ١ / ٦١ ، ١٦٩ ) ، ( ٣ / ٢٠٧ ) ، ( ٤ / ٩٩ ) ، ( ٦ / ١٣ ) ، ومسلم ( ٢ / ٢١ ، ٢٢ ) عن عبيدالله بن عبدالله بن عتبة بن مسعود أن عائشة زوج النبي ـ صلى الله عليه وسلم ـ قالت : لما ثقل رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ وذكرت الحديث وفيه : (( ··· هريقوا على من سبع قرب ··· ))

١٥٠ ـ صحيح : أخرجه البخاري ( ٢ / ٣٣ ، ٣٧ ) ، (٦ / ٩٦ ، ١٤٢ ، ١٥٦ ، ١٦٤ ، ١٦٥ ) ، ومسلم ( ٨ / ١٣١ ) عن مسرون عن ابن مسعود وفيه : (( إن رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم لما رأى من الناس إدباراً فقال : اللهم سَبْعٌ كسبع يوسف ··· )) ٠

گرنگیەكی گەوریان بە حەوت داوە ، بەتایبەت دەریاوانەكان . ( بقراط ) دەڵێت : هەموو شتێك لەم جیهانەدا لە سەر حەوت بەش ئەندازە گیراوە ، ئەستێرەكان حەوتن ، ڕۆژەكان حەوتن ، تەمەنەكانی خەڵك حەوتن ، یەكەم جار منداڵە تا حەوت ، پاشان نەوجوانە تا چواردە ، پاشان هەرزەكارە ، پاشان لاوە ، پاشان پیاویكی كامڵە ، پاشان پیرە ، پاشان كەنەفتەو زۆرپیرە تا كۆتایی تەمەن ،خوای پەروەردگاریش زاناترە بە حیكمەت و بەشەرع دانانی و ، قەدەری لە دیاریكردنی ئەم ژمارەیەدا ، ئایا لەبەر ئەو مانایەن یا هیدیكەیە ؟

سوودی ئەم ژمارەیە لەم خورمایە لەم شارەو لەم شوێنەدا بەتایبەت بەرامبەر بە ژەهرو جادوو ، بەجۆرێك مرۆڤ قەدەغە بكات لە تووشبوون ، لەو تایبەتمەندیانەیە كە ئەگەر پزیشكانێكی وەكو ( بقراط ) و ( جالینوس )و پزیشكانی دیكە باسیان بكردایە ، پزیشكانی تر بە قبوڵبوون و ملكەچبوونەوە وەریان دەگرت ، ئەگەرچی ئەو پزیشكانە كارە پزیشكیەكانیان تەنها بەهۆی زۆر وریایی و تەخمین كردن بەهۆش و گومان بردنەوە پەی پێ دەبن ، بۆیە ئەو كەسەی كە گوفتارەكانی هەرهەمووی بێ دڵاودڵی و ، بە ئێكجاری و سەلماندن و وەحیە ، زۆر شایستەترو گونجاوترە گوفتارەكانی بە قبوڵبوون و ملكەچیەوە وەرگیرێت و ، واز لە ڕەخنەگرتن بهێنرێت ، دەرمانەكانی ژەهر جاریەجار بە چۆنیەتی دەبێت و ، جاربەجاریش بە خاسیەت وەكو خاسیەتی زۆرێك لە بەردەكان و گەوهەرەكان و یاقوتەكان . والله أعلم .

## بەشێك سەبارەت بە سوودی ئەم بەرەو كاریگەری لە سەر هەندێ لە ژەهرەكان

شیاوە ئەم بەرە بۆ لابردنی هەندێ لە ژەهرەكان سوودی هەبێ ، ئینجا فەرموودەكە دەبێتە گشتیەكی تایبەتكراو ، شیاویشە بۆ لادانی هەموو ژەهرێك سوودی هەبێ ، لە بەر تایبەتمەندی ئەو شارەو ئەو خاكە تایبەتە ، بەڵام لێرەدا شتێكی تر هەیە پێویستە ئاماژەی پێ بدرێت ، ئەوەش ئەوەیە كە ئەو نەخۆشەی دەیەوێ سوود لە دەرمانێك وەرگرێ ، مەرجە

بەدڵ دەرمانەکەی قبوڵ بێ و بڕوای بە سوودو کاریگەری هەبێ ، ئەوجا سروشتی جەستەشی قبوڵی دەکات و ، دەیکات بە یارمەتیدەرێك بۆ لادانی نەخۆشی و عیلەتەکە ، تا ئەو ئاستەی زۆرێك لە چارەسەرەکان سوود بە نەخۆش دەگەیەنن ، ئەگەر بە بڕوایەکی تەواو و ، قبوڵبونێکی چاك و ، بە وەرگرتنێکی تەواوەوە بەکاری بێنێت ، خەڵکانیش شتانێکی سەرسوڕمێنیان لەو بارەوە بینیوە ، ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە سروشتی نەخۆشەکە بەتوندی قبوڵی دەرمانەکە دەکات و ، زۆر پێی دڵخۆش دەبێ ، بۆیە هێزی جەستەشی دەبوژێتەوەو ، سوڵتانی سروشتی جەستەشی بەهێز دەبێ و ، لە کۆتایدا بە سەر نەخۆشیەکەدا زاڵ دەبێ و ، دوری دەخاتەوە ، بە پێچەوانەشەوە زۆرێك لە دەرمانەکان بۆ ئەو نەخۆشی و عیلەتە بەسوودن ، بەڵام باوەڕی خراپی کەسە نەخۆشەکە ، کەوا سروشتی دەرمانەکەی بە تەواوی قبوڵ نابێ ، وا دەکات کە ئەو دەرمانە هیچ سوودێك نەگەیەنێت ٠

لە گەڵ ئەوەشدا گەورەترین دەرمان و شیفابەخشەکان و ، لە هەموویان بە سوودتر بۆ دڵەکان و جەستەکان و دونیاو رۆژی دوایی قورئانە ، کە بۆ هەموو نەخۆشیەك شیفابەخشە ، بەڵام بۆ ئەو دڵانەی بڕوایان بە شیفابەخشین و سوودی قورئان نی یە ، تەنها نەخۆشیەکانیان زیاد دەکات ، کەچی بۆ نەخۆشی دڵان هیچ دەرمانێکی تری بە سوود نی یە جگە لە قورئان ، چونکە شیفابەخشی تەواوێتیی کە هەموو نەخۆشیەکان چاك دەکاتەوەو ، تەندروستی بە تەواوی دەپارێزێ و ، بەرامبەر بە هەر شتێکی زیانبەخشێکی بەوەیی دەیپارێزێ بە پاراستنێکی تەواو ، بەڵام لە بەر ئەوەی زۆربەی دڵان ڕوویان لێ وەرگێڕاوەو ، بەڕوایەکی تەواویان پێ نی یە کە بەدڵنیایی و بەبێ گومان شیفابەخش بێت و ، بەکاری ناهێنن و ، لە جیاتی قورئان دەرمانی دیکە بەکاردەهێنن ، کە مرۆڤێکی تر وەکو خۆی پێکیهێناوەو دروستی کردووە ، بۆیە هەموو ئەمانە بوون بە ڕێگرێك بۆ ئەوەی شیفایان پێبەخشێت ، ئالێرەدا دیسانەوە ئاکامی ئەم کردەوانەیان زاڵ بوو و ڕوو وەرگێڕانیان لە قورئان توندتر بوو ، نەخۆشی و عیلەتە درێژخایەنەکانیش زیاتر دڵانیان نەخۆش خست و ، پزیشکان و نەخۆشانیش لە سەر چارەسەرەکانی مرۆڤی هاوڕەگەزی خۆیان و ، ئەوەی کە شێخەکانیان و

، ئەو کەسانەی کە بە گەورەیان دادەنێن و نێتیان بەرامبەریان چاکە ڕاهاتن ، بۆیە کارەساتەکە گەورەتر بوو ، نەخۆشیەکانیش زیاتر جێگیربوون و ، چەندین نەخۆشی و عیلەتیش پەیدابوون ، کە نەیانتوانی چارەسەری بکەن ، وە چەند بەم دەرمانە دروستکراوانە چارەسەریان بکردایە نەخۆشیەکە زیاتر دەبوو ، باروحاڵیش دەیگووت :

ومن العجائبِ والعجائبُ جَمـــة
قُربُ الشّفاءِ وما إليهِ وُصُولُ
كالعيش في البيداءِ يقتُلُها الظّماُ
والماءُ فوقَ ظُهُورها محمُولُ

**واتە :**

لە شـــــتە سەرسوڕمێنەکان کە شـتی سـەـــرسوڕمێنیش زۆرە
شـــــیفا نزیك بێ و نەتوانرێ پێی بـــــگەیت
وەکو ئەوەی لە بیاباندا بێ و ئەوەندەی نەمابێ تینویەتی بیکوژێ
کەچی ئاوەکەش لە سەر پشتی ئەو هەڵگیرۆاوە

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوورخستنەوەی زیانی خۆراك و میوەکان و ، چاکردنیان بە جۆرێك زیانیان لابەرێت و ، سوودیان بەهێز بکات :

ثبت في الصحيحين من حديث عبدالله بن جعفر ، قال : رأيتُ رسولَ الله ﷺ يأكل الرُّطَبَ بالقِثّاء[١٥١] .

واتە لە ( عبدالله )ی کوڕی ( جعفر )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ ترۆزی بە خورمای تەڕی پێکەیووە دەخوات .

١٥١ _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٧ / ١٠٢ ، ١٠٤ ) ومسلم ( ٦ / ١٢٢ ) .

خورماى تەڕى پێگەیوو ( الرُّطب ) : گەرم و شێدارە لە دووەمدا ، گەدەی سارد بەهێز دەكات و ، بۆی گونجاوە ، جووتبوون زیاد دەكات ، بەڵام خێرا بۆگەن دەبێت ، تینوهێنەرەو ، خوێن لیخن و لیڵ دەكات ، سەرئێشە دروست دەكات ، كونیلەی داخراو دروست دەكات ، ئازاری میزڵدان دروست دەكات ، بۆ ددان زیانی هەیە ، ، بەڵام ترۆزی ساردو شێدارە لە دووەمدا ، تینویەتی ناهێڵێت ، بە بۆنكردنی هێز دەبوژێنێتەوە لە بەر ئەو بۆنەخۆشەی تێیدایە ، گەرمیی گرگرتووی نێو گەدە دەكوژێنێتەوە ، ئەگەر تۆوەكەی ووشك بكرێتەوەو بكوترێت و تێكەڵ بە ئاو بكرێت و بگوشرێت بۆ دەرهێنانی ئاوەكەی و ، پاشان بخورێتەوە ، تینویەتی ناهێڵێت ، میز زیاد دەكات ، بۆ ئازاری میزڵدان باشە ، ئەگەر بكوترێت و بە هێڵەك پاك بكرێت و بە ددانەدا بهێنرێت ، سپی دەكاتەوە ، ئەگەر بكوترێت و لە گەڵ ( المَيْبَخْتَج )دا[١٥٢] برین پێچێكی لێ دروست بكرێت بۆ گەستنی سەگی هار بەسوودە ٠

بەگشتی : خورما گەرمەو ، ترۆزیش ساردە ، بۆیە هەر دانەیەكیان بەسوودە بۆ ئەویتر ، زۆرترین زیانی بەرامبەری لادەدات ، بەرگریكردنی چۆنیەتی هەر دانەیەكیانە بە دژەكەی ، لابردنی توندوتیژی هەر دانەیەكیانە بە ئەویتر ، ئەمەش خۆی بۆ خۆی بنەڕەتی هەموو چارەسەریەكانەو ، بنەڕەتیشە بۆ پاراستنی تەندروستی ، بۆیە بەكارهێنانێكی بەو جۆرەو هاوشێوەكانیان لە خۆراك و دەرماندا ڕۆڵێكی كاریگەری دەبێ لە چاكردن و ڕاستكردنەوەو ، دوورخستنەوەی چۆنیەتیە زیانبەخشەكانی هەر دانەیەك بە بەرامبەرەكەی ، ئەوەش یارمەتیدەرێكی باشی پاراستنی تەندروستی و ، هێزو بە پیت بوونیەتی ، خاتوو ( عائشة ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : هەوڵیاندا بەهەموو شتێك قەڵەوم بكەن ، قەڵەو نەبووم ، ئینجا بە ترۆزی و خورمای تەڕو پێگەیوو قەڵەویان كردم ، ئەوەبوو قەڵەو بووم ٠

---

١٥٢ _ المَيْبَخْتَج : عەجەمەكان ئەم ناوە بەكاردێنن ، كە بریتیە لە شەربەتی ترێ دەكوڵێنرێت تا دوو لە سەر سێی ئاوەكەی دەچێت و دەبێت بە روبی ترێ و بە لای عەرەبیشەوە بە ( طِلا ) ناودەبرێت ، بڕوانە الجوهري ، الصحاح في اللغة ، مادة طلا ، ص ٤٢٩ ، وەرگێڕ ٠

بەگشتی : دوورخستنەوەی زیانی سارد بە گەرم و ، گەرم بە ساردو ، شێدار بـە ووشـك و ، ووشـك بـە شـێدار و ، ڕاسـتکردنەوەی هـەر دانەیـەکیان بـە ئـەویتر لووتکـەی هـەموو جۆرە چارەسەریەکانەو ، لووتکەشە لە پاراستنی تەندروستیدا ، هاوتـای ئـەم جۆرە چارەسـەریەش جۆرە چارەسەریەکەی دیکە بوو کە پێشتر ئامازەی پێدراو بریتی بوو لە فـەرمانی پێغەمبـەری خوا ﷺ بە خۆچارەسەرکردن بە ( السَّناو السَّنوت ) و ( السَّنوت )یش : هەنگوێنێکە کەمێك لـە خۆشـاوی ڕۆنـی تێدایـە ( السَّـنا )ی پـێ چـاك دەكرێـت و ڕاسـتی دەكاتـەوەو نێوەنجێتیـەكی دەداتـێ ، كـەوابوو صـەلات و سـەلام لـە ئـەو كەسـەی نێـردراوە بـۆ ئاوەدانكردنـەوەی دڵ و جەستەكان و ، بەرژەوەندیەكانی دونیاو ڕۆژی دوایی ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پارێزکردندا :

دەرمـان هەرهـەمووی دوو شـتە : پـارێزکردن و پاراسـتنی تەندروسـتیە ، بـەڵام ئەگـەر تێکەڵاوێکی زیانبـەخش لـە جەسـتەدا دروسـت بـوو ، پێویسـتی بـە دەرهاوێشـتنێکی گونجـاو دەبێت ، تەوەری پزیشکێتیش بەگشتی لە سەر ئەم سێ یاسایە دەخولێتەوە ٠

پـارێزکردنیش دوو پارێزکردنـە : پارێزکردنیـك بەرامبـەر بـەو شـتانەی نەخۆشـیی دروسـت دەكەن ، پارێزکردنێکیش بەرامبەر بەوەی كە نەخۆشیەكە زیاد دەكات ، ئەمەش دەگەڕێتـەوە بۆ باری كەسەكە خۆی ، كەوابوو یەكەمیان : پارێزکردنێکی تایبەتە بەوانەی كـە تەندروسـت و لەش ساغن ٠ دووەمیشیان : پارێزکردنێکە تایبەتە بەوانەی نەخۆشن ٠ نەخۆش ئەگەر پـارێزی كـرد نەخۆشـیەكەی دەوەسـتێت و زیـاد ناكـات ، هێـزیش كـارا دەبێـت بـۆ دوورخسـتنەوەی ٠

بنەرەتیش لە پارێزکردندا گوفتاری خوای پەروەردگارە كـە دەفـەرمێت :﴿ وَإِنْ كُنْتُمْ مَرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ أَوْ لامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا ﴾ [سورة المائدة: ٦] واتە : ﴿ وَإِنْ كُنْتُمْ مَرْضَى ﴾ وە ئەگەر نەخۆش بوون ﴿أَوْ عَلَى سَفَرٍ ﴾ یان لە سەفەردا بوون ﴿ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ ﴾ یـان كەسێكتان هاتـەوە لـە شـوێنی

پێویستی سەرئاو ﴿ أَوْ لامَسْتُمُ النِّسَاءَ ﴾ یان جووت لە ( یان پێستتان بەر یەك كەوت ) لە گەڵ خێزانەكانتاندا ﴿ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً ﴾ وەئاوتان دەست نەكەوت ﴿ فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا ﴾ ئەوە تەیموم بكەن بە خۆڵێكی پاك[١٥٣] لێرەدا خوای تعالی مرۆڤی پاراستووە لە بەكارهێنانی ئاو ، چونكە زیانی پێدەگەیەنێت ٠

وفي سنن ابن ماجة وغيره ، عن أُمِّ المنذِر بن قيس الأنصارية ، قالت : دَخَلَ عليٌّ رسول الله ﷺ ومعه عليّ ، وعليٌّ ناقِهٌ من المرض ، ولنا دوالي مُعَلَّقة ، فقام رسولُ الله ﷺ يأكل منها ، وقام عليٌّ يأكل منها ، فطَفِقَ رسولُ الله ﷺ يقول لعليّ : إنك ناقِهٌ حَتَّى كفَّ ٠ قالت : وصنعت شعيراً وسلقاً ، فجئت به ، فقال النبيُّ ﷺ لعليّ : منْ هذا أصِب ، فإنه أنفع لَكَ ٠ وفي لفظ فقال : مِنْ هذا فَأَصِبْ فإنه أوفَق لَك[١٥٤].

واتە لە ( أُمِّ المنذر )ی كچی ( قيس )ی ئەنصاریەوە_ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ با یاوەری ( علي ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ دیدەنیان كردم و ، ( علي )یش بەو نزیكانە لە نەخۆشی چاك بوبۆوە ، ئێمەش هێشوگەلێكی خورمای هەڵواسراومان هەبوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستاو دەستیكرد بە خواردنی و ، ( علي )یش هەستاو لێی دەخوارد ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە ( علي ) فەرموو : تۆ بەم نزیكانە لە نەخۆشی چاك بویتەتەوە ، تا وازی هێنا ٠ ( أم المنذر ) دەفەرمێت : پاشان هەستام سلق و جۆم بۆ لێنان و ، بۆم هێنان ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ بە ( علي ) فەرموو : لەمە بخۆ ، ئەمە بۆ تۆ بەسوودترە ٠ لە بێژەیەكی تریشدا فەرمووی : لەمە بخۆ ، ئەمە بۆ تۆ گونجاوترە ٠

---

١٥٣ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

١٥٤ _ إسناده صحيح : أخرجه الترمذي ( ٢٠٣٨ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٤٢ ) ، وصححه الألباني في الصحيحة ( ٥٩ ) ٠

وَفِي " سُنَنِ ابْنِ مَاجَهْ " أَيْضًا عَنْ صُهَيْبٍ ، قَالَ : قَدِمْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَبَيْنَ يَدَيْهِ خُبْزٌ وَتَمْرٌ ، فَقَالَ (( ادْنُ فَكُلْ )) ، فَأَخَذْتُ تَمْرًا فَأَكَلْت ، فَقَالَ (( أَتَأْكُلُ تَمْرًا وَبِكَ رَمَدٌ ؟ )) فَقُلْت : يَا رَسُولَ اللّهِ أَمْضَغُ مِنْ النّاحِيَةِ الْأُخْرَى ، فَتَبَسّمَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ [١٥٥] .

واته : له ( صهيب )ەوە _ خواى ليّ رِازى بيّت _ فەرموويەتى : چوومە خزمەتى پيّغەمبەرى خوا ﷺ و هاوكات نان و خورماى له پيّش دەستدا بوو ليّى دەخوارد ، پيّى فەرمووم : نزيك بەرەوە بخۆ ، منيش خورمايكم هەلْگرت و خواردم ، پيّى فەرمووم : خورما دەخۆى و چاويشت دەيەشىّ ؟ منيش گووتم : ئەى پيّغەمبەرى خوا من خواردنەكە بەلا چاك و رِاستەكەم دەجوم ، پيّغەمبەرى خواش ﷺ زەردە خەنە گرتى ٠

وَفِي حَدِيثٍ مَحْفُوظٍ عَنْهُ ﷺ إنّ اللّهَ إذَا أَحَبّ عَبْدًا حَمَاهُ مِنْ الدّنْيَا كَمَا يَحْمِي أَحَدُكُمْ مَرِيضَهُ عَنْ الطّعَامِ وَالشّرَابِ ٠

وَفِي لَفْظٍ إنّ اللّهَ يَحْمِي عَبْدَهُ الْمُؤْمِنَ مِنْ الدّنْيَا[١٥٦] .

واته : پيّغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى : ئەگەر خواى تعالى بەندەيەكى خۆشويست لە دونيا دەيپاريّزى وەكو چۆن كەسيّكتان نەخۆشەكەى لە خواردن و خواردنەوە دەپاريّزىّ ٠

لە بيّژەيەكى تريشدا : خواى تعالى بەندە برِوادارەكەى خۆى لە دونيا دەپاريّزيّت ٠

بەلاّم ئەو فەرموودەيەى لە سەر زمانى خەلّك دەسورِيّتەوەو باس دەكريّت : (( الحَميةُ رأسُ الدواءِ ، والمَعِدَةُ بيتُ الداءِ ، وعوِّدوا كلَّ جسم ما أعتاده )) واته : (( پاريزكردن

---

١٥٥ _ إسناده صحيح : أخرجه الترمذي ( ٢٠٣٨ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٤٢ ) ، وصححه الألباني في صحيح ابن ماجة ( ٢٧٧٦ ) ٠

١٥٦ _ إسناده صحيح : أخرجه أحمد ( ٥ / ٤٢٧ ) ، والترمذي ( ٢٠٣٦ ) ، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ( ١٦٥٩ ) ٠

سەرەکیترین دەرمانەو ، گەدەش شوێنی نەخۆشیە ، هەر جەستەیەکیش ڕابێنن لە سەر ئەوەی لە سەری ڕاهاتووە )) ، ئەم فەرموودە لە گوفتارەکانی ( الحارث )ی کوڕی ( كَلَدَة )ی پزیشکی عەرەبەو ، بەرزکردنەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ شیاو نی یە و بە ڕاست دانانرێت ، زیاد لە یەکێك لە فەرموودەناسان ئەمەیان گوتوە ، ويذكر عن النبي ﷺ : (( أنَّ المَعِدَةَ حوضُ البدن ، والعُروق إليها واردة ، فإذا صحَّت المَعِدَةُ صدرت العروقُ بالصحة ، وإذا سَقِمَت المَعِدَةُ ، صَدَرَت العروقُ بالسقم ))[157] واتە : ئەم فەرموودەیەش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ باسکراوە : (( گەدە حەوزی جەستەیەو ، ڕەگەکانی بۆ هاتووە ، بۆیە ئەگەر گەدە تەندروست بێ ، ڕەگەکانیش ئەو تەندروستیە بڵاو دەکەنەوەو ، ئەگەر گەدە نەخۆشیش کەوت ، ڕەگەکان بڵاوی دەکەنەوە بە هەموو جەستەدا )) ٠

( الحارث ) دەڵێت : لووتکەی پزیشکێتی پارێزکردنە ، پارێزکردنیش بەلایانەوە بۆ کەسی تەندروست _ لە ڕووی زیانەوە _ بە پلەی تێکچوونە بۆ نەخۆش و بۆ ئەوانەش بەم نزیکانە لە نەخۆشی چاك بوونەتەوە ، بەڵام پارێزکردن زۆرترین سوود بەو کەسانە دەبەخشێت کە بەم نزیکانە لە نەخۆشی چاك بونەتەوە ، چونکە سروشتیی نەخۆشەکە هێشتا نەگەڕاوەتەوە بۆ هێزو دۆخی جارانی خۆی ، هێزی هەرسکردنیی لاوازە ، سروشتی نەخۆش قبولکارە ، ئەندامەکانیشی ئامادەیە ، بۆیە تێکدانی هۆکارێك دەبێت بۆ شکستهێنانی ، کەلە دەستپێکردنی نەخۆشیەکە قورستر دەبێت ٠

بزانە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا بە قەدەغەکردنی ( علي ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ کە بەو نزیکانە لە نەخۆشی چاك بوبوۆوە بۆ ئەوەی لە هیشووە خورما هەڵواسراوەکە نەخوات ، چاکترین چارەسازی بوو ، چونکە میوە زیانبەخشە بەو کەسانەی بەم نزیکانە لە نەخۆشی چاك بوونەتەوە ، لە بەر ئەوەی بە خێرا لە گەدەدا دەگۆڕێن و ، سروشتی

١٥٧ _ إسناده ضعيف : ضعفه الألباني في الضعيفة ( ١٦٩٢ ) ٠

نەخۆشـیش هێشـتا لاوازەو توانـای پـاڵ پێوەنـانی نـی یـە ، هێشـتا هیـزی نەگەڕاوەتـەو ، سەرقاڵیشە بە دوورخستنەوەی ئاسەواری نەخۆشیەکەو ، لابردنی لە جەستەدا ٠

خورمای تەڕی تازە پێگەیوو ( الرُّطَب ) جۆرە قورسـیەکی تێدایـە بـۆ گـەدە ، بۆیـە ئەگـەر بیخوات سەرقاڵ دەبێـت بـە چارەسـەرکردن و چـاکردنیی و ئـاوڕ لـە ئاسـەواری نەخۆشـیەکەو لادانی ناداتەوە ، دەرەنجامیش یا پاشماوەی نەخۆشیەکە دەمێنێتەوە ، یا زیاد دەکات ٠

کـاتێ سـلق و جۆکـە خرایـە پـێش دەسـتی ئیمـامی ( علـي ) _ خـوای لـێ ڕازی بێـت _ ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمانیـدا لـەوە بخـوات ، چـونکە یەکێکـە لـە باشـترین خۆراکـەکان بـۆ کەسێك بەم نزیکانە لە نەخۆشی چاك بوبێتەوە ، چونکە ئـاوی جـۆ چـەند خاسـیەتێکی وەکـو فێنکردنەوەو خۆراك پیێ بەخشین و ، نەرم و نیانکردن و ، بەهێزکردنی تێدایـە کـە بـۆ کەسـێك بەم نزیکانە لـە نەخۆشـی چـاك بوبێتـەوە زۆر بەسـوودە ، بـە تایبـەت ئەگـەر لـە گـەڵ سـڵقدا کوڵێنرا ، بۆیە ئـەم خۆراکـە زۆر گونجـاوە بـۆ ئـەو کەسـانەی گـەدەیان لاوازە ، هـیچ تێکەڵـەو پاشماوەیەکی ترسێنەریش دروست ناکات ٠

( زید )ی کوڕی ( أسلم ) دەڵێت : ( عمر ) _ خوای لیێ ڕازی بێت _ پارێزی بە نەخۆشـێکی خۆی دەکرد ، تا ئەو ئاستەی نەخۆشەکە لە بەر زۆری پارێزکردن ناوکی دەمژی ٠

بەگشتی : پارێزکردن بە سوودترین دەرمانەکانە پیش تووشبوون بە نەخۆشی ، قەدەغـەی دروسـتبوونی دەکـات و ، ئەگـەر دروسـتیش بـوو ، زیـادبوون و بڵاوبوونـەوەی لـە جەسـتەدا قەدەغە دەکات ٠

**بەشێك :**

پێوستە بزانرێت کە نەخۆش و ئەو کەسەش بەم نزیکانە لە نەخۆشی چاك بۆتەوەو کەسی تەندروستیش ، ئەگەر ئارەزووی خواردنی کردو ، سروشتیشی مەیلی بۆ چوو ، پیویستە شتێکی کەم بخوات بە ئەندازەیەك توانای هەرسکردنی هەبێت و ، بە خواردنی ئەوەش زیانی پێ نەگات ، بەڵکو پێوستە سوودیشی پێ گەیەنێت ، ئیتر لێرەدا سروشت و گەدە بە قبوڵ و شادومانبوونەوە خواردنەکان وەردەگرێت و ، هەڵدەستن بە چاکردن و چارەسازیکردنی ئەوەی ترسی زیانی لێدەکرێت ، پێدەچێ لەو دەرمانانەش چاکتربێ کە سروشی مرۆڤ حەزی پێ نەیەو ، لە خۆی دوور دەخاتەوە ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ رازی بوو ( صُهَیب ) کە چاوی دەیەشا چەند دانەیەك خورما بخوات و ، دەشیزانی زیانی پێ ناگەیەنێت ٠

لەم بارەشەوە دەگێڕنەوە کەوا ئیمامی ( علي ) _ خوای لێ رازی بێت _ چاوی دەیەشاو ، چووە دیدەنی پێغەمبەری خوا ﷺ ، هاوکات پێغەمبەری خوا ﷺ لە پیش دەستیدا خورما هەبوو لێی دەخوارد ، فەرمووی : ئەی ( علي ) حەزی لێ دەکەی ؟ وە خورمایەکی بۆ فرێدا ، پاشان دانەیەکی تری بۆ فرێدا تا حەوت دانەی بۆ فرێدا ، پاشان فەرمووی : ئیتر بەسە ئەی ( علي ) ٠

وَمِنْ هَذَا مَا رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ فِي " سُنَنِه " مِنْ حَدِيثِ عِكْرِمَةَ ، عَنْ ابْنِ عَبّاسٍ أَنّ النّبِيّ ﷺ عَادَ رَجُلًا ، فَقَالَ لَهُ : مَا تَشْتَهِي ؟ فَقَالَ أَشْتَهِي خُبْزَ بُرّ ٠ وَفِي لَفْظٍ أَشْتَهِي كَعْكًا فَقَالَ النّبِيّ ﷺ مَنْ كَانَ عِنْدَهُ خُبْزُ بُرّ ، فَلْيَبْعَثْ إلَى أَخِيهِ ، ثُمّ قَالَ : إذَا اشْتَهَى مَرِيضُ أَحَدِكُمْ شَيْئًا ، فَلْيُطْعِمْهُ[١٥٨]

---

١٥٨ _ إسناده ضعيف : أخرجه ابن ماجة ( ١٤٣٩ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف ابن ماجة ( ٣٠٤ ) ٠

واته : له ( ابن عباس )ه‌وه _ خوا له خۆی وبابیشی ڕازی بێت _ فه‌رموویه‌تی : پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ چووه سه‌ردانی نه‌خۆشێك ، پێی فه‌رموو : حه‌زت به چی یه ؟ ئه‌ویش گووتی : حه‌زم به نانی گه‌نمه . له بێژه‌یه‌كی دیكه‌دا : حه‌زم به كێكه ، پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمووی : هه‌ركه‌س نانی گه‌نمی هه‌یه ، با بۆ براكه‌ی بنێرێ ، پاشان فه‌رمووی : ئه‌گه‌ر نه‌خۆشی كه‌سێكتان حه‌زی به خواردنێك بوو ، با بیداتێ )) .

له‌م فه‌رمووده‌یه‌دا نهێنیه‌كی پزیشكی ناسك به‌دیده‌كرێت ، بریتیه له‌وه‌ی كه ئه‌گه‌ر نه‌خۆش له كاتی برسێتیه‌كی ڕاستی سروشتیدا ئه‌و خواردنه‌ی حه‌زی لێیه‌تی بخوات ، ئه‌گه‌رچی جۆره زیانێكیشی تێدا بێت ، سوودێكی زۆرو زیانێكی كه‌متری بۆ ده‌بێت ، به‌ڵام ئه‌گه‌ر هه‌مان خواردن له كاتێكدا بخوات حه‌زی پێ نه‌بێت ئه‌و سووده‌ی لێ نابینێت ئه‌گه‌رچی خواردنه‌كه له خودی خۆشیدا به‌سوود بێت ، چونكه ئه‌و نه‌خۆشه‌ی به ڕاستی حه‌زی به خواردنه‌كه‌یه ، سروشتی ڕاستی ئه‌و حه‌زلێكردنه زیانی ئه‌و خواردنه‌ی بۆ لاده‌بات ، به‌ڵام ئه‌گه‌ر به سروشتی ڕقی له خواردنێكی به‌سوودیش بێت ، ڕه‌نگه زیانێكی پێگه‌یه‌نێت .

به‌گشتی : خۆراكی خۆشی حه‌زلێكراو ، سروشتی مرۆڤ به وردی ڕووی تێ ده‌كات و ، به جوانترین شێوه هه‌رسی ده‌كات ، به‌تایبه‌ت له كاتێكدا كه نه‌فس به حه‌زلێكردنێكی ڕاست و ، به‌هێزێكی ته‌ندروسته‌وه ڕووی تێده‌كات . والله أعلم .

## به‌شێك : سه‌باره‌ت به ڕێبازی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له چاره‌سه‌ركردنی چاوئێشه‌دا به نه‌رم ونیانی و له سه‌رخۆیی و و وازهێنان له جوڵانه‌وه‌و پارێزكردن له‌وه‌ی ده‌بێت به‌هۆی وروژاندنی چاوئێشه‌كه :

پێشتر ئاماژه‌ی پێدرا كه‌وا پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ پارێزی بۆ ( صُهیب ) به‌كارهێنا ، كاتێ نكۆڵیی لێكرد خورماكه بخوات ، چونكه چاوئێشه‌ی هه‌بوو ، هه‌روه‌ها پارێزی بۆ ( علي )

بــەكارهێنا ، كــاتێ قەدەغــەی كــرد خورمــا تەڕەپێگەیووەكــە بخــوات ، بــەهۆی چــاو ئێشەیەكەوە تووشی بوبو ٠

( أبونعيم ) لە كتێبی ( الطب النبـوي )دا دەڵێت : پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەگـەر خێزانێكـی تووشی چاوئێشە بوایە نەدەچووە لای تا چاوی چاك دەبویەوە.

چاوئێشە ( الرمد ) : ئاوسانێكی گەرمە لە سپیایی چاودا پەیدا دەبێت ، هۆكاری بریتیـە لـە تێرژانی یەكێك لە چوار تێكەڵاوەكە ، یا بایەكی گەرمە بڕی لە سەرو جەسـتەدا زیـاد دەكـات و ، بەشێكیشی دەچێتە ناوەڕۆكی چاو ، یا لێـدانێك بـەر چـاو دەكـەوێت و ، سروشـتی لـەش و دڵیش بڕێكی زۆری خوێنی بۆ دەنێرێت ، چونكە دەیەوێت بـەهۆی نـاردنی ئـەو بـڕە خوێنـەوە چارەسەری بكات ، بۆیە ئەندامە لێدراوەكە دەئاوسێت ٠

بزانـە وەكـو ئـەوەی چـۆن لـە زەویـەوە بـۆ بەرگـە هـەوا ، دوو هـەڵم بـەرز دەبێتـەوە ، یەكێكیان : ووشكەو ، ئەویتریان : گەرمی شێدارەو ، بەهەردوكیانـەوە هـەورێكی كەڵەكـەبوو دروست دەكەن ، قەدەغەی چـاومان دەكـەن و نـاهێڵن دەركـی ئاسمـان بكـەین ، ئاوەهـاش شتی بەو جۆرە لە قوڵایی گەدەوە بۆ كۆتایەكەی بەرز دەبێتـەوە ، قەدەغـەی بینینمـان لـێ دەكـەن ، بـەو هۆیەشـەوە چـەندین نەخۆشـی دروسـت دەبێـت ، ئەگـەر سروشـتی جەسـتە بەسەریدا زاڵ بوو و بەرەو لـووت پـاڵی پێوەنـا ، هەڵامـەت دروسـت دەكـات ، ئەگـەر بـەرەو زمانە بچكۆلەوەو هەردوو كونە لووت پاڵی پێوەنا ، نەخۆشی گـەروەخڕە دروسـت دەكـات ، ئەگەر بەرەو لاكانی جەستە پاڵی پێوەنا ، نەخۆشی ( الشَّوصة ) دروسـت دەكـات ، ئەگـەر بەرەو سنگ پاڵی پێوەنا ، كۆكەو هەڵامەت دروست دەكات ، ئەگەر چوو بـۆ دڵ ، تێكچـونی دڵ دروست دەكات ، ئەگەر بەرەو چـاو پـاڵی پێوەنـا ، چاوئێشـە دروسـت دەكـات ، ئەگـەر دابەزیە ناوسك ، نەخۆشـی هـەوكردنی ئەنـدامی زازێ دروسـت دەكـەن ( السَّیْلان ) ، ئەگـەر بـەرەو بەشـەكانی مێشـك پـاڵی پێوەنـا ، نەخۆشـی بیرچـوونەوە دروسـت دەكـات ، ئەگـەر

بەهۆیەوە خوێنبەرەکانی مێشك شێدارو تەڕاوی بوون و ڕگەکانی لێ پڕبوون ، نەخۆشی خەوتنی توند دروست دەکات ، ئەو کات خەوتنەکە شێدار دەبێت و ، شەونخونیش ( السهر ) ووشك دەبێت · ئەگەر هەڵمەکە ویستی بۆ دەروەی سەر گوزەر بکات و ، توانای نەبوو ، سەرئێشەو شەونخونی دروست دەکات ، ئەگەر هەڵمەکە بۆ لایەکی سەر لێژبویەوە ، بەدوایدا سەرئێشەی ( الشقيقة ) دروست دەبێت ، ئەگەر ناوەڕاست و سەرسەری داگیرکرد ، بەدوایدا نەخۆشی خۆربردن ( داء البَيْضة ) دروست دەبێت ، ئەگەر بەهۆیە پەردەی مێشك سارد بوو یا گەرم بوو یا شێداربوو و چەند بایەکی لێوە ووژا ، پژمین دروست دەکات ، ئەگەر بوبە هۆی ووژانی شێ بەڵغەمیەکەی نێو مێشك تا ئەو ئاستەی زاڵ بێت بەسەر گەرمە سروشتیەکەیدا ، بورانەوەو ( السُكات )[١٥٩] دروست دەکات ، ئەگەر ( المِرَّة السوداء )ی ووژان تا ئەو ئاستەی هەوای مێشك تاریك بکات ، نەخۆشی دودڵی دروست دەکات ، ئەگەر ڕژایە نێو ڕێڕەوکانی دەمارەوە ، نەخۆشی فێی سروشتی دروست دەکات ، ئەگەر کۆبەندی دەمارەکانی سەر شێدار بێت و بڕژێتە نێو ڕێڕەوەکانی ، نەخۆشی ئیفلیجی دروست دەکات ، بەڵام ئەگەر هەڵمەکە لە ( المِرَّة الصفراء )ەوە بوو بە ئاستێك مێشك گەرم بکات ، نەخۆشی ( البِرْسام ) دروست دەکات ، ئەگەر سنگیشی لە گەڵدا بەشداربوو ، نەخۆشی ( السَّرْسَامُ )[١٦٠] دروست ، کەوابوو باش تێبگە لەم بەشە ·

مەبەستیش ئەوەیە کە خەڵتەکانی جەستەو سەر دەجوڵێن و دەووروژێن لە باری چاوئێشەدا ، جووتبوونی خێزانیش جوڵان و هەڵچونی زیاد دەکات ، چونکە جووتبون جوڵانێکی سەرتاپای جەستەو ووح و سروشتە· بۆیە جەستە لەو باردا گەرم دەبێت

---

١٥٩ ـ السُكات : نەخۆشیەکە مەردوم لە قسەو گوتە دەخات و بەردەوام دەبێت لە سەر بێدەنگی ، بڕوانە : فەرهەنگی دەریا ، وەرگێڕ ·

١٦٠ ـ السَّرْسَامُ : ئەستوربوون و ئاوسانێکە لە پەردەی مێشکدا پەیدا دەبێ و لەرزوتای بەردەوام لە نەخۆشیەکدا پەیدا دەکا ، هەروەها دیاردەی تریشی لێ پەیدا دەبێ بۆ نموونە خەو پزاندن و سەرسوڕمان و سەرلێشێواندن · بڕوانە : قاموسی ڕستە ، وەرگێڕ ·

بـەدڵنیایی ، نەفسـیش جوڵانەکـەی تونـدتر دەکاتـەوە بـۆ گەشـتن بـە خۆشـی جوتبـون و تەواوکردنی ، ڕوحیش دەجوڵێتەوە لە گەڵ جوڵانەوەکەی نەفس و جەستەدا ، چـونکە یەکـەم پەیوەندبوونی ڕوح بـە جەسـتەوە لـە دڵـەوە دەسـت پـێ دەکـات و ، لەوێشـەوە ڕوح دروسـت دەبێ و ، بەهەموو ئەندامـەکانی جەسـتەدا بڵاودەبێتـەوە ٠ بـەڵام مەبەسـت بـە جوڵانەوەکـەی سروشت ، بۆ ئەوەیە ئاوی نێرینەی پێویست بەپێی ئەندازەی پێویست بنێرێ ٠

بەگشـتی : جووتبـونی خێـزان جوڵانەوەیـەکی سـەتاپایی گشـتیە ، هێـزو ، سروشـت و خەلتـەکان و ، ڕوح و نەفسـی جەسـتە لـە گەڵیـدا دەجوڵێتـەوە ، بۆیـە هـەموو جوڵانەوەیـەك خەڵتەکان دەوروژێنێ و نەرم و تەنکیان دەکاتـەوەو بـە ئاسـانی ڕەوانـەی ئەندامـە لاوازەکـانی جەسـتەی دەکـات ، چـاویش لـە بـاری نەخۆشـی چاوئێشـەدا لـە هـەمووی لاوازتـر دەبـێ ، جوڵانەوەی جووتبونیش لە هەمووی زیانتر دەبێ بۆی ٠

( بقراط ) لە کتێبی ( الفصول )دا دەڵێت : پێدەچێ سواربوونی کەشتی پەنجەڕادەکێشێت بۆ ئەوەی کە جوڵانەوە هەڵچون و وروژان بە جەستە دەبەخشێت ٠ لە گـەڵ هـەموو ئەمانەشـدا چاوئیشە سوودو کەڵکی زۆری تێدایە ، چونکە پێویست بـە پـارێزکردن و دەرهاوێشـتنی مـادە زیانبەخشەکان دەکات ، هەروەها سـەرو جەسـتە لـە پاشمـاوەو مادەگـەنیوەکان پـاك و روون دەکاتەوە ، هەروەها مرۆڤ دەبێ وازبێنێت لەوانەی زیان بە نەفس و جەستە دەگەیەنن وەکـو توورەبوون و ، خەم و خەفـەت و ، جوڵانـەوە توندوتیـژەکان و ، کـارە قورسـەکان ٠ لـە ( أثـر )ێکی سەلەفیدا هاتووە : با ڕقتان لە چاوئێشە نەبێت ، چونکە ڕەگەکانی کوێربوون دەبڕێت ٠

لەو هۆکارانەی بـەکاردێت بـۆ چارەسـەرکردنی چاوئێشـە پشـوودان و نـەرم و نیـانی و خـۆ ماندوو نەکردنە ، هەروەها وازهێنان لە دەست لێـدانی چـاو و خـەریك بـوون پێـوەی ، چـونکە ئەوانەی سەرەوە ئەگەر ئەنجام دران ئەوا دەبن بە هۆکارێکی کاریگەر بۆ تێڕژانی مادەیـەك بـۆ نێو چاو ٠ هەندێ لە پێشینانی چاك فەرمویانە : نموونەی هاوەڵانی پێغەمبەری خـوا ﷺ وەکـو

چاوە ، دەرمانی چاویش دەست لیٚ نەدانێتی · لە فەرموودەیەکی ( مرفوع )دا باسکراوە : (( چارەسەری چاوئێشە ئەوەیە کە ئاوی سارد بتکێنرێتە نێو چاو )) · ئەمەش بەسوودترین دەرمانەکانە بۆ چاوئێشەی گەرم ، چونکە ئاوی سارد بەکاردەهێنرێت بۆ کوژاندنەوەی گەرمی چاوئێشە ئەگەر گەرم بوو ·

وَلِهَذَا قَالَ عَبْدُ اللّهِ بْنُ مَسْعُودٍ _ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ _ ، لِامْرَأَتِهِ زَيْنَبَ وَقَدْ اشْتَكَتْ عَيْنُهَا : لَوْ فَعَلْت كَمَا فَعَلَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ كَانَ خَيْرًا لَك وَأَجْدَرَ أَنْ تُشْفِيَ ، تَنْضَحِينَ فِي عَيْنِك الْمَاءَ ، ثُمّ تَقُولِينَ : أَذْهِبْ الْبَأْس رَبّ النّاسِ ، وَاشْفِ أَنْتَ الشّافِي ، لَا شِفَاءَ إلّا شِفَاؤُك ، شِفَاءً لَا يُغَادِرُ سَقَمًا[١٦١] .

واتە : ( عبدالله )ی کوڕی ( مسعود ) _ خوای لیٚ ڕازی بێت _ بە ( زینب )ی خێزانی فەرموو : ئەگەر کارێکت ئەنجام بدایە بەهاوشێوەی کارەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ چاکتر دەبو و شایستەتریش دەبوو بۆ چاکبونەوەت ، ئاو بتکێنیتە چاوت و ، پاشان بڵێی : ئەی پەروەردگاری خەڵك ناڕەحەتیەکان لابەرەو ، چاك بکەروە هەر تۆ چاك دەکەیتەوە ، هیچ چاکبونەوەیەکیش نی یە جگە لە چاکبوونەوەکەی تۆ ، چاکبونەوەیەك هیچ نەخۆشیەك تێنەپەڕێنێت · ئەمەش وەکو چەندەها جار ئاماژەمان پێداوە تایبەتە بە هەندیٚ وەڵاتەوەو ، تایبەتیشە بەهەندیٚ لە جۆرەکانی چاوئێشەوە ، بۆیە پێویستە گوفتاری تایبەتی پێغەمبەری خوا ﷺ گشتاندن نەکرێت و ، گوفتاری گشتیشی تایبەت نەکرێت بە بەشێکی خەڵکەوە ، بەوەش هەڵەگەلیك و ، پێچەوانەگەلێکی راستی زۆر ڕوودەدات · والله أعلم ·

١٦١ _ إسناده صحيح : أخرجه أبوداود ( ٣٨٨٣ ) ، وابن ماجة ( ٣٥٣٠ ) ، وصححه الألباني في صحيح الجامع ( ٤٦٣٩ ) ·

## بەشێك : سەبارەت بە سڕبوونی گورچیلە
## کە لە گەڵیدا جەستە ڕەق دەبێت :

ذَكَرَ أَبُو عُبَيْدٍ فِي " غَرِيبِ الْحَدِيثِ " مِنْ حَدِيثِ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ : أَنَّ قَوْمًا مَرُّوا بِشَجَرَةٍ فَأَكَلُوا مِنْهَا ، فَكَأَنَّمَا مَرَّتْ بِهِمْ رِيحٌ ، فَأَجْمَدَتْهُمْ ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: قَرِّسُوا الْمَاءَ فِي الشِّنَانِ ، وَصُبُّوا عَلَيْهِمْ فِيمَا بَيْنَ الْأَذَانَيْنِ ٠

واتە : لە ( أبي عثمان النَّهْدِيّ )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : کۆمەڵەخەڵکێك بەلای درختێکدا تێپەڕیوون و لێیان خوارد ، وەکو ئەوەی بایەك بە سەریاندا تێپەڕیبوو ، ڕەقی کردن ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئاو لە کونەکاندا سارد بکەن و ، لە نێوان بانگ و قامەتی نوێژی بەیاندا بیکەن بە سەریاندا ٠

( أبوعبيد ) دەڵێت : فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ (( قَرِّسُوا )) : واتە : ساردی بکەن ٠ خەڵکیش دەڵێن : (( قد قَرَسَ البرد )) واتە : سەرماکە زۆر بوو ٠ (( الشِّنان )) : واتە : کوندەو جەوەندەی کۆن ٠ باسی ئەمەشی کردووە چونکە ئاوەکە زیاتر سارد دەکات ٠ (( بين الأذانين ) واتە : نێوان بانگ و قامەتی نوێژی بەیان ٠ گوتەکانی تەواوبو ٠

هەندێ لە پزیشکان گووتویانە : ئەم چارەسەرە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لە چاکترین چارەسەرەکانی ئەم نەخۆشیەیە ئەگەر لە وەڵاتێکی وەکو حیجازدا ڕوویدات ، کە وەڵاتێکی گەرمی ووشکە ، چونکە گەرمیی سروشتی لە ناوەڕۆکی دانیشتوانی ئەم وەڵاتەدا لاوازەو ، ئاوکردنیش بەسەریاندا لە کاتی باسکراودا کە ساردترین کاتەکانی ڕۆژە ، هۆکاریکی کارا دەبێت بۆ کۆکردنەوەی ئەو گەرمیە سروشتیەی کە بڵاوبۆووەتەوە لە جەستەیانداو هەموو هێزەکانیش هەڵدەگرێت و ، بەوەش هێزی پاڵنەر بەهێز دەبێت و ، لە لایەکانی جەستەوە

دێت و لـه سـكدا كۆدەبێتـەوە كـە شـوێنی نەخۆشـیەكەیەو ، بـە یارمـەتی هێزەكـانی تـر نەخۆشیەكە پاڵ بە نەخۆشیەكەوە دەنێت و ، بەئیزنی خوای تعالى دوری دەخاتـەوە ، ئەگـەر ( جالینوس ) یا ( بقراط ) یا كەسانی تر ، وەسفی ئەم دەرمانەیان بۆ ئـەم نەخۆشـیە بكردایـە ، پزیشكان ملكەچی دەبوون و ، لە تەواوی زانستی سەرسام دەبوون ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چاكردنی ئەو خۆراكەدا كە مێشی تێدەكەوێت و ڕێنمایەكانی سەبارەت بە دوورخستنەوەی زیانەكانی ژەهرەكان بە دژەكانیان :

في " الصَّحيحَيْنِ " مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ : إِذَا وَقَـعَ الـذُّبَابُ فِـي إِنَـاءِ أَحَدِكُمْ ، فَامْقُلُوهُ ، فَإِنَّ فِي أَحَدِ جَنَاحَيْهِ دَاءً ، وَفِي الْآخَرِ شِفَاءً(١٦٢) .

واته : له ( أبي هريرة )ەوە _ خوای لـێ ڕازی بێـت _ فەرموویـەتی : پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمووی : (( ئەگەر مێش كەوتە قاپی یەكێكتانەوە ، لە شـلەكەدا نقومی بكـەن ، چونكە لـە باڵێكیدا نەخۆشی هەیەو ، لەویتردا چارەسەر )) ٠

وَفِي " سُنَنِ ابْنِ مَاجَهْ " عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَحَدُ جَنَاحَيْ الذُّبَابِ سَمٌّ ، وَالْآخَرُ شِفَاءٌ ، فَإِذَا وَقَعَ فِي الطَّعَامِ ، فَامْقُلُوهُ ، فَإِنَّهُ يُقَدِّمُ السَّمَّ وَيُؤَخِّرُ الشِّفَاءَ(١٦٣).

واته : له ( أبي سعيد الخُدْرِيّ ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( باڵێكی مێش ژەهرەو ، ئەویتریش چارەسەرە ، ئەگەر كەوتە نێو قاپی

---

١٦٢ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٢ / ٣٩٨ ) ، والدارمي ( ٢٠٤٤ ) ، والبخاري ( ٤ / ١٥٨ ) ، ( ٧ / ١٨١ ) ، وابن ماجة ( ٣٥٠٥ ) كلهم عن طريق عتبة بن مسلم مولى بني تميم ، عن عبيد بن حنين ، عن أبي هريرة فذكره مرفوعاً ولم أجده في مسلم ، ولعله وهم من المصنف ٠

١٦٣ _ إسناده صحيح : أخرجه ابن ماجة ( ٣٥٠٤ ) ، وصححه الألباني في الصحيحة ( ٣٩ ) ٠

يەكێكتانەوە ، لە شلەكەدا نقومی بكەن بۆ دەهێنانی چارەسەرەكەی ، چونكە مێش باڵە ژەهرینەكەی پێش دەخات و ئەو باڵەی چارەسەری تێدایە دوایدەخات )) ٠

ئەم فەرمووده دوو شتی تێدایە : فیقهی و پزیشكی :

بەڵام فیقهیەكە : بەڵگەیەكی زۆر ئاشكەرایە كە ئەگەر مێش لە نێو ئاودا یا هەر شلەیەكی تردا مرد ، پیسی ناكات ، ئەمەش گوفتاری جەماوەری زانایانە ، ناشزانراوە لە پێشیندا كەسێك هەبوبێت بەرهەڵستی ئەمەی كردبێت ، ڕووی كردنیشی بە بەڵگە ئەوەیە كەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا بە نقوم كردنی مێشەكە لە ئاوەكەدا ، زانراویشە بەو كارە مێشەكە دەمرێت ، بە تايبەت ئەگەر چێشتەكە گەرم بوو ، بۆیە ئەگەر پیسی بكردایە فەرمانی بە ڕشتنی چێشتەكە دەكرد ، لە ڕاستیدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە چاكردنی چێشتەكە كرد بە نقوم كردنی مێشەكە ، پاشان حوكمەكە لەو سنورە تێپەڕێنراو هەموو ئەو جانەوەرانەشی گرتەوە كە نەفسێكی شلیان نی یە ، وەكو مێش هەنگوێن و زەردەواڵەو ، جاڵجاڵۆكە و ، هاوشێوەكانیان ، چونكە حوكم گشتی دەبێت بە گشتیبونی هۆكاری و ، ناشمێنێت بە نەمانی هۆكارەكەی ، لەبەر ئەوەی هۆكاری پیسبوون ئەو خوێنەیە كە لە جەستەی ئاژەڵی مردوودا دەوەستێت و ، جانەوەرانیش خوینێكی شلیان نی یە ، بۆیە حوكم بە پیسبوونی ئەو شلەی مێشی تێدەكەوێت نامێنێت ، چونكە هۆكاری دروستبوونی پیسبوون كە خوێنەكەیە نەماوە ٠

پاشان ئەو كەسانەی كە حوكم بەوە ناكەن كە ئێسكی مردارەوەبوو پیس بێت دەڵێن : ئەگەر ئەمە جێگیر بێت بۆ ئاژەلێكی تەواو كە هەموو جۆرە شێ و تەڕی و ، پاشەڕۆو ، نەبونێكی ڕەقی تێدا بێت ، جێگیربوونی شایستەتر دەبێت بۆ ئێسكێك كە هیچ جۆرە شێ و تەڕی و ، پاشەڕۆو ، خوێنێكی وەستاوی تێدا نەبێت ، ئەمەش لەوپەڕی بەهێزیدایە ، بۆیە شایستەترە كاری پێ بكرێت ٠

يەكەم كەسێكیش لە ئیسلامدا ئەم گوفتارەی لێوە بیسترابێت و ، فەرموبێتی : ( ما لا نفس لە سائلة ) واتە : ( نەفسێكی شلی نەبێت ) پێشەوا ( إبراهيم النخَعيُّ ) بوو ، لە ئەویشەوە هەموو زانایانی ئیسلام وەریانگرتووە ، ووشەی ( النفس )یش لە زمانی عەرەبیدا واتە : خوێن ، بۆیە دەگوترێت : ( نَفَست المرأة ) واتە : كەوتە بێنوێژیەوە ، بەڵام ئەگەر گوترا ( نُفِسَت ) بضم النون : واتە : منداڵی بوو ٠

بەڵام مانا پزیشكیەكەی : ( أبو عُبَيْد ) دەڵێت : مانای ( امْقُلُوه ) : واتە : نقومی بكەن با چارەسەرەكەی بێتەدەروە وەكو چۆن نەخۆشیەكەی دەرچوو ، لەم بارەشەوە لە زمانی عەرەبیدا دەگوترێت : ( هما يَتَماقلان ) واتە : ئەو دووانە خۆیان لە ئاوەكەدا نقوم كرد ٠

بزانە بەلایانەوە مێش هێزێكی ژەرینی تێدایە ئاوسان و ، خورووی كاتی كە بە مرۆڤەوە دەدات پەنجەی بۆ ڕادەكێشێت ، ئەمەش وەكو چەكێكە بۆ مێش ، ئەگەر كەوتە شتێكەوە بەجۆرێك زیانی پێگەیەنێت ، بە چەكەكەی خۆی دەپارێزێت ، بۆیە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمانیداوە ئەو ژەهرەی لە باڵێكیدایە چارەسەر بكریت بەو دەرمانەی كە خوای تعالى خستویەتیە باڵەكەی ترەوەی ، هەموو مێشەكە لە ئاو و چێشتەكەدا نقوم دەكرێت و ، مادە ژەهرەكەو مادە بەسوودەكە بەرامبەر یەكتر دەبنەوەو ، زیانەكەی دوردەخاتەوە ، ئەمەش پزیشكێتیەكە پزیشكانی گەورەو پێشەواكانیان ڕێی پێ نابەن و نایدۆزنەوە ، بەڵكو لە ڕوناكی پێغەمبەرایەتی بەدەرە ، لە گەڵ ئەمەشدا پزیشكی زانای سەركەوتوو ملكەچی ئەم چارەسەرە دەبێ و ، دانی پێدا دەنێ ئەو كەسەی هێناویەتی تەواوترین بونەوەرەو ، پشتگیری كراوە بە سروشێكی ئیلاهی بەدەرە لە هێزی مرۆڤایەتی ٠

زیاتر لە یەك پزیشك بەیادیان هێناوەتەوە كە شوێنی پێوەدانی زەردەواڵەو دووپشك ئەگەر مێشی پێدا بهێنرێت سوودێكی ئاشكەرای بۆ دەبێت و ، ئێشەكەی دەنیشێنێتەوە ، ئەوەش بۆ هیچی تر ناگەڕێتەوە تەنها بۆ ئەو مادده نەبێت كە شیفای تیدایە ، ئەگەر بهێنرێت بەو

ئاوسانەدا كە لە برژانگی چاودا پەیدا دەبێت و بە ( الشَّعْرَة ) ناودەبرێت پاش بڕینی سەری مێشەكە چاكی دەكاتەوە ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەركردنی زیپكەدا :

ذَكَرَ ابْنُ السّنّيّ فِي كِتَابِهِ عَنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النّبِيّ ﷺ قَالَتْ : دَخَلَ عَلَيّ رَسُولُ اللّهِ ﷺ وَقَدْ خَرَجَ فِي أُصْبُعِي بَثْرَةٌ ، فَقَالَ " عِنْدَكِ ذَرِيرَةٌ ؟ قُلْت : نَعَمْ . قَالَ " ضَعِيهَا عَلَيْهَا " وَقُولِي : اللّهُمّ مُصَغّرَ الْكَبِيرِ ، وَمُكَبّرَ الصّغِيرِ ، صَغّرْ مَا بِي[١٦٤] .

واتە : كەسانێك لە خێزانەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ دیدەنی كردم كە هاوكات زیپكەیەك لە پەنجەمدا دەرچووبو ، پێی فەرمووم : دەرمانی ( ذریرة )ت لایە ؟ گوتم : بەڵێ٠ فەرمووی : بیخە بە سەری و ، بڵێ : پەروەردگار ئەی بچوكارەوەی گەورەو ، گەورەكاری بچوك ، ئەوەی لە جەستەمدایە بچوكی بكەرەوە ٠

( الذَّرِيرةُ ) : دەرمانێكی هیندی كوتراوە لە قامیشی ( الذَّرِيرة ) دەردەهێنرێت ، گەرم و ووشكەو بەسوودە بۆ ئاوسانەكانی گەدەو جگەرو ئاوبەنگ ( الأستسقاء )و ، دڵ بەهێز دەكات چونكە بۆن خۆشە ٠ وَفِي " الصّحِيحَيْنِ " عَنْ عَائِشَةَ أَنّهَا قَالَتْ طَيّبْتُ رَسُولَ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ بِيَدِي بِذَرِيرَةٍ فِي حَجّةِ الْوَدَاعِ لِلْحِلّ وَالْإِحْرَامِ[١٦٥] .

واتە : لە خاتوو ( عائشة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: بەدەستەكانی خۆم بە ( الذريرة ) پێغەمبەری خوام ﷺ بۆنخۆش كرد لە حەجیماڵئاوایدا بۆ ئیحرام

---

١٦٤ _ إسناده ضعيف : أخرجه أحمد ( ٥ / ٣٧٠ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٤٢١٠ ) ٠

١٦٥ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٦ / ٢٠٠ ، ٢٤٤ ) ، والبخاري ( ٧ / ٢١١ ) ، ومسلم ( ٤ / ١٠ ) كلهم عن عروة والقاسم عن عائشة فذكرته ٠

بەستن و دوای ئیحرام شکاندنیش . ( البَثْرَة ) : هەڵتۆقیویەکی بچوکە بەهۆی مادەیەکی گەرمەوە دروست دەبێ و سروشتی جەستە پاڵی پێوە دەنێ ، جێگەیەك لە جەستەدا دەدرێ و لێی دێتە دەرەوە ، پێویستی بە شتێکە پێیگەیەنێت و دەریکاتە دەرەوە ، ( الذَّريرة )ش یەکێکە لەو دەرمانانەی ئەو کارە بەجێ دێنێت ، چونکە سیفەتێکی بەرزی پێگەیاندن و دەهاوێشتنی هەیە سەرەڕای بۆن خۆشیەکەی ، ئەگەرچی سیفەتێکی ساردکردنەوەشی تێدایە بۆ ئەو ئاگریەی لەو مادەدایە ، بۆیە دانەر کتێبی ( القانون ) دەڵێت : هیچ شتێك نی یە لە ( الذَّريرة ) چاکتربێ بۆ سوتاندنی ئاگر ئەگەر لە گەڵ ڕۆنی گوڵ و ( بدهن الورد ) سرکەدا ( الخل ) تێکەڵ کرا .

## بەشێك : سەبارەت بە چارەسەرکردنی ئاوساو دومەڵەکان بە هەڵدرین و دەرهێنانی کێم و ئاوەکەی :

يُذكر عن علي أنه قال : دخلتُ مع رسول الله ﷺ على رجل يعودهُ بظهره ورم ، فقالوا : يا رسول الله بهذه مِدَّة . قال : بُطُّوا عنه ، قال عليٌّ فما بَرِحتُ حتى بُطَّتْ ، والنبيُّ ﷺ شاهدٌ[١٦٦].

واتە : لە ( علي )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ باسکراوە فەرموویەتی : (( بەیاوەری پێغەمبەری خوا ﷺ چوینە دیدەنی پیاوێك ، پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی دەکرد بە هۆی ئەو ئاوسانەوە کە لە پشتیدا بوو ، گوتیان : ئاوسانەکەی کێم و زیچکاوی هەیە ، ئەویش فەرمووی : هەڵیدڕن ، ( علي ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ دەفەرمێت : جێگەکەم بەجێنەهێشت تا ئاوسانەکەی هەڵدڕا بۆ دەرهێنانی کێم و زیچکاوەکەی ، پێغەمبەری خواش ﷺ ئامادەبوو.

ويُذكر عن أبي هريرة : أنَّ النبيَّ ﷺ أمر طبيباً أن يَبُطَّ بطن رجل أجْوى البطن ، فقيل : يا رسول الله هل ينفع الطبُ ؟ قال : الذي أنزَلَ الداء ، أنزل الشِّفاء ، فيما شاء[١٦٧].

---

١٦٦ _ ضعيف : انظر مجمع الزوائد ( ٥ / ٩٩ ) .

واته : له ( أبي هريرة )ەوه _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ باسكراوه فەرموويەتى : پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمانيدايه پزيشكێك سكى پياوێكى تووشبوو به نەخۆشى ئاوبەنگ هەڵدڕێ ، گوترا: ئەى پێغەمبەرى خوا ئايا پزيشكێتى سوود دەگەيەنێت ؟ فەرمووى : ئەو زاتەى نەخۆشيەكەى دابەزاندووه ، چارەسەرەكەشى دابەزاندووه ، بەهەر شتێك ئارەزووى لێبێت ٠

ئاوسان ( الورم ) : مادەيەكه به قەبارەى ئەندامەكه ، دروستبوونى دەگەڕێتەوه بۆ زێده مادەيەك دەڕژێته نێو ئەو جێگەيه ، له تێكڕاى ڕەگەزەكانى نەخۆشيدا هەيه ، ئەو مادانەش ئاوسانەكه پەيدا دەكەن چوار تێكەڵاوەكەو ، ئاو و ، بان ، ئەگەر ئاوسانەكه كۆبۆوه به دومەڵ ( خُراج ) ناودەبرێت ، هەموو ئاوسانێكى گەرمى بەئازاريش دەرەنجامى سىٚ شت دەبىٚ : يا شيبوونەوەو نەمان ، يا كۆبوونەوەى كێم و زيچكاو ، يا دەگۆڕێت بۆ بارێكى ڕەقى ٠ بۆيه ئەگەر هێزى مرۆڤـ بەهێزبوو ، مادەى ئاوسانەكه كۆنتڕۆڵ دەكات و شيدەكاتەوەو نايهێڵێت ، ئەمەش چاكترين بارەكانه ئەگەر بارى ئاوسانەكەى پێدا تێپەڕبێت ، بەڵام ئەگەر هێزى لەوه كەمتر بوو ، مادەى ئاوسانەكه پێدەگەيەنێت و ، دەيكات به كێمێكى سپى و ، جێگەيەكى بۆ دەكاتەوەو دەيڕژێنێته دەرەوه ، ئەگەر هێزى مرۆڤەكه لەوەش كەمتربوو ئەوا مادەكه دەگۆڕێت بۆ كێمێكى تەواو پێنەگەيو ، بێتواناش دەبىٚ جێگەيەك لەو ئەندامەدا بكاتەوەو پاڵى پێوه بنێت بۆ دەرەوه ، لەم بارەدا ترسى گەنين لەو ئەندامەى لەشى مرۆڤـ دەكرێت بەهۆى زۆر مانەوەى مادە كێماوه ڕەقەكه تيايدا ، بۆيه پێويستى به يارمەتى پزيشكه بۆ هەڵدڕينى جێگەكه ، يا هەر ڕێگەيەكى تر بۆ دەهێنانى ئەو مادە خراپبووه كه ئەندامەكەى خراپ كردووه ٠

هەڵدڕينيش دوو سوودى تێدايه : يەكەميان : دەهێنانى ئەو كێم و مادە خراپانەيه كه ئەندامەكەى لەش خراپ دەكات٠ دووەميان : ڕێگريى له كۆبونەوەى مادەى تر لەويدا بۆ ئەوەى هێزى ترى پىٚ نەبەخشێت ٠

١٦٧ _ سبق تخريجه ٠

بەڵام سەبارەت بەو گوفتارەی کە فەرموویەتی : (( إنه أمر طبيباً أن يَبُطَّ بطن رجل أجْوَى البطن )) واتە : (( فەرمانیدایە پزیشکێك سکی پیاوێکی تووشبوو بە نەخۆشی ئاوبەنگ هەڵدڕێ )) ، لێرەدا ووشەی ( الجَوى ) بۆ چەند مانایەك بەکاردێ لەوانە : ئەو ئاوە بۆگەنەیە کە لە سکدا کۆدەبێتەوەو نەخۆشی ئاوبەنگ دروست دەکات ٠

پزیشکان جیاوازبوون سەبارەت بە هەڵدڕین و دەرهێنانی ئەو ئاوەی تیایدا کۆبۆتەوە ، کۆمەڵێك لە پزیشکان ڕێگری لێ دەکەن چونکە مەترسیدارەو ، ساغ و سەلامەتیشی لێوە بەدوورە ، کۆمەڵێکی تریش شیاوێتیان پێداوەو ، دەڵێن : بەدەر لەوە هیچ چارەسەرێکی تری نی یە ، مەبەستیشیان بەو جۆرەیەتی کە بە ( الزِّقيّ ) ناودەبرێت ، چونکە وەکو پێشتریش ئاماژەمان پێدا سێ جۆرە : تەپڵی و ، گۆشتی و ، ( الزِّقي )ە ، کە بەلای زۆربەی پزیشکانەوە خراپترین جۆرەکانە ٠ پزیشکانی تریش گوتویانە خراپترین جۆریان گۆشتیە چونکە هەموو جەستە دادەپۆشێ ٠

لە کۆی چارەسەرەکانی جۆری ( الزِّقي ) دەرهێنانی ئاوەکەیە بە هەڵدڕین ( البَزْل ) ، ئەمەش وەکو خوێن دەرهێنانی پیسە لە ڕەگەکانەوە ، بەڵام مەترسیدارە وەکو پێشتر ئاماژەی پێدرا ، ئەگەر ( صحیح )ی ئەم فەرموودەیە جێگیربوو ، ئەوا بەڵگەیەك دەبێت بۆ شیاوێتی هەڵدڕین و دەرهێنانی ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خۆراك پێدانی مرۆڤ بە ناسکترین و بەتامترین ئەو خۆراکانەی لە سەری ڕاهاتووە :

في " الصّحِيحَيْنِ " مِنْ حَدِيثِ عُرْوَةَ ، عَنْ عَائِشَةَ : أَنَّهَا كَانَتْ إِذَا مَاتَ الْمَيِّتُ مِنْ أَهْلِهَا، وَاجْتَمَعَ لِذَلِكَ النِّسَاءُ ، ثُمّ تَفَرّقْنَ إِلَى أَهْلِهِنّ ، أَمَرَتْ بِبُرْمَةٍ مِنْ تَلْبِينَةٍ فَطُبِخَتْ ، وَصُنِعَتْ ثَرِيدًا ،

ثُمّ صُبّتْ التّلْبِينَةُ عَلَيْهِ ، ثُمّ قَالَتْ : كُلُوا مِنْهَا ، فَإِنّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِ ﷺ يَقُولُ (( التّلْبِينَةُ مَجَمّةٌ لِفُؤَادِ الْمَرِيضِ تَذْهَبُ بِبَعْضِ الْحُزْنِ ))(١٦٨) .

واته : ( عُرْوة ) له خاتوو ( عائشة )ەوه _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ دەگێڕێتەوەو دەفەرمێت : ئەگەر یەکێك له کەسوکاری بمردایه ، پاش ئەوەی ژنان کۆدەبونەوەو ، دەچونەوە ماڵی خۆیان ، فەرمانیدەدا مەنجەڵێك ( تلبینة ) لێدەنرا ، ئینجا تریدی دەکردو ، ( تلبینة )ەکەی بەسەریدا دەکردو ، پاشان دەیفەرموو لێی بخۆن ، چونکە گوێبیستی پێغەمبەری خوا بووم ﷺ دەیفەرموو : (( ( التلبینة ) ئاسوودەیی بە دڵی نەخۆش دەبەخشێ و هەندێ لە خەمەکان دەڕوێنێتەوە )) .

وَفِي " السّنَنِ " مِنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ أَيْضًا ، قَالَتْ : قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ عَلَيْكُمْ بِالْبَغِيضِ النّافِعِ التّلْبِين ، قَالَتْ : وَكَانَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ إذَا اشْتَكَى أَحَدٌ مِنْ أَهْلِهِ لَمْ تَزَلْ الْبُرْمَةُ عَلَى النّارِ حَتّى يَنْتَهِيَ أَحَدُ طَرَفَيْهِ . يَعْنِي يَبْرأُ أَوْ يَمُوتُ(١٦٩) .

واته : له خاتوو ( عائشة )ەوه _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (( بێزلێکراوی بەسوود بەکاربێنن ( التلبین ) )) ، خاتوو ( عائشة ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ دەفەرمێت : پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر یەکێك لە کەسوکاری نەخۆش بوایە ئیتر بەردەوام مەنجەڵە ( التلبین )ەکە بەسەر ئاگرەوە دەبوو تا بەلایەکا کۆتای دەهات . مەبەستی ئەوەیە یا چاك دەبۆوە یا دەمرد .

---

١٦٨ _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ٩ / ٤٧٩ ) ، ومسلم ( ٢٢١٦ ) .

١٦٩ _ إسناده ضعيف : أخرجه أحمد ( ٦ / ٢٤٢ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٤٦ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٣٧٥٥ ) .

وَعَنْهَا : كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قِيلَ لَهُ إِنَّ فُلَانًا وَجِعٌ لَا يَطْعَمُ الطَّعَامَ ، قَالَ : عَلَيْكُمْ بِالتَّلْبِينَةِ فَحَسُّوهُ إِيَّاهَا ، وَيَقُولُ : وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهَا تَغْسِلُ بَطْنَ أَحَدِكُمْ كَمَا تَغْسِلُ إِحْدَاكُنَّ وَجْهَهَا مِنَ الْوَسَخِ (١٧٠) .

واته : ديسان له خاتوو ( عائشة )ەوه _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : ئەگەر به پێغەمبەرى خوايان ﷺ بگوتبا فلاّن كەس نەخۆشەو خۆراك ناخوات ، دەيفەرموو ، (( ( التلبينة ) بەكاربێنن با بيخواتەوه ، دەشيفەرموو : بەو زاتەى نەفسى منى بەدەستە نێو سكى يەكێكتان دەشواتەوه بە هاوشێوەى ئەوەى يەكێتان دەم و چاوى لە پيسى پشواتەوه ٠

( التلبين ) : شۆربايەكى ناسكەو لە خەستى ماستاودايە ، هەر لە ئەويشەوه ناوەكەى داتاشراوه ، ( الهَرَوِيُّ ) دەفەرمێت : ناونراوه به ( التلبينة ) لەبەر ئەوەى لە ماستاو دەچێت لە بوارى سپێتى و ناسكى و خەستيەوه ، ئەم خۆراكە بەسووده بۆ نەخۆش ، چونكه ناسكێكى پێگەيووه نەك چرێكى نەكوڵاو ، ئەگەر ويستى زانينى چاكێتى ( التلبينة ) دەكەى ، تەماشاى چاكێتەكانى ئاوى جۆ بكە ، بەڵكو ئاوى جۆيە بۆ ئەوان ، چونكه ( التلبينة ) شۆربايەكى وەرگيراوه له ئاردى جۆ بە كەپەكەوه ، جياوازيش لە نێوان ئەم و ئاوى جۆدا ئەويە ئاوى جۆ له جۆ لێدەنرێت به ساغى ، كەچى ( التلبينة ) له جۆ لێدەنرێت بە هاڕاوى ، ئەمەش بەسوودتره چونكه خاسيەتى جۆكە ديتەدەروه بە هاڕاوى ، پێشتريش ئامازەى پێدرا كه داب و نەرێت كاريگەرى خۆى دەبێت بۆ سوود وەرگرتن لە دەرمان و خۆراكەكان ، چونكه نەرێتى عەرەب وابوو ئاويان له جۆى هاڕاو وەردەگرت نەك بە ساغى ، ئەمەش خۆراكێكى زياتر دەبەخشێت ، كاريگەريشى بەهێزترەو ، توانـاى پاككردنەوەشى گەورەتره ، بەڵام پزيشكانى شار ئاويان له جۆى ساغ وەرگرتووه ، بۆ ئەوەى ناسك و نەرم ونيانتر بىٚ و ، قورسيش نەبىٚ بۆ سروشتى نەخۆش ، ئەمەش بەگوێرەى خووى دانيشتوانى شارو نەرم و

١٧٠ _ إسناده ضعيف : أخرجه أحمد ( ٦ / ٣٢ ) ، ورواه البخاري ( ٥٤١٧ ) مرفوعاً بلفظ : (( التلبينة مُجِمَّة لفؤاد المريض ، تُذْهِب ببعض الحزن )) ٠ ورواه مسلم ( ٢٢١٦ ) ٠

نیانیانەو ، ئاوی جۆی هاڕاویش بۆ سروشتی ئەوان قورسە ، مەبەستیش ئەوەیە کە ئاوی جۆی لێنراو بە ساغی خێرا گوزەر دەکات و ، پاکردنەوەشی زۆر ئاشکەرایەو ، خۆراکێکی نەرم نیانیش بە جەستە دەبەخشێت و ئەگەر بە گەرمیش بخورێتەوە بەهێزتر پاك دەکاتەوەو ، خێراتریش گوزەر دەکات و ، گەرمی خۆڕسکیش زیاتر پەرەپێدەدات و ، سەرکەوتوتریش بەر ڕووی گەدە دەکەوێت ٠

فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ (( مجمة لفؤاد المريض )) واتە ئاسودەکارە بۆ دڵی نەخۆش و ، شادکارو خۆشی هێنەرە بۆی ٠ فەرمایشتی : (( تذهب ببعض الحُزْن )) واتە : خەم بەرە ، ئەمەش _ والله أعلم _ لەبەر ئەوەیە خەم وخەفەت میزاج سارد دەکەنەوەو ، گەرمیی خۆڕسکیش لاواز دەکەن ، چونکە ئەو خوێن و ڕوحەی هەڵگری گەرمیەکەن مەیلی لای دڵ دەکەن ، کە جێگەی دروستبونیەتی ، ئەم شۆربایەش گەرمیە خۆڕسکیەکە بەهێزدەکات بە زیادکردنی مادەکەی ، بۆیە زۆربەی ئەو خەم و خەفەتەی توشی بووە لایدەبات ٠

دەشگوترێت _ ئەمە نزیکترە لە قبوڵبونەوە _ هەندێ خەم و خەفەت لادەبات بە هۆی خاسیەتێکەوە کە تیایدایە لە ڕەگەزی خاسیەتی خۆراکە شادومانکارەکان ، چونکە هەندێ لە خۆراکەکان شادومانی و ئاسودەی بەدڵ دەبەخشن بە هۆی خاسیەتێکی تایبەتەوە ٠ والله أعلم ٠

دەشگوترێت : هێزەکانی کەسی خەمبار لاواز دەبێت ، چونکە ووشکێتی بەسەر ئەندامەکانی و ، بەسەر گەدەشیدا بەتایبەت زاڵ دەبێ ، بەهۆی کەمبونەوەی خۆراك تیایدا ، ئەم شۆربایەش تەڕو شێداری دەکاتەوەو ، بەهێزی دەکاتەوەو ، خۆراکێ پێ دەبەخشێتەوە ، هەمان ئەو شتانەش بە دڵی نەخۆش دەبەخشێت ، بەڵام نەخۆش بە زۆری خەڵتەی تاڵی و ترشی ، یا بەڵغەمی ، یا کێمی لە گەدەیدا کۆدەبێتەوە ، ئەم شۆربایەش گەدە پاك

دەكاتەوەو ، ئەو مادانەش شلْ دەكاتەوەو ، بەرِیيان دەخات و ، چۆنيەتيان چاك دەكاتەوەو ، توندتيژيان دەشكێنێت ، هەموو ئەمانەش ئاسودەيى بە نەخۆش دەبەخشێت ، بە تايبەت بۆ ئەو كەسانەى بەخواردنى نانى جۆ ڕاهاتوون كەوا نەريتى دانيشتوانى مەدينە بوو ، زۆربەى بژێوى و خواردەمەنيان ئەوەبوو ، چونكە گەنم لاى ئەوان دەگمەن بوو ٠ والله أعلم ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازى پێغەمبەرى خوا ﷺ لە چارەسەركردنى نەخۆشدا بە خۆشكردنى نەفسيان و بەهێزكردنى دڵيان :

رَوَى ابْنُ مَاجَهْ " فِي سُنَنِه " مِنْ حَدِيث أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيّ ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ إِذَا دَخَلْتُمْ عَلَى الْمَرِيضِ ، فَنَفِّسُوا لَهُ فِي الْأَجَلِ ، فَإِنّ ذَلِكَ لَا يَرُدّ شَيْئًا ، وَهُوَ يُطَيّبُ نَفْسَ الْمَرِيضِ[(١٧١)] ٠

واتە : لە ( أبي سَعيد الخُدْريّ ) _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموويەتى: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : (( ئەگەر چوونە سەردانى نەخۆش ، ناڕەحەتيەكانى لە سەر برەوێننەوە بە هيواى تەمەن درێژى ، ئەوەش هيچ شتێك لە چارەنووسى خواى تعالى ناگەڕێنێتەوە ، بەڵام دڵى نەخۆشى پىٚ خۆش دەبىٚ )) ٠

جۆرێكى زۆر بەڕێز لە بەڕێزترين جۆرەكانى چارەسەرى نەخۆش لەم فەرمودەيەدا بەديدەكريت ، كە بريتيە لە ڕێنيشاندان بۆ ئەو شتانەى دڵيى نەخۆشى پىٚ خۆش دەبێت و ، چاكترينيشيان گوفتارى خۆشە كە سروشتى نەخۆشى پىٚ بەهێز دەبێت و ، هێزى پىٚ دەبوژێتەوەو ، گەرمى خۆڕسكيشى پىٚ بڵاودەبێتەوە ، ئەمەش يارمەتى دورخستنەوەى نەخۆشيەكە دەدات ، يا كەمى دەكاتەوە ، كە بەرزترين مەبەستەكانى پزيشكە ٠

---

١٧١ _ إسناده ضعيف : أخرجه ابن ماجة ( ٢٤٣٨ ) ، وضعفه الألباني في الضعيفة ( ١٤٨ ) ٠

شادومان كردنى نەفسى نەخۆش و ، دڵخۆشكردنى و ، باسكردنى ئەوەى ئاسودەيى پێ دەبەخشێت ، كاريگەريەكى سەرسوڕمێنى لە چاكردنەوەى نەخۆشى و سوكردنەوەيدا هەيە ، چونكە خوێن و ڕوح و هێزەكانى پێ بەهێز دەبێ و ، يارمەتيدەرێكى چاكيش دەبێ بۆ دوورخستنەوەى زيانبەخشەكە ، خەڵكى زۆرێك لە نەخۆشەكان دەبينن هێزەكانى دەبوژێتەوە ، بەتايبەت بە سەردانيى ئەو كەسانەى كە نەخۆشەكان خۆشيان دەوێ و ، بە گەورەيان دادەنێن و ، ئەوانيش چاويان پێ دەكەوێ و ، سۆزو ميهرەبانى بۆ دەنوێنن و ، لە گەڵيدا دەدوێن ، ئەمەش يەكێكە لە سودەكانى سەردانى نەخۆش كە پەيوەندى بە ئەوانەوە هەيە ، چونكە لە بنچينەدا چوار جۆر سودى تێدايە : جۆرێك دەگەڕێتەوە بۆ نەخۆش ، جۆرێك دەگەڕێتەوە بۆ ئەو كەسەى سەردانى دەكات ، جۆرێك دەگەڕێتەوە بۆ كەسوكارى نەخۆش ، جۆرێكيش دەگەڕێتەوە بۆ ڕەمەكى خەڵك .

پێشتر ئاماژەى پێدرا كە ڕێبازى پێغەمبەرى خوا ﷺ وابوو لە نەخۆشى دەپرسى سەبارەت بە نەخۆشيەكەى و ، چۆن هەستى پێ دەكات و ، لێشى دەپرسى سەبارەت بەو خۆراكەى حەزى لێيەتى ، دەستە موبارەكەكانيشى دەخستە سەر تەوێڵى و ، ڕەنگە دەستيشى بخستبايەتە نێوان هەردوو مەمكەكانى ، بۆشى دەپاڕايەوەو نزاى بۆ دەكردو ، دەرمانێكيشى بۆ وەسف دەكرد گونجاوى نەخۆشيەكەى بوايە ، پێدەچێ دەستنوێژيشى بگرتايەو لە ئاوى دەستنوێژەكەشى بەسەردا بكردايە ، لەوانەبوو بە نەخۆشيش بڵێ : (( لا بأس ، طَهُورٌ إنْ شاء الله ))[١٧٢] واتە : دەيفەرموو : (( هێچى تێدا نى يە ، چاك دەبيتەوە إن شاء الله )) ، ئەمەش لوتكەى تەواوێتى سۆزو ميهرەبانى و ، باشێتى چارەسەرو چارەسازيە .

١٧٢ ــ صحيح : أخرجه البخاري ( ٤ / ٢٤٦ ) ، ( ٧ / ١٥٢ ، ١٥٣ ) ، ( ٩ / ١٦٩ ) وفي الأدب المفرد ( ٥١٤ ) ، ( ٥٢٦ ) والنسائي في عمل اليوم والليلة ( ١٠٣٩ ) كلهم من طريق خالد الحذاء عن عكرمة عن ابن عباس فذكره .

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەرکردنی جەستەکاندا بە پێدانی ئەو خۆراك و دەرمانانەی لە سەری ڕاهاتووە ، نەك بەوەی لە سەری ڕانەهاتووە :

ئەمە بچینەیەکی گەورەیە لە بنچینەکانی چارەسەر ، بەسوودترین شتیشە تیایدا ، ئەگەر پزیشك هەڵەی تێدا بکات ، زیان بە نەخۆش دەگەیەنێ لەو شتەدا کە پێی وایە سوودی بۆ دەبێ ، هیچ کەسیش ئامادە نی یە لەم دەستوەرە لابدات و ، ئەو دەرمانانە بەکاربێنی کە لە کتێبە پزیشکیەکاندا هەیە ، جگە لە پزیشکێکی نەفام ، چونکە گونجاوێتی دەرمان و خۆراك بۆ جەستە بە گوێرەی ئامادەیی و قبوڵبوونێتی بۆ ئەو دەرمان و خۆراکە ، ئەمانەش دەشتەکی و وەرزێرو و کەسانی تری بەو هاوشێوانەن کەوا شەربەتی ( لینوفر )و گوڵی ناسك و( الورد الطريّ ) خواردنەوەی گەرم گاریگەری بۆ ئەمانە نابێ ، هیچ شتێك کار لە میزاجیان ناکات ، بەڵکو سەرجەم دەرمانەکانی دانیشتوانی شارو خەڵکانی خۆشگوزەران کاریان تێناکات ، تاقیکردنەوەش گەواهیدەرە ، هەرکەس تەماشای ئەو چارەسەرە پێغەمبەرایەتیانە بکات کە ئاماژەی پێدرا ، دەبینێ هەرهەمووی گونجاوی نەریتی نەخۆش و زەویەکەیەتی ، گونجاوی ئەوەیە کە لە سەری پەروەردە بووە ، کەوابوو ئەمە بنچینەیەکی گەورەیە لە بنچینەکانی چارەسەر ، کە پێویستە ڕەچاو بکرێت ، ئەمەش لە لایەن پزیشکە بەڕێزەکانەوە دانی پێدانراوە ، تا ئەو ئاستەی گەورەترین پزیشکی عەرەب ( الحارث )ی کوڕی ( كَلَدَة ) ، کە وەکو ( بقراط ) بووە لە نێو قەومەکەی خوێدا دەڵێت : پارێزکردن سەرەکیترین دەرمانەو ، گەدەش شوێنی نەخۆشیەو ، هەموو جەستەیەکیش ڕابێنن لە سەر ئەوەی لە سەری ڕاهاتووە ، لە بێژەیەکی دیکەشدا گوتویەتی : وازهێنان لە خواردن و خۆ برسیکردن دەرمانە ، ئەمەش لە گەورەترین دەرمانەکانە بۆ چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشیانەی بە هۆی تێڕژانی یەکێك لە چوار تێکەڵاوەکانی خوێنی ، بەڵغەمی ، ( صفراوي ) ، ( سوداوي )ەوە پەیدا دەبن

به جۆرێك له هەموو ئەو دەرمانانەی بەكار دەهێنرێن بۆ بەتاڵكردن و دەرهاوێشتنی ئەو چوار تێكەڵاوە چاكترە ، بەمەرجێك ترسی ئەوەی لێنەكرێت ئەو چوار تێكەڵاوە زیاتر تێرژێت ، یا ترسی وروژانی تێكەڵاوەكانی لێ بكرێت ، یا تیژترو گڕگرتوتری بكات ٠

گوفتاری ( الحارث )ی كوڕی ( كَلَدَة ) : ( المعدة بيت الداء ) واته گەدە شوینی نەخۆشیە ٠ گەدە : ئەندامێكی دەماریی نێو بۆشە ، لە شێوی كولەكەدایە ، لە سێ چین پێكهاتووە ، لە پارچەگەلێكی وردی دەماریی پێكهاتووە بە ڕیشاڵ ناودەبرێت ، گۆشت چواردەوری داوە ، ڕیشاڵی چینێكیان بە درێژیە ، ئەویتریان بە پانیەو ، سێ یەمیش پێچاوپێچە ، دەمی گەدە زۆرترین دەماری پێوەیەو ، بنیشی زۆرترین گۆشتی پێوەیە ، ناوەوەی ڕیشووی هەیە ، كەوتۆتە ناوەڕاستی سكەوە ، كەمێك بەلای ڕاستدا مەیل دەكات ، ئا بەم شێوەیە لە لایەن خوای پەروەرگارەوە خولقێنراوە بۆ حیكمەتێكی ناسك و جوان ، گەدە ماڵ و شوێنی نەخۆشیە ، شوێنی هەرسی یەكەم بوو ، تیایدا خۆراك پێدەكات و لێژ دەبێتەوە بۆ جگەرو ڕیخوڵە ، پاشەڕۆشی لێ بەجێ دەمێنێت كە هێزی هەرسكردن نەیتوانیوە بەتەواوی هەرسی بكات ، یا بەهۆی زۆری خۆراكەوە ، یا بەهۆی گەندی خۆراكەكەوە ، یا بەهۆی خراپ ڕێكخستنی خۆراكەكانەوە ، یا بە هۆی تێكڕای ئەو هۆكارانەوە ، بەزۆری مرۆڤ توانای خۆ ڕزگارگردنی له هەندێ لەوانە نابێت ، بۆیە گەدە دەبێ بە ماڵ و شوێنی نەخۆشیەكان ، وەكو ئەوەی بەو گوفتارانەی هانی خەڵك بدات بۆ كەمكردنەوەی خۆراك و ، قەدەغەكردنی نەفس لە شوێنكەوتنی ئارەزوەكانداو ، خۆپاراستن له زێده خۆراك و پاشەڕوی زیاد ٠

بەڵام ( عادة ) واته : نەرێت ، ئەمیش وەكو سروشت وایە بۆ مرۆڤ ، بۆیە دەگوترێت : نەرێت خووی دووەمە ، كە هێزێكی گەورەیە له لەشدا ، تا ئەو ئاستەی ئەگەر شتێك بەپێی چەند جەستەیەكی نەریت جیاواز بپێورێت ، دەبینرێت بۆ هەر دانەیەكیان جیاواز دەبێ ، ئەگەرچی جەستەكان گەنجاو و ڕێكەوتوش بن لە ڕووەكانی ترەوە ، بۆ نموونە سێ جەستەی میزاج گەرم لە تەمەنی لاویدا ، یەكێكیان ڕاهێنراوە لە سەر خواردنی شتە گەرمەكان ،

دووەميان ڕاهێنراوە لە سەر خواردنی شتە ساردەکان ، سێ یەمیش ڕاهێنراوە لە خواردنی شتە ناوەندەکان ، بۆیە یەکەم : ئەگەر هەنگوێن بخوات زیانی پێ ناگەیەنێت ٠ دووەم : هەرکات بیخوات زیانی پێ دەگەینێ ٠ سێ یەمیش : بە کەمی زیانی پێ دەگەیەنێ٠ کەوابوو نەرێت پایەیەکی گەورەیە لە پاراستنی تەندروستی و ، چارەسەری نەخۆشیەکاندا ، بۆیە پێغەمبەری خو ﷺ هەموو جەستەیەکی چارەسەر دەکرد بەوەی ڕاهاتووە لە سەری لە بواری بەکارهێنانی خۆراك دەرمان و شتی تریشدا ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لەچارەسەرکردنی ئەو ژەهرەدا کە تووشی بوو لە خەیبەر لە لایەن جولەکەکانەوە :

ذَكَرَ عَبْدُ الرَّزّاقِ ، عَنْ مَعْمَرٍ ، عَنْ الزّهْرِيّ ، عَنْ عَبْدِ الرّحْمَنِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ : أَنّ امْرَأَةً يَهُودِيّةً أَهْدَتْ إلَى النّبِيّ ﷺ شَاةً مَصْلِيّةً بِخَيْبَرَ ، فَقَالَ : مَا هَذِهِ ؟ قَالَتْ هَدِيّةٌ ، وَحَذِرَتْ أَنْ تَقُولَ مِنْ الصّدَقَةِ ، فَلَا يَأْكُلُ مِنْهَا ، فَأَكَلَ النّبِيّ ﷺ وَأَكَلَ الصّحَابَةُ ، ثُمّ قَالَ : أَمْسِكُوا ، ثُمّ قَالَ لِلْمَرْأَةِ : هَلْ سَمَمْت هَذِهِ الشّاةَ ؟ قَالَتْ : مَنْ أَخْبَرَك بِهَذَا ؟ قَالَ : هَذَا الْعَظْمُ لِسَاقِهَا ، وَهُوَ فِي يَدِهِ ؟ قَالَتْ : نَعَمْ . قَالَ : لِمَ ؟ قَالَتْ : أَرَدْتُ إنْ كُنْت كَاذِبًا أَنْ يَسْتَرِيحَ مِنْك النّاسُ ، وَإِنْ كُنْت نَبِيّا لَمْ يَضُرّك ، قَالَ : فَاحْتَجَمَ النّبِيّ ﷺ ثَلَاثَةً عَلَى الْكَاهِلِ ، وَأَمَرَ أَصْحَابَهُ أَنْ يَحْتَجِمُوا فَاحْتَجَمُوا ، فَمَاتَ بَعْضُهُمْ[١٧٣] .

واتە : ( عبدالرحمن )ی کوڕی ( کعب )ی کوڕی ( مالك ) فەرموویتی : ژنێکی جولەکە لە خەیبەر مەڕێکی برژاوی دایە پێغەمبەری خوا ﷺ ، فەرمووی : ئەمە چی یە ؟ ژنەکە گوتی : دیاریەو ، وریابوو لەوەی نەڵێت خێرو صەدەقەیە ، چونکە لێی ناخوات ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لێی خواردو هاوەڵانیش لێیان خوارد ، پاشان فەرمووی : دەستهەڵگرن ، پاشان بە ژنەکەی فەرموو : ئایا مەڕەکەت ژەهراوی کردووە ؟ ژنەکەش گوتی : کێ

١٧٣ ـ صحيح : أخرجه البخاري بنحوه ( ٦ / ١٩٠ ) ٠

هـەوالّى ئەمـەى پێداى ، پێغەمبـەرى خـوا ﷺ فـەرمووى : ئـەم ئێسـكەى لاقـى ، كـە بـە دەستيەوە بوو ؟ ژنەكـە گـوتى : بـەلّىٰ ٠ پێغەمبـەرى خـوا ﷺ فـەرمووى : بۆچـى ؟ ژنەكـە گوتى : ويستم ئەگەر درۆزن بيت خەلّكى لە دەستت بحەوێنەوە ، ئەگـەر پێغەمبـەريش بيت ئەوا زيانت پىٰ ناگەيەنىٰ ، ئەو هاوەلّە بەرێزە دەفەرمێت : پاشان پێغەمبـەرى خـوا ﷺ سـىٰ كەلّەشاخى گرت لە سەر شـانى و ، فـەرمانى دايـە هاوەلّانيشـى كەلّەشـاخ بگـرن ، ئـەوانيش كەلّەشاخيان گرت ، پاشان هەنديكيان مردن ٠

لە رێگەيەكى تـرى فەرموودەكـەوە باسكراوە : كـەوا پێغەمبـەرى خـوا ﷺ لـە سـەر شـانى كەلّەشاخى گرت بەهۆى خواردنى گۆشتى مەرەكەوە ، ( أبوهند )ى خزمەتكارى ( بـني بَياضَـةَ ) لە پشتيوانان ، بە شاخ و چـەقۆى دەم پـان كەلّەشـاخى بـۆ گـرت ، دواى ئـەوە پێغەمبـەرى خوا ﷺ سىٰ سالٌ مايەوە تا ئەو ئێش و ئازارەى توش بوو كە بوبە هۆى مردنى ، دەيفـەرموو : تا ئێستا هەست بە ئازار دەكەم بە هـۆى ئـەو پاروانـەوە كـە لـە گۆشـتى مەرەكـەم خـوارد لـە رۆژى خەيبـەردا ، تـا ئـەوە بوبـە هـۆى برينـى شـاخوێنبەرم ، بۆيـە پێغەمبـەرى خـوا ﷺ بـە شەهيدى مرد ، ئەمە گوفتارى ( موسى )ى كوڕى ( عقبة )يە ٠

چارەسەرى ژەهر بەو دەرمانانە دەكرێت كە خاسيەتى بـەتالّكردن و دەرهاوێشـتنيان هەيـە ، بـەو دەرمانانـەى بەرهەلّسـتى كـارى ژەهـر دەكـەن و پـوكى دەكەنـەوەو نـايهێلّن ، يـا بـە چۆنيەتيەكانى ، يا بە خاسيەتەكانى ٠ هەركـەس ئـەو دەرمانانـەى نـەبوو ، بـا خێـرا رووبكاتـە بەتالّكردن و دەرهاوێشتنى سەتاپايى و بەسـوودترين شـتيش لـەم بـوارەدا كەلّەشـاخ گرتنـە ، بەتايبەت ئەگەر وەلّاتەكە گەرم بوو ، زەمەنيش گەرم بوو ، چونكە هێـزى ژەهـر دەچـێتە نێـو خوێنەوەو ، بەرێگاى رەگ و رێڕەوەكاندا بلّاودەبێتەوە تا بـە دلّ دەگـات ، كـە گەشـتە ئـەوىٰ مردن ڕوودەدات ، خوێن ڕاڕەوى گەيەنەرى ژەهرە بـۆ دلّ و ئەندامـەكانى ديكـە ، بۆيـە ئەگـەر كەسـى ژەهـراوى يەكسـەر دەستپێشـخەرى كـرد و خوێنەكـەى دەرهێنـا ، ئـەو چـۆنيەتيە ژەهراويەى تێكەلّيى بووە لـە گەلّيـدا دەچـێتە دەرەوە ، ئەگـەر بـەتالّكردن و دەرهاوێشـتنەكە

بەتەواویی بێت ، ئەوا چیتر ژەهەرەکە زیانی پێ ناگەیەنێ ، بەڵکو ژەهرەکە یا دەچێت و نامێنێت ، یا لاواز دەبێت و سروشتی مرۆڤی بەسەردا زاڵ دەبێ و ، کاریگەری پوك دەکاتەوە یا زۆر لاوازی دەکات ٠

## شەهیدبوونی بە ژەهرەکە :

کە پێغەمبەری خوا ﷺ کەڵەشاخی گرت ، لە سەر شانی کەڵەشاخی گرت ، کە نزیکترین شوێنێکە لە دڵەوە بتوانرێت کەڵەشاخی تێدا بگیرێت ، ئەوەبوو مادە ژەهراویەکە لە گەڵ خوێندا هاتەدەرەوە بەڵام نەك بە تەواوی ، بەڵکو لە گەڵ لاوازیونی مادەکەدا کەچی شوێنەواری هەر مایەوە ، چونکە ویستی پەروەردگار ئەوەبو پلەکانی فەزڵی هەموو بۆ تەواو بکات ، بۆیە کە خوای تعالی ویستی ئەوەی هەبوو بە شەهیدبوون رێز لە پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ بنێت ، بۆیە کاریگەری شوێنەواری ژەهرەکە لە خوێنیدا دوبارە دەرکەوتەوە ، بۆ ئەوەی خوای تعالی کارێك بەدیبهێنێت کە هەر بەدی دێت ، وە نهێنی گوفتاری خوای تعالی بەرامبەر بە دوژمنەکانی لە جولەکە دەرکەوت کە دەفەرمێت :﴿ أَفَكُلَّمَا جَاءَكُمْ رَسُولٌ بِمَا لا تَهْوَى أَنْفُسُكُمُ اسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًاكَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴾ [ البقرة : ٨٧ ]واتە : ﴿ أَفَكُلَّمَا جَاءَكُمْ رَسُولٌ ﴾ جا هەر کاتێ پێغەمبەرێکتان بۆ بهاتایە ﴿ بِمَا لا تَهْوَى أَنْفُسُكُمُ ﴾ بە جۆرێك کە رێکی ئارەزوتان نەبوایە ﴿ اسْتَكْبَرْتُمْ ﴾ لووت بەرزبوون و خۆتان بەگەورە گرتووە ﴿ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ ﴾ جا دەستەیەکتان ( لە پێغەمبەران ) بەدرۆ زانیوە ﴿ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴾ وە دەستەیەکتان کوشتوون[١٧٤] ٠ لەم ئایەتەدا خوای پەروەردگار ووشەی ( كَذَّبْتُمْ )ی بە شێوازی فرمانی رابردوو باسکردووە کە ئاشکرایە بێباوەڕان بەدرۆیان زانی و بەرهەڵستیشیان کردو ، هەموو ئەوانەش رویدا ، وە ووشەی ﴿ تَقْتُلُونَ ﴾یشی بە شێوازی فرمانی داهاتوو باسکردووە کە چاوەڕوانی ڕودانی کوشتنی بوون ، والله أعلم ٠

---

١٧٤ ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەركردنی ئەو جادووەدا كە جولەكەكان جادویان لێكرد :

دەستەیك نكۆڵی لەوە دەكەن كە جولەكەكان جادویان لە پێغەمبەری خوا ﷺ كردبێ و ، دەڵێن : ئەمە بۆ ئەو شیاو نی یەو ، واگومان دەبەن كەموكوڕی وعەیبە ، بەڵام شتەكە ئاوەها نی یە وەكو بانگەشەی بۆ دەكەن ، بەڵكو لە ڕەگەزی ئەو نەخۆشی و ئێش و ئازارانەیە كە تووشی دەبوو ، نەخۆشیەكە لە نەخۆشیەكان ، توشبوونی بە جادوو بە هاوشێوەی تووشبونیەتی بە ژەهرەكە هیچ جیاوازیەكیان لە نیواندا نی یە ٠

وقد ثبت في الصحيحين عَنْ عَائِشَةَ _ رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا _ أَنّهَا قَالَتْ : سُحِرَ رسول الله ﷺ حَتّى إنْ كَانَ لَيُخَيّلُ إلَيْهِ أَنّهُ يَأْتِي نِسَاءَهُ ، وَلَمْ يَأْتِهِنّ ، وَذَلِكَ أَشَدّ مَا يَكُونُ مِنْ السّحْرِ[١٧٥] .

واتە : لە خاتوو ( عائشة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : جادووكرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ تا ئەو ئاستەی وای بە خەیاڵدا دەهات چوّتە لای خێزانەكانی و ، نەشچوبوە لایان ، ئەوەش توندترین جۆرەكانی جادووە ٠

پێشەوا ( القاضي عياض ) دەفەرمێت : جادوو نەخۆشیەكە لە نەخۆشیەكان ، شیاوە تووشی ببێت وەكو هەموو جۆرە نەخۆشیەكانی تر ، نكۆڵیی لێناكرێت و ، پێغەمبەرایەتیشی لەكەدار ناكات ، بەڵام سەبارەت بەوەی وای خەیاڵ دەكرد كە كارێك دەكات و نەشیكردبوو ، لەمەدا هیچ نیەت و نیازێكی دیكە تێكەڵ بە ڕاستگۆیەكەی نابێ ، چونكە لەم بارەوە بەڵگەو ( الإجماع ) جێگیرن لە سەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ سیفەتی پارێزراوی ( العصمة ) لەلایەن

---

١٧٥ _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٤ / ١٢٣ ، ١٤٨ ) ، ( ٧ / ١٧٦ ، ١٧٧ ، ١٧٨ ) ، ( ٨ / ٢٢ ، ١٠٣ ) ، ومسلم ( ٧ / ١٤ ) ٠

خواى پەروەردگارەوە پێدراوە ، بەڵكو ئەمە بەشياو دادەنرێت بۆ ئەوەى كە تووشى دەبێت لە بوارى شتگەلێكى دونيايدا كە ئەمە هۆكارى ناردنى نى يە ، هيچ فەزڵكيشى پێنەدراوە لەبەر دونيا ، بۆيە وەكو هەموو مرۆڤايەتى تووشى بەڵاو ناڕەحەتيەكان دەبێت و، بە دوريش دانانرێت خەيالى شتێكى كردبێت كە حەقيقەتى نەبێت ، پاشانيش لابچێت وەكو جاران ٠

## چارەسەركردنى جادوو :

مەبەستيش : باسكردنى ڕێبازى پێغەمبەرى خوايە ﷺ لە چارەسەركردنى ئەم نەخۆشيەدا ، لەم بارەوە دوو جۆر چارەسەرى لێوە باسكراوە :

يەكەميان : _ كە لە هەمووى گرنگترە _ دەرهێنان و پوچكردنەوەى جادوەكەيە ، وەكو ئەوەى بە ( صحيح )ى لە پێغەمبەرى خواوە ﷺ باسكراوە كەوا لە پەروەردگارى خۆى پرسى و ، ڕێى پيشاندرا ٠ ئەوەبوو هەستاو جادووەكەى لەو بيرە دەرهێنا ، جادووەكەش لە شانەو هەندێ لە تاڵە مووەكانى پێغەمبەرى خوا ﷺ دروست كرابوو ، كەلە سەرو ڕيشى كەوتبوونە خوارەوە ، لە كاتى داهێناندا ، هەمووى خستبوونە نێو پەردەيەكى تايبەتەوە كە بە سەر چرووزو هەڵاڵەكانى دارەخورووەيە ، كە دەريهێنان ، ئەو جادووەى كە توشى بوبو نەماو لاچوو ، وەكو ئەوەى لە پێوەندێك ئازاد كرابێ ، كەوابوو ئەمە لە گرنگترين ئەو شتانەيە كە كەسى جادولێكراوى پێ چارەسەر دەكرێت ، ئەمەش لە پلەدا وەكو لابردنى مادە پيسەكانە لەجەستە بە ڕێگاى بەتاڵكردن و دەرهاوێشتن ٠

دووەم : دەرهاوێشتن لەو جێگەيەى كە زيانى جادووەكەى پێگەشتووە ، چونكە جادوو كاريگەرى خۆى لە سروشتى مرۆڤ و ، هەڵچونى تێكەڵاوەكانى و ، شڵژانى ميزاجى هەيە ، ئەگەر شوێنەوارى لە ئەندامێكدا بەدەركەوت و ، توانرا مادە گەندەكە لەو ئەندامەدا بە ڕێگاى دەرهاوێشتن بكرێتە دەرەوە ، سوودى زۆر دەبەخشێت٠ ( أبوعبيد ) لە كتێبى ( غريب

الحديث )دا دەڵێت : لە ( عبدالرحمن )ی کوڕی ( أبي ليلی )وە دەفەرمێت : پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ جادووی لێکرا بە شاخێك سەری ڕووشێنراو کەڵەشاخی گرت ٠

زۆرێك لە کەسانی کەم زانست ئەمەیان بەلاوە ئاڵۆزبوەو ، دەڵێن : کەڵەشاخ و جادوو چ پەیوەندیەکیان پێکەوە هەیە ؟ پەیوەندی لە نێوان ئەم نەخۆشیەو ئەو دەرمانەدا چی یە ؟ ئەمانە ئەگەر پزیشکانێکی وەکو ( أبقراط ) ، یا ( ابن سینا ) ، یا کەسانی تر ئەو چارەسەریەیان داڕێژایە ، زۆر بەقبوڵبوون و ملکەچیەوە پێشوازان لێدەکردو ، دەیانگووت : پزیشکانێك دایانڕێژاوە گومان لە زانست و فەزڵیاندا نی یە ٠

بزانە مادەی ئەو جادووەی کە تووشی پێغەمبەی خوابوو ﷺ گەشتە سەری ، گەشتە یەکێکی ئەو هێزانەی تیایدا بوو ، بە جۆرێك وای بە خەیاڵ دەهات شتێك دەکات بەڵام نەشیکردبوو ، ئەمەش ئەو کردارەیە کەوا جادوکار تەصروف بە سروشت و مادە خوێنێکەوە دەکات ، بەجۆرێك ئەو مادەیە بەسەر ناوەوەی پێشەوەی سەری پێغەمبەری خوادا زاڵ بوو ، میزاجی لە سروشتە بنەڕەتەکەی خۆی گۆڕی ٠

**جادوو :** پێکهاتووە لە کاریگەری ڕوحە خراپە زیانبەخشەکان و ، کاردانەوەی هێزە سروشتیەکانی مرۆڤ بەرامبەری ، ئەمەش بە جادووی ( التمريحات ) ناودەبرێت ، کە توندترین جۆرەکانی جادووە ، بە تایبەت بۆ ئەو جێگەیەی لەشی مرۆڤ کە جادووەکەی تێدایە ، بۆیە کەڵەشاخ گرتن لەم جێگەیەدا کە زیانی پێگەشتووە بە هۆی جادووەکەوە بە سوودترین چارەسەرەکانە ئەگەر بە پێی ئەو یاسایەی کە پێویستە بەکارهێنرا ٠

( أبقراط ) دەڵێت : ئەو شتانەی کە پێویستە بکرێتە دەروە ، پێویستە لەو جێگایانەدا دەربهێنرێت ، کە شیاوە بۆ ئەوەی شتەکانی بکرێتە دەرەوە ٠

كۆمەڵێكی خەڵكی تریش دەڵێن : كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ تووشی ئەم نەخۆشیە بوو ، وای بە خەیاڵدا دەهات شتێكی كردوەو نەشیكردبوو ، وای دەزانی ئەوە بەهۆی مادەیەكی خوێنیەوە تووشی بووە كە بەرەوە لای مێشكی چووەو ، بەسەر بەشی سكی پێشەوەی مێشكیدا زاڵ بووە ، میزاجی لە سەر باری سروشتی خۆی نەهێشتووە ، بۆ ئەم بارە بەكارهێنانی كەڵەشاخ لە گرنگترین دەرمانەكان و ، بەسوودترین چارەسەرەكان بوو ، ئەوەبوو كەڵەشاخی گرت ، بەڵام ئەمە پێش ئەوەبوو كە خوای تعالی سروشی بۆ دابەزێنێت و پێی ڕاگەیەنێت ئەو باروحاڵەتە بەهۆی جادۆوە تووش بووە ، بۆیە كاتێ سرووشی بۆ دابەزاندو ، پێی ڕاگەیاند جادووی لێكراوە ، دەستی لەوە هەڵگرت و چارەسەری حەقیقی بەكارهێنا كە بریتی بوو لە دەرهێنانی جادووەكەو پووچكردنەوەی ، ئەوەبوو لە پەروەردگاری خۆی پرسی و ، خوای پەروەردگاریش شوینەكەی پێشانداو ، دەریهێنا ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا وەكو ئەوەی لە پێوەندێك ئازاد كرابێ ، لە ڕاستیدا جادووەكە لە جەستەو ، ئەندامە ئاشكەراو دیارەكانیدا بوو ، نەك لە ئەقڵی و دڵیدا ، بۆیە باوەڕی بەڕاستێتی ئەو خەیاڵانەی خۆی نەبوو كەوا دەچێتە لای خێزانەكانیی ، بەڵكو دەیزانی تەنها خەیاڵەو حەقیقەت نی یە ، شتی وەكو ئەمەش زۆرجار لە ئەنجامی چەند نەخۆشیەكەوە ڕوودەدات ٠ والله أعلم ٠

## بەشێك : سەبارەت بەوەی كە دەرمانە ئیلاهیەكان بەسوودترین چارەسەریەكانی جادووە :

بەسوودترین چارەسەریەكانی جادوو دەرمانە ئیلاهیەكانە ، بەڵكو چارەسەری تایبەتی جادووە ، چونكە جادوو لە ڕاستیدا كاریگەری ڕووحە پیسە زیانبەخشەكانی دونیایە ، دورخستنەوەی ئەو كاریگەریانەش بە چارەسەرگەلێك دەبێت كە بەرهەڵستی بكات و بەرگریی بكات ، وەكو زیكرەكان و ، ئایەتەكانی قورئان و ، ئەو نزاو پاڕانەوانەی كە كارو كاریگەریەكانی پوچ دەكاتەوە ، چەندیش ئەو نزایانە بەهێزو توندتر بێت ، ئەمەندە

كارتێكردنی نوشته‌كه به‌هێزتر ده‌بێت ، نموونه‌ی ئه‌مه‌ش وه‌كو دوو سوپایه ، هه‌ر دانه‌یه‌كیان چه‌ك و كه‌رسته‌ی خۆی پێیه ، ڕوو به‌ ڕووی یه‌كتر ده‌بنه‌وه ، هه‌ریه‌كێكیان زاڵ بوو به‌سه‌ر ئه‌ویتردا ده‌یشكێنێت و ، ده‌سته‌ڵات و حوكم هی خۆی ده‌بێ ، كه‌واته‌ ئه‌گه‌ر دڵ پڕ بێت له‌ خواو نقوومی زیكره‌كانی بێت ، به‌رده‌وام ویردێكی هه‌مه‌ ڕۆژه‌ی هه‌بێت له‌ ڕووكردنه‌ په‌روه‌ردگارو ، نزاو دوعاكان و ، زیكره‌كان و ، په‌ناگرتن به‌خوا به‌ خوێندنی سوره‌ته‌كانی ( الفلق ) و ( الناس )و هه‌موو په‌ناگرتنه‌كانی تر ، به‌ جۆرێك ئه‌و په‌یمانه‌ی له‌ گه‌ڵ خوای خۆیدا داویه‌تی نه‌یشكێنێت و ، له‌و كاته‌دا دڵ و زمانی چونیه‌ك بن ، هه‌موو ئه‌وانه‌ ده‌بن به‌ هۆكارێكی كاریگه‌ر بۆ تووش نه‌بوونیی به‌ جادوو ، گه‌وره‌ترین چاره‌سه‌ره‌كانیش ده‌بن دوای تووشبوونی به‌ جادوو ٠

سه‌باره‌ت به‌ جادوبازانیش : له‌ ڕاستیدا جادوكه‌یان كاریگه‌ری ته‌واوی خۆی ده‌بێت له‌ سه‌ر دڵه‌ لاوازه‌كان و ، نه‌فسه‌ به‌ ئاره‌زووه‌كان ، ئه‌وانه‌ی دڵیان په‌یوه‌سته‌ به‌ شته‌ دونیایه‌كانه‌وه‌ ، بۆیه‌ به‌ زۆری كار له‌ ژنان و ، منداڵان و ، نه‌فامان و ، ده‌شته‌كیه‌كان و ، ئه‌وانه‌ش كه‌ لایه‌نی ئاینیان لاوازه‌و ، ئه‌وانه‌ش كه‌ پشت به‌ستنی ته‌واو و ، یه‌كتا په‌رستیان نی یه‌ و ، ئه‌وانه‌ش كه‌ ویردی ڕۆژانه‌ی وه‌كو نزاو ، په‌ناگرتنیان نی یه‌ به‌خوای تعالى٠

به‌گشتی سوڵتانی كاریگه‌ریی به‌ سه‌ر دڵه‌ لاوازه‌كاندایه‌ ، ئه‌وانه‌ی هه‌واداریی خۆشیه‌كانی دونیان ، ده‌ڵێن : كه‌سی جادولێكراو خۆی یارمه‌تیده‌ره‌ بۆ تووشبوون به‌ جادوو ، ئێمه‌ ته‌ماشای دڵیی ده‌كه‌ین كه‌ په‌یوه‌سته‌ به‌ شتێكه‌وه‌و زۆر ئاوڕی لێده‌داته‌وه‌ ٠ بۆیه‌ ده‌ست به‌سه‌ر دڵیدا ده‌گرین به‌هۆی ئه‌و بێئاگایی و ئاوڕدانه‌وه‌یه‌ی كه‌ بۆ شته‌ دونیایه‌كان هه‌یه‌تی ، ڕوحه‌ پیسه‌ زیانبه‌خشه‌كانیش له‌ ڕاستیدا زاڵ ده‌بن به‌ سه‌ر دڵانێكدا ئاماده‌ی قبوڵبوونی ئه‌و زاڵبونه‌یه‌ ، چونكه‌ هه‌واداری شتگه‌لێكی دونیایه‌ كه‌ گونجاوی ئه‌و ڕوحه‌ پیسه‌ زیانبه‌خشانه‌ن و ، هیچ هێزێكی ئیلاهی تێدا نه‌ماوه‌و ، هیچ كه‌رسته‌یه‌كیشی به‌ده‌سته‌وه‌ نی یه‌ بتوانێ به‌رامبه‌ریان بجه‌نگێ ، بۆیه‌ ته‌ماشای ده‌كا چۆڵه‌و هیچ كه‌ره‌سته‌یه‌كی تیدا نی یه‌و ،

هەواداریشە بۆ ئەوەی گونجاوی خۆیەتی ، بۆیە دەستی بە سەردا دەگرێت و ، بە جادوو شتی تریش کاری خۆی تێدەکات · والله أعلم ·

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەرهاوێشتن و کردنە دەرەوەی مادەکاندا بە ڕشانەوە :

روى الترمذيُّ في جامعه عن مَعدان بن أبي طلحة ، عن أبي الدرداء : أنَّ النبي ﷺ قاءَ ، فتوضَّأ فلقيتُ ثَوْبان في مسجد دِمَشق ، فذكرتُ له ذلك ، فقال : صَدَقَ ، أنا صَبَبْتُ له وَضُوءَه[176] ·

واتە : لە ( مَعدان )ی کوڕی ( أبي طلحة )ەوە ، لە ( أبي الدرداء )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ ڕشایەوە ، دەستنوێژی گرتەوە ، ( مَعدان ) فەرمووی : لە مزگەوتی دیمەشقدا چاوم بە ( ثَوْبان ) کەوت و ، ئەمەم بۆ باسکرد ، فەرمووی : ڕاستی فەرمووە ، من ئاوی دەستنوێژەکەم بە دەستیدا کرد ·

**ڕشانەوە** : یەکێکە لە پێنج ڕێگەکانی دەرهاوێشتن ، کە بنەڕەتن بۆ دەرهاوێشتن و بریتین لە : ڕەوانکردن و ، ڕشانەوەو ، دەرهێنانی خوێن و ، چونە دەرەوەی هەڵم و ، ئارەق کردن ، کە سوونەتیان لە بارەوە هاتووە

**سەبارەت بە ڕەوان کردن** : پێشتر ئاماژەمان پێداوە لە فەرموودەی (( خیرُ ما تداویتم بم المَشِيُّ )) هەروەها لە فەرموودەی ( السَّنا )دا ·

**سەبارەت بە دەرهێنانی خوێن** : پێشتر لە فەرموودەکانی کەڵەشاخ گرتندا باسمان کردووە.

---

١٧٦ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٦ / ٤٤٣ ) ، والدارمي ( ١٧٣٥ ) ، وأبوداود ( ٢٣٨١ ) ، والترمذي ( ٨٧ ) ، وابن خزيمة ( ١٩٥٦ ) ·

**سەبارەت بە دەهاوێشتنی هەڵمەکان** : دواى ئەم بەشە باسی دەکەین إن شاء الله ٠

بەڵام دەرهاوێشتنی مادده پیسەکانی جەستە بە ئارەق کردنەوە : بەزۆری بەبێ ئەوەی مەبەستی مرۆڤی لە گەڵدا بێت خۆی دێتە دەرەوە ، چونکە سروشتی جەستە پاڵی پێوە دەنێت بۆ رووکاری دەرەوەو ، ڕێکەوتنی کونیلە کراوەکان دەکات و ، لێی دێتە دەرەوە ٠

ڕشانەوە دەرهاوێشتنێکە لە سەرەوەی گەدەوە ، حوقنەش دەرهاوێشتنێکە لە ژێرەوەی گەدەوە ، دەرمانیش لە سەرەوەو ژێرەوە دەکرێت ٠

ڕشانەوەش دوو جۆرە : جۆرێك بە زاڵبوون و هەڵچوون ، جۆرێکیش بە داوا کردن و خۆڕشانەوە ٠

شیاو نی یە ڕشانەوە ڕاگیرێت و بگێڕدرێتەوە ، مەگەر لە ڕادە بچێتە دەرەوەو ئەو مرۆڤە زۆر زۆر بڕشێتەوەو ترسی لەناوچوونی مرۆڤەکەی لێبکرێت ، ئەوکاتە دەوەستێنرێت بەو شتانەی توانای وەستاندنی ڕشانەوەکەی هەیە ٠

بەسوودترین ڕشانەوە لە کاتی پێویستیدایە ئەگەر کات و مەرجەکانی ڕەچاو بکرێت ٠

**هۆکارەکانی ڕشانەوەش دەن :**

**یەکەمیان** : زاڵبوونی ( المِرَّة الصفراء ) ، کە سەر گەدە دەکەوێت و ، داوای هاتنە دەرەوە دەکات ٠

**دووەم** : بەزاڵبوونی بەڵغەمێکی لینج کە لە گەدەدا جوڵاوەتەوەو ، داوای هاتنە دەرەوە دەکات ٠

**سێ یەم** : پێدەچی بە هۆی لاوازبوونی خودی گەدەوە بێت ، بۆیە خواردنەکە هەرس ناکات و ، بۆ لای سەرەوەدا فرێی دەدات ٠

**چوارەم** : پێدەچێ تێکەڵاوێکی گەندی تێکەڵ ببێت و بڕژێتە نێوی ، لەبەر ئەوە هەرسکردنی خراپ دەبێت و ، کاری لاواز دەبێ ٠

**پێنجەم** : خواردن و خواردنەوەی زۆر دەخورێت بە ئاستێك لە ئەندازەی بەرگەکرتنی گەدە دەچێتە دەرەوە ، توانای گرتنی نابێت و ، داوای پاڵ پێوەنان و فرێدانی دەکات ٠

**شەشەم** : ئەو خواردن و خواردنەوانەی دەخورێت گونجاوی نابن و ، حەزی پێ نابێت ، بۆیە داوای پاڵ پێوەنان و فرێدانی دەکات ٠

**حەوتەم** : هەندێ مادەی تێدا دروست دەبێت خواردنەکان بە چۆنیەتی و سروشتی هەڵدەچێنێت و ، فرێی دەداتە دەروە ٠

**هەشتەم** : دڵ تێکهەڵهاتن ، کە هۆکاری دروستبوونی دڵ بەیەکدا هاتن و هێڵنج دانە ٠

**نۆیەم** : بەهۆی نەخۆشیە نەفسیەکانەوە ، وەکو خەم و خەفتی توندو ، خەمباربوون ، کە هێزە سروشتیەکانی مرۆڤی پێوە خەرێك دەبێت و ، گرنگی بە ڕوودانی ئەمانە دەدات و ئاوڕ لە چارەسازی جەستەو ، چاککردنی خۆراك و ، پێگەیاندنی و ، هەرسکردنی ناداتەوە ، بۆیە گەدەش فرێی دەداتە دەرەوە ، پێدەچێ بەهۆی جوڵانەوەی تێکەڵاوەکانیشەوە بێت لەکاتی تێکچونی نەفسدا ، چونکە هەر یەکێکیان کاردانەوەی بەرامبەر بە ئەویتر دەبێت و ، کار لە چۆنیەتی دەکات ٠

**دەیەم** : سروشت دەگوازێتەوە ، بەوەی کەسێك یەکێکی دیکە دەبینێت دەڕشێتەوە ، ئەویش ڕشانەوەی بە سەردا زاڵ دەبێت بەبێ داواکردن و خۆ ڕشانەوە ، چونکە سروشتیش گوێزەرەوەیە ٠

**پێشەوا ( ابن القیم ) دەفەرمێت** : پزیشکێکی بەسەلیقە پێی ڕاگەیاندم و گووتی : کوڕ خوشکێکم هەبوو زۆر لێهاتوبوو لە چاو ڕشتندا ، بۆیە دانیشت و چاوی بۆ خەڵك دەرشت ، بەڵام ئەگەر پیاوێك چاوئێشەی هەبوایەو بیبینیایەو بۆیی بڕشتایە ، دەسبەجێ خۆشی تووشی چاوئێشە دەبوو ، ئەوەشی چەندین جار لێ دوبارە بویەوە ، بۆیە دەستی لێهەڵگرت و ازی هێنا ٠ منیش پێم گووت : هۆکاری وازهێنانت چ بوو ؟ پێی گوتم : گواستنەوەی سروشت ، چونکە گوێزەرەوەیەو نەخۆشیەکان دەگوێزێتەوە ، هەروەها هەمان پزیشك بۆی باسکردم و گوتی : یەکێکی تریش دەناسم ، ئەگەر دومەڵێکی بە جێگەیەکی مرۆڤەوە ببینیایە ، هەمان جێگەی جەستەی خۆی دەخوراند ، تا دومەڵێکی لێ دەدەهات ٠

دەڵێم _ ( ابن القیم ) _ هەموو ئەمانە دەبێ سروشتی بۆ ئامادە بێت ، بەدڵنیایی ئەو مادەیەش لەو جێگەیەدا وەستاوەو ناجوڵێتەوە ، بەڵام هۆیەك لە هۆکان دەیجوڵێنێت ، بۆیە ئەمانە هۆکارن بۆ جوڵاندنی مادەکە نەك هۆکاری دروستبونی بێ ٠

## بەشێك : سەبارەت بەوەی ڕشانەوە لە وڵاتە گەرمەکاندا بەسوودەو ، ڕەوانبونیش لە وڵاتە ساردەکاندا :

لەبەر ئەوەی دانیشتوانی وڵاتە گەرمەکان و ، زەمەنە گەرمەکان تێکەڵاویان تەنك و ناسك دەبێتەوەو ، ڕادەکێشرێت بۆ سەرەوە ، بۆیە ڕشانەوەی بۆ بەسوود دەبێت ، بەڵام لەبەر ئەوەی لە زەمەنە ساردەکان و وڵاتەکاندا ساردەکاندا چڕەو ڕاکێشانی بەرەو سەرەوە قورسە ، بۆیە دەرهاوێشتنی خەڵتەکان بە ڕەوانکرن سوودی زۆری بۆ دەبێت ٠

لادانـى خەڵتـەكان و دوورخسـتنەوەيان بەڕاكێشـان و دەهاوێشـتن دەبێـت ، ڕاكێشـان لـە دوورتـرين ڕێگەكانـەوە دەبێـت و ، دەرهاوێشـنيش لـە نزيكترينـەوە ، جيـاوازى نێوانيشـيان ئەوەيە كە ئەگەر مادە لە كاردا بێت بـۆ تێـڕژان يـا بـۆ بەرزبونـەوە ئـەوا سـەقامگير نـى يـەو ، پێويستى بە ڕاكێشانە ، بۆيە ئەگەر مادەكە لە جەستەدا سيفەتى بەرزبوونـەوەى هـەبێت و لـە ژێرەوە بۆ سەروە بچێت ، ئەوا هەر لە ژێرەوە ڕادەكێشرێت و دەرەكرێتە دەرەوەى جەسـتە و ، ئەگەر سيفەتى تێڕژانيشى هەبێت و لە سەرەوەى جەستەوە بۆ خوارەوە بچێت ئەوا هـەر لـە سـەرەوەوە ڕادەكێشـرێت ، بـەڵام ئەگـەر سـەقامگيربوو لـە جێگەكەيـدا ، لـە ڕێگەيەكـەوە ڕادكێشرێت زۆر نزيكيى بێت ، بۆيە هەركات مادەكە زيانى بـە ئەندامـەكانى سـەرەوە گەيانـد ، لـە ژێـرەوە ڕادەكێشـرێت ، هـەركاتيش زيـانى بـە ئەندامـەكانى ژێـرەوە گەيانـد ، لـە سـەروە ڕادەكێشـرێت ، هـەركاتيش سـەقامگيربوو ، لـە نـزيكترين جێگـەوە ڕادەكێشـرێت ، بۆيـە پێغەمبـەرى خـوا ﷺ جارێـك كەڵەشـاخى لـە سـەر شـانى گـرت و ، جـارێكيش لـە سـەرى و ، جارێكيش لەسەر پێى ، چونكە مادە خوێنيە زيانبەخشەكەى ڕادەكێشا لە نزيكترين شـوێنەوە ، والله أعلم .

## بەشێك : سەبارەت بە سوودەكانى ڕشانەوە :

ڕشانەوە گەدە پاك دەكاتەوەو بەهێزى دەكات ، چاو تيژ دەكات ، قورسى سەر ناهێڵێـت ، بەسوودە بۆ برينەكانى گورچيلەو ، ميزڵدان و ، نەخۆشـيە درێژخايەنـەكان : وەكـو گـوليى و ، ئاوبەنگ و ، ئيفليجى و ، لەرزين ، هەروەها بۆ زەردووى ( اليرقان ) بەسوودە .

پێويستە كەسى تەندروست لە مانگێكدا دووجارى يەك لە دواى يەك ڕشانەوە بـەكار بێنێـت ، بەبێ پاراستنى كاتى دياريكراو ، بۆ ئەوەى دووەم فرياى كەموكورتيەكانى يەكەم بكـەوێت و چـاكى بكاتـەوەو ، ئـەو پاشـەڕۆيانەش بكاتـە دەرەوە كـە بـەهۆى ئـەوەوە تێـڕژاون ، زۆر بەكارهێنانيشى زيان بە گەدە دەگەيەنێت ، واى لێدەكات گونجاو بێت بۆ زێدە پاشماوەكـان ،

زیان بـه ددان و چـاو گـویٚ دەگەیـەنێت ، ڕەنگـە هەنـدیٚ لـە خوێنبـەرەکانیش بقلیشـێنێت ، پێویستە ئەو کەسانەی ئاوسانێکیان لە گەروودا هەیە ، سنگیان لاوازە ، یا ملیـان باریکـە ، یـا ئامادەی خوێن فرێدانن ، ، خۆیان لە ڕشانەوە بەدوور بگرن ٠

بەڵام ئەو کارەی زۆرێك لە خەڵك ئەنجامی دەدەن و بـە چارەسـازیەکی خـراپیش دانـراوە ، هەڵدەستن بـە پڕکردنـی ورگیـان لـە خواردەمـەنی و ، پاشـان فرێـی دەدەنـە دەرەوە ، ئەمـە چەندین بەڵای تێدایە وەکو : پیربوون پێش دەخات ، ئەو کەسە تووش بـە چـەندین نەخۆشـی دەکات ، ڕشانەوە دەکات بە نەریتێکی بەردەوامی ، ڕشـانەوە لـە گـەڵ ووشـکێتی جەسـتەو ، لاوازی هەناودا ، سك لاوازو نەرم دەکـات ، یـا هـە نـەبیٚ لاوازبـوونی ئـەو کەسـەی دەڕشـێتەوە مەترسیدارە ٠

## باشترین کاتەکانی و چۆنیەتی ئەنجامدانی :

باشترین کاتەکانیشی هاوین و بەهارە بەبیٚ زستان و پایز ، پێویسـتە لـەکاتی ڕشانەوەشـدا چاوەکانی ببەستێتەوە ، سکی ببەستێت ، کاتیٚ تەواویش دەبێت دەم و چاوی بە ئاوی سـارد بشوات و ئینجا شەربەتی سێو ( شراب التفاح )بخواتەوە لە گەڵ کەمێك لە( المُصْطكَي )و(١٧٧) ، ئاوی گوڵیش ( ماء الورد ) سودێکی ئاشکەرای پێدەگەیەنێت ٠

---

١٧٧ ـ المصطكي : درەختێکی هەمیشە سەوزەو ، بەرێکی سوری تاڵی هەیە ، ئەم درەختە بچوکە لە ناچەکانی دەریای ناوەڕاستدا دەڕوێت ، بنێشتێکی تایبەتی لیٚ دەردەهێنرێت ، لە ساڵێکدا سیٚ جار دەردەهێنرێت واتە سیٚ بەرهەم دەدات : بەرهەمی یەکەم مەیلی سپێتی دەکات و خۆشترین و چاکترین جۆریەتی ، بەرهەمی دووەم زەردێکی بێگەردو خەوشەو ، بەرهەمی کۆتاش خۆڵەمێشیە ، بڕوانە : ٠ http://www.tbeeb.net

ڕشانەوە لە سەرەوەی گەدەوە دەکرێتە دەرەوەو ، لە ژێرەوە ڕادەکێشرێت ، ڕوانبونیش بە پێچەوانەوەیە ٠ ( أبقراط ) دەڵێت : پێویستە لە هاویندا دەرهاوێشتن لە سەرەوە بکرێت بە ئەندازەیەکی زیاتر لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ دەرهاوێشتن ، لە زستانیشدا دەرهاوێشتن لە ژێرەوە بکرێت ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕێنمایی کردندا بۆ چارەسەر وەرگرتن لە بەسەلیقەترین پزیشکەوە :

ذَكَرَ مَالكٌ فِي " مُوَطّئِه " : عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ، أَنّ رَجُلًا فِي زَمَانِ رَسُولِ اللّه ﷺ أَصَابَهُ جُرْحٌ ، فَاحْتَقَنَ الْجُرْحُ الدّمَ ، وَأَنّ الرّجُلَ دَعَا رَجُلَيْنِ مِنْ بَنِي أَنْمَارٍ ، فَنَظَرَا إلَيْهِ فَزَعَمَا أَنّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ قَالَ لَهُمَا : " أَيّكُمَا أَطَبّ ؟ فَقَالَ أَوَ فِي الطّبّ خَيْرٌ يَا رَسُولَ اللّهِ ؟ فَقَالَ أَنْزَلَ الدّوَاءَ الّذِي أَنْزَلَ الدّاءَ ٠

واتە :ئیمامی ( مالك ) لە ( موطأ )ەکەیدا : لە ( زید )ی کوڕی ( أسلم )ەوە دەگێڕێتەوە ، کەوا پیاوێك لە زەمانی پێغەمبەری خوادا ﷺ تووشی برینێك بوو ، برینەکە خوێنی تیزا ٠ پیاوەکە بانگی دوو پیاوی لە هۆزی ( بني أنمار ) کردو ، تەماشای برینەکەیان بۆ کردو واشیان ڕاگەیاند کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ، پێی فەرموون : کامتان پزیشکترە ؟ ئەوانیش گوتیان : ئایا پزیشکیتی خەیری تێدایە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی : ئەو کەسەی نەخۆشیەکەی دابەزاندووە دەرمانەکەشی دابەزاندووە ٠

لەم فەرموودەیدا ڕوون دەبێتەوە کە بۆ هەموو زانست و پیشەسازیەك پیویستە داوای یارمەتی لە بەسەلیقەترین کەسی ئەم بوارە بکرێت و ، ئەگەر نەبوو پاشان لە کەسێکی بەسەلیقەی تر ، چونکە کەسی بەسەلیقە لە پێکانەوە نزیکە ٠

هەر بەو شێوەش پێویستە ئەو کەسەی داوای فەتوایەك دەکات سەبارەت بەو شتەی تووشی بووە ، داوای یارمەتی لە زاناترین کەس بکات ، ئەگەر نەبوو لە زانایەکی تر ، چونکە زاناترین کەس لە پێکانەوە نزیکترە بە بەراوردی کەسێکی تری خواری خۆی ٠

هەر بەو شێوەش ئەو کەسەی قیبلەی لێ نادیار بووە ، هەڵدەستێت بە لاسایکردنەوەی زاناترین کەس کە چاوی پێ دەکەوێ ، هەر لە سەر ئەم شتە خوای تعالی بەندەکانی خوڵقاندووە ، هەروەها کەسی موسافیر لە دەشت و دەریادا پشت بەوە دەستێت کە دڵی پێی شادومان دەبێت و ، دڵنیاش دەبێت سەبارەت بە چاکترین یەکێك لە دوو بەڵگەکەو ڕاسترینیان ، بۆ دەچێت و ، پشتی پێ دەبەستێت ، چونکە شەریعەت و فیترەت و ئەقڵ لە سەر ئەمە ڕێکەوتون ٠

فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ (( أنزل الدواء الذي أنزل الداء )) فەرمایشتی تری بەو هاوشێوە لە زۆر فەرموودەی دیکەدا باسکراوە وەکو ئەوەی کە ( هِلال )ی کوڕی ( یساف ) _ خوای لێ ڕازی بێت _فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەردانی نەخۆشێك و ، فەرمووی : بنێرن بە شوێن پزیشکێکدا ، کەسێکیش گووتی : تۆی وادەڵێی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی : بەڵێ ، خوای _ عزَّوجلَّ _ هەر نەخۆشیەکی دابەزاندبێت دەرمانێکیشی بۆ دابەزاندووە ٠

وَفِي " الصَّحِيحَيْنِ " مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ يَرْفَعُهُ : مَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنْ دَاءٍ إِلَّا أَنْزَلَ لَهُ شِفَاءً[١٧٨] .

واتە: لە ( أبي هريرة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : خوای تعالی هەر نەخۆشیەکی دابەزاندبێت شیفاکەشی دابەزاندووە ٠

١٧٨ _ سبق تخريجه ٠

خەڵکیش جیاوازبوون سەبارەت بە مانای ( أنزل الداء والدواء ) ، دەستەیەك دەڵێن : كە فەرموویەتی : ( أنزل ) واتە : دابیەزاند ، واتە : تەنها بەندەكانی لیێ ئاگاداركردۆتەوەو ، هیچی تر ، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی داوە بە دابەزینی گشتی بۆ هەموو نەخۆشی و دەرمانیك و ، زۆربەی خەڵكیش ئەوە نازانن ، بۆیە فەرموویەتی : (( ئەو كەسەی زانی زانی و ، ئەو كەسەش نەیزانی نەیزانی )) ٠

دەستەیەكیش دەڵێن : ( إنزالهما ) : واتە : خوڵقاندن و لە سەر زەوی دانانی ، وەكو ئەوەی لە فەرموودەكەی دیكەدا هاتووە : (( إنَّ الله لم يَضَعْ داءً إلا وَضَعَ له دواءً )) واتە : خوای تعالى هەر نەخۆشیەكی دانابێت مەگەر دەرمانێكیشی بۆ داناوە ، ئەگەرچی ئەم گوفتارە لە قبوڵبوونەوە نزیكترە ، بەڵام ووشەی ( إنزال ) واتە : دابەزاندن ، لە ووشەی ( الخلق ) واتە : خوڵقاندن و ، لە ووشەی ( الوضع )یش واتە : دانان تایبەترە ، بۆیە پێویستە تایبەتێتی ووشەی ( إنزال ) لانەبرێت بەبێ بەڵگە ٠

دەستەیەكیش دەڵێن : خوای تعالى هەردوكیانی دابەزاندووە ، كە لە ڕێگەی پەریگەلێكەوە چارەسازیی خەڵكیان پێ سپێردراوە لە ڕووی نەخۆشی و دەرمان و هیتریشەوە ، چونكە پەریەكان كاروباری ئەم جیهانەیان پێ سپێردراوە ، هەروەها كاروباری جۆریی مرۆڤیشیان پێ سپێردراوە ، لە كاتی كەوتنی بە سكی دایكەوە تا كاتی مردن ، بۆیە دابەزاندنی نەخۆشی و دەرمانیش لە ڕێگەی پەریەكانەوە بووە ، ئەمەش لە هەردوو ڕووەكەی تر لە قبوڵبونەوە نزیكترە ٠ دەستەیەكیش گوتویانە : سەرتاپای نەخۆشیەكان و دەرمانەكان لە ڕێگەی بارانەوە بووە لە ئاسمانەوە كە هەموو شتێكی لێ دروست دەبێت وەكو خۆراك و ، دەرمان و ، نەخۆشیەكان و ئامرازەكانی تێكڕای ئەوانەو ، هۆكارەكان و تەواوكاریەكانیان ، هەروەها كانزا بەرزەكان كە لە چیاكانەوە بەدەست دێت و ، ڕوبارو دەریاكان و میوەكان ، هەموو

ئەمانە دەچنە چوارچێوەی بێژەکەوە بەڕێگەی ( التغليب )و[١٧٩] بەکارهێنانی کارێك (فعل)ێك لە جیاتی بە کارهێنانی دوو کار ( فعلين ) ، ئەمەش لە زمانی عەرەبیدا زۆر بەکارهاتووە ، بەڵکو لە زمانەکانی تریشدا بەکاردێت ، بۆنموونە ئەم شاعیرە دەڵێت :

عَلَفتُها تِبْنَاً وماءً بارداً حَتَّى غَدَتْ هَمَّالَةً عَيْناها

واتە

بە کا و ئاوی سارد ئاژۆمدا تا چاوەکانی دەستی کرد بە فرمێسك ڕژان

لێرەدا دەبینی ئالیك و ئاژوودان بۆ کایە ، بەڵام بۆ ئاو دەبێ بگوترێت ئاودان ، بەڵام شاعیر ووشەی ئاژوودانی بەکارهێناوە بۆ کا و بۆ ئاویش ، بۆ ئەوەی بە ڕێگەی ( التغليب ) تەنها کارێك ( فعل ) بەکاربێنێ لە جیاتی دوو کار ( فعل ) چونکە دڵنیایە ئەو کەسەی گوێبیستی دێرە شیعرەکە دەبێت خۆی بە باشی لە ماناکەی تێدەگات ۰

وقول الآخر :

وَرَأَيْتُ زَوْجَكَ قَدْ غَـدَا مُتَقَلِّداً سَيْـفاً وَرُمْحَـاً

واتە : مێردەکەتم بینی چوو شمشێرێك و ڕمێکی کردبوو شان

---

١٧٩ ـ التغليب : لە بواری زمانەوانیدا هەڵبژاردنی ووشەیەکە بەسەر ووشەیەکی دیکەدا بەمەرجێ پەیوەندیەك لە نێوانیاندا هەبێت وەکو ( الأبوين ، العمرين ، المشرقين ، الوالدين ) لێرەدا دەبینی لە زمانی عەرەبیدا ووشەی ( الأبوين ) هەڵبژێردراوە بۆ دایك و باب ئەگەرچی لە بنچینەدا ووشەکە مانای دوو باب دەگەیەنێ بەڵام عەرەب کە قسە دەکەن و دەڵێن ( الأبوين ) مەبەستیان دوو باب نی یە چونکە هیچ کەسێك دوو بابی نی یە بەڵکو مەبەستیان دایك و بابە هەروەها بۆ ووشەکانی تریش ، لێرەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە بەڵێ باران هۆکاری دروسبوونی خۆراك و دەرمان و شتەکانی تریشن ، بەڵام هەموو مادەیەك بە هۆی بارانەوە دروست نابێت ، بەڵکو دەبینی کانزاکان لە ئەنجامی هۆکاری دیکەوە پەیدا دەبن ، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەموو مادەکان لە دەرەنجامی شتێکەوە پەیدا دەبن ، بۆیە دەبینی لە زمانی عەرەبیدا تەنها یەك کار ( فعل ) بەکاردەهێنێ لە جیاتی هەموو شتەکان ، بۆیە دەبینی گوتویەتی باران دەبارێت و خۆراك و دەرمان و نەخۆشی و کانزاو ۰۰۰۰ دروست دەبێت ۰ وەرگێڕ ۰

لەم دێڕەدا : شمشێر لە شان دەكرێت و ئاشكەرایە ڕمیش هەڵدەگیرێت ·

وقول الآخر :

إذا مـــــتا الغَانياتُ بـَـرَزنَ يَوْمـــاً وَزَجَجْنَ الحَواجِـــبَ والعُيونـــــا

واته :

هەر ڕۆژێك ئافرەتە جوانەكان دەركەوتن و برۆو چـــاویان باریـــك كردبۆوە

لەم دێڕەشدا : برۆ باریك دەكرێتەوەو چاو دەڕێژرێت ·

ئەمــەش چـاكترین شــتێكە لــەم بــارەوە گــوترابێ و لــە هــەموو ڕووەكــانی تــریش بەهێزترە .والله أعلم.

ئەمــەش لـە تـەواوێتی حیكمـەت و دانـایی و تـەواوێتی پـەروەردگارێتی خـوای تعالاوەیـە ، چونكە وەكو چۆن بەندەكانی بە نەخۆشیەكان تووش كـردووە ، ئاوەهـاش یارمـەتی داون بـەو دەرمانانەی بۆی فەراهام كردوون ، وەكو چۆن تاقیان دەكاتەوە بە تاوان ، ئاوەهاش یارمـەتی داون بـە تەوبـە كـردن و ، ئـەو چـاكانەی كـردەوە خراپـەكان دەسـڕنەوەو ، ئـەو بـەڵاو كارەساتانەی تاوانەكان لادەبن ، وەكو چۆن تووشی ڕوحـە پیسـە زیانبەخشـەكانی كـردوون ، ئاوەهاش یارمەتی داون بە سەریازگەلیك لە ڕوحە پاكەكان ، كە بـریتین لـە پەریـەكان ، وەكـو چۆن تاقیان دەكاتەوە بە هـەواو ئـارەزوو ، ئاوەهـاش یارمـەتی داون بـۆ دەسـتكەوتنیان بـەو شتە شەرعیە خۆشە پاكانەی بۆی فەراهام كردون ، بۆیە تەماشا دەكەین خوای تعـالی تووشـی شـتیكی نـەكردوون مەگـەر شـتێكی تـری داونـەتێ بـۆ خـۆ ڕزگـاركردن لـەو بەڵایـەو ، دوورخستنەوەی ، بـەڵام لـە گـەڵ ئەمەشـدا جیاوازیـان لـە نێوانـدا دەمێنێتـەوە سـەبارەت بـە زانینی ئەو شتەو ، زانینی دەستكەوتنی و چۆنیەتی پێگەشتنی · وبالله المستعان.

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێبژاردنی ئەو كەسەدا كە چارەسەی خەڵك دەكات و نەفامە بە بواری پزیشكێتی :

رَوَى أَبُو دَاوُدَ ، وَالنّسَائِيّ ، وَابْنُ مَاجَهْ ، مِنْ حَدِيثِ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ، عَنْ أَبِيهِ ، عَنْ جَدّهِ ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ : (( مَنْ تَطَبّبَ وَلَمْ يُعْلَمْ مِنْهُ الطّبّ قَبْلَ ذَلِكَ فَهُوَ ضَامِنٌ ))[١٨٠] .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : هەركەس خۆی بە پزیشك دابنێت و نەزانرابێت پێشتر پزیشكێتی كردووە ، خۆی دەستەبەرەو پێی دەبژێردرێت ٠

ئەم فەرموودە پەیوەندی بەسێ شتەوە هەیە : زمانەوانی ، فیقهی ، پزیشكی ٠

سەبارەت بە زمانەوانیەكەی : ووشەی ( الطّب ) لە زمانی عەرەبیدا ، بۆ چەند مانایەك بەكارهاتووە ٠ لەوانە چاكردن دەگوترێت : ( طببتُه ) ئەگەر چاكم كردەوە ٠ دەشگوترێت : ( له طِبٌ بالأمور ) ٠ واتە : نەرم ونیانی و سیاسەتی بە كاروبارەكان هەیە ٠ شاعیر دەڵێت :

وإذا تغــيَّرَ مــن تَمــيمٍ أمْرُهــا      كُنتَ الطَّبيب لَهــا بِــرأيٍ ثــاقــبِ

واتە :

ئەگەر كاروبار لە هۆزی ( بني تميم ) گۆڕا      تۆ بەڕایەكی بەجێی كاریگەر سیاسەتیان بكە

لە ماناكانیش دیسان ( الحِذق )ە واتە : بە سەلیقە ٠ ( الجوهري ) فەرموویەتی : هەر كەسێكی لێهاتووی بەسەلیقە بەلای عەرەبەوە پزیشكە ، ( أبوعبيد ) دەڵێت : بنچینەی ووشەی ( الطّب ) واتە : لێهاتووی و بەسەلیقەیی لە شتەكاندا ٠ بۆیە بە پیاو دەگوترێت ( طب و طبيب ) ئەگەر زۆر لێهاتوو بەسەلیقەبوو تیایدا ، ئەگەرچی لە بوارێكی دیكەشدا بێت ٠

---

١٨٠ ـ إسناده حسن : أخرجه أبوداود ( ٤٥٨٦ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٦٦ ) ، وانظر الصحيحة ( ٦٣٥ ) ٠

کەسانی تریش گوتویانە : ( رجل طبيبٌ ) واتە : لێهاتوو بەسەلیقە ، بە پزیشك ناوبراوە لەبەر لێهاتووی و زرنگی . ( علقمة ) دەڵێت :

فإنْ تَسْألُونِي بِالنِّسَاءِ فَإنَّني   خَبيرٌ بِأدْوَاءِ النِّسَاءِ طَبِيبُ
إذا شابَ رأسُ المرءِ أو قلَّ مالُه   فليسَ لهُ من وُدِّهنَّ نصيبُ

واتە :

ئەگەر سەبارەت بە ژنان لێم پرسن   من شارەزام بە نەخۆشیەکانی ژنان و پزیشکم تیایدا
ئەگەر پیاو سەری سپی بوو یا ماڵی کەم   لە خۆشەویستی ئەوان هیچ بەشێکی نابێ

وقال عنترةُ :

إنْ تُغْدِفِي دُوني القِنَاعَ فإنَّني   طَبٌّ بأخْذِ الفارسِ المُسْتَلْئِمِ

واتە : ئەگەر ڕووپۆشەکەت شل بکەیتەوەو ، دەم و چاوت لەمن داپۆشیت و بتەوێت وازم لێ بێنیت ، بزانە من شارەزاو لێهاتووم بە بردنی ئەو سوارەی قەڵغانی جەنگەکەی پۆشیوە .

هەروەها لە ماناکانی ( العادة )یە واتە : نەریت ، بۆیە لێرەدا دەگوترێت : ( ليس ذلك بطِبِّي ) واتە : ئەوە نەریتی من نی یە ، ( فَرْوَةُ )ی کوڕی ( مُسَيْك ) دەڵێت :

فما إنْ طِبُّنا جُبْنٌ وَلكِن   مَنايَانا وَدَوْلَةُ آخَرِينا

واتە : نەریتمان و کارمان ترس نەبووە بەڵکو مردنی خۆمان و ئاژاوەگێڕی کەسانی تربوو.

( أحمد )ی کوڕی ( الحسين المتنبي ) شاعیریش دەڵێت :

وما التِّيهُ طِبِّي فِيهِمُ غَيرَ أنَّني   بَغيضٌ إليَّ الجَاهِلُ المُتَعَاقِلُ .

واتە :

لوتبەرزی نەریتی من نیە سەبارەت بەوان   بەڵام بێزراوە بەلامەوە کەسێکی نەفامی خۆ بە ئاقڵ زان

هەروەها لە ماناكانی ( السِّحر )ە واتە : جادوو بۆیـە دەگوترێـت : ( رجـل مطبـوب ) واتـە : پیاوێكی جادوو لێكراوە ، لە فەرموودەیەكی ( صحیح )دا خاتوو ( عائشـة ) _ خـوای لـیّ ڕازی بێت _ بۆمان دەگێڕێتەوە كەوا كاتیّ جولەكەكان جادوویان لە پێغەمبـەری خـوا كـرد ﷺ، دوو پەری دانیشتن یەكێكیان لای سـەری و ئـەویتریان لای پێـی ، یـەكێكیان گـووتی : ئـەم پیـاوە چێیەتی ؟ ئەویتریان گووتی : ( مطبوب ) واتە : جـادووی لێـكراوە · گـووتی : ( مَـن طَبَّـه ) ؟ واتە : كیّ جادووی لێكردووە ؟ گووتی : فلاّن كەسی جولەكە ·

( أبوعبیـد ) دەڵێـت : لـە ڕاسـتیدا بەكەسـی جـادولێكراو گوتویانـە : ( مطبوبـاً ) چـونكە ووشـەكەیان بـۆ مەبەسـتی دوونیـازی بـەكارهێناوە ، بـۆ نموونـە عەرەبـەكان بـە كەسـی گەزاستراویان گووتووە : ( سلیم ) چونكە گەشبین بوونـە بـە سـاغ و سـەلاّمەتی ئـەو كەسـە ، هەروەها بە دەشتی بیابانی بیّ ئاوی فەوتینـەریان گووتـوە : ( مفـازة ) واتـە : سـەركەوتن بـۆ گەشبینی دەربڕین بە سەركەوتن و ڕزگاربوون لە تیاچوون لە نێو ئەو بیابانـەدا · هـەروەها بـۆ چارەسەركردنی نەخۆشیەكانیش دەڵێن : ( الطُب ) • ( ابن أبي الأسلت ) دەڵێت :

أَلَا مَـــنْ مُـبْلِغٌ حَسَـــــّانَ عَـــنّي      أَسِـــحْرٌ كَـــــانَ طِبّكَ أَمْ جُـــنُونٌ

واتە :

ئاگادارین كیّ قسەكانم بە حەسان دەگەیەنیّ      پـــزیشكیت جـادوو بوو یـــا شێتی

وَأَمّا قَوْلُ الْحَمَاسِيّ :

فَـــإِنْ كُنْــتَ مَطْبُوبــًا فَلَا زِلْــتَ هَكَذَا      وَإِنْ كُنْتَ مَسْـــحُورًا فَلَا بَرِئَ الـــسّحْرُ

واتە :

ئەگەر ئەوەی تووشم بووە بە هۆی تۆو خۆشەویستی تۆوە بووە ، داواكارم خوای تعالی بەردەوامی بكات و ، نامەویّ لابچێت ، ئەگەر جادوو بێت یا نەخۆشی بێت ·

لەم دێرە شیعرەدا شاعیر ووشەی ( مطبوب )ی بۆ جادوو بەکارهێناوە ووشەی ( مسحور )یشی بۆ نەخۆشی بەکارهێناوە ٠

( الجوهري ) دەڵێت : بە نەخۆش دەگوترێت : ( مسحور ) ٠

( الطَّب ) ، بفتح الطاء ٠ واتە: زانایە بە کاروبار ، هەروەها ( الطبيب )یش واتە : پزیشك ، دیسان پێی دەگوترێت : ( الطَّب ) ، ( الطِب ) ، بكسر الطاء ٠ واتە کاری پزیشکێتی ، ( الطُب ) ، بضم الطاء ٠ ناوی شوێنێکە قَالَهُ ابْنُ السِّيدِ وَأَنْشَدَ

فَقُلْتُ هَلْ انْهَلْتُمْ بِطُبِّ رِكَابِكُمْ بِجَائِزَةِ الْمَاءِ الَّتِي طَابَ طِينُهَا

واتە :

گووتم ئایا یەکەم جار ووشترەکانتان لە (طُبَّ ) ئاودا بەو ئاوپێدانەی کە خاکەکەی چاکە

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( مَنْ تَطَبَّبَ )) بەڵام نەیفەرمووە (( مَنْ طَبَّ )) چونکە ئەو ووشانەی دەکەونە سەر کێشی ( التَّفعل ) پەنجە ڕادەکێشن بۆ ئەوەی خاوەنەکەی خۆی دەنوێنێ بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو کارەو خۆی تێهەڵدەقورتێنێ و ڕایدەپەڕێنێ بە قورسی و ناڕەحەتی ئەگەر لەو بوارەشدا لێهاتوو نەبێ و پیاوی ئەو بوارەش نەبێ ، لە زمانی عەرەبیدا ووشەی بەو هاوشێوانە زۆرن وەکو ( تَحَلَّمَ ) واتە : میهرەبانی دەنوێنێ ، ( تَشَجَعَ ) واتە : غیرەتی نواند ، ( تصبَّر ) واتە : ئارامگرتن دەنوێنێ ، چەندین ووشەی دیکەی بەو هاوشێوانەش ، بۆیە لە زمانی عەرەبیدا ( تكلّف )یان واتە : خۆنواندن بۆ ئەنجامدانی شتێك ئەگەر لێهاتووش نەبێ لە سەر ئەو کێشە داناوە ، شاعیرێك دەڵێت :

وقيسَ عَيلانَ ومَن تَقَيَّسا واتە : خێڵی ( قَيس عَيلان )و ئەوانەی خۆیان کردووە بە ( قیس).

بەڵام سەبارەت بە لایەنی شەرعی : پزیشکی نەفام زامنەو و لێپرسینەوەی دەکەوێتە سەر ، چونکە ئەگەر هەوڵی فێربوون و کارکردنی بە زانستی پزیشکیداو ، پێشکەوتنی بە خۆوە نەبینی لە بواری تێگەشتن و فێربوونیدا ، ئەوا بەو نەفامیەی خۆیەوە هێرش دەبات و نەفسەکان تیادەچێنێت و ، بەهەڵەشەیەوە خۆی دەخاتە مەترسی ئەنجامدانی ئەو کارەوە کە پێشتر ئەنجامی نەدابوو ، بەوەش نەخۆش تووش دەکات ، بۆیە زامنی و لێپرسینەوەی دەکەوێتە سەر ، ئەمەش ( إجماع ) واتە کۆڕایی زانایانی خاوەن زانستە .

پێشەوا ( الخطابي ) دەفەرمێت : جیاوازیەك بەدیناکەم کەوا ئەو کەسەی کاری چارەسەرکردن دەکات ئەگەر سەرپێچی کردو لە سنوور چووە دەرەوەو ، زیانی بە نەخۆش گەیاند زامنەو لێپرسینەوەی دەکەوێتە سەر ، ئەو کەسەش کە زانستێك یا کارێك ئەنجام دەدات بەبێ زانینێکی تەواو سەرپێچیکارەو لە سنوور چۆتە دەرەوە ، ئەگەر لە ئەنجامی ئەو کارەوە کە دەیکات زیانێك بۆ نەخۆش دروست بوو زامنی ( الدیة )ەکەی[١٨١] دەکات و ، ( القَودُ )ی[١٨٢] لە سەر لادەچێت ، چونکە بە زۆرداری ئەو کارەی ئەنجام نەداوە بەبێ مۆڵەت وەرگرتن لە نەخۆشەکە ، ( الدیة )ی تاوانکردنی ئەو کەسەی خۆی کردووە بە پزیشك دەکەوێتە ئەستۆی خزم و کەسوکاری لە بابەوە بە پێی گوفتاری هەرهەموو زانایان .

---

١٨١ ـ الدية : ئەو پارەو ماڵەیە کە پێویست دەبێ لە سەر کەسی تاوانبار بە هۆی تاوانەکەیەوەو ، دەدرێت بەو کەسەی تاوانەکەی دەرهەق کراوە یا بە خاون و کەسوکاری . بڕوانە : پوختەی فیقهی شەریعەت : مامۆستا طارق هەمەوەندی . وەرگێڕ .

١٨٢ ـ القَودُ : واتە کوشتنی تاوانبار لە جیاتی ئەو کەسەی کوشتویەتی ، بڕوانە : علم أصول الفقه ، الدكتور عبدالكريم زيدان ، وەرگێڕ .

**دەڵێم _ ( ابن القيم ) _ بەشەكان پێنجن :**

**يەكەميان** : پزيشكێكى بەسەليقە هەقى داوە بە كارو پيشەكەو دەستيشى تاوانى نەكردووە ، بەڵام لە دەرەنجامى كارەكەيەوە كە لە لايەن شەرعەوە ڕێ پێدراوەو ، هەستاوە بە چارەسەركردنى كەسێك و بووە بەهۆى زيان پێگەياندنى ئەندامێكى ، ياخود نەفسى لەناوبردووە ، يا زيانى بە سيفەتێكى ئەو كەسە گەياندووە ، ئەمە زامنى و لێپرسينەوەى لە سەر نى يە بە ڕێكەوتنى زانايان ( بالإتفاق ) ، چونكە ئەو زيان پێگەياندنە دەرەنجامى كارێكى ڕێ پێدراوە لە لايەن شەرعەوە ، وەكو ئەو كەسەى كە خەتەنەى منداڵێكى كردو ، تەمەنى منداڵەكە گونجاوى خەتەنەكردنەكەيەو ، هەقى داوە بە كاروپيشەكە ، بەڵام زيانى گەياندووە بە ئەندامەكە يا بە منداڵەكە ، زامنى و لێپرسينەوەى نى يە ، هەروەها ئەگەر هەر جێگەيەكى جەستەى مرۆڤێكى عاقڵى بڕاند بۆ هەر هۆيەك بێت ، لە كاتى خوێداو بە شێوەى پێويست بەڵام زيانى پێگەياند ، زامنى و لێپرسينەوەى نابێت ، بۆيە زيان پێگەياندنى مرۆڤ لە ئەنجامى هەموو كارێكى ڕێ پێدراوى شەرعيەوە كە بە ئەنقەست و دەستدرێژى نەكرابێ ، زامنى و لێپرسينەوەى نى يە ، وەكو ( الحد ) بە ڕێكەوتنى هەموو زانايان ، وە ( القصاص )يش بە بەلاى جەماوەرى زانايانەوە ( الجمهور ) ، ئەمە بە پێچەوانەى پێشەوا ( أبي حنيفة )وەيە ، چونكە ئەم پێشەوايە زامنى و لێپرسينەوەى بۆ داناوە ، هەروەها تەمبێ كردن و ئەدەبدان ( التعزير ) ، هەستانى پياو بە لێدانى خێزانى ، مامۆستا بە لێدانى منداڵى خوێندكار ، ئەو كەسەى وەڵاخێك بە كرێ دەگرێ هەموو ئەمانە زامنى و لێپرسينەوەى نابێت ، بە پێچەوانەى پێشەوايان ( أبوحنيفة ) و ( الشافعي )وە كە زامنى و لێپرسينەوەيان بۆ داناوە ، بەڵام پێشەوا ( الشافعي ) لێدانى وەڵاخى جياكردۆتەوە ، بۆيە بەگشتى ياساى بەشەكە لە يەك دەنگى و جياوازى زانايانـدا بەم جۆرەيە : زيان گەياندن بە مرۆڤ بەهۆى ئەنجامدانى تاوانێكەوە زامنى و لێپرسينەوەى بۆ دەكرێت ، بەڵام ئەگەر زيانى بە مرۆڤێك گەياند لە دەرەنجامى بەجێهێنانى پێويستيەكەوە بۆ كەسەكە ، ئەوا زامنى ناكرێت بە ڕێكەوتنى زانايان ، ئەوەشى دەكەوێتە نێوانەوە جياوازى تێدايە · ( أبوحنيفة ) زامنى بە پێويست داناوە بە

ڕەهایی ، ( أحمد ) و ( مالك ) زامنیان پوچکردۆتەوە ، پێشەوا ( الشافعي ) جیاوازی دەکات لە نێوان ئەندازەدانراو ( المقدَّر ) کە زامنی بۆ پوچکردۆتەوەو ، نەندازەدانەراو ( غیر المقدر )دا کە زامنی بۆ داناوە · چونکە پێشەوا ( أبوحنیفة ) وای تەماشا کردووە کە کاتێك مۆڵەتیان داوە بە ئەنجامدانی کارەکە لە ڕاستیدا مەرجی ئەوەشیان داناوە کەوا ساغ و سەلامەت بن ، بەڵام پێشەوایان ( أحمد ) و ( مالك ) وایان تەماشا کردووە کە کاتێك مۆڵەتیان داوە کارەکەیان بۆ ئەنجام بدرێ ، ئیتر خۆی بۆ خۆی زامنی نەهێڵاوە ، بەڵام پێشەوا ( الشافعي ) تەماشای کردووە کەوا ئەو شتانەی ئەندازەو ژمارەیەکی بۆ دانراوە توانای کەمکردنەوەی نی یە ، چونکە لە پلەی دەقدایە ، ئەوەش کە ئەندازەو ژمارەیەکی بۆ دانەنراوە وەکو _ تەمبێ کردن و ئەدەبدان ( التعزیرات والتأدیبات ) شێوازێکی ( إجتهادي ) هەیەو لێرەدا ئەگەر زیانی پێگەیەنرا ، زامن دەکرێت ، چونکە بۆچۆنی دەستدرێژی لێدەکرێ ·

**بەشی دووەم :** کەسێکی خۆ بە پزیشك کاری نەفام دەستی کرد بە چارەسەرکردنی کەسێك و ، زیانی پێ گەیاند ، لێرەدا ئەگەر کەسی تاوان لێکراو زانیبێتی پزیشکەکە نەفامەو ، لە گەڵ ئەوەشدا مۆڵەتی دابێ ، ئەوا زامنی و لێپرسینەوەی لە سەر نابێ ، ئەم شێوە پێچەوانەی فەرموودەکەی پێشوو نی یە ، چونکە میانەو( السیاق ) بەهێزی گوفتاری ناوەڕۆکی فەرموودەکە باسی ئەوە دەکات کەوا فریوی دابێ و گومانی وای بۆ دروست کردبێ کە پزیشکەو ، پزیشکیش نەبێ ، بەڵام ئەگەر نەخۆش وای گومان بەردبێ کە پزیشکەو ، مۆڵەتی پێدابێ چارەسەری بکات لەبەر ئەوەی وای زانیوە دەزانێ ، لێرەدا پزیشکەکە زامنەو لێپرسینەوەی لێدەکرێت لە بەر ئەو تاوانەی بەدەستەکانی ئەنجامی داوە ، هەروەها ئەگەر پزیشکەکە وەسفی دەرمانێکی کرد بۆ ئەوەی نەخۆش بەکاری بێنێت ، نەخۆشیش وای زانیوە لە ڕوانگەی زانینی تەواوەوە بۆی وەسف کردووە بەڵام زیانی پێ گەیاند ، ئەوا پزیشکەکە زامنی و لێپرسینەوەی بۆ دەکرێت ، لە فەرموودەکەدا وا دەردەکەوێت یا ئاشکەرایە·

**بەشی سێیەم** : پزیشکێکی لێهاتوو ، مۆڵەتی درا ، هەقی داوە بەکارووپیشەکە ، بەڵام دەستی هەڵەی کردو ، سنوری بەزاند بۆ ئەندامێکی ساغ و زیانی پێگەیاند ، وەکو : کەسێکی خەتەنەکار دەستی گەشتە سەرە خڕەکەی ئەندامی نێرینەو زیانی پێگەیاند ، زامنی ولێپرسینەوەی هەیە ، چونکە تاوانێکی هەڵەیە ، پاشان ئەگەر ئەو پارەوماڵەی بەهۆی زامن کردنی تاوانە هەڵەکەیەوە لێی دەستێنرێت سێ یەك و زیاتر بوو ، دەکەوێتە ئەستۆی خزم و کەسوکاری ، ئەگەر خەزم وکەسوکار نەبوو ئایا ( الدية )ەکە لە ماڵەکەی خۆی دەدرێت ، یا لە ( بيت المال )ی موسڵمانان ؟ دوو گوفتاری تێدایە : بریتین لە دوو ( رواية )ی ئیمامی ( أحمد ) ٠ گوتراوە : ئەگەر پزیشکەکە لە ( أهل الذمة )[١٨٣] بوو ، ئەوا دەبێ لە پارەو ماڵی خۆی بیدات ، ئەگەر موسڵمانیش بوو ، ئەو دوو ( الرواية )تەی تێدایە ، لە کاتێکدا ئەگەر ( بيت المال ) نەبوو ، یا ( بيت المال ) لە توانایدا نەبوو ، ئایا ( الدية )کە لادەچێت ، یا پێویستە کەسی تاوانبار لە ماڵی خۆی بیدات ، دوو ڕووی تێدایە بەناوبانگترینیان : لاچون و نەمانیەتی.

**بەشی چوارەم** : پزیشکی بەسەلیقەی لێهاتوو لە پیشەکەیدا ، ( إجتهاد )ی کردو دەرمانێکی بۆ نەخۆش وەسف کرد ، بەڵام لە ( إجتهاد )ەکەیدا هەڵەی کردو ، بۆیە هۆی کوشتنی نەخۆشەکە ، ئەمە لە ڕوانگەی دوو ( الرواية )ەوە لێکدەدرێتەوە یەکەمیان : ( الدية )ی کوژراوەکە لە ( بيت المال ) دەدرێ ٠ دووەم : دەکەوێتە ئەستۆی خزم و کەسوکاری پزیشکەکە ، ئیمامی ( أحمد ) لە کتێبی ( خطأ الإمام والحاكم )دا بڕیاری لە سەر ئەم دووانە داوە ٠

---

١٨٣ ـ أهل الذمة : ئەو هاوەڵ بڕیاردەرە خاون کتێبانەن کە سەرانە دەدەن بە پێشەوای موسڵمانان بەرامبەر بە پاراستنی سەرو ماڵیان ، بۆیە پێشەواش دڵنیایان دەکات کەوا لە ئاسایشدا دەبن لە لایەن موسڵمانانەوە ، وەدەوڵتی ئیسلام پارێزگاری لە خوێن و ئابڕو ماڵیان دەکات ، بڕوانە : پوختەی فیقهی شەریعەت ، مامۆستا طارق هەمەوەندی ٠ وەرگێڕ ٠

**بەشی پێنجەم :** پزیشکێکی لێهاتوو ، هەقی بە کارو پیشەکەی داوە ، بەڵام زیادە گۆشتێکی لە جەستەی پیاوێك یا منداڵێك ، یا شێتێك بڕی بەبێ موڵەتی خۆی ، یا بەبێ موڵەتی بەخێوکاری ، یا خەتەنەی منداڵێکی کرد بە بێ موڵەتی بەخیوکاری و بو بە هۆی زیان پێگەیاندنی ، هاوەڵانمان گوتویانە ، زامنی و لێپرسینەوەی لێدەکرێت ، پێدەچێ بە ڕەهایش زامنی نەکرێت ، چونکە ئەو پزیشکە چاکەکارەو ، چاکەکاریش تۆڵەی لێ وەرناگیرێتەوە ٠ لە لایەکی تریشەوە ئەگەر تاوانبار بێ و دەستدرێژی کردبێ ، موڵەتدانی بەخێوکار زامنیەکەی لە سەر لانابات ، ئەگەر دەستدرێژیشی نەکردبێ ، ئەوا هیچ ڕوویەك بەدیناکرێت بۆ زامنکردنی ٠

ئەگەر گوتت : ئەو بە دەستدرێژیکار دادەنرێ لەکاتی موڵەت نەدانیداو ، بە دەستدرێژیکاریش دانانرێت ئەگەر موڵەتی درا ٠

دەڵێم _ ( ابن القيم ) _ دەستدرێژیکردن و نەکردنی لە ڕاستیدا دەگەڕێتەوە بۆ کردارەکەی خودی خۆی ، بۆیە مۆڵەتدان و مۆڵەتنەدان هیچ کاریگەریەکی نابێ ٠ ئەمەش جێی تێڕوانینی زیاترە ٠

## بەشێك :

لە فەرموودەکەی پێشوودا ووشەی ( الطبيب ) واتە پزیشك ئەو کەسەیە کە چارەسەر دەکات بە وەسفی و بە گوفتاری و ، لە زمانی عەرەبیدا ووشەی ( الطّبائعي )یشی پێ دەگوترێت و ، هەروەها ووشەی پزیشك کەسانی چاوڕێژیش دەگرێتەوە کە بە میلەکەیان چاوان دەرێژن و ، برینسازانیش دەگرێتەوە کە بە نەشترو مەڵهەمەکانیان چارەسەری دەکەن و ، خەتەنەکاریش دەگرێتەوە کە بە موسەکەی خەتەنە دەکات و ، خوێن گریش دەگرێتەوە کە بە نەشتەرەکەی خوێن دەگرێت و ، کەڵەشاخ گریش دەگرێتەوە کە بە پیاڵەی خوێن گرتن و نەشتەرەکەی کەڵەشاخ دەگرێت و ، ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە بەستەرو پێچەکەکانیان ئێسکی شکاو دەگرنەوەو ، کەسی داخکاریش دەگرێتەوە کە بە ئامێری داخکردنەکەی و

بەئاگر داخ دەكات و ، ئەو كەسەش دەگرێتەوە كە گۆزەكەی ( بقربته ) چارەسـەری نـەخۆش دەكات لە ژێرەوە ·

بـە يەكسـانی ئەگـەر چارەسـەری ئاژەڵێـك بكـات ، يـا چارەسـەری مرۆڤێك بكـات ، نـاوی پزيشك لە ڕووی زمانيەوە بۆ هەموو ئەمانە بەكاردێت ، خەڵكيش كە ووشەی پزيشـكی تايبـەت كردووە بەهەندێ لە جۆرەكانی پزيشكەوە نەريتێكی نوێ يە ، وەكـو چـۆن خـەڵكی زاراوەی ( الدابة )يان لە زمانی عەرەبيدا تايبەت كردووە بە ئاژەڵەوە ئەگەرچی مانـای ووشـەكە زۆر لـەوە فراوانترە ·

## بەشێك سەبارەت بەو شتانەی كە دەبێ پزيشكی بە سەليقە ڕەچاوی بكات :

پزيشكی لێهاتوو ، ئەو پزيشكەيە كە لە بواری چارەسەردا بيست شت لەبەر چاو دەگرێت:

يەكەميان : تەماشاكردنی جۆری نەخۆشيەكە بۆ ئەوەی بزانرێت چ نەخۆشيەكە ·

دووەم : تەماشاكردنی هۆی نەخۆشيەكە واتە لە چيەوە ڕويـداوە ، ئـەو هۆكـارە كارايـەی بووە بەهۆی دروستبوونی چيە·

سێ يەم : هێـزی نـەخۆش و ، ئايا توانـای بـەرگری نەخۆشـيەكەی هەيـە ، يـا هێـزی لـە نەخۆشيەكە لاوازترە ؟ ئەگەر توانای بـەرگری نەخۆشـەكەی هـەبوو ، بەسـەريدا زاڵ بـوو ، لـە گەڵ نەخۆشيەكەدا بەجێی دێڵێ و ، دەرمان بەكارناهێنێت ·

چوارەم : ميزاجی سروشتی جەستە چی يە ؟

پێنجەم : ميزاجی دروستبووی نوێ بە پێچەوانەی ڕێڕەوی سروشتی ·

شەشەم : تەمەنی نەخۆش ·

حەوتـەم : كاتی ئێستا لە وەرزەكانی ساڵداو ئەوی پێی گونجاوە ·

هەشتەم : نەرێتی كە پێی ڕاهاتووە ·

نۆیەم : نیشتمانی نەخۆش و خاکەکەی ٠

دەیەم : باری هەوا لە کاتی نەخۆش کەوتندا ٠

یازدەیەم : تەماشاکردنی دەرمانی گونجاوی دژ بەو نەخۆشیە ٠

دوازدەیەم : تەماشاکردنی هێزی دەرمان و پلەکەی ، هاوکێشی لە نێوان دەرمان و هێزی نەخۆش ٠

سیازدەیەم : دەبێ هەموو مەبەستی پزیشك بۆ لابردنی نەخۆشیەکە نەبێت بەتەنها ، بەڵکو دەبێ هۆشی خۆی بەکار بێنێت بۆ لابردنی نەخۆشیەکە بەجۆرێك دڵنیا بێت لەوەی نابێ بە هۆی دروستبوونی نەخۆشیەکی قورستر ، بۆیە هەرکات لایبردو دڵنیانەبوو لەوەی کە نابێ بەهۆی ڕوودانی نەخۆشیەکی قورستر ، نەخۆشیەکە لە سەر باری خۆی دەهێڵێتەوەو ، هێزی خۆی ئاڕاستە دەکات بۆ ئاسان کردن وهێمن کردنەوەی نەخۆشیەکەو ئەمەش پێوستەو ئەرکی سەرشانە ، وەکو نەخۆشی دەمە ڕگەکان ، چونکە هەرکات بە بڕین و وەستاندن چارەسەرکرا ، ترسی ڕوودانی نەخۆشی لەوە قورستری لێدەکرێت ٠

چواردەیەم : چارەسەر بکرێ بە ئاسانترین و ئاسانتر ، بۆیە لە چارەسەرکردن بە خۆراك واز ناهێنێ و بچێت بۆ دەرمان مەگەر لە کاتی دەست نەکەوتنیدا ، دەرمانی ئاوێتە بەکارناهێنێت مەگەر لەکاتی دەست نەکەوتنی دەرمانی سادەدا ، بۆیە لە لێهاتووی پزیشکە ئەگەر چارە سەری خۆراکی لە جیاتی دەرمان بەکار بێنێت و ، دەرمانی سادە لە جیاتی دەرمانی ئاوێتە بەکاربێنێت ٠

پازدەیەم : تەماشای نەخۆشیەکە بکات ، ئایا لە توانادایە چارەسەر بکرێت یا نەء ؟ ئەگەر نەتوانرا چارەسەر بکرێت ، ڕێزی پیشەو کارەکەی دەپارێزێت و ، تەماعکاری هانی نادات بۆ هەستان بە چارەسەرکردنێك هیچ سوودێکی نەبێت ٠ ئەگەر لە توانادا بوو چارەسەر بکرێت ، ئینجا تەماشا دەکات ئایا لەتوانادایە لابرێت بەتەواوی یا نەء ؟ ئەگەر

بۆی دەرکەوت لە تواناادا نی یە بە تەواوی لابرێت ، ئینجا تەماشا دەکات ئایا لـە توانادایـە سووك بکرێتەوە یا هەرنەبیّ کەم بکرێتەوە ؟ ئەگەر نـەتوانرا کـەم بکرێتـەوەو ، تەماشـای کرد ئەو پەڕی توانـا لـە وەسـتاندن و نەهێشـتنی فـراوان بونیدایـە · ئـەو کاتـە مەبەسـتی چارەسەرەکەی بۆ ئەو شتە ئاڕاستە دەکات و ، یارمەتی بەهێزبوونی کەسـی نـەخۆش و ، لاوازبوونی مادەیی نەخۆشیەکە دەدات ·

شـازدەیەم : دەسـتکاری تێکەڵاوەکـە نـەکات و هەڵنەسـێت بـە دەرهاوێشـتنی پـێش پێگەیاندنی ، بەڵکو مەبەستی خۆی ئاراستە دەکات بۆ پێگەیاندنی ماددەکە ، ئەگـەر پێگـەیی ، ئینجا دەست دەکات بە دەرهاوێشتنی ·

حەڤدەیەم : دەبیّ لە بواری نەخۆشیەکانی دڵ و ڕوح و دەرمانەکانیـدا شـارەزابیّ ، ئەوەش بنچینەیەکی گەورەیە بۆ چارەسەرکردنی جەستە ، چونکە کاردانەوەی جەستەو سروشتی بەرامبەر بە نەفس و دڵ کارێکی ئاشکەرایەو ، پزیشکیش ئەگەر شارەزابوو بـە نەخۆشـیەکانی دڵ و چارەسـەرەکانیان ، ئـەوجا دەبـیّ بـە پزیشـکێکی تـەواو ، ئـەو کەسەش شارەزایی بەوە نەبیّ ، ئەگەرچی لێهاتووش بیّ لە چارەسـەرکردنی سروشـت و بارەکـانی جەسـتەدا نیـوە پزیشـکە ، هـەر پزیشـکێکیش تیمـاری نـەخۆش نـەکات بـە پشـکنینی دڵـی نـەخۆش و چـاکردنی و ، بـەهێزکرنی ڕوحـی و هێزەکـانی بـە خەیروچاکەداری و ، ئەنجامدانی کردەوەی خـەیرو ، چـاکەکردن بەرامبـەر بـە خـەڵك و ، ڕووکردنە خواو ڕۆژی دوایی ، ئەوە پزیشك نی یە ، بەڵکو خۆ بە پزیشـکارێکی بێتوانایـە · گـەورەترین چارەسـەریەکانی نەخۆشـیش ئەنجامـدانی کـردەوەی خێـرو ، چـاکەکردن بەرامبـەر خـەڵك و ، زیکـرو ، نـزاو پاڕانـەوەو ، لاڤـەلاڤ و ، تەوبەکردنـە ، ئـەم کردەوانـە کاریگەریەکی بەهێزی لە دورخستنەوەی نەخۆشیدا هەیە ، بەدەسـتهێنانی شـیفاش بـەو کردەوانـە گـەورەترو کاریگـەرترە بەبـەراوردی دەرمانـە سروشـتیەکان ، بـەڵام ئەمـە دەکەوێتە سەر ئامادەیی نەفسی نەخۆش و قبوڵکردنی و بیروباوەڕی بەوانەو سودی ·

هەژدەیەم : ئاسان کردن و ئارامکردنەوەی نەفسی نەخۆش و ، بەسۆزو نەرمی مامەڵە لەگەڵ کردنی ، بەهاوشێوەی مامەڵەکردنی منداڵ ۰

نۆزدەیەم : جۆرەکانی دەرمانە سروشتی و ئیلاهیەکان بەکار بێنێت ، چارەسەرکردن بە خەیاڵکردن ( التخییل ) بەکاربێنێت ، چونکە پزیشکە لێهاتووەکان لە بواری بەکارهێنانی خەیاڵکردن ( التخییل ) کردەوەگەلێکی سەرسوڕمێنیان هەیە کە دەرمانەکان ناگەن بە ئاستی ، بۆیە پزیشکی لێهاتوو لە هەموو یارمەتیدەرێك سوود وەردەگرێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکە ۰

بیستەم : باشترین دەستەڵاتی کاری پزیشکە ، کەوا چارەسەرو و چارەسازیەکەی لە سەر شەش پایە دامەزرێنێت : پاراستنی تەندروستیە هەبووەکە ، گەڕانەوەی تەندروستیە ونبووەکە بە گوێرەی توانا ، لابردنی نەخۆشیەکە یا کەمکردنەوەی بەگوێرەی توانا ، ئەگەر دوو خراپە ( مفسدة ) هەبوو هەڵسێت بەلابردنی گەورەترینیان ، لە کیسدانی بچوکترین بەرژەوەندی ( مصلحة ) لە پێناو بەدەستهێنانی گەورەترینیاندا ، لە سەر ئەم شەش بنچینە چارەسەرەکان دەخولێنەوە ، بۆیە هەر پزیشکێك ئەمە پیشەی نەبێت کە بۆی بگەڕێتەوە ، ئەوە پزیشك نی یە ۰ والله أعلم ۰

## بەشێك سەبارەت بەوەی کە دەبێ پزیشك ڕەچاوی باروحاڵی نەخۆش بکات :

لەبەر ئەوەی نەخۆش چوار باری هەیە : دەستپێکردن ، بەرزبوونەوە ، کۆتایی و ، نەمان بۆیە پێوستە پزیشك چاودێری هەر بارێك لە بارەکانی نەخۆشیەکە بکات بەوەی بۆی دەشێت و گونجاویەتی ، بۆ هەر بارێکیش ئەوە بەکاربێنێت کە پێویستە تیایدا بەکاربێت ۰ بۆیە لە خاڵی دەستپێکردنی نەخۆشیەکەدا ، ئەگەر تەماشای کرد سروشت پێویستی بە جوڵاندنی

پاشماوه خراپەکانـەو پێویستە دەرهاوێشتنی بۆ بکرێت ، لەبەر ئـەوەی مـاددە خراپـەکان پێگەیووە ئیتر دەست بەوە دەکات ، ئەگەر جوڵاندنی پاشماوە خراپەکانی لە دەست چوو لـە خاڵی دەستپێکردنی نەخۆشیەکدا لەبەر هەر کۆسپێك قەدەغەی بکات ، یا لەبـەر لاوازی هێـزی نـەخۆش و بەرگەنـەگرتنی بـۆ کـاری دەرهاوێشـتن ، یـا بـەهۆی سـاردی وەرزەوە ، یـا لەبـەر کەمتەرخەمیەك ڕوویداوە ، پێویستە وریا بێت ئەو پەڕی وەریـایی کـە کـاری دەرهاوێشـتنەکەی بـۆ نـەکات لـە خـاڵی بەرزبوونـەوەی نەخۆشـیەکدا ، چـونکە ئەگـەر ئـەنجامی دا ، سەروشـت ڕادەمـێنێ و خـوێ خـەرێك دەکـات بـە دەرمانەکـەوەو ، واز لـە چارەسـازی نەخۆشـیەکەو بـەرگریکردنی دێنـێ بـە یـەکجاری ، نموونەشـی وەکـو نموونـەی : کەسـێکە دەچـێتە لای سوارچاکێك کە سەرقاڵی جێگەکانی دوژمنە ، خەریکی دەکات بە کارێکی ترەوە · چونکە لـەم بارەدا پێویستە یارمەتی سروشت بدات بۆ پاراستنی هێز چەند لە تواناداد بوو ·

ئەگەر نەخۆشیەکە کۆتایی هـات و وەسـتاو هێـور بویـەوە ، دەسـت بـە دەرهاوێشـتنی و ، ڕیشەکێش کردنی هۆکارەکانی دەکات ، ئەگەر گەشتە خاڵی نەمان ، ئەوانەی سەرەوەی زیـاتر بۆ شایستە دەبێ · نموونەی ئەمەش وەکو نموونەی دوژمنێکە هێزی تەواو بێـت و ، چەکیشـی پێ نەمابێت ، فەوتاندنی ئاسان دەبێت ، ئەگـەر پشـتی هـەڵکردو دەسـتی بـە هـەڵهاتن کـرد ، فەوتاندنی ئاسانترە ، چونکە توندی و لێهاتوویی لە سەرەتادایە ، هەروەها باری دەرهاوێشـتن و ، فراوانیی هێزی ، دەرمان و نەخۆشیش بەو شێوەیە ·

## بەشێك سەبارەت بەوەی کە پزیشك بە سەلیقە لە ئاسانترینەوە چارەسازی دەکات:

پزیشـکی لێهـاتوو هـەرکاتێك بتوانێـت چارەسـازیی بـە ئاسـنترین بکـات ، دەبـێ وازی لـێ نەهێنێت و بچێتە سەر قورسترین چارەسازیی ، بـەڵکو پلـە بـە پلـە لـە لاوازترینـەوە دەچـێتە سەر بەهێزترین ، بەڵام ئەگەر ترسا لەوەی لە ئەنجامی بـەکارهێنانی دەرمـانی لاوازەوە هێـزی

نەخۆشەكە لەناو بچێت ، ئەوا یەكسەر دەرمانی بەهێز بەكاردێنیّ ، لە چارەسەركردنیشدا لە سەر یەك بار ناوەستیّ و تەنها یەك چارەسەر بەكاربێنیّ ، چونكە سروشتی نەخۆشیەكە لە سەر دەرمانەكە ڕادێت و ، توانای بەرگەگرتنی دەرمانەكەی بۆ پەیدا بێت و نەخۆشیەكەش هەر بمێنێتەوە ، دەرمانە بەهێزەكانیش لە وەرزە بەهێزەكاندا بەكار ناهێنێت ، پێشتریش ئاماژەمان پێدا كە تاوەكو توانای چارەسەركردنی بە خۆراك هەبیّ، دەرمان بەكار ناهێنیّ ، ئەگەر ئالۆزیەكیشی لا دروست بو و نەیزانی نەخۆشیەكە گەرمە یاخود ساردە ، دەست بە چارەسەركردن ناكات تاوەكو بۆی ڕوون دەبێتەوە ، هەركات ترسی لە دەرەنجامی نەخۆشیەكە هەبوو ئەگەر دەرمانێكی بۆ بەكارهێنا ، ئەوا دەرمانەكەی بۆ تاقی ناكاتەوە ، هیچیشی تێدا نی یە ئەگەر دەرمانەكەی تاقیكردەوە لە بارێكدا ئەگەر هیچ ترسێكی نەبوو لەوەی شوینەوارێكی خراپ دروست بكات ٠

ئەگەر چەند نەخۆشیەكیش كۆبوونەوە ، دەست بە چارەسەركردنی ئەوە دەكات كە یەكێك لەم خەسڵەتانەی تێدایە :

یەكەمیان : چاكبونەوەی ئەویتر لە سەر چاكبونەوەی ئەم وەستابیّ وەكو ئاوسان و برین ، لێرەدا دەست بە چارەسەری ئاوسانەكە دەكات ٠

دووەم : دانەیەكیان هۆكاری دروستبوونی ئەویتر بیّ وەكو ( السَّدة ) و ( الحمى العفنة )[١٨٤] ، لێرەدا دەست دەكات بە لابردنی ( السَّدة )كە چونكە هۆكاری دروستبونی تاكەیە ٠

سیّ یەم : دانەیەكیان لەویتر گرنگتربیّ ، وەكو نەخۆشیەكی توندو نەخۆشیەكی درێژخایەن ، لێرەدا دەست دەكات بە چارەسەركردنی نەخۆشیە توندەكەو ، لە گەڵ ئەوەشدا ئەویتر فەرامۆش ناكات ، ئەگەر نەخۆشیەك و نەخۆشیەكی كات بەكات كۆبونەوە ، دەست

---

١٨٤ ــ السَّدة : ناوێكە بۆ هەر شتێك لە نێو جەستەدا ڕیّ لە هاتوچۆی شتێكی تر بگریّ ٠

الحمى العَفنة : تایەكە بەهۆی یەكێك لە چوار تێكەڵاوەكەوە دروست دەبیّ كە ( الصفراء والسوداء )و خوێنی و بەڵغەمی ، بڕوانە : مەلا محمودی گەلاڵەیی ، قامووسی ڕستە ٠

دەكات بە چارەسەركرنی نەخۆشيەكە ، مەگەر نەخۆشيە كات بە كاتەكە ( العَرض ) بەهێزتربێ وەكو ( القُولنج )[١٨٥] ، لێرەدا دەست دەكات بە نيشتنەوەی ئازارەكەو ، پاشان ( السَّدة )كە چارەسەر دەكا · ئەگەر تواناشی هەبوو لە جێگەی چارەسەركردن بە دەرهاوێشتنی مادەكان ، جۆری چارەسەری دیكەی وەكو برسێتی و ڕۆژوو یا نووستن بەكاربێنێ باشترەو ، با كرداری دەهاوێشتن ئەنجام نەدات ، ئەگەر ویستی پاراستنی هەر تەندروستیەكی بوو ، با بە هاوشێوەكان و وێكچووەكان بیپارێزێت ، ئەگەر ویستی گواستنەوەشی هەبوو بۆ بارێكی چاكتر لە خۆی بە دژ دەیگواستێتەوە ·

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆپاراستن لەو نەخۆشیانەی دەتترێتەوە بە سروشتی و ڕێنمایی كردنی كەسانی تەندروست بە خۆدورخستنەوە لەو كەسانەی تووشیبوونە:

ثبَتَ فِي " صَحِيحِ مُسْلِمٍ " مِنْ حَدِيثِ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّهِ ، أَنّهُ كَانَ فِي وَفْدِ ثَقِيفٍ رَجُلٌ مَجْذُومٌ ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ النّبِيّ ﷺ (( ارْجِعْ فَقَدْ بَايَعْنَاكَ ))[١٨٦] .

واتە : لە ( جابر )ی كوڕی ( عبدالله )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : شاندەكەی هۆزی ( ثقیف ) پیاوێكی گوولی تێدابوو ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی بۆ نارد : (( بگەڕێرەوە پەیمانمان لە گەڵ بەستووی )) ·

---

١٨٥ _ القُولنج : نەخۆشیەكە لە ریخۆڵەدا پەیدا دەبێ و پیسایی و با بە ئەستەك لە كۆم دێتە دەرەوەو هۆكەشی دەگەڕێتەوە بۆ هەوكردنی كۆڵۆن ، بڕوانە : فەرهەنگی دەریا · وەرگێڕ ·

١٨٦ _ صحيح : رواه مسلم ( ٤ / ١٧٥٢ ) بلفظ : (( إنا بايعناك فارجع )) واتە : بە بێژەی : (( ئێمە پەیمانمان لە گەڵ بەستووی بگەڕێرەوە )) ·

وَرَوَى الْبُخَارِيُ فِي " صَحِيحِهِ " تَعْلِيقًا مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ ، عَنْ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ : (( فِرَّ مِنْ الْمَجْذُومِ كَمَا تَفِرّ مِنْ الْأَسَدِ ))[١٨٧] .

واته : له ( أبي هُريرة )ەوه ـ خوای لیّ ڕازی بێت ـ فەرموویەتی : (( له کەسی گول هەڵبێ وەکو چۆن له شێر هەڵدێی )) ٠

وَفِي " سُنَنِ ابْنِ مَاجَهْ " مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عَبّاسٍ ، أَنّ النَبيّ ﷺ قَالَ : (( لَا تُدِيمُوا النّظَرَ إلَى الْمَجْذُومِينَ ))[١٨٨] .

واته : له ( ابن عباس )ەوه ـ خوا له خۆی وباییشی ڕازی بێت ـ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( به بەردەوامی تەماشای کەسی گول مەکەن )) ٠

وَفِي " الصّحِيحَيْنِ " مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ (( لَا يُورِدَنّ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحّ ))[١٨٩] .

واته : له ( أبي هُريرة )ەوه ـ خوای لیّ ڕازی بێت ـ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( خاوەن ووشتری نەخۆش با ووشترەکانی نەباته سەرئاوی خاون ووشتری ساغ )) ٠

وَيُذْكَرُ عَنْهُ ﷺ: كَلِّمْ الْمَجْذُومَ وَبَيْنَكَ وَبَيْنَهُ قِيدَ رُمْحٍ أَوْ رُمْحَيْنِ[١٩٠] .

---

١٨٧ ـ صحيح : أخرجه البخاري ( ١٠ / ١٣٢ ) ٠

١٨٨ ـ إسناده صحيح : أخرجه أحمد ( ٢٠٧٢ ) ، وابن ماجة ( ٣٥٤٣ ) ، وصححه الألباني في الصحيحة ( ١٠٦٤ ) ٠

١٨٩ ـ صحيح : أخرجه البخاري ( ٧ / ١٦٦ ، ١٧٩ ) ، ومسلم ( ٧ / ٣٠ ، ٣١ ، ٣٢ ) ٠

واتە: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ باسکراوە : لە گەڵ کەسی گولدا بدووی با دووری نێوان تۆ و ئەو نزیکەی ڕمێك یاخود دوو ڕم بێت ٠

## نەخۆشی گولیی چی یە ؟

نەخۆشی گولیی : نەخۆشیەکی خراپە بەهۆی بڵاوبونەوەی ( المِرَّة السوداء )ەوە لە هەموو جەستەدا ڕوودەدات و ، میزاجی ئەندامەکانی جەستەو ڕووخسارو شێوازیان خراپ دەکات ، پێدەچێ لە کۆتادا پەیوەندی ئەو ئەندامانە تێك بچێت تا دەڕزێن و دەکەون ، لە زمانی عەرەبیدا بە ( داء الأسد )یش ناوبراوە، سەبارەت بەم ناوەش پزیشکان بە سێ بۆچون لێکیان داوەتەوە یەکەمیان : چونکە بە زۆری تووشی شێر دەبێ ، دووەم : چونکە ئەم نەخۆشیە ڕووی کەسی تووشبوو مۆڕو مۆن دەکات و دەیچوێنێت بە شێوەو شێوازی شێر ، سێ یەم : کەسی تووشبوو بەم نەخۆشیە ڕاوی ئەوانە دەکات کە نزیکی دەبنەوەو دەیانکوژێت وەکو شێر ٠

ئەم نەخۆشیە بەلای پزیشکانەوە نەخۆشیەکی تەنراوەی ئەم بۆ ئەوە ، ئەو کەسەی نزیکی کەسی گوول و تووشبوو بە نەخۆشی سیل دەبێتەوە هەر بە بۆنیان تووشی نەخۆشیەکەیان دەبێت ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر تەواو بەزەی هاتنەوەی بە ئومەتەکەیداو ، بۆ بەجێهێنانی ئامۆژگاری کرنی تەواو ، قەدەغەی ئومەتەکەی خۆی کردووە بە نزیك نەبوونەوە لەو هۆکارانەی نەخۆشی بۆ جەستەو دڵیان دەگوێزێتەوە ، گومانی تێدا نی یە جەستەش لە ئەوپەڕی ئامادەباشی شاراوەدایە بۆ قبولکردنی نەخۆشیەکە ، ڕەنگە سروشتی

---

١٩٠ ــ حسن صحيح : أخرجه عبدالله بن أحمد ( ١ / ٧٨ ) عن الحسين بن علي عن أبيه عن النبي ــ صلى الله عليه وسلم ــ قال : (( لا تديمو النظر المجذومين ، وإذا كلمتوهم فليكن بينك وبينهم قيد رمح )) واته : (( بە بەردەوامی تەماشای کەسی گول مەکەن و ، ئەگەر لە گەڵیشیاندا دووان با دووری نێوان ئێوەو ئەوان بە ئەندازەی ڕمێك بێت )) ٠

جەستە ئامادەی کاردانەوەی تەواو بێت بۆ وەرگرتن لە جەستەی ئەو کەسانەوە کە نزیکی دەبنەوەو تێکەڵی دەبن ، چونکە جەستە تووشبووەکان گوێزەرەوەن ، لەوانەیە ترس و خەیاڵی مرۆڤ لە گەورەترینی هۆکارەکان بن بۆ تووش بوون بەم نەخۆشیە ، چونکە خەیاڵ کارایەو زاڵە بەسەر هێزەکان و خووەکانی مرۆڤدا ، لەوانەیە بۆنی کەسی تووشبوو بگات بە کەسی تەندروست و نەخۆشیەکەی بۆ بگوێزێتەوە ، ئەمەش لە چەندین نەخۆشیدا بینراوەو ، بۆنیش یەکێکە لە هۆکارەکانی تەنینەوەی نەخۆشی ، لە گەڵ هەموو ئەمانەشدا دەبێ جەستە ئامادەبێ بۆ قبوڵبوونی ئەو نەخۆشیە ، وَقَدْ تَزَوَّجَ النَّبِيّ ﷺ امْرَأَةً ، فَلَمَّا أَرَادَ الدُّخُول بِهَا ، وَجَدَ بِكَشْحِهَا بَيَاضًا ، فَقَالَ : (( الْحَقِي بِأَهْلِكِ ))[١٩١] .

واتە: باسکراوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ ژنێکی خواست ، کە ویستی بچێتە لای سپیایەکی لە کەلەکەیدا بەدیکرد ، ئەوەبوو فەرمووی : بچۆرەوە ماڵی بابت ٠

کۆمەڵێك وایانزانیوە ئەم فەرموودانە بەرپەرچ دراوەتەوە بە کۆمەڵێك فەرموودەی دیکە ، کەوا پوچیان دەکاتەوەو دژایەتیان دەکات لەو فەرموودانە : مَا رَوَاهُ التِّرْمِذِيّ ، مِنْ حَدِيثِ عبدالله بن عمر أَنّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَخذَ بِيَدِ رَجُلٍ مَجْذُومٍ ، فَأَدْخَلَهَا مَعَهُ فِي الْقَصْعَةِ ، وَقَالَ : (( كُلْ بِسْمِ اللَّهِ ، ثِقَةً بِاَللَّهِ ، وَتَوَكُّلًا عَلَيْهِ ))[١٩٢] ، وَرَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ ٠

واتە : لە ( عبدالله )ی کوڕی ( عمر )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کەسێکی گوڵی گرت و ، خستیە نێو لەگەنەکەوە لە گەڵ خۆیداو ، فەرمووی : بخۆ بەناوی خوا : متمانە بەخواو ، پشت پێ بەستنی ٠

١٩١ _ إسناده صحيح : أخرجه أحمد في مسنده ( ٣ / ٤٩٣ ) ٠

١٩٢ _ إسناده ضعيف : أخرجه أبوداود ( ٣٩٢٥ ) ، والترمذي ( ١٨١٨ ) ، وضعفه الألباني ٠

وَبِمَا ثَبَتَ فِي " الصَّحِيحِ " عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، عَنْ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ : لَا عَدْوَى وَلَا طِيَرَةَ[١٩٣] .

واته : له ( ابي هُريرة )ەوه _ خـواى لـىٰ ڕازى بێـت _ فەرمووبـەتى : پێغەمبـەرى خـوا ﷺ فەرمووى : تەنينەوەى نەخۆشى نى يە ، شوومى و ڕەشبينى نى يە .

ئێمە دەڵێين _ ( ابن القيم ) _ سپاست بۆ خوا هيچ دژ بەيەك بوونێك له نێـوان فـەرمووده ( صحيح )ەكانى پێغەمبەرى خـوادا ﷺ بـەديناكرێت ، ئەگـەر دژ بـه يـەك بـوونێكيش بـەديكرا ، ئەوا پێدەچىٰ يەكێك له فەرموودەكان گوفتارى پێغەمبـەرى خـوا ﷺ نـەبىٰ و ، ئـەو كەسـانەى فەرموودەكـەيان گێڕاوەتـەوە هەڵـەيان تێـدا كردبـىٰ ، ئەگەرچـى كەسـێكى بـاوەڕپێكراوى سەرڕاستيش بێت ، چونكه كەسى باوەڕپێكراو هەڵە دەكات ، ياخود يـەكێك لـە فـەرموودەكان ( ناسخ )و(١٩٤) ئەويترى پێش خۆى لادەبات ئەگـەر قبـوڵى ( نسخ ) بكـات ، يـاخود دژ بـە يەك بوونەكە تەنها له تێگەشتنى بيسەردايە ، نـەك لـە فەرمايشـتەكانى پێغەمبـەرى خـوادا ﷺ بۆيە دەبىٰ يەكێك لەو سيانەى پێشەوە هەبىٰ تاوەكو دژ بە يەك بوونەكە ڕووبدات .

بـەڵام دوو فـەرموودەى ( صـحيح )ى ئاشـكەراى دژ بـە يـەك لـە هـەموو ڕوويەكـەوەو ، يەكێكيشيان ئەويتر ( نسخ ) نەكاتەوە ، هەرگيز شتى وانەبووە ، بەڵكو پەنا دەگرين بـە خـوا لە گوفتارى پێغەمبەرى خوادا ﷺ ئەم شتانە هەبێت ، چونكە له زارى ئەوەوە بـەدەر لـە هـەق هيچى تر نەگوتراوە ، بەڵكو لە ڕاستيدا بەڵاكە كەمتەرخەميە :

١ _ لە تێگەشتنى ئەو فەرموودانەدا كە هاتووە .

٢ _ توانا نەبوون لە جياكردنەوەى فەرموودە ( صحيح )ەكان و ( ضعيف )ەكاندا .

١٩٣ _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٧ / ١٦٦ ، ١٧٩ ) ، ومسلم ( ٧ / ٣٠ ، ٣١ ، ٣٢ ) عن الحسن عن أبي هريرة . وأخرجه البخاري ( ٧ / ١٧٥ ، ١٨٠ ) ، ومسلم ( ٧ / ٣٣ ) عن أنس . والحديث مروي عن كثير من الصحابة .

١٩٤ _ المنسوخ : له زمانى عەرەبيدا له ( نَسَخَ الشيءُ )ەوه هاتووه به واتاى : هەڵگرتن و لابردن ، بۆيه ووشەى ( المنسوخ ) له زمانى عەرەبيدا واتاى لابراو هەڵگيراو دەبەخشێت .

٣ _ تێنەگەشتنی تەواو لە مەبەستی ڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ

٤ _ هەڵگرتنی فەرموودەکە بۆ کارپێکردن لە بوارگەلێکدا بە پێچەوانەی مەبەستی پێغەمبەری خواوە ﷺ. هەموو ئەمانە هۆکاربوون بۆ دروستبوونی جیاوازی و خراپی . وباللە التوفیق .

( ابن فتیبة ) لە کتێبی ( اختلاف الحدیث )داو _ لە زاری ئەو کەسانەی دوژمنی فەرموودەو فەرموودەناسانن _ دەڵێت : دوو فەرموودەی دژ بە یەکتان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی : (( لَا عَدْوَى وَلَا طِيَرَةَ )) واتە : نە تەنینەوە هەیەو ، نە شومی و ڕەشبینی. پێشی گوترا : گەڕوویی و خورویی لە لیچی ووشتردا پەیدا دەبێ و ، ئینجا ووشترەکان گەڕوویان تێدەکەوێت ، فەرمووی : ئەی چ شتێك نەخۆشیەکەی تەنیەوە بۆ یەکەم ؟[١٩٥] . پاشان لە فەرموودەیەکی تردا گێڕاوتانەتەوە : با هیچ کەس ووشترە نەخۆشەکانی نەباتە سەر ئاوی خاوەن ووشتری ساغ ، لە کەسی گوول هەلبێ بەهاوشێوەی هەڵهاتنت لە شێر ، وە پیاوێکی گول هات بۆ گفتپێدانی بەڵام گفتەکەی بۆ ناردو ، فەرمانی پیدا بگەڕێتەوەو ، مۆڵەتی نەدا ، وە فەرموویەتی : شوومی لە ژن و ماڵ و وەڵاخدایە[١٩٦] . گوتیان : هەموو ئەمانە جیاوازن و یەکێکیان لەویتر ناچێت .

( أبومحمد ) دەڵێت : ئێمە دەڵێین : لەمەدا هیچ جیاوازیەك نی یەو ، مانای هەر فەرموودەیەکیان کات و شوێنی خۆی هەیە ، ئەگەر لە کات و شوێنی خۆیدا دانرا جیاوازیەکە لادەچێت .

---

١٩٥ _ إسناده صحيح : أخرجه أحمد ( ٢ / ٣٢٧ ) ، وصححه الألباني في صحيح الجامع ( ٧٥٢٩ ) .

١٩٦ _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ٩ / ١١٨ ) ، ومسلم ( ٢٢٢٥ ) .

**تەنینەوە دوو ڕەگەزە :**

**یەکەمیان** : تەنینەوەی گوولی ، چونکە بۆنی کەسی گوول توند دەبێت تا ئەو کەسانەش تووش دەکات کە زۆر لە گەڵیدا دادەنشن و قسەی لە گەڵدا دەکەن ، هەروەها بە جووتبوونی کەسی گوول لە گەڵ خێزانەکەیدا زیانی پێدەگەیەنێت و ، لەوانەشە تووشی گوولی بێت ، هەروەها منداڵەکانیشی لە گەورەبوونی تەمەندا تووشی دەبن ، هەروەها تووشبووان بە نەخۆشیەکانی سیل و گەڕووی ، چونکە پزیشکان فەرمان دەکەن بە دانەنیشتن لە گەڵ تووشبووان بە سیل و گوولیدا ، لەمەشدا مەبەستیان مانای تەنینەوە نی یە ، بەڵکو مەبەستیان گوڕینی بۆنیانەو ، ئەو کەسانەش بە زۆری بونیان دەکەن تووشی هەمان نەخۆشی دەبن ، پزیشکان دوورترین کەسن لە ڕەشبینی و شوومەوە ، گەڕووی و خورووی لە ووشتردا پەیدا دەبیٚ _ کە گەڕوویەکی شێداری تەڕە _ ئەوەش تێکەڵی ووشترە تووشبۆوەکە دەبێت یا دەیخورێنێت ، یا دەچێتە شوێنی یخدانی ووشترەکانەوە ئاوی گەڕووەکەی پیٚ دەگات و تووش دەبێت ، ئەمە ئەو مانایەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : با هیچ کەس ووشتری تووشبوو نەباتە سەرئاوی خاوەن ووشتری ساغ ، چونکە بە باشی نەزانیوە نەخۆش تێکەڵ بە ساغ بێت نەوەکو ئاوو خورووەکەی پیٚ بگات و تووشی بکات ٠

دەفەرمێت : بەڵام ڕەگەزەکەی دیکەی تەنینەوە ، وەکو بڵاوبونەوەی نەخۆشی چاوەقوڵەیە لە وەڵاتێکداو ، کەسانی تەندروستیش لەو وەڵاتە دەچنە دەرەوە لە ترسی تەنینەوەدا ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( إذا وقَعَ ببلدٍ وأنتُم به ، فلا تخرُجوا مِنْه ، وإذا كان ببلدٍ ، فلا تدخُلوه )) فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ (( إذا وقع ببلدٍ وأنتم به ، فلا تخرجوا مِنهُ )) واتە : (( ئەگەر لە وەڵاتێکدا بڵاوبویەوەو ئێوەی لێبوو ، لێی دەرمەچن )) لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ پێمان دەفەرمێت : ئێوە واگومان دەبن کە بە هەڵهاتنتان لە چارەنووسی خوا لە خوا ڕزگارتان دەبیٚ ٠ فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ : (( وإذا كان ببلد ، فلا تدخلوه )) واتە : (( ئەگەر لە وەڵاتێکدا بڵاوبویەوە ، مەچنە نێوی )) لێرەدا

پێغەمبەری خوا ﷺ پێمان دەفەرمێت : بە مانەوەتان لەو جێگەی کە تاعونی تێدا نی یە دڵتان زیاتر دەحەوێتەوەو ، گوزەرانتان خۆشتر دەبێ ٠ لەم بوارەدا ژن یا ماڵ بە شووم ناسراوەن ، کە پیاو تووشی ناخۆشیەك یاخود بەڵایەك دەبێ ، دەڵێ : ژن و ماڵەکە شومیەکەی بۆ تەنیمەوەو لێیدام ، ئەمە ئەو تەنینەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەیەوە فەرموویەتی : تەنینەوە نی یە ٠

کۆمەڵێکی دیکەش دەڵێن : بەڵکو فەرماندان بە خۆدورخستنەوە لە کەسی گوول و هەڵهاتن بۆ ( الاستحباب )و هەڵبژاردن و ، ڕێنمویی کردنە ، ٠ بەڵام بۆ لە گەڵیدا خواردن ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی ئەنجامدا بۆ بەدەرخستنی شیاوێتی و ، حەرام نەبوونی ٠

کۆمەڵێکی دیکەش دەڵێن : ئەم پەیامەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێرەدا بۆ بەشێکی خەڵکە نەك بۆ هەمووی ٠ بۆیە تەماشا دەکرێت پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەر یەکیان پەیامێکی فەرمووە بە باروحاڵیان شایستە بێت ، چونکە هەندێکی خەڵك ئیمانی بەهێزەو ، پشت بەستنی بەهێزە بە ئاستێك تەنینەوەی نەخۆشیەکە لە خۆی دور دەخاتەوە ، وەکو چۆن هێزی سروشت هێزی نەخۆشیەکە دووردەخاتەوەو پوچی دەکاتەوە ، کەچی هەندێ خەڵکی تر ئەو هێزەی تێدا نی یە ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم پەیامەی خۆی ئاڕاستەی ئەم جۆرە خەڵکە کردووە بۆ ئاگاداری وەرگرتن و خۆپارێزی ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو بارەکەشی پێکەوە ئەنجامداوە ، بۆ ئەوەی ئومەتەکەی چاوی لێکەن و پەیڕەویی بکەن ، بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی لە ئومەتەکەیدا بەهێزن ڕێگەی پشت بەستن و هێزو متمانەی تەواو بە خوا هەڵبژێرن و ، ئەوەشیان کە لاوازە ڕێگەی ئاگاداری وەرگرتن و خۆپارێزی بەکاربێنن و ، هەردوو ڕێگەکەش ( صحیح )و تەواون :

یەکەمیان : بۆ باوەڕدارانی بەهێز ٠

ئەویتریشیان : بۆ باوەڕدارانی لاواز ٠

لێرەشدا هەر کۆمەڵێکیان بەڵگەیەکی بەدەستەوە دەبێ و پێشەنگێشی دەبێ ئەو کارەی ئەنجام دابێ بە گوێرەی باروحاڵیان و ئەوەی بۆیان شایستەیە ، ئەمەش بەهاوشێوەی هەستانی پێغەمبەری خوایە ﷺ بە داخکردن و ، ستایشی ئەو کەسەشی کردووە کە وازی لێدەهێنێت ، چونکە وای داناوە ئەو کەسەی وازی لێدەهێنێت پشت بەستنێکی تەواوی بەخوای تعالی هەیە ، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ وازی لە شوومی و ڕەشبینی هێناوەو ، هاوشێوەی ئەمەش لە شەرعدا زۆرە ، ئەمەش ڕێگەیەکی ناسك و زۆر چاکە بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێ هەقی خۆی بدەنێ ، بەتایبەت ئەو کەسانەی توانای لێکدانەوەی نەفسی خۆیانیان پێدراوە ، بەمەش ئەو دژ بە یەك بوونەی هەستی پێ دەکات لە سوونەتی ( صحیح )دا نامێنێت و لادەچێت ٠

کۆمەڵێکی تریش وای بۆ دەچن کە فەرمان کردن بە هەڵهاتن و ، خۆ دوورخستنەوە بۆ شتێکی سروشتیە ، کە بریتیە لە گواستنەوەی نەخۆشیەکە بۆ کەسی تەندروست بە دەست پێوەدان و تێکەڵبوون و بۆن کردن ، ئەم بارەش بە دووبارەکردنەوەی تێکەڵبوون و دەست پێوەدان دەبێ ، پێغەمبەری خواش ﷺ کە هەستا بە خواردن لە گەڵ کەسێکی گوولدا بۆ بەرژەوەندیەکی پەسەندکراوبوو ، هیچی تێدا نی یەو ، بە یەك جارو یەك ساتیش تەنینەوەی نەخۆشی دروست نابێت ، بەڵام قەدەغەی کردووە بۆ ئەوەی نەبێت بە هۆکارێك بۆ بڵاوبونەوەی نەخۆشی و فەوتاندن ، هەروەها بۆ پاراستنی تەندروستی ، بە تێکەڵبونێکیش تێکەڵیان بوو لەبەر پێویستی و بەرژەوەندیەك ، بۆیە هیچ دژ بە یەك بوونێك لە نێوان هەردوو شتەکەدا بەدیناکرێت ٠

کۆمەڵێکی تریش دەڵێن : پێدەچێ ئەو کەسە گوولەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەڵیدا خۆراکی خواردبێ نەخۆشیەکەی شتێکی کەم بێ و تەنینەوە دروست نەکات ، کەسانی گوولیش هەموویان وەکو یەك نین و ، ئەو تەنینەوەش لێیانەوە دروست دەبێ هەمووی وەکو یەك نی یە ، بەڵکو تێکەڵبوونی کەسانێکیان زیانی نی یەو ، تەنینەوە دروست ناکات ، ئەو

كەسە گوولەش توشی شتێكی كەمی گوولی بوبو ، پاشان وەستاو لەسەر بارەكەی بەردەوام بوو ، گولیەكەش نەتەنیەوە بۆ سەراپای لەشی ، بۆیە بە شایستەتر نەخۆشیەكەی ناتەنێتەوە بۆ كەسانی تر ٠

كۆمەڵێكی تریش دەڵێن : خەڵكانی تاڤ نەفامی بڕوایان وابوو كە تەنینەوەی نەخۆشیە پەتاكان بە خودێكی سروشتی دەبێت ، بەبێ ئەوەی بیگەڕێننەوە بۆ خوای تعالی ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو باوەڕەی پوچكردنەوەو ، لە گەڵ كەسە گوولەكەدا خۆراكی خواردو ، بۆی ڕوون كردنەوە كە خوای تعالایە نەخۆش دەخات و چاكیش دەكاتەوە ، قەدەغەی نزیكبوونەوەی خەڵكیشی لێكردن بۆ ئەوەی بۆیان ڕوون بكاتەوە كە خودی نزیكبوونەوە یەكێكە لەو هۆكارانەی لە لایەن خوای پەروەردگارەوە دانراوە بۆ دروستبوونی نەخۆشیەكە ، كاتێكیش پێغەمبەری خوا ﷺقەدەغە دەكات لە ڕاستیدا هەڵدەستێت بە جێكركردنی ئەو هۆكارانەی نەخۆشی دروست دەكەن ، كردوەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاشكەرای دەكات كە نەخۆشیەكان سەربەخۆیان وەرنەگرتووە لە كاركردندا ، بەڵكو هەموو شتێك خوای تعالایە ، ویستی هەبێت هێز لە نەخۆشیەكە وەردەگرێتەوەو چیتر كاریگەری نابێت و ، ویستیشی هەبێت هێزەكەی دەهێڵێتەوەو كاریگەری دروست دەكات ٠

كۆمەڵێكی تریش دەڵێن : بەڵكو فەرموودەكان ( ناسخ و منسوخ )ی تێدایە ، تەماشای مێژووەكەی دەكرێت ، ئەگەر زانرا فەرموودەیەكیان دواكەوتوترە ، حوكم دەدرێت كە ( ناسخ )ە ، ئەگەر بەو جۆرەش نەبوو ، تیایدا دەوەستین ٠

كۆمەڵێكی تریش دەڵێن : هەندێ لەو فەرموودانە جێگیرەو ، هەندێكیشیان جێگیر نین ، بۆیە سەبارەت بە فەرموودەی : (( لا عدوى )) دەڵێت : یەكەم جار هاوەڵی بەڕێز ( أبوهريرة ) دەیگێڕایەوە ، پاشان لەو بارەوە گومانی بۆ دروست بوو وازی لێهێنا ، دیسان سەبارەت بەو فەرموودە ڕاوێژیان پێكردو ، گوتیان : گوێبیستت بوین دەتگێڕایەوە ، بەڵام قایل نەبوو بیگێڕێتەوە ٠

( أبوسلمة ) دەڵێت : ئیتر نازانم ، ( أبوهريرة ) بیری چوو ، یاخود یەكێك لە فەرموودەكان ئەویتری ( نسخ ) كردەوە ؟

بەڵام فەرموودەكەی ( جابر ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ : (( أنَّ النبيَّ ﷺ أخذ بيدِ مجذوم ، فأدخلها معه في القصعة )) واتە : (( پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی كەسێكی گوولی گرت و ، لە گەڵ خۆیدا دەستی خستە نێو لەگەنەكەوە )) ، فەرموودەیەكی ( صحيح ) نیەو ، بۆ بەرزترین پلەشی ئیمامی ( الترمذي ) فەرموویەتی فەرموودەیەكی ( غريب )ەو ، نە بە ( صحيح )ی داناوەو نە بە ( حسن )یشی داناوە · ( شعبة ) دەڵێت : خۆتان بپارێزن لەو فەرموودە ( غريب )انە · ئیمامی ( الترمذي ) فەرموویەتی : لە چوارچێوەی كردەوەكانی ( عمر )ەوە ( ريوايە )ت كراوە ، ئەمەش جێگیرترە ، ئەمەیە باری ئەم دوو فەرموودەیەی كە بەرهەڵستی فەرموودەكانی قەدەغەكردنی پێ دەكرێت :

یەكێكیان : ( أبوهريرة ) پەشیمان بۆتەوە لە گێڕانەوەیداو نكوڵیی لێ كردووە ·

دووەمیشیان : بە ( صحيح )ی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ( ريوايە )ت نەكراوە ، لە كتێبی ( المفتاح )دا بە تێروتەسلیی سەبارەت بەم مەسەلە دواوین ، وباللە التوفيق ·

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە قەدەغەكرنی خۆچارەسەركردن بە حرامكراوەكان :

رَوَى أَبُو دَاوُدَ فِي " سُنَنِهِ " مِنْ حَدِيثِ أَبِي الدَّرْدَاءِ _ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ _ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ (( إِنّ اللّهَ أَنْزَلَ الدّاءَ وَالدّوَاءَ ، وَجَعَلَ لِكُلّ دَاءٍ دَوَاءً ، فَتَدَاوَوْا ، وَلَا تَدَاوَوْا بِالْمُحَرّمِ ))[١٩٧] واتە : لە ( أبي الدَّرداء )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ

١٩٧ _ إسناده ضعيف : أخرجه أبوداود ( ٣٨٧٤ ) ، وضعفه الألباني ·

فەرمووی : (( خوای تعالی نەخۆشی و دەرمانەکەشی دابەزاندووەو ، بۆ هەر نەخۆشیەکیش دەرمانێکی داناوە ، بەوە چارەسەر بکەن و ، بە شتی حەرام چارەسەر مەکەن )) ٠

وَذَكَر الْبُخَارِيّ فِي " صَحِيحِهِ " عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ : إنّ اللّهَ لَمْ يَجْعَلْ شِفَاءَكُمْ فِيمَا حَرّمَ عَلَيْكُمْ٠[١٩٨]

واتە : ئیمامی ( البخاري ) لە ( صحيح )ەکەیداو لە ( ابن مسعود )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ دەگێڕێتەوە ، فەموویەتی : خوای تعالی شیفای ئێوەی لە شتە حەرام کراوەکاندا دانەناوە ٠

وَفِي " السّنَنِ " : عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، قَالَ : (( نَهَى رَسُولُ اللّهِ ﷺ عَنْ الدّوَاءِالْخَبِيثِ ))[١٩٩]
واتە : لە ( أبي هُريرة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : (( پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی خۆ چارەسەرکردنی کردووە بە دەرمانە پیسەکانی وەکو مەی و ژەهر )) ٠

وَفِي " صَحِيحِ مُسْلِمٍ " عَنْ طَارِقِ بْنِ سُوَيْدٍ الْجُعْفِيّ أَنّهُ سَأَلَ النّبِيّ ﷺ عَنْ الْخَمْرِ ، فَنَهَاهُ ، أَوْ كَرِهَ أَنْ يَصْنَعَهَا ، فَقَالَ : إنّمَا أَصْنَعُهَا لِلدّوَاءِ ، فَقَالَ : (( إنّهُ لَيْسَ بِدَوَاءٍ وَلَكِنّهُ دَاءٌ ))[٢٠٠]

واتە : لە ( طارق )ی کوڕی ( سُوَيْدٍ الجُعْفي )وە _ خوای لێ ڕازی بێت _ : کەوا سەبارەت بە مەی لە پێغەمبەری خوای ﷺ پرسیبوو ، ئەویش قەدەغەی کردبوو ، یاخود بەباشی

---

١٩٨ _ ذكره البخاري تعليقاً ( ١٠ / ٦٨ ) في الطب باب شراء الحلواء والعسل

١٩٩ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٢ / ٣٠٥ ، ٤٤٦ ، ٤٧٨ ) وأبوداود ( ٣٨٧٠ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٥٩ ) ، والترمذي ( ٢٠٤٥ ) كلهم من طريق يونس بن أبي إسحاق عن مجاهد عن أبي هريرة فذكره٠

٢٠٠ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٤ / ٣١١ ، ٣١٧ ، ٣٩٩ ) ، والدارمي ( ٢١٠١ ) ، ومسلم ( ٦ / ٨٩ ) ، وأبوداود ( ٣٨٧٣ ) ، والترمذي ( ٢٠٤٦ ) كلهم من طريق سماك بن حرب عن علقمة بن وائل عن أبيه فذكره

نەزانی دروستی بکات ، ( طارق )یش پێی فەرمووی : لە ڕاستیدا بۆ دەرمان دروستی دەکەم ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : (( دڵنیابە ئەوە دەرمان نی یە بەڵکو نەخۆشیە )) ٠

وَفِي " السّنَنِ " أَنّهُ ﷺ سُئِلَ عَنْ الْخَمْرِ يُجْعَلُ فِي الدّوَاءِ ، فَقَالَ : (( إِنّهَا دَاءٌ وَلَيْسَتْ بِالدّوَاءِ ))[٢٠١] رواه أبوداود ، والترمذي .

واتە : لە پێغەمبەری خوایان ﷺ پرسی سەبارەت بەوەی مەی وەکو دەرمان بەکاربێت ، ئەویش فەرمووی : (( ئەوە نەخۆشیە نەك دەرمان )) ٠

وَفِي " صَحِيحِ مُسْلِمٍ " عَنْ طَارِقِ بْنِ سُوَيْدٍ الْحَضْرَمِيّ قَالَ : قُلْت : يَا رَسُولَ اللّهِ إِنّ بِأَرْضِنَا أَعْنَابًا نَعْتَصِرُهَا فَنَشْرَبُ مِنْهَا ، قَالَ : " لَا " فَرَاجَعْته قُلْتُ : إِنّا نَسْتَشْفِي لِلْمَرِيضِ قَالَ : (( إِنّ ذَلِكَ لَيْسَ بِشِفَاءٍ وَلَكِنّهُ دَاءٌ ))[٢٠٢] .

واتە : لە ( طارق )ی کوڕی ( سُوَيْدٍ الحَضْرَمِيّ )وە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : گووتم : ئەی پێغەمبەری خوا زەویەکانی ئێمە ترێکەلێکی لێیە دەیگووشین بۆ ( مەی )و لێی دەخۆینەوە ، فەرمووی : نەخێر ، ( طارق ) فەرموویەتی : جارێکی تر وەڵامم بۆ ناردەوەو گوتم : ئەوە بۆ چارەسەری نەخۆشی بەکاردێنین فەرمووی : (( ئەوە چارەسەر نی یە بەڵکو نەخۆشیە ))

وَفِي " سُنَنِ النّسَائِيّ أَنّ طَبِيبًا ذَكَرَ ضِفْدَعًا فِي دَوَاءٍ عِنْدَ رَسُولِ اللّهِ ﷺ فَنَهَاهُ عَنْ قَتْلِهَا[٢٠٣]
واتە لە ( سنن )ی ئیمامی ( النسائي )دا هاتووە کەوا پزیشکێك لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ لە دەرمانێکدا باسی بۆقی کرد ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد بۆق بکوژێت ٠

---

٢٠١ _ هو السابق ٠

٢٠٢ _ هو السابق ، وليس هذا لفظ مسلم ٠

وَيُذْكَرُ عَنْهُ ﷺ أَنَّهُ قَالَ : (( مَنْ تَدَاوَى بِالْخَمْرِ ، فَلَا شَفَاهُ اللَّهُ ))[٢٠٤]

واتە : لە پێغەمبەری خواوە ﷺ باسکراوە کەوا فەرموویەتی : (( هەرکەس بە مەی چارەسەر دەکات ، خوای تعالی شیفای نەدات )) .

خۆچارەسەرکردن بە شتە حەرامەکان قیزەونە لە ڕووی شەرع و لە ڕووی ئەقڵیشەوە ، لە ڕووی شەرعەوە ئەو فەرموودانە بوو کە لە سەرەوە باسکران . بەڵام لە ڕووی ئەقڵەوە : خوای تعالی ئەو شتانەی حەرام کردووە لەبەر پیسێتیان ، بەڵام شتە چاکەکانی لەم ئومەتە حەرام نەکردووە وەکو سزایەك ، بەهاوشێوەی ئەو حەرامکردنەی کە سەپاندی بە سەر ( بني إسرائيل )دا کە دەفەرمێت ﴿ فَبِظُلْمٍ مِنَ الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ ﴾[ سورة النساء:١٦٠ ] واتە ﴿ فَبِظُلْمٍ مِنَ الَّذِينَ هَادُوا ﴾ بەهۆی ستەم کردنەوە لە لایەن جولەکەکانەوە ﴿ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ ﴾ حەراممان کرد لێیان ﴿ طَيِّبَاتٍ ﴾ چەند خۆراکێکی پاك و خاوێن ﴿ أُحِلَّتْ لَهُمْ ﴾ کە حەڵاڵ کرابوو بۆیان[٢٠٥] ، بەڵکو چەند شتێکی لەم ئومەتە حەرام کردووە چونکە خودی ئەو شتانە پیسن و ، حەرامیشی کردووە وەکو پارێزێك بۆ بەندەکان و ، پاراستنیان لە خواردنی ، بۆیە لەم بارەوە بەشیاو دانانرێت وەکو چارەسەری نەخۆشیی بەکاربێت ، چونکە ئەگەرچی ڕۆلیی هەبێت لە لادانی نەخۆشیدا ، بەڵام پاشان نەخۆشیەکی گەورەتر لە دڵدا دروست دەکات بەهۆی ئەو پیسیەوە کە تیایدایە ، بۆیە ئەو کەسەی چارەسەر بە شتە حەرامەکان دەکات ، هەوڵیداوە بە نەخۆشخستنی دڵیی چارەسەری نەخۆشی جەستەی بکات.

---

٢٠٣ ـ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ٤٥٣ ، ٤٩٩ ) ، وعبد بن حميد ( ٣١٣ ) ، والدارمي ( ٢٠٠٤ ) ، وأبوداود ( ٣٨٧١ ، ٥٢٦٩ ) ، والنسائي ( ٧ / ٢١٠ ) كلهم من طريق ابن أبي ذئب ، عن سعيد بن خالد ، وعن سعيد بن المسيب بن عبدالرحمن بن عثمان فذكره .

٢٠٤ ـ إسناده صحيح : انظر الصحيحة ( ٢٨٨١ ) .

٢٠٥ ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان .

هەروەها لە بەر ئەوەی ئەو شتانە حەرامە ، بۆیە پێویستە مرۆڤ خۆی لێ لابدات و خۆی لێ بەدوور بگرێت ، بە هەر ڕێگەیەك بێت ، بەڵام ئەگەر وەکو دەرمان بەکارهێنرا ، ئەوە هانی مرۆڤ دەدات ئەو شتانەی بەلاوە پەسەندبێ و زیاتر بەکاری بێنێ ، ئەمەش دژ بە مەبەستی شەرعە ، لەلایەکی تریشەوە ئەو شتانە نەخۆشین وەکو ئەوەی شەرع بڕیاری لە سەر داوە ، بۆیە نابێ وەکو دەرمان بەکاربێت ٠

هەروەها شتە حەرامەکان سیفەتی بەدی و پیسی بە ڕوح و سروشتی مرۆڤ دەبەخشن ، چونکە جەستە کاردانەوەی خۆی دەبێت بەرامبەر بە چۆنیەتی دەرمانەکە ، بۆیە ئەگەر چۆنیەتی دەرمانەکە پیس بێت ، ئەوا پیسی بە سروشتی مرۆڤ دەبەخشێت ، کەواتە ئەگەر خودی دەرمانەکە پیس بوو ئیتر دەبێ چۆن بێ ؟ ، بۆیە خوای تعالی خۆراك و خواردنەوەو جلی پیسی لە بەندەکانی حەرام کردووە ، چونکە ڕوخسارو سیفەتی پیسی بە نەفس دەبەخشن ٠

هەروەها ڕێگەدان بە بەکارهێنانی ئەو شتە حەرامانە بۆ خۆچارەسەرکردن ، مەینەتیەکە زیاتر دەکات ، چونکە ئەگەر نەفس هەواداری بوو ، ئەوا دواتریش بۆ هەواو ئارەزووش بەکاری دەهێنێ ، بەتایبەت ئەگەر نەفسی مرۆڤ بزانی بۆی بەسوودەو ، نەخۆشیەکانی لادەباو شیفای بۆ دەهێنێ ، ئەوا دەبێ بە خۆشەویسترین شت بەلایەوە ، لێرەدا شەرع دەرگاکانی بەهانەی هەموو داخستووە بۆ ئەوەی بە هیچ شێوەیەك بەکار نەهێنرێت ، گومانی تێدا نیە ئەگەر لە لایەکەوە دەرگاکانی بەهانە دابخات بۆ بەکارنەهێنانی و ، لە لایەکی تریشەوە دەرگاکانی بەهانە بکاتەوە بۆ بەکارهێنانی وەکو دەرمان جیاوازی و دژ بە یەك بوون دروست دەکات و ئەمەش لە شەرعەوە دوورە ٠

هەروەها لەم دەرمانە حرامکراوانەدا نەخۆشی گەلێکی ئەوتۆی تێدایە ، کە زۆر زیاترە لەوەی کە خەڵك واگومان دەبات شیفای هەندێ نەخۆشی تێدا هەبێ ، بۆیە لە مەی و شەرابی

دایكی پیسەكاندا كە خوای تعالی بەهیچ شێوەیەك شیفای نەخستۆتە نێو ئـەم خواردنەوەیـەوە ، بەلای پزیشكان و ، زۆرێك لە شەرع زانان و قسەناسانەوە ، چەندین نەخۆشی بەهێز بۆ سـەر مێشك دروست دەكات كە سەنتەری ئەقڵە ٠

( أبقراط ) لە میانەی گوفتارەكانیدا لە سەر نەخۆشیە توندەكان دەڵێـت : زیـانی مـەی بـۆ سـەر توندوتیـژە ، چـونكە بـەخێرا بـۆی بـەرز دەبێتـەوە ، لـە گـەڵ بەرزبونـەودا خەڵتـەكانی لەشیش بەرزدەبنەوەو لە شوێنە بـەرزەكانی جەسـتەدا دەوەسـتن و ، زیـان بـە هۆشـی مرۆڤـ دەگەیەنن ٠

دانەری ( الكامل ) دەڵێت : زیان گەیاندن بە مێشك و دەمارەكان لـە خاسـیەتە گرنگـەكانی مەی و شەرابە ٠

بەڵام دەرمانە حەرامكراوەكانی دیكە دوو جۆرن :

یەكـەمیان : بـەلای دڵـەوە قیزەونـەو ، سروشـتی مرۆڤـیش یارمەتیـدەری نابێـت ، بـۆ دوورخستنەوەی نەخۆشیەكە وەكو ژەهرەكـان و ، گۆشـتی مـارو شـتە پـیس و پۆخڵـەكانی دیكـە ، بۆیـە وەكـو بـارێكی قـورس بـە سـەر سروشـتی مرۆڤـەوە دەمێنێتـەوەو دەبـێ بـە نەخۆشی نەك دەرمان ٠

دووەم : بەلای دڵـەوە قیـزەون نـی یـە وەكـو ئـەو خواردنەوانـەی كـە دایكـە سـك پڕەكـان بەكاریدەهێنن بۆ نموونە ، ئەمە زیانی لە سوودو كەڵكی زۆرترە ، ئەقڵیش بڕیاری حـەرامبوونی دەدات و ، لێرەدا ئەقڵ و فیترەتی مرۆڤـ جووتی شەرع دەبن ٠

لێـرەدا نهێنیـەكی ووردو ناسـك بەدیـدەكرێت سـەبارەت بـەوەی كـە حرامكراوەكـان بـۆ چارەسەر بەكار ناهێنرێت ، مـەرجی شـیفا وەرگـرتن لـە هـەر دەرمانێك ئەوەیـە بـە ئەوپـەڕی قبوڵبوونەوە وەربگیرێت ، باوەر هـەبێت بـە سـوودو كـەڵكی و ، خـوای تعـالی پـیرۆزی شیفای

پێدلوه ، چونكه شتی بەسوود پیرۆزی تێدایەو ، بـه سـوودترین شـتیش پیرۆزترینیانـه ، بۆیـه دەگوترێت پیاوی پیرۆز له هەر كوێ بێت ئەو پیاوەیه كه له هەر شوێنێك دابـەزی سـوودی لـێ ببینرێت ، زانراویشه ئەگەر موسڵمان باوەڕی بـه حـەرامێتی شـتێك هـەبوو ئـەوا ئـەو بـاوەڕەی دەبێ به ڕێگرێك له نێوان خودی خۆی و لـه نێـوان پـیرۆزی و سـوودی شـتەكه ، وه لـه نێـوان چاكێتی گومان پێبردن و ، وەرگرتنی ئەو شـته بـه ئەوپـەڕی قبوڵبوونـەوه ، بـەڵكو هەرچـەند بەنده باوەڕی بەهێزتر بێ ، ئەمەندەی تر حەزی پێ نابێـت و بیروباوەڕی بەرامبـەر بـەو شـته خراپ دەبێ و ، خووشی ئەمەندەی تر ئـەو شـتەی بـەلاوه قیـزەون دەبـێ ، بۆیـه ئەگـەر لـەم بارەدا بەكاری بێنێت دەبێ به نەخۆشی نەك دەرمان ، مەگەر مرۆڤ باوەڕی پیسێتی بەرامبـەر بەو شته نەمێنێت و ، خراپی گومان بردنی بگۆڕێت بۆ خۆشەویستی ، ئەمـەش دژیـه ئیمانـه ، چونكه خودی شتەكه حەرام و قیزەونه ، بۆیه مرۆڤی باوەڕدار بەردەوام له ڕووی نەخۆشیەوه تەماشای دەكات . والله أعلم .

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ له چارەسەركردنی ئەو ئەسپێیەی له سەردا پەیدا دەبێ و لابردنی :

في " الصّحيحَيْنِ " عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ، قَالَ : كَانَ بِي أَذًى مِنْ رَأْسِـي ، فَحُمِلْتُ إِلَـى رَسُـولِ اللّه ﷺ وَالْقَمْلُ يَتَنَاثَرُ عَلَى وَجْهِي ، فَقَالَ : (( مَا كُنْت أَرَى الْجَهْدَ قَـدْ بَلَـغَ بِـكَ مَـا أَرَى )) ، وَفِـي رِوَايَةٍ : فَـأَمَرَهُ أَنْ يَحْلِـقَ رَأْسَـهُ ، وَأَنْ يُطْعِـمَ فَرَقًـا بَـيْنَ سِـتَّةٍ ، أَوْ يُهْـدِيَ شَـاةً ، أَوْ يَصُـومَ ثَلَاثَـةَ أَيَّامٍ[٢٠٦] .

واته : له ( كَعْب )ی كوڕی ( عُجْرَة )ەوه _ خوای لێ ڕازی بێت _فەرموویەتی : ئازارێك لـه سـەرمدا بـوو ، هـەڵگیرام بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ، ئەسـپێش هەڵدەوەریـه دەم و

---

٢٠٦ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٤ / ٢٤٢ ، ٢٤٣ ) ، والبخاري ( ٣ / ١٣ ) ، ( ٦ / ٣٣ ) ، ومسلم ( ٤ / ٢١ ، ٢٢ ) ، وابن ماجة ( ٣٠٧٩ ) ، والترمذي ( ٢٩٧٣ ) ، كلهم عن طريق عبدالله بن معقل فذكره عن كعب بن عُجرة .

چاومدا ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( وای بۆ نەدەچووم شەکت و مانـدووبوونت بکات بەم ئاستەی کە دەیبینم )) ، لە ( ریوایە )تێکی دیکەشدا : فەرمانیدایە سـەری بتاشـیّ و ، سیّ ( صاع )ی دانەوێڵە بکات خۆراکی شەش کەس ، یاخود مەڕێك ببەخشێت ، یاخود سـیّ ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت .

ئەسـپیّ لـە سـەرو جەسـتەدا بـەهۆی دوو شـتەوە پەیـدا دەبـیّ : دەرەوەی جەسـتەو ناوەوەی جەستە ، بەڵام ئەوەی لە دەرەوەی جەستەدا پەیدا دەبیّ هۆکاری دەگەڕێتـەوە بۆ ئەو پیسی و پۆخڵیەی لە سەر جەستە کۆدەبێتەوە ، دووەمـیش : بـەهۆی خەڵتەیـەکی پیسی بۆگەنەوە کـە سروشـتی مرۆڤـ پـاڵی پێـوە دەنێـت بـۆ نێـوان پیسـت و گۆشـت و ، پاشان لە کونیلەکانەوە دەردەچێت ، لـە ڕووی پێستیشـدا بـە شـێوەیەکی زیـاتر بـەهۆی شێی خوێنەوە بۆگەن دەبیّ ، ئەمـەش ئەسـپیّ دروسـت دەکـات ، ئـەم دیاردەیـە بـەزۆری پاش نەخۆشـی زۆر دەبـیّ و ، بـەهۆی پیسیشـەوە ، لـە سـەری منداڵانـدا بـە شـێوەیەکی فراوانتر دەبینریّ چونکە زۆرتر ئەو هۆکارانە بـەکاردەهێنن کـە ئەسـپیّ دروسـت دەکـەن ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ سەری منداڵەکانی ( جعفر )ی تاشی .

گـەورەترین چارەسەریشـی سەرتاشـینە ، بـۆ ئـەوەی کونیلـەی شـێکان بکرێنـەوەو ، شـیّ پیسەکان بچنە دەرەوەو ، بەوەش مادەی خەڵتەکە لاواز دەبـیّ ، پاشـانیش پێویسـتە هـەموو سەر لەو دەرمانانە بگیرێت کە ئەسپیّ دەکوژن و ، دروستبوونی قەدەغە دەکەن .

**سەرتاشینیش سیّ جۆرە :**

یەکەمیان : بۆ خواپەرستی و هۆکارێکی نزیکبوونەوە لە خوای پەروەردگار .

دووەم : بیدعەو هاوەڵ پەیداکردن .

سیّ یەم : پێویستی و دەرمان .

کەواتە یەکەم : سەرتاشینە لە کاتی یەکێك لە خواپەرستیەکانی حەج یاخود عەمرەدا.

دووەم : سەرتاشین بۆ کەسانێکی تری جگە لە خوای پەروەردگار ٠ وەکو سەرتاشینی موریدەکان بۆ شێخەکانیان ، بۆیە کەسانێکیان دەڵێن : من سەرم تاشیوە بۆ فلان کەس و ، تۆش تاشیوتە بۆ فلان کەس ، ئەمە لە پلەی ئەوەدایە کە بڵێت : سوژدەم بۆ فلان کەس برد ، چونکە سەرتاشین ملکەچی و بەندایەتی و زەبوونی دەنوێنێ ، بۆیە لە تەواوکاریەکانی حەجە ، تا ئەو ئاستەی بەلای ئیمامی ( الشافعي )وە پایەیەکە لە پایەکانی حەج کە تەواو نابێت تەنها بەو نەبێ ٠ مرۆڤ کە پێشەسەری لە پێش دەستی خواکەیدا دادەنێ ، وەکو ملکەچیەك بۆ گەورەیی و ، زەبوونیەك بۆ شکۆمەندی ، لە بەرزترین جۆرەکانی پەرستنە ، بۆیە ئەگەر عەرەبەکان ویستی زەبوونکردنی دیل و بەردانیان هەبوایە ، سەریان دەتاشی و بەریان دەدا ، پاشان شێخەکانی گومڕایی و پێش برکێ کارانی پەروەردگارێتی ئەوانەی بنچینەی شێخێتیان لە سەر بیدعەو هاوەڵ پەیداکردنە ، هاتن و ویستیان موریدەکانیان پەرستنیان بۆ بکەن و ، بۆیان ڕازاندنەوە کە سەرتاشینیان بۆ بکەن ، وەکو چۆن بۆیان ڕازاندنەوە سژودیان بۆ بەرن ، بەڵام بەناوێکی ترەوە ناویان دەهێناو ، دەیانگووت : تەنها سەر دانانێکە لە پێش دەستی شێخدا ، سوێند بەخوا سوژدەبردنیش بۆ پەروەردگار هەر تەنها بریتیە لە سەردانان لە پێش دەستیدا ، پاشان ئەو شێخانە بۆیان ڕازاندنەوە کە نەزریان بۆ بکەن و ، تەوبەو پەشیمانیان بۆ دەربڕن و ، بەناوی ئەوانەوە سوێند بخۆن ، هەموو ئەمانەش خودی بە پەرستراوکردن و خودی کردنیانە بە خواوەند بەدەر لە خوای پەروەردگار ، خوای تعالی دەفەرمێت : ﴿ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَنْ يُؤْتِيَهُ اللَّهُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا عِبَادًا لِي مِنْ دُونِ اللَّهِ وَلَكِنْ كُونُوا رَبَّانِيِّينَ بِمَا كُنْتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَابَ وَبِمَا كُنْتُمْ تَدْرُسُونَ ٠ وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَنْ تَتَّخِذُوا الْمَلَائِكَةَ وَالنَّبِيِّينَ أَرْبَابًا أَيَأْمُرُكُمْ بِالْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنْتُمْ مُسْلِمُونَ ﴾[ آل عمران : ٧٩ _ ٨٠ ] واتە : ﴿ مَا كَانَ لِبَشَرٍ ﴾ نابێ بۆ هیچ ئادەمی یەك ﴿ أَنْ يُؤْتِيَهُ اللَّهُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ ﴾ کە خوا نامەو شەرعەت و پێغەمبەرێتی دابێتێ ﴿ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ ﴾ پاشان بە خەڵکی بڵێت ﴿ كُونُوا عِبَادًا لِي ﴾ ببن بە بەندەی من ﴿ مِنْ دُونِ اللَّهِ ﴾ لە جیاتی خوا ﴿ وَلَكِنْ كُونُوا رَبَّانِيِّينَ ﴾ بەڵکو ( پێیان دەڵێت ) خواپەرست بن ﴿ بِمَا كُنْتُمْ تُعَلِّمُونَ

الْكِتَابَ ﴾ چونكه ئێوه دەرسی نامەی ئاسمانی دەڵێنەوه ﴿ وَبِمَا كُنْتُمْ تَدْرُسُونَ ﴾ وه ئێوه خۆشتان دەیخوێنن . ﴿ وَلا يَأْمُرَكُمْ أَنْ ﴾ وه خوا فەرمانتان پێ نادات ﴿ أَنْ تَتَّخِذُوا الْمَلائِكَةَ وَالنَّبِيِّينَ ﴾ كه فریشتەو پێغەمبەران بكەن ﴿ أَرْبَابًا ﴾ به پەرستراوی خۆتان ﴿ أَيَأْمُرُكُمْ بِالْكُفْرِ ﴾ چۆن فەرمانتان پێ دەدات بێ بڕوابن ( كافرين ) ﴿ بَعْدَ إِذْ أَنْتُمْ مُسْلِمُونَ ﴾ دوای ئەوەی كه ئێوه بڕواداربوون ؟!(٢٠٧).

پایەبەرزترین بەندایەتی دەربڕینیش بەندایەتی دەربڕینی نوێژه ، كه شێخ و وێچوان و زۆرداران له نێوان خۆیاندا هەستاون به دابەشكردنی ، شێخەكان پایەبەرزترین شتی نوێژیان بردووه كه سژوده ، كەسانی وێچوانیش به زانایان ركوعیان بردووەو ، هەركات یەكتریان چاوپێكەوت ركوع بۆ یەكتر دەبن ، وەكو چۆن ركوع بۆ خوای تعالى دەبەن ، زۆردارانیش هەستانی نوێژیان بردووه ، بۆیه ئازادان و كوێلەكان بەسەریانەوه دەوەستن وەكو بەندایەتی دەربڕینێك و ئەوانیش دانیشتوون ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەووردی قەدغەی ئەو سێ ڕەفتارەی سەرەوەی كردووه ، بۆیه بەكارهێنانی سەرپێچیەكی ئاشكرای پێغەمبەری ڕەحمەت و بەزەیه ، قەدەغەی كردووه سژود بۆ جگه لەخوای پەروەردگار ببرێت و فەرموویەتی : (( لا ينبغي لأحد أن يسجُدَ لأحدٍ ))(٢٠٨) واته پێویسته هیچ كەس سژوود بۆ كەسێكی تر نەبات . نكوڵیشی له هاوەڵی بەڕێز ( مُعاذ ) كرد كاتێ سژوودی بۆ بردو فەرمووی : ( مَهْ )(٢٠٩) واته : دەست بكێشەرەوەو واز لەو كرداره بێنه . حەرامبوونی ئەمەش له ئاینەكەیدا زۆر بەدڵنیایی زانراوه ، ئەو كەسانەش بۆ كەسانی تری جگه له خوای تعالای به شیاو دادەنێن ، له ڕاستیدا دەیانەوەی پێش بركێی خواو پێغەمبەرەكەی پێبكەن ، چونكه سژوودبردن پایەدارترین پلەكانی بەندایەتی نوانده ، بۆیه ئەگەر ئەم كەسه هاوەڵ پەداكاره سژوودبردن بۆ مرۆڤ به

٢٠٧ ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان .

٢٠٨ ـ إسناده صحيح : صححه الألباني في الإرواء ( ١٩٩٨ ) .

٢٠٩ ـ حسن صحيح : أخرجه أحمد ( ٥ / ٢٢٧ ) عن أبي ظبيان عن معاذ بن جبل فذكره ، وأخرجه أحمد ( ٥ / ٢٢٨ ) عن أبي ظبيان يحدث عن رجل من الأنصار عن معاذ بن جبل فذكره نحوه .

شياو دابنێت ، ئەوا بەندايەتی نواندنی بۆ جگە لە خوای پەروەردگاری بە شياو داناوە ، وقد صَحَّ أنه قيل له : الرَّجلُ يَلقَى أخاه أينْحَني له ؟ قال : لا · قيل : أيَلْتَزِمُه ويُقَبِّلُهُ ؟ قال : لا · قيل : أيُصافِحَه ؟ قال : نعم[210] واتە : بە ( صحيح )ی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ( ريوايە )ت كراوە كەوا پرسياری لێكرا : پياو چاوی بە براكەی دەكەوێت ئايا بۆی بچەمێتەوە ؟ فەرمووی : نەخێر · گووترا : لە ئامێزی بگرێت و ماچی بكات ؟ فەرمووی : نەخێر · گووترا : ئايا تەوقەی لـــە گەڵ بكات ؟ فەرمووی : بەڵێ ·

هەروەها · چەمانەوە لە كاتی سڵاوكردندا سڕوودو كڕنووشە ، خـوای تعـالی فەرموويـەتی : ﴿ وادْخُلُوا البابَ سُجَّدا ﴾[ البقرة : ٥٨ ] واتە : وە لە دەرگـاوە بچـنە ژوورەوە بـە ملكەچـی ( بـە كرنووشـەوە )(٢١١)، ئـەگينا لـە توانـادا نـی يـە بچـينە ژوورەوە بـۆ لای بـاج وەرگـران ، هەروەها بە ( صحيح )ی لـە پێغەمبـەری خـواوە ﷺ هـاتووە كـەوا قەدەغـەی كـردووە ئەگـەر كەسێك هاتە ژوورەوە دانيشتوان هەستن ، بە هاوشێوەی ئەو بەگـەورە دانانـەی كـە خـەڵكانی عەجەم بەرامبەر بە يەكتر دەری دەبڕن ، تا گەشتە ئەو ئاستەی لە نوێژيشدا قەدەغـەی كـردن و ، فەرمانی پێكردن ئەگەر بە دانيشتنەوە نوێژی كرد ئـەوانيش بـە دانيشـتنەوە نوێـژ بكـەن ، ئەمە لە كاتێكدايە كە تەندروستن و هيچ بەهانەيەكيان نی يە ، بـۆ ئـەوەی بـە سـەر سـەريەوە نەوەسـتن و ئـەو دانيشـتبێت ، هەرچـەند هەستانەكەشيان بـۆ خوايـە ، ئـەی هەسـتانی بـە گەورەدانان و بەندايەتی بۆ كەسانی تری جگە لە خوای پەروەردگار دەبێ چۆن بێ ؟

مەبەستيش ئەوەيە : كە نەفسە نەفامە گومڕاكان بەندايەتی كردنيان بۆ خوای پـەروەردگار لابردوو و ، ئەو بەديهێنراوە هاوەڵانـەيان لـە گەڵدا دانـاون كـە بـە گـەورەيان دادەنـێن ، بۆيـە سڕووديان بۆ غەيری خوای تعالی بردو ، ڕكوعيـان بـۆ بـردو ، وەسـتان لـە پـێش دەسـتيدا بـە

---

٢١٠ ــ إسناده صحيح : أخرجه الترمذي ( ٢٧٢٩ ) ، وأحمد ( ٣ / ١٩٨ ) ، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ( ٢١٩٥ ) ·

٢١١ ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسيری قورئان ·

هاوشێوەی وەستانیان لە نوێژدا ، سوێندیان پێ خواردن و ، نەزریان بۆ کردن و ، سەریان بۆ تاشین و ، سەربڕینیان بۆ کردن و ، بە دەوری شتگەلێکی تری جگە لە ماڵەکەی خوادا سووڕانەوەو ، بە گەورەیان دانان و خۆشەویستن و ، ترس و ، پاڕانەوەو ، ملکەچیان بۆ نواندن، وەکو چۆن پەروەردگار بە گەورە دەگیرێت ، بەڵکو زیاتریش ، بەدیهێنراوە پەرستراوەکانیان لە گەڵ خوای تعالادا یەکسان کرد ، ئەمانەن کە دژ بە بانگەوازی پێغەمبەرانن ، ئەمانەن کە هاوتا بۆ خوا دادەنێن و ، لە ئاگریشدا لە گەڵ خواوەندەکانیاندا مشتومڕ دەکەن ﴿ تَاللهِ إن كُنَا لَفي ضَلالٍ مُبينٍ إذ نُسَوِّكُم بِرَبِّ العَالَمين ﴾ [ الشعراء : ٩٨ ] ﴿ تَاللهِ إن كُنَا لَفي ضَلالٍ مُبينٍ ﴾ سوێند بەخوا ئێمە لە گومڕایەکی ئاشکەرادا بووین ﴿ إذ نُسَوِّكُم بِرَبِّ العَالَمين ﴾ کاتێك ئێوەمان دەبردە ڕیزی پەروەردگاری جیهانیانەوە[٢١٢] ، ئەمانەن کە خوای تعالى دەربارەیان دەفەرمێت ﴿ ومِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللهِ أندَاداً يُحِبُّونهمْ كَحُبِ اللهِ ، والذينَ آمنوا أشَدُّ حُبّاً للهِ ﴾ [ البقرة : ١٦٥ ] واتە : ﴿ ومِنَ النَّاسِ مَن ﴾ وە کەسانی واهەیە لە خەڵکی ﴿ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللهِ أندَاداً ﴾ کە هاوبەشی زۆر بۆ خوا پەیدا دەکەن ﴿ يُحِبُّونهمْ ﴾ خۆشیان دەوێن ﴿ كَحُبِ اللهِ ﴾ وەك خۆشەویستی ( ئیمانداران بۆ ) خوا ﴿ والذينَ آمنوا أشَدُّ حُبّاً للهِ ﴾ بەڵام ئەوانەی بڕوایان هێناوە زۆر زیاتر خوایان خۆش دەوێ[٢١٣] ، هەموو ئەمانە شیرك و هاوەڵ پەیداکردنن و ، خوای پەروەردگاریش لەو کەسانە خۆش نابێت کە هاوەڵی بۆ پەیدا دەکەن ، ئەم باسەمان توێژینەوەیەك بوو لە میانەی باسی ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە سەرتاشین ، پێدەچێ لەوەش گرنگتربێ کە مەبەستی سەرەکی باسەکەمان بوو · والله أعلم.

---

٢١٢ ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ·

٢١٣ ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ·

# بەشی دووەم

## چەند بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەركردندا بە دەرمانە ڕوحیە خواوەندیە تاكەكان و ، ئاوێتەیەك لەو و ، لە دەرمانە سروشتیەكان :

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەركردنی چاو لێدراودا :

رَوَى مُسْلِمٌ فِي " صَحِيحِه " عَنْ ابْنِ عَبّاسٍ ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ (( الْعَيْنُ حَقّ وَلَوْ كَانَ شَيْءٌ سَابَقَ الْقَدَرَ ، لَسَبَقَتْهُ الْعَيْنُ ))(٢١٤) .

واتە : لە ( ابن عباس )ەوە _ خوا لە خۆی وبابیشی ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( چاو پیسی ڕاستە ئەگەر شتێكیش هەبوایە پێشی چارەنووس بكەوتایە ، چاوی پێش دەكەوت )) .

وَفِي " صَحِيحِهِ " أَيْضًا عَنْ أَنَسٍ ، أَنّ النّبِيّ ﷺ رَخّصَ فِي الرّقْيَةِ مِنْ الْحُمَةِ ، وَالْعَيْنِ وَالنّمْلَةِ(٢١٥) .

---

٢١٤ _ صحيح : أخرجه مسلم ( ٢١٨٨ ) .

٢١٥ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ١١٨ ، ١١٩ ، ١٢٧ ) ، ومسلم ( ٧ / ١٨ ) ، وابن ماجة ( ٣٥١٦ ) ، والترمذي ( ٢٠٥٦ ) ، كلهم عن عاصم بن سليمان الأحول عن يوسف بن عبدالله عن أنس فذكره ، إلا أن الترمذي قال : عن عاصم عن عبدالله بن الحارس عن أنس فذكره

واته : له ( أنس )ەوه _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوه نوشته بکرێت له چاو پیسی و گەستنی گیانداری ژەهراوی و برینی پێست ٠

وَفِي " الصّحِيحَيْنِ " مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ ، (( الْعَيْنُ حَقّ ))(٢١٦).

واته : له ( أبي هُريرة )ەوه _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( چاوپیسی ڕاسته )) ٠

وَفِي سُنَنِ أَبِي دَاوُدَ " عَنْ عَائِشَةَ _ رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا _ قَالَتْ : كَانَ يُؤْمَرُ الْعَائِنُ فَيَتَوَضّأُ ، ثُمّ يَغْتَسِلُ مِنْهُ الْمَعِينُ"(٢١٧).

واته : له ( عائشة )ەوه _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموویەتی : فەرمان به چاوپیس دەکرا دەستنوێژی دەشت و ، ئینجا بەو ئاوه کەسی بەچاوەوەبوو خۆی دەشت ٠

في الصّحِيحَيْنِ " عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ : أَمَرَنِي النّبِيّ ﷺ أَوْ أَمَرَ أَنْ نَسْتَرْقِيَ مِنْ الْعَيْنِ"(٢١٨).

واته : له ( عائشة )ەوه _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردم یا فەرمانیدا نوشته بکەین له چاوی پیس ٠

وَذَكَرَ التّرْمِذِيّ مِنْ حَدِيثِ سُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ عَامِرٍ ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ رِفَاعَةَ الزّرَقِيّ ، أَنّ أَسْمَاءَ بِنْتَ عُمَيْسٍ قَالَتْ ، يَا رَسُولَ اللّهِ إنّ بَنِي جَعْفَرٍ تُصِيبُهُمْ

---

٢١٦ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٢ / ٣١٩ ) ، البخاري ( ٧ / ١٧١ ، ٢١٤ ) ، ومسلم ( ٧ / ١٣ ) ، وأبوداود ( ٣٨٧٩ ) كلهم من طريق عبدالرزاق بن همام ، قال : حدثنا معمر ، عن همام بم منبه ، فذكره عن أبي هريرة مرفوعاً ٠

٢١٧ _ إسناده صحيح : أخرجه أبوداود ( ٣٨٨٠ ) عن الأسود عن عائشة فذكرته ٠

٢١٨ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٦ / ٦٣ ، ١٣٨ ) ، البخاري ( ٧ / ١٧١ ) ، ومسلم ( ٧ / ١٧ ) ، وابن ماجة ( ٣٥١٢ ) كلهم عن معبد بن خالد عن عبدالله بن شداد فذكره عن عائشة ٠

الْعَيْنُ ، أَفَأَسْتَرْقِي لَهُمْ ؟ فَقَالَ : (( نَعَمْ فَلَوْ كَانَ شَيْءٌ يَسْبِقُ الْقَضَاءَ لَسَبَقَتْهُ الْعَيْنُ ))[219] قَالَ التِّرْمِذِيّ : حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ .

واته : ( أسماء )ى كچى ( عُمَيْس ) خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرمووى : ئەى پێغەمبەرى خوا كوڕەكانى ( جعفر ) دەبن بە چاوى پيسەوە ، نوشتەيان بۆ بكەم ؟ فەرمووى : (( بەڵێ ئەگەر شتێك پێشى چارەنووس بكەوتايە چاو پێشى دەكەوت )) .

وَرَوَى مَالِكٌ رَحِمَهُ اللَّهُ ، عَنْ ابْنِ شِهَابٍ ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ، قَالَ : رَأَى عَامِرُ بْنُ رَبِيعَةَ سَهْلَ بْنَ حُنَيْفٍ يَغْتَسِلُ ، فَقَالَ : وَاللَّهِ مَا رَأَيْتُ كَالْيَوْمِ وَلَا جِلْدَ مُخَبَّأَةٍ ، قَالَ : فَلُبِطَ سَهْلٌ ، فَأَتَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَامِرًا ، فَتَغَيَّظَ عَلَيْهِ ، وَقَالَ : (( عَلَامَ يَقْتُلُ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ ؟ أَلَا بَرَّكْتَ ؟ اغْتَسِلْ لَهُ )) فَغَسَلَ لَهُ عَامِرٌ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ وَمِرْفَقَيْهِ وَرُكْبَتَيْهِ ، وَأَطْرَافَ رِجْلَيْهِ ، وَدَاخِلَةَ إِزَارِهِ فِي قَدَحٍ ، ثُمَّ صَبَّ عَلَيْهِ ، فَرَاحَ مَعَ النَّاسِ.

وَرَوَى مَالِكٌ رَحِمَهُ اللَّهُ أَيْضًا عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلٍ ، عَنْ أَبِيهِ ، هَذَا الْحَدِيثَ ، وَقَالَ فِيهِ : إِنَّ الْعَيْنَ حَقٌّ ، تَوَضَّأْ لَهُ ، فَتَوَضَّأَ لَهُ[220]

واته : ئيمامى ( مالك ) _ بەڕەحمەتى خوا بێت _ ، لە ( ابن شهاب )ەوە ، لە ( أبي أمامة )ى كوڕى ( سَهل )ى كوڕى ( حُنَيف )ەوە دەگێڕێتەوە ، فەرموويەتى : ( عامر )ى كوڕى ( ربيعة ) تەماشاى كرد ( سَهْل )ى كوڕى ( حُنَيف ) خۆى دەشوا ، ئەوەبوو گوتى : سوێند بەخوا نە وەكو ئەمڕۆم بينيوەو نە كچى شونەكردووى نێو پەردەش ئاوەهايە ، ( أبي أمامة ) دەڵێت : ( سَهل ) تێكچوو داى بەزەويدا ، پێغەمبەرى خوا ﷺ تەشريفى هێنايە لاى ( عامر )و

219 _ صحيح : أخرجه الترمذي ( ٢٠٥٩ ) ، من طريق عبدالرزاق قال : أخبرنا معمر ، عن أيوب ، عن عمرو بن دينار عن عروة بن عامر ، عن عبيد بن رفاعة فذكر الحديث عن أسماء . وطريق سفيان المذكور أخرجه الحميدي ( ٣٣٠ ) وأحمد في مسنده ( ٦ /٤٣٨ ) ، وابن ماجة في سننه ( ٣٥١٠ ) ، والترمذي ( ٢٠٥٩ ) .

220 _ إسناده صحيح : أخرجه مالك في الموطأ ( ٢ / ٩٣٨ ) ، وصححه الألباني في صحيح الجامع ( ٤٠٢٠ ) .

، زۆر لێی تووڕەبوو ، ئینجا فەرمووی : (( بۆ کەسێکتان براکەی دەکوژێت ؟ بۆ نزای فڕو بەرەکەتت بۆ نەکرد ؟ خۆتی بۆ بشۆ ، ئەوەبوو ( عامر ) دەم و چاوی و دەستەکانی و مەچەکی و ئەژنۆکانی و ، سەرەوەی پەنجەکانی پێی و ، کەنارو لێواری ( الإزار ) ەکەی[221] لە ناوەوە لە پەرداخێکدا شت و ، پاشان ڕشێنرا بە سەر ( سَهل )دا ، ئەوەبوو هەستاو لەگەڵ خەڵکەکەدا ڕۆشت ٠

هەروەها ئیمامی ( مالك ) ئەم فەرموودەە لە ( محمد )ی کوڕی ( أبي أمامة )ی ( سَهل )ەوە کە لە بابیەوە دەگێڕێتەوەو تیایدا دەڵێت : چاوپیسی ڕاستە ، دەستنوێژی بۆ بشۆ ، ئەوەبوو دەستنوێژی بۆ شت٠

وَذكَرَ عَبْدُ الرَّزّاقِ ، عَنْ مَعْمَرٍ ، عَنْ ابْنِ طَاوُوسٍ ، عَنْ أَبِيهِ مَرْفُوعًا ، الْعَيْنُ حَقٌّ ، وَلَوْ كَانَ شَيْءٌ سَابَقَ الْقَدَرَ ، لَسَبَقَتْهُ الْعَيْنُ ، وَإِذَا اسْتُغْسِلَ أَحَدُكُمْ ، فَلْيَغْتَسِلْ ٠ ووصله صحيح[222] .

واتە : ( عبدالرزاق ) ، لە ( مَعْمَر )ەوە ، لە ( طاووس )ەوە ، لە باپیەوە بە ( مرفوع )ی دەگێڕێتەوەو دەفەرمێت : چاوپیسی ڕاستە ، ئەگەر شتێکیش پێش چارەنووس بکەوتایە ، چاوی پێش دەکەوت ، ئەگەر خەڵکتان بە چاوەوە کردو داوای خۆشتنتان لێکرا خۆتان بشۆن.

پێشەوا ( الزُّهري ) فەرموویەتی : چاوپیس فەرمانی پێ دەکرێت قاپێك ئاو بێنێت و ، ئینجا دەستەکانی دەکاتە نێو قاپەکەوەو ، ئاوەکە لە زاری وەردەدات و دەریدەهێنێتە نێو قاپەکەوەو ، پاشان بەدەستی چەپی ئاو لە قاپەکە هەڵدەگرێت و ، دەیڕژێنێ بەسەر ئەژنۆی ڕاستیداو ئاوەکەی دەکاتەوە نێو قاپەکەو ، ئینجا کەنارو لێواری ( الإزار )ەکەی لە ناوەوە

---

٢٢١ ــ الإزار : دەرپێ ، پۆشاکێکە نیوەی خوارەوەی لەشی مرۆڤ پێ دادەپۆشرێت ٠ وەرگێڕ ٠

٢٢٢ ــ إسناده صحيح : صححه الألباني في السلسلة الصحيحة ( ١٢٥١ ) ٠

دەشوات و ، قاپەكە ناخاتە سەر زەوى ، پاشان لە پشتەوە بە یەك جار دەڕشێنرێت بەسەر كەسی بە چاوەوە بوودا ، بەفەرمانی خوا سەرفەراز دەبێ ٠

بەچاووەبونیش دوو بەچاوەوە بوونە : بەچاوەوەبونێكی مرۆڤی و ، بە چاوەوەبونێكی جنۆكەی ٠ فقدْ صحّ عنْ أُمّ سلَمَةَ ، أنّ النّبِيّ ﷺ رأى فِي بَيْتِهَا جَارِيَةً فِي وَجْهِهَا سَفْعَةٌ ، فقال: اسْتَرْقُوا لَهَا ، فَإِنّ بِهَا النّظْرَةَ[٢٢٣] .

واتە : لە ( أُمّ سلمة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ دەگێڕنەوە كەوا : پێغەمبەری خوا ﷺ كەنیزەكێكی لە ماڵەكەیدا بینی دەم و چاوی زەردهەڵگەڕابوو ، ئەوەبوو فەرمووی : نوشتەی بە سەردا بخوێنن ، جنۆكە تێی ڕوانیوە ٠

( الحسین )ی كوڕی ( مسعود الفرّاء ) دەڵێت : كە فەرموویەتی ( سَفْعَة ) واتـە : تێـڕوانین ، مەبەستی لە جنۆكەوە بووە ، دەگوترێت : لە تێڕوانینی جنۆكەوە تووشی بـە چـاوەوە بونێـك بووە كە لە تێپەڕبوونی نوكە ڕم تیژترە ٠

ويُذكَرُ عَنْ جَابِرٍ يَرْفَعُهُ : (( إنّ الْعَيْنَ لَتُدخِلُ الرّجُلَ الْقَبْرَ ، وَالْجَمَلَ الْقِدْرَ ))[٢٢٤] واتـە لـە ( جابر )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( دڵنیـابن چاوپیسی پیاو دەخاتە نێو گۆڕەوەو ، ووشتریش دەخاتە نێو مەنجەڵەوە )) ٠

وعن أَبِي سَعِيدٍ _ رضي الله عنه _ أَنّ النّبِيّ ﷺ كَانَ يَتَعَوّذُ مِنْ الْجَانّ ، وَمِنْ عَيْنِ الْإِنْسَانِ[٢٢٥] .

واتە : لە ( أبي سعید )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای دەگرت بەخوا لە جنۆكەو ، لە چاوپیسی مرۆڤ ٠

---

٢٢٣ _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ١٠ / ١٧١ ، ١٧٢ ) ، ومسلم ( ٢١٩٧ ) ٠

٢٢٤ _ إسناده حسن : أخرجه أبونعيم في الحلية ( ٧ / ٩٠ ) ، وصححه الألباني في الصحيحة ( ١٢٤٩ ) ٠

٢٢٥ _ صحيح : أخرجه ابن ماجة ( ٣٥١١ ) ، والترمذي ( ٢٠٥٨ ) ، والنسائي ( ٨ / ٢٧١ ) عن الجريري عن أبي نضرة عن أبي سعيد فذكره وزاد فيه ٠٠ (( فلما نزلت المعوذتان أخذ بهما وترك ما سوى ذلك )) ٠

كۆمەڵێك كە بەشيان لـە گـوێگرتن و ئـەقڵ پێنـەدراوە ، چاوپيسـى و بەچـاوەوەبون پـووچ دەكەنـەوەو ، دەڵـێن : ئەوانـە هـەمووى خەياڵـەو لـە ڕاسـتيەوە بـەدوورە ، بـەڵام ئەمانـە نـەفامترينى خـەڵكن بـە بيسـتن و ئـەقڵ ، پـەردەكانى سـەر چـاو و دڵيشـيان لـە هـەمووى ئەستورترە ، لە هەموو كەسيش بەدخووترن ، دورترين كەسيشن بە ناسينى ڕوح و نەفسـەكان و ، سيفات و كردارو كاريگەريان ، ئاقڵ و ژيرانى ئومەتان بە جيـاوازى ئـاين و بيروباوەڕيانـەوە ، بـوارى چاوپيسـى و بەچـاوەوە بـوون ڕەت ناكەونـەوەو ، نكـۆڵيى لـىَ ناكـەن ، ئەگەرچـى جياوازن سەبارەت بە هۆكارى لايەنى كاريگەرى چاوپيسى ٠

كۆمەڵێك دەڵێن : نەفسى كەسى چاوپيس ئەگەر لە گەڵ چۆنيەتيەكى پيسـدا ڕاهـات ، لـە چـاوەكانيەوە هێزێكـى ژەهـرين دێتـە دەرەوەو دەگـات بـە كەسـى بـە چـاوەوەبوو ، زيـانى پێدەگەيـەنێت ٠ گوتيـان : نكـۆڵيى لەمـە ناكرێـت ، وەكـو چـۆن ناتوانرێـت نكـۆڵيى لـە هاتنـە دەرەوەى هێزێكى ژەهرين لە جۆرە مارێكەوە بكرێت كە دەگات بـە مرۆڤـ و ، دەيفـەوتێنێت ، ئەمەش لە جۆرە مارێكەوە ڕوودەدات كە هەركات تەنها بە چاوەكانى تەماشـاى مرۆڤـ بكـات ، يەكسەر ئەو مرۆڤە دەفەوتێت ، كارى چاوپيسيش ئاوەهايە ٠

كۆمـەڵێكى تـريش دەڵـێن : بـەدوور دانانرێـت لـە چـاوى هەنـدىَ مرۆڤـەوە چـەند نـەژادو گەوهـەرێكى ناسـك و ڕوونـى نـەبينراو( جـواهر لطيفـة غـير مرئيـة ) بێتـە دەرەوەو ، بگـات بـە كەسى بە چاوەوەبوو ، بچێتە نێو كونيلەكانى جەستيەوەو ، زيانى پىَ بگەيەنێت ٠

كۆمەڵێكى تريش گوتويانە : خواى تعالى نەرێتى وابووە بە پێى ويستى خۆى زيـان دروسـت دەكات ، كەوا هەر بە ڕوو بە ڕووبونـەوەى چـاوى پـيس بـە كەسـێك زيـانى پـىَ دەگەيـەنێت ، بەبىَ ئەوەى هێزێك ياخود هۆيەك ياخود كاريگەريـەك هـەبێت ، ئەمـە ڕێبـاوەڕى نكۆڵيكـارانى هۆكـارو هێـزو كاريگەريـەكانن لـە جيهانـدا ، ئەمانـە دەرگـاى هۆكـارو كاريگـەريان لـە خۆيـان داخستوەو ، دژبە تێكڕاى ئاقڵ و ژيران وەستانەوە ٠

## بەرپەرچدانەوەی ئەو کەسانەی کە نکۆڵیی لە بە چاوەوبوون دەکەن :

گومانی تێدا نی یە خوای تعالى لە جەستەو ڕوحەکاندا هێزو دیاردەگەلێکی جیاوازی خوڵقاندووەو ، چەندین خاسیەت و چۆنیەتی جۆراوجۆری بە زۆریان بەخشیوە ، مرۆڤی ئاقڵ و ژیر هەرگیز ناتوانێت نکۆڵیی لە کاریگەری ڕوحەکان لە جەستەدا بکات ، چونکە شتێکی بینراوی هەست پێکراوە ، تۆ دەم و چاو دەبینی چۆن سوور سوور دەبێتەوە کاتێ کەسێك تەماشای دەکات کە شەرمی لێبکات ، زەرد زەردیش هەڵدەگەڕێت کاتی تەماشای کەسێك دەکات لێی دەترسێت ، خەڵکانیش کەسانێکیان بینیوە تەنها بە تەماشاکردنیی ، نەخۆش دەکەوێت و هێزی لاواز دەبێ ، هەموو ئەمانە کاریگەری ڕوحەکانە ، بەڵام بەهۆی زۆر پەیوەندبوونی بە چاوەوە ئەو کارە دەدرێتە پاڵ چاو ، بەڵام چاو بکەر نی یە ، بەڵکو کاریگەری ڕوحەکانەو ، ڕوحەکانیش جیاوازن لە دیاردەو سروشت و چۆنیەتی و خاسیەتەکانیاندا ، ڕوحی ئێرەیی بەر ( حسود ) زیانێکی ئاشکەرا بە کەسی ئێرەیی براوی بەرامبەر دەگەیەنێت ، خوای تعالاش فەرمانی داوە بە پێغەمبەرەکەی پەنا بەخوا بگرێت لە شەڕی کەسی ئێرەیی بەر ، بۆیە کاریگەریەکانی کەسی ئێرەی بەری چاوچنۆك لە کەسی ئێرەیی براوی بەرامبەردا زۆر ئاشکەرایەو هیچ کەس توانای نکۆڵیکردنی ئەو کارەی نی یە ، مەگەر کەسێك لە حەقیقەتی مرۆڤایەتی بەدەربێت ، ئەمەش بنەڕەتی بەچاوەوەبونە ، چونکە نەفسی کەسی ئێرەیی بەری چاوچنۆك لە گەڵ چۆنیەتیەکی پیسدا ڕادێت و ، بەرامبەر بە کەسی ئێرەی براو دەبێتەوەو ، بەهۆی ئەو خاسیەتە پیسەوە کاری تێدەکات ، نموونەی ئەمە وەکو نموونەی مارە ، چونکە ژەهرەکە وزەیەکی متی بەهێزە تیایدا ، ئەگەر چاوی بە دوژمنەکەی کەوت ، هێزێکی تووڕەبونی لێوە دەردەچێت و ، ڕادێت بە چۆنیەتیەکی پیسی زیانبەخش و کاری خۆی دەکات ، پێدەچێ جار بە جار چۆنیەتیەکەی ئەمەندە بەهێز بێت کاریگەری هەبێت لە کەوتنی منداڵی کۆرپەلەی سکی دایکداو ، جار بە جاریش لە کوێرکردنی چاودا کاریگەری دەبێ ، كما قال النبيُّ ﷺ في الأبْتَر ، وذي الطُّفْتَيْن مَنَ الحَيَّات : إنَّهما

يَلتَمِسَان البَصَرَ ، ويُسقطان الحَبَل[٢٢٦] واتـه : پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە ماری کوڵەوەییاب و ، بازگ فەرموویەتی : ئەو دوانە چاو کوێر دەکەن و ، منداڵ لە باری دایک دەبەن ·

هەشیانە : بە تەنها بینین کار لە مرۆڤ دەکات بەبێ هیچ پەیوەندبوونێکی بەو کەسەوە ، بەهۆی زۆر پیسی ئەو نەفسەو ، چۆنیەتیە پیسە کاریگەریەکانی ، کاریگەریش لە سەر پەیوەندبوونی جەستەیی نەوەستاوە ، وەکو ئەوەی کەسانێکی کەم زانست و زانین بە سروشت و شەریعەت وای بۆ دەچن ، بەڵکو کاریگەری جار بە جار بە پەیوەند بوونە ، جار بە جار بە ڕووبەڕووبونەوەیە ، جار بە جار بە بینینە ، جار بە جار بە ئاڕاستەبوونەوەی ڕوحە بەرەو لای ئەو کەسەی کاری تێدەکات ، جار بە جار بە نزاو نوشتەو پەناگرتنەکانە ، جار بە جار بە خەیاڵ و ئەندێشەیە ، بۆیە کاری نەفسی چاوپیس بەتەنها لەسەر بینین نەوەستاوە ، بەڵکو پێدەچێ کەسی چاوپیس کوێر بێت ، کە شتی بۆ وەسف کرا ، نەفسە پیسەکەی کاری تێدەکات ، ئەگەرچی نەشی بینیبێت ، زۆرێك لە چاوپیسان کار لە خەڵك دەکەن بە وەسف و بەبێ بینین ، وەکو ئەوەی خوای تعالى بە پێغەمبەرەکەی فەرمووە : ﴿ وَإِنْ يَكَادُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَارِهِمْ لَمَّا سَمِعُوا الذِّكْر ﴾ [ القلم : ٥١ ] واته : ﴿ وَإِنْ يَكَادُ الَّذِينَ كَفَرُوا ﴾ بەڕاستی نزیك بوو بێ بڕواکان ﴿ لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَارِهِمْ ﴾ هەڵت خلیسکێنن بە چاو ( ی پیس )یان ﴿ لَمَّا سَمِعُوا الذِّكْرَ ﴾ لە کاتێکدا کە قورئان دەبیستن[٢٢٧] ، ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ (١) مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ (٢) وَمِنْ شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ (٣) وَمِنْ شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ (٤) وَمِنْ شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ (٥) ﴾ [ سورة الفلق ] واته : ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ﴾ ئەی محمد ﷺ بڵێ : پەنا دەگرم بە دروستکاری بوونەوەر ( بەرەبەیان ) ﴿ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ ﴾ لە زیانی ئەوەی کە

---

٢٢٦ _ صحيح : أخرجه الحميدي ( ٦٢٠ ) ، وأحمد ( ٢ / ٩ ، ١٢١ ) ( ٣ / ٤٥٢ ) ، والبخاري ( ٤ / ١٥٤ ) ، ومسلم ( ٧ / ٣٨ ) ، وأبوداود ( ٥٢٥٢ ) ، وابن ماجة ( ٣٥٣٥ ) ، والترمذي ( ١٤٨٣ ) كلهم عن ابن شهاب الزهري عن سالم عن ابن عمر فذكره مرفوعاً ·

٢٢٧ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ·

دروستی کردووه ﴿ وَمِنْ شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴾ وه له زیانی تاریکی کاتێك که دابێ ﴿ وَمِنْ شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ ﴾ وه له زیانی فووکه‌ران ( جادووکه‌ران ) به گرێ یاندا ﴿ وَمِنْ شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴾ وه له زیانی به‌خیل و حه‌سود کاتێك که حه‌سودی ببات(٢٢٨) بۆیه لێره‌دا ئاشکه‌را ده‌بێت که هه‌موو که‌سێکی چاوپیس ئێره‌ی به‌رێکی چاوچنۆکه‌و ، هه‌موو ئێره‌ی به‌رێکی چاوچنۆکیش چاوپیس نی یه ٠

به‌ڵام له‌به‌ر ئه‌وه‌ی که‌سانی ئێره‌ی به‌ری چاوچنۆك گشتیترن به به‌راوردی که‌سی چاوپیس ، بۆیه په‌ناگرتن له که‌سی ئێره‌ی به‌ر په‌ناگرتنه له چاوپیس ، به گشتی کاره‌که‌شیان تیرگه‌لێکه له نه‌فسی که‌سی ئێره‌ی به‌ری چاوچنۆکه‌وه به‌ره‌و لای که‌سی ئێره‌ی براو و به چاوه‌وه بوو ده‌چێت ، جار به جار ده‌یانپێکێت و جار به جاریش به هه‌ڵه‌دا ده‌چێت ، بۆیه ئه‌گه‌ر رێکه‌وتی که‌سێك بۆوه که هیچ پارێزه‌رێکی به سه‌ره‌وه نه‌بێت و ئاشکه‌را بێت ، کاری تێ ده‌کات ، به دڵنیایی ، به‌ڵام ئه‌گه‌ر له باری ئاگاداربوون و ئاماده‌بوون بۆ جه‌نگدا رێکه‌وتی کردو ته‌ماشای کرد هیچ رێره‌وێك نی یه بۆ تێپه‌ڕبوونی تیره‌کانی ، کاری تێ ناکات و ، پێده‌چێ تیره‌کانیشی بۆ بگه‌ڕێنێته‌وه ، ئه‌مه‌ش وه‌کو تیرهاوێشتنی هه‌ستی ( الحسّي ) وایه ، چونکه ئه‌مه له لایه‌ن نه‌فس و ڕوحه‌کانه‌وه‌یه‌و ، تیرهاویشتنی هه‌ستیش له لایه‌ن جه‌سته‌و خێوه‌کانه‌وه‌یه ٠ بنه‌ڕه‌تیشی بریتیه له به‌دڵبوون و سه‌رسامبوونی چاوپیس به شته‌که ، پاشان نه‌فسه پیسه‌که‌ی شوێنی ده‌که‌وێ و ، ئینجا به تێڕوانینێك بۆ که‌سی ئێره‌ی براوی به‌رامبه‌ر ژه‌هره‌که‌ی جێبه‌جێ ده‌کات ، ڕه‌نگه پیاو خودی خۆشی به چاوه‌وه بکات ، له‌وانه‌یه که‌سی چاوپیس به‌بێ ویستی خۆی ، به‌ڵکو به سروشت و خۆڕسکی خه‌ڵك به چاوه‌وه بکات ، ئه‌مه‌ش خراپترین جۆری مرۆڤایه‌تیه ، هاوه‌ڵانمان ـ ( ابن القيم ) ـ له زانایان و جگه له‌وانیش فه‌رموویانه : ئه‌و که‌سه‌ی به‌وه ناسراو بێت ، پێشه‌وا ده‌ستبه‌سه‌ری ده‌کات و ، بژێوی بۆ ده‌ڕێته‌وه تاوه‌کو مردن ، ڕاستیش ئه‌مه‌یه به‌دڵنیایی ٠

---

٢٢٨ ـ مه‌لا محمد مه‌لا صالح ، پوخته‌ی ته‌فسیری قورئان ٠

# بەشێك : سەبارەت بە چارەسەركردنی كەسی بە چاوەوەبوو بە نوشتەو پەناگرتنەكان

مەبەستیش : چارەسەری پێغەمبەرایەتیە بۆ ئەم نەخۆشیە ، ئەوەش چەند جۆرێكە ، وقد روى أبوداود في سننه عن سهل بن حُنيفٍ ، قال : مررْنا بِسَيْلٍ ، فدخلتُ ، فاغتسلتُ فيه ، فخرجتُ محموماً ، فنُمِيَ ذلك إلى رسول الله ﷺ ، فقال : (( مُرُوا أبا ثابتٍ يَتَعَوَّذ ))ُ ٠ قال : فقلتُ : يا سيدي والرُّقى صالحة ؟ فقال : (( لا رُقيةَ إلا في نَفْسٍ ، أو حُمَةٍ ، أو لَدْغَةٍ ))[٢٢٩] .

واتە : لە ( سَهل )ی كوڕی ( حُنیفٍ )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : بەلای سێلاوێكدا تێپەڕبووین ، منیش چومە نێوی و ، خۆم شت ، كە هاتمە دەرەوە ( تا ) گرتبومی ، هەواڵم گەینرایە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوەبوو فەرمووی : (( فەرمان بدەن با ( أبا ثابت ) نووشتە بكات )) ( سَهل ) فەرمووی : گەورەم ئایا نووشتە چاكە ؟ ئەویش فەرمووی : (( لەوە چاكتر نابێت كە نوشتە بۆ چاوپیسی و ، ( تا )و ، پێوەدانی جانەوەرە ژەهردارەكان بكرێت )) ٠

ووشەی ( النفس )ی نێو فەرموودەكە ، واتە : چاو ، دەگوترێت : ( أصابت فلاناً نفسٌ ) واتە : فڵان كەس بە چاوەوە بوو ٠ ( النافِس ) واتە : چاوپیس ٠ ووشەی ( اللَّدغة )ی نێو فەرموودەكە واتە : پێوەدانی دوپشك و بەو هاوشێوانە ٠ لەو پەناگرتن و نووشتانەی لە تواناداية ئەنجام بدرێت : خوێندنی ( المعوذتين )و ، سورەتی ( الفاتحة )و ، ئایەتی ( الكرسي )و ، هەروەها زیكرو پەناگرتن و نوشتەكانی پێغەمبەرە ﷺ: وەكو : (( أعوذ بكلمات الله التامات من شر ما خلق )) ٠ واتە : پەنا دەگرم بە خوای پەروەردگار لە خراپەی

٢٢٩ _ إسناده ضعيف : أخرجه أبوداود ( ٣٨٨٨ ) ، وضعفه الألباني في الضعيفة ( ١٨٥٤ ) ٠

دروستكراوەكانى · (( أعيذكما بكلمات الله التامة من كل شيطان و هامة و من كل عن لامـة )) ·
واتە : پەناتان دەدەم بە ووشە تەواوەكانى خواى تعالى لـە شـەيتان و هـەر گيانلـەبرێكى زيـان بەخشى خاوەن ژەهرو و لە چاوپيسێكى لۆمەكراو ·

(( أعوذُ بكلمات الله التَّامَّاتِ التي لا يُجَاوِزُهُنَّ بَرٌّ ولا فاجرٌ ، مِن شَرِّ ما خلق وذرأَ وبرأَ ، ومِن شَرِّ ما ينزلُ من السماء ، ومِن شَرِّ ما يَعرُجُ فيها ، ومِن شَرِّ ما ذرأ في الأرض ، ومِن شَرِّ ما يخرُج مِنها ، ومِن شَرِّ فِتَنِ الليلِ والنهار ، ومِن شَرِّ طَوَارق الليلِ ، إلا طارقاً يَطرُق بخير يا رحمن )).

واتە : پەنا دەگرم بە ووشە تەواوەكانى خواى تعالى كە چاكەكارو خراپەكار ناتوانن بيبەزێنن ، لە خراپەى ئەوەى دروستى كردووەو ، بەديهناون و هێناونەتيە بوون ، وە لە خراپەى ئەوەى لە ئاسمانەوە دادەبەزێ و ، خراپەى ئەوەى بۆى بەرز دەبێتەوەو ، لە خراپەى ئەوەى لە زەويدا چێندراوەو ، ئەوەى لە زەوييەوە بەدەردێت ، وە لە فيتنەو ئاشوبەى شەو و ڕۆژ ، وە لە هەموو لێدەرێكى دەرگا بە شەو ، مەگەر لێدەرێك بێ بە خێر لێى بدات ئەى خواى بە بەزەيى ·

(( أعوذ بكلمات الله التامة من غضبه وعقابه، ومن شر عبـاده، ومـن همـزات الشـياطين وأن يحضرون )) · واتە : پەنادەگرم بە ووشە تەواوەكانى خواى تعالى لە تووڕەبوونى و سزادانى ، وە لە خراپەى بەندەكانى ، وە لە دودڵى و گومان دروستكردنى شەيتان و ئامادەبونى ·

(( اللهم إني أعوذ بوجهك الكريم ، وكلماتك التامات من شر مـا أنـت آخـذ بناصـيته ، اللـهم أنت تكشف المغرم والمأثم ، اللهم لا يهزم جندك ، ولا يخلف وعدك ، سبحانك وبحمدك )).
واتە : پەروەردگارا من پەنادەگرم بە ڕووى پيرۆزو ، ووشە تەواوەكانت لـە خراپـەى هـەموو شتێك تۆ خاوەنيت و تەصرِوفى پێوە دەكەيت ، پـەروەردگارا تـۆ لابـەرى گوناهـەكانى تـاوان و ياخيبونى ، پەروەردگارا سەربازانت شكست ناهێنن ، پەيمانت ناشكێنرێت ، پـاك و بێگـەردى و ستايش بۆ تۆيە ·

(( أعُوذُ بوجه اللهِ العظيمِ الذي لا شيءَ أعظمُ منه ، وبكلماتِه التامَّات التي لا يُجاوزُهن برّ ولا فاجرٌ ، وأسماءِ الله الحُسْنَى ، ما علمتُ منها وما لم أعلم ، مِن شَرِّ ما خلق وذرأ وبرأ ، ومن شَرِّ كُلِّ ذى شرّ لا أُطيق شرَّه ، ومِن شَرِّ كُلِّ ذى شَرّ أنتَ آخِذٌ بناصيته ، إنَّ ربِّى على صِراط مستقيم )).

واته : پەنادەگرم بە ڕووی گەورەی خوای پەروەردگار کە شتێکی تر لەو گەورەتر نی یە ، وە بەووشە تەواوەکانی کە هەموو کەسێکی چاك و خراپ لێی تێپەڕ نابن ، وە بەناوە پێرۆزەکانی ، ئەوەی دەیزانم و ئەوەی نایزانم ، لە خراپەی ئەوەی خوڵقاندویەتی و دروستی کردووەو هێناویەتیە بوون ، وە لە خراپەی هەموو خاوەن خراپەیەك کە توانای بەرگەکرتنی خراپەکانیم نی یە ، وە لە خراپەی هەموو خاوەن خراپەیەك کە تۆ خاوەنیت و تەسرووف پێوە دەکەیت ، پەروەردگارم لە سەر ڕێگەیەکی ڕاستە .

(( اللَّهُمَّ أنْتَ رَبِّي لا إِلَهَ إِلاَّ أنْتَ ، عَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ ، وَأَنْتَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ، مَا شَاءَ اللَّهُ كَانَ ، وَمَا لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ ، وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ ، أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ، وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي ، وَمِنْ شَرِّ كُلِّ دَابَّةٍ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا ، إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ )).

واتە : پەروەردگارا تۆ پەروەردگاری منی و هیچ خوایەکی تر نی یە بە هەق جگە لە تۆ ، پشتم بە تۆ بەستووەو ، تۆ پەروەردگاری عەرشی مەزنی ، هەرچی خوای تعالی بیەوێت دەبێ و ، هەرچیش نەیەوێت نابێت ، هیچ گۆڕان و توانایەکیش نی یە مەگەر لە لایەن خوای پەروەردگارەوە ، بە زانینی دەوری هەموو شتێکی داوە ، پەروەردگارا من پەنات پێدەگرم لە خراپەی نەفسی خۆم و ، لە خراپەی هەموو شتێك کە تۆ خاوەنیت و تەسرووف پێوە دەکەیت ، پەروەردگارم لە سەر ڕێگەیەکی ڕاستە .

(( تحصَّنتُ باللهِ الذي لا إله إلا هُوَ ، إلهي وإله كُلِّ شيء ، واعتصمتُ بربي وربِّ كُلِّ شيء ، وتوكلتُ على الحيِّ الذي لا يموتُ ، واستَدْفَعتُ الشرَّ بلاحَوْلَ ولا قُوَّةَ إلا بالله ، حسبيَ اللهُ ونِعْمَ الوكيلُ ، حسبيَ الربُّ مِن العباد ، حسبيَ الخَالِقُ من المخلوق ، حسبيَ الرازقُ مِنَ المرزوق ، حسبيَ الذي هو حسبي ، حسبيَ الذي بيده ملكوتُ كُلِّ شيءٍ ، وهو يُجيرُ ولا يُجَارُ عليه ، حسبيَ اللهُ وكَفَى ، سَمِعَ اللهُ لمنْ دعا ، ليس وراء اللهِ مرمَى ، حسبيَ اللهُ لا إله إلا هُوَ ، عليه توكلتُ ، وهُوَ ربُّ العرشِ العظيم )).

واته : قەڵابەندیم بە خوای تعالی کردووە کە هیچ خوایەکی تر نیە بەهەق جگە لەو ، خواوەندی من و خواوەندی هەموو شتێك ، وە پەنادەگرم بە پەروەردگارم و پەروەردگاری هەموو شتێك ، وە پشتم بە ست بە زیندوویەك کە هەرگیز نامرێت ، وە بە گوتنی هیچ گۆڕان و توانایەك نیە مەگەر بە خواوە خراپە لە خۆم دوردەخەمەوە ، هەر خوام بەسە کە پشت پێ بەستراوێکی چاکە ، خوام بەسە بەبێ بەندەکان ، خوڵقێنەرم بەسە بەبێ خوڵقێنراوەکان ، ڕۆزیدەرم بەسە بەبێ ڕوزی دراوەکان ، بەسمە ئەوەی کە بەسمە ، بەسمە ئەو زاتەی کە فەرمانڕەوایی هەموو شتێکی بەدەستەو ، وە پەنای هەموو کەس دەدات و کەس لەو پەنا نادرێت ، هەر خوام بەسەو هیچی تر ، خوا گوێبیستی ئەوانەیە کە نزا دەکەن ، پاش پەروەردگار هیچی تر نی یە بکرێت بە مەبەست ، بەسمە ئەو خوایەی کە هیچ خوایەکی تر نی یە بەهەق جگە لەو ، پشتم پێ بەستوەو ، پەروەردگاری عەرشی مەزنە ·

وە هەرکەس ئەم نزاو دوعاو پەناگرتنانە تاقیکاتەوە ، ئەندازەی سودو کەڵك و ، زۆر پیویستبوونی بۆ دەردەکەوێت ، قەدەغەی ئەوە دەکات کە کاریگەری چاوپیس بە مرۆڤ بگات ، پاش گەشتنیشی بە مرۆڤ هەڵدەستێت بە دورخستنەوەی ئاسەواری ، بە گوێرەی بەهێزی باوەڕبوونی بێژەرەکەی و ، بەهێزبوونی نەفسی و ، ئامادەبوونی و ، بەهێزی پشت بەستنی و جێگیری دڵیی ، چونکە ئاشکەرایە کاریگەری و هێزی چەك بەو کەسەیە کە دەیهاوێژێت ·

## بەشێك : سەبارەت بەو شتانەی بەچاوەوە بوونی پێ دوردەخرێتەوە :

ئەگەر كەسی چاوپیس ترسا چاوی زیان بە كەسی بەرامبەری بگەیەنێت ، با زیانی چاوی دورخاتەوە بە گوتنی : ( اللَّهُمَّ بَارِكْ عليه ) واتە : پەروەردگارا فڕوبەرەكەت بڕشێنە بەسەریدا ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ بە ( عامر )ی كوڕی ( ربيعة )ی فەرموو كاتێك كە ( سَهْل )ی كوڕی ( حُنيف )ی كرد بە چاوەوە : ( ألا بركت ) واتە : ئەی بۆ نەتگوت : پەروەردگارا فڕویەرەكەت برشێنە بەسەریدا ٠

هەروەها لەو نزایانەش كە چاوپیسی پێ دور دەخرێتەوە گوتنی : ( ما شاء الله لا قُوَّة إلا بالله ) واتە : هەرچی خوای تعالى بیەوێ هەر ئەوە دەبێ و هەموو توانایەكیش هەر بەدەست خوای پەروەردگارە ٠

هەروەها دەتوانرێت نوشتەكەی ( جبريل ) _ عليه السلام _ بەكار بهێنرێت كە ئیمامی ( مسلم ) لە ( صحيح )ەكەیدا دەیگێڕێتەوەو دەفەرمێت : عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيّ أَنّ جِبْرِيلَ – عَلَيْهِ السّلَامُ – أَتَى النّبِيّ ﷺ قَالَ يَا مُحَمّدُ اشْتَكَيْتَ ؟ فَقَالَ : (( نَعَمْ )) ، فَقَالَ جِبْرِيلُ – عَلَيْهِ السّلَامُ – بِاسْمِ اللّهِ أَرْقِيكَ ، مِنْ كُلّ شَيْءٍ يُؤْذِيكَ ، مِنْ شَرّ كُلّ نَفْسٍ أَوْ عَيْنِ حَاسِدٍ اللّهُ يَشْفِيكَ ، بِاسْمِ اللّهِ أَرْقِيكَ[٢٣٠]٠

واتە : لە ( أبي سعيد الخُدْريّ )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : ( جبريل ) _ عليه السلام _ هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی : ئەی محمد ئازارت هەیە ؟ ئەویش فەرمووی : (( بەڵێ )) ، ئەوەبوو ( جبريل ) _ عليه السلام _ فەرمووی : بەناوی

---

٢٣٠ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ٢٨ ، ٥٦ ، ٥٨ ، ٧٥ ) ، وعبد بن حميد ( ٨٨ ) ، ومسلم ( ٧ / ١٣ ) ، وابن ماجة ( ٣٥٢٣ ) ، والترمذي ( ٩٧٢ ) ، والنسائي في عمل اليوم والليلة ( ١٠٠٥ ) ، كلهم من طريق أبي نضرة عن أبي سعيد فذكره ٠

خواوه نوشتەت بۆ دەخوێنم ، لە هەموو شتێك ئازارت بدات ، لە خراپەی هەموو نەفسێك یا چاوپیسێکی ئێرەیی بەر خوا شیفات بدات ، بەناوی خواوە نوشتەت بۆ دەخوێنم ·

کۆمەڵێك لە پێشین وای بۆ دەچن ئایەتی قورئانی بۆ بنوسرێت و بکرێتە نێو ئاوەوەو ، بیخواتەوە · ( مجاهد ) دەڵێت : هیچی تێدا نی یە قورئان بنوسرێت و ، لە ئاودا بیشواتەوە ، نەخۆشەکە بیخواتەوە ، هەروەها لە ( أبي قِلابَة )شەوە هەمان شت باسکراوە ، دیسان باسکراوە کە ( ابن عباس ) _ خوا لە خۆی و بابیشی ڕازی بێت _ فەرمانیدا چەند ئایەتێك لە قورئان بۆ ژنێك کە منداڵبوونی ئاستەم و گران بوبو بنوسرێت و ، پاشان لە نێو ئاودا بیشۆنەوەو بیخواتەوە · ( أیوب ) دەڵێت : ( أبا قِلابة )م بینی چەند ئایەتێکی قورئانی نووسی و پاشان لە نێو ئاودا شتی و دای بە پیاوێك بیخواتەوە کە ئازارێکی هەبوو ·

## بەشێك : سەبارەت فەرمان دان بە چاوپیس بە شتنی بن هەنگل و هەموو شوێنە پێچەکانی جەستەی ولاکانی و ناوەوەی ( الإزار )ەکەی :

هەموو ئەوانەی سەرەوە بە دوو گوفتار لێك دراونەتەوە : یەکەمیان : مەبەست بەوانەی سەرەوە ئەندامەکانی زاوزێیە · دووەمیان : لای ڕاستی ( الإزار )ەکەیەتی لە ناوەوە کە یەکسەر بەر جەستە دەکەوێت ، پاشان لە کاتێکدا کەسی بە چاوەوە بوو بێ ئاگابێ دەرشێنرێت بە سەریدا ، ئەمەش شتێکە چارەسەی پزیشکانی پێ نەگەشتووە ، وە ئەو کەسەی کە نکۆڵیی لێدەکات ، یاخود گاڵتەی پێ دەکات ، یاخود لێی بە گومانە ، یا تەنها تاقیدەکاتەوەو لەو بڕوایەدا نی یە سوودی بۆ هەبێت ، هەموو ئەم جۆرە کەسانە سوودی لێ نابینن ·

## حيكمەت و دانايى خۆشتن :

باشـه ئەگـەر لـه سروشـتـدا چـەند خاسـيەتێك هـەبێ و ، هـەرگيز لـه لايـەن پزيشـكانەوه هۆكانى نەزانرێت و ، بەلايانەوه له ئەندازەى سروشت بـەدەرەو بـه خاسـيەت كار دەكـات ، ئيتر بۆ كەسه گومڕاو نەفامەكانيان نكۆڵيى له خاسيەته شەرعيەكان بكەن ، له گـەڵ ئـەوەى كه چارەسەركردن بەم خۆشتنه ئەقڵ و ژيريى تەندروست شايەتى بۆ دەدەن و ، دانـى پێدا دەنێن ، ئەوەتا ( تِرياق )ى[٢٣١] ژەهرى مار له گۆشتەكەيدايەو ، چارەسەرى نـەفس تـووڕە ، به هێوركردنەوەى تووڕەبونەكەيەتى و ، دامركاندنەوەى گرميەكەيەتى بەوەى كه دەسـتت له سەرى دانێى و دەستى پياهێنى ، نمونەى ئەمـەش وەكـو نمونـەى پياوێكـه مەشخەڵێكى ئاگرى بەدەستەوە بێ و ، بيەوێت بۆ تۆى فڕێ بدات و ، هەر بـه دەسـتى پياوەكـەوه ئـاوت بە سەردا ڕشاند تا كوژايەوە ، بۆيه فەرمان درايه چـاوپيس بڵێـت : ( اللَّهُمَّ بـارِكْ عَلَيْـه ) بـۆ ئـەوەى بـه نـزاو دوعـا ئـەو چـۆنيەتيه خـراپ و پيسـه دورخاتـەوەو كاريگـەرى لـه سـەر بەرامبەرەكەى نەبێ كه له ڕاستيدا چاكەشه بۆ كەسى بەرامبەر ، چونكه دەرمـانى شـت بـه دژەكـەى دەبـێ ٠ وە لـه بـەر ئـەوەى كـه ئـەم چۆنيەتيه خـراپ و پيسـه لـه جێگـه نـەرم و تەنكەكانى جەستەدا بەدەردەكەوێت ، چونكه دەيـەوێت تێپـەڕبێ و ، لـه جێگـه پێچـەكانى جەستەو ، ناوەوەى ( الإزار ) نـەرمترو تـەنكتر نادۆزێتـەوە ، بەتايبـەت ئەگـەر مەبەسـت بـه هەموو ئەوانه ئەندامەكانى زاوزێ بێت ، ئەوا لـه هـەمووى ناسـكترو تـەنكترەو لـه هەمووشـى ئامادەتره بۆ تێپەڕبوون ، بۆيه ئەگەر به ئاو بيشوات ، كارو كاريگەرى پـوچ دەبێتـەوە ، لـه لايەكى تريشەوە ڕوحه شەيتانيەكان پسپۆڕن بەم جێگانەى جەستەوە ٠

مەبەسـت : ئەوەيـه كـه شـتنى بـه ئـاو ئاگريەكـەى دادەمركێنێتـەوەو ، ئـەو ژەهريەشـى ناهێڵێت ٠

---

٢٣١ ــ تِرياق : دەرمانێكى ئاوێتەيەو ، ( ماغنيس ) دايهێناوەو ، پاشان ( أندروماخيس )ى دێرين به زيادكردنى گۆشتى مار بۆ دەرمانەكه تەواوى كردوەو ، به شێوەيەكى ميكانيكى ناهێڵێت ژەهر له گەدەو ڕيخۆڵەوە هەڵمژرێت ، بڕوانه : القاموس المحيط للفيروزئابادي ، وەرگێڕ ٠

هەروەها شتێکی تریشی تێدایە : بریتیە لە گەیاندنی ئاسەواری شتن بۆ دڵ لە تەنکترین جێگەکانی جەستەوە ، کە بەبەراوردی جێگەکانی تر لە هەمووی خێراتر ئەو ئاسەوارە تێدەپەڕێنێت و ، ئەو ئاگریی و ژەهریە دەکوژێنێتەوەو ، کەسی بە چاوەوە بوو چاك دەبێتەوە ، نموونەی ئەمە وەکو نموونەی جانەوەرە ژەهراویەکانن ، ئەگەر بکوژرێن دوای ئەوەی هەڵدەستن بە پێوەدانی کەسێك ، کاریگەری پێوەدانەکە کەم دەبێتەوەو ، هەست بە حەوانەوە دەکات ، چونکە جانەوەرەکە هەر خۆی یارمەتیدەری زیادکردنی ئازارەکەشە دوای پێوەدان و ، ئەو زیادە ئازارە یارمەتیدەرەش دەگەیەنێت بە کەسی پێوەدراو ، بۆیە ئەگەر بکوژرێت ، ئازارەکە کەم دەبێتەوە ، ئەمە لە زۆر کەسی پێوەدراوەوە بینراوە ، هەروەها ئەوە جێگەی دڵخۆشبونی کەسی پێوەدراوەو ، سارێژبوونی دڵیەتی بە کوشتنی دوژمنەکەی ، ئەوجا سروشتی کەسی پێوەدراو بەهێز دەبێ و ، دوریدەخاتەوە ۰

بەکشتی ۰ خۆشتنی کەسی چاوپیس هۆکارێکی کاریگرە بۆ لادانی ئەو بارەی لێوە بەدەردێت ، بەسوودتریش دەبێ ئەگەر نەفسی ڕاهاتبێت لە گەڵ ئەو بارە چاوپیسیەدا ۰

ئەگەر گوترا : هۆکاری شتنی ئەو شوێنانەی کەسی چاوپیس زانرا ، ئەی هۆکاری ڕشاندنی ئاوەکەی بە سەر کەسی بە چاوەوەبودا چی یە ؟

دەگوترێت : ئەو ئاوەی کە ئاگریی کەسی چاوپیسی پێ کوژێنرایەوەو ، ئەو بارە چاوپیسیە خراپەی لە سەر پوچکرایەوە ، بە هەمان شێوە ئەو ئاگریەی کە تووشی کەسی بەچاوەوەبوو بوە دەکوژێنێتەوە ، ئاسەوار لە سەر شوێنی کارتێکراوی کەسی بە چاوەوەبوو لادەبات ، پاش پەیوەندبوونی ئاوەکە لە گەڵ جەستەی کەسی کارتێکەری چاوپیسدا ، ئەو ئاوەی کە ئاسنی پێ دەکوژێنرێتەوە بەشدارە لە پێکهاتنی چەندین دەرمانی سروشتیداو پزیشکان باسیان کردووە ، ئەوە ئاوەی کە ئاگریی کەسی چاوپیسی کوژاندەوە ، نکۆڵیی ناکرێت کە بەشدار بێت لە دەرمانێکدا شیاوی ئەم نەخۆشیە بێت ۰

بەگشـتی ٠ پزیشـکێتی پزیشـکان و چارەسـەریەکانیان بـە بـەراوردی پزیشـکێتی پێغەمبەرایەتی ، وەکو پزیشکێتی سۆفیە نەزانەکانە بـە بـەراوردی پزیشـکێتی ئـەوان ، بـەڵکو کـەمتریش ، چـونکە جیـاوازی نێـوان ئـەوان و پێغەمبـەران گەورەیـەو ، گەورەتریشـە لـەو جیاوازیەی لە نێوان ئەوان و سۆفیەکاندا هەیە ، بە ئاستێك مرۆڤ ئەندازەکـەی نـەزانیوە ، ئـەو پەیمانە برایەتیەشمان بۆ ڕوون بۆتەوە کە لـە نێـوان شـەرع و دانایدایـە ، کـە هـیچ کامیشـیان دژبە بەویتر نی یە ، خوای پەروەردگاریش بە ویسـتی خـۆی ڕێنمـووی هەرکەسـێك دەکـات بـۆ ڕێگـەی ڕاسـت و ، هـەموو دەرگاکـانیش دەکاتـەوە بەرامبـەر بەوانـەی بـەردەوام لـە دەرگـای سەرکەوتن دەدەن ، نیعمەتی فراوان و تەواو ، بەڵگەی بەهێزی پێیە بۆ بەندەکانی ٠

## بەشێك : سەبارەت بە داپۆشینی ئەو خووڕەوشتە چاك و باشانەی مەترسی بە چاوەوەبونی لێدەکرێت بەهەر شتێك لێی دورخاتەوە :

دیسان لەو چارەسەریانەی بەکاردێت بۆ خۆپاراستن ، داپۆشینی ئـەو خووڕەوشـتە چـاك و باشـانەیە کـە مەترسـی بەچـاوەوەبوونی لێـدەکرێت و ، بـە هەرشـتێك لایبـەرێت ، پێشـەوا ( البغـوي ) لـە کتـێبی ( شـرح السـنة )دا فەرمەوویـەتی : ( عثمـان ) _ خـوای لـیٚ ڕازی بێـت _ منداڵێکی جوانی بەدیکرد ، ئەویبوو فـەرمووی : ( دَسِّمُوا نُونَتَـه ، لـئلا تُصـيبه العَـين ) واتـە : چاڵە بچوکەکەی چەناکەی ڕەش بکەن بۆ ئەوەی بەچاوەوە نەبیٚ ٠

هەروەها پێشەوا ( الخطابي ) لـە کتـێبی ( غريـب الحـديث )دا فەرموویـەتی : ( عثمـان ) _ خوای لیٚ ڕازی بێت _ منـداڵێکی بـینی تووشـی بەچـاوەوەبوون دەبـیٚ ، فـەرمووی : ( دسِّموا نونته ) ، ( أبوعمرو ) دەڵێت: سەبارەت بەو فەرمایشـتەی ( عثمـان ) لـە ( أحمـد )ی کـوڕی ( يحـی )م پرسـی ، گـوتی : مەبەسـتی بـە ووشـەی ( النونـة ) واتـە : ئـەو چـاڵە بچـوکەی لـە چەناکەدایە ٠ ( التدسيم ) واتە : ڕەشکردن ٠ بە گشـتی مەبەسـتی ئـەوەبوو چـاڵە بچـوکەکەی چەناکەی ڕەش بکەن بۆ ئەوەی بە چاوەوە نەبێت ٠ هەروەها فەرمووی : لەم بارەوە خـاتوو (

عائشة ) _ خوای لیّ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : أن رسول الله ﷺ خطب ذاتَ يومٍ ، وعلى رأسه عِمامةٌ دَسْماء[٢٣٢] واته : ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ ووتاری دەخوێندەوەو مێزەرێکی چەورو ڕەشی بەسەرەوە بوو ، واتە : بەڵگەی دەهێنایەوە لە سەر ووشەی ( الدَسْماء ) ، ئالێرەشەوە شاعیرێك گوفتارەکەی وەرگرتووە کە دەڵێت :

مَا كَانَ أحْوَجَ ذا الكَمَالِ إلى عَيبٍ يُوَقِّيهِ مِنَ العَيْنِ

واته :

خاوەن سیفاتی تەواو پێویستی بە کەموکوڕدارێك نەبوو لە چاو بیپارێزێت

## بەشێك : سەبارەت بەو نوشتانەی چاوپیسی دەگێڕنەوە :

لەو نوشتانەی چاوپیسی دەگێڕێتەوە ئەوەیە کە لە ( أبي عبدالله السَّاجي )وە باس دەکرێت ، کەوا لە سەفەرێکیدا بە سەر ووشترێکی جوانەوە بوو ، کە بۆ حەج یاخود بۆ غەزا دەچوو ، لە نێو ڕەفیقەکانیشیدا پیاوێکی چاوپیس هەبوو ، کە تەماشای شتێکی دەکرد کەم جار نەیدەفەوتاند ، بە ( أبي عبدالله )یان گووت : ووشترەکەت لە چاو پیسەکە بپارێزە ، گوتی : هیچ ڕێگەیەکی نی یە بە ووشترەکەم بگات ، گوفتارەکانی ( أبي عبدالله ) گەینرایە چاوپیسەکە ، ئەوەبوو چاوپیسەکە لە کاتێکدا ئامادەنەبوونی ( أبي عبدالله )ی بەهەل زانی ، هاتە لای کۆپانی ووشترەکەو ، تەماشایەکی ووشترەکەی کرد ، یەکسەر ووشترەکەو تێکچوو و کەوت ، ( أبي عبدالله ) هاتەوە ، هەواڵیان پێدا کە چاوپیسەکە چاوی لە ووشترەکەی داوەو ، ئەوەتا دەیبینی کەوتووە ، گوتی : شوێنی ئەو پیاوەم پیشان بدەن . پیشان درا ، ئەوەبوو

---

٢٣٢ _ لم أجده من حديث عائشة . وأخرج أحمد ( ١ / ٢٣٣ ، ٢٨٩ ) ، والبخاري ( ٢ / ١٤ ) ( ٤ / ٢٤٨ ) ، ( ٥ / ٤٣ ) والترمذي في الشمائل ( ١١٨ ) كلهم عن عبدالرحمن بن سليمان بن حنظلة بن الغسيل قال : سمعت عكرمة عن ابن عباس قال : خرج رسول الله _ صلى الله عليه وسلم _ ، في مرضه الذي مات فيه بملحفة ، قد عصب بعصابة دسماء . . . والرواية المذكورة إنما هي رواية أحمد ( ١ / ٢٣٣ ) عن ابن عباس .

بەسەریەوە وەستاو ، گوتی : بسم الله ، حَبْسٌ حابسٌ ، وحَجَرٌ يابِسٌ ، وشهابٌ قابِس ، ردَّت عين العائنِ عليه ، وعلى أحبِّ الناس إليه ، ﴿ فارْجِعِ الْبَصرَ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ (٣) ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصرَ كَرَّتَيْنِ يَنْقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ (٤) ﴾ [ الملك : ٣ _ ٤ ] واتە : گرتنێك گرتویەك ، بەردە ووشكێك ، گڕوبزوسكی ئاگرە وەرگێراوێك ، چاوپیسی ئەو كەسە بگەڕێتەوە بۆ خۆی و ، بۆ خۆشەویسترین كەس بەلایەوە ، ئینجا ئەو ئایەتانەی سەرەوەی خوێند ، واتە : ﴿ فارْجِعِ الْبَصرَ ﴾ چاو بگێڕەو وورد بەرەوە بزانە ﴿ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ ﴾ ئایا هیچ ناتەوایەك دەبینیت · ﴿ ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصرَ ﴾ دوبارە چاو بگێڕە ﴿ كَرَّتَيْنِ ﴾ یەك لە دوای یەك ﴿ يَنْقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصرُ خَاسِئًا ﴾ چاوت بە ڕیسوایی و نائومێدی دەگەڕێتەوە بۆ لای خۆت ﴿ وَهُوَ حَسِيرٌ ﴾ وە ئەو ( چاوەت ) ماندووە تاقەتی چووە [٢٣٣] ئەوەبوو گلێنەی چاوپیسەكە هاتە دەرەوەو ، ووشترەكەش بە ساغی هەستا[٢٣٤].

## بەشێك : سەبارەت بەوەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ بە نووشتە ئیلاهیەكان چارەسەری گشتی بۆ هەموو ئازارەكان دەكرد :

رَوَى أَبُو دَاوُدَ فِي " سُنَنِه " : مِنْ حَدِيثِ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ : (( مَنْ اشْتَكَى مِنْكُمْ شَيْئًا ، أَوْ اشْتَكَاهُ أَخٌ لَهُ فَلْيَقُلْ: رَبَّنَا اللَّهُ الَّذِي فِي السَّمَاءِ ، تَقَدَّسَ اسْمُك ، أَمْرُكَ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ كَمَا رَحْمَتُكَ فِي السَّمَاءِ ، فَاجْعَلْ رَحْمَتَكَ فِي

---

٢٣٣ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ·

٢٣٤ _ لە فەتوای ژمارە ( ١٩٦٣٥ )دا ، ( اللجنة الدائمة )ی تایبەت بەزانایانی وەڵاتی سعودیەو بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارێك كە سەبارەت بەم مەسەلەیە ئاراستەیان كرابوو فەرموویانە : ئەم گوفتارانە جێگیر نەبووە نە لە پێغەمبەری خواوە _ صلى الله عليه وسلم _ و نە لە هاوەڵە بەڕێزەكانیشەوە ، بەلامانەوە هیچ بنەڕەتێكی نی یە و ، ووشەكانیشی نامۆیەو ، چارەسەری چاوپیسی و بە چاوەوەبونیش بە ئایەتەكانی قورئان و نوشتەو نزاو دوعاكانی پێغەمبەری خوا دەبێت _ صلى الله عليه وسلم _ ، وەرگێڕ ·

الْأَرْضِ ، وَاغْفِرْ لَنَا حُوْبَنَا وَخَطَايَانَا أَنْتَ رَبّ الطَّيِّبِينَ ، أَنْزِلْ رَحْمَةً مِنْ رَحْمَتِك ، وَشِفَاءً مِنْ شِفَائِكَ عَلَى هَذَا الْوَجَعِ ، فَيَبْرَأُ بِإِذْنِ اللّهِ )[٢٣٥]

واته : له ( أبي الدّرداء )هوه _ خواى لىّ رِازى بيّت _ فهرموويهتى : گويبيستى پيّغهمبهرى خوا بووم ﷺ دهيفهرموو : (( ههركهس له ئيّوه ئازاريّكى ههبوو ، ياخود براكهى ئازاريّكى بوّ دهربرِى با بلّيّت : پهروهردگارمان ئهو خوايهيه كه له ئاسماندايه ، ناوه جوانهكانت به پاك و پيروّز رِادهگرين ، فهرمانت له زهوى و ئاسماندا بهردهوامهو جيّبهجىّ دهكريّت وهكو ئهوهى بهزهى و رِهحمهتت له ئاسماندا فهراهام كردووه ، ئاواش بهزهى و رِهحمهتت له سهر زهويدا زيادو فهراهام بكه ، له تاوانى گهورهى به ئهنقهستمان و له تاوانه بچوكهكانمان خوّش به ، توّ پهروهردگارى پاكان و چاكهكانى ، ئهوانهى وازيان له تاوان و سهرپيّچى هيّناوه ، رِهحمهت و بهزهيهكى خوّت و ، شيفايهك له شيفاكانى خوّت به سهر ئهم ئازارهدا دابهزيّنه ، ئيتر به ئيزنى خواى تعالى چاك دهبيّتهوه )) ٠

صَحِيحِ مُسْلِمٍ " عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيّ ، أَنّ جِبْرِيلَ – عَلَيْهِ السّلَامُ – أَتَى النّبِيّ _ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ _ فَقَالَ يَا مُحَمّدُ اشْتَكَيْتَ ؟ فَقَالَ : (( نَعَمْ )) ، قَالَ جِبْرِيلُ ﷺ بِاسْمِ اللّهِ أَرْقِيكَ مِنْ كُلّ شَيْءٍ يُؤْذِيكَ ، مِنْ شَرّ كُلّ نَفْسٍ أَوْ عَيْنِ حَاسِدٍ اللّهُ يَشْفِيكَ ، بِاسْمِ اللّهِ أَرْقِيكَ[٢٣٦].

واته : له ( أبي سعيد الخُدْريّ )هوه _ خواى لىّ رِازى بيّت _ فهرموويهتى : ( جبريل ) _ عليه السلام _ هاته خزمهتى پيّغهمبهرى خوا ﷺ و فهرمووى : ئهى محمد ئازارت ههيه ؟ ئهويش فهرمووى : (( بهلّىّ )) ، ئهوهبوو ( جبريل ) _ عليه السلام _ فهرمووى : بهناوى

---

٢٣٥ _ ضعيف : أخرجه أبوداود ( ٣٨٩٢ ) ، والنسائي في عمل اليوم والليلة ( ١٠٣٨ ) كلاهما عن محمد بن كعب عن فضالة بن عبيد عن أبي الدرداء فذكره ، وأخرجه النسائي في عمل اليوم والليلة ( ١٠٣٧ ) عن محمد بن كعب عن أبي الدرداء نحوه ولم يذكر فيه فضالة بن عبيد٠

٢٣٦ _ صحيح : أخرجه مسلم ( ٢١٨٦ ) ٠

خواوه نوشتەت بۆ دەخوێنم ، له هەموو شتێك ئازارت بدات ، له خراپەی هەموو نەفسێك یا چاوپیسێكی ئێرەیی بەر خوا شیفات بدات ، بەناوی خواوه نوشتەت بۆ دەخوێنم ٠

ئەگەر گوترا چ دەڵێین دەربارەی ئەو فەرموودەیەی كه ئیمامی ( أَبُو دَاوُدَ ) دەیگێڕێتەوه : (( لَا رُقْيَةَ إِلَّا مِنْ عَيْنٍ أَوْ حُمَةٍ )) ؟ واته : (( نوشتەكردن نی یه مەگەر بۆ دورخستنەوەی بەچاوەوەبوون یاخود جانەوەره ژەهرداره‌كان )) ٠

بۆ وەڵامەكەی دەڵێین : ئەو فەرموودەیه قەدەغەی شیاوێتی نووشتەكردن ناكات بۆ بوارەكانی دیكه ، چونكه مەبەست به فەرموودەكه ئەوەیه كه : نوشتەكردن شایستەترو بەكەڵك تره كه بۆ چاوپیسی و پێوەدانی جانەوەره ژەهرداره‌كان بكرێت بەبەراوردی بوارەكانی تر ٠ میانەو شێوازی فەرموودەكه بەڵگەی سەر ئەم شتەن ، چونكه ( سَهْل )ی كوڕی ( حُنيف ) كاتێ كه بەچاوەوەبوو فەرمووی : ( أَوَ في الرُّقى خير ؟ فقال : لا رُقية إلا في نَفْسٍ أو حُمَةٍ ) واته : فەرمووی : گەورەم ئایا نووشته چاكه ؟ ئەویش فەرمووی : (( لەوه چاكتر نابێت كه نوشته بۆ چاوپیسی و ، پێوەدانی جانەوەره ژەهرداره‌كان بكرێت )) ٠ هەروەها تێكڕای فەرموودەكانی نوشته گشتی و تایبەتەكان پەنجه بۆ ئەوه ڕادەكێشن

وَقَدْ رَوَى أَبُو دَاوُدَ مِنْ حَدِيثِ أَنَسٍ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ _ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ _ : (( لَا رُقْيَةَ إِلَّا مِنْ عَيْنٍ ، أَوْ حُمَةٍ ، أَوْ دَمٍ يَرْقَأُ ))[(٢٣٧)].

واته : ( أنس ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لەوه چاكتر نابێت نوشته بۆ به چاوەوەبوون ، یا پێوەدانی جانەوەره ژەهرداره‌كان ، یا بۆ وەستانەوەی خوێن بەربونی لووت بكرێت )) ٠

---

٢٣٧ _ إسناده ضعيف : أخرجه أبوداود ( ٣٨٨٩ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف أبي داود ( ٨٣٨ ) ٠

وَفي " صَحِيحِ مُسْلِمٍ " عَنْهُ أَيْضًا : رَخّص رَسُولُ اللّهِ ﷺ فِي الرّقْيَةِ مِنْ الْعَيْنِ ، وَالْحُمَةِ ، وَالنّمْلَةِ(٢٣٨) .

واته : ( أنس ) _ خواى لىّ رازى بيّت _ فەرموويەتى : پيّغەمبەرى خوا ﷺ مۆلّەتى داوه نوشته بكريّت بۆ بەچاوەوەبوون و ، پيّوەدانى جانەوەره ژەهرداره‌كان و ، ئەو برين و زامانەى له لاكانى مرۆڤدا دروست دەبن .

## بەشيّك : سەبارەت بەوەى كه پيّغەمبەرى خوا ﷺ چارەسەر و نووشتەى بۆ كەسى پيّوەدراو دەكرد به خويّندنى سورەتى ( الفاتحة ) :

أخْرَجَا في " الصّحِيحَيْنِ " مِنْ حَدِيثِ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيّ ، قَالَ : انْطَلَقَ نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِ النّبِيّ ﷺ فِي سُفْرَةٍ سَافَرُوهَا حَتّى نَزَلُوا عَلَى حَيّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ ، فَاسْتَضَافُوهُمْ ، فَأَبَوْا أَنْ يُضَيّفُوهُمْ ، فَلُدِغَ سَيّدُ ذَلِكَ الْحَيّ ، فَسَعَوْا لَهُ بِكُلّ شَيْءٍ لَا يَنْفَعُهُ شَيْءٌ ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ : لَوْ أَتَيْتُمْ هَؤُلَاءِ الرّهْطَ الّذِينَ نَزَلُوا لَعَلّهُمْ أَنْ يَكُونَ عِنْدَ بَعْضِهِمْ شَيْءٌ ، فَأَتَوْهُمْ فَقَالُوا : يَا أَيّهَا الرّهْطُ إِنّ سَيّدَنَا لُدِغَ ، وَسَعَيْنَا لَهُ بِكُلّ شَيْءٍ لَا يَنْفَعُهُ ، فَهَلْ عِنْدَ أَحَدٍ مِنْكُمْ مِنْ شَيْءٍ ؟ فَقَالَ بَعْضُهُمْ ، نَعَمْ وَاللّهِ إِنّي لَأَرْقِي ، وَلَكِنْ اسْتَضَفْنَاكُمْ ، فَلَمْ تُضَيّفُونَا ، فَمَا أَنَا بِرَاقٍ حَتّى تَجْعَلُوا لَنَا جُعْلًا ، فَصَالَحُوهُمْ عَلَى قَطِيعٍ مِنْ الْغَنَمِ ، فَانْطَلَقَ يَتْفُلُ عَلَيْهِ ، وَيَقْرَأُ : ﴿ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبّ الْعَالَمِينَ ﴾ ، فَكَأَنّمَا أُنْشِطَ مِنْ عِقَالٍ ، فَانْطَلَقَ يَمْشِي وَمَا بِهِ قَلَبَةٌ ، قَالَ : فَأَوْفَوْهُمْ جُعْلَهُمْ الّذِي صَالَحُوهُمْ عَلَيْهِ ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ اقْتَسِمُوا، فَقَالَ الّذِي رَقَى : لَا تَفْعَلُوا حَتّى نَأْتِيَ رَسُولَ اللّهِ ﷺ فَنَذْكُرَ لَهُ

٢٣٨ _ تقدم تخريجه .

الّذي كَانَ ، فَنَنْظُرَ مَا يَأْمُرُنَا ، فَقَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللّهِ ﷺ فَذَكَرُوا لَهُ ذَلكَ فَقَالَ : (( وَمَا يُدْرِيكَ أَنّهَا رُقْيَةٌ ؟ )) ثُمّ قَالَ : (( قَدْ أَصَبْتُمْ اقْسِمُوا وَاضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ سَهْمًا ))(٢٣٩).

واته : له ( أبي سعيد الخُدري )وه _ خواى لىَ رازى بيَت _ فهرموويهتى : چهند كهسيَك له هاوهڵانى پيَغهمبهرى خوا ﷺ له سهفهريَكدا بهريَكهوتن تا لاى خيَڵيَك له خيَڵهكانى عهرهبدا دابهزين ، داواى ميوانداريان ليَكردن ، بهڵام به ميوان وهريان نهگرتن ، گهورهى خيَڵهكه پيَوهى درا ، به ههموو شتيَك ههوڵيان بۆدا هيچ شتيَك سوودى بۆ نهبوو ، كهسانيَكيان گوتيان : ئهگهر بچونايهته لاى ئهو چهند كهسهى لاتان دابهزيون بهشكو لاى كهسيَكيان شتيَك ههبيَت ، ئهوهبوو چونه لايان و گوتيان : ئهى ئهم كۆمهڵه خهڵكه گهورهكهمان پيَوهى دراوهو ، بهههموو شتيَك ههوڵمان بۆ داوه بهڵام بيَسوود بوو ، ئايا بهلاى يهكيَتانهوه شتيَك دهست دهكهوێ ؟ كهسيَكيان فهرمووى: بهڵێ سويَند بهخوا من نوشته دهكهم ، بهڵام داواى ميوانداريمان ليَكردن و ، به ميوان وهرتان نهگرتين ، بۆيه دڵنيابن نوشتهى بۆ ناكهم تا كريَيهكمان بۆ دانهنيَن ، ئهوهبوو له سهر رانيَك مهڕ له گهڵياندا ريَكهوتن ، بۆيه كهسيَكيان راپهڕى و تفى به شويَنى پيَوهدانهكهدا دهكردو ، ﴿ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبّ الْعَالَمِينَ ﴾ دهخويَند ، تا واى ليَهات وهكو ئهوهى له پيَوهنديَك ئازاد كرابێ ، ئهوهبوو دهستى به رۆشتن كردو هيچ نهخۆشيهكى نهمابوو ، گوتى : ئهو كريَيهى لهسهر ريَكهوتن بياندهنێ ، كهسانيَك له هاوهڵان فهرموويان با دابهشى بكهين ، بهڵام ئهو هاوهڵهى نوشتهكهى كرد فهرمووى : ئهو كاره نهكهن تاوهكو دهچينهوه خزمهتى پيَغهمبهرى خوا ﷺ و ئهوهى رويدا بۆى دهگيَرينهوهو ، تهماشا دهكهين چ فهرمانيَكمان پىَ دهكات ، پاشان هاتنهوه خزمهتى پيَغهمبهرى خوا ﷺ ئهوهيان

٢٣٩ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ٢ ، ٤٤ ) ، والبخاري ( ٣ / ١٢١ ) ( ٧ / ١٧٠ ، ١٧٣ ) ، ومسلم ( ٧ / ١٩ ، ٢٠ ) ، وأبوداود ( ٣٤١٨ ، ٣٩٠٠ ) ، والترمذي ( ٢٠٦٤ ) ، والنسائي في عمل اليوم والليلة ( ١٠٢٨ ) ( ١٠٢٩ ) كلهم من طريق أبي بشر جعفر بن إياس ، عن أبي المتوكل عن أبي سعيد الخدري فذكره .

بۆ كێڕايەوەو ئەويش فەرمووى (( چۆن زانيوتە سورەتى ( الفاتحة ) نوشتەيە )) پاشان فەرمووى : (( پێكاوتانە بچن دابەشى بكەن و بەشكيش بۆ من دابنێن )) ٠

وَقَدْ رَوَى ابْنُ مَاجَهْ فِي " سُنَنِهِ " مِنْ حَدِيثِ عَلِيّ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ (( خَيْرُ الدَّوَاءِ الْقُرْآنُ ))(٢٤٠) .

واتە : ئيمامى ( علي ) _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : (( خێرترين و چاكترين دەرمان قورئانە )) ٠

ئاشكەرايە هەندىٚ گوفتار خاسيەت و سوودو كەڵكى تاقيكراوەى هەيە ، ئەى گوفتارى خواى تعالى دەبىٚ چۆن بىٚ ؟ ، كە فەزڵى داوە بەسەر هەموو گوفتارێكدا ، وەكو ئەوەى فەزڵى خۆى داوە بەسەر هەموو خوڵقێنراوەكانيدا ، بۆيە گوفتارەكانى شيفادەرى تەواوە ، هۆكارى تەواوە بۆ دووربوون لە هەڵەو تاوان ، نورو ڕوناكى ڕێنمايكارە ، بەزەى و ڕەحمەتى گشتيە ، كە ئەگەر دابەزێنرايە سەر چيايەك دەشكێت و شەق دەبات لە بەر گەورەيى و شكۆمەندى ﴿ وَنُنزِلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ وَلا يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إِلا خَسَارًا ﴾ [ الإسراء : ٨٢ ] واتە : ﴿ وَنُنزِلُ مِنَ الْقُرْآنِ ﴾ وە لەم قورئانەدا دەنێرينە خوارەوە ﴿ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾ ئەوەى كە شيفاو ميهرەبانيە بۆ بڕواداران ﴿ وَلا يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إِلا خَسَارًا ﴾ بەڵام ( هاتنى ئەم قورئانە ) بۆ ستەم كاران هيچ زياد ناكات بێجگە لەو خەسارەت مەندى(٢٤١) ، واتاى ئايەتەكە ئەوە دەبەخشێت كە لە ڕەگەزى ئەم قورئانەى دابەزاندووە بۆ شيفابەخشين ، نەك هەندىٚ لە قورئانەكە شيفابەخش بن بەڵكو هەمووى شيفابەخشە ٠ ئەمە ڕاسترينى دوو بۆچونە لەم بارەوە ، ئەمەش بە هاوشێوەى گوفتاريەتى لە ئايەتێكى تردا كە دەفەرمێت : ﴿ وَعَدَ اللهُ الذينَ آمَنُوا وَعَملوا الصَّالحاتِ مَنهُم مَّغْفرةً وَأجْراً عَظيماً ﴾ [ الفتح : ٢٩ ] واتە : ﴿ وَعَدَ اللهُ ﴾ خوا بەڵێنى داوە ﴿ الذينَ آمَنُوا وَعَملوا الصَّالحاتِ مَنهُم ﴾ بەوانەيان كە

---

٢٤٠ _ إسناده ضعيف : أخرجه ابن ماجة ( ٣٥٧١ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٢٨٨٥ ) ٠

٢٤١ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەى تەفسيرى قورئان ٠

باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە ﴿ مَّغْفِرَةً وَأَجْراً عَظِيماً ﴾ بە لێبوردن و پاداشتی گەورە ( کە بەهشتە )[٢٤٢] ، هەمووشیان لەوانەن کە باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە · ئەی سورەتی ( الفاتحة ) دەبێ چۆن بێ ؟ ، کە نەلە قورئان و ، نەلە تەورات و ، نەلە ئینجیلیشدا بەهاوشێوەی دانەبەزیوە ، کە مانای هەموو کتێبەکانی خوا لە خۆدەگرێت ·

باسی بنەڕەتی ناوەکانی پەروەردگارو کۆکەرەوەی لە خۆدەگرێت ، وەکو : ( الله ) ، ( الرَّب ) ، ( الرَّحمن ) · جێگیرکردنی دەرەنجام و ڕۆژی زیندوبونەوە لە خۆدەگرێت ·

باسی هەردوو جۆرەکەی یەکتاپەرستی : یەکتاپەرستی پەروەردگارێتی و ، یەکتاپەرستنی ئولوهیەتی تێدایە·

باسی پێویست بوون بە خوای تعالاوە دەکات ، سەبارەت بە داواکردنی یارمەتی و داواکردنی ڕێنمووییی و ، تایبەتکردنی خوای پەروەردگار بەوەوە ·

باسی چاکترین و بەسودترین و پێویستیترین جۆرەکانی نزاو دوعای تێدایە ، کە پێویسترین شتن بۆ بەندەکانی خواو ، بریتیە لە ڕێنمووی کردن بۆ ڕێگای ڕاست ، کە لە چوارچێوەی تەواو ناسینی خوای تعالی و یەکتاپەرستی و پەرستنیدا خۆی دەنوێنێ ، بە ئەنجامدانی ئەوەی فەرمانی پێکردوەو ، خۆبەدورگرتن لەوەی قەدەغەی کردووەو ، بەردەوام بوون لە سەری تاوەکو مردن ·

باسی هەموو جۆرە بەدیهێنراوەکانی خوای تعالای تێدایە کە دابەش بوونە بۆ جۆرێك : نیعمەتی خۆی بەسەردا ڕشتوون وەکو ناسینی هەق و ، کارپێکردنی و ، خۆشویستنی و ، فەزڵدانی بە سەر هەموو شتێکی تردا ، جۆرێکیش : خەشمیان لێگیراوە چونکە پاش

---

٢٤٢ ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ·

ئەوەی هەقیان ناسی وازیان لێهێنا ، وە جۆرێکی گومڕاش : بە هۆی نەناسینی خوای پەروەردگاری هەقەوە ٠

باسی جێگیرکردنی قەدەرو چارەنوس و ، شەرع و ، ناو و ، سیفات و ، زیندوبونەوەو ، ( النبوات )و ، پاکردنەوەی نەفس و ، چاکردنی دڵانی تێدایە ٠

باسی دادپەروەری و چاکەکاری و ، وەڵامدانەوەی ئەهلی بیدەعەو پوچێتی تێدایە ، وەکو ئەوەی لە کتێبە گەورەکەماندا ( مدارج السالكين ) باسمان کردووە ٠

بۆیە ئەگەر سورەتێك ئەمە باروحاڵی بێ ، بەڕاستی زۆر شایستیە بکرێت بە هۆکارێك بۆ وەرگرتنی شیفاو ، نوشتەیەك بێت بۆ کەسی پێوەدراو ٠

بە گشتی ٠ لەبەر ئەوەی سورەتی ( الفاتحة ) بەتەنها بەندایەتیکردن و ، ستایشکردنی خوای تعالای تێدایە ، هەروەها هەموو دەستەڵات پێدانێك و ، داوای یارمەتی و ، پشت پێ بەستن و ، داواکردنی هەموو نیعمەتێك لە خوای تعالی لە خۆ دەگرێت ، کە بەڕاستی ڕێنمویی کارە بۆ دەستخستنی هەموو نیعمەتێك و ، لادانی هەموو سزایەك ، بۆیە بوە بە گەورەترین دەرمانە شیفابەخشەکان ٠

گوتراوە : جێگەی نوشتەکە لەم سورەتدا بریتیە لە ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ [ الفاتحة : ٤ ] واتە: ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ ﴾ ( خوایە ) تەنها تۆ دەپەستین ﴿ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ وە تەنها لە تۆ داوای یارمەتی دەکەین[٢٤٣] ، بێگومان ئەم دوو ووشەیە بەهێزترین بەشەکانی ئەم دەرمانەن ، چونکە هەموو ئەمانە لە خۆ دەگرێت : دەستەڵات پێدان ، پشت بەستن ، پەنابردن ، داوای یارمەتیکردن ، پێویست بوون و داواکردن ، کۆکردنەوە لە نێوان گەورەترین مەبەستەکاندا : کە بریتیە لە بەتەنها پەرستنی خوای تعالاو ، بەڕێزترین وەسیلەکانیشدا کە

٢٤٣ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

داواى يارمەتى كردنە بە تەنها لە خواى تعالى ، بۆ بەجێهێنانى پەرستنى تەواوى خۆى ، كە لە هيچ جێگەيەكى ديكەدا ئەم شتانە كۆ نەبۆتەوە · پێشەوا ( ابن القيم ) فەرموويەتى : لە مەككە بووم كاتێكم بە سەردا تێپەڕيوو نەخۆش كەوتم و ، پزيشك و دەرمانم دەست نەكەوت ، بۆيە خۆمم بەم سورەتە چارەسەر دەكرد ، دەچوم چەند قومێكم لە ئاوى زەمزەم دەهێناو ، چەند جارێك ئەم سورەتەم بەسەردا دەخوێندو ، پاشان دەمخواردەوە ، ئەوەبوو بوبە هۆى چاكبونەوەى تەواوم ، پاشان پشتم پێ دەبەست بۆ چارەسەركردنى هەر ئازارێكى تريش كە تووشم دەبوو ، بەوەش ئەوپەڕى سوودەم لێوەردەگرت ·

## بەشێك : سەبارەت بەوەى كاريگەرى نوشتەكرن بە سورەتى ( الفاتحة ) و جگە لەويش نهێنيەكى سەرسوڕمێنى تێدايە لە چارەسەركردنى ژەهردارەكاندا :

لەم بارەوە كاريگەرى نووشتەكردن بە سورەتى ( الفاتحة )و جگە لەويش نهێنيەكى سەرسوڕمێنى تێدايە سەبارەت بە چارەسەركردنى پێوەدانى ژەهردارەكان ، چونكە ژەهردارەكان چۆنيەتيە پيسە ژەهرەكانيان بەكاردەهێنن وەكو چەكێك بۆ خۆپاراستن كاتێ كە هەڵدەستن بە گەزتن و پێوەدان ، بەو كارەش هەڵناسن تاوەكو توڕە نەبن ، ئەگەر توڕەبوون ، ژەهرەكانيان هەڵدەچن و ، بە ئاميرەكانيان فڕێى دەدەن ، خواى پەروەردگاريش بۆ هەموو نەخۆشيەك دەرمانێكى داناوە ، بۆ هەموو شتێك دژێكى داناوە ، نەفسى ئەو كەسەى نووشتەكە دەكات كار لە نەفسى ئەو كەسە دەكات كە نووشتەكەى بۆ دەكرێت ، لە نێوان هەردوو نەفسەكەدا كارو كارتێكراوبوون دروست دەبێ ، وەكو ئەوەى لە نێوان نەخۆشى و دەرماندا دروست دەبێ ، بۆيە نەفس و هێزى ئەو كەسە نووشتەكە زياتر بە سەر نەخۆشيەكەدا زاڵ دەكات و ، بە ئيزنى خواى پەروەردگار لايدەبات · لێرەوە ڕوون دەبێتەوە كە تەوەرەى كاريگەرى دەرمان و نەخۆشيەكان لە سەر كارو كاتێكراوبوون وەستاوە ، چونكە بەهاوشێوەى ئەوەى كە لە نێوان نەخۆشى سروشتى و دەرمانە سرۆشتيەكاندا ڕوودەدات ، ئاوەهاش لە نێوان نەخۆشى ڕوحى و دەرمانە ڕوحيەكاندا ، وە

ڕوحـانى و ، سروشـتيەكاندا ڕوودەدات ، فـوكردن و تفكـردنيش هۆكـاريكن پشـت بـە شـىٚ و هەواكەيان دەبەستريٚت ، لە گەلْ ئەو نەفسەى نوشتەكە دەكات و ، لە گەلْ زيكـرو نزاكردنـدا بەكاردێن بۆ لادانى نەخۆشيەكە ، چونكە نوشتە لە دلْ و دەمى ئەو كەسەوە دەردەچێت كە نوشتەكە دەكات ، بۆيە ئەگەر شتێك لە تف و هەواو نەفەسى ناوەكى ئەو كەسەى لـە گەلْدا بىٚ كاريگـەرى تـەواوى دەبـىٚ و ، كـارو تێپـەڕبونێكى بەهێزيشـى دەبـىٚ ، بـە جـووتكردنى نووشـتەو تـف و هەواكـە دەرمـانێكى كاريگـەرى بـەهێز پەيـدا دەبـىٚ كـە دەچـوێنرێت بـەو دەرمانانەى كە بە ئاوێتەكردن بەدەست دێن٠

بەگشتى ٠ نەفسى نوشتەكار بەرامبەر بە نەفسـە خـراپ و پيسـەكان دەوەسـتێتەوە ، ئـەم شـتەش زيـاترو كاريگـەرتر دەبـىٚ بـە گـوێرەى نەفسـى نووشـتەكار خـۆى ، وە بـە يارمـەتى خوێنـدنى نوشـتەكەو فـوكردن ئـەو ئاسـەوارە لادەبـات ، بۆيـە هەرچـەند نەفسـى نوشـتەكار بەهێزتر بێت ئەمەندە نووشتەكە تەواوتر دەبىٚ ، نوشتەكاريش كە يارمەتى لە فـوكردنى خـۆى وەردەگرێت بە هاوشێوەى ئەو نەفسە پيسانەيە كـە يارمـەتى لـە گـەزتن و پێـوەدانى خۆيـان وەردەگرن ٠

فووكردن نهێنيەكى تريشى تێدايە ، چونكە هۆكارێكـە ڕوحـە چـاك و پيسـەكانيش بـەكارى دەهێنن و يارمـەتى لێـوەردەگرن ، بۆيـە جادوگـەرانيش بەكاريـدەهێنن وەكـو هـەر خـەلْكێكى باوەڕدار كە بەكاريدێنن ٠

خواى تعالى فەرموويەتى : ﴿ ومِنْ شَرِّ النَّفاثاتِ في العُقَدِ ﴾ [ الفلق : ٤ ] واتە : وە لـە زيـانى فووكەران ( جادووكەران ) بـە گـرىٚ يانـدا [٢٤٤] ، چـونكە نـەفس لـە گـەلْ بـارێكى تووڕەبـوون و جەنگاندا ڕادێت و ، نەفەسى وەكو تيرێكى خۆى دەنێرێت و ، بـە فـوو تـەف كۆمـەكى دەكـات كە كەمێك لێكيى لە گەلْدايە ، ئيتر بەياوەرى بارێكى كاريگەريش كارى خـۆى ئـەنجام دەدات ،

---

٢٤٤ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەى تەفسيرى قورئان ٠

جادوكەران يارمەتى لە فووكردن وەردەگرن بە ئاشكرا ، ئەگەرچى هيچ پەيوەنديەكيشى بە جەستەى كەسى جادولێكراوەوە نەبىٚ ، بەڵكو فوو لە گرێكان دەكات و گرىٚ يان دەدات ، بە جادوو قسە دەكات و ، ئەو كارە بە كەسى جادولێكراو دەكات بە يارمەتى ڕوحە پيسەكانى خوارەوە ، ڕوحە پاك و چاكەكەش بە خوێندنى نوشتە بەرامبەرى دەوەستێت و دورى دەخاتەوەو ، لەم بارەشدا يارمەتى لە فووكردنى خۆى وەردەگرێت ، هەركاميان بەهيزتر بوون حوكم بۆ ئەو دەبێت · ڕوو بە ڕووبونەوەى هەندىٚ لە ڕووحەكان بەرامبەر بە هەندێكى تريان و ، جەنگكردنيان و ئەو كەرستانەى كە بەكارى دێنن ، لە ڕەگەزى ڕوو بە ڕووبونەوەى جەستەكان و ، جەنگكردنيانە و ئەو كەرستانەى كە بەكارى دێنن ، چونكە بنەڕەت لە هێزى جەنگين و ڕوو بە ڕووبونەوەى ڕوح و جەستەكاندا ئەو سەبازو كەرەستانەيە كە بەكار دەهێنرێن ، بەڵام هەندىٚ كەس بيروهۆشى واى لێكردووە هەست بە كاريگەرى ڕوحەكان و كارو كاتێكرابوونيان نەكات ، چونكە لە لايەن بيروهۆشى خۆيەوە دەستى بەسەردا گيراوە ، خۆى لە جيهانى ڕوحەكان و ، حوكم و ، كردەوەكانيان بەدوورگرتووە ·

مەبەستيش ئەوەيە كە : ئەگەر ڕوح بەهێز بوو و لە گەڵ ماناكانى سورەتى ( الفاتحة )دا ڕاهات و ، كۆمەكى لە فووكردن و تفى خۆى وەرگرت ، ئەوا ڕوو بە ڕووى ئەو ئاسەوارە دەبێتەوە كە بە هۆى نەفسە پيسەكانەوە تووشى بووەو ، لايدەبات و دووريدەخاتەوە · والله أعلم ·

## بەشێك : سەبارەت بە چارەسەركردنى پێوەدانى دووپشك بە نوشتە :

رَوَى ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ فِي " مُسْنَدِه " ، مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللّٰه بْنِ مَسْعُودٍ ، قَالَ : بَيْنَا رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ يُصَلِّي ، إِذْ سَجَدَ فَلَدَغَتْهُ عَقْرَبٌ فِي أُصْبُعِهِ ، فَانْصَرَفَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ وَقَالَ : " (( لَعَنَ

اللّهُ الْعَقْرَبَ مَا تَدعُ نَبِيّا وَلَا غَيْرَهُ ))[٢٤٥] ، قَالَ : ثُمّ دَعَا بِإِنَاءٍ فِيهِ مَاءٌ وَمِلْحٌ ، فَجَعَلَ يَضَعُ مَوْضِعَ اللّدْغَةِ فِي الْمَاءِ وَالْمِلحِ ، وَيَقْرأُ ﴿ قُلْ هُوَ اللّهُ أَحَدٌ ﴾ وَالْمُعَوّذَتَيْنِ ، حَتّى سَكَنَتْ.

واته : له ( عبدالله )ى كوڕى ( مسعود )ەوە _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : له كاتێكدا پێغەمبەرى خوا ﷺ نوێژى دەكرد ، كە چووە سوجدە دووپشكێك داى بە پەنجەيەوە ، پێغەمبەرى خوا ﷺ سڵاوى نوێژەكەى دايەوەو فەرمووى : (( نەفرينى خوا له دووپشك بێت كە نە له پێغەمبەرێك و نە لە كەسێكى تريش واز دێنىٚ )) ، ( عبدالله ) فەرمووى : پاشان بانگى كرد قاپێكى بۆ بێنن ئاو خوێى تێدا بێت ، ئەوەبوو شوێنى پێوەدانەكەى دەخستە نێو ئاو و خوێكەو ، ﴿ قل هو الله أحد ﴾ و ( المعوذتين ) دەخوێند ، تاوەكو ئازارەكەى نيشتەوە .

## ئەو سوودانەى لە سورەتى ( الإخلاص ) دايە بۆ چارەسەركردنى كەسى پێوەدراو :

چارەسەرى نێو ئەم فەرموودەيە بە دەرمانێكى ئاوێتە كراوە لە دوو شت : سروشتى و خوايى ، چونكە سورەتى ( الإخلاص ) يەكتاپەرستى زانستى باوەڕيى ( التوحيد العلمي الأعتقادي ) لە خۆ دەگرێت . جێگيركردنى تەنهايى بۆ خواى تێدايە ، كە پێويستە هەموو هاوبەشێكى لىٚ دورخەيتەوە .

جێگركردنى ( الصمدية )ى تێدايە ، واتە سيفاتەكانى لە هەموو ڕوويەكەوە ئەوپەڕى بلٚندن لە تەواوێتيدا ، بە ئاستێك هەموو بونەوەر ڕووى تێدەكەن بۆ جێبەجێكردنى پێويستيەكانيان ، لە ئاسمان و لە زەمين .

---

٢٤٥ _ إسناده صحيح : أخرجه الترمذي ( ٢٩٠٥ ) ، وصححه الألباني في الصحيحة ( ٥٤٨ ) .

نەفیکردنی باب و کوڕو ، هاوتا و هاوشان و ، لق و منداڵ و هاو وێنەو ، هاوچەشنی تێدایە. چونکە هەموو ئەوانە تەنها تایبەتن بە پەروەردگارەوەو بەم شێوە ئەم سورەتە لە جێی سێ یەکی قورئانە ·

ناوی ( الصمد ) شێوەی تەواوی بێ کەم و کوڕی دەبەخشێت · نەفیکردنی ( الكُفْءِ ) نەفیکردنی هاوشێوەو هاوشان دەبەخشێت · ووشەی ( الأحد )یش نەفیکردنی هەموو هاوبەشێکە بۆ خوای پەروەردگار ، ئەم سێ بنەڕەتانەش کۆکەرەوەی یەکتاپەرستنە ·

## ئەو سوودانەی لە ( المعوذتين ) دایە بۆ چارەسەرکردنی کەسی پێوەدراو :

( المعوذتين ) پەناگرتنە لە هەموو شەڕو خراپەو نەویستراوێك بەگشتی ، چونکە کە مرۆڤ پەنا بەخوا دەگرێت لە خراپەو شەڕی هەموو ئەوانەی کە خوای تعالى دروستی کردوون ، ئەوا بەتێکڕا هەموو خراپەو شەڕێك دەگرێتەوە ، بە یەکسانی ئەگەر لە جەستەدا بن یاخود لە ڕوحەکاندا ·

هەروەها پەناگرتنی تێدایە لەو خراپانەی لە شەودا ڕوودەدەن و ، نیشانەشی ئاوابونی مانگە ، کە بریتیە لە پەناگرتن بەخوا لە خراپەی هەموو ئەو روحە پیسانەی تیایدا بڵاو دەبنەوە ، کە پێشتر ڕوناکی ڕۆژو ڕوناکی مانگ قەدەغەی بڵاوبونەوەی لێ دەکردن ، بەڵام بە ئاوابونی ڕۆژو مانگ و داهاتنی تاریکی ، ئەو ڕوحە خراپە زیانبەخشانە بڵاوبونەوەو دەستیان بە خراپی کرد ·

پەناگرتن لە شەڕی فوکەران بە گرێکانیاندا واتە پەناگرتنە لە شەڕو خراپەی جادوکران و جادوکانیان · پەناگرتنیش لە شەڕوخراپەی کەسانی ئێرەیی بەر ، واتە پەناگرتنە بەخوا لەو نەفسە پیسە زیانبەخشانەی کە بە ئێرەیی و چاوچنۆکی و تێڕوانینیان خراپە دروست دەکەن ·

سورەتی دووەمیش واتە سورەتی ( النـاس ) پەناگرتنە بەخوا لە شەڕوخراپەی شەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکە ، بەراستی هەردوو سورەتەکە هەموو پەناگرتنێکیان بەخوا کۆکردۆتەوە ، لە هەموو شەڕو خراپەیەك ، پلەیەکی گەورەشیان هەیە بۆ خۆپارێزیی و قەڵابەندی لە شەڕوخراپە پێش ئەوەی ڕوویدەن ، ولهذا أوصى النبيُّ ﷺ عُقبةَ بن عامر بقراءتهما عَقِبَ كُلِّ صلاةٍ[٢٤٦]، ذكره الترمذي في جامعه · واتە : بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ( عُقبةَ )ی کوڕی ( عامر )ی ڕاسپارد پاش هەموو نوێژێك ( المعوذتين ) بخوێنێت ·

نهێنیەکی گەورە لەمەدا بەدیدەکرێت بۆ دورخستنەوەی شەڕو خراپە لە نوێژێکەوە بۆ نوێژێکی تر · پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : هەرگیز پەناگرتنان ( المتعوذون ) نەینتوانیوە بە شتێکی تری هاوشێوەی ( المعوذتين ) پەنا بەخوا بگرن · باسکراوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺبە دوازدە گرێ جادوی لێکراو ، ( جبريل ) _ عليه السلام _ ( المعوذتين )ی بۆ دابەزاندو ، ئەویش کە ئایەتێکی دەخوێند گرێیەك دەکرایەوە ، تاوەکو هەر دوازدە گرێکە کرانەوەو ، ئەوەبوو هەستا وەکو ئەوەی لە پێوەندێك ڕزگار کرابێ ·

## سوود لە خوێدایە بۆ چارەسەرکردنی پێوەدان :

بەڵام بۆ چارە سەری سروشتی ، ماددەی خوێ بۆ لابردنی زۆرێك لە ژەهرەکان سوودی هەیە ، بەتایبەت پێوەدانی دووپشك ، دانەری کتێبی ( القانون ) دەڵێت : لە گەڵ تۆوی کەتاندا ( بزرِ الكتّان ) بۆ پێوەدانی دووپشك بەکاردێت ، هەروەها کەسانی تریش هەمان شتیان باس کردووە · خوێش هێزێکی ڕاکێشانی تێدایە ژەهر ڕادەکێشێت و شی دەکاتەوە ، لەبەر ئەوەی گەزتن و پێوەدانی دووپشك هێزێکی ئاگرینی تێدایەو پێویستی بە

٢٤٦ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٤ / ١٥٥ ، ٢٠١ ) ، وأبوداود ( ١٥٢٣ ) ، والترمذي ( ٢٩٠٣ ) ، والنسائي ( ٣ / ٦٨ ) ، وابن خزيمة ( ٧٥٥ ) ، كلهم عن علي بن رباح عن عقبة بن عامر قال : (( أمرني رسول الله _ صلى الله عليه وسلم _ أن أقرأ المعوذات دبر كل صلاة )) ·

ساردكردنەوەو ڕاكێشان و دەرهێنان دەبێت بۆیە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ هەستا بە كۆكردنەوە لە نێوان ئاو بۆ ساردكەرەوەی گەزتن و پێوەدانەكەو ، خوێدا كە هێزێكی ڕاكێشان و دەرهێنانی هەیە ، ئەمەش تەواوترین و ئاسانترین شێوەكانی چارەسەرە ، ئاگاداركردنەوەی ئێمەشە كەوا چارەسەری ئەم نەخۆشیە بە ساردكردنەوەو ڕاكێشان و دەرهێنان دەبێ . والله أعلم .

قَدْ رَوَى مُسْلِمٌ فِي " صَحِيحِهِ " عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ : جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا لَقِيتُ مِنْ عَقْرَبٍ لَدَغَتْنِي الْبَارِحَةَ ، فَقَالَ :(( أَمَا لَوْ قُلْتَ حِينَ أَمْسَيْتَ أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ ، لَمْ تَضُرَّك ))[٢٤٧] .

واتە: لە ( أبي هريرة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا چ ئازارێكم پێگەشت بەهۆی دووپشكێكەوە كە ئەمشەو پێوەیدام ، ئەویش فەرمووی : (( ئەگەر سەر لە ئێوارە بتگوتایە : پەنا دەگرم بە ووشە تەواوەكانی خوای تعالى لە زیانی ئەو شتانەی دروستی كردووە ، ئەوا زیانی پێ نەدەگەیاندی )) .

بزانە كە دەرمانە سروشتیە خوایەكان بەسوودە بۆ نەخۆشیەكان پاش ڕودانی ، وە قەدەغەی ڕوودانیشی دەكات ، ئەگەر ڕووشبدات بە ڕوودانێكی زیانبەخش ڕوونادات ، ئەگەرچی بە ئازاریش بێت . لە ڕاستیدا دەرمانە سرووشتیەكان بەسوود دەبێ پاش ڕوودانی نەخۆشیەكە . بەڵام پەناگرتنەكان و زیكرەكان ، یاخود قەدەغەی ڕوودانی هۆكاری نەخۆشیەكان دەكات ، یان ناهێڵێت كاریگەریەكی تەواوی هەبێت ، ئەوەش بە گوێرەی

---

٢٤٧ _ صحيح : أخرجه مالك في موطئه ( ٥٩٠ ) ، وأحمد ( ٢ / ٣٧٥ ) ، والبخاري في خلق أفعال العباد ( ٥٨ ) ، ومسلم ( ٨ / ٧٦ ) ، وابن ماجة ( ٣٥١٨ ) ، والنسائي في عمل اليوم والليلة ( ٥٨٧ ) ، ( ٥٨٨ ) ، ( ٥٨٩ ) ، ( ٥٩١ ) ، ( ٥٩٢ ) كلهم عن أبي صالح عن أبي هريرة فذكره .

تەواوی و بەهێزی و لاوازی پەناگرتنەکەیە ، نوشتەو پەناگرتنەکان بۆ پاراستنی تەندروستی و لابردنی نەخۆشی بەکاردەهێنرێت ، بۆ یەکەم : کە پاراستنی تەندروستیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : في الصّحيحَيْنِ " مِنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إذَا أوَى إلَى فِرَاشِهِ نَفَثَ فِي كَفَّيْهِ : ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾ وَالْمُعَوِّذَتَيْنِ . ثُمّ يَمْسَحُ بِهِمَا وَجْهَهُ ، وَمَا بَلَغَتْ يَدُهُ مِنْ جَسَدِهِ[٢٤٨] واتە : خاتوو ( عائشة ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بچوایەتە سەر نوێنەکەی فووی بە هەدوو دەستیدا دەکردو : ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾و ( الْمُعَوِّذَتَيْنِ )ی تێدا دەخوێندو ، پاشان دەهێنا بە دەم و چاوی و ، ئەوەی دەستی پێگەشتایە لە جەستەی ٠

وكَمَا فِي حَدِيثِ عُوذَةِ أَبِي الدَّرْدَاءِ الْمَرْفُوعِ : اللَّهُمّ أَنْتَ رَبّي لَا إلَهَ إلّا أَنْتَ عَلَيْكَ تَوَكّلْتُ وَأَنْتَ رَبّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ، وَقَدْ تَقَدّمَ وَفِيهِ : مَنْ قَالَهَا أَوّلَ نَهَارِهِ لَمْ تُصِبْهُ مُصِيبَةٌ حَتّى يُمْسِيَ ، وَمَنْ قَالَهَا آخِرَ نَهَارِهِ لَمْ تُصِبْهُ مُصِيبَةٌ حَتّى يُصْبِحَ[٢٤٩] .

واتە : ( أبي الدرداء ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ بەم شێوە پەنای بە خوا دەگرت : پەروەردگارا تۆ پەروەردگاری منی هیچ خوایەکی تر نی یە بە هەق جگە لە تۆ ، پشتم بە تۆ بەست و تۆ پەروەردگاری عەرشی مەزنی ، ئەمەشی تێدایە : هەرکەس سەرەتای ڕۆژ بیخوێنێت هیچ بەڵایەکی تووش نابێت تاوەکو ئێوارەو ، هەرکەس لە کۆتای ڕۆژدا خوێندی هیچ بەڵایەکی تووش نابێ تاوەکو ڕۆژ دەکاتەوە ٠

---

٢٤٨ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٦ / ١١٦ ، ١٥٤ ) ، وعبد بن حميد ( ١٤٨٤ ) ، والبخاري ( ٦ / ٢٣٣ ) ، ( ٨ / ٨٧ ) ، ( ٧ / ١٧٢ ) ، وأبوداود ( ٥٠٥٦ ) ، وابن ماجة ( ٣٨٧٥ ) ، والترمذي ( ٣٤٠٢ ) ، وفي الشمائل ( ٢٥٧ ) ، والنسائي في عمل اليوم والليلة ( ٧٨٨ ) كلهم عن ابن شعاب عن عروة عن عائشة فذكرته

٢٤٩ _ إسناده ضعيف : أخرجه ابن السني في عمل اليوم والليلة ( ٢٠ ، ٢١ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الترغيب والترهيب ( ٣٨٢ ) ٠

وكَمَا فِي " الصَّحِيحَيْنِ " : (( مَنْ قَرَأَ الْآيَتَيْنِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ : كَفَتَاهُ ))(٢٥٠).

واته : له ( الصحيحين )دا هاتووه : (( هەركەس دوو ئایەتەكەی كۆتایی سورەتی ( البقرة ) له شەودا بخوێنێ : بەسیەتی )) .

وكَمَا فِي " صَحِيحِ مُسْلِمٍ " عَنْ النَّبِيِّ ﷺ (( مَنْ نَزَلَ مَنْزِلًا فَقَالَ : أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ ، لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ حَتَّى يَرْتَحِلَ مِنْ مَنْزِلِهِ ذَلِكَ ))(٢٥١).

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( هەركەس له شوێنێكدا دابەزی و پاشان گوتی : پەنا دەگرم به ووشەتەواوەكانی خوای تعالى له شەڕی هەموو شتێ كه دروستی كردووه ، هیچ شتێ زیانی پێناگەیەنێت تا لەو شوێنه كۆچ دەكات )) .

وكَمَا فِي " سُنَنِ أَبِي دَاوُدَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ فِي السَّفَرِ يَقُولُ بِاللَّيْلِ : (( يَا أَرْضُ رَبِّي وَرَبُّكِ اللَّهُ ، أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّكِ وَشَرِّ مَا فِيكِ ، وَشَرِّ مَا يَدُبُّ عَلَيْكِ ، أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ أَسَدٍ وَأَسْوَدٍ ، وَمِنْ الْحَيَّةِ وَالْعَقْرَبِ ، وَمِنْ سَاكِنِ الْبَلَدِ ، وَمِنْ وَالِدٍ وَمَا وَلَدَ ))(٢٥٢).

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەفەردا بەشەو دەیفەرموو : ئەی زەمین پەروەردگارم و پەروەردگارت خوایە ، پەنادەگرم به خوا له شەروخراپەت و شەروخراپەی ئەوەی تێتدایەو ،

---

٢٥٠ _ صحيح : أخرجه الحميدي ( ٤٥٢ ) ، وأحمد ( ٤ / ١٢١ ) ، والبخاري ( ٥ / ١٠٧ ) ، ( ٦ / ٢٤٢ ) ، ومسلم ( ٢ / ١٩٨ ) وابن ماجة ( ١٣٦٨ ) ، والنسائي في عمل اليوم والليلة ( ٧٢٠ ) ، وفي فضائل القرآن ( ٢٩ ) ، ( ٤٥ ) ، وابن خزيمة ( ١١٤١ ) ، كلهم عن طريق إبراهيم عن عبدالرحمن بن يزيد عن علقمة عن أبي مسعود فذكره .

٢٥١ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٦ / ٣٧٧ ) ، والبخاري في خلق أفعال العباد ( ٥٧ ، ٥٨ ) ، ومسلم ( ٨ / ٧٦ ) ، والترمذي ( ٣٤٣٧ ) ، والنسائي في عمل اليوم والليلة ( ٥٦٠ ) كلهم عن سعد بن أبي وقاص قال : سمعت خولة بنت حكيم فذكرته مرفوعاً

٢٥٢ _ إسناده ضعيف : أخرجه أبوداود ( ٣٨٨٧ ) ، وأحمد ( ٢ / ١٢٣ ) وضعفه الألباني في ضعيف أبي داود ( ٥٦٠ ) .

له شەروخراپەی ئەوەی بەسەردا دەچێت ، پەنادەگرم بەخوا لە شێرو ڕەش ، لە مارو دووپشك و ، له نیشتەنی وەڵات و ، له باوەك و ئەوەی لێی کەوتۆتەوە ٠

بەڵام دووەم : کە لابردنی نەخۆشیە ، وەکو هەموو ئەو نوشتانەیە کە بە سورەتی ( الفاتحة ) دەکرێت ، یاخود وەکو نووشتەی پێوەدانی دووپشك ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوشتەکردندا بۆ برینەکانی پێستی ناسراو بە ( النملة ) :

قَدْ تَقَدَّمَ مِنْ حَدِيثِ أَنَسٍ الَّذِي فِي " صَحِيحِ مُسْلِمٍ أَنَّهُ ﷺ رَخَّصَ فِي الرُّقْيَةِ مِنَ الْحُمَةِ وَالْعَيْنِ وَالنَّمْلَةِ[٢٥٣] .

واتە : ( أنس ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوە نوشتە بکرێت بۆ بەچاوەوەبوون و ، پێوەدانی جانەوەرە ژەهردارەکان و ، ئەو برین و زامانەی لە لاکانی مرۆڤدا دروست دەبن ٠

وَفِي " سُنَنِ أَبِي دَاوُدَ عَنْ الشِّفَاءِ بِنْتِ عَبْدِ اللهِ ، قالت : دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَنَا عِنْدَ حَفْصَةَ ، فَقَالَ : (( أَلَا تُعَلِّمِينَ هَذِهِ رُقْيَةَ النَّمْلَةِ كَمَا عَلَّمْتِيهَا الْكِتَابَةَ ))[٢٥٤] ٠

واتە : لە ( الشِّفاء )ی کچی ( عبدالله )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : من لە خزمەتی ( حَفصَة )دا بووم کە پێغەمبەری خوا ﷺ دیدەنی کردم و فەرمووی : (( ئەوەبۆ ئەمە فێری نوشتەی برینی پێست ناکەی وەکو ئەوەی فێری نووسینت کرد )) ٠

---

٢٥٣ _ تقدم تخريجه ٠

٢٥٤ _ إسناده صحيح : أخرجه أبوداود ( ٣٨٨٧ ) ، وأحمد ( ٦ / ٣٧٢ ) ، وصححه الألباني في الصحيحة ( ١٧٨٠ ) ٠

( النَّملة ) : برينێكه له پێستی لاكانی مرۆڤدا دروست دەبێت ، نەخۆشیەكی ناسراوەو ، ناونراوە بە ( النَّملة ) ، چونكە كەسی تووش بوو واهەست دەكات كە میرولەیەك بەسەر پێستیدا ڕێ دەكات و گازی لێدەگرێت ، سێ جۆری هەیە ، ( ابن قتیبة )و كەسانی تریش دەڵێن : مەجوسەكان وایان ڕادەگەیاند كە ئەگەر كوڕی پیاو لە خوشكیەوە خەت بە دەوری میرولەدا بكێشێت ، كەسی تووش بوو چاك دەبێتەوە · ئالێرەشەوە شاعیر گوفتاری شیعرەكەی وەرگرتووە

وَلَا عَيْبَ فِينَـــا غَيْـــرَ عُــرْفٍ لِمَعْشَـــرٍ كِــرَامٍ وَأَنَّا لَا نَخُـــطُّ عَلَى النَّمْلِ

واتە :

هیچ عەیبێكمان نی یە جگە لەوەی وچەی كۆمەڵێكی

وجاخ زادەین و ئێمە مەجوس نین تا خەت بە دەوری مێرولەدا بكێشین

( الخلّال ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت : ( الشّفاء )ی كچی ( عبدالله ) لە تاقی نەفامیدا نووشتەی دەخوێند بۆ برینی پێستی لاكانی مرۆڤ ، كاتێ كۆچی كرد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێشتریش لە مەككە گفتی پێ دابوو ، پێی فەرموو : ئەی پێغەمبەری خوا من لە تاقی نەفامیدا نووشتەم دەكرد بۆ برینەكانی پێست و ، دەمەوێ بیخەمەڕووت ، ئەوەبوو بۆی خوێندەوەو فەرمووی : بِسْمِ اللّهِ ضَلّتْ حَتّى تَعُودَ مِنْ أَفْوَاهِهَا ، وَلَا تَضُرّ أَحَدًا ، اللّهُمّ اكْشِفْ الْبَأْسَ رَبّ النّاسِ ، قَالَ : تَرْقِي بِهَا عَلَى عُودٍ سَبْعَ مَرّاتٍ ، وَتَقْصِدُ مَكَانًا نَظِيفًا ، وَتَدْلُكُهُ عَلَى حَجَرٍ بِخَلّ خَمْرٍ حَاذِقٍ ، وَتَطْلِيهِ عَلَى النّمْلَةِ واتە : بەناوی خوا بوەستێت تا لە دەمەكانی دەگەڕێتەوە ، پەروەردگارا نەخۆشیەكە لابەرە ئەی پەروەردگاری خەڵك ، دەڵێ : حەوت جار نوشتەكەی بەسەر دارێكدا دەخوێندو ، لە جێگەیەكی خاوێندا دایدەناو ، پاشان لە گەڵ سركەی شەرابێكی پاكدا دەیهێنایە سەر بەردێكدا تا وورد دەبوو ، پاشان برینەكەی تێدەگرت · لە فەرموودەكشەوە ڕوون دەبێتەوە كە : شیاوە ژن فێری نوسین بكرێت ·

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نووشتەكردندا بۆ مار :

پیشتر ئامازەی پێدرا كەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : لەوە چاكتر نابێ نوشتە بكرێت بۆ بەچاوەوەبوون و ، پێوەدانی جانەوەرە ژەهردارەكان و ، ئەو برین و زامانەی لە لاكانی مرۆڤدا دروست دەبن ·

وَفِي " سُنَنِ ابْنِ مَاجَهْ " مِنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ : رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الرُّقْيَةِ مِنْ الْحَيَّةِ وَالْعَقْرَبِ(٢٥٥) ·

واتە لە خاتوو ( عائشة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوە نووشتە بۆ گەزتن و پێوەدانی مارو دووپشك بكرێت ·

هەروەها لە پێشەوا ( الزهري )وە دەگێڕنەوە ، فەرموویەتی : مارێك كەسانێكی لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺگەزت ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئایا كەسێك هەیە نووشتە بكات ؟ فەرموویان : ئەی پێغەمبەری خوا ( آل حزم ) نووشتەی ماریان دەكرد ، بەڵام كە قەدەغەی نووشتەت كرد وازیان لێهێنا ، فەرمووی ( عُمارة )ی كوڕی ( حزم )م بۆ بانگ بكەن ئەوەبوو بانگیان كردو ، ئەویش نووشتەكانی خستەڕووی پێغەمبەری خوا ﷺو ، بۆیە فەرمووی : هیچی تێدا نی یەو مۆڵەتی داو نووشتەی بۆ كردن ·

---

٢٥٥ _ أخرجه ابن ماجة في سننه ( ٣٥١٧ ) عن طريق أبي الأحوص عن مغيرة عن ابراهيم عن الأسود فذكره عن عائشة ·

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نووشتكردندا بۆ زام و برینەكان :

أَخْرَجَا فِي " الصَّحِيحَيْنِ " عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ : كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إذَا اشْتَكَى الْإِنْسَانُ أَوْ كَانَتْ بِهِ قَرْحَةٌ أَوْ جُرْحٌ ، قَالَ بِأُصْبُعِهِ : هَكَذَا وَوَضَعَ سُفْيَانُ سَبَّابَتَهُ بِالْأَرْضِ ، ثُمّ رَفَعَهَا وَقَالَ : (( بِسْمِ اللَّهِ تُرْبَةُ أَرْضِنَا بِرِيقَةِ بَعْضِنَا ، يُشْفَى سَقِيمُنَا بِإِذْنِ رَبِّنَا ))[٢٥٦].

واتە : لە خاتوو ( عائشة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر مرۆڤێك ئازاری بوایە یاخود زامێك یا برینێكی پێوەبوایە ، بە پەنجەی ئاماژەی دەكرد : ( سُفيان ) پەنجەی شایتومانی خستەسەر زەویەكەو ، پاشان بەرزی كردەوەو فەرمووی : بەناوی خوا خاكی زەویەكەمان لە گەڵ لیكی خۆمان ، ببێت بە شیفای نەخۆشەكەمان بە فەرمانی خوا ٠

ئەمە لە چارەسەرە ئاسانە بەسودە ئاوێتەكانە ، بریتیە لە چارەسەرێكی نەرم و نیان كە زام و برینە شێدارەكانی پێ چارەسەر دەكرێت ، بەتایبەت لە كاتی نەبوونی دەرمانی دیكەدا ، چونكە لە هەموو زەویەكدا فەراهامە ، بەڕاستی زانراوە كە سروشتی خاكی پوخت ساردو ووشكەو ، ووشكەرەوەی شێی برین و زامەكانیشە ، ئەو برین و زامانەی كە ناهێڵێت سروشت بە باشی كاری خۆی بكات و ، بەخێرایی ساڕێژ بنەوە ، بەتایبەت لە وەڵاتە

٢٥٦ _ صحيح : أخرجه الحميدي ( ٢٥٢ ) ، وأحمد ( ٦ / ٩٣ ) ، والبخاري ( ٧ / ١٧٢ ) ، ومسلم ( ٧ / ١٧ ) ، وأبوداود ( ٣٨٩٥ ) ، وابن ماجة ( ٣٥٢١ ) ، والنسائي في عمل اليوم والليلة ( ١٠٢٣ ) كلهم عن عمرة عن عائشة فذكرته ٠ مانای فەرموودەكەش ئەوەیە كە : هەندێ لە لیكی خۆی بە پەنجەی شایتومان هەڵدەگرێت و ، پاشان دەیخاتە سەر خاكەكە تا شتێكی پێوە دەلكێت و ، جێكە بریندارەكەی پێ دەسڕێت و هاوكاتی سڕینەكەش ئەم زیكرە دەخوێنێت ٠

گەرمەکان و ، خاوەن میزاجە گەرمەکاندا . برین و زامەکانیش بەزۆری میزاجێکی خراپی گەرم بۆ مرۆڤ دروست دەکات ، لەم بارەدا گەرمی وەڵات و میزاج و برین و زام کۆدەبنەوەو ، سروشتی خاکی پوختیش ساردو ووشکەو لە هەموو دەرمانە تاکە ساردەکانی تریش ساردترە ، بۆیە ساردی خاکەکە ڕوو بە ڕووی گەرمی نەخۆشیەکە دەبێتەوە ، بەتایبەت ئەگەر خاکەکە شۆردرابێت و ووشك کرابێتەوە ، هەروەها برین و زامەکان زۆریك لە کێماو شێی پیس دروست دەکات و ، خاکیش ووشکیان دەکاتەوەو ، بەهۆی ئەو خاسیەتە ووشکردنەوە کە تیایدایە ئەو شێ و کێماوە پیسانە لادەبات ، کە ڕێگیری لە چاکبوونەوەی برینەکە دەکات و ، بەوەش میزاجی ئەندامە نەخۆشەکە ڕاست دەبێتەوەو ، هەرکات میزاجی ئەندامە نەخۆشەکە ڕاست بویەوە ، هێزە چارەسازەکانیشی ڕاست دەبێتەوەو ، بە فەرمانی خوای تعالی نەخۆشیەکە لادەبات .

مانای فەرموودەکەش ئەوەیە : کەوا کەسی نووشتەکار بە پەنجەی شایتومانی لیکی خۆی هەڵدەگرێت و ، پاشان دەیخاتە سەر زەویەکەو ، هەندێ خاکی پێوە دەلکێت و ، برینەکەی پێ دەسرێت و ، هاوکاتی سرینەکەش ئەو زیکرە دوخوێنێت ، چونکە فروبەرەکەتی زیکری خوای پەروەردگاری تێدایە ، هەروەها پێسپاردنی باروحاڵی خۆیە بە خوای تعالی ، پشت بەستنیشە بەو زاتە ، بۆیە هەردوو چارەسەرەکە دەچنە پاڵ یەکترو ، کاریگەریەکەیان بەهێزتر دەبێ .

ئایا مەبەست بە فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ ( تُرْبَةُ أَرْضِنَا ) واتە : خاکی زەویەکەمان ، تایبەتە بە خاکی مەدینەی پیرۆزەوە یا هەموو خاکێك دەگرێتەوە ؟ دوو بیروبۆچونی تێدایە ، بێ گومان هەندێ خاك چەند خاسیەتێکی تێدایە بەو خاسیەتەیەوە بەسوود دەبێت بۆ نەخۆشیگەلێکی زۆرو ، چەندین نەخۆشی پیسیشی پێ چارەسەر دەکرێت .

( جالينوس ) دەڵێت : لە ئیسکەندەریە چاوم بە کەسانێکی زۆری جگەر نەخۆش و ، نەخۆشانی ئاویەنگ کەوت ، قوڕی میسر بەکاردێنن ، لاق و ، ڕان و ، باڵ و ، پشت و ، پەراسووەکانی خۆیانیان تێدەگرت و ، سودێکی زۆریان لێدەبینی · دەڵێت : بەم جۆرە لەوانەیە ئەم تێهەڵسوینە بەسوود بێت بۆ زۆرێك لە ئاوسانە بۆگەن و نەرم و شلەکان ، دەڵێت : من کاسانێك دەناسم هەموو جەستەیان شل و خاو بۆتەوە ، لەبەر دەرهاوێشتنی خوێنێکی زۆر لە ژێرەوە ، سودێکی زۆریان لەم قوڕە بینیوە ، کەسانێکی تریش نەخۆشیگەلێکی درێژخایەنیان پێ چارەسەرکرد کە بە توندی جێگیربوبو لە هەندێ ئەندامەکانیاندا ، ئەوەبوو چاکبونەوەو نەخۆشیەکەیان بە یەکجاری لاچوو ·

دانەری کتێبی ( المسیحيّ ) دەڵێت : هێزی قوڕی هێنراو لە ( کنوس )ەوە کە بەدورگەی ( المصطکي ) ناودەبرێت هێزێکە کە لادەبات و دەشواتەوە ، گوشتی برینەکان دوبارە دەڕوێنتەوەو ، سارێژیان دەکاتەوە · گوتەکانی تەواوبوو ·

بۆیە ئەگەر ئەم سوودانە لەو خاکانەدا هەبێت ، دەبێ پاکترین خاکی سەر زەمین و فڕوبەرەکەترینیان چۆن بێ کە مەدینەی پیرۆزە ، بە تایبەت کە تێکەڵیش بوو بە لیکی پێغەمبەری خوا ﷺ· پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ نووشتەکەی لە گەڵ ناوی پەروەردگاریدا جووت کردو ، ئەم کارەشی بە خوای تعالی سپارد ، وەکو پێشتریش ئاماژەی پێدرا کە بەهێزی و کاریگەریی نووشتە بەگوێرەی باری ئەو کەسەیە کە نووشتەکە دەکات ، هەروەها ئاستی کارتێکراوبونی کەسی نووشتە بۆ کراوە بە نووشتەکەی ، ئەمەش هیچ پزیشکێکی موسڵمانی بەڕێز نکۆڵیی لێناکات ، ئەگەر یەکێك لەم وەسفانە لەناوچون ، با هەرچی ئارەزوو دەکات بیڵێت ·

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەرکردنی ئازاردا بە نووشتەکردن :

رَوَى مُسْلِمٌ فِي " صَحِيحِهِ " عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي العَاصِ ، أَنَّهُ شَكَى إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَجَعًا يَجِدُهُ فِي جَسَدِهِ مُنْذُ أَسْلَمَ ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ (( ضَعْ يَدَكَ عَلَى الَّذِي تَأَلَّمَ مِنْ جَسَدِكَ وَقُلْ : بِسْمِ اللَّهِ ثَلَاثًا ، وَقُلْ سَبْعَ مَرَّاتٍ أَعُوذُ بِعِزَّةِ اللَّهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ وَأُحَاذِرُ ))(٢٥٧) ٠

واتە : ( عثمان )ی کوڕی ( أبي العاص ) ، سکاڵای ئازارێکی بردە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوا لە جەستەیدا هەستی پێدەکات لەوکاتەوەی موسڵمان بووە ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( دەستت دابنێ لە سەر ئەو شوێنەی ئازاری هەیە لە جەستەت و بڵێ : بەناوی خوا سێ جارو ، حەوت جاریش بڵێ : پەنادەگرم بە شکۆمەندی و توانای خوای تعالى لە شەڕو خراپەی ئەو ئازارەی هەستی پێدەکەم و خۆمی لێ پەنادەدەم )).

لەم چارەسەردا ئاستێکی بەرزی وەکو زیکری خواو ، سپاردنی باروحاڵ بە خوای پەروەردگارو ، پەناگرتن بە شکۆمەندی و توانای خوای تعالى لە شەڕو خراپەی ئازاری تێدایە کە ئازارەکە دورخاتەوە ، دوبارەش دەکرێتەوە بۆ ئەوەی کاریگەرترو چاکتر بێت ، بەهاوشێوەی دوبارەکردنەوەی دەرمان بۆ کردنەوە دەرەوەی مادە خراپەکە ، لە حەوتیشدا خاسیەتێك هەیە کە لە هیدیکەدا نی یە ٠

٢٥٧ _ صحيح : أخرجه مالك في موطئه ( ٥٨٥ ) ، وأحمد ( ٤ / ٢١ ) ، وعبد بن حميد ( ٣٨٢ ) ، ومسلم ( ٧ / ٢٠ ) ، وأبوداود ( ٣٨٩١ ) ، وابن ماجة ( ٣٥٢٢ ) ، والترمذي ( ٢٠٨٠ ) ، والنسائي في عمل اليوم والليلة ( ٩٩٩ ) ، ( ١٠٠١ ) ، كلهم من طريق نافع بن جبير عن عثمان بن أبي العاص فذكره ٠

وَفي الصّحِيحَيْنِ " : أنّ النّبِيّ ﷺ كَانَ يُعَوّذُ بَعْضَ أهْلِهِ ، يَمْسَحُ بِيَدِهِ الْيُمْنَى ، وَيَقُولُ : (( اللّهُمّ رَبّ النّاسِ أذْهِبْ الْبَاسَ ، وَاشْفِ أنْتَ الشّافِي ، لَا شِفَاءَ إلّا شِفَاؤُك ، شِفَاءً لَا يُغَادِرُ سَقَمًا ))[٢٥٨] .

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ نووشتەی بۆ کەسانێك لە کەس و کاری خۆی دەکردو ، دەستی ڕاستی دەهێنا بە شوێنی ئازارەکەداو ، دەیفەرموو : (( ئەی پەروەردگاری ئادەمیزاد ئەم ئازارە لابەرە ، شیفابدە تۆ شیفابەخشی ، شیفا نیە جگە لە شیفای تۆ ، شیفایەك نەخۆشی جیّ نەهێڵێت )) .

لەم نووشتەیدا لە خوای تعالی پاڕاونەتەوە بە شێوەی تەواوی بێ کەموکوڕی پەروەردگاریتی و ، شێوەی تەواوی بەزەی و ڕەحمەتی بە شیفادان و ، بەڕاستی تەنها هەر خۆی شیفابەخشەو ، بەڕاستی هیچ شیفایەك نی یە جگە لە شیفای ئەو زاتە ، بۆیە نووشتەکە پاڕانەوەیەك لە خۆدەگرێت بە تەواوی یەکتاپەرستی و چاکەو پەروەردگاریتی خوا باڵادەست.

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەرکردنی خەماربوون بۆ گەرمی بەڵاو کارەسات :

قال تعالى : وَبَشّرِ الصَّابِرِينَ (١٥٥) الّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ (١٥٦) أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ (١٥٧) ﴾ البقرة : ١٥٥ ـ ١٥٧ ] واته : ﴿ وَبَشّرِ ﴾ جا موژدە بدە ﴿ الصَّابِرِينَ﴾ بەخۆڕاگران ﴿ الّذِينَ ﴾ ئەوانەی ﴿ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ ﴾ کە لە گەڵ دووچاری سەختیەك بوون ﴿ قَالُوا ﴾ دەڵێن ﴿ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا

٢٥٨ ـ صحيح : أخرجه أحمد ( ٦ / ٤٤ ، ٤٥ ، ١٠٩ ، ١١٤ ، ١٢٦ ، ١٢٧ ، ١٣١ ، ٢٧٨ ) ، والبخاري ( ٧ / ١٥٧ ، ١٧١ ، ١٧٣ ) ، ومسلم ( ٧ / ١٥ ، ١٦ ) ، وابن ماجة ( ١٦١٩ ) ، ( ٣٥٢٠ ) ، والنسائي في عمل اليوم والليلة ( ١٠١٠ ) ، ( ١٠١١ ) ( ١٠١٣ ) ، ( ١٠١٤ ) ، ( ١٠١٦ ) ، ( ١٠٩٦ ) كلهم عن مسرق عن عائشة فذكرته .

﴿ إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴾ ئێمه هەر هی خواین و هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە ﴿ أُولَـٰئِكَ ﴾ ئا ئەوانە ﴿ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ﴾ درودو بەزەیی بەسەر ئەواندا دەبارێ لە لایەن پەروەردگاریانەوە ﴿ وَأُولَـٰئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ ﴾ وئەوانە ئەو کەسانەن کە هیدایەتیان وەرگرتووە[٣٥٩].

وَفِي " الْمُسْنَد " عَنْهُ ﷺ أَنَّهُ قَالَ : (( مَا مِنْ أَحَدٍ تُصِيبُهُ مُصِيبَةٌ فَيَقُولُ : إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ، اللَّهُمَّ أْجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي وَاخْلُفْ لِي خَيْرًا مِنْهَا ، إِلَّا أَجَارَهُ اللَّهُ فِي مُصِيبَتِهِ ، وَأَخْلَفَ لَهُ خَيْرًا مِنْهَا ))[٣٦٠].

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( هەرکەسێك تووشی کارەساتیك بێت و بڵێت : ( ئێمه هەر هی خواین و هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێننەوە ) ، خوایه پاداشتم بدەرەوە لەسەر ئەو کارەساتەی تووشم بووەو چاکتر لەوەی لێت سەندووم پێم ببخەشه ، بەدڵنیایی خوای تعالى پاداشتی دەداتەوەو چاکتری پێ دەبەخشێت )) .

ئەم گوفتارانه چاکترین جۆرەکانی چارەسەرەو ، بەسوودترین شتێکیشه بۆی لە دونیاو ڕۆژی دوایدا ، چونکه دوو بنەڕەتی گەورە لەخۆدەگرێت ، ئەگەر بەنده لە زانینیان دڵنیابوو ، ئەوا دڵخۆش دەبێت و بیری لای کارەساتەکی نامێنێت :

یەکەمیان : بەندەو خێزان و سەروەت و سامانی موڵکی خوای پەروەردگاره به حەقیقەت ، به ئەمانەت لای داناوه ، بۆیه ئەگەر لێی سەندەوە ، وەکو ئەوە وایه قەرزدەرێك ماڵەکەی لە قەرزار وەرگرێتەوه ، هەروەها ئابلۆقەدراوه بە دوو نەبوون : نەبونێکی پێش و ، نەبونێکی

---

٢٥٩ ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان .

٣٦٠ ـ صحيح : أخرجه أحمد ( ٤ / ٢٧ ) ، وابن ماجة ( ١٥٩٨ ) ، والترمذي ( ٣٥١١ ) ، والنسائي في عمل اليوم والليلة ( ١٠٧٠ ) ، ( ١٠٧٢ ) كلهم عن أم سلمة عن أبي سلمة فذكره . وأخرجه أحمد ( ٦ / ٣٠٩ ) ، ومسلم ( ٣ / ٣٧ ، ٣٨ ) عن ابن سفينة عن أم سلمة فذكرته ، وليس فيه أبوسلمة .

پاش ، سەروەت و سامانی بەندەش خۆشیەکی کاتی هەیە بۆ ماوەیەکی کەم ، هەروەها بەندە خودی خۆی ئەو ماڵ و سامانەی لە نەبونەوە بەدینەهێناوە ، بۆ ئەوەی ببێت بە مولکی خۆی بە حەقیقەت ، هەروەها خودی خۆشی توانای پاراستنی ماڵەکەی نی یە لەو باڵایانەی تووشی دەبێ پاش بوونی ، مانەوەی ماڵ و سامانەکەش لەسەر ئەم نەوەستاوەتەوە ، بۆیە بەندە هیچ کاریگەریەکی بەسەر ئەو سامانەوە نی یەو ، بەحەقیقەتیش مولکی ئەو نی یە ، هەروەها تەصرڕوفی پێوە دەکات وەکو تەصرڕوفی بەندەیەکی فەرمان پێکراو و قەدەغەکراو ، نەك وەکو تەصرڕوفی ئەوەی خۆی خاوەنی بێت ، بۆیە شیاو نی یە تەصرڕوفی تێدا بکات مەگەر گونجاوی فەرمانی خاوەنە حەقیقەکەی بێت ٠

دووەم : دەرەنجامی بەندەو گەڕانەوەی تەنها بۆ لای پەروەردگارە حەقەکەیەتی و ، دەبێ دونیاش بەجێبێڵێت و ، بەتاکی وەکو ئەوەی یەکەمجار خوڵقاندی بەبێ کەسوکارو خێزان و خێڵ و سەروەت و سامان بگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگاری ، بەڵکو تەنها چاکەو خراپەکەی دەبات ، بۆیە ئەگەر ئەمە سەرەتای بەندەو کۆتایەکەی بێت ، ئیتر چۆن دڵخۆش بێت بە بوون ، یا خەمبار بێت بۆ نەبوون ، بۆیە بیرکردنەوەی بەندە لە سەرەتای بوون و دەرەنجام و کۆتایی خودی خۆی لە گەورەترین چارەسەریەکانی ئەم نەخۆشیەیە ، لە چارەسەریەکانی تریشی ئەوەیە کە بەبێ دڵاودڵی بزانێت ئەوەی تووشی بووە بەدڵنیایی لێی بەهەڵەدا نەدەچوو ، ئەوەش لێێ بەهەڵەدا چووە هەرگیز تووشی نەدەبوو.

قال تعالى : مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الأَرْضِ وَلا فِي أَنْفُسِكُمْ إِلا فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ على اللهِ يَسِيرٌ ٠ لِكَيْ لا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴾ الحديد : ٢٢ — ٢٣ ﴿ واتە : ﴿ مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ ﴾ هیچ زیان و بەڵایەك ڕووی نەداوە ﴿ فِي الأَرْضِ وَلا فِي أَنْفُسِكُمْ ﴾ نە لە زەوی و نە لە خودی خۆتاندا ﴿ إِلا فِي كِتَابٍ ﴾ ئیلا لە ( لوح المحفوظ )دا نوسراوە ﴿ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَ ﴾ پێش ئەوەی بەدی بهێنین ﴿ إِنَّ ذَلِكَ على اللهِ يَسِيرٌ ﴾ بێ گومان ئەوە بۆ خوا زۆر ئاسانە ﴿ لِكَيْ لا تَأْسَوْا ﴾ تا خەفەت

نەخۆن ﴿ عَلَى مَا فَاتَكُمْ ﴾ بۆ ئەوەی لە دەستان چووە ﴿ وَلَا تَفْرَحُوا ﴾ وە دڵخۆش و غەڕانەبن ﴿ بِمَا آتَاكُمْ ﴾ بەوەی کە پێی داون ﴿ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴾ وە خوا هیچ خۆبەزل زانێکی شانازی کەری خۆش ناوێ (٢٦١).

هەروەها لە چارەسەریەکانی تریشی ئەوەیە کە تێڕوانێتە ئەو شتەی تیایدا تووش بووە ، ئیتر دەزانێت پەروەردگاری هاوشێوەی ئەو شتەی لە دونیادا بۆ هێڵاوەتەوە ، یا لەو چاکتر ، ئەگەر بەئارام بێ و ڕازی بێ ئەوا خوای تعالى شتگەلێکی بۆ پاشەکەوت کردووە زۆر گەورەتر لەو شتانەی کە بەهۆی ئەو کارەساتەوە لەدەستی داوە بەچەندەها جار ، ئەگەر ویستیشی هەبێ زۆر لەوە گەورەتری دەکات .

## خۆ دڵدانەوە بە تەماشاکردنی کەسانی دیکەی تووشبوو وە باسکردنی چەند چیرۆکێك لەو بارەوە:

لە چارەسەرەکانی دیکەشی ئەوەیە کە ئاگری کارەسات لە دڵیدا بکوژێنێتەوە بە ساردی خۆ دڵدانەوە بە خەڵکانی تری تووشبوو بە کارەسات و ، بزانێت هەر خۆی بە تەنها تووشی کارەسات نەبووە ، با بزانێت هەموو شێوێك ( بنوسعد )ی تێدایە ، با تەماشای لای ڕاستی بکات ، ئایا لە دەردەسەری زیاتر دەبینێت ؟ ئینجا با بەر بەلای چەپیدا بکاتەوە ، ئایا لە پەژارە زیاتر دەبینێت ؟ ، بەڕاستی ئەگەر هەموو دونیا بگەڕێت جگە لە گرفتار نابینێت ، کە یا خۆشەویستێکی لە دەست داوە ، یاخود خراپەیەکی نەویستراوی تووش بووە ، بەڕاستی شەڕوخراپەکانی دونیا وەکو خەونێکە یا سێبەرێکی لاچووە ، ئەگەر کەمێك پێکەنێنێت ، زۆر دەگرێنێت ، ئەگەر ڕۆژێك دڵ شادومان بکات ، ساڵێك دڵ خەمبارو پەژارەدار دەکات ، ئەگەر کەمێك خۆشی بەخش بێ ، ماوەیەکی درێژیش ڕێگری لێدەکات ، ئەگەر ماڵێکیش پڕ خێر

---

٢٦١ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان .

كات پاشان پڕ لـه فەرمێسکی دەکات ، ئەگـەر ڕۆژێ بەشتێك شـادومانی بکـات ، بـەدڵنیایی ڕۆژێکی شەڕوخراپەشی بۆ شاردۆتەوە ٠

( ابن مسعود ) _ خـوای لـێ ڕازی بێـت _ فەموویـەتی : هـەر دڵخۆشـبوونێك پەژارەیـەکی هەیەو ، هەر ماڵێکیش پڕ کرابێت لە دڵخۆشبوون پاشان پڕکراوە لە پەژارە ٠

ابن سیرین فەرموویەتی: هەر پێکەنینێك کرابێت ، دڵنیابن بەدوایدا گریان هەبووە ٠

( هند )ی کچی ( النعمان )[٢٦٢] دەڵێت : ئێمە شکۆمەنترینی خەڵکان بووین و لە هەمووشـی زیاتر موڵکمان هەبوو ، پاشان هێشتا ڕۆژ ئاوا نـەبوبو ئێمـە بـوین بـە کـەمترینی خـەڵك ، مـاڤ خـوای پـەروەردگارە کـە خێـری فراوانـی بـە هـەر ماڵێـك بەخشـی ، پاشـان بـەدڵنیایی لـە فرمێسکیش پڕی دەکات ٠

پیاوێك داوای لە ( هند ) کرد باسێکی باروحاڵی خۆی بۆ بکـات : ئـەویش گـووتی : ڕۆژمـان کردەوەو ، هیچ کەسێك نـەما لـە عـەرەب بـەهیوای بەخشـین نـەبوبێ لـە ئێمـە ، کـە شـەومان بەسەردا هات هیچ کەسێك نەما لە عەرەب بزەیی بە ئێمەدا نەیەتەوە ٠

---

٢٦٢ _ ( هند )ی کچی ( النُعمان )ی کوری ( المنذر )ە ، کە لە لایەن کیسرای پادشای فارسەوە بابی بە پادشای ( الحیرة ) دانرابوو ، کچێکی وجاخزادەی ، زمان پاراو بوو ، لە ماڵی پادشایەتیدا گەورە بوبو ، کیسرای پادشای فارس لە ( النعمان )ی بابی تووڕەبوو ، لە پادشایەتی ( الحیرة ) دەرهێناو لای خۆی خستیە زیندانەوە تاوەکو مرد ، پاش مردنی بابی ڕەبەنگەری هەڵبژاردو لە کەنیسەیەکی نێوان ( الحیرة ) و ( الکوفة )دا مایەوە ، ( خالد )ی کوری ( ولید ) پاش ڕزگارکردنی ( الحیرة ) دیدەنی کردو ، بانگی کرد بۆ ئیسلام ، بەڵام بەهۆی گەورەبوونی تەمەنیەوە داوای لێبوردنی کرد ، بەڵام ( خالد ) ڕێزی لێ گرت و فەرمانیدا یارمەتی و پۆشاکیشی بدەنێ ، پاش تەمەنێکی درێژو کوێربوونی چاوەکانی هەر لەو کەنیسەدا مرد ٠ بڕوانە : الشیخ محمد هادي الیوسفي الغروي ، موسوعة التاریخ الإسلامي ٠ وەرگێڕ ٠

ڕۆژێك ( حُرقَةُ ) كچی ( النُعمان ) كە خوشكی ( هند )ە گریا ، كە لە كاتی پادشایەتی و شكۆمەندایاندا بوون ، پێی گوترا : چ دەتگرێنێت ، نەوەكا كەسێك ئازاری دابێتی ؟ گوتی : نەخێر ، بەڵام خۆشگوزارانیەكی فراوان لە كەسوكارمدا دەبینم ، كە ماڵێك لە خۆشی پڕ دەبێ ، دڵنیابن پاشان لە خەمباریش پڕ دەبێ ٠

( إسحاق )ی كوڕی ( طلحة ) دەڵێت : ڕۆژێك چوومە دیدەنی ( هند )و ، پێم گووت ، خێروخۆشی پادشایانت چۆن بینی ؟ ئەویش گووتی : ئەوەی ئێمە ئەمڕۆ تیایداین زۆر چاكترە لەوەی كە دوێنێ تیایدا بووین ، ئێمە لە كتێبدا بینیومانە كەوا كەسوكاری هەر ماڵێك ئەگەر لە خێرێكی بەرفراواندا بژین ، بەدڵنیایی بەدوایدا فرمێسك دەڕێژن ، زەمنیش ئەگەر ڕۆژێكی بەدەرخستبێ بۆ كۆمەڵێك حەزیان پێ بێت ، بەدڵنیایی ڕۆژێكی تریشی بۆ هەڵگرتوون حەزیان پێ نەبێت ٠ پاشان گوتی :

فَبَيْنَا نَسُوسُ النّاسَ وَالْأمْرُ أمْرُنَا
إذَا نَحْنُ فِيهِمْ سُوقَةٌ نَتَنَصّفُ
فَأُفّ لِدُنْيَا لَا يَدُومُ نَعِيمُهَا
تَقَلّبُ تَارَاتٍ بِنَا وتَصَرّفُ

واتە :

لە كاتێكدا ڕابەرایەتی خەڵكمان دەكردوو فەرمان فەرمانی ئێمە بوو
لە پڕدا بۆین بە خەڵكێكی ئاسایی خزمەتكار
ئاخ بۆ دونیایەك خۆشیەكانی بەردەوام نابێت
كە چەندەها جار وەرچەرخان و ئەم دیو ئەو دیومان پێ دەكات

هەروەها لە چارەسەریەكانی دیكەی خەمابربوون بۆ ئەو كارەساتانەی تووشمان دەبێت ئەویە : مرۆڤ دەبێ بزانێت بێ ئارامی و شپرزەبوون نایگەڕێنێتەوە ، بەڵكو بێ

ئـارامی و شـپرزەبونەکەی زیـاد دەکـات ، کـە لـە حەقیقەتـدا لـە ئـەنجامی زیـادبوونی نەخۆشیەکەوە ڕوودەدات.

لە چارەسەریەکانی تریشی : پێویستە ئەوە بزانێت کە پاداشتەکانی ئارامگرتن و ڕازیبـوون بە چارەنووسی خوای تعالى ، بریتیە لە بەخشینی تاوان و بـەزەی و ڕەحمـەت و هیدایەتـدان ، کە خوای تعالى بۆ ئەو کەسانەی داناوە ، کە ئارام دەگرن و ( إنا لله وإنا إليه راجعـون ) دەڵێن ، بۆیە ئەگەر ئەو پاداشتانە لە دەست بدات و لـە کیسـی بچێت ، ئـەوا لـە حەقیقەتـدا زۆر لـە خودی کارەساتەکە گەورەترە ٠

لـە چارەســەریەکانی دیکەشــی : پێویســتە بزانێــت بــێ ئـارامی جێگـەی شـادومانبوونی دوژمنەکانیەتی بەو بەڵاو گرفتاریەی تووشی بـووە ، مایـەی بێـزاری هاوڕێیانیـەتی ، خواکـەی تووڕە دەکات ، شەیتانەکەی دڵخۆش دەکات ، مایەی بەفیڕچونی پادەشتەکانیەتی ، نەفسـی لاواز دەکـات ، ئەگـەر ئـارامگربوو بـەو بـارەو قایـل بـوو تیربـارانی شـەیتانەکەی دەکـات و ، بەنائومێدی دەیگەڕێنێتەوە ، پەروەردگاری لە خۆی ڕازی دەکات ، هاوڕێیانی دڵخۆش دەکـات ، دوژمنـانی بێـزار دەکـات ، پـەژارەی دڵـی براکـانی هەڵدەگرێت و دڵنـەوایان دەکـات ، پـێش ئەوەی ئەوان دڵنەوایی بکەن ، ئائەمە بەغیرەتیی و شێوەی تەواوی بێ کـەم و کـوڕی مرۆڤـە ، نەك لێدانی ڕوومەت و ، دڕاندنی پۆشاك و ، نزاکردن بە واوەیلاو ماڵ وێران بـوون و ، بیزابـوون لە چارەنووسراو ٠

لە چارەسەریەکانی دیکەشی : پێویستە بزانێت ئەو بەلەزەتی و خۆشیەی پـاش ئـارامگرتن و قایل بوون دەستی دەکەوێت ، چەندەهاو چەندەها جار گەورەترە لەوەی دەسـتی دەکـەوت ئەگەر ئەو شتەی بۆ بمایەتەوە کە تیایـدا تووشـی کارەسـات بـووە ، تـەنها ئـەو ( بیـت الحمـد )ەشی بەسە کە لە بەهەشتدا بۆی دروست دەکرێت ، لە پاداشتی سـوپاس و سـتایش کردنـی پەروەردگاری و گوتنی ( إنا لله وإنا إليه راجعـون )دا ، بـا تیڕوانێـت : کـام لـەم دوو کارەسـاتە

گەورەترە ؟ ئەو كارەساتەی تووشی بووە ، یاخود كارەساتی لە دەستدانی ( بیت الحمد ) لە بەهەشتی نەبڕاوەدا ؟

وفی الترمذی مرفوعاً : ( يَوَدُّ ناسٌ يَوْمَ القيامة أنَّ جُلُودَهُم كانت تُقْرَضُ بالمقارِيض في الدُّنيا لما يَرَوْنَ من ثوابِ أهلِ البلاءِ )(٢٦٣) ٠

واتە : پێشەوا ( الترمذي ) دەگێڕێتەوە كەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( لە ڕۆژی قیامەتدا كەسانێك خۆزگە دەخوازن كەوا لە دونیادا پێستیان بە مەقەست ببڕدرایە بەهۆی ئەو پاداشتەوە كە دەیبینن بۆ تووشبووانی كارەساتەكان دانراوە )) ٠

كەسانێك لە پێشین گوتویانە : ئەگەر كارەساتەكانی دونیا نەبوایە بە مایەپوچی بۆ قیامە دەگەڕاینەوە ٠

لە چارەسەریەكانی دیكەشی : دڵی كەسی كارەستبار خۆش بكرێت ، بە ئومێدی ئەوەی كە خوای تعالی لە جێی ئەوەی پێ دەداتەوەو بۆی دبژێرێتەوە ، چونكە هەموو شتێك جێگرەوەی هەیە مەگەر خوای پەروەردگار ، كە جێگرەوەی نی یەو هاوشێوە نی یە ، وەكو ئەوەی گوتراوە

مِـــنْ كُلِّ شَـــيْءٍ إذَا ضَيَّعْتَهُ عِوَضٌ
وَمَـــــا مِـــــنَ اللهِ إنْ ضَيَّعْتَهُ عِـــوَضُ

واتە :

هەموو شتێك ئەگەر لە دەستت چوو جێگرەوەی دەبێ
بەڵام ئەگەر خوات لە دەست چوو جێگرەوەی نابێ

٢٦٣ ــ حسن : أخرجه الترمذي ( ٢٤٠٢ ) عن أبي الزبير عن جابر فذكره مرفوعاً ٠ وحسنه الألباني في صحيح الجامع ( ٨ / ٧٧ ) ، وانظر المشكاة ( ١٥٧٠ ) ، والترغيب ( ٤ / ١٤٦ ) ٠

له چارەسەرییەکانی دیکەشی : پێویستە مرۆڤ بزانێت بەشی لە کارەساتەکە بە گوێرەی ئەوەیە کە خۆی بۆ خۆی دروست دەکات ، بۆیە هەرکەس ڕازیی بوو ، خوای تعالاش لێی ڕازی دەبێ و ، هەرکەسیش بێزار بێ و ڕق دەربڕێت ، ئەوا ڕقی بۆ خۆی دەستەبەر کردووە ، لێرەوە ئاشکەرا دەبێ کە بەشی مرۆڤ لە کارەساتەکە بە گوێرەی ڕەفتاری خۆیەتی ، کەوابوو چاکترین یاخود خراپترین بەش بە ویستی خۆت هەڵبژێرە ، بۆیە ئەگەر ڕق و کوفری بۆ کارەساتەکە دەربڕی ، ئەوا لە دیوانی تیاچواندا دەنوسرێت ، وە ئەگەر شێوەن و نوزەنوزو کەمتەرخەمی دەربڕی بە وازلێهێنانی ( واجب )ێك ، یا کردەوەیەکی حەرام ، ئەوا لە دیوان کەمتەرخەمبواندا دەنوسرێت ، وە ئەگەر گلەیی و گازندەو بێ ئارامی دەربڕی ، ئەوا لە دیوانی تێشکاو فریوخواردواندا دەنوسرێت ، وە ئەگەر ڕەخنەی لە خوای تعالی گرت و ، هەستا بە پلار تێگرتنی دانایی و حیکمەتەکەی ، ئەوا لە دەرگای زەندیقیەتی داوە ( واتە کەسێکی بێ ئاینەو خۆی بە ئایندار دەنوێنێ ) یا چۆتە نێوی ، بەڵام ئەگەر ئارامگرتن و خۆگری بۆ خوای تعالی دەربڕی ، ئەوا لە دیوانی بە ئارامبواندا دەنوسرێت ، وە ئەگەر بەخوا ڕازی ، ئەوا لە دیوانی ڕازیبواندا دەنوسرێت ، وەئەگەر سپاس و ستایشی دەربڕی ، ئەوا لە دیوانی سوپاستگوزاراندا دەنوسرێت و ، لە ژێر ئاڵای ستایشکاراندا دەبێت ، وە ئەگەر خۆشەویستی و ئارەزووی دیدارکردنی پەروەردگاری دەربڕی ، ئەوا لە دیوانی خۆشەویستکارە دڵسۆزەکاندا دەنوسرێت ٠

وفي مسند أحمد والترمذي ، من حديث محمود بن لبيد يرفعه : أن رسول الله ﷺ قال: (( إنَّ اللهَ إذا أحبَ قوماً ابتلاهُم ، فمَن رَضِيَ فلهُ الرِّضى ، ومَن سَخِطَ فلهُ السُّخطُ )) زاد أحمد : (( ومن جزع فلهُ الجزع ))[٢٦٤] ٠

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ئەگەر خوای تعالی کۆمەڵێکی خۆشویست تاقیان دەکاتە ، هەرکەس ڕازی بوو ئەوا ڕازیبوونی خوای بۆ خۆی دەستەبەر کردووەو ، هەرکەسیش

٢٦٤ ــ إسناده حسن : أخرجه الترمذي ( ٢٣٩٨ ) ، وأحمد ( ٥ / ٤٢٧ ) ، وانظر الصحيحة ( ١٤٦ ) ٠

ڕقی لێبێتەوە ئەوا ڕق لێبونەوەی خوای بۆ خۆی دەستەبەر کردووە )) پێشەوا ( أحمد )یش ئەم زیادەیەی خستۆتە سەر (( وە هەر کەسیش بێ تاقەتی و بێ ئۆقرەیی دەربڕێت ئەوا بێ تاقەتی و بێ ئۆقرەیی بۆ خۆی دەستەبەر کردووە )) ٠

لە چارەسەریەکانی دیکەشی : ئەگەر لە شیوەن و نوزەنوزدا مرۆڤ بگاتە ئەوپەڕی ، لە کۆتادا هەر دەبێ قایل بێ بە ئارامگرتنێکی ناچاری ، بەڵام ئەم بارە نەستایشکراوەو نە پاداشتیشی دەبێت ، کەسانێك لە دانایان دەڵێن : کەسانی ژیر لە یەکەم ڕۆژی کارەساتەکەدا ئەوە ئەنجام دەدات کە نەفام پاش چەند ڕۆژێك ئەنجامی دەدات ، وە هەرکەس ئارامی نەگرت وەکو ئارامگرتنی کەسانی جوامێر ، ئەوا ناچار دەبی وەکو ئاژەڵ ئارام بگریت ٠

وفي الصحيح مرفوعاً : (( الصَّبرُ عند الصَّدْمَةِ الأُولى ))[٢٦٥] واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( ئارامگرتن لە سەرەتای کارەساتەکەوەییە )) ٠

( الأشعث )ی کوڕی ( قیس ) دەڵێت :

لە چارەسەریەکانی دیکەشی : پێویستە بزانێت کە چاکترین دەرمان بۆ ئەو ، ڕازیبوونە ، بەوەی پەروەردگاری پێی ڕازیەو حەزی پێیەتی کە بەندەکەی لەم بارەدا ئەنجامی بدات ، چونکە یەکێك لە خاسیەتەکانی خۆشەویست سازیاربوونە لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا ، بۆیە هەرکەس بانگەشەی خۆشویستنی یەکێك بکات و ، پاشان ڕقی بێتەوە لەوەی خۆشەویستەکەی حەزی پێیەتی ، وە حەزی بەوەبێ کە خۆشەویستەکەی ڕقی لێیەتی ، ئەوا شایەتی لە سەر نەفسی خۆی دەدات کە درۆی کردووەو ، لە دڵی خۆشەویستەکەشیدا ڕق و کینە بەرامبەر بە خودی خۆی دروست دەکات ٠

( أبو الدرداء ) فەرموویەتی : خوای پەروەردگار ئەگەر فەرمانیدا بە حوکمێك ، حەزی بەوەیە پێی ڕازی بن٠

---

٢٦٥ ــ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ٣ / ١٣٨ ) ، ومسلم ( ٩٢٦ ) ٠

( عِمران )ى كوڕى ( حصين ) له نەخۆشيەكەيدا دەيفەرموو : خۆشەويترين شت بەلامەوە ئەوەيە كە خۆشەويسترين شتە بەلاى ئەوەوە ، هەروەها ( أبوالعالية )ش هەمان شتى دەفەرموو ٠

ئەمەش دەرمان و چارەسەريەكە كار ناكات مەگەر لەگەڵ خۆشەويستاندا ، بۆيە هەموو كەسێك لە توانايدا نيە وەكو چارەسەر بە كارى بێنێت ٠

لە چارەسەريەكانى ديكەشى : با تەماشاكات بزانێت كاميان كێشدارترو قورسترو بەردەوامترە ، لەزەت و خۆشى وەرگرتن لە ئەو كارەساتەى تووشى بووە ، يا لەزەت و خۆشى پاداشتى خواى تعالى ، ئەگەر ڕاى پەسەندى بۆ دەركەوت ، باسوپاسى خواى تعالى بكات كە سەرى خستووە ، بەڵام ئەگەر ڕاى پەسەندنەكراوى بەلاوە باشتربوو ، با بزانێت ئەو كارەساتەى لە ئەقڵ و دڵ و ئاينەكەيدايە زۆر گەورەترە لەو كارەستە دونيايەى كە تووشى بووە٠

لە چارەسەريەكانى ديكەشى : پێويستە بزانێت ئەوەى تووشى ئەو كارەساتەى كردووە دادوەرترينى هەموو دادوەرانەو ، ميهرەبانترينى هەموو ميهرەبانانە ، وە خواى تعالاش تووشى ئەو كارەساتەى نەكردووە بۆ ئەوەى بيفەوتێنێت ، ياخود بەو كارەساتە سزاى بدات ، ياخود هێرشى بەرێتەسەر ، بەڵكو لە ڕاستيدا دەيەوێ بەو كارەساتە پلەى ئارامگرتن و ڕازيبون و باوەڕى تاقيكاتەوەو ، گوێبيستى پاڕانەوەو لاڵانەوەى بێت و ، ببينێ خۆى فڕێداوەتە بەر دەرگاكەى و ، هاناى بۆ جەنابى بردووە بە دڵشكاوى لە پێش دەستيدا ، چيرۆكى سكاڵاكانى بۆ بەرز كردۆتەوە ٠

( شيخ عبدالقادر ) فەرموويەتى : كوڕم كارەسات نەهاتووە بۆ فەوتانت ، بەڵكوهاتووە بۆ تاقيكردنەوەى پلەى ئارامگرتن و باوەڕت ، كوڕم قەدەرو چارەنووس جانەوەرێكى دڕندەيەو ( سَبُعٌ ) ، جانەوەرى دڕندەش مردارەوەبوو ناخوات ٠

مەبەستیش ئەوەیە کە کارەسات ( کیر )ی[٢٦٦] واتە موشەدەمەی بەندەیە کە بەهۆیەوە ئاگری کورەکە خۆش دەکات بۆ توانەوەی کانزاکە ، بۆیە دەرەنجام یا زێڕێکی سوری دەست دەکەوێت ، یا هەمووی خراپ دەبێت و هیچ دەستکەوت نابیٚ ، شاعیریش دەڵێت :

سَبَكْنَـــاهُ ونَحْسَـبُهُ لُجَيناً    فــأبْدَى الكِيرُ عَـنْ خَبَثِ الحَـديدِ

واتە :

تواندمانەوە وامــانزانی زێڕە    بەڵام موشەدەمەکە پیسی ئاسنی بەدەرخست

ئەگەر ئەم موشەدەمەو دەستکەوتەکەی سودی بۆ نەبێت ، با بزانێت گەورەترین موشەدەمەی ڕۆژی دوای لە پێش دەستدایە ، بۆیە ئەگەر بۆی دەرکەوت کە بەکارهێنانی موشەدەمەی دونیاو دەستکەوتەکەی بۆی چاکترە بەبەراوردی ئەو موشەدەمەو دەستکەوتەکەی · ناچاریشە یەکێك لە موشەدەکان هەڵبژێرێت ، با ڕێزو قەدری ئەو نیعمەتە بزانێت کە خوای تعالی پێی بەخشیوەو مۆڵەتی داوە کە موشەدەمەی دونیا بەکاربێنێت ·

لە چارەسەریەکانی دیکەشی : پێویستە بزانێت کە ئەگەر بەڵاو کارەساتی دونیا نەبوایە ، بەندە تووشی چەندەها نەخۆشی فیزو لوت بەرزی و شانازی و دڵڕقی و خۆبەگەورەزانین و زۆرداریەکی ئەوتۆ دەبوو ، کە دەبووە هۆکاری تیاچوونی ئێستاو دوایی ، بۆیە خوای پەروەردگار بە ڕەحمەت و بەزیی خۆی جار بە جار تووشی چەندەها جۆری دەرمانە کارەساتەکانی دەکات و، دەرەنجامیش دەبێتە پارێزیی لەو نەخۆشیانەی سەرەوەو ، تەندروستی و چاکێتی بەندایەتی دەپارێزێت و ، مادده خراپە بۆگەنە فەوتێنرەکانی بۆ دەکاتە دەرەوە · پاك و بێگەردی بۆ ئەو پەروەردگارەی کە بەڵاو کارەساتەکانی بەکاردێنێت

٢٦٦ _ کیر : واتە موشەدەمە کە ئامێرێکە لە پێست دروست دەکریٚ و ئاسنگەر بەکاری دێنی بۆ گەشانەوەو خۆشکردنی ئاگری کورەکەی ، وەرگێڕ ·

بۆ بەزەی پێدا هاتنەوەی بەندەكانی و ، كەسانێكیش بە نیعمەتەكانی خۆی تاقی دەكاتـەوە ، وەكو شاعیر دەڵێت :

قَدْ يُنْعِمُ اللهُ بِالبَلوَى وإنْ عَظُمَتْ
وَيبْتَلِي اللهُ بَعْضَ القَومِ بالنِّعَمِ

واتە :

پێدەچێ خوا بە كارەساتەكانی خۆی ئەگەرچی گەورەش بێت نیعمەت بڕشێنێت بە سەر بەندەكەیدا
بەنیعمەت بەخشینیشی بۆ هەندێ لە بەندەكانی تاقیان بكاتەوە

ئەگـەر خـوای پـەروەردگار بەنـدەكانی خـۆی بـە دەرمانـەكانی بەڵاوكارەسـات چارەسـەر نەكردایـە ، سـەركەش دەبـوون و سـنوریان دەبەزانـد ، سـتەمیان دەكـرد ، لـە خۆیـان بـایی دەبوون ، خوای پەروەردگاریش ئەگەر ویستی چاكەی بـە بەندەكـەی هـەبێت ، دەرمانـەكانی بەڵاو كارەسات و تاقیكردنەوەی دەداتێ بە گوێرەی باروحاڵی ، تـا نەخۆشـیە فەوتێنـەرەكانی بۆ دوردخاتەوە ، تاوەكو ئەگەر بژاردكاری و خـاوێنكردن و پاكردنـەوەی بـۆ بەندەكـەی كـرد ، شایستەی دەكات بە بەڕێزترین پلەكانی دونیا ، كە بەندایـەتی بـۆ كردنیـەتی و ، شایستەشـی دەكات بۆ بەرزترین پاداشتەكانی ڕۆژی دوای ، كە بریتیـە لـە بیـنین و نزیكبونـەوە لـە خـوای پەروەردگار ·

لە چارەسەریەكانی دیكەشی : پێویسـتە بزانێـت كـە تاڵیـەكانی دونیـا شـیرینیەكانی ڕۆژی دوایە ، خوای تعالی ئا بەو شێوە دەیگۆڕێت ، شـیرینیەكانی دونیـاش تاڵیـەكانی ڕۆژی دوایـە ، بەندەش ئەگەر بەرگـەی تاڵیـە كۆتـای هاتووەكـانی دونیـا بگرێـت ، لـە پێنـاو بەدەسـتهێنانی شـیرینیە بەردەوامـەكانی ڕۆژی دوایـدا ، خێرێكـی چـاكتری دەسـتگیر دەبـێ ، بـە بـەراوردی ئەوەی ئەگەر بە پێچەوانەوە كاربكات · ئەگەر ئەمەشت نـەزانی ، ئـەوا تەماشـای فەرمایشـتی

پێغەمبەری خوا بکە کە دەفەرمێت : (( حُفَّتِ الجَنَّةُ بالمَكَارِهِ ، وحُفَّتِ النَّارُ بالشَّهَواتِ ))(٢٦٧) واتــە : (( بەهەشـت بــە ناخوشــی و ناڕەحەتیــەکان دەور دراوەو ، دۆزەخـیش بــە هــەواو ئارەزووەکان دەور دراوە )) ·

لەم جێگەیەدا ئەقڵ و ژیری خـەڵك جیاواز بـوون و ، حەقیقـەتی پیـاوانیش بەدەرکـەوتن ، زۆربـەیان پەسـەندێتی شـیرینی بڕاوەیـان دابەسـەر شـیرینی بەردەوامـدا کـە لـەناو ناچـێت ، بەرگەی تاڵیی سـاتێك ناگرێت لـە پێنـاو شـیرینی هـەتا هەتایدا ، بەرگـەی کەساسـی سـاتێك ناگرێت لە پێنـاو سـەربەرزیەکی هـەتا هەتایدا ، بەرگـەی مەینـەتی سـاتێك ناگرێت لـە پێنـاو خۆشـی هـەتا هەتایـدا ، چـونکە بەلایـەوە شـتی ئامـادە شـایەت و گەواهیـدەری خۆشـی و ناخۆشیەو ، شـتی چـاوەڕوانکراویش نادیـارە ، بـاوەڕیش لاوازەو ، سـوڵتانی هـەواو ئـارەزوو فەرمانڕەوایەو ، هەموو ئەمانە هۆکاری پاڵنەری مرۆڤن بۆ پەسەندێتی هەنووکەو ، قبوڵنـەبونی ڕۆژی دوایـی ، ئەمـە بـاری تێڕوانینـە بـۆ باروحـاڵی دیـاری خـەڵك و ، سـەرەتاکانیان ، بـەڵام تێڕوانینـی بـەجێ کـە پـەردەکانی پەسـەندێتی هەنووکـە تێپـەڕێنێت ، بـۆ ئـەو دەرەنجـام و مەبەستانەی کە هەندێکی تـر بـیری لێدەکەنـەوەو هـەوڵی بـۆ دەدەن بـۆ بەدەسـتهێنانی ڕۆژی دوای ، ئەمە شتیکی ترە ·

بۆیە بانگی نەفسی خۆت بکە بۆ ئەو خۆشیە نەبڕاوەو نیعمەت و سەرکەوتنە گەورەیەی کە خـوای پـەروەردگار دایـناوە بـۆ ئـەو وەلی و بەنـدە خۆشەویسـتانەی کـە گـوێڕاڵی دەکـەن ، هەروەها تەماشای ئەو شەرمەزاری و سزاو ئەفسوسە بەردەوامانە بکە کە دایناوە بۆ کەسـانی

---

٢٦٧ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ٢٥٤ ) ، ( ٢٨٤ ) ، وعبد بن حميد ( ١٣١١ ) ، ومسلم ( ٨ / ١٤٢ ) ، والترمذي ( ٢٥٥٩ ) عن حماد بن سلمة عن ثابت وحميد عن أنس فذكره مرفوعاً ، وأخرجه أحمد ( ٣ / ١٥٣ ) ، والدارمي ( ٢٨٤٦ ) مثله ليس فيه حميد · وأخرجه أحمد ( ٢ / ٣٨٠ ) عن أبي هريرة مثله ، وأخرجه أحمد ( ٢ / ٢٦٠ ) ، والبخاري ( ٢ / ١٨٧ ) ، ومسلم ( ٨ / ١٤٣ ) عن أبي الزناد عن الأعرج عن أبي هريرة مرفوعاً : (( حجبت النار بالشهوات وحجبت الجنة بالمكاره )) ·

مايەپوچ و هەل لە كيس خۆدەر ، پاشان هەر بەشێكيان كە بۆ خۆتی بەشايستە دەزانی هەڵبژێرە ، هەموو كەسێكيش لە سەر سروشت و ڕێبازی خۆی كاردەكات ، هەموو كەسێكيش بەپرۆشە بۆ ئەوەی گونجاويەتی و ، شايستەيە بۆی ، ئەم چارەسەرە بەدرێژ دامەنێ ، چونكە زۆر پێويسبوونی بۆ پزيشك و نەخۆش وای لێكردين بەدرێژی باسی بكەين ٠ وبالله التوفيق ٠

## بەشيك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەركردنی ناڕەحەتی و خەم و خەفەت و دڵتەنگی و ناخۆشيدا :

أَخْرَجَا فِي " الصَّحِيحَيْنِ " مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، أَنّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ، كَانَ يَقُولُ عِنْدَ الْكَرْبِ : (( لَا إِلَهَ إِلّا اللّهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ ، لَا إِلَهَ إِلّا اللّهُ رَبّ الْعَرْشِ الْعَظِيمُ ، لَا إِلَهَ إِلّا اللّهُ رَبّ السّمَاوَاتِ السّبْعِ ، وَرَبّ الْأَرْضِ رَبّ الْعَرْشِ الْكَرِيمُ ))[٢٦٨] .

واتە : لە ( ابن عباس )ەوە _ خوا لە خۆی وبابيشی ڕازی بێت _ فەرموويەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ لە كاتی ناڕەحەتيدا دەيفەرموو : (( هيچ پەرستراوێك نی يە بەهەق جگە لە خوای مەزنی ميهرەبان ، هيچ پەرستراوێك نی يە بەهەق جگە لە پەروەردگاری عەرشی گەورە ، هيچ پەرستراوێك نی يە بەهەق جگە لە پەروەردگاری حەوت ئاسمانەكەو ، پەروەردگاری زەمين و پەروەردگاری عەرشی بەڕێز )) ٠

وَفِي " جَامِعِ التّرْمِذِيّ " عَنْ أَنَسٍ ، أَنّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ كَانَ إِذَا حَزَبَهُ أَمْرٌ ، قَالَ : (( يَا حَيّ يَا قَيّومُ بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغِيثُ ))[٢٦٩] .

---

٢٦٨ _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ١١ / ١٢٢ ) ، ومسلم ( ٢٧٣٠ ) ٠

٢٦٩ _ إسناده صحيح : أخرجه الترمذي ( ٣٥٢٢ ) ، وصححه الألباني رحمه الله ٠

واته له ( أنس )ەوه _ خوای لیّ ڕازی بیّت _ فەرموويەتی : پيّغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ڕووداویّکی کاریگەری تووش بوایه دەیفەرموو: (( ئەی خوای زیندوو ئەی خوای هەڵسوڕیّنەری بونەوەر هاناو هاوار بۆ بەزەی و ڕەحمەتی تۆ دەبەم )) ·

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ : أَنّ النّبِيّ ﷺ كَانَ إِذَا أَهَمّهُ الْأَمْرُ ، رَفَعَ طَرْفَهُ إِلَى السَمَاءِ فَقَالَ : (( سُبْحَانَ اللّهِ الْعَظِيمِ )) ، وَإِذَا اجْتَهَدَ فِي الدّعَاءِ قَالَ : (( يَا حَيّ يَا قَيّومُ ))[٢٧٠] ·

واته : له ( أبي هريرة )ەوه _ خوای لیّ ڕازی بیّت _ فەرموويەتی : پيّغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر شتیّك خەمباری بکردایه ، چاوەکانی بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوەو دەیفەرموو : (( پاك و بیّگەردی بۆ خوای گەورە )) ، ئەگەر به پەرۆشیشەوه نزای بکردایه دەیفەرموو : (( ئەی خوای زیندوو ئەی خوای هەڵسوڕیّنەری بونەوەر )) ·

وَفِي " سُنَنِ أَبِي دَاوُدَ " عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصّدّيق ، أَنّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ قَالَ : (( دَعَوَاتُ الْمَكْرُوبِ : اللّهُمّ رَحْمَتَكَ أَرْجُو ، فَلَا تَكِلْنِي إِلَى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ ، وَأَصْلِحْ لِي شَأْنِي كُلّهُ ، لَا إِلَهَ إِلّا أَنْتَ ))[٢٧١] ·

واته : له ( أبي بكرة )ەوه _ خوای لیّ ڕازی بیّت _ فەرموويەتی : پيّغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (( نزاکانی کەسی ناڕەحەت : پەروەردگارا هیوای بەزەیت دەکەم و ، به ئەندازەی چاوتروکانیّك مەمدره دەست خۆم و ، هەموو کاروبارم چاك بکه ، هیچ پەرستراویّك نی یه بەهەق جگه له تۆ )) ·

---

٢٧٠ _ إسناده ضعيف : أخرجه الترمذي ( ٣٤٣٢ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٤٣٥٦ ) ·

٢٧١ _ إسناده صحيح : أخرجه أبوداود ( ٥٠٩٠ ) ، وصححه الألباني رحمه الله ·

وَفِيهَا أَيْضًا عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ قَالَتْ : قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَلَا أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ تَقُولِيهِنَّ عِنْدَ الْكَرْبِ أَوْ فِي الْكَرْبِ : (( اللَّهُ رَبِّي لَا أُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا ))[٢٧٢] وَفِي رِوَايَةٍ أَنَّهَا تُقَالُ سَبْعَ مَرَّاتٍ ٠

واته : ( أسماء )ى كچى ( عُمَيس ) _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم ئەوەبۆ چەند ووشەیەکت فێرنەکەم لە کاتی ناڕەحەتیدا یا لە ناڕەحەتیدا بیلێی : (( خوا پەروەردگارمەو هیچ شتێك ناکەم بە هاوەڵی )) ، لە ( ریوایە )تێکی دیکەدا هاتووە کە حەوت جار دەگوترێت ٠

وفي مُسْنَدِ الْإِمَامِ أَحْمَدَ " عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ ، عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ : (( مَا أَصَابَ عَبْدًا هَمٌّ وَلَا حُزْنٌ فَقَالَ : اللَّهُمَّ إِنِّي عَبْدُكَ ، ابْنُ عَبْدِكَ ، ابْنُ أَمَتِكَ ، نَاصِيَتِي بِيَدِكَ ، مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ ، عَدْلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ ، أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ ، أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ ، أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ ، أَوْ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ ، أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ الْعَظِيمَ رَبِيعَ قَلْبِي ، وَنُورَ صَدْرِي ، وَجِلَاءَ حُزْنِي ، وَذَهَابَ هَمِّي ، إِلَّا أَذْهَبَ اللَّهُ حُزْنَهُ وَهَمَّهُ وَأَبْدَلَهُ مَكَانَهُ فَرَحًا ))[٢٧٣] ٠

واته : له ( ابن مسعود )ەوە _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( هەرکات بەندەی خوا تووشی هەر خەم و خەفتێك بوو و بڵێت : پەروەردگارا من بەندەی تۆم ، کوڕی بەندەیەکی تۆم ، کوڕی کەنیزەکێکی تۆم ، ناوچاوان و کاروبارم بەدەستی تۆیە ، حوکمت بەسەرمدا بەردەوامەو ، بڕیارت بە سەرمدا جێبەجێ و بەدادە ، داوات لىٚ دەکەم بەهەموو ناوێك کە هەتەو خۆتت پىٚ ناوناوە ، یا لە کتێبەکەتدا ناردوتەتە خوارەوە ، یا فێری یەکێك لە دروستکراوەکانی خۆتت کردووە ، یا لە عیلمی غەیبی خۆتدا

٢٧٢ _ إسناده حسن : أخرجه أبوداود ( ١٥٢٥ ) ، وابن ماجة ( ٣٨٨٢ ) ، وصححه الألباني في صحيح الجامع ( ٢٦٢٣ ) ٠

٢٧٣ _ إسناده صحيح : أخرجه أحمد ( ١ / ٣٩٤ ) ، وصححه الألباني في الصحيحة ( ١١٩ ) ٠

هەڵت گرتووەو خۆت دەیزانی ٠ کە قورئان بکەیتە بەهاری دڵم و نورو ڕوناکی سنگم و ڕەوێنەرەوەی دڵ تەنگیم و ، لابەری خەم و خەفەتم ، ئەوا خوای تعالی خەم و خەفەتی لادەبات و ، جێگەکەی دەگۆڕێت بە خۆشی و شادومانی )) ٠

وَفِي التِّرمِذِيِّ عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ (( دَعْوَةُ ذِي النُّونِ إِذْ دَعَا رَبَّهُ وَهُوَ فِي بَطْنِ الْحُوتِ : لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْت مِنْ الظَّالِمِينَ ، لَمْ يَدْعُ بِهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ فِي شَيْءٍ قَطّ إِلَّا اُسْتُجِيبَ لَهُ ))[٢٧٤]
وَفِي رِوَايَةٍ (( إِنِّي لَأَعْلَمُ كَلِمَةً لَا يَقُولُهَا مَكْرُوبٌ إِلَّا فَرَّجَ اللَّهُ عَنْهُ : كَلِمَةَ أَخِي يُونُسَ )).

واتــە : لــە ( سـعد )ی کـوڕی ( وقـاص )ەوە _ خـوای لـێ ڕازی بێـت _ فەرموویـەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (( نزاکەی ( ذي النون ) پێغەمبەر کە لە سکی نەهەنگەکەدا بـوو پێی لە خوای تعالی پاڕایەوە : ﴿ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْـت مِـنْ الظَّـالِمِينَ ﴾ [ الأنبيـاء : ٨٧ ] واتە ﴿ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ ﴾ ( ئەی خوا ) بەڕاستی هیچ پەرسـتراوێك نـی یـە جگـە لـە تـۆ ﴿ سُـبْحَانَكَ ﴾ پـاك و بێگـەردی بـۆ تۆیـە ﴿ إنـي كُنْـت ﴾ بێگومـان مـن ﴿ مِـنْ الظَّـالِمِينَ ﴾ لـە ستەمکاران بووم[٢٧٥] هیچ پیاوێکی موسڵمان نی یە بۆ هەر شتێك بەم نزایە لە خـوا بپاڕێتـەوە مەگەر خوای تعالی وەڵامی داوەتەوە )) ٠

لە ( ریوایە )تێکی دیکەشدا : (( من گوفتارێـك دەزانم هـیچ خـەفتبارێك نـی یـەو بیڵێـت مەگەر خوای تعالی خـەم و خەفتەکـەی دەڕوێنێتـەوەو لایـدەبات : گوفارەکـەی ( یـونس ) پێغەمبەری برام )) ٠

٢٧٤ _ إسناده صحيح : أخرجه الترمذي ( ٣٥٠٠ ) ، وصححه الألباني رحمه الله ٠

٢٧٥ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

وَفِي " سُنَنِ أَبِي دَاوُدَ " عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِي ، قَالَ : دَخَلَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ الْمَسْجِدَ ، فَإِذَا هُوَ بِرَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ : أَبُو أُمَامَةَ ، فَقَالَ : يَا أَبَا أُمَامَةَ مَالِي أَرَاكَ فِي الْمَسْجِدِ فِي غَيْرِ وَقْتِ الصَّلَاةِ ؟ " فَقَالَ : هُمُومٌ لَزِمَتْنِي ، وَدُيُونٌ يَا رَسُولَ اللّهِ ، فَقَالَ : (( أَلَا أُعَلِّمُكَ كَلَامًا إِذَا أَنْتَ قُلْتَهُ أَذْهَبَ اللّهُ عَزّ وَجَلّ هَمّكَ وَقَضَى دَيْنَكَ ؟ )) " قَالَ : قُلْتُ : بَلَى يَا رَسُولَ اللّهِ قَالَ : (( قُلْ إِذَا أَصْبَحْتَ وَإِذَا أَمْسَيْتَ : اللّهُمّ إِنّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمّ وَالْحَزَنِ ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ وَالْبُخْلِ ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ غَلَبَةِ الدّيْنِ وَقَهْرِ الرّجَالِ )) ، قَالَ : فَفَعَلْتُ ذَلِكَ ، فَأَذْهَبَ اللّهُ عَزّ وَجَلّ هَمّي ، وَقَضَى عَنّي دَيْنِي (٢٧٦) .

واته : له ( أبي سعيد الخُدري )وه _ خواى لىٰ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : ڕۆژێك پێغەمبەرى خوا ﷺ چووه مزگەوتەوه ، له پڕدا چاوى به پياوێك له پشتيوانان كەوت به ( أبوأُمامة ) ناسرابوو ، فەرمووى : ئەى ( أبوأُمامة ) بۆ بەدەر له كاتى نوێژ له مزگەوتدا دەتبينم ؟ ئەويش فەرمووى : خەمگەلێك دايگرتووم و ، قەرزاريگەلێكيش ئەى پێغەمبەرى خوا ، فەرمووى : (( بۆ گوفتارێكت فێر نەكەم ئەگەر بيلێيى خواى تعالى خەم و خەفتت دەڕوێنێتەوەو ، قەزاريەكانيشت بۆ دەداتەوە ؟ )) ( أبوأُمامة ) فەرمووى : گوتم : بەڵێ ئەى پێغەمبەرى خوا ، ئەويش فەرمووى : ئەگەر بەيانى و ئێوارەت كردەوه بڵێ : (( پەروەردگارا ، پەنات پێ دەگرم له دڵتەنگى و خەم و خەفەت ، پەنات پێ دەگرم له بێدەسەڵاتى و تەمبەڵى ، پەنات پێ دەگرم له دەست قوچاوى و ترسنۆكى ، پەنات پێ دەگرم له زاڵبونى قەرزو دۆڕانى پياوانى موسڵمان )) ، ( أبوأمامة ) فەرمووى : ئەوەم جێبەجێ كرد ، ئەوەبوو خواى تعالى خەم وخەفتى ڕواندمەوەو ، قەرزەكەشى بۆ دامەوه .

٢٧٦ _ إسناده ضعيف : أخرجه أبوداود ( ١٥٥٥ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٢١٦٩ ) .

وَفِي " سُنَنِ أَبِي دَاوُدَ ، عَنْ ابْنِ عَبّاسٍ ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ (( مَنْ لَزِمَ الاسْتِغْفَارَ ، جَعَلَ اللّهُ لَهُ مِنْ كُلّ هَمّ فَرَجًا ، وَمِنْ كُلّ ضِيقٍ مَخْرَجًا ، وَرَزَقَهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ))(٢٧٧) .

واته : له ( ابن عباس )ەوه _ خواى لىٚ رِازى بيٚت _ فەرموويەتى : پيٚغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : (( هەركەس بەردەوام بىٚ له سەر داواكردنى ليٚخۆش بوون له خواى تعالى ، له هەموو خەم و خەفتيٚك رِزگارى دەكات ، له هەموو نارِەحەتى و تەنگانەيەك رِيٚگەى كردنه دەرەوەى بۆ دادەنيٚت و ، له شويٚنيٚكيشەوه رِۆزى دەدەات كه به خەيالّيدا نەهاتبيت )) .

وَفِي " الْمُسْنَدِ : أَنّ النّبِيّ ﷺ كَانَ إذَا حَزَبَهُ أَمْرٌ ، فَزِعَ إلَى الصّلَاةِ ، وَقَدْ قَالَ تَعَالَى : ﴿ وَاسْتَعِينُوا بِالصّبْرِ وَالصّلَاةِ ﴾(٢٧٨) واته له ( المسند )دا هاتووه : كەوا پيٚغەمبەرى خوا ﷺ ئەگەر رِوداويٚك دلّتەنگى بكردايه ، هاناى دەبردەبەر نويٚژكردن ، خواى پەروەردگاريش فەرموويەتى : ﴿ وَاسْتَعِينُوا بِالصّبْرِ وَالصّلَاةِ ﴾ واته : ﴿ پەنا بەرنەبەر ئارام گرتن و نويٚژ ( بۆ گەشتن به مەبەست ) ﴾(٢٧٩).

وَفِي السّنَنِ : (( عَلَيْكُمْ بِالْجِهَادِ ، فَإِنّهُ بَابٌ مِنْ أَبْوَابِ الْجَنّةِ ، يَدْفَعُ اللّهُ بِهِ عَنْ النّفُوسِ الْهَمّ وَالْغَمّ ))(٢٨٠) واته : له ( السنن )دا هاتووه : (( تيٚكۆشن له پيٚناوى خوادا ، چونكه دەرگايەكه له دەرگاكانى بەهەشت ، خواى تعالى خەم و خەفتى سەر دلّى بەندەكانى پىٚ دەرِويٚنيٚتەوه )).

---

٢٧٧ _ إسناده ضعيف : أخرجه أبوداود ( ١٥١٨ ) ، وأحمد ( ٢٢٣٤ ) ، وضعفه الألباني في الضعيفة ( ٧٠٥ ).

٢٧٨ _ حسن : أخرجه أحمد ( ٥ / ٣٨٨ ) ، وأبوداود ( ١٣١٩ ) كلاهما عن عبدالعزيز بن أخي حذية عن حذيفة فذكره ، وحسنه الألباني في صحيح الجامع ( ٤٧٠٣ ) .

٢٧٩ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەى تەفسيرى قورئان .

٢٨٠ _ إسناده صحيح : أخرجه أحمد ( ٥ / ٣١٤ ) ، وصححه الألباني في الصحيحة ( ١٩٤١ ) .

وَيَذْكُرُ عَنْ ابْنِ عَبّاسٍ ، عَنْ النّبِيّ ﷺ (( مَنْ كَثُرَتْ هُمُومُهُ وَغُمُومُهُ ، فَلْيُكْثِرْ مِنْ قَوْلِ : لَا حَوْلَ وَلَا قُوّةَ إلّا بِاَللّهِ ))[٢٨١]

وَثَبَتَ فِي " الصّحِيحَيْنِ : أَنّهَا كَنْزٌ مِنْ كُنُوزِ الْجَنّةِ[٢٨٢] .

وفي الترمذي : أنها باب من أبواب الجنَّة[٢٨٣] .

لە ( ابن عباس )ەوە _ خوا لە خۆی و باببیشی ڕازی بێت _ فەرموویەتی : (( هەركەس خەم و خەفتی زۆربوو ، با ئەم گوفتارە زۆری بڵێت : ( هیچ هێزو پەناو توانایەك نی یە تەنها بەخوا نەبێت ) .

لە ( الصحیحین )یشدا هاتووە : بەڕاستی سامانێکە لە سامانەكانی بەهەشت .

لە ( الترمذي )دا هاتووە : دەرگایەكە لە دەرگاكانی بەهەشت .

ئەم دەرمانانە پانزە جۆری دەرمان لە خۆ دەگرێت ، ئەگەر توانایان نەبوو خەم و خەفت و دڵتەنگی مرۆڤ لابەرن ، ئەوا نەخۆشی ئەو كەسانە ڕەگی داكوتاوەو ، هۆكارەكانیشی چەسپیون ، بۆیە پێویستە دەرهاوێشتنێكی تەواویان بۆ بكرێت .

یەكەم : یەكتاپەرستی پەروەردگارێتی .

دووەم : یەكتاپەرستی ئولوهیەت .

سێ یەم : یەكتاپەرستی زانستی باوەڕی ( التوحيد العلمي الإعتقاديّ ) .

چوارەم : بەدورگرتنی خوای پەروەردگار لە ستەم كردن بەرامبەر بە بەندەكەی ، یا هەستێ بە سزادان ، بەبێ ئەوەی بەندەكەی هیچ كردەوەیەكی خراپی ئەنجام دابێت ، كە شایستە بێت بە سزادان .

---

٢٨١ _ إسناده ضعيف : ضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٥٤٩١ ) بلفظ : ( من أنعم الله عليه نعمة ) .

٢٨٢ _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٤ / ٦٩ ) ، ( ٥ / ١٦٩ ) ، ( ٨ / ١٠١ ، ١٠٨ ، ١٥٥ ) ، ( ٩ / ١٤٤ ) ، ومسلم ( ٨ / ٧٣ ، ٧٤ ) كلاهما عن أبي عثمان النهدي عن أبي موسى فذكره.

٢٨٣ _ إسناده صحيح : أخرجه الترمذي ( ٣٥٧٦ ) ، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ( ٢٨٣٤ ) .

پێنجەم : داناپێدانانی بەندە بەوەدا کە خودی خۆی ستەمکارە ٠

شەشەم : پاڕانەوە ( توسل ) لە خوای پەروەردگار بەخۆشەویسترین شتەکان ، کە ناوو سیفاتەکانێتی ، لە هەمووشیان زیاتر کە ماناکانی ناو و سیفات کۆبکاتەوە : ( الحيُّ القَيُّوم )ە ، واتە زیندووی ڕاگری بونەوەر ٠

حەوتەم : بەتەنها لە خوای تعالی داوای یارمەتیدان بکرێت ٠

هەشتەم : داناپێدانانی بەندە کەوا خوای تعالی بەتەنها جێی هیواکردن و پاڕانەوەکردنە٠

نۆیەم : بەجێهێنانی پشت پێ بەستنی و ، کارپێ سپاردنی و ، دان پێدانانی بەند کەوا نێوچاوان و کاروباری بەدەستی پەروەردگارەو ، بەویستی خۆی تەصرفیان پێوە دەکات و ، حوکمەکانی بەسەردا جێبەجێ دەکات و ، دادپەروەرانە بڕیارەکانێ بە سەردا دەدات ٠

دەیەم : لە گوڵستانی قورئانـدا دڵـی بحەوێتـەوەو ، دڵـی تیایـدا ئاسـودە بێـت ، بـە هاوشێوەی ئاسودەبوونی گیانلەبەران لە بەهاردا ، لە تاریکی گومان و دودڵیـی هـەواوئارەزوودا خۆی پێ ڕووناك بکاتەوە ، خۆئاسوودەکردن بە قورئان لە جیاتی هـەموو ئەوانـەی لـە دەست دەچێت ، خۆدڵدانەوە بە قورئان بەرامبەر بە هـەموو بـەڵاو کارەساتێك کـە تووشـی دەبێـت ، قورئان بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی سنگی بەکار بێنێت ، ئەوا دڵتەنگی دەڕەوێنێتـەوەو ، بۆ خەم و خەفەتەکانی شیفابەخش دەبێت ٠

یازدەهەم : داوای لێخۆشبوون ٠

دوازدەهەم : پەشیمان بوونەوەو تەوبەکردن ٠

سیازدەهەم : تێکۆشان لە پێناوی خوادا ٠

چواردەهەم : نوێژ ٠

پازدەهـەم : نکۆڵیکردن لـە هێـزو پـەناو توانـاو ، سـپاردنیان بـە دەسـتی ئـەو زاتـەی ئەوانەی بەدەستە٠

## بەشێك : سەبارەت بە لایەنی كاریگەری ئەم دەرمانانە لەم نەخۆشیانەدا :

خوای تعالی نەوەی ئادەم و ئەندامەكانی لەشی خولقاندووە ، بۆ هەموو ئەندامێك شێوەیەكی تەواوی بێ كەم و كوڕیی داناوە ، كە ئەگەر وونیكات هەست بە ئازار دەكات ، هەروەها بۆ دڵیش كە سەروەری ئەندامەكانە شێوەیەكی تەواوی بێ كەم و كوڕی داناوە ، ئەگەر لە دەستی بدات ، نەخۆشی و ئازارەكانی وەكو خەم و خەفەت و دڵتەنگیەكانی ئامادە دەبێت ٠

ئەگەر چاوەكان هێزی بینینیان نەمێت و ، گوێكانیش هێزی بیستنیان نەمێنێت و ، زمانیش هێزی قسەكردنی نەمێنێت كە بۆی خولقێندراوە ، شێوەی تەواوی بێ كەم وكوڕی خۆیان لە دەست دەدەن ٠

دڵیش : خولقێنراوە بۆ ناسینی بەدیهێنەری ، خۆشویستنی ، بەتەنها پەرستنی ، شادومان بوون بەخوا ، دڵخۆشبوون بە خۆشویستنی ، ڕازیبوون بەخوا ، پشت پێ بەستنی ، خۆشویستن لە پێناویدا ، ڕق لێبوونەوە لە پێناویدا ، خۆشەویستی لەبەر خواو دژایەتی لەبەر خوا ، بەردەوام زیكركردنی ، بەلایەوە لە هەموو شتێك خۆشەویستر بێت ، لە هەموو شتێك زیاتر جێگای ئومێدی بێت ، لە دڵیدا لە هەموو شتێك شكۆمەندتر بێت ، نیعمەت و شادومانی و لەزەت و ، بەڵكو بەلایەوە ژیانیش بەبێ ئەو زاتە مانایەكی نەبێت ، هەموو ئەمانە وەكو خۆراك و تەندروستی و ژیانن بۆ دڵ ، بەنەبونیان خەم و خەفەت و دڵتەنگی لە هەموو لایەكەوە ڕووی تێ دەكات و ، بەسەریەوە دەمێنێتەوە ٠

گەورەترین نەخۆشیەكانی دڵیش : هاوەڵ پەیداكردن و تاوان و بێ ئاگایی و بەسووك تەماشاكردنی ئەوەیە كە پەروەردگار خۆشی دەوێن و پێی ڕازیە ، وازهێنان لە گەڕاندنەوەو

سپاردنی کارەکانە بە خوای تعالی ، کەمی پشت بەستنە بەخوای تعالی ، متمانەکردنە بە جگە لە خوای تعالی ، بێزاربوونە لە چارەنووسی ، بەگومانبوونە لە پەیمان و هەڕەشەکانی ٠

بە تێڕوانینت لە نەخۆشیەکانی دڵ ، بۆت دەردەکەوێت ئەم شتانەو هاوشێوەکانیان هۆکاری دروستبوونی ئەو نەخۆشیانەن و هیچ هۆکارێکی تری نی یە ، تەنها دەرمانی دڵیش کە هیچ دەرمانێکی تری نی یە ، چارەسەرە پێغەمبەرایەتیەکانە کە چەندین شتی دژ بەو نەخۆشیانەی تێدایە ، چونکە نەخۆشی بە دژەکانی لادەدرێت و ، تەندروستیش بە هاوشێوەکانی دەپارێزرێت ، بۆیە تەندروستیی بەم شتە پێغەمبەرایەتیانە دەپارێزرێت و ، نەخۆشیەکانیشی بە دژەکانیان چارەسەر دەکرێت ٠

یەکتاپەرستی : دەروازەکانی خەیرو شادومانی و چێژوەرگرتن و دڵخۆشی و ئاسودەیی بۆ بەندەی خوا دەکاتەوە ، تەوبەو پەشیمانیش دەرهاوێشتنێکە بۆ ئەو تێکەڵاو و مادە خراپانەی کە هۆکارن بۆ نەخۆش کەوتنی بەندە ، هەروەها لە تێکچوونیش دەیپارێزێت و ، دەروازەی شەڕوخراپەشی لێ دادەخات ، بۆیە دەروازەکانی خەیرو خۆشی بە یەکتاپەرستی دەکرێتەوەو ، دەروازەکانی شەڕیش بە تەوبەو پەشیمانی دادەخرێت ٠

کەسانێك لە پزیشکانی پێشین گوتویانە : هەرکەس خوازیاری تەندروستی جەستەیە ، با خواردن و خواردنەوەکانی کەم بکاتەوە ، هەرکەسیش تەندروستی دڵیی دەوێ ، با واز لە تاوانەکان بێنێت ٠

( ثابت )ی کوڕی ( قُرَّة ) دەڵێت : حەوانەوەی جەستە لە کەم خواردندایە ، حەوانەوەی ڕوحیش لە کەمی تاوان کردندایە ، حەوانەوەی زمانیش لە کەم قسەکردندایە ٠

تاوانیش بۆ دڵ ، وەکو ژەهرەکانە ، کە ئەگەر نەیفەوتێنێت ئەوا بەدڵنیاییی لاوازی دەکات ، کە هێزیشی لاواز بوو ، چیتر ناتوانێت بەرامبەر بە نەخۆشیەکان بەرهەڵستی بکات ، پزیشکی دڵان ( عبدالله )ی کوڕی ( مبارك ) دەفەرمێت :

رَأيتُ الذنُوبَ تُميتُ القُلوبَ    وقدْ يُورِثُ الذُّل إدمانُهــــا
الذُّنوبِ حــــياةُ القُلوبِ    وخَيرٌ لِنَفسِكَ عَصْيانُهــــا

واتە :

تـــاوانم بینی دڵ دەمـــرێنێت    سەرشۆڕیش بەردەوامەتی پیێ دەبەخشێت
وازهێنان لە تاوان ژیانەوەی دڵە    بۆ خۆت چاکــــــترە سەرپێچی بکەیت

هەواو ئارەزوو بە گەورەترین نەخۆشیەکانی دڵ دادەنرێت و ، سەرپێچیکردنی ئەو هەواو ئارەزوانەش بە گەورەترین چارەسەرەکانی دڵ دانراوە ، لە بنەڕەتدا نەفس بە نەفامی و ستەمکاری خوڵقێنراوە ، بۆیە بەهۆی ئەو نەفامیەوە وادەزانێت ئەگەر شوێنی هەواو ئارەزووەکانی نەفسی خۆی بکەوێت ئەوە دەبێتە چارەسەر ، بەڵام لە ڕاستیدا دەیفەوتێنێت و پەکی دەخات ، وە لەبەر ئەوەی کەسێکی ستەمکاریشە هیچ شتێکی لە پزیشکی ئامۆژگاریکارەوە قبوڵ نابێ ، بەڵکو نەخۆشی دەخاتە جێگەی دەرمانەوەو پشتی پێ دەبەستێت و ، دەرمانیش دەخاتە جێگەی نەخۆشیەوەو خۆی لێ بەدوور دەگرێت ، لێرەدا کە نەخۆشی پەسەند دەکات و ، خۆی لە دەرمانەکان بەدوردەگرێت ، جۆرها دەردو نەخۆشی ڕووی تێدەکات ، بە جۆرێك پزیشکان ماندوو دەکات و ، شیفاش ئاستەم دەکات ، کارەساتی گەورەش ئەویە کە هەموو ئەوانە بە چارەنووسەوە دەبەستێتەوە ، بۆیە بەزمانی حاڵ خۆی بەبێ تاوان دادەنێت و ، بەبەردەوامی سەرزەنشتی پەروەردگاری دەکات ، سەرزەنشتەکەش بەهێز دەکات تاوەکو بە زمانی ئاشکەرای دەکات ٠

ئەگەر نەخۆش بەم بارە گەشت ، چاوەڕێی چاکبونەوەی لێناکرێت مەگەر خوای تعالی ڕەحمەت و بەزەیی خۆی بەو کەسە بگەیەنێت و ، بە ژیانێکی نوێ بیژێنێتەوەو ، ڕێگەیەکی باش و ستایشکراویشی پیشان بدات ، بۆیە فەرموودەکەی ( ابن عباس ) _ خوای لە خۆی ویابیشی ڕازی بێت _ سەبارەت بە نزای کاتی کارەسات جۆرەکانی یەکتاپەرستی پەروەردگارێتی و پەرستراوێتی لە خۆدەگرت و ، خوای تعالاش بە گەورەو میهرەبان وەسف دەکات ، ئەم دوو سیفەتەش شێوەی تەواوی بێ کەم وکوڕی ڕەحمەت و بەزەیی و بەتوانایی و ، چاکەکردن و لێبوردن بۆ خوای تعالی جێگیر دەکەن ۰

خوای تعالی بە شێوەی تەواوی بێ کەم و کوڕیی پەروەردگارێتی بۆ جیهانەکانی سەرو و خوارو وەسف دەکات ۰

باسی عەرشیش دەکات کە سەربانی هەموو بەدیهێنراوانەو لە هەمووشیان گەورەترە ۰

شێوەی تەواوی بێ کەم و کوڕی پەروەردگارێتی خوای تعالی یەکتاپەرستن پێویست دەکات و ، دەبێ هەموو جۆرەکانی پەرستن و خۆشەویستی و هیواو خواست و ڕێزو گوێڕایەڵیی بەتەنها بۆ ئەو زاتە بکرێت ۰

گەورەیی بەرەهایی خوای پەروەردگاریش واپێویست دەکات هەموو شێوەیەکی تەواوی بێ کەم و کوڕی بۆ جێگیر بکرێت و ، هەموو کەم و کوڕی و چواندنێکی لێ بەدور بگیرێت.

میهرەبانی خوای تعالاش شێوەی تەواوی بێ کەم و کوڕی ڕەحمەت و بەزەیی و چاکەکردنی بەرامبەر بە بەدیهێنراوانی خۆی بەدەردەخات ۰

کە دڵ ئەوانەی سەرەوە بزانێت ، ئەوا خۆشویستن و ڕێزگرتن و یەکتاپەرستی بۆ خوای تعالی جێبەجێ دەکات و ، بەوەش مرۆڤ دڵخۆشی و شادومانی و چێژی دەست دەکەوێت بە ئاستێك ئازاری کارەسات و خەم و خەفتی لێ دوردەخاتەوە ، تۆ تەماشا دەکەیت نەخۆش

ئەگەر ئەو هەواڵانەی پێ بگات کە دڵخۆشی بکات و ، نەفسی بەهێز بکات ، چۆن سروشتی جەستەی بەهێز دەبێ و نەخۆشیە هەستیەکانی خەم و خەفت لادەبات ، کەوابوو دڵ بە ئاسایی چاك دەبێتەوە ٠

پاشان ئەگەر بەراوردێکی نێوان تەنگانەکانی کارەسات و فراوانی ئەو وەسفانەی نێو نزاو دوعاکانی کارەسات بکەیت ، دەبینی زۆر زۆر گونجاوە بۆ ئەوەی دەرووی تەنگانەکان بکاتەوەو ، دڵیش لەو دەروازەیەوە گوزەر بکات بۆ بەهاری دڵخۆشی و شادومانی ، ئەمەش لەو کەسانەدا زیاتر بەدیدەکرێت ، کە ڕوناکی ئەو نزایانەی تێدا هەڵهاتووەو ، دڵیشی لە ئیش پێکردنی ڕاستیەکانیدا دەست بەکاربووە ٠

فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ: (( يَا حَيّ يَا قَيّومُ ، بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغِيثُ )) هۆیەکی گونجاوە بۆ دورخستنەوەی ئەم نەخۆشیە ، چونکە سیفەتی ( حَيّ ) واتە : زیندوو کە شێوەی تەواوی بێ کەم و کوڕی لە خۆدەگرێت و ، پێوەی پەیوەندە ٠

هەروەها سیفەتی ( القَيُّوم ) واتە : هەڵسوڕێنەری بوونەوەر ، ئەمە هەموو سیفاتە کرداریەکان لە خۆدەگرێت ، بۆیە گەورەترین ناوی خوا کە ئەگەر نزای پێ بکرێت قبوڵ دەکرێت و ، داوای پێ بکرێت پێت دەدەرێت بریتیە لە : (( يَا حَيّ يَا قَيّومُ ))ە ٠

سیفەتی زیندوویی تەواوی بێ کەم و کوڕی خوای تعالاش ، دژبە هەموو نەخۆشی و ئازارەکانە ، بۆیە کاتێك ژیانی خەڵکی بەهشت تەواو بوو و کەم و کوڕیی تێدا نەما چیتر تووشی خەم و خەفەت و دڵتەنگی و بەڵاکان نابن ، بەڵام سیفەتی کەم و کوڕ بوونی ژیان زیان بە کردەوەکان دەگەیەنێت و ، دژبە ( القَيومِيَّة )ە ٠

بوونی سیفەتی ( القَيومِيَّة )تی خوای تعالاش ، ڕەنگدانەوەی شێوەی تەواوی بێ کەم و کوڕی سیفەتی ژیان و زیندویەتیە ، چونکە زاتێك کە بە ڕەها زیندوو بێ و ، ژیانیشی تەواو بێ

، ئەوا هەموو سیفاتەکانی تەواویتی لە خۆدەگرێت ، ( القَيوم )یش هیچ کردەوەیەکی شیاوی بەلاوە ئاستەم نابێت ·

هاوتای ئەمەی سەرەوەش پاڕانەوەی پێغەمبەری خوایە ﷺ لە خواکەی بە پەروەردگارێتیکردنی بۆ ( جبريل ) و ( ميكائيل ) و ( إسرافيل ) بۆ ئەوەی ڕێنمووی بکات بۆ ئەو هەقەی خەڵکی تیایدا جیاوازن و ، لەسەر ئەو هەقە دامەزراوی بکات ، چونکە ژیانی دڵ بە ڕێنمووی وەرگرتنە ·

خوای تعالاش ژیانی بەم سێ فریشتەیە سپاردووە ، سروش ، کە ژیانی دڵە بە (جبريل )ی سپاردووە ·

باران ، کە ژیانی جەستەی مرۆڤ و ئاژەڵانە بە ( ميكائيل )ی سپاردووە ·

فووکردن بە بووقدا ، کە هۆی ژیانی جیهان و گەڕانەوەی ڕووحەکانە بۆ جەستەکان بە ( إسرافيل )ی سپاردووە ·

کەوابوو پاڕانەوە بە پەروەردگارێتی خوای تعالی بۆ ڕوحی ئەو فریشتە گەورانەی کە ژیانیان پێ سپێردراوە ، کاریگەریەکی ئیجابی دەبێ بۆ ئەوەی داواکاریەکان بەدەستبهێنرێ ·

مەبەستیش ئەوەیە کە : ناوی (( الحَيّ القَيّومُ )) کاریگەریەکی ئیجابی تایبەتی هەیە بۆ ئەوەی داواکاریەکان وەڵام بدرێتەوەو ، کارەساتەکان لابەرێت ·

وَفِي " السُّنَنِ " و " صَحِيحِ أَبِي حَاتِمٍ " مَرْفُوعًا : اسْمُ اللَّهِ الْأَعْظَمُ فِي هَاتَيْنِ الْآيَتَيْنِ : ﴿ وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ ﴾ [ الْبَقَرَةُ ١٦٣ ] ، وَفَاتِحَةُ آلِ عِمْرَانَ ﴿ الم اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ﴾ قَالَ التِّرْمِذِيُّ : حَدِيثٌ صَحِيحٌ[٢٨٤] .

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : گەورەترین ناوەکانی خوای تعالی لەم دوو سورەتەدایە ﴿ وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ ﴾ واته ﴿ وَإِلَهُكُمْ ﴾ پەرستراوی ئێوە ﴿ إِلَهٌ وَاحِدٌ ﴾ پەرستراوێکی تاك و تەنهایە ﴿ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ ﴾ هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە تەنها ئەو نەبێت ﴿ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ ﴾ کە بەخشندەی میهرەبانە ، هەروەها ئایەتی یەکەمی سورەتی ( آل عمران ) ﴿ الم اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ﴾ واته : ﴿ الم ﴾ تەنها خوا ماناکەی دەزانێت بە ( ئەلیف ، لام ، میم ) دەخوێندرێتەوە بۆ ماناکەی سەیری سەرەتای سوەرتی ( البقرة ) بکە ﴿ اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا ﴾ خوا ئەو خوایەیە کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە جگە لە خوا ﴿ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ﴾ زیندووی ڕاگری بونەوەرە[٢٨٥]

وَفِي " السُّنَنِ " و " صَحِيحِ ابْنِ حِبَّانَ " أَيْضًا : مِنْ حَدِيثِ أَنَسٍ أَنَّ رَجُلًا دَعَا ، فَقَالَ : اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِأَنَّ لَكَ الْحَمْدَ ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ الْمَنَّانُ ، بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ، يَا ذَا الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ، يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ : (( لَقَدْ دَعَا اللَّهَ بِاسْمِهِ الْأَعْظَمِ الَّذِي إِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ ، وَإِذَا سُئِلَ بِهِ أَعْطَى ))[٢٨٦] .

واته : لە ( أنس )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پیاوێك نزای کردو ، فەرمووی : پەروەردگارا من داوات لێدەکەم بەوەی کە ستایش بۆ تۆیە ، هیچ پەرستراوێك نی

---

٢٨٤ _حسن : أخرجه أحمد ( ٦ / ٤٦١ ) ، وعبد بن حميد ( ١٥٧٦ ) ، والدارمي ( ٣٣٩٢ ) ، وأبوداود ( ١٤٩٦ ) ، وابن ماجة ( ٣٨٥٥ ) ، والترمذي ( ٣٤٧٨ ) كلهم من طريق عبيدالله بن أبي زياد عن شهر بن حوشب عن أسماء بنت يزيد فذكرته مرفوعاً ٠

٢٨٥ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

٢٨٦ _ إسناده صحيح : أخرجه أبوداود ( ١٤٩٥ ) ، وصححه الألباني ٠

يه به هەق جگە لە تۆی بەخشندەی منەتكاری ، داهێنەری ئاسمانەكان و زەوی ، ئەی خاوەن ڕێزو شكۆمەندی ، ئەی زیندووی ڕاگری بونەوەر ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لە خوا پاڕایەوە بەناوە گەورەكانیی كە ئەگەر نزای پێ بكرێت قبولْ دەكرێت و ، داواشی پێ بكرێت پێی دەدرێت )) ٠

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بە پەرۆشەوە نزای بكردایە دەیفەرموو : (( یا حيٌّ یا قَيُّوم)).

فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ (( اللّهُمّ رَحْمَتَكَ أرْجُو ، فَلَا تَكِلْنِي إلَى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ ، وَأصْلِحْ لِي شَأْنِي كُلَّهُ ، لَا إلَـهَ إلّـا أنْـتَ )) واتـە : پـەروەردگارا هیـوای بـەزەیت دەكـەم و ، بـە ئەندازەی چاوتروكانێك مەمدرە دەست خۆم و ، هەموو كاروبارم چاك بكـە ، هـیچ پەرسـتراوێك نی یە بەهەق جگە لـە تـۆ )) ، لـەم نزایـەدا هیـوای بـەزەی لـە زاتێـك داوادەكرێت كـە هـەموو خەیرێكی بەدەستەو ، بەتەنها پشتی پێ دەبەسترێت و ، مرۆڤ هەموو كاروبارەكانی خۆی پـێ دەسپێرێت و ، لێی دەپاڕێتەوە بۆ ئەوەی هەموو كاروبارەكانی چاك بكـات و ، بـە ئەنـدازەی چـاوتركانێك نەیداتـە دەسـتی خـۆی و ، لێـی دەپاڕێتـەوە بـە یەكتاپەرسـتیی ، چـونكە لـە دوورخستنەوەی نەخۆشیدا ڕۆلێكی كاریگەری بەهێز دەبینێت ٠ هـەروەها فەرمایشتیشـی : (( اللهُ ربِّي لا أُشْرِكُ بِهِ شَيئاً )) هەمان كاریگەریەكانی سەرەوەی تێدایە ٠

بەڵام فەرموودەكەی ( ابـن مسـعود )_ خـوای لـێ ڕازی بێـت _ : (( اللّهُـمَّ إنِّـي عَبْـدُكَ وابْنُ عَبْـدِكَ ٠٠ )) چـەندین زانسـتی ئیلاهـی و ، نـەهێنی بەندایـەتی تێدایـە كـە لـە كتێبێكـدا جێـی نابێتـەوە ، چـونكە مرۆڤـ لێـرەدا دان بـە بەندایـەتی خـۆی و بـاوان و دایانیـدا دەنێـت ، كـە نێوچاوان و هەموو كاروبارەكانی بەدەسـتی ئـەو زاتەیـەو چـۆنی حـەز لێبێـت تەصـرووف پێـوە دەكات ، بەندەش توانای هیچ سودو زیان و ، مردن و ژیان و ، زیندوبونەوەیەكی بۆ خـۆی نـی یە ، بەڵكو دیلی ژێر دەستی پەروەردگارو ، كەساسی ژێر سوڵتان و زاڵبونێتی٠

وه فەرمایشـتی : (( مـاضٍ فيَّ حُكْمُـكَ عَـدْلٌ فِـيَّ قضـاؤكَ )) واتـه : حوكمـت بەسـەرمدا بەردەوامەو ، بڕیـارت بـە سـەرمدا دادپەروەرانەیـە ، دوو بنچـینەی گـەورە لـە خۆدەگرێـت کـە تەوەرەی یەکتاپەرستی لە سەر دەخولێتەوە ٠

یەکەمیان : جێگیرکردنـی چـارەنووس ، وە حوکمـەکانی خـوای تعـالی بەسـەر بەندەکانیـدا جێبەجێ کراوەو بەردەوامە ، مرۆڤ ناتوانێت لێی جیابێتەوەو ، هیچ ڕێگەیەکیشـی بەدەسـتەوە نی یە بۆ دورخستنەوەی ٠

دووەم : خوای تعالی لەم حوکمانەدا دادپـەروەرەو ، هـیچ سـتەمێك لـە بەندەکـەی ناکـات ، بەڵکو تیایدا لە چوارچێوەی دادپەروەری و چاکەکردن ناچێتە دەرەوە ، چـونکە سـتەم کـردن هۆکارەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ستەمکار یـا پێویسـتی بـە شـتێکە ، یـاخود نەفامـە ، یاخود نەزان و گێلە ، بەڵام هەرگیز گونجاو نیە ئەوە لە زاتێك بوەشێتەوە کە بە هەموو شتێك زانایەو ، پێویستی بەهیچ شتێك نی یەو ، هەموو شتێك پێویسـتی پێیـەتی و ، دادپـەروەرترین دادوەرانەو ، بچوکترین گەردیلە لە قەدەرو چارەنووسەکانی ناتوانێت لە لـە حیکمـەت و دانـایی و ستایشکردنی بچنە دەرەوە ، وەکو چۆن لە تواناو ویستیی ناچنەدەرەوە ، بۆیە حیکمـەت و دانایی پەیڕەوکراوە لە گەڵ تواناو ویستیدا ، ئەوەبوو ( هود ) پێغەمبەر _ صلى الله على نبينـا وعليه وسلم _ کاتێ قەومەکەی بە بتەکانیان دەیترسێنن دەڵێت :

﴿ إِنِّي أُشْهِدُ اللَّهَ وَاشْهَدُوا أَنِّي بَرِيءٌ مِمَّا تُشْرِكُونَ * مِنْ دُونِهِ فَكِيدُونِي جَمِيعًا ثُمَّ لا تُنْظِرُونِ * إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُمْ مَا مِنْ دَابَّةٍ إِلا هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴾[ هود: ٥٤ –٥٦ ] ٠ واته : ﴿ أُشْهِدُ اللَّهَ ﴾ خوا دەکەم بە شایەت ﴿ وَاشْهَدُوا ﴾ و ئێوەش شایەت بن ﴿ أَنِّي بَرِيءٌ ﴾ کە بەڕاستی من بەری و دوورم ﴿ مِمَّا تُشْرِكُونَ ﴾ لەوەی کە ئێوە دەیکەن بە هاوبەش بۆ خوا ﴿ مِنْ دُونِهِ ﴾ جگە لە خوا ﴿ فَكِيدُونِي جَمِيعًا ﴾ جا هەمووتان پیلانم لێ بگێڕن ﴿ ثُمَّ لا تُنْظِرُونِ ﴾ لە پاشان مۆڵەتیشم مەدەن ( ولێم مەوەستن )

﴿ إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللهِ ﴾ بەڕاستی من پشتم بەخوا بەستووە ﴿ رَبِّي وَرَبِّكُمْ ﴾ كە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە ﴿ مَا مِنْ دَابَّةٍ ﴾ هیچ گیان لەبەرێك نی یە ﴿ إِلا هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا ﴾ مەگەر خوا دەسەڵات دراوە بەسەریدا ( بگری مووی پێشی سەرێتی ) ﴿ إِنَّ رَبِّي ﴾ بەڕاستی پەروەردگارم ﴿ عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴾ لەسەر ڕێگەیەكی ڕاستە(٢٨٧) واتە لە گەڵ ئەوەدا كە خوای تعالی دەستەڵاتی خۆی داوە بەسەر هەموو شتێكداو بە ویستی خۆی تەصروفیان پێوە دەكات ، بەڵام لە سەر ڕێگەیەكی ڕاستیشەو بە دادپەروەری و دانایی و ، چاكەكردن و ڕەحمەت و بەزەیی نەبێت تەصروفیان پێوە ناكات ٠ بۆیە فەرمایشتی : (( ماضٍ فيَّ حُكْمُكَ )) واتە : حوكمەت بە سەردەمدا بەردەوامە ، سازیارو ڕێككەوتووی فەرمایشتی خوای تعالایە : ﴿ مَا مِنْ دَابَّةٍ إِلا هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا ﴾ واتە : هیچ گیانلەبەرێك نی یە مەگەر خوای تعالی دەستەڵات دراوە بەسەریدا ، هەروەها فەرمایشتی : (( عَدلٌ فيَّ قضاؤكَ )) واتە : بڕیارت بەسەرمدا دادپەروەرانەیە ، سازیارو ڕێككەوتوی فەرمایشتی خوای تعالایە : ﴿ إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴾ واتە : بەڕاستی پەروەردگارم لە سەر ڕێگەیكی ڕاستە ٠ پاشان لە پەروەردگاری دەپاڕێتەوە بەو ناوانەی كە خۆی پیێ ناوناوە ، ئەوەی بەندەكان دەیزانن و ئەوەشی كە نەیانزانیوە ٠ لەوانەش : هەندێك لەو ناوانەی لە عیلمی غەیبی خۆیدا هەڵگرتووەو ، پیشانی هیچ پەریەكی نزیك ، یاخود پێغەمبەرێكی نەداوە ، ئەم وەسیلەیە گشتیترین وەسیلەیەو ، لە هەمووشیان بەلای خواوە خۆشەویسترەو ، لە هەمووشیان نزیكترە بۆ دەستكەوتنی داواكراو ٠

پاشان داوای لێكرد قورئان بكات بە بەهاری دڵی ، چونكە بەڕاستی قورئان بەهاری دڵانە ، وە بیكات بە شیفای خەم و خەفەتەكانی ، بۆیە دەچێتە جێگەی ئەو دەرمانەی كە نەخۆشیەكان ڕیشەكێش دەكات و ، تەندروستی بۆ جەستە دەگەڕێنێتەوە ، داواشی لێكرد خەم و خەفەتەكانی پیێ لابەرێت وەكو چۆن ژنگ و پیسی مشت و ماڵ دەكرێت ، بۆیە ئەگەر

---

٢٨٧ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

نەخۆش بەڕاستگۆیی ئەم دەرمانە بەکاریبێنێت ئەوا نەخۆشیەکەی لادەبات و ، شیفایەکی تەواوی بۆ دەستەبەر دەکات و ، تەندروستیشی بۆ دەگەڕێنێتەوە · والله الموفق ·

بەڵام نزاکەی ( ذي النون ) · شێوەی تەواوی بێ کەم و کوڕی یەکتاپەرستی و پاک و بێگەردی خوای پەروەردگاری تێدایە ، هەروەها بەندەی خوا دان بە ستەم و تاوانی خۆیدا دەنێت و ، بەوەش دەبێت بە گەورەترین دەرمانەکانی کارەسات و خەم و خەفەت لابردن و ، چاکترین وەسیلەکانیش دەبێ بۆ ئەوەی خوای تعالی پێویستیەکان جێبەجێ بکات ، چونکە یەکتاپەرستی و پاک و بێگەردی هەموو تەواویەک بۆ خوای تعالی جێگیر دەکەن و ، هەموو کەم و کوڕیەکی و عەیب و چواندنێکی لێ بەدور دەگرن · دان نانی بەندەش بە ستەمدا لە ڕاستیدا ڕەنگدانەوەی باوەڕی تەواوێتی بە شەرع و پاداشت و سزا ، بۆیە ئەمە وای لێدەکات خۆی بشکێنێتەوەو بۆ لای خوا بگەڕێتەوە ، واز لە هەڵنوتانەکانی بهێنێت ، دان بە بەندایەتی خۆیدا بنێت ، پێویستێتی خۆی بۆ خوای تعالی ئاشکەرا بکات · لێرەدا چوار شت بەکارهاتووە بۆ پاڕانەوە : یەکتاپەرستی ، پاک و بێگەردی ، بەندایەتی ، دان پێدانان ·

بەڵام فەرمودەکەی ( أبي أمامة ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ : (( اللَّهُمَّ إِنِّي أعوذُ بِكَ مِنَ الهَمِّ والحَزَنِ ···)) ، لە هەشت شتدا پەنا بەخوا دەگرێت ، هەر دوانێکیان پێکەوەبەندێکی جووتن ، ئەوەتا دڵتەنگی و خەم دوو بران ، بێدەستەڵاتی و تەمەبەڵی دوو بران ، ترسنۆکی و دەست قوچاوی دوو بران ، زاڵبونی قەرزو دۆڕانی پیاوان دوو بران ، چونکە شتی نەویستراوی بە ئازار کە بە دڵ گەشت ، پێدەچێ هۆکارەکەی شتێکی ڕابردوو بێت ، بۆیە مرۆڤ دڵتەنگ دەکات ، یاخود شتێکە چاوەڕوان دەکرێت لە ئاییندەدا ڕوویدات ، بۆیە مرۆڤ خەمی دەخوات ·

کە مرۆڤ لە بەرژەوەندیەکانی دوادەکەوێت و لە دەستی دەچێت ، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە یا بۆ بێ توانایی کە بە بێدەستەڵاتی ناودەبرێت ، یاخود دەگەڕێتەوە بۆ وەرەبەردان و نائومێدی کەبە تەمبەڵی ناودەبرێت ·

كه مرۆڤ خێرو سودو كەڵك له خودى خۆى و هاوڕگەزى قەدەغه دەكات ، يا بەجەستەى ئەو سودە قەدەغەدەكات ، كه به ترسنۆكى ناودەبرێت ، ياخود به ماڵ و سامانى ، كه به دەست قوچاوى ناودەبرێت · وه كه خەڵكى بەسەردا زاڵ دەبێت يا بەهەقه ، كه زاڵبونى قەرزه ، يا به ناهەق و پوچيه كه بەدۆڕانى پياوان ناودەبرێت ، بۆيه لەم فەرموودەيەدا پەنا به خوا گيراوه له هەموو شەڕو خراپەكاريەك ·

بەڵام كاريگەرى ئيستغفارو داواى لێخۆشبوون له دورخستنەوەى خەم و دڵتەنگى و تەنگانەدا ، لەبەر ئەوەيه كه هەموو ڕێبازو ئاقڵ و ژيرانى ئومەتێك دەزانن كه سەرپێچى و خراپەكارى خەم و خەفت و ، ترس و دڵتەنگى و ، ستنگ تەنگى و ، نەخۆشيەكانى دڵ پەيدا دەكات ، ئيتر هەركات ئارەزووەكانيان لەو خراپەو سەرپێچيانه تێربو و ، لێى بێزاربوون ، دوباره ئەو سەرپێچى و خراپەكاريه ئەنجامى دەدەنەوه بۆ دورخستنەوەى ئەو خەم و خەفەتەى دايگرتوون ، وەكو ئەوەى شێخى گومڕابووان دەڵێت :

وَكَــــأسٍ شَـــــرِبتُ على لَــــذَّةٍ          وَأُخــــــــــــــرَى تَدَاوَيْتُ مَــــنْهَا بِهَـــــــا

واته :

كاسێكى شەرابم خواردەوه بۆ خۆشى و          خۆشم لێ چارەسەر كرد بەخواردنەوەى كاسێكى تر

بۆيه ئەگەر ئەمه ئاسەوارى تاوان و گوناهەكان بێت له سەر دڵ ، ئەوا هيچ دەرمانێكى نى يه بەدەر له تەوبەو پەشيمانى و داواى لێخۆشبوون ·

بەڵام نوێژ · دەروازەيەكى گەورەيه بۆ شادومانبوون و بەهێزبوون و ، كرانەوەو ئاسودەبوونى دڵان ، هەروەها دڵ و ڕوح به خواى تعالى دەگات ، لێى نزيك دەبێتەوەو چێژ له يادو زيكركردنى وەردەگرێت ، به ڕازونيازكردنى دڵخۆش دەبێت ، له پێش دەستيدا دەوەستێت ، هەموو جەستەو هێزو ئەندامەكانى له پەرستنيدا بەكاردەهێنێت و ، هەموو ئەندامێك بەشى خۆى دەداتێ ، واز له خەڵك و تێكەڵاوبون و گفتوگۆكردنيان دەهێنێت و ،

هێزەكانی دڵیی و ئەندامەكانی بە خوای پەروەردگارەوە پەیوەست دەبێت و ، لە دەستی دوژمنی دەحەوێتەوە ، هەموو ئەمانە كە لە كاتی نوێژدا مرۆڤ پەیڕەوی دەكات دەبێت بە گەورەترین دەرمانەكان و دڵخۆشكارەكان خۆراكەكان كە بەتەنها گونجاوی دڵە تەندروستەكانە · بەڵام دڵە نەخۆشەكان ، بەهاوشێوەی جەستەكانە كە بەدەر لە خۆراكی چاك هیچی تر سودی بۆ نابێت ·

بۆیە نوێژ یارمەتیدەرێكی گەورەیە بۆ ئەوەی بەرژەوەندیەكانی دونیاو ڕۆژی دوای پێ بەدەست بهێنرێت و ، خراپەكانی دونیاو ڕۆژی دوای پێ دوربخرێتەوە ، تاوان قەدەغە دەكات ، نەخۆشیەكانی دڵ دوردەخاتەوە ، نەخۆشیەكانی جەستە لادەبات ، دڵ ڕوناك دەكاتەوە ، ڕووی مرۆڤ سپی دەكات ، ئەندامەكانی لەش و نەفس چالاك دەكات ، ڕۆزی فراوان دەكات ، ستەم دوردەخاتەوە ، ستەملێكراو سەردەخات ، تێكەڵاوەكانی ئارەزوو هەڵسان دادەمركێنێتەوە ، نیعمەت دەپارێزێ ، ڕق و قین دوردەخاتەوە ، ڕەحمەت و بەزەی دادەبەزێنێت ، خەم وخەفەت لادەبات ، بۆ زۆرێك لە ئازارەكانی سك بەسوودە ·

وَقَدْ رَوَى ابْنُ مَاجَهْ فِي " سُنَنِه " مِنْ حَدِيثِ مُجَاهِدٍ ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ : رَآنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا نَائِمٌ أَشْكُو مِنْ وَجَعِ بَطْنِي ، فَقَالَ لِي : (( يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَشكَمَتْ دَرْدْ ؟ )) قَالَ : قُلْتُ : نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، قَالَ : (( قُمْ فَصَلِّ ، فَإِنَّ فِي الصَّلَاةِ شِفَاءً ))[٢٨٨]

وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الْحَدِيثُ مَوْقُوفًا عَلَى أَبِي هُرَيْرَةَ وَأَنَّهُ هُوَ الَّذِي قَالَ ذَلِكَ لِمُجَاهِدٍ وَهُوَ أَشْبَهُ وَمَعْنَى هَذِهِ اللَّفْظَةِ بِالْفَارِسِيِّ أَيُوجِعُك بَطْنُك ؟ واتە : لە ( أبي هُريرة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ منی بەدیكرد كە نووستبووم و هاوارم لە ئازاری سكم دەكرد ، ئەوەبوو بە زمانی فارسی پێی فەرمووم (( أشكَمَتْ دَرْدْ )) واتە سكت ئازای

---

٢٨٨ _ ضعيف : أخرجه أحمد ( ٢ / ٣٩٠ ، ٣٠٤ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٥٨ ) كلاهما عن مجاهد عن أبي هريرة فذكره ·

هەیە ، ( أبوهُريرة ) دەفەرمێت : گوتم : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەویش فەرمووی : (( هەستە نوێژ بکە ، چونکە نوێژ شیفای تێدایە )).

ئەگەر سنگی پزیشکی زەندیقی بێ باوەڕ بەم چارەسەرە نەکرایەوە ، ئەوا بەشێوازی پزیشکی لە گەڵیدا قسەدەکرێت و ، پێی دەگوترێت : نوێژ وەرزشی نەفس و جەستەشە پێکەوە ، چونکە چەندین جوڵانەوەو باری جیاواز لە خۆدەگرێت وەکو هەڵسان و ، ڕکوع و ، سجودو ، دانیشتن لە سەر سمت و ، گواستنەوەکان لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر کە لە گەڵیدا زۆربەی جومگەکان دەجوڵێنەوەو ، هەروەها زۆربەی ئەندامە ناوەکیەکانی وەکو گەدەو ، ڕیخۆڵەو ، ئەندامی هەناسەدان و ، هیتریش دەجوڵێنەوە ، بۆیە نکۆڵیی ناکرێت کە ئەم جوڵانەوانە ڕۆڵیکی کاریگەر ببینێت لە بەهێزکردن و شیکردنەوەی مادەکاندا ، بەتایبەت بەهۆی هێزی نەفس و کرانەوەو ئاسودەبونی لە نوێژدا ، ئەوجا سروشتی جەستەش بەهێز دەبێت و ، نەخۆشیەکە دوردەخرێتەوە ٠

بەڵام نەخۆشی زەندیقێتی بێ باوەڕیی و ڕوو وەرگێڕان لەو پەیامەی کە پێغەمبەران هێناویانەو ، لە جیاتیدا باوەڕنەبوون بەخوا هەڵبژێردرێت ، ئەوا هیچ دەرمانێکی نی یە بەدەر لە ئاگرێکی بڵێسەدار ، کە کەس ناچێتە نێوی مەگەر خراپترینی خەڵك ، بەتایبەت ئەو کەسانەی کە بڕوایان نی یە و پشت هەڵدەکەن لە ئاینی ڕاستی ئیسلام ٠

بەڵام کاریگەری تێکۆشان لە پێناوی خوادا ( الجهاد ) بۆ دورخستنەوەی خەم و خەفەت ، کارێکە مرۆڤ بە ویژدانی خۆی دەیزانێت ، چونکە نەفس هەرکات هێرشەکانی پوچ و ناهەق و داگیرکردنەکانی پشت گوێ خست ، خەم و خەفەت و ، کارەسات و ترسەکانی زیاتر دەبێ ، بۆیە ئەگەر مرۆڤ بۆ خوا بەرامبەر بەوانە تێکۆشا ، ئەوا خوای تعالی ئەو خەم و خەفەت و دڵتەنگیەی بۆ دەگۆڕێت بە شادومانیی و چالاکی و هێز ، وەکو ئەوەی خوای تعالی فەرموویەتی : ﴿ قَاتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنْصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ

مُؤْمِنِينَ (١٤) ويُذْهِبُ غَيظَ قُلُوبِهِم ﴾[ التوبة :١٤ _ ١٥ ] واته : ﴿ قَاتِلُوهُمْ ﴾ ( باوەڕداران ) بیانكوژن ﴿ يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ ﴾ خوا بەدەستی ئێوە سزایان دەدات ﴿ وَيُخْزِهِمْ ﴾ وریسوایان دەكات ﴿ وَيَنْصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ ﴾ وە سەرتان دەخات بەسەریاندا ﴿ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ ﴾ وە ( خوا ) سینەو دڵی كۆمەڵی برِوادار خۆش دەكات ﴿ وَيُذْهِبْ غَيظَ قُلُوبِهِم ﴾ و رِق و خەشمی دڵەكانیان دادەمركێنیٚ و ناهێڵیٚ(٢٨٩) ، بۆیە هیچ شتێك نی یە بە ئەندازەی تێكۆشان پەرێشانی دڵ و خەم و خەفەتی لابەرێت ٠ والله المستعان ٠

بەڵام كاریگەری ( لاحول ولا قوة إلا بالله ) لە دورخستنەوەی ئەم نەخۆشیەدا ، دەگەرِێتەوە بۆ شێوەی تەواوی بیٚ كەم و كورِی سپاردنی كاروبار بەدەستی خوای تعالی ، نكۆڵیكردنە لە هەر هێزو توانایەك مەگەر لەلایەن پەروەردگارەوە بەدەست هاتبیٚ ، وە لەو بارەوە لە تواناادا نی یە ناكۆكی لە گەڵ خوادا بكرێت ، بۆیە بە گشتی هەموو گۆرِانێك لە بارێكەوە بۆ بارێكی تر لە جیهانی سەرەوەو خوارەوەدا تەنها بە یارمەتی خوای تعالایەو ، هێزی خوای تعالاش لەسەر ئەو گۆرِانەیە ، هەموو ئەوانەش بە دەستی خوایە بەتەنها ، هیچ شتێك ناتوانێت لە ئاستی ئەم ووشەیەدا هەستێتەوە ٠

لە هەندیٚ ( آثار )دا هاتووە : هیچ پەریەك لە ئاسمانەوە دانابەزێت و ، بۆشی بەرز نابێتەوە مەگەر بە ( لاحول ولا قوة إلا بالله ) ، كاریگەریەكی گەورەشی هەیە لە دورحستنەوەی شەیتاندا ٠ والله المستعان٠

---

٢٨٩ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

## بەشێك : سەبارەت بەڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەركردنی ترس و ، خەوزڕاندا :

رَوَى التِّرْمِذِيّ فِي " جَامعه " عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ : شَكَى خَالِدٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّه مَا أَنَامُ اللَّيْلَ مِنَ الْأَرَقِ ، فَقَالَ النَّبِيّ ﷺ: (( إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَقُلْ : (( اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَمَا أَظَلَّتْ ، وَرَبَّ الْأَرْضِينَ ، وَمَا أَقَلَّتْ ، وَرَبَّ الشَّيَاطِينِ وَمَا أَضَلَّتْ ، كُنْ لِي جَارًا مِنْ شَرِّ خَلْقِكَ كُلِّهِمْ جَمِيعًا أَنْ يَفْرُطَ عَلَيَّ أَحَدٌ مِنْهُمْ ، أَوْ يَبْغِيَ عَلَيَّ ، عَزَّ جَارُك ، وَجَلَّ ثَنَاؤُك ، وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ ))(٢٩٠) .

واتە : لە ( بُرَيْدَةَ )ەوە _ خوای لیّ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : ( خالد ) سكالاّی بردە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا من بەشەوان خەوم دەزڕێ و ناخەوم ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ئەگەر چویتە سەر نوێنەكەت بڵێ : خوایە ئەی پەروەردگاری حەوت ئاسمانەكەو ئەوەی سێبەری بۆ دەكات ، ئەی پەروەردگاری چینەكانی زەوی و ئەوەی هەڵیگرتووە ، ئەی پەروەردگاری شەیتانەكان و ئەوەی گومڕایان كردون ، خوایە پشتیوانم بە بەرامبەر بە شەڕو خراپەی هەموو بەدیهێنراوانت نەوەكا یەكێكیان دستدرێژیم بكەنەسەر ، یاخود ستەمم لێبكەن ، ئەوەی تۆ پەنای بدەیت بەهێزو زاڵ دەبێ ، ستایشكردنت پیرۆزو دیارە ، هیچ پەرستراوێكی تر نی یە بەهەق جگە لە تۆ )) .

وَفِيهِ أَيْضًا : عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ، عَنْ أَبِيهِ ، عَنْ جَدِّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُعَلِّمُهُمْ مِنْ الْفَزَعِ : أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ مِنْ غَضَبِهِ ، وَعِقَابِهِ ، وَشَرِّ عِبَادِهِ ، وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ ،

---

٢٩٠ _ إسناده ضعيف : أخرجه الترمذي ( ٣٥١٨ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٤٠٨ ) .

وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَنْ يَحْضُرُونِ ، قَالَ : وكَانَ عَبْدُ اللّهِ بْنُ عَمْرٍو يُعَلِّمُهُنّ مَنْ عَقَلَ مِنْ بَنِيهِ . وَمَنْ لَمْ يَعْقِلْ كَتَبَهُ ، فَأَعْلَقَهُ عَلَيْهِ ، (٢٩١)

واته : له ( عَمْرو )ى كورِى ( شُعَيْب )هوه ، له بابيهوه ، له باپيريهوه دهگێڕێتهوهو دهفهرمێت : پێغهمبهرى خوا ﷺ فێرى دهكردن له كاتى ترسدا بلێن : پهنادهگرم به ووشه تهواوهكانى خوا له تورِهبوونى و ، له سزاى و ، شهڕو خراپهى بهندهكانى و ، له خهتهرهو پالْنهرو وهسوهسهى شهيتانهكان و ، وهپهنات پىٚ دهگرم لهوهى شهيتانهكان لام ئامادهبن و سهرم لىٚ بشێوێنن ، ( عَمرو ) دهفهرمێت : ( عبدالله )ى كورِى ( عَمْرو ) مندالْهكانى خۆى ئهوانهى گهورهو ژير دهبوون ئهم نزايهى فێر دهكردن و ، بۆ ئهوانهش كه مندالْ بوايهن هێشتا ژير نهبوبون دهينوسى و ، پێياندا ههلْيدهواسى٠

كهوابوو سازياربوونى ئهم پهناگرتنه بۆ چارهسهركردنى ئهم نهخۆشيه ڕوونهو شاراوه نى يه ٠

## بهشێك : سهبارهت به ڕێبازى پێغهمبهرى خوا ﷺ له چارهسهركردنى ئاگركهوتنهوهو كوژانهوهيدا

يُذْكَرُ عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدّهِ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ : (( إِذَا رَأَيْتُمْ الْحَرِيقَ فَكَبّرُوا ، فَإِنّ التّكْبِيرَ يُطْفِئُهُ ))(٢٩٢)

واته : ( عَمْرو )ى كورِى ( شُعَيب ) له بابيهوه له باپيريهوه دهگێڕێتهوهو فهرموويهتى : پێغهمبهرى خوا ﷺ فهرمووى : (( ههركات ئاگركهوتنهوهتان بهديكرد ( الله أكبر ) بكهن ، چونكه ( الله أكبر ) دهيكوژێنێتهوه )) ٠

٢٩١ ـــ حسن دون قوله (( وكان عبدالله ٠٠٠٠ )) : أخرجه أحمد ( ٢ / ١٨١ ) ، وأبوداود ( ٣٨٩٣ ) ، والترمذي ( ٣٥٢٨ ) ، والنسائي في عمل اليوم والليلة ( ٧٦٥ ) ، ( ٧٦٦ ) كلهم عن عمر بن شعيب عن أبيه عن جده فذكره ٠

٢٩٢ ـــ إسناده ضعيف : أخرجه ابن السني ( ٢٨٩ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ٠

لەبەر ئەوەی ئاگر هۆکاری سەرەکی ئاگرکەوتنەوەیەو ، ئاگریش ئەو ماددەیەیە کە شەیتانی لیّ خولقێنراوەو ، خراپەیەکی گشتی ئەوتۆی تێدایە کە گونجاوی شەیتانە وەکو ماددەکەو ووەکو کرداریش ، بۆیە شەیتان یارمەتیدەری کەوتنەوەیەتی ، ئاگریش بە سروشت دلوای بەرزبونەوەو خراپەکاری دەکات ، ئەم دوو شتەش ڕێبازی شەیتانەو ، بانگەوازی بۆ دەکات و ، بەو دوو شتەش ئەوەی ئادەم دەفەوتێنێت ، هەریەك لە ئاگرو شەیتان دلوای بەرزبونەوەو خراپەکاری لە سەر زەویدا دەکەن ، بەڵام شکۆمەندی و گەورەیی و مەزنی پەروەردگار شەیتان و کردارەکانی دادەمرکێنێتەوەو لایان دەبات ·

لەبەر ئەمە ( الله أكبر ) گوتن کاریگەری بەتینی هەیە لە ئاگر کوژانەوەدا ، چونکە هیچ شتێك توانای وەستانی نی یە لە بەردەم گەورەیی و مەزنی خوای پەروەردگاردا ، بۆیە ئەگەر موسڵمان ( الله أكبر )ی گووت ، ئەو ( الله أكبر ) گووتنە ئاگرەکە دادەمرکێنێتەوەو شەیتانیش دادەمرکێنێتەوە کە لێی خولقێنراوە ، ئینجا ئاگرەکەش دەکوژێتەوە ، ئێمە _ ( ابن القيم ) _ و کەسانی تری جگە لە ئێمەش ئەمەمان تاقیکردۆتەوەو ، بینیومانە ئاوەهایە · والله أعلم ·

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پاراستنی تەندروستیدا :

نێوەنجێتی و تەندروستی و مانەوەی جەستە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تەڕایی و شێیەی کە لە جەستەدایەو بەرگریی پلەکانی گەرمی دەکات ، تەڕایی وشێ مادەی تەندروستیە ، گەرمیش ئەو مادەیە پێ دەگەیەنێت و ، پاشماوەکانی دوردەخاتەوەو ، چاکیان دەکات و ، نەم و نیانیان دەکات ، ئەگینا جەستە خراپ دەبوو توانای هەستانی نەدەبوو · هەروەها تەڕایی و شێ خۆراکی گەرمیە ، ئەگەر تەڕایی وشێ نەبوایە ، گەرمی جەستەی دەسوتان و ووشکی دەکردو خراپی دەکرد ، هەڵسوڕاندنی کاروباری هەر دانەیەکیان لەسەر ئەویتر وەستاوە ،

مانەوەو جێگیری و دروستی جەستە لە سەر هەدوكیان پێكەوە دەوەستێت ، هەر یەكێكیان مادەیە بۆ ئەویتر ، بۆیە گەرمی مادەی تەڕیی و شێ یە كە دەیپارێزێت و ، لە خراپی و گۆڕان بۆ باری ناشیاو قەدەغەی دەكات ، تەڕای و شێش مادەن بۆ گەرمی كە خۆراكی دەداتێ و هەڵیدەگرێت ، هەركات یەكێكیان بەسەر ئەویتردا زیادبوو ، بە گوێرەی ئەو زیادبوونە میزاجی جەستە دەست بەلادان و شێوان دەكات ، گەرمی بە بەردەوامی تەڕای و شێ شیدەكاتەوە ، بۆیە جەستە پێویستی بە شتی تره تاوەكو جێگەی ئەوانە بگرێتەوە كە گەرمی شیكردۆتەوەو ، ئەو شتانەش بریتیە لە خۆراك و خواردنەوە ، بەڵام ئەگەر خۆراك و خواردنەوە زیاد بوو لە ئەندازەی ئەوەی كە شی بوبۆوە ، ئەوا چیتر گەرمی توانای شیكردنەوەی پاشماوەكانی نابێت ، بۆیە ئەو پاشماوانە دەگۆڕێت بۆ مادەگەلێكی خراپی زیانبەخش ، باری جەستە تێك دەدات و ، خراپی دەكات ، بۆیە چەندین نەخۆشی لە جەستەدا پەیدا دەبێ بەگویرەی هەمە چەشنەیی مادەكان و ، قبوڵكردنی ئەندامەكانی جەستەو ئامادەبونیان ، هەموو ئەمانەش لە گوفتاری خوای پەروەردگارەوە وەرگیراوە كە دەفەرمێت : ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا ﴾[ الأعراف : ٣١ ] واتە : بخۆن و بخۆنەوە ( لەوەی كە حەڵاڵە بۆتان ) و زیادە ڕەوی مەكەن[٢٩٣]، لێرەدا خوای تعالى ڕێنمای بەندەكانی دەكات بۆ خواردن و خواردنەوە بە ئەندازەیك جەستەی پێ ڕاوەستێت و بمێنێت و جێگەی ئەو خۆراكانە بگرێتەوە كە پێشتر شیبونەتەوە ، بە ئەندازەیەك بێت جەستە سودی لێ ببینێت لە چەندایەتی و چۆنیەتیدا ، بەڵام هەركات ئەو سنورەی بەزاند ئەوا زێدەڕۆیە ، بۆیە هەریەك لە نەخواردن و نەخواردنەوە ، یاخود زێدەڕۆیی كردن تیایندا وەكو یەك تەندروستی باش دەشێوێنن ٠

پاراستنی تەندروستی لەو دوو ووشە ئیلاهیەی سەرەوەدان ، گومانی تێدا نی یە كە جەستە بەردەوام لە شیكردنەوەی مادە خۆراكیەكان و لە جێ دانانەوەی ئەو مادە خۆراكیە

٢٩٣ ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

شیکراوانەدا کار دەکات ، هەرچەند ئەو شیکردنەوەیە زیاد بێت ، ئەوا گەرمی جەستەش لاواز دەبێت ، لە بەر ئەوەی کە ماددەی گەرمیەکە لاوازو کەم دەبێتەوە ، چونکە زۆریی شیبوونەوە لە جەستەدا تەڕایی و شێ لەناو دەبات و ، ئەو شێ و تەڕایەش مادەی گرمیە وەکو پێشتر ئاماژەی پێدرا ، بۆیە ئەگەر گەرمی لاواز بوو ، هەرسیش لاواز دەبێ ، بەو شێوە بەردەوام دەبێ تاوەکو شێ و تەڕایی نامێنێت و ، گەرمیش دەکوژێتەوە بە گشتی ، بۆیە مرۆڤیش ئەو تەمەنە تەواو دەکات کە خوای تعالی بۆی نوسیوە پێی بگات . بۆیە مەبەستی مرۆڤ لە چارەسەرکردندا تەنها پاراستنی جەستەیە تاوەکو دەگاتە ئەم بارە ، نەك لە پێناو پاراستنی گەرمی و شێ و تەڕای جەستە لەبارێکی ئەوتۆدا کە بتوانێت گەنجێتی و تەندروستی و هێزی مرۆڤ بە بەردەوامی بپارێزێت ، چونکە ئەو شێوە تەواویە لە دونیادا بۆ هیچ کەس بەدینەهاتووە ، لە ڕاستیدا مەبەستی پزیشك تەنها پاراستنی شێ و تەڕای جەستەیە بەرامبەر بە خراپبونیی وەکو بۆگەن بوون و شتی تر ، گەرمیش دەپارێزێت بەرامبەر بەو شتانەی لاوازی دەکەن ، ڕێکیان دەخات و دەیانخاتە یەك کێشەوە لە کردارێکی چارەسازیدا کە جەستەی مرۆڤی پێ ڕاگیراو بێت ، وەکو چۆن ئاسمانەکان و زەمین و هەموو بەدیهێنراوانی تر بەڕێکی و کێشێکی چون یەك و دادپەروەری ڕاگیراون .

هەرکەس تێڕوانێتە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ چاکترین ڕێبازی دەستگیر دەبێ ، کە لە تواناداپە تەندروستیەکی تەواوی پێ بپارێزێت ، ئەو پاراستنە لە سەر چارەسازیەکی ڕێك و پێك وەستاوە لە خواردن و خواردنەوەدا ، لە پۆشاك و ماڵدا ، لە هەواو نوستندا ، لە بەخەبەربوون و جوڵانەوەدا ، لە سرەوتن و ژن هێناندا ، لە دەرهاوێشتن و ڕاگیراندا ، ئەگەر هەموو ئەوانەی سەرەوە لە بارێکی گونجاوی لەباردا بەپێی جەستەو نیشتمان و تەمەن و نەرێت دەستگیربوو ، ئەوا نزیکە تەندروستی بەردەوام بێت ، یاخود بارەکە بەسەر مرۆڤدا زاڵ دەبێ و بەرەو لای تەواوبونی تەمەن دەچێت .

تەندروستی و هێزو توانا ، بەرێزترین نیعمەتەکانی خوایە بۆ بەندەکەی ، زۆرترین بەخششەکانێتی ، دەوڵەمەندترین خەڵاتەکانێتی ، بەڵکو تەندروستی و هێزو توانا بەرێزترین نیعمەتەکانە بەگشتی ، بۆیە هەرکەسێ ئەندازەیەك لە سەرکەوتنی پێدرابێت شایانێتی چاودێری بکات و بیپارێزێت و پارێزگاری لێ بکات بەرامبەر بەو شتانەی دژی ئەو تەندروستیەن ٠

وَقَدْ رَوَى الْبُخَارِيّ فِي " صَحِيحِهِ " مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عَبّاسٍ ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ (( نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنْ النّاسِ : الصّحّةُ وَالْفَرَاغُ ))[٢٩٤] .

واتە : لە ( ابن عباس )ەوە _ خوا لە خۆی وبابیشی ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( دوو نیعمەت هەن کە زۆرێك لە خەڵك هەڵخەڵەتاو خەسارۆمەندن تیایدا : تەندروستی و دەست بەتاڵی )) ٠

وَفِي التّرْمِذِيّ وَغَيْرِهِ مِنْ حَدِيثِ عُبَيْدِ اللّهِ بْنِ مِحْصَنٍ الْأَنْصَارِيّ ، قَالَ : قَالَ ﷺ : (( مَنْ أَصْبَحَ مُعَافًى فِي جَسَدِهِ ، آمِنًا فِي سِرْبِهِ ، عِنْدَهُ قُوتُ يَوْمِهِ ، فَكَأَنّمَا حِيزَتْ لَهُ الدّنْيَا ))[٢٩٥] .

واتە : لە ( عُبَيْدالله )ی کوڕی ( مِحصَن الأنصاري )وە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( هەرکەسێك جەستەی تەندروست بوو ، نەفس و دڵیی ئارام و ئاسودەبوو ، خۆراکی ئەو ڕۆژەی هەبوو ، وەکو ئەوە وایە هەموو دونیای بۆ کۆکرابێتەوە )) ٠

---

٢٩٤ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ١ / ٢٥٨ ، ٣٤٤ ) ، والدارمي ( ٢٧١٠ ) ، والبخاري ( ٨ / ١٠٩ ) ، وابن ماجة ( ٤١٧٠ ) ، والترمذي ( ٢٣٠٤ ) ، كلهم من طريق عبدالله بن سعيد بن أبي هند أنه سمع أباه عن ابن عباس فذكره مرفوعاً .

٢٩٥ _ حسن : أخرجه الحميدي ( ٤٣٩ ) ، والبخاري في الأدب المفرد ( ٣٠٠ ) ، وابن ماجة ( ٤١٤١ ) ، والترمذي ( ٢٣٤٦ ) كلهم من طريق سلمة بن عبيدالله عن أبيه فذكره

وَفِي التِّرْمِذِيِّ أَيْضًا مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ ، عَنْ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ : (( أَوَّلُ مَا يُسْأَلُ عَنْهُ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنَ النَّعِيمِ ، أَنْ يُقَالَ لَهُ : أَلَمْ نُصِحَّ لَكَ جِسْمَكَ ، وَنَرْوِكَ مِنْ الْمَاءِ الْبَارِدِ ))(٢٩٦).

واته : له ( أبي هريرة )وه _ خواى لىَ رِازى بيَت _ فەرموويەتى : پيَغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : (( له رِۆژى قيامەتدا يەكەم شتيَك كه له بەندەى خواى دەپرسن ، سەبارەت بە نيعمەتەكان ، ئەوەيە كە پيَى دەگوتريَت : ئايا جەستەمان بۆ تەندروست نەكردى و ، ئاوى ساردمان دايتىَ ))

ئاليَرەدا كەسانيَك لە پيَشين سەبارەت بەم گوفتارەى خـواى تعـالى : ﴿ ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ ﴾ [ التَّكَاثُر ٨ ] گوتويانه : ووشەى ( النعيم )ى نيَو ئەم ئايەتـه واتـاى تەندروسـتى چاك دەگەيەنيَت ٠

وَفِي مُسْنَدِ الْإِمَامِ أَحْمَدَ : أَنّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِلْعَبَّاسِ : (( يَا عَبَّاسُ ، يَا عَمّ رَسُولِ اللّهِ سَلْ اللّهَ الْعَافِيَةَ فِي الدّنْيَا وَالْآخِرَةِ ))(٢٩٧).

واته : پيَغەمبەرى خوا ﷺ به ( عباس )ى مامى فەرموو : (( ئەى ( عباس ) ، ئەى مامى پيَغەمبەرى خوا داواى تەندروستى چاك له خواى تعالى بكه له دونياو رِۆژى دوايدا )) ٠

وَفِيهِ عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصّدّيقِ ، قَالَ : سَمِعْت رَسُولَ اللّهِ ﷺ يَقُولُ : (( سَلُوا اللّهَ الْيَقِينَ وَالْمُعَافَاةَ ، فَمَا أُوتِيَ أَحَدٌ بَعْدَ الْيَقِينِ خَيْرًا مِنْ الْعَافِيَةِ ))(٢٩٨).

واته : له ( أبي بكر الصّديق )ەوه _ خواى لىَ رِازى بيَت _ فەرموويەتى : گوێبيستى پيَغەمبەرى خوا بووم ﷺ دەيفەرموو : (( داواى دلّنيابوون و تەندروستى بكەن له پەروەردگار ، چونكه هيچ كەسيَك پاش دلّنيابوون له تەندروستى چاكترى پىَ نەدراوه )) ٠

---

٢٩٦ _ إسناده صحيح : أخرجه الترمذي ( ٣٥٥٥ ) ، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ( ٢٦٧٤ ) ٠

٢٩٧ _ إسناده صحيح : أخرجه الترمذي ( ٣٥٠٩ ) ، وأحمد ( ١٧٨٣ ) ، وصححه الألباني في الصحيحة ( ١٥٢٣ ) ٠

٢٩٨ _ إسناده صحيح : أخرجه أحمد ( ٥ / ١٧ ) ، وصححه الألباني في صحيح الجامع ( ٤٧٢ ) ٠

لێرەدا نێوان دڵنیابوون و تەندروستی ئاین و دونیای کۆکردۆتەوە ، چاکبوونی بەندەی خوا لە دونیاو ڕۆژی دوایدا تەواو نابێ مەگەر بە دڵنیابوون و تەندروستی ، چونکە دڵنیابوون سزاکانی ڕۆژی دوای لێ دوردەخاتەوەو تەندروستیش نەخۆشیە دونیا زیانبەخشەکانی دڵ و جەستەی لادەبات ٠

وَفِي " سُنَنِ النَّسَائِيِّ " مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ يَرْفَعُهُ : (( سَلُوا اللَّهَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ وَالْمُعَافَاةَ ، فَمَا أُوتِيَ أَحَدٌ بَعْدَ يَقِينٍ خَيْرًا مِنْ مُعَافَاةٍ ))[٢٩٩]

واتە : لە ( أبي هُريرة )وە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لە خوای تعالی داوای لێبوردن و تەندروستی و چاکبوون بکەن ، چونکە هیچ کەسێك پاش دڵنیابوون لە تەندروستی چاکتری پێ نەدراوە )) ٠

ئەم فەرموودەیە داوای سێ شت لە خوای تعالی دەکات ، چۆنکە پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی : ( سلوا الله العفو ) واتە : بۆ لادانی شەڕو خراپەی ڕابردوتان لە خوای تعالی داوای لێبوردن بکەن ، ( العافية ) واتە لە خوای تعالی داوا بکەن کاتی ئێستاتان تەندروست و بێوەی بکات ، ( المعافاة ) واتە لە خوای تعالی داوا بکەن بۆ ئایندەتان چاکبوون و پاراستن فەراهام بکات ، کەوابوو ئەم سیانە داوای تەندروستی و بێوەیی و چاکبون دەبەخشن ٠

وَفِي التِّرْمِذِيِّ مَرْفُوعًا : مَا سُئِلَ اللَّهُ شَيْئًا أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ الْعَافِيَةِ[٣٠٠] .

واتە : پێشەوا ( التِّرمِذي ) دەگێڕێتەوە : کەوا هیچ شتێك لە خوای تعالی داوا نەکراوە کە بەلایەوە لە تەندروستی خۆشەویستر بێت ٠

---

٢٩٩ _ إسناده صحيح : صححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب ( ٣٣٨٧ ) ٠

٣٠٠ _ إسناده ضعيف : أخرجه الترمذي ( ٣٥١٠ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٥٧٢٠ ) ٠

وَقَالَ عَبْدُ الرّحْمَنِ بْنُ أبِي لَيْلَى : عَنْ أبِي الدّرْدَاءِ ، قُلْت : يَا رَسُولَ اللّهِ لَأنْ أُعَافَى فَأشْكُرَ أحَبّ إلَيّ مِنْ أنْ أُبْتَلَى فَأصْبِر ، فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: (( وَرَسُولُ اللّهِ يُحِبّ مَعَكَ الْعَافِيَةَ )) [(٣٠١)] .

واته : ( أبي الدّرداء ) _ خواى لىَ ڕازى بێت _ دەڵێت : گوتم : ئەی پێغەمبەری خوا حەزدەکەم تەندروست بم و سوپاسى خوا بکەم نەك بە نەخۆشى تاقى بکرێمەوەو ئارام بگرم ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووى : (( پێغەمبەری خواش لە گەڵ تۆدا حەزى بە تەندروستيە )) .

لە ( ابن عباس )ەوە _ خوا لە خۆى وبابيشى ڕازى بێت _ دەگێڕنەوە کەوا دەشتەکيەك چووە خزمەتى پێغەمبەری خوا ﷺ و پێى گووت : پاش پێنج نوێژە فەرزەکە چ لە خواى تعالى داوا بکەم ؟ ئەويش فەرمووى : (( لە خوا تعالى داواى تەندروستى چاك بکە )) ، دەشتەکيەکە دووبارە لێى پرسيەوە ، لە سىَ يەم جاردا بە دەشتەکيەکى فەرموو : (( لە خواى تعالى داواى تەندروستى چاك بکە لە دونياو ڕۆژى دوايدا )) .

ئەمە باروحاڵى تەندروستى چاکە ، بۆيە چەند شتێك لە ڕێبازى پێغەمبەری خوا ﷺ دەخەينە ڕوو سەبارەت بە چاودێريکردنى تەندروستى ، ئەو کەسەى تەماشاى بکات بۆى دەردەکەوێت کە تەواوترين ڕێبازە بەگشتى ، بەهۆيەوە پاراستنێکى تەواوى تەندروستى جەستەو دڵى دەستگير دەبىَ و ، ژيانێکى نوێى دونياو دوا ڕۆژيش ، والله المستعان ، وعليه التكلان ، ولا حول ولا قوة إلا بالله .

٣٠١ _ موضوع : انظر ضعيف الجامع ( ٦١٢٠ ) .

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بواری خواردن و خواردنەوەدا :

بەڵام بۆ خواردن و خواردنەوە ، نەریتی پێغەمبەری خوا ﷺ وانەبووە نەفسی خۆی لەسەر جۆرێك لە خواردەمەنی ڕاگرێت و ، دەستی لێ هەڵنەگرێت بۆ خواردەمەنیەکی تر ، چونکە ئەم کارە زیانێکی زۆر بە سروشتی مرۆڤ دەگەیەنێت ، پێدەچێ مرۆڤ جار بە جار ئەوەی بەلاوە ئاستەم بێت و خواردنی دیکەی دەست نەکەوێت ، بەڵام ئەگەر شتی تر نەخوات ، لاواز دەبێ یاخود تیادەچێت ، ئەگەر جۆرێکی دیکەشی خواردو ، سروشتی جەستەی قبوڵیی نەبوو ، دیسان زیانی پێ دەگەیەنێت ، بەردەوامبوون لە سەر یەك جۆر خواردن ، ئەگەرچی چاکترین خواردمەنیەکانیش بێ مەترسیەکی زیان بەخشی تێدایە ، بۆیە پێویستە ئەو خواردەمەنیانە بخوات کە باوە بەلای خەڵکی شارەکەیەوە ، وەکو گۆشت و ، میوەو ، نان و ، خورماو ، شتی تریش کە لە بەشی ڕێبازی پێغەمبەری خوادا ﷺ باسمان کردوە سەبارەت بە خواردەمەنیەکان ، بیخوێنەرەوە ٠

ئەگەر پێویستی بکردایە کەوا تین و کاریگەری یەکێك لە خواردەمەنیەکان کزو لاواز بکرایە ، یا پێویستی بە ڕێکخستن هەبوایە ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێی توانا ئەو کارەی بە دژەکەی ئەنجام دەدا ، وەکو ڕێکخستنی گەرمی خورمای ڕوتابی تازە پێگەیو بە کاڵەك ، چونکە کاڵەك ڕادەی شیرینی کەمەو خورماش زۆر شیرینە ئەگەر پێکەوە خوران شیرینی یەکتر ڕێك دەخەن ، ئەگەر ئەوەشی دەست نەکەوتایە ، بەپێی پێویست و دڵتێچون ، ئەو خۆراکەی دەخوارد بەبێ زێدەڕۆیی ، ئەوکاتە سروشتی جەستەش زیانی پێ نەدەگەشت ٠

ئەگەر دڵیشی لیّ تێکەڵهتایە نەیدەخواردو ، لە سەر بیّ ئارەزووبوون نەیدەکرد بە کۆڵیەوە ، ئەمە بنچینەیەکی گەورەیە بۆ پاراستی تەندروستی ، هەرکات مرۆڤ شتێکی خواردو نەفسی قیزی لیّ دەبۆوەو ، حەزی پیّ نەبوو ، بۆ جەستەی زیانی لە کەڵکی زۆرتر دەبیّ . قال أبوهُريرة : ما عاب رسولُ الله ﷺ طعاماً قَطُّ ، إن اشتهاه أكله ، وإلا تركه ، ولم يأكلْ منه[٣٠٢] واته : ( أبي هُريرة ) _ خوای لیّ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنی عەیبدار نەدەکرد ، ئەگەر حەزی لێکردایە دەیخوارد ، بە پێچەوانەشەوە وازی لێدەهێناو ، نەیدەخوارد .

ولمّا قُدِّمَ إليه الضَّبُّ المشويُّ لم يأكلْ منه ، فقيل له : أهو حرامٌ ؟ قال : لا ، ولكنْ لم يكن بأرضِ قَوْمي ، فأجِدُني أعافُه[٣٠٣] .

واته : کاتیّ گۆشتی بزن مژەیەکی برژاویان خستە پێش دەستی لێی نەخوارد ، پێی گوترا : بزن مژەك حەرامە ؟ فەرمووی : نەخێر ، بەڵام لە خاکی قەومەکەی مندا نەبووە ، بۆیە دەبینی حەزم لیّ نی یە . لێرەدا تەماشا دەکەیت پێغەمبەری خوا ﷺ چاودێری داب ونەرێت و حەزی خۆشی کردووە ، چونکە لە خاکەکەی خۆیدا لە سەر خواردنی ڕانەهاتبوو ، نەفسیشی حەزی پیّ نەبوو ، بۆیە نەیخوارد ، بەڵام قەدەغەی خواردنی نەکرد بۆ ئەو کەسانەی حەزیان لێبوو ، وە داب ونەرێتیشیان خواردنی بوو .

پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی بە گۆشت بوو ، لە هەمووشی بەلایەوە خۆشتر قۆڵەکان و ، بەشی پێشەوەی مەڕ بوو ، هەر بۆیە ئەم بەشەی بۆ ژەهراوی کرا . وفي الصحيحين : أُتِيَ

---

٣٠٢ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٢ / ٤٧٤ ، ٤٧٩ ، ٤٨١ ) ، والبخاري ( ٤ / ٢٣٠ ) ، ( ٧ / ٩٦ ) ، ومسلم ( ٦ / ١٣٣ ، ١٣٤ ) ، وأبوداود ( ٣٧٦٣ ) ، وابن ماجة ( ٣٢٥٩ ) ، والترمذي ( ٢٠٣١ ) كلهم عن سليمان الأعمش عن أبي حازم عن أبي هريرة فذكره . وقد وهم المصنف إذ جعله عن أنس .

٣٠٣ _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ٩ / ٤٧٧ ) ، ومسلم ( ٢٠٦٤ ) .

رسولُ الله ﷺ بلحم ، فرُفَع إليه الذراع ، وكانت تُعجبُه[٣٠٤] واته : له ( الصحيحين )دا هاتووه : كەوا پێغەمبەری خوا ﷺ گۆشتی بۆ هێنرا ، ئەوەبوو قۆڵەکانی خرایە پێش دەست ، کە حەزی لێ بوو ٠

وَذَكَرَ أَبُو عُبَيْدَةَ وَغَيْرُهُ عَنْ ضِبَاعَةَ بِنْتِ الزّبَيْرِ ، أَنّهَا ذَبَحَتْ فِي بَيْتِهَا شَاةً ، فَأَرْسَلَ إلَيْهَا رَسُولُ اللّهِ ﷺ أَنْ (( أَطْعِمِينَا مِنْ شَاتِكُمْ )) ، فَقَالَتْ لِلرّسُولِ : مَا بَقِيَ عِنْدَنَا إلّا الرّقَبَةُ ، وَإِنّي لَأَسْتَحْيِي أَنْ أُرْسِلَ بِهَا إلَى رَسُولِ اللّهِ ﷺ ، فَرَجَعَ الرّسُولُ فَأَخْبَرَهُ ، فَقَالَ : ارْجِعْ إلَيْهَا فَقُلْ لَهَا : (( أَرْسِلِي بِهَا ، فَإِنّهَا هَادِيَةُ الشّاةِ وَأَقْرَبُ إلَى الْخَيْرِ ، وَأَبْعَدُهَا مِنْ الْأَذَى ))[٣٠٥] ٠

واته : ( ضباعة )ی کچی ( الزّبير ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ له ماڵەکەی خۆیدا مەڕێکی سەربڕی ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێکی نارد بۆ لای کەوا (( له گۆشتی مەڕەکەتان بەشمان بدە )) ، ( ضباعة )ش پێی گووت : جگە له ملەکەی هیچی ترمان نەماوەو ، منیش شەرم دەکەم بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ بنێرم ، کەسە نێراوەکەش گەڕایەوەو هەواڵەکەی بە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاگەیاند ، ئەوەبوو بە کەسە نێراوەکەی فەرموو : بگەڕێرەوە بۆ لای و پێی بڵێ : (( بینێرە بۆمان ، چونکە بەشی پێشەوەی مەڕەو له خەیریشەوە نزیکترەو ، له هەمووشی زیاتر له پشقل و ڕیخ و پاشماوەوە بەدوورە )) ٠ گومانی تێدا نی یە کە سوکترین گوشتی مەڕ گوشتی مل و ، گۆشتی قۆڵ و باسکە ، کە زۆر بۆ سەر گەدە سووکەو ، خێراتریش هەرس دەکرێت ، ئەمەش خۆی بۆ خۆی چاودێریکردنی خۆراکە کە سێ خاسیەت له خۆیدا کۆدەکاتەوە :

یەکەم : سودو کەڵکی زۆر بێ و کار له هێزەکانی جەستە بکات ٠

دووەم : له سەر گەدە سووك بێ و ، هیچ قورسیەکی له سەر نەبێ ٠

---

٣٠٤ _ صحيح : تقدم تخريجه ٠

٣٠٥ _ إسناده حسن : أخرجه أحمد ( ٦ / ٣٦٠ ) ، عن الأعرج عن ضباعة بنت الزبير فذكرته ٠

سێ یەم : بەخێرا هەرس بوونی ، ئەمەش چاکترین خاسیەتی خواردەمەنی باشە ٠ بۆیە خواردنی کەمێکی ئەمە لە زۆرێکی خواردنی تر باشترو بەسودترە ٠

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی بە حەڵواو هەنگوێن بوو ، ئەم سیانە مەبەستم : گۆشت و حەڵواو هەنگوێنە چاکترینی خواردەمەنیەکانەو ، لە هەمووشی زیاتر بۆ جەستەو جگەرو ئەندامەکان بەسوودە ، خواردنی ئەمانە سودێکی گەورەی لە پاراستنی تەندروستی و هێزدا هەیە ، هیچ کەسیش نی یە خۆی لێ دوربخاتەوە مەگەر کەسێکی نەخۆش و دەرداوی٠

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ نانی بە پێخۆرەوە دەخوارد ئەگەر دەستی کەوتایە ، ئەوەبوو جار بە جار بە گۆشتەوە دەیخواردو دەیفەرموو : هُوَ سَيِّدُ طعامِ أهل الدنيا والآخرة[٣٠٦] واتە : سەرداری خواردنەکانی خەڵکانی دونیاو ڕۆژی دوایە ٠ جار بە جاریش بە کاڵەکەوە دەیخواردو ، جار بە جاریش بە خورماوە ، ئەوەبوو خورمایەکی خستە سەر پارچەیەك نانی جۆو ، فەرمووی : (( هذا إدام هذه ))[٣٠٧] واتە فەرمووی : ئەمە پێخۆری ئەمەیە ٠ ئەم شتە چارەسازیەکی چاکی خواردەمەنی تێدایە ، چونکە نانی جۆ ساردو ووشکەو ، خورماش گەرمی تەڕی شێدارە بەپێی ڕاسترینی دوو گوفتار لەم بارەوە ، بۆیە خواردنی لە گەڵ نانی جۆدا چاکترین چارەسازیە ، بەتایبەت بۆ ئەوانەی ئەوە نرێتیانە و تیایاندا باوە ، وەکو خەڵکی مەدینە ، جار بە جاریش بە سرکەوە دەیخواردو ، دەیفەرموو : نِعْمَ الإدَامُ الخَل[٣٠٨] واتە : چاکترین پێخۆر سرکەیە ، لێرەدا ئەم گوفتارەی پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بەو سرکەیە ستایشکردن و پیاهەڵدانێکە بە گوێرەی پێویستیەکانی باردۆخی ئامادە ، ئەگینا مەبەستی ئەوە نەبوو چاکێتی بدات بەسەر خۆراکەکانی دیکەدا

---

٣٠٦ _ إسناده ضعيف : أخرجه ابن ماجة ( ٣٣٠٥ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٣٣٢٧ ) ٠

٣٠٧ _ إسناده ضعيف : أخرجه أبوداود ( ٣٢٥٩ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف أبي داود ( ٧٠٨ ) ٠

٣٠٨ _ صحيح : أخرجه الدارمي ( ٢٠٥٥ ) ، ومسلم ( ٦ / ١٢٥ ) ، وابن ماجة ( ٣٣١٦ ) ، والترمذي ( ١٨٤٠ ) ، وفي الشمائل ( ١٥١ ) كلهم عن عروة فذكره ٠

، وەکو ئەوەی نەفامەکان لێی تێدەگەن ، هۆی فەرموودەکەش ئەوەبوو کە ڕۆژێك چووە ژوورەوە بۆ لای خێزانی ، نانی خستە پێش دەستی ، ئەویش فەرمووی : ئایا هیچ پێخۆرێکتان هەیە ؟ فەرموویان : بەدەر لە سرکە هیچی ترمان نی یە ٠ ئەویش فەرمووی : چاکترین پێخۆر سرکەیە٠

مەبەست ئەوەیە : خواردنی نان بە پێخۆرەوە لە هۆیەکانی پاراستنی تەندروستیە ، بەڵام ئەگەر لە سەر دانەیەکیان خۆی سنوریەند بکات ، ئەوا کاریگەریەکانی بە پێچەوانەوە دەبیٚ ، لە زمانی عەرەبیدا ووشەی ( الأُدمُ ) واتە پێخۆر ، بە ( أُدم )یش ناوبراوە ؛ چونکە نان چاك دەکات و ، وای لێدەکات بۆ پاراستنی تەندروستی لەبار بێت ٠ لەم بارەشەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگە دەدات کەسی خوازبێنیکار تەماشای کچ بکات بکات دەفەرمێت : ( إنه أحرى أنْ يُؤدَمَ بَينَهما ) واتە : لە ڕێکەوتن و پێهاتن و قایل بوونەوە نزیکترە ، چونکە مێرد دەچێتە نێو مەسەلەکەوە بەچاوکراوەیی ، بۆیە پەشیمان نابێتەوە ٠

پێغەمبەری خوا ﷺ لە میوەی شارەکەی خۆی دەخوارد کاتی دەهاتەبەرو ، خۆی لیٚ نەدەپاراست ، ئەمەش دیسان لە گەورەترین هۆیەکانی پاراستنی تەندروستیە ، چونکە خوای تعالى بە حیکمەت و دانای خۆی ، لە هەموو شارێکدا ئەو میوانەی فەراهام کردووە ، کە لە کاتی خۆیدا دانیشتوانیی سودی لیٚ ببینن ، بەوەش تەندروستی چاك بەدەست دەهێنن و ، ئیتر پێویستیان بە زۆرێك لە دەرمانەکان نابێت ، ئەو کەسانەی کە لە ترسی نەخۆش کەوتندا خۆپارێزی لە میوەی شارەکەی خۆیان دەکەن ، لە ڕاستیدا لە هەموو کەس زیاتر جەستەیان نەخۆشترەو ، لە هەمووشیان زیاتر لە تەندروستی و هێزەوە بەدورن ٠ ئەو ئەندازە تەڕی و شێیەی لە میوەدا هەیە زیانی نیە ، چونکە گەرمی وەرزو زەمین و ، گەرمی گەدە پێی دەگەیەنێت و ، شەڕو خراپەی دوور دەخاتەوە ، بە مەرجیٚ ئەو کەسە زێدەڕۆیی لە خواردنیدا نەکردبیٚ و ، سروشتی جەستەشی لیٚ بار نەکردبیٚ بە ئەندازەیەکی زیاتر لە توانا بەدەر ، خۆراکیشی پیٚ خراپ نەکردبیٚ پێش هەرسکردنی ، خراپیشی نەکردبیٚ بەوەی ئاوی بەسەردا

خواردبێتەوە ، یاخود خۆراکی خواردبێ پاش خواردنی میوەکە ، چونکە نەخۆشی ( القولنج ) واتە نەخۆشی ڕیخۆڵەکان لەو کاتەدا پەیدا دەبێ ، بۆیە هەرکەس ئەندازەی پێویستی لێ خواردبێ لە کاتی پێویستداو بە شێوەی پێویستی گونجاو ، دەبێتە دەرمانێکی بەسوود ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شێوازی دانیشتندا بۆ خۆراك خواردن :

صحَّ عنه ﷺ أنه قال: (( لا آكُلُ مُتَّكئًا ))[٣٠٩] واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( بە پاڵدانەوەوە خۆراك ناخۆم )) ، وقال : إنما أجلِسُ كما يَجْلِسُ العبدُ ، وآكُلُ كما يأكُلُ العبدُ[٣١٠] واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : لە ڕاستیدا دادەنیشم وەکو دانیشتنی بەندەو ، دەشخۆم وەکو خواردنی بەندە ٠

وروى ابن ماجة في سننه أنه نَهى أن يأكلَ الرجلُ وهو منبطحٌ على وجهه[٣١١] واتە : پێشەوا ( ابن ماجة ) لە ( سنن )ەکەیدا دەگێڕێتەوە ، کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە پیاو بە ڕاکشانەوە لە سەر سك خواردن بخوات ٠ ووشەی ( الأتكاءُ )ی نێو فەرمودەی یەکەم بە دانیشتنی چوارمشقی لێکدراوەتەوە ، هەروەها بە پاڵدانەوە بەسەر شتێکدا لێکدراوەتەوە ، کە پشت پێوەدانی شتێکە ، هەروەها بە پاڵدانەوە بەسەر لادا لێکدراوەتەوە ٠ هەر سێ شێوەکەش هەر پاڵدانەوەیە ، بەڵام شێوەی پاڵدانەوە بەسەر لادا زیان بە خواردن دەگەیەنێت ، چونکە قەدەغەی خواردن دەکات بە شێوەی ڕێڕەوی سروشتی خۆیدا تێپەڕ بێت و ، ڕێی لێدەگرێت بەخێرای بۆ نێو گەدە گوزەر بکات ، پاڵەپەستۆشی دەخاتە سەرو ، بۆ کردنەوەش پتەو تۆکمە نابێت ، هەروەها لار دەبێتەوەو بەرێکی ناوەستێت ، بۆیە بە ئاسانی خواردنی

٣٠٩ _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٧ / ٩٣ ) عن علي بن الأقمر قال : سمعت أبا جحيفة فذكره مرفوعاً ٠
٣١٠ _ إسناده صحيح : أخرجه أحمد في الزهد ( ٥ ، ٦ ) ، وصححه الألباني في الصحيحة ( ٥٤٤ ) ٠
٣١١ _ صحيح : أخرجه أبوداود ( ٣٧٧٤ ) ، وابن ماجة ( ٣٣٧٠ ) عن الزهري عن سالم من ابن عمر فذكره

پێ ناگات ٠ بەڵام دوو جۆرەکەی تر : لە شێوازەکانی دانیشتنی زۆردارانە کە دژ بە بەندایەتی مرۆڤە بۆ خوای تعالی ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەخۆم وەکو خواردنی بەندە ، بەهەڵتروشکانەوە ( الإقعاء ) خۆراکی دەخوارد ، هەروەها باسکراوە بۆ کاتی خۆراك خواردن لە سەر سمتەکانی و ئەژنۆکانی دادەنیشت و سکی پێی چەپی دەخستە سەر پشتی پێی ڕاستی ـــ بە هاوشێوەی دانیشتنی نوێژ ـــ وەکو خاکیێتیەك بۆ پەروەردگاری ـــ عزَّوجلَّ ـــ و ئەدەبێکیش لە پێش دەستیداو ، وەکو ڕێزێکیش بۆ خۆراکەکەو ئەو کەسەش کە لە گەڵیدا دەیخوارد ، ئەم شێوە دانیشتنە بەسوودترین و چاکترین شێوەکانی دانیشتنە ، چونکە هەموو ئەندامەکان لە سەر باری سروشتی خۆیان دەبن کە خوای تعالی خوڵقاندویەتی لە گەڵ ئەو شێوە ئەدەبیەی لە سەری دروستی کردون ، خۆراکی مرۆڤیش بەسوودتر دەبێ ئەگەر ئەندامەکانی لە سەر باری سروشتی خۆیان بن لە کاتی خواردندا ، ئەمە بەدینایەت مەگەر لە کاتی ڕێك وەستاندا ، خراپترین دانیشتنەکانی خواردنیش ئەوەیە کە لە سەر لا پاڵدەیتەوە ، چونکە وەکو پێشتر باسکرا کە سورێنجگ و ، ئەندامەکان قووتدانیش لەم شێوەدا تەسك دەبنەوە ، گەدەش لە سەر باری سروشتی خۆی نامێنێت ، چونکە پەستانەکە دەکەوێتە سەر ئەو لایەی لە سەر زەویەکەیەو ، بەرەو لای پەردەی جیاکەرەوەی نێوان ئەندامەکانی خواردن و ، ئەندامەکانی هەناسەداندا ٠

ئەگەر مەبەست بە ووشەی ( الاتکاء ) پاڵدانەوە بێت لە سەر پشتی و ڕاخەری نەرم ونۆڵ کە لە ژێر کەسی دانیشتودایە ، ئەوا مانای فەرموودەکە ئەوە دەبێت : من ئەگەر خۆراکم خوارد دانانیشم و پاڵم دابێتەوە سەر پشتی و ڕاخەر ، بەهاوشێوەی کرداری زۆرداران و ، ئەو کەسانەی دەیانەوێ زۆر بخۆن ، بەڵکو ئەندازەیەك دەخۆم پێویستیم تێربکات وەکو خواردنی بەندەکان ولێم زیاد نەبێت ٠

# بەشێك سەبارەت بە خواردن بە سێ پەنجەکە

پێغەمبەری خوا ﷺ بەسێ پەنجەی خۆراکی دەخوارد ، ئەمە بەسودترین جۆرەکانی خواردنە ، چونکە ئەو کەسەی خواردن بە پەنجەیەك یا دوو پەنجە دەخوات چێژی لێوەناگرێت و ، بەلایەوە خۆش و تەندروست و بەکەڵك نابێت ، تێریشی ناکات مەگەر پاش ماوەیەکی درێژ ، ئەندامەکانی خۆراك و گەدەش لە هەر پارویەکی خوراو خۆشی و چێژ وەرناگرن و ، بە گوێنەدانەوە وەریدەگرن ، بەهاوشێوەی پیاوێك هەقەکەی بە تۆوێك یا دوو تۆو یا بەو هاوشێوانە وەربگرێت ، بۆیە چێژی لێوەرناگرێت و ، پێشی دڵخۆش نابێ ٠ بەڵام خواردن بە بەر لەپ و پێنج پەنجە وادەکات خۆراك لە سەر ئەندامەکانی مرۆڤ و ، گەدەی کەڵەکەبن ، پاشانیش پێدەچی ئەندامەکانی بەو هۆیەوە دابخرێن و بمرێت ، بەڵام بەزۆری ئەندامەکان ناچاری پاڵ پێوەنانی ئەو خۆراکە زۆرانە دەکرێت و ، گەدەش ناچارە تەحەمولیی بکات ، دوای ئەوەش هیچ چێژو خۆشی و سودێکی لێ نابینیت ، بۆیە بەسودترین شێوازی خواردنەکان شێوازی خواردنەکەیەتی ﷺ ، هەروەها خواردنی ئەو کەسەشە کە پەیڕەوی دەکات و بەسێ پەنجەکەی دەخوات ٠

## بەشێك

هەرکەس تەماشای خواردنەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بکات ، دەبینێ هەرگیز نێوان ماست و ماسی کۆنەکردۆتەوەو بەیەکەوە بیانخوات ، هەروەها نێوان ماست و خۆراکێکی ترشی کۆنەکردۆتەوە ، هەروەها نێوان دوو خۆراکی میزاج گەرم ، یاخود سارد ، یاخود لینجی کۆنەکردۆتەوە ، یاخود نێوان دوو خۆراکی کۆنەکردۆتەوە سك بگرن ، یاخود تووشی سکچونی بکەن ، هەروەها نێوان دوو خۆراکی چڕ ، یاخود نەرم وشلی کۆ نەکردۆتەوە ، هەروەها نێوان دوو خۆراکی کۆنەکردۆتەوە بگۆڕێن بۆ یەك تێکەڵاو ، هەروەها نێوان دوو خۆراکی جیاوازیشی کۆنەکردۆتەوە وەکو ئەوەی دانەیەکیان سك بگرێت و ئەویتریان تووشی

سك چونی بكات ، یاخود دانەیەكیان خێرا هەرس بكرێت و ئەویتریان خاوو لەسەرخۆ ، یاخود دانەیەكیان ببرژێنرێت و ئەویتریان بكوڵێندرێت ، یاخود دانەیەكیان پاراو نەرم وشل و تازەو ئەویتریان ووشكراوە ، یاخود نێوان ماست و هێلكە ، یاخود گۆشت و ماستی كۆنەكردۆتەوە ، هەروەها خۆراكی نەدەخوارد لە كاتی زۆر گەرمابونیدا ، یاخود چێشتێكی نەدەخوارد شەو مابێتەوەو سبەینیێ بۆی گەرم بكرێتەوە ، یاخود جۆرە خواردەمەنیە بۆگەن و سوێرەكانی وەكو ، ( كوامخ )و[٣١٢] ترشیات و ، سوێرەمەنیەكانی نەدەخوارد . هەموو ئەم جۆرانە زیانبەخشن و مرۆڤ لە نێوەنجێتی و تەندروستی چاك دەبەنە دەرەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ زیانی هەندێ لە خواردەمەنیەكانی بەهەندێكی تری خواردەمەنی چاك دەكرد ، ئەگەر ڕێگەی چارەسەری هەبوایە ، بۆ نموونە گەرمی ئەم خواردنەی بە ساردی ئەو خواردنە چارەسەر دەكرد ، یاخود وشكێتی ئەم خواردنەی بە تەڕێتی ئەو خواردنە چارەسەر دەكرد ، وەكو ئەوەی خەیارو خورمای ڕوتابی تازەپێگەیو بەیەكەوە دەخواردو ، هەروەها خورمای لە گەڵ ( الحَيْسُ )دا[٣١٣] دەخوارد ، هەروەها خورمای بۆ دەكرایە نێو ئاو و دەیخواردەوە بۆ ئەوەی ( كیموس )ی خواردەمەنیە توندو بەتینەكانی پێ نەرم و نیان و چاك بكاتەوە ، هەروەها فەرمانی بە خواردنی شێوان دەكرد ، ئەگەر بە چنگێك خورماش بێت و ، دەیفەرموو: (( تَرْكُ العَشاءِ مَهرَمَةٌ )) ، ذكره الترمذيُّ في جامعه ، وابن ماجة في سننه[٣١٤] واتە : (( وازهێنان لە خواردنی شێوان لاوازی و پیری دروست دەكات )) .

---

٣١٢ ــ كوامخ : واتە پێخۆر ، یاخود ترشیات و زەڵاتەو شتی وا كە ئیشتیهای خواردن بكاتەوە ، بڕوانە : المعجم الوسيط ، وەرگێڕ .

٣١٣ ــ الحَيْسُ : خورماو كەشك و ڕۆن تێكەڵ بەیەك دەكرێن و دەكوترێن و دەشێلدرێن و دەكرێت بە قاوت ، بڕوانە : قاموسی ڕستە ، وەرگێڕ .

٣١٤ ــ إسناده ضعيف : أخرجه الترمذي ( ١٨٥٧ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الترمذي ( ٣١٥ ) .

پێشەوا ( أبونُعيم ) دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی دەکرد مرۆڤ تێربخوات و یەکسەر بخەوێت ، هەروەها باسکراوە کەوا دڵ ڕەقی دروست دەکات ، بۆیە پزیشکان چەند ئامۆژگاریەکیان خستۆتەڕوو بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێ تەندروستیان بپارێزن : کەوا پێویستە دوای شێوان چەند هەنگاوێك ڕێ بکات ئەگەر صەد هەنگاویش بێ ، دوای خواردن یەکسەر نەخەوێت ، چونکە زۆر زیانبەخشە ، پزیشکە موسڵمانەکانیش گوتویانە : یاخود پاش خواردن نوێژ بکات بۆ ئەوەی خۆراکەکە لە بنی گەدەدا جێگیر بێ و ، هەرس کردنی ئاسان بێ و ، بەوەش چاك دەبێ ٠

پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوی بەسەر خواردنەکەیدا نەدەخواردەوە بۆ ئەوەی خراپی نەکات ، بەتایبەت ئەگەر ئاوەکە گەرم بێ یاخود سارد بێ ، چونکە زۆر خراپە ٠ شاعیرێك دەڵێت:

نەکەی لە کاتی خواردنێکی گەرم یا سارد     یا چونە گەرماوەوە ئاو بخۆیتەوە
ئەگەر بەڕاستی خۆت لەوە دوورخەیتەوە     هەتا لە ژیاندا بی لە نەخۆشی ناوەکی مەترسە

ئاو خواردنەوە لە پاش وەرزش کردن و ، ماندووبوون ، جووت بوونی خێزان و ، پێش و پاش خواردن و ، پاش خواردنی میوە بەباش دانەنراوە ، ئەگەرچی خواردنەوەی پاشی هەندێکیان ئاسانترە بەبەراوردی هەندێکی تریان ، هەروەها ئاو خواردنەوە لە پاش گەرماوکردن و ، کاتی خەبەربونەوە لە نووستن بەباش دانەنراوەو ، هەموو ئەمانە دژیە پاراستنی تەندروستین ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خواردنەوەکاندا

ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خواردنەوەکاندا ، بەتەواوترین ڕێبازەکان دادەنرێت بۆ پاراستنی تەندروستی ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ هەنگوێنی تێکەڵکراوی بە ئاوی سارد

ده خواردەوه ، ئەمەش ڕێبازێكی تەواوه بۆ پاراستنی تەندروستی كه بەدەر له پزیشكه بەڕێزەكان كەسی دیكه پەی پێ نابات ، چونكه خواردنەوەو لستنەوەی پێش نان خواردنی بەیانی بەڵغەم ناهێڵێت و ، ڕیشوەكانی گەدە دەشواتەوەو ، لینجیەكانی لادەبات و ، پاشەڕۆكانی دوردەخاتەوه ، بەشێوەیەكی مام ناوەند گەرمی دەكات و ، كونیلە داخراوەكانی دەكاتەوه ، هەمان كرداریش بە جگەرو گورچیلەو میزڵدان دەكات ، بۆ گەدە له هەموو شیرینیەكانی تر كه دەچنه نێوی بەسوودتره ، بەڵام بەشێوەیەكی كاتی ( العَرَض ) زیان بە تووشبوانی نەخۆشی ( الصفراء ) دەگەیەنێت ، لەبەر تیژێتی هەردوكیان ، كه پێدەچێ بیوروژێنێت ، بەڵام دەتوانرێت به سركه ( الخل ) زیانی ئەوەیان لێ دور بخرێتەوەو ، بەوەش سودێكی زۆری لێدەبینن ، خواردنەوەشی زۆر بەسودتره بەبەراوردی زۆرێك لەو خواردنەوەكانی تر كه له شەكر دروست دەكرێن ، بەتایبەت بۆ ئەو كەسانەی بە خواردنەوه شەكریەكان ڕانەهاتوون و ، سروشتی جەستەشیان هۆگری نەبووەو ، ئەگەر بیخواتەوه وەكو هەنگوێن بۆی لەبار نابێت و ، لێشیەوه نزیك نی یه ، داوەریش لێرەدا نەرێته ، كه زۆرێك له بنچینەكان دەڕۆخێنێت و ، زۆرێكیش دروست دەكاتەوه .

بەڵام خواردنەوەیەك كه هەردوو وەسفی شیرنی و ساردی له خۆیدا كۆبكاتەوه ، له هەموو شتێك بەسوودتر دەبێ بۆ جەستەو ، له گەورەترین هۆیەكانی پاراستنی تەندروستیش دەبێ ، ڕوح و هێزەكان و جگەرو دڵیش شەیدای ئەم جۆره خواردنەوەو ، بەدەستهێنانین ، ئەگەر ئەو دوو وەسفەی سەرەوەی تێدا بوو ، ئەوا خۆراكی چاك بە جەستە دەدەات و ، خواردنیش بە ئاسانی بۆ نێو ئەندامەكان گوزەر دەكات و ، بەو پەڕی تەواویشەوه پێیان دەگات .

ئاوی سارد تەڕەو گەرمی دادەمركێنێتەوه ، تەڕی و شێ بنەڕەتیەكانی جەستە دەپارێزێت ، جێگەی ئەوانەش دەگرێتەوه كه لێی شی بونەتەوه ، خواردەمەنی نەرم و نیان و ناسك وتەنك دەكات و بە ئاسانی بۆ ڕەگەكان گوزەریان پێ دەكات .

پزیشـكان بـەدوو گوفتـار جیاوازیـان تێكـەوت سـەبارەت بـەوەی كـە ئایـا ئـاو خـۆراك دەبەخشێتە جەستە ؟ كۆمەڵێك لەسەر ئەو ڕایەن كە خۆراك دەبەخشێتە جەستە بە پێی ئەو گەشەو زیادەو هێزەی كە دەیبینن بە هۆی ئاوەوە لـە جەستەدا دروسـت دەبـێ ، بـە تایبـەت لەكاتێكدا ئەگەر جەستە زۆر پێویستی پێی بێت ٠

گوتیان : لە نێوان ئاژەڵ و ڕووەكداو لە چەند ڕوویەكەوە چەند ئەندازەیەكی هاوبەش هەیـە لەوانە : گەشەكردن و خۆراك وەرگرتن و نێوەنجێتی ، لـە ڕوەكـدا هێزێكـی هەسـتی هەیـە كـە گونجـاوێتی ، بۆیـە خـۆراكی ڕووەك بـە ئـاوە ، كـەوابوو نكـۆڵیی ناكرێـت ئـاژەڵیش جـۆرە خواردنێك لە ئاوەوە وەربگرێت و ، ئاویش بەشێك بێت لە خواردنە تەواوەكەی ٠

گوتیان : ئێمە نكۆڵی لەوە ناكەین كە هێزی گەشەكردن لـە خۆراكدا بێـت ، بـەڵكو ئـەوە بەڕاست نازانین كە ئاو بەهیچ شێوەیەك هێزی خۆراك پێدان و گەشەكردنی نـەبێت ٠ گوتیـان : هەروەها خواردنیش لە ڕاستیدا هێزی خۆراك بەخشینی بەهۆی ئەو ئاوەوەیـە كـە تیایدایـە ، چونكە بەبێ ئاو خـۆراك بەخشـین و گەشـەكردن ڕوونـادات ٠ گوتیـان : ئـاو مـادەی ژیـانی ئـاژەڵ و ڕووەكـەو ، بـێ گومـان ئـەوەی نزیكـە لـە مـادەی شـتەوە ، خـۆراك وەرگـرتن و گەشەكردنی لێوە بەدەست دێت ، باشە ئەگەر خودی ئاو مادەی بنەڕەتی شتەكە بێ دەبێ چۆن بێ ، خوای تعالى دەفەرمێت : ﴿ وجعَلْنـا مِـنَ المـاءِ كُـلَّ شَـيءٍ حَـيّ﴾[ الأنبيـاء : ٣٠ ] واتە : ﴿ وجعَلْنا مِنَ الماءِ ﴾ وەفەراهاممان هێنا لە ئاو ﴿ كُلَّ شَيءٍ حَـيّ ﴾ هـەموو شـتێكی زینـدوو ([٣١٥]) ، كـەوابوو چـۆن نكـۆڵیی بەدەسـهێنانی خـۆراك وەرگـرتن و گەشـەكردن لـە شتێكەوە بكەین كە مادەی ژیانە بەگشتی ؟

گوتیان : كەسی تینومان بینیوە ئەگەر ئاوی سارد بخواتەوە ، هێزو چـالاكی و جوڵانـەوەی بۆ دەگەڕێتەوە ، بەرامبەر بە بێ خـۆراكیش بـە ئـارم دەبـێ ، تـا ئـەو ئاسـتەی كـە سـوود لـە

[٣١٥] ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

ئەندازەی کەمیشی وەردەگرێت ، کەچی کەسی تێنوی دیکەمان بینیوە کە پێشتر تێر ئاوە نەبووە ، هیچ سوودێکی لە ئەندازەیەکی زۆری خواردن وەرنەگرتووەو ، هیچ هێزو گەشەو خۆراك وەرگرتنێکیشی لیٚ وەرنەگرتووە ، وە ئێمە نکۆڵیی لەوە ناکەین کە ئاوە خۆراکەکە بۆ ئەندامەکانی جەستە دەگوێزێتەوەو ، کاری خۆراك بەخشینیش بەبیٚ ئاو تەواو نابێت ، بەڵکو ئەوە بەڕاست نازانین کە کەسانێك هێزی خۆراك بەخشین و گەشەکردن لە ئاو بەدور دەگرن ، هێندەی نەماوە بەلامانەوە گوفتاریان بچێتە چوارچێوەی نکۆڵیی کردنی کاروبارە ویجدانیەکانەوە ٠

کۆمەڵێکی تریش نکۆڵیی لەوە دەکەن کە لە ئاوەوە خۆراك و گەشەکردن بەدەست بێت ، بەڵگەشیان چەند شتێکە پوختەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئاو بەتەنها بەس نی یەو ، جێگەی خۆراك ناگرێتەوەو ، گەشەی ئەندامەکانی پیٚ زیاد نابێت و ، جێگەی ئەوە ناگرێتەوە کە گەرمی شیی کردۆتەوەو ، چەند شتێکی تریش کە پسپۆڕانی خۆراك نکۆڵیان لیٚ نەکردووە ، ئەوان خۆراك بەخشینی ئاو بە گوێرەی گەوهەرو ناوەڕۆکی و ، بە گوێرەی نەرم و ناسکیەکەی لێك دەدەنەوە ٠ بەڵام خۆراك بەخشینی هەر شتێك بە گوێرەی خۆیەتی ، بۆ نموونە بینراوە هەوای شێداری ساردی نەرم ونیانی خۆش سیفەتی خۆراك بەخشین و گەشەکردنی هەیە بە گوێرەی خۆی ، بۆنی خۆش جۆرێك لە سیفەتی خۆراك بەخشین و گەشەکردنی تێدایە ، کەوابوو سیفەتی خۆراك بەخشینی ئاو ئاشکەرا ئاشکەرایە ٠

مەبەست ئەوەیە : ئەگەر سارد بێت و ، شتێکی شیرینکاری وەکو هەنگوێن و شەربەتی مێوەژ ، یاخود خورما یاخود شەکری تێکەڵ کرا ، بەسودترین ئەو شتانە دەبیٚ کە دەچنە جەستەوەو ، تەندروستیش دەپارێزێت ، بۆیە خۆشەویسترین خواردنەوەکان بەلای پێغەمبەری خواوە ﷺ ساردی شیرین بوو ٠ بەڵام ئاوی شلەتێنی نە ساردو نەگەرم باکردن و سك هەڵاوسان دروست دەکات و ، بە پێچەوانەی ئەوانەی سەرەوەوە کار دەکات ٠

لەبەر ئەوەی خواردنەوەی ئاوێك كە مابێتەوە لەو ئاوەی كە كاتی دەرهێنانی دەخورێتەوە بە سوودترە ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ چووە باخەكەی ( أبي الهيثم )ی كوڕی ( التيهان ) هوە فەرمووی : ئایا ئاوێكتان هەیە لە كونەدا مابێتەوە ؟ ئەوەبوو بۆی هێناو ، ئەویش لێی خواردەوە ، ئیمامی ( البخاري ) دەیگێڕێتەوە بە بێژەی : (( إن كان عندك ماءٌ بات في شنّه وإلاّ كَرَعْنا ))([316]) واتە : (( ئەگەر ئاوت هەیەو لە كونەدا ماوەتەوە بۆمانی بێنە ئەگینا دەم دەخەینە نێو ئاوەكەو دەیخۆینەوە _ بەبێ بەكارهێنانی دەست _ )) ٠ ئاوی سارد وەكو هەویری هەڵهاتوو وایە ، بەڵام ئەو ئاوەی لە كاتی دەرهێنانیدا دەخورێتەوە وەكو هەوێری هەڵنەهاتووە ، هەروەها ئاو ئەگەر بمێنێتەوە خوڵ و خاكەكەی نێوی دەنیشێتەوەو لێی جیادەبێتەوە ، باسكراوە كەوا پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوی بۆ دەهێنرا ، بەڵام ئەو ئاوەی هەڵدەبژارد كە مابۆوە ٠ وقالت عائشة : كان رسول الله ﷺ يُستقى له الماء العذب مِن بئر السقيا([317]) واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوی سازگاری لە بیری ( السُقيا )وە بۆ دەهێنرا ٠

ئەو ئاوەی لە كونەی شڕو كۆندایە ، زۆر بەلەزەترە بەبەراوردی ئەو ئاوەی كە لە قاپی گڵێنەو بەردو شتی تردایە ، بەتایبەت ئەگەر لە پێست دروستكرابێ خۆشترە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ئاوێكی كرد لە كونەدا مابێتەوە بەتایبەت بەبێ شتی دیكەی دروستكراو لە گڵ وهیتر ، ئەو ئاوەش كە دەخرێتە نێو كونەو ، شتی دیكەی دروستكراو لە پێست خاسیەتێكی ناسكی هەیە ، بەهۆی ئەو كونیلە كراوانەوە كە ئاوەكە دەپاڵێوێت ، بۆیە ئەگەر ئاوێك لە قاپێكی گڵێنەدا بێت و توانای پاڵاوتنی هەبێ زۆر بەلەزەتر وساردتریش دەبێ لەو ئاوەی كە لە نێو قاپێكی گڵێنەدا بێت و توانای پاڵاوتنی نەبێ ، بۆیە _ صلاة وسلام _ لە

---

[316] _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ٣٢٨ ، ٣٤٣ ، ٣٤٤ ، ٣٥٥ ) ، والدارمي ( ٢١٢٩ ) ، والبخاري ( ٧ / ١٤٢ ، ١٤٤ ) ، وأبوداود ( ٣٧٢٤ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٣٢ ) كلهم عن سعيد بن الحارث عن جابر بن عبدالله فذكره ٠

[317] _ حسن : أحمد ( ٦ / ١٠٠ ، ١٠٨ ) ، وأبوداود ( ٣٧٣٥ ) عن هشام بن عروة عن أبيه عن عائشة فذكرته ٠

بئر السقيا : بیرێك بوو لە دەوروبەری شوێنی ( الحرّة )ی نزیك بە شاری مەدینەی پیرۆز ، بڕوانە: أخلاق النبي لأبي الشيخ الأصبهاني ٠

سەر تەواوترینی بونەوەرو ، بەڕێزترینیان ، خاوەنی چاکترین ڕێبـاز لـە هـەموو شتێکدا ، ئـەو پێغەمبـەرەی کـە ڕێگـەی ڕاستی بـە ئومەتەکـەی پیشـان داوە ، بـۆ چـاکترین کاروبارەکـان و بەسودترینیان لە دڵ و جەستەو ، دونیاو ڕۆژی دوایاندا ٠

قالت عائشةُ : كان أحبُّ الشرابِ إلى رسول اللهِ ﷺ الحُلوَ البارِدَ([٣١٨]) واتە: خـاتوو ( عائشـة ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویـەتی : خۆشـترین خواردنـەوەکان بـەلای پێغەمبـەری خـواوە ﷺ شیرینی سارد بوو ٠

لێرەدا دەگونجێ مەبەستی ئـاوی سـازگار بێـت ، وەکـو ئـاوی کـانی و بـیرە شـیرینەکان ، چونکە ئاوی سازگاری بۆ دەهێنرا ٠ دەشگونجێ مەبەستی ئاوێکی تێکەڵکراوی هـەنگوێن بـێ ، یاخود ئەو ئـاوە بێـت کـە خورمـاو ترێـی تێـدا خوسـێندراوە ٠ لەوانەشـە بگوترێـت : هـەمووی دەگرێتەوە ، ئەمەش ئاشکەراترو دیارترە ٠

فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودە ( صحيح )ەکەدا : (( ئەگەر ئاوت هەیەو لە کونەدا ماوەتەوە بۆمانی بێنە ئەگینا دەم دەخەینە نێو ئاوەکەو دەیخۆینەوە )) ، بەڵگەیە لە سەر شیاوێتی خواردنەوە بەدەم بەبێ بەکارهێنانی دەستەکان لە حەوزو ئاوکۆو بەو هاوشێوانە ، ئەمەش لەبەر ئەوەبووە ، والله أعلم ، کە کانیەك بووە جێگەکەی واکەوتووە کە پێویستی بەوە کردووە بەدەم ئاوی لێ بخورێتەوە ، یاخود پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی فەرمووە بۆ ڕوونکردنەوەی شیاوێتی ئەم جۆرە خواردنەوەیە ، چونکە هەندێ کەس حەزی بەم شێوە خواردنەوەیە نی یەو ، پزیشکانیش هێندەی نەماوە حەرامی بکەن و ، دەڵێن : زیان بە گەدە دەگەیەنێت ، رُوِيَ فِي حَدِيثٍ لَا أَدْرِي مَا حَالُهُ عَنْ ابْنِ عُمَرَ ، أَنّ النّبِيّ ﷺ نَهَانَا أَنْ نَشْرَبَ عَلَى بُطُونِنَا ، وَهُوَ الْكَرْعُ ، وَنَهَانَا أَنْ نَغْتَرِفَ بِالْيَدِ الْوَاحِدَةِ وَقَالَ : (( لَا يَلَغْ

---

[٣١٨] _ صحيح : أخرجه الحميدي ( ٢٥٧ ) ، وأحمد ( ٦ / ٣٨ ، ٤٠ ) ، والترمذي ( ١٨٩٥ ) ، وفي الشمائل ( ٢٠٤ ) ، كلهم من طريق الزهري عن عروة عن عائشة فذكرته ٠

أَحَدُكُمْ كَمَا يَلَغُ الْكَلْبُ وَلَا يَشْرَبْ بِاللَّيْلِ مِنْ إِنَاءٍ حَتَّى يَخْتَبِرَهُ إِلَّا أَنْ يَكُونَ مُخَمَّرًا ))([٣١٩]) واته : له ( ابن عُمر )هوه _ خوای لیّ ڕازی بێت _ فهرموویهتی : پێغهمبهری خوا ﷺ قهدهغهی كردین له سهر سكمان ئاو بخۆین ، واته مرۆڤ له سهر سك ڕاكشێت و یهكسهر دهم بخاته نێو ئاوهكهو لێی بخواتهوه بهبێ بهكارهێنانی دهستهكانی ، ههروهها قهدهغهی كردین بهیهك دهست ئاو ههڵگرین و فهرمووی : (( با هیچ كهستان زمانی نهباته نێو ئاوهكهو لێی بخواتهوه وهكو سگ ، بهشهویش لهقاپێك ئاو نهخواتهوه تاوهكو تاقی دهكاتهوه مهگهر داپۆشراو بێ )).

فهرموودهكهی پێشووی ئیمامی ( البخاري ) لهم فهرمووده ( صحيح )تره ، ئهگهر ( صحيح )یش بێت ، هیچ دژبه یهك بونێكیان له نێواندا نی یه ، چونكه پێدهچێ لهو كاتهدا له تواناندا نهبێ ئاوهكه بهدهست بخورێتهوه ، بۆیه پێغهمبهری خوا ﷺ فهرمووی : ئهگینا بهدهم ئاو دهخۆینهوه ، له ڕاستیدا خواردنهوه بهدهم زیان به مرۆڤ دهگهیهنێت ئهگهر له سهر سكی ڕاكشاو ئاوی خواردهوه ، وهكو ئهو كهسهی ئاو له ڕوبارو جۆگهلهكان دهخواتهوه ، بهڵام ئهگهر بهڕێكی ڕاوهستاو ئاوی له حهوزێكی بهرزو بهو هاوشێوانه خواردهوه ، ئهوا هیچ جیاوازیهكی نی یه ئاوهكه بهدهستی یاخود بهدهمی بخواتهوه .

## بهشێك سهبارهت به ڕوونكردنهوهی ئهو جیاوازیهی كه له ئارادایه دهربارهی ئاو خواردنهوه به ڕاوهستانهوه

ڕێبازی پێغهمبهری خوا ﷺ ئهوهبوو كه به دانیشتنهوه ئاوی دهخواردهوه ، ئهمه ڕێبازی ڕاهاتووی بوو ، به ( صحيح )ی له پێغهمبهری خواوه ﷺ ( ريواية )ت كراوه كهوا قهدهغهی ئاو خواردنهوهی كردوه به پێ وه ، ههروهها به ( صحيح )ی له پێغهمبهری خواوه ﷺ ( ريوايه )ت كراوه كهوا فهرمانی داوه بهو كهسهی به ڕاوهستانهوه ئاوی خواردهوه ، خۆی

[٣١٩] _ إسناده ضعيف : أخرجه ابن ماجة ( ٣٤٣١ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف ابن ماجة ( ٧٤٦ ) .

بڕشێنێتەوە ، هەروەها بە ( صحیح )ی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ( ریوایە )ت کراوە کە بە ڕاوەستانەوە ئاوی خواردۆتەوە ٠

کۆمەڵێك دەڵێن : ئەمە قەدەغەکردنەکەی ( نسخ ) کردۆتەوە ، کۆمەڵێکی دیکەش دەڵێن : ئەمە ڕوونی دەکاتەوە کە قەدەغەکردنەکە بۆ حەرام کردن نەبووە ، بەڵکو بۆ ڕێنیشاندان و واز لێهێنانە لە پێناو ئەنجامدانی کاری شایستەتر ، کۆمەڵێکیش دەڵێن : بە هیچ شێوەیەك دژایەتیان لە نێواندا نی یە ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی پێویستیدا بە ڕاوەستانەوە ئاوی خوارۆدەوە ، ئەوەبوو چووە لای بیری زەمزەم و ، کەسانێکیش ئاویان لێ دەردەهێنا ، داوای ئاوی کردو ئەوانیش سەتڵەکەیان پێداو ، بەپێوە ئاوەکەی خواردەوە ، بەڵام ئەمە جێگەیەك بوو ئەوەی پێویست بوو ٠

ئاو خواردنەوە بە ڕاوەستناوە چەندین بەڵای تێدایە لەوانە : تێر ئاوبوونی تەواوی پێ بەدەست نایەت ، لە گەدەشدا جێگیر نابێ تاوەکو جگەر بەسەر ئەندامەکاندا دابەشی دەکات ، بەخێرای و بەتیژی دادەبەزێتە نێو گەدە ، بۆیە ترسی ئەوەی لێدەکرێت گەرمیەکەی دابەزێنێت و ، بیشێوێنێت و ، بەخێرای گوزەر بکات بۆ خوارەوەی جەستە بەبێ شێنەیی و لە سەرخۆ ، هەموو ئەمانە زیان بە مرۆڤ دەگەیەنێت ، بەڵام ئەگەر زۆر بە کەمی یاخود لەبەر پێویستی ئەو کارەی ئەنجامدا ، زیانی پێ ناگەیەنێت ٠

## بەشێك سەبارەت بە سێ جار هەناسەدان لە کاتی خواردنەوەدا :

وفي صحيح مسلم من حديث أنس بن مالك ، قال : كان رسول الله ﷺ يَتَنَفَّسُ في الشَّراب ثلاثاً ، ويقولُ : (( إنه أرْوَى وأمْرَأ وأبْرَأُ ))([320])

[320] ـ صحيح : أخرجه مسلم ( ٦ / ١١١ ، ١١٢ ) من طريق أبي عصام عن أنس فذكره ٠

واته : له ( أنس )ى كوڕى ( مالك )ەوه _ خواى لىّ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : پێغەمبەرى خوا ﷺ له كاتى خواردنەوەدا سىّ جار هەناسەى دەدلو دەيفەرموو : (( ئاوا چاكتر تينويەتى دەشكێنىّ و ، بێوەى ترەو ، به ئاسانتريش دەچێته نێو گەدەوه )) ٠

ووشەى ( الشراب ) له زمانى دانەرى شەرع و هەڵگرانى شەرعدا بريتيه له : ئاو ، وه ماناى ( يَتَنَفَّسُ في الشراب ) واته پەرداخەكەى له زارى موبارەكى لادەدلو ، لە دەرەوەيدا هەناسەى دەدلو ، پاشان دەگەڕايەوه بۆ خواردنەوه ، وەكو ئەوەى به ئاشكەرا لە فەرموودەيەكى تردا باسكراوه : إذا شَرِبَ أحَدُكُم فلا يَتَنَفَّسْ في القَدَحِ ، ولكن لِيُبِنِ الإناء عن فيهِ([٣٢١]) واته : هەركات كەسێكتان ئاوى خواردەوه با لە نێو پەرداخەكدا هەناسە نەدات ، بەڵكو با پەرداخەكه له زارى دووربخاتەوه ٠

چەندين دانايى و ، چەندين سوود ، لەم شێوه خواردنەوەدا بەديدەكرێت ، پێغەمبەرى خوا ﷺ هەمووى كورت كردۆتەوه بەفەرمايشتى : ( إنه أروَى وأمرأ وأبرأ ) ، لێرەدا ووشەى ( أروى ) واته : واته به ئاستێكى بەرزى به سوود و بەهێز تينويەتى دەشكێنێت ، ( وأبرأ ) واته : شيفا ، مەبەستى ئەوەبوو كه شيفابەخشه بۆ تينويەتى بەهێز ، چونكه جار لە دواى جار دەچێته نێو گەدەى گڕگرتووەو ، ئەگەر بەجارى يەكەم هێور نەبوبێتەوه ئەوا جارى دووەم هێورى دەكاتەوەو ، ئەگەر بەجارى دووەميش هێور نەبوبێتەوه ئەوا جارى سىّ يەم و ، بەو شێوەيه تاوەكو دەحەوێتەوه ، هەروەها بێوەى تره بۆ گەرمى گەدە ، چاكتريش پارێزگارى لەو گەرميه دەكات و دەيهێڵێتەوه بەبەراوردى ئەوەى كه ئەگەر بەيەك جارو بەيەك خواردنەوه ئاوه ساردەكه هێرشى بۆ بەرێت ٠ هەروەها به يەك خواردنەوه ، ناتوانيت تينويەتى بشكێنێت چونكه تەنها ساتێكى كەم ڕێكەوتى گەرمى تينويەتيەكەى دەكات ، پاشان لێى

[٣٢١] _ إسناده صحيح : أخرجه ابن ماجة ( ٣٤٢٧ ) ، وصححه الألباني في صحيح ابن ماجة ( ٢٧٢٦ ) ، بلفظ : ( إذا شرب أحدكم ٠٠٠ ) ٠

دوردەكەويتەوەو ، هيشتا توندوتيژی تينويەتيەكە نەشكاوە ، ئەگەر بشكيتيش بە تەواوی نابيت بە پيچەوانەی ئاوخواردنەوەوە بە هيواشی و كەم كەم ٠

هەروەها دەرەنجامی بيوەی ترەو ، لە بەلاو كارەساتيشەوە بەدورترە بەبەراوردی هەموو ئەوانەی بەيەك جار دەخورينەوە ، چونكە بەيەكجار خواردنەوە ترسی ئەوەی ليدەكريت بەهۆی ساردی و زۆری برەكەيەوە گەرمی سروشتی جەستە بكوژينيتەوە ، ياخود لاوازی بكات و بەوەش ميزاجی گەدەو جگەر خراپ دەكات و ، دەبيتە هۆی دروستبوونی نەخۆشی ، بەتايبەت لە نيو دانيشتوانی وەلاتە گەرمەكانی وەكو حيجازو يەمەن و بەو هاوشيوانە ، ياخود لە وەرزە گەرمەكانی وەكو هاويندا ، خواردنەوەی ئاو بەيەك جار زۆر ترسناكە بۆيان ، چونكە گەرمی سروشتی ناوەكی دانيشتوانی لاوازە ، وە لەو وەرزە گەرمەشدا ٠

ووشەی ( وأمْرأ ) واتە : خۆراك و خواردنەوە بۆ جەستەی قوت چوو ، واتە : چووە نيو جەستەی و بە ئاسانی و بەچيژو سوودەوە تيكەلی بوو ٠ خوای تعالی دەفەرميت ﴿ فَكُلُوهُ هَنِيئاً مَّرِيئاً ﴾[ النساء : ٤ ] واتە : ( فكلوه ) بيخۆن ( هَنيئاً ) ئاكام و دەرەنجامی خۆشی بيت ( مريئاً ) خۆش و بەلەزەت بیّ لە چەشتنيدا([٣٢٢])٠ دەشگوتريت مانای ئەوەيە : لە سورينچكەوە بەخيرای سەربەروەخوار دەبيتەوە ، چونكە بەسەريەوە ئاسان و سووكە ، بە پيچەوانەی زۆريكی تر ، كە لە سورينچكەوە بە ئاسانی ناچنە خوارەوە ٠

لە بەلاكانی ديكەی خواردنەوە بەيەكجار ، ترسی ئەوەی ليدەكريت ئاوەكە لە قورگيدا گير بيت ، بەوەی ريرەوی خواردنەوەكە دابخريت ، لەبەر زۆری ئەو برە ئاوەی بۆ هاتووە ، بەوەش هەناسەدانی بە ئاستەم و گران بۆ دەدريت و دەرەنجامی خراپی هەيە ، بەلام ئەگەر وردە وردە هەناسەی داو ، پاشان بخواتەوە ، لەو بەلايە رزگاری دەبیّ ٠

[٣٢٢] ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسيری قورئان ٠

له سودەكانى : ئەو كەسەى ئاوەكە دەخواتەوە، له گەڵ يەكەم خواردنەوەدا شىّ دوكەڵيـە گەرمەكەى سەر دڵ و جگەرى بەرز دەبێتەوە ، لەبەر ئەو ئاوە ساردەى بۆ هاتووەو ، بـەوەش سروشت ئەو شێيە لەخۆى دورى دەخاتەوە ، بەڵام ئەگەر ئاوەكە بەيەك جار بخواتەوە ، ئـەوا دابەزينى ئاوە ساردەكەو ، بەرزبونەوەى شێكان هاوكاتى يـەك دەبن و ، پاڵەپەستۆ دەخەنـە سـەر يـەكترو خۆيـان چارەسـەر دەكـەن ، بـەوەش ئـەو كەسـە ئـاو لـە قـورگ گـيران و هەناسەنەدانى تـووش دەبىّ ، لەبـەر ئـەوە خۆشـى لـە ئاوەكـە نابينێـت و ، بـە ئاسـانى بـۆى ناچێتە خوارەوەو ، تێر ئاويش نابێت ٠

وَقَدْ رَوَى عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُبَارَكِ ، وَالْبَيْهَقِيّ ، وَغَيْرُهُمَا عَنْ النَّبِيّ ﷺ إذَا (( شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَمُصّ الْمَاءَ مَصّا ، وَلَا يَعُبّ عَبّا ، فَإِنّهُ مِنْ الْكُبَادِ ))([٣٢٣])٠

واتە : پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى : (( هەركات كەسێكتان ئاوى خواردەوە با بەهێواشى و نەرم و نيانى بيخواتەوە ، بينى پێوە نەنێت و بەيەكجار هەڵى قوڕێنێت ، چونكە ئەمە ئازارى جگەر دروست دەكات )) ٠ ووشەى ( الكُباد )ى نێو فەرموودەكە واتە ئازارى جگەر ، چونكە هەر بە تاقيكردنەوە زانراوە كە دابەزينى ئاو بەجارێك بۆ سەر جگەر ئازارى پىّ دەگەيەنێت و گەرميەكەى لاواز دەكات ، هۆكارى ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دژايەتيەى لە نێوان گەرمى جگەرو ، لە نێوان برِو چۆنيەتى ئەو ئاوە ساردەدا هەيە كە دادەبەزێتە سەرى ٠ بەڵام ئەگەر وردە وردەو لە سەرخۆ بۆى دابەزيايە ، دژايەتى گەرمى جگەرى نەدەكردو ، لاوازيشى نەدەكرد ، نموونەى ئەمەش وەكو نموونەى ئاو بەسەراكردنى مەنجەڵە لەكاتى كوڵانيدا ، بەڵام ئەكەر كەم كەم ئاوى بەسەردا كرا زيانى بۆ نابێت ٠

[٣٢٣] _ ضعيف : ضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٥٦١ ) ، ( ٥٦٢ ) ، ( ٥٦٣ ) ، وانظر الضعيفة ( ٩٤٠ ) ، ( ٢٣٢٣ ) ، ( ٢٥٧٦ ) ٠

وَقَدْ رَوَى التِّرْمِذِيّ فِي " جَامِعِهِ " عَنْهُ ﷺ (( لَا تَشْرَبُوا نَفَسًا وَاحِدًا كَشُرْبِ الْبَعِيرِ ، وَلَكِنْ اشْرَبُوا مَثْنَى وَثُلَاثَ ، وَسَمُّوا إِذَا أَنْتُمْ شَرِبْتُمْ وَاحْمَدُوا إِذَا أَنْتُمْ فَرَغْتُمْ ))([٣٢٤]).

واتــه : پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی : (( بەیـەك نەفـەس ئـاو مەخۆنـەوە وەكـو خواردنەوەی ووشـتر ، بـەڵكو بـەدوو جارو بەسـێ جار بیخۆنـەوە ، ( بسم الله ) بڵـێن ئەگـەر دەستان بە ئاو خواردنەوە كردو ، كە تەواویش بوون ( الحمد لله ) بڵێن ٠

( بسـم الله ) گـووتن لـە سـەرەتای خـواردن و خواردنـەوەداو ، ( الحمـد لله ) گـووتنیش لـە پاشیدا كاریگەریەكی سەرسوڕمێنی هەیە بۆ سـود وەرگرتن و چێژ وەرگرتن لـەو خـواردن و خواردنەوەویەو ، دورخستنەوەی زیانەكانی ٠

ئیمامی ( أحمد ) فەرموویەتی : ئەگەر خواردن چـوار شـت كۆبكاتـەوە ، ئـەوا تـەواوەو بـێ كەم و كوڕیـە : ئەگـەر ( بسـم الله ) لـە سـەرەتایدا گـوترا ، ( الحمـد لله )ی لـە كۆتـادا گـوترا ، دەستی لە سەر زۆر بوو ، خواردنێكی حەڵاڵیش بوو ٠

## بەشێك سەبارەت بە دا پۆشینی قاپ :

وَقَدْ رَوَى مُسْلِمٌ فِي " صَحِيحِهِ " مِنْ حَدِيثِ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ، قَالَ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ : (( غَطُّوا الْإِنَاءَ ، وَأَوْكُوا السِّقَاءَ ، فَإِنَّ فِي السَّنَةِ لَيْلَةً يَنْزِلُ فِيهَا وَبَاءٌ لَا يَمُرُّ بِإِنَاءٍ لَيْسَ عَلَيْهِ غِطَاءٌ ، أَوْ سِقَاءٍ لَيْسَ عَلَيْهِ وِكَاءٌ إِلَّا وَقَعَ فِيهِ مِنْ ذَلِكَ الدَّاءِ ))([٣٢٥]) .

---

[٣٢٤] ـ إسناده ضعيف : أخرجه الترمذي ( ١٨٨٦ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٦٢٣٣ ) ٠

[٣٢٥] ـ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ٣٥٥ ) ، وعبد بن حميد ( ١١٤٠ ) ، ومسلم ( ٦ / ١٠٧ ) كلهم من طريق القعقاع بن حكيم عن جابر فذكره مرفوعاً ٠

واتـه : لـه ( جـابر )ی کـوڕی ( عبـدالله )وه _ خـوای لـیٰ ڕازی بێـت _ فـەرموویـەتی : گوێبیسـتی پێغەمبـەری خـوا بـووم ﷺ دەیفـەرموو : (( قاپـەکان داپۆشـەکان و ، دەمـی کوندەکان ببەستن ، چونکە لە ساڵدا شەوێك هەیە نەخۆشـی تێدا دادەبـەزیٰ ، ئەگـەر بەسـەر هەر قاپێکدا تێپـەڕبێت و دانەپۆشـرابێت ، یـاخود بەسـەر هـەر کوندەیکدا تێپـەڕبێت و دەمـی نەبسترابێت ئەوا ئەو نەخۆشیە دادەبەزێتە نێوی )) ٠

ئەمەش یەکێکە لەو شتانەی کە زانستی پزیشکانی پیٰ نەگەشتووە ، بەڵام ژیرانی خەڵك بـە تاقیکردنەوە زانیویانە ٠ ( اللیث )ی کـوڕی ( سـعد ) کـە یەکێکـە لـەو کەسانەی فەرموودەکـە دەگێڕنەوە فەرموویەتی : بێگانەکانی لای ئێمە لـە مـانگی کـانونی یەکەمـدا خۆیـان لـە شـەوی ئەو ساڵە دەپارێزن ٠

بە ( صحیح )ی لە پێغەمبەری خـواوە ﷺ باسـکراوە کـەوا فەرمانیـداوە بـە داپۆشـینی قاپەکان ئەگەر بە دارچیلکەیەکیش بێت ٠ دارچیلکە خستنە سەر قاپیش چەند حیکمەت و دانابیەکی تێدایە ، لەوانە ئەوەیە کە داپۆشینی قاپەکـەی بیرناچێت ، بـەڵکو گرنگـی پـیٰ دەدا ئەگـەر بـە دارچـیلکەیەکیش بێـت ، لـە دانایـەکانی دیکـەش : ئەوەیـە کـە ڕەنگـە جانەوەرێك بیەوێت بکەوێتە نێوی ، بەڵام بەسەر دارچیلکەکەدا دەڕوات و ، دەبێتە پردێك و ناهێڵێت بکەوێتە نێوی ٠

بە ( صحیح )ی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ باسکراوە کەوا فەرمانیـداوە لـە کـاتی داپۆشـینی قاپەکانـدا بگوترێـت ( بسـم الله ) ، چـونکە ( بسـم الله ) گـوتن لـەکاتی داپۆشـینی قاپەکانـدا شەیتانی لیٰ دور دەخاتەوە ، هەروەها داپۆشینی قاپەکان هۆکارێکە بۆ ئەوەی جانـەوەری لـیٰ دوربخرێتـەوە ، بۆیـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمانی داوە بـە ( بسـم الله ) گـوتن لـەم دوو جێگەیەدا لەبەر ئەو دوو هۆکارە ٠

وروى البخاري في صحيحه من حديث ابن عباس ، أنَّ رسولَ الله ﷺ نهى عن الشُّرب مِنْ في السِّقاء([326]) .

واته : لـه ( ابـن عبـاس )هوه _ خـوا لـه خـۆی و بابیشـی ڕازی بێـت _ فەرموویـەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووه ئاو له دەمی کوندەوه بخورێتەوه ٠

لەمەشدا چەند ئادابێك بەدیدەکرێت : دوبارەبونـەوەی نەفەسـی کەسـی ئـاوخۆر لـه سـەر دەمی کوندەکه چەوری و بۆنێکی ناخۆشی پێ دەگەیەنێت و ، مرۆڤ قیزی لێ دێتەوه ٠

هەروەها : پێدەچێ ئاوی کوندەکه زاڵ بێ بەسـەریداو بەڕادەیـەکی زۆر بچێته سـکیەوەو ، زیـانی پێگەیـەنێت ٠ پێدەچـێ جانـەوەرێکی تێـدا بـێ و ئـەو هەسـتی پـێ نـەکات و ، زیـانی پێگەیـەنێت ٠ لەوانەیـه ئاوەکـه خـاك و خـۆڵ و شـتی دیکـەی تێـدا بـێ و نـەیبینێت لـه کـاتی خواردنەوەداو ، بچێته سکیەوه ٠ له لایەکی تریشەوه له گەڵ ئـاو خواردنـەوەدا هـەوا دەچـێته سکەوەو ، بەوەش تەسك دەبێتەوه بۆ وەرگرتنی ئـاو ، یـا فشـاری دەخاتـه سـەر ، یـا زیـانی پێدەگەیەنێت ، هەروەها بۆ چەندین حیکمەت و دانایی تریش ٠

ئەگەر گوترا : ئەی چ دەکەن بەوەی کە ئیمامی ( الترمذي ) له ( جامع )ەکەیدا دەگێڕێتەوه : أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَعَا بِإِدَاوَةٍ يَوْمَ أُحُدٍ ، فَقَالَ : (( اخْنُثْ فَمَ الإِدَاوَةِ )) . ثُمَّ شَرِبَ مِنْ فِيهَا([327]) واته : پێغەمبەری خوا ﷺ له ڕۆژی ئوحدا بانگی کرد جەوەندە ئاوەکەی بۆ بێنن ، ئەوەبوو فەرمووی : (( دەمی جەوەندەکه بنوشتێنەوه )) ٠ پاشان له دەمەکەیەوه ئاوی خواردەوه ٠ ئێمەش دەڵێین تەنها گوفتارەکەی ئیمامی ( الترمذي )مان بەسه که دەفەرمێت : ( هذا حديثٌ ليس إسناده بصحيح ، وعبدالله بن عمر العُمريُّ يُضعَّفُ

---

[326] _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٧ / ١٤٥ ) من طريق خالد الحذاء عن عكرمة عن ابن عباس فذكره ٠

[327] _ إسناده ضعيف : أخرجه أبوداود ( ٣٧٢١ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف أبي داود ( ٧٩٧ ) ٠

من قبل حفظه ، ولا أدري سمع من عيسى ، أولا ٠ أنتهى ، يريد عيسى بن عبدالله الذي رواه عنه ، عن رجل من الأنصار )٠

## بەشێك سەبارەت بە ئاو خواردنەوە لەو جێگەوە كە پەرداخەكە شكاوەو ڕوونكردنەوەی خراپەكانی

وفي سنن أبي داود من حديث أبي سعيد الخُدريِّ ، قال : نهى رسولُ الله ﷺ عن الشُّرب من ثُلْمَةِ القَدَحِ ، وأن ينفُخَ في الشَّراب([٣٢٨])

واتە : لە ( أبي سعيد الخُدريِّ )وە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە لە جێگە شكاویەكەی لێواری پەداخەوە ئاو بخورێتەوەو ، فوو لە خواردنەوە بكرێت ٠

ئەمە لەو ئادابانەیە كە بەرژەوەندی كەسی ئاوخۆری پێ تەواو و ڕێك وپێك دەبێ ، چونكە خواردنەوە لە جێگەی شكاوی لێواری پەرداخەوە چەندین خراپەی تێدایە :

یەكەم : هەر خاك و خۆڵ و شتێك بەسەر ڕووی ئاوەكەوە بێ لە جێگە شكاویەكەدا كۆدەبێتەوە ، بە پێچەوانەی لا دروستەكە ٠

دووەم : پێدەچێ سەر لە مرۆڤ بشێوێنێت و ، نەتوانێت بە چاكی ئاو لە جێگە شكاویەكەوە بخواتەوە ٠

سێ یەم : پێسی و چەوری لە جێگە شكاویەكەدا كۆدەبێتەوەو ، شتنیشی پێ ناكات ، بەڵام لا دروستەكە باشتر شتنی پێ دەكات ٠

---

[٣٢٨] _ إسناده حسن : أخرجه أبوداود ( ٣٧٢٢ ) ، وانظر الصحيحة ( ٣٨٨ ) ٠

چوارەم : شكاوی لـە پەرداخـدا جێگـەی عەیبـەو ، خـراپترین جێگەیـەتی ، بۆیـە پێویسـتە مرۆڤ خۆی لێ دورخاتەوەو ، لا ڕاستەكە بەكار بێنێت ، چونكە خراپیـی هـەموو شـتێك خێـری تێدا نی یە ، كەسانێك لـە پێشینی چـاك پیاویـەكی بـەدیكرد شـتێكی خراپـی دەكـڕێ ، پێـی فەرموو : ئەو كارە مەكە ، ئەی نەتزانیوە خوای تعالی فرو بەرەكەتی لە هـەموو شـتێكی خـراپ لابردووە ٠

پێنجەم : ڕەنگە جێگە شكاویەكەی لێواری پەرداخەكە تیژ بێ و دەمی مرۆڤ برینـدار بكـات ، لەبەر ئەم هۆكارانەو چەندینی تریش ، پێویستە مرۆڤ خۆی لە جێگـەی شـكاوی پەرداخـەوە بەدور بگرێت ٠

بـەڵام فـووكردن لـە خواردنـەوە ٠ وا دەكـات دەمـی كەسـی فووكـار بـۆنێكی نـاخۆش بـە خواردنەوەكە بگەیەنێت و چیتر قیزی لـێ بكرێتـەوە ، بەتایبـەت ئەگـەر كەسـی فووكـار بـۆنی دەمی گۆڕابێت ٠ بەگشتی : نەفەسـی كەسـی فووكـار تێكـەڵ بـە خواردنەوەكـە دەبـێ ، بۆیـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ قەدەغـەكردنی هەناسـەدان لـە نێـو قاپـداو فـووكردن لـە خواردنـەوەی كۆكردۆتەوە لە فەرموودەیەكدا كە ئیمامی ( الترمذي ) دەیگێڕێتەوە ، عن ابن عبـاس _ رضـي الله عنهما _ ، قال : نهى رسول الله ﷺ أن يُتنفَّسَ في الإناء ، أو يُنْفَخَ فيه([329]) واتە : لـە ( ابـن عبـاس )ەوە _ خـوا لـە خـۆی و بابیشـی ڕازی بێـت _ فەرموویـەتی : پێغەمبـەری خـوا ﷺ قەدەغەی كردووە هەناسە لە نێو قاپدا بدرێت ، یاخود فووی تێ بكرێت ٠

[329] _ صحيح : أخرجه الحميدى ( ٥٢٥ ) ، وأحمد ( ١ / ٢٢٠ ، ٣٠٩ ، ٣٥٧ ) ، والدارمي ( ٢١٤٠ ) ، وأبوداود ( ٣٧٢٨ ) ، وابن ماجة ( ٣٢٨٨ ) ، ( ٣٤٢٨ ) ، ( ٣٤٢٩ ) ، ( ٣٤٣٠ ) ، والترمذي ( ١٨٨٨ ) كلهم من طريق عكرمة عن ابن عباس ٠

ئەگەر گوترا : ئەی چ بە فەرموودەكەی ( أنس ) دەكەن كە لـە ( الصـحيحين )دا هـاتووە : أنّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ كَانَ يَتَنَفّسُ فِي الْإِنَاءِ ثَلَاثًا([٣٣٠]) واتە : پێغەمبەری خـوا ﷺ لـە قاپەكـە سـێ جار هەناسەی دەدا ٠

دەگوترێت : بە قبولّ و ملكەچيەوە ڕوو بە ڕووی دەبينەوە ، هيچ دژبە يەك بونێك لە نێـوان ئەم فەرموودەو فەموودەكەی يەكەمدا نی يە ، ماناشـی ئەوەيـە لـە خواردنەوەكـەی سـێ جـار هەناسەی دەدەا بـە دوورخسـتنەوەی قاپەكـە لـە زاری و هەناسـەدان لـە دەرەوەيـداو ديسـان جارێكی تـر دەسـتی بـە خـواردنەوەكـەی دەكـرد ، بـەڵام باسـی قـاپ دەكـات چـونكە ئـامێری خواردنەوەكەيە ، ئەمەش بە هاوشێوەی ئەم فەرمووده ( صحيح )يـە : أنّ إبـراهيم ابـن رسـول الله ﷺ مات في الثّدي([٣٣١]) واتە : ( إبراهيم )ی كـوڕی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە زەمـەنی مـەمك خواردندا مرد ٠ واتە لە زەمەنی شيرخواردندا ٠

## بەشێك سەبارەت بە خواردنەوەی ماست بە تەنهاو جار بە جاريش تێكەڵ بە ئاو و سوودەكانی :

پێغەمبەری خوا ﷺ جار بە جار ماستی پوختی دەخواردەوەو ، جار بە جاريش تێكـەڵ بـە ئاوكرابوو ٠ خواردنەوەی ماستی پوخت و بە ئاو تێكەڵ كـراو لـەو وەڵاتـە گەرمانـەدا سـودێكی يـەكجار گـەورەی هەيـە لـە پاراسـتنی تەندروسـتی و ، تـەڕكردنی جەسـتەو ، داشـتنی ( رَي ) جگەردا ، بەتايبەت ماستی ئەو ئاژەڵانەی كە لەسەر ڕووەكـەكانی ( الشـيحَ )و ، ( القَيْصـومَ )و

---

[٣٣٠]_ صحيح : تقدم تخريجه ٠

[٣٣١]_ صحيح : رواه مسلم ( ٤ / ١٨٠٨ ) حديث ( ٢٣٦١ ) وقوله (( مات في الثدي )) أي في زمن إلتقام الثدي ، وهو مدة الرضاعة ٠

، ( الخُزَامَـى )و([332]) ئـەو هاوشـێوانە دەلـەوەڕێن ، ماسـتی ئـەو ئاژەڵانـە خواردنێکـە لـە خواردنەکان ، خواردنەوەیەکە لە خواردنەوەکان ، دەرمانێکە لە دەرمانەکان

وفي جامع الترمذي عنه ﷺ قال : (( إذا أكل أحدكم طعاما فَلْيَقُلْ : اللَّهُمَّ بارِكْ لنا فيه ، و أطْعِمنا خيراً منه ، و من سُقي لبناً فليقل : اللّهُمَّ بارِك لنا فيه ، و زِدْنا منه ، فإنه ليس شيء يُجْزِىءُ منَ الطعام و الشرابِ إلا اللبنُ ))([333]) قال الترمذي : هذا حديث حسن ٠

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ئەگەر کەسێکتان خواردنێکی خوارد با بڵێت : پەروەردگارا بەرەکەتمان بۆ بڕژە نێوی و ، لەم خواردنەش چاکترمان بدەرێ ، وە هەرکەسێك ماستاوی درایە ، با بڵێت : پەروەردگارا فرو بەرەکەتمان بۆ بخەرە نێوی و ، لەمەشمان بۆ زیاد بکە ، چونکە هیچ شتێك جێگەی خواردن و خواردنەوە ناگرێتەوە مەگەر ماستاو ٠

## بەشێك سەبارەت بە خواردنەوەی ( النبیذ ) پێش ئەوەی تیژ بێ و بگۆڕدرێت بۆ ماددەیەکی سەرخۆشکار

وَثَبَتَ فِي " صَحِيحِ مُسْلِمٍ " أَنَّهُ ﷺ كَانَ يُنْبَذُ لَهُ أَوَّلَ اللَّيْلِ ، وَيَشْرَبُهُ إِذَا أَصْبَحَ يَوْمَهُ ذَلِكَ ، وَاللَّيْلَةَ الَّتِي تَجِيءُ ، وَالْغَدَ ، وَاللَّيْلَةَ الْأُخْرَى ، وَالْغَدَ إِلَى الْعَصْرِ ، فَإِنْ بَقِيَ مِنْهُ شَيْءٌ سَقَاهُ الْخَادِمَ ، أَوْ أَمَرَ بِهِ فَصُبَّ([334]) .

---

[332] ـ الخُزَمَى : ڕووەکێکی یەك ساڵەیەو لە بەهاردا دەڕوێت ، لقەکانی نزیکەی ( ٤٠ ) سم درێژ دەبێ ، گەڵاکانی گەشاوەیە ، شیراوکە ، لاکێشەیە ، لێوار گرنجە ، خوڵەمێشی مەیلەو سەوزە ، بەدرێژی ( ٦ سم ) و پانی ( ٢سم ) ، گوڵەکان لە کۆتایی لقەکاندا دێنەدەرو ، ڕەنگێکی بەنەوشەیان هەیە ، ئەم ڕووەکە لە خاکە لمیەکاندا دەڕوێت ، لە دەشتەکاندا پاش باران بارین بە خێرایی دەردەچێت و ، بەشە گوڵەکەی بەکاردەبرێت٠

[333] ـ إسناده صحيح : أخرجه الترمذي ( ٣٤٥١ ) ، وصححه الألباني في صحيح الجامع ( ٦٠٤٥ ) ٠

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەتای شەوەوە خواردنەوەی ( النَبیذ )ی بۆ دروست دەکرا ، کە ڕۆژی لێ دەبویەوە لێی دەخواردەوە ، ئەو شەوەش کە دەهات ، سبەینێ و ، شەوەکەی تریش ، ڕۆژی سێ یەمیش تاوەکو عەسر ، ئەگەر شتێکی لێ بمایەتەوە بە خزمەتکارەکەی دەدا ، یا فەرمانی دەدا بڕژێنرێت .

خواردنەوەی ( النَبیذ ) : خورمای تێدەکرا بۆ شیرین کردنی ، کە بەشدار دەبێ لە خواردن و خواردنەوەدا ، بۆ زیادبوونی هێزو ، پاراستنی تەندروستی زۆر بەسوودە ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ دوای سێ ڕۆژ نەیدەخواردەوە لە ترسی گۆڕانیدا بۆ مادەیەکی سەرخۆشکار .

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسازی جل و بەرگدا :

ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لەم بارەوە تەواوترین و بێ کەم وکوڕیترین ڕیباز بوو ، کە بەسوودترین پۆشاکی بۆ جەستەی بەکاردەهێنا ، بە جۆرێك زۆر سوك بێ لە بەریدا ، لە هەمووشی ئاسانتر بێ بۆ پۆشین و داکەنین ، زۆربەی پۆشاکەکانی عەباو ( الإزار ) بوو _ پۆشاکێك نیوەی خوارەوەی جەستە داپۆشێ _ ، کە بۆ جەستە لە هەموو شتێکی تر سووکترە ، کراسیشی ( القمیص ) دەپۆشی و ، لە هەموو پۆشاکەکانی تر بەلایەوە خۆشبەویستر بوو .

ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پۆشینیدا ئەوەبوو کە بەسوودترین پۆشاکی بۆ جەستەی هەڵدەبژارد ، بۆیە سەرقۆڵەکانی درێژ نەدەکردەوەو ، فراوانی دەکرد ، بەڵکو سەرقۆڵەکانی تاوەکو مەچەکی بوو لە دەستی تێنەدەپەڕی ، بۆ ئەوەی قورسی و ناڕەحەتی لە سەر

---

٣٣٤ _ صحیح : أخرجه أحمد ( ١ / ٢٢٤ ) ، ومسلم ( ٦ / ١٠١ ، ١٠٢ ) ، وأبوداود ( ٣٧١٣ ) ، وابن ماجة ( ٣٣٩٩ ) ، والنسائي ( ٨ / ٣٣٢ ، ٣٣٣ ) كلهم عن يحيى بن عبيد بن أبي عمر عن ابن عباس فذكره .

دروست نەبێ و، نەوەکا نەهێڵێت بەئاسانی بجوڵێتەوەو دەستی بەم لاو ئەو لادا بەرێت ، لەم ئاستەش سەرقۆڵەکانی زیاتر کورت نەدەکردەوە ، بۆ ئەوەی دەرنەکەون بۆ گەرماو سەرما ٠

داوینی کراس و ( الإزار )ەکەی تا نیوەی قاچی بوو لە پاژنەی تێنەدەپەڕی ، بۆ ئەوەی ئازاری نەدات و بەلایەوە گران نەبێت و ، بیکات بە کەسێکی پێوەندکراو ، لە ماسولکەکانی پێیشی کورتری نەدەکردەوە ، بۆ ئەوەی دەرنەکەوێت و گەرماو سەرما ئازاری پێ نەگەیەنن.

مێزەرەکەی گەورە نەبوو بە هەڵگرتنی ئازار بەسەری بگەیەنێت ، یاخود لاوازی بکات و تووشی نەخۆشی بکات ، وەکو باری ئەو کەسانەی کە مێزەری گەورەیان بەسەرەوەیە ، بچوکیش نەبوو بەڕادەیەك نەتوانێت سەر بپارێزێت بەرامبەر بە گەرماو سەرما بەڵکو نێوەندی ئەو دوانە بوو ، دەیخستە ژێر چەناکەیەوە ، چەندین سوودیش لەمەدا بەدیدەکرێت : لەوانە مل لە گەرماو سەرما دەپارێزێت ، بەم جۆرە مێزەرەکە چاکتر جێگیر دەبێ ، بەتایبەت لە کاتی سواربوونی ئەسپ و ووشترو ، هێرش بردن و کشانەوەدا ، کەسانێکی زۆریش لە جیاتی چەناکە قولاب بەکار دەهێنن ، بەڵام جیاوازیەکی زۆریان لە نێواندایە لەهەردوو لایەنی سوودو جوانیشەوە ، ئەگەر تۆ تەماشای ئەم پۆشاکە بکەیت دەبینی لە پۆشاکەکانی تر بەسوودترەو ، لە هەمووشیان چاکترە بۆ پاراستنی تەندروستی ، لە هەموو پۆشاکێکی تریش بەدورترە لە تێچوون و گیرگرفت و ناڕەحەتیەوە بۆ سەر جەستە ٠

لە سەفەردا بەبەردەوامی ، یاخود لە زۆربەی بارەکانیدا سۆڵی ( خُف ) لە پێ دەکرد ، چونکە پێیەکانیش پێویستیان بە شتێکە لە گەرماو سەرما بیانپارێزێت ، جار بە جار لە ماڵەوەشدا لە پێی دەکردن ٠

خۆشەویسترین ڕەنگەکان بەلایەوە سپی و ، ( البُردة )([335]) بوو ، کە بریتی بوو لە ( البُـردة )یەکی نەخشێنراو·

لە ڕێبازیدا ئەوە نەبوو پۆشاکی سوورو ، ڕەش و ، ڕەنگکراو ، بپۆشێت ·

بەڵام ئەو ( الحلّة )([336]) سورەی کە پۆشیەی ، بریتی بوو لە عەبایەکی ( الرداء ) یەمـەنی کە نەخشێنرابوو بە ڕەش و سوورو سپی ، بەهاوشێوەی ( الحلّة ) سـەوزەکە ، ئـەوەبوو ئـەوەو ئەمەشی دەپۆشی ، پێشتریش ئەوەمان یـەکلاکردەوەو ، بۆچـونی ئـەو کەسـانەشمان بەهەڵـە دانا کە وای بۆ دەچون سووری تێری پۆشیوە ·

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسازیی شوێنی نیشتەجێ بووندا :

کە پێغەمبەری خوا ﷺ دڵنیابوو لەوەی کـە ڕێ دەکـات و ، دونیـاش قۆنـاغێکی موسـافیرە کە تیایدا دادەبەزێ بە ئەندازەی درێژی تەمەنی و ، پاشـان دەگوازێتـەوە بـۆ دونیایـەکی تـر ، بۆیە لە ڕێبازی خـۆی و هاوەڵـانی و شـوێنکەوتوانیاندا نـەبوو گرنگـی بـەماڵ و خـانوو بـدەن و دروسـتـی بکـەن و ، بـەرزی بکەنـەوەو ، بیڕازێننـەوەو ، فراوانـی بکەنـەوە ، بـەڵکو چـاکترین خانووی پشوی موسافیر ئەوەیە لە گەرماو سەرما بیپارێزێت ، لە چاوی خـەڵك بـەری گرێـت ، قەدەغەی چونە ژورەوەی جانەوەران بکـات ، ترسـی داڕۆخـانی نـەکرێت لەبـەر زۆر قورسـی ، هـەروەها جانـەوەران هێلانـەی تێـدا نەکـەن ، لەبـەر زۆر فراوانبـوونی ، هـەوای زیانبەخشـیش جارێك لە باکورو جارێك لە باشورو جاریك لە پێش و جارێك لە پاشەوە تیایدا هاتوچۆ نـەکات ،

---

[335] _ البُردة : پۆشاکێکە مرۆڤ بە دەوری جەستەیدا دەیسوڕێنێتەوەو خۆی پێ دەپێچێتەوە ، بڕوانە : تهذیب السنن للطبري ، ج١ ، ص ١٤٣ · وەرگێڕ ·

[336] _ الحُلّة : دوو پارچە پۆشاکە لەیەك کوتاڵ دروست دەکرێت بەزۆری بریتیە لە دەرپێیەك ( إزار )و کراسێك یا عەبایەك ( الرداء ) ، وەرگێڕ ·

له بەر زۆر بەرزی ، ژێر زەمینیش نەبێ بەجۆرێك زیان به دانیشتوانی بگەیەنێت ، زۆریش لە سەر زەمینەوە بەرز نەبێ ، بەڵكو نێوەندی ئەو دوانە بێ ، ئەمە باشترین سیفاتی ماڵ و خانوه ، كه كەمترین گەرمی و ساردی بەردەكەوێت ، تەنگیش نابێ لە سەر دانیشتوانی ، بەجۆرێك تیایدا گیربن ، لێشی زیاد نەبێ و كەسی تێدا نەژیێ و ببێتە شوێنێك جانەوەران دالدەبات ، شوێنیكیشی نەبێ به بۆنی ناخۆشی ئازار به دانیشتوانی بگەیەنێت ، بەڵكو بۆنی ماڵیی خۆشترین بۆن بوو ، چونكه حەزی بەبۆنی خۆش بوو ، بەردەوام بەلایەوه بوو ، بۆنی جەستەشی خۆشترین بۆن بوو ، ئارەقەی خۆشترین بۆن بوو ، بێگومان ئەم جۆره ماڵە نێوەنجیترین ماڵ و بەسودترینیانه و بۆ جەستەش زۆر گونجاوەو ، تەندروستیش دەپارێزێت.

## بەشێك : سەبارەت به رێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ له چارەسازیی كاروباری نووستن و بەئاگابوندا :

هەركەس تەماشای نووستن و بەئاگابوونی پێغەمبەری خوا ﷺ بكات دەبینێ چاكترین نووستنەو ، زۆر بەسودیشە بۆ جەستەو ئەندامەكان و هێزەكان ، چونكه سەرەتایی شەو دەنووست و ، سەرەتای نیوەی دووەمی شەو بەئاگا دەهاتەوه ، هەڵدەستا سیواكی دەكردو ، دەستنوێژی دەگرت و چەند خوای تعالی بۆی بنوسیبا نوێژی دەكرد ، بەم جۆره جەستەو ئەندامەكان و هێزەكان بەشی خۆیان له نووستن و حەوانەوه وەردەگرت و ، بەشی خۆشیان له مەشقی دەرونی وەردەگرت له گەڵ پاداشتێكی تەواودا ، ئەمەش ئەوپەڕی چاكیتی دڵ و جەستەو ، دونیاو دوارۆژیشه · پێغەمبەری خوا ﷺ لە نووستن ئەندازەی زیاد لە پێویستی وەرنەدەگرت ، قەدەغەی نەفسی خۆشی نەدەكرد لە ئەندازەی پێویستی نووستن ، بەتەواوترین شێوەكان ئەوەی ئەنجام دەدا ، بۆیە ئەگەر پێویستی بەنووستن بوایە بەلای ڕاستیدا ڕادەكشا ، زیكری پەروەردگاری دەكرد تا چاوەكانی دەچووه خەو ، به جۆرێك سكی له خۆراك پڕ نەبوایه ، له سەر زەوی نەدەنوست ، نوێنی بەرزی نەبوو ، بەڵكو نوێنەكەی لە

پێست و ناواخنەکەی ڕیشاڵی دارەخورما بوو ، سەری دەخستە سەر سەرین و ، جار بە جاریش دەستی دەخستە ژێر گۆنای ٠

ئێمەش بەشێك سەبارەت بە نووستنی بەسوودو نووستنی زیانبەخش باس دەکەین و دەڵێین : نووستن بارێکی جەستەیە کە بەدوایدا گەرمی غەریزی و هێزەکان بەرەو ناوەڕۆکی جەستە ڕۆدەچن بۆ پشودان ، ئەمەش دوو جۆرە : سروشتی و ، ناسروشتی :

سروشتی : خۆگرتنەوەی هێزە نەفسانیەکانە لە ئەنجامدانی کردەوەکانیان ، کە بریتیە لە هێزەکانی هەست و جوڵانەوە خۆویستەکان ، هەرکات ئەم هێزانە خۆیان لە جوڵاندنی جەستە گرتەوە خاوی و سستبونەوەی بەسەردا زاڵ دەبێ و ، بەوەش ئەو تەڕی و شێیانەی کە لە کاتی جوڵانەوەو بەئاگابوندا شی دەبونەوەو جیادەبونەوە لە مێشکدا کۆدەبنەوە ، میشکیش وەکو زانراوە شوێنی دروستبوونی هەموو هێزو جوڵانەوەکانی جەستەیە ، بۆیە کاتێ ئەو تەڕی و شێیانەی تێدا کۆدەبێتەوە ، سڕدەبێت و بەوەش خاوی و سستبونی بەسەردا زاڵ دەبێ و ، نووستنی سروشتی ڕوی تێدەکات ٠

نووستنی ناسروشتی : هۆکاری نووستنی ناسروشتی دەگەڕێتەوە بۆ ڕوداوێکی کاتی یاخود نەخۆشیەك ، وەکو ئەوەی کە شێ و تەڕاتیەکی زۆر مێشك داگیر دەکات ، بە ئاستێك بەئاگابوون لە توانایدا نابێ بڵاوەیان پێ بکات و شییان بکاتەوە ، یاخود شێیەکی تەڕی زۆری بۆ بەرز دەبێتەوە وەکو ئەوەی لەکاتی تێربووندا ڕوودەدات ، ئەوەش مێشك قورس دەکات و ، خاوی و سستی بەسەردا زاڵ دەکات و ، دوای ئەوە مێشك سڕ دەبێ و ، هێزە نەفسانیەکان خۆیان لە کردەوەکردن دەگرنەوەو ، نووستن ڕوودەدات ٠

**نووستن دوو سوودى بەڕێزى هەيە :**

**يەكـــەميان** : سـرەوتنى ئەندامـەكانى جەسـتەو حەوانـەوەيان لـەو هيلاكـى و ماندوبونـەى توشـيان دەبـێ ، بـەوەش هەسـتەكان لـە ناڕەحەتيـەكانى بـەئاگابوون دەحەوێنێتـەوەو ، شەكەتى و كەشەنگيان لىَ دووردەخاتەوە ٠

**دووەم** : هەرسـكردنى خـۆراك و ، پێگەيانـدنى تێكـەڵاوەكان ، چـونكە لـە كـاتى نووسـتندا گـەرمى غـەريزى ڕۆدەچـىَ بـەرەو نـاوەڕۆكى جەستە ، ئـەوەش يارمەتيـدەرێكى باشـى ئـەو كردارانەيـە ، بۆيـە كەسـى نوسـتوو ڕوكـەش و ڕواڵـەتى دەرەوەى جەسـتەى سـارد دەبـىَ و پێويستى بە داپۆشەرى زياد دەبىَ ٠

**بەسودترين نووستن** : ئەوەيە مرۆڤ بەلاى ڕاستيدا بنوىَ ، بـەم شـێوە خـۆراك بەباشـى لـە گەدەدا جێگير دەبىَ ، چونكە گەدە كەمێك بەرەو لاى چەپ لاربۆتەوە ، پاشـان پێويسـتە مرۆڤ شێوازى نووستنەكەى بگۆڕێت و كەمێك بەلاى چەپيدا بنوىَ بۆ ئەوەى هەرسكردنەكە خێرا بێتەوە ، چـونكە گـەدە لـە جگـەر دوردەكەوێتـەوە ، قونـاغى كۆتـاش نوسـتنەكەى بەلاى ڕاستدا جێگير دەكات ، بۆ ئـەوەى خـۆراك بـەخێراى لـە گـەدە بێتـە خـوارەوە ، بـە جۆرێك نوستنى بەلاى ڕاسـتيدا سـەرەتاى نوسـتنەكەى و كۆتاكەشـى بێـت ، زۆر نوسـتنى مرۆڤـ بـەلاى چـەپدا زيـان بـە دلَ دەگەيـەنێت بـەهۆى لابونـەوەى ئەندامـەكان بەلايـداو ، بەوەش مادەكانى تىَ دەڕژێت ٠

خراپترين نوستنەكان نوستنى سەر پشتە ، بەڵام زيانى نى يە بۆ حەوانەوەو بەبىَ نوستن بەسەريدا ڕاكشێت ، لەوەش خراپتر نوستنە بە پاڵكەوتن لەسەر ڕوو ، وفي المسند وسنن ابن ماجة ، عن أبي أُمامة قال : مرَّ النبيُّ ﷺ على رجُلٍ في المسجد منبطح على وجهه ، فضرَبه برجله ، وقال : قُمْ أو أقعد فإنَّهَا نومةٌ جهَنَّمِيَّةٌ([٣٣٧])

---

[٣٣٧] ـ أخرجه ابن ماجة ( ٣٧٢٥ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف ابن ماجة ( ٨١٦ ) ٠

واته : له ( أبي أُمامة )وه _ خوای لیٚ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای پیاوێکدا تێپەڕیبوو له مزگەوتدا بەسەر ڕوویدا ڕاکشابوو ، ئەوەبوو بە پێیەکانی لێیداو فەرمووی : هەستە یاخود دانیشە چونکە نووستنێکی دۆزەخیە ٠

( أبقراطُ ) له کتێبی ( التَّقدِمة )دا دەڵێت : بەڵام نووستنی نەخۆش لە سەر سکی بەبێ ئەوەی پێشتر لە کاتی تەندروستیدا نەریتی ئەو جۆرە نووستنە بێت ، نیشانەی تێکچونی ئەقڵەو ، نیشانەی ئەوەیە کە ئازار لە لاکانی سکیدا هەیە ، ڕاڤەکارانی کتێبەکەی گوتویانە : چونکە پێچەوانەی نەریتی چاکی کردو شێوەیەکی خراپی بەکارهێنا ، بەبێ ئەوەی هیچ هۆیەکی ئاشکەرا یاخود شاراوە هەبێ ٠

نووستنی ڕێك و پێك وا لە هێزە سروشتیەکان دەکات کردەوەکانیان بەچاکی ئەنجام بدەن ، هێزە نەفسانیەکان دەحەوێنێتەوە ، گەوهەری هەڵگریان زۆر دەکات ، تا ئەو ئاستەی ڕەنگە ئەو خاوبونەوەو سست بونەوەیەی لە کاتی نووستندا بەسەریدا زاڵ دەبێ ڕێگریی لە شیبونەوەی ڕوحەکان بکات ٠ نووستنی ڕۆژ خراپەو نەخۆشیە تەڕاتیەکان و بەڵاو مەینەتی دروست دەکات ، ڕەنگی مرۆڤ دەگۆڕێت و خراپی دەکات ، هەوکردن و ئاوسانی سپڵ دروست دەکات ، دەمار خاودەکاتەوە ، تەمبەڵی دروست دەکات ، شەهوەت و ئارەزوو لاواز دەکات ، بەدەر لە نووستنی کاتی قرچەی گەرمای هاوینان ، لە هەمووشی خراپتر نووستنی سەرەتای ڕۆژە ، لەوەش خراپتر نووستنی دوای عەسرە ، پێشەوا ( عبدالله )ی کوڕی ( عباس ) _ خوا لە خۆی و بابیشی ڕازی بێت _ کوڕێکی خۆی بەدیکرد بەیانیخەو دەکات ، ئەوەبوو پێی فەرموو : هەستە ، ئایا لە کاتێکدا دەنوێی ڕۆزیەکانی تێدا دابەش دەکرێت ؟

گوتراوە : نووستنی ڕۆژ سێ جۆرە ڕەوشتی ( خُلق ) ، سوتاوی ( حُرق ) ، گێلی ( حُمق ) ٠ ڕەوشتی ( خُلق ) : نوستنی قرچەی گەرمای نیوەڕۆیە ، کە ڕەوشتی پێغەمبەری خوابوو ﷺ ٠ سوتاوی ( الحُرق ) : نووستنی چێشتەنگاوە ، کە کاروباری دونیاو ڕۆژی دوای پشت

گویَ دەخات ٠ گێلی ( الحُمق ) نوستنی کاتی عەسرە ٠ کەسانێك لە پێشین گوتویانە : هەرکەس دوای عەسر نوست و ، ئەقڵی لیَ سەندرایەوە ، با لە خۆی زیاتر سەرزەنشتی هیچ کەسی تر نەکات ٠ شاعیر دەڵێت :

أَلا إِنَّ نَوْمَـــــاتِ الضُّحى تُورِثُ الفَتَى خبالاً ونَوْمَـــــــاتِ العُصَيْرِ جُنُونُ

واتە :

ئاگاداربە نووستنی چێشتنگاو بۆ لاو خراپەو نوستنی عەسرانەش شێتیە

نوستنی بەیانیان قەدەغەی ڕۆزی دەکات ، چونکە کاتێکە بەدیهێنراوانی پەروەردگار بەدوای ڕۆزی خۆیاندا دەگەڕێن ، کە کاتی دابەشکردنی ڕۆزیەکانە ، بۆیە نووستنی ئەو کاتە بێبەشبوونە مەگەر لەبەر ڕوداوێکی کاتی یاخود زەرورەتێك ، زیانێکی زۆریش بە جەستە دەگەیەنێت ، چونکە جەستە خاو دەکاتەوەو ، پاشەڕۆکانیش خراپ دەکات ، کە پێوستە بە مەشق کردن شیی بکرێنەوە ، بۆیە لەش تێکشکان و شەکەتی و لاوازی ڕووی تیَ دەکات ٠ ئەگەر پێش پیسیکردن و جوڵانەوەو وەرزش کردن و سەرقاڵکردنی گەدە بە شتێکەوە بێت ، ئەوا نەخۆشیەکی سەختەو چەندین جۆری نەخۆشی دروست دەکات ٠

نووستنی بەر هەتاو نەخۆشی شاراوە دەوروژێنێت ، وە نوستنی مرۆڤ بەجۆرێك نیوەی لەبەر هەتاو بیَ و ، نیوەکەی دیکەشی لە سێبەردا بیَ خراپە ، وَقَدْ رَوَى أَبُو دَاوُدَ فِي " سُنَنِهِ " مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ (( إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ فِي الشَّمْسِ فَقَلَصَ عَنْهُ الظِّلّ ، فَصَارَ بَعْضُهُ فِي الشَّمْسِ وَبَعْضُهُ فِي الظِّلّ ، فَلْيَقُمْ ))([٣٣٨]) واتە : لە ( أبي هُريرة )وە _ خوای لیَ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ئەگەر کەسێکتان لە دەرەوەبوون و لەبەر سێبەرێکدا دانیشتبوو سێبەرەکەش هاتەوەیەك و کەم بۆوە تا هەندێ لە جەستەی کەوتە بەر هەتاو و هێندەکەی دیکەشی لە سێبەردا بوو ، با هەستێت و شوێنەکەی بگۆڕێت کە هەرهەمووی سێبەر بیَ یاخود هەرهەمووی هەتاو بیَ )) ٠

---

[٣٣٨] _ إسناده صحيح : أخرجه أبوداود ( ٤٨٢١ ) ، وصححه الألباني في الصحيحة ( ٨٣٧ ) ٠

وَفِي " سُنَنِ ابْنِ مَاجَهْ " وَغَيْرِهِ مِنْ حَدِيثِ بُرَيْدَةَ بْنِ الْحَصِيبِ ، أَنّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ نَهَى أَنْ يَقْعُدَ الرّجُلُ بَيْنَ الظّلّ وَالشّمْسِ([339]) .

واته : له ( بُرَيدة )ى كوڕى ( الحَصيب )ەوە _ خواى لىٚ رازى بێت _ فەرموويەتى : پێغەمبەرى خوا ﷺ قەدەغەى كردووە پياو لە نێوان سێبەرو هەتاودا دانيشێت ٠ ئەمە ئاگاداركردنەوەمانە بە نەنوستن لەو نێوانەدا ٠

وَفِي " الصّحِيحَيْنِ " عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ، أَنّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ قَالَ : (( إذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ فَتَوَضّأْ وُضُوءَك لِلصّلَاةِ ، ثُمّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقّكَ الْأَيْمَنِ ، ثُمّ قُلْ : اللّهُمّ إنّي أَسْلَمْتُ نَفْسِي إلَيْك ، وَوَجّهْتُ وَجْهِي إلَيْك ، وَفَوّضْتُ أَمْرِي إلَيْك ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إلَيْك ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إلَيْك ، لَا مَلْجَأَ وَلَا مَنْجَا مِنْك إلّا إلَيْك ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الّذِي أَنْزَلْت ، وَنَبِيّكَ الّذِي أَرْسَلْت ، وَاجْعَلْهُنّ آخِرَ كَلَامِك ، فَإِنْ مُتّ مِنْ لَيْلَتِك ، مُتّ عَلَى الْفِطْرَةِ ))([340]).

واته : له ( البرَاء )ى كوڕى ( عَازِب )ەوە _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى: (( هەركات ويستت بچيتە سەر نوێنەكەت دەستنوێژ بگرە وەكو چۆن بۆ نوێژكردن دەستنوێژ دەگرى ، پاشان بەلاى ڕاستتدا ڕاكشىٚ و ، بڵىٚ : پەروەردگارا من نەفسى خۆمم دايە دەستى تۆ ، ڕووم كردە تۆ ، پشتم بەست بەتۆ ، پشت و پەنام دا بە تۆ ، بە ئومێدى بەزەيى تۆ و ترسان لە تۆ ، هيچ حەشارگەو شوێنى ڕزگاربونێك نى يە مەگەر بۆ لاى تۆ ، بڕوام هێنا بەو كتێبەت كە داتبەزاندووە ، بەو پێغەمبەرەى كە ناردوتە ، با ئەمانە دواهەمين گوفتارەكانى بێت ، ئەگەر لەو شەوەتدا بمريت لەسەر فيترەت و سروشتى پاك دەمريت ٠

---

[339] _ صحيح : أخرجه ابن ماجة ( ٣٧٢٢ ) عن ابن بريدة عن بريدة فذكره ٠

[340] _ صحيح : أخرجه البخاري ( ١ / ٧١ ) ، ( ٨ / ٨٤ ) ، ومسلم ( ٨ / ٧٧ ) كلاهما عن سعد بن عبيدة عن البراء فذكره ٠

وَفِي " صَحِيحِ الْبُخَارِيّ " عَنْ عَائِشَةَ أَنّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ كَانَ إذَا صَلّى رَكْعَتَيْ الْفَجْرِ – يَعْنِي سُنّتَهَا – اضْطَجَعَ عَلَى شِقّهِ الْأَيْمَنِ([341]).

واته : خاتوو ( عائشة ) _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموویەتى : پێغەمبەرى خوا ﷺ ئەگەر دوو ڕكاتە سوونەتەكەى نوێژى بەیانى بكردایە بەلاى ڕاستیدا ڕادەكشا ٠

گوتراوە : دانایى نووستن بەلاى ڕاستدا ، بۆ ئەوەیە كەسى نووستو نوقمى نووستنەكە نەبىٚ ، چونكە دڵ بەلاى چەپدا لار بۆتەوە ، ئەگەر مرۆڤـ بەلاى ڕاستیدا نووست ، دڵ داواى جێگە ئارامگەكەى خۆى دەكات كە لاى چەپە ، ئەم باروحاڵە قەدەغەى جێگیربوونى كەسى نووستوو دەكات و ، ناهێڵێت نووستنەكەى قورس بىٚ ، بە پێچەوانەى هێمن بوونەوەى دڵ لە نووستندا ، كە كاتىٚ بە لاى چەپدا دەنوىٚ ، چونكە ئارامگەى خۆیەتى ، بەوەش لە حەوانەوەو پشویەكى تەواودا دەبىٚ و ، مرۆڤیش نقومى نووستن دەبىٚ و ، قورس دەبىٚ و ، ئیتر بەرژەوەندیەكانى دونیاو ڕۆژى لە دەست دەچێت ٠

## سوودەكانى نزاكردنى پێش نووستن :

لەبەر ئەوەى نووستن لە پایەى مردندایەو ، براى مردنەو لەبەر ئەمەشە كە خواى تعالى نانوێت و ، خەڵكانى بەهەشتیش تیایدا نانوون ، بۆیە كەسى نووستوو پێویستى بە كەسانى تره پاسەوانیى بكەن و ، بیپارێزن لەو بەڵاو كارەساتانەى تووشى دەبن و ، پاسەوانى جەستەشى بكات لەو بەڵایانەى كە بەشەو ڕووى تێدەكەن و ، بە تەنها پەروەردگارى و بەدیهێنەرى ئەو كارەى گرتۆتە ئەستۆ ، بۆیە پێغەمبەرى خوا ﷺ كەسى نووستووى فێركردووە ، كەوا ووشەكانى كاروبار سپاردن بەخواى تعالى و ، پەنابردن بەخواى تعالى و ، ئومێدو ترس ( الرغبة والرهبة ) بڵێین ، بۆ ئەوەى بە تەواوى پاراستن و ، پاسەوانى خواى

[341] _ صحيح : أخرجه البخاري ( ١ / ١٦١ ) ، ( ٢ / ٦٩ ) عن عروة عن عائشة ٠

پەروەردگار بۆ نەفس و جەستەی پێ ئامادەبکات ، لە گەڵ ئەوەشدا ڕێنمایی کردوون بۆ ئەوەی باوەڕ بیری خۆیان بخەنەوەو ، لە سەر ئەوە بنوون ، گوتنی ئەو باوەڕەش بکەن بە کۆتا قسەکانیان ، چونکە لەوانەیە خوای تعالى لە نووستنەکەیاندا بیانمرێنێت ، ئەگەر باوەڕ کۆتا قسەکانیان بێ دەچنە بەهەشتەوە ، کەوابوو ئەم ڕێبازەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرژەوەندیەکانی دڵ و جەستەو ڕوح لە کاتی نووستن و بەئاگابون و ، دونیاو دوارۆژیشدا لە خۆدەگرێت ، بۆیە _ الصلاة و السلام _ لە سەر ئەو کەسە بێت کە بوبە هۆی ئەوەی ئومەتەکەی هەموو خێرێکیان دەستگیر بێت ·

فەرمایشتی : ( أسلمتُ نفسي إليكَ ) ، واتە : نەفسی خۆمم سپاردۆتە دەستی تۆ ، بەهاوشێوەی کویلەیەك کە نەفسی خۆی دەسپێرێتە دەستی خاوەن و گەورەکەی ·

فەرمایشتی : ( وَجّهْتَ وَجهي إليك ) ، واتە : بەتەواوی ڕووم کردۆتە پەروەردگارم و ، بەدڵسۆزیەوە مەبەست و ویستی خۆمم ڕوو تێکردووە ، دان بە بە ملکەچی و سەرشۆڕی و خۆبەدەستەوەدانمدا دەنێم ، خوای تعالى دەفەرمێت : ﴿ فَإِنْ حَاجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ اتَّبَعَنِ ﴾[ آل عمران : ٢٠ ] واتە : ﴿ فَإِنْ حَاجُّوكَ ﴾ ئینجا ئەگەر ( خاوەن نامەکان ) دەمەقاڵێ یان لە گەڵ کردیت ﴿ فَقُلْ ﴾ ( ئەی محمد ﷺ تۆش بڵێ ) ﴿ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلَّهِ ﴾ ڕووی خۆمم سپارد بەخوا ( مکەچی ئەوم ) ﴿ وَمَنِ اتَّبَعَنِ ﴾ لە گەڵ ئەوانەی پەیڕەوەی من دەکەن[٢٤٢]· لێرەدا کە باسی ڕوو دەکات لەبەر ئەوەیە کە بەڕێزترین ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤەو ، کۆجێی هەموو هەستەکانیشە ، هەروەها مانای ڕووتێکردن و مەبەستبوونی کردەوەکانی تێدایە ، بە بەڵگەی ئەم دێرە شیعرە :

---

[٢٤٢] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ·

أســــــــــتَغْفِرُ اللهَ ذَنباً لَســــــــــــتُ مُحْصِــــــــــــيَهُ
رَبَّ العِـــــبادِ إلَيْهِ الوَجْــــــــــهُ والعَمَــــــلُ

واته :

داوای لێخۆشبوون له پەروەردگار دەکەم سەبارەت بە تاوانگەلێك كه نەمژماردووه
پەروەردگاری بەندەکان کە کردەوەو ڕووتێکردن تەنها بۆ لای ئەوە

فەرمایشتی : ( فَوَّضتُ أمري إليكَ ) : واتــه : هــەموو كاروبارەكــانم گەڕاندۆتــەوە بــۆ خــوای تعــالی ، ئەمــە وا لــە مرۆڤــ دەكــات كــە دڵنیــابونێكی تــەواوی بــۆ دروســت بــێ و ، هێمنــی و هێوربونەوە ڕوو لە دڵی بكات و ، ڕازی بێت بەوەی خوای تعـالی بـۆی هەڵیدەبـژێرێت و بڕیـاری لە سەر دەدات ، لەوانەی كە خوشی دەویَ و پێی ڕازیە ، كاروبار گەڕاندنـەوە بـۆ خـوای تعـالی بەڕێزترین پایەكانی بەندایەتیەو ، هیچ زەدەیەكی تێدا نی یە ، ئەمـە لـە پایـە تایبەتەكانـە بـە پێچەوانەی بیروڕای ئەو كەسانەوە كە بۆچونێكی پێچەوانەی ئەمەیان هەیە

فەرمایشتی : ( ألجأت ظهري إليك ) : واته : زۆر بە بەهێز پشتم بەخوای تعالی بەسـتووەو ، متمانــەم پێكـردوەو ، لێــی دڵنیــام ، چــونكە ئــەو كەســەی دیــوارێكی قــایم و جــێگیر دەكاتــە پاڵپشتی خۆی ، چیتر لە كەوتن ناترسێت ٠

لەبەر ئەوەی دڵ دوو هێزی تێدایە : هێزی داواكردن ، كە بریتیە لـە ئومێـدبوون ، وە هێـزی هەڵهاتن ، كە بریتیە لە ترس ، بەندەش داوای بەرژەوەندیەكانی دەكـات و ، لـە زیانكارەكـانی هەڵدێت ، بۆیـە هــەردوو شـتەكەی لـە كاروبـاری خـۆ سـپاردن بـەخوای تعـالی و ڕووتێكردنیـدا كۆكردتەوە ، دەڵێت : بە ئومێدی بەزەی تۆ و لە ترسی تۆدا ٠

پاشان ستایشی پەروەردگاری دەكات ، بـەوەی بەنـدە هـیچ پـەناو حەشـارگەیەكی نـی یـە مەگەر ئەو زاتە ، هیچ شوێنێكی ڕزگاربوونیشی لەو زاتە نی یە " مەگەر خودی پەنای ئەو زاتـە ، چونكە بەندە لە پەنای ئەو زاتەدا خۆی حەشار دەدات ، بۆ ئـەوەی نەفسـی لـە خـودی ئـەو

زاته رزگار بكات ، وەكو ئەوەی لە فەرموودەكەی دیكەدا بە ئاشكەرا هاتووە : أعوذُ برِضَاكَ مِن سَخَطِكَ ، وبمُعَافَاتكَ من عُقُوبَتِكَ ، وأعوذُ بِكَ مِنْكَ([٣٤٣]) واتە : پەروەرگارا پەنا دەگرم بە ڕەزابونت لە خەشم و توڕەبونت ، پەنادەگرم بە لێبوردەیت لە سزادانت ، وە پەنادەگرم بە تۆ لە تۆ . هەر خوای تعالایە پەنای بەندەكەی دەدا ، وە لەو مەترسی و زیانەی كە بە ویست و چارەنوسی خۆیەتی " رزگاری دەكات ، بۆیە بەڵا لە خواوەیە ، یارمەتیدانیش هەر لە خواوەیە ، هەر لە خۆشی داوای ڕزگاربوون لە خودی خۆی دەكرێت ، بۆ ڕزگاربوون پەنا بۆ خودی خۆی دەبرێت ، چونكە هەر خۆیەتی كە دەكرێتە پاڵپشت بۆ ڕزگاربوون لەو بەڵاو خەشم و توڕەبونەی لە لایەن خودی خۆیەوە دروست دەبێ ، وە پەنای پێ دەگیرێت لەوانەی لە لایەن خۆیەوە دروست دەبێ ، چونكە پەروەردگاری هەموو شتێك هەر خۆیەتی و ، هیچ شتێكیش بەبێ ویستی ئەو نابێت ، خوای تعالی دەفەرمێت : ﴿ وَإِنْ يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلا كَاشِفَ لَهُ إِلا هُوَ ﴾[ الأنعام : ١٧ ] واتە : ﴿ وَإِنْ يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ ﴾ وە ئەگەر خوا دووچاری بەڵاو زیانی كردیت ﴿ فَلا كَاشِفَ لَهُ إِلا هُوَ ﴾ ئەوە جگە ئەو ( خوا ) كەس نی یە بتوانێ لایبات([٣٤٤]) ، هەروەها دەفەمێت : ﴿ قُلْ مَنْ ذَا الَّذِي يَعْصِمُكُمْ مِنَ اللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوءًا أَوْ أَرَادَ ﴾[ الأحزاب : ١٧ ] واتە : ﴿ قُلْ مَنْ ذَا الَّذِي يَعْصِمُكُمْ مِنَ اللَّهِ ﴾ بڵێ كێ یە ئەو كەسەی ئێوە لە خوا دەپارێزێ ﴿ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوءًا أَوْ أَرَادَ ﴾ ئەگەر خوا زیان و خراپە یا بەزەیی و ڕەحەتی بۆ ئێوە بوێ ([٣٤٥]) .

پاشان نزاكە تەواو دەكات بە دان پێدانان بە قورئان و پێغەمبەرەكەی كە هۆكاری ڕزگاربوون و ، سەركەوتنی دونیاو دواڕۆژیشە ، ئەمەبوو ڕێبازی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ لە نووستنیدا .

---

[٣٤٣] ـ أخرجه مسلم ( ٤٨٦ ) .

[٣٤٤] ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان .

[٣٤٥] ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان .

لَوْ لَمْ يَقُلْ إِنِّي رَسُولٌ لَكانَ شَاهِدٌ فِي هَدْيِهِ يَنْطِقُا

واته :

ئەگەر نەشیگوتبا من پێغەمبەرم ئەوا بە ڕێبازەکانی شایەتی ئەوەی دەداو دەریدەبڕی

## بەشێك سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی بە ئاگابوندا

بەڵام بۆ ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی بە ئاگابونیدا ، ئەوەبوو بەیانیان لە گەڵ قوقاندنی کەڵەشێردا خەبەری دەبۆوە ، سپاست و ستایشی خوای تعالای دەکردوو ( الله أكبر )ی دەکردو ، ( لا إله إلا الله ) دەکردو داوای لێ دەکردو ، پاشان سیواکی دەکردو ، ئینجا دەستنوێژی دەگرت و ، لە پێش دەستی پەروەردگاریدا دەوەستا بۆ نوێژکردن ، بە گوتەکانی ڕازونیازی ( مناجاة ) لە گەڵ پەروەردگاریدا دەکرد ، ستایش و پیاهەڵدانی دەکرد ، داخوازی لێ دەکرد ، بەئومێدی بەزەی پەروەردگاری بوو ، لێی دەترسا ، کەوابوو چ پاراستنێکی تەندروستی دڵ و جەستەو ، ڕوح و هێزەکان و ، نیعمەتەکانی دونیاو دواڕۆژ لەمە چاکتربێ و لە سەرووی ئەم ڕێبازەوە بێ .

## بەشێك سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە وەرزش کردندا

بەڵام بۆ چارەسازیی جوڵانەوەو سرەوتن ، کە بریتیە لە وەرزش ، بەشێکی لێ باس دەکەین ، لە میانەی ئەوەدا بۆت ئاشکرا دەبێ کە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لەم بوارەدا گونجاوی تەواوترین جۆرکانیی و باشترین و ڕاسترینیانە ، بۆیە دەڵێین :

زانراوە جەستە بۆ ئەوەی بمێنێتەوە پێویستی بە خواردن و خواردنەوەیە ، خۆراکیش بەگشتی نابێتە بەشێك لە جەستە ، بەڵکو پاش هەرس کردن پێویستە بەشێکی هەر

بمێنێتەوە ، بە تێپەڕبوونی زەمەن ئەگەر ئەو خۆراکە زۆربوو ، ئەوا بەشێکی کۆدەبێتەوەو هێندو چۆنیەتی پەیدادەکات ، بە هێندە زۆرەکەی زیان دەگەیەنێت ، لەبەر ئەوەی کونیلە دادەخات و جەستە قورس دەکات و ، بەمەش نەخۆشیەکانی گیران و قەبزبوون ڕوودەدات ، ئەگەر دەرهاوێشتنیشی بۆ بکرێت ، ئەوا جەستە زیانی پێ دەگات بەهۆی ئەو دەرمانانەوە کە لەم بوارەدا بەکاردێن ، چونکە زۆربەی ژەهریە ، هەروەها بەشێك لە شتە چاکە سوودارەکانیش دەکاتە دەرەوە ، بەچۆنیەتیەکەشی زیان دەگەیەنێت ، بەوەی بەخودی خۆی گەرم دەکات ، یاخود بە گەنین ، یاخود بەخودی خۆی سارد دەکات ، یاخود گەرمی غەریزی لاواز دەکات و ئیتر لە پێگەیاندنی ئەو مادانەدا بەشدار نابێ ٠

ئەو کونیلە داخراوانەی بەهۆی پاشەڕۆوە پەیدا دەبن بەدڵنیایی زیانبەخشە ، واز لەو پاشەڕۆیانە بهێنرێت یاخود دەرهاوێشتنی بۆ بکرێت ، جوڵانەوەش بەهێزترین هۆیەکانی ڕێگرتنە لە دروستبوونی ، چونکە ئەندامەکان گەرم دەکات ، پاشەڕۆکانی دەتوێنێتەوەو بەڕێیان دەخات و ، چیتر بەتێپەڕبوونی زەمەن کۆنابنەوەو ، بەوەش سووکی و چابوگی و چالاکی بۆ جەستە دەگەڕێتەوە ، وای لێدەکات خواردن قبوڵ بکات ، جومگەکان پتەو دەکات ، ژێ و دەمارو بەستەرەکان بەهێز دەکات ، هەموو نەخۆشیە مادیەکان و زۆربەی نەخۆشیە میزاجیەکان ناهێڵێت " ئەگەر لە کاتی خۆیداو بە ئەندازەیەکی مام ناوەند بەکارهات و ، ئەو چارەسازیەکانی دیکەش ڕاست و دروست بوون ٠

کاتی وەرزش کردن پاش لێژبونەوەی خۆراکەو ، پاش ئەوەی خۆراك بەتەواوی هەرس دەبێت ، وەرزش کردنی مامناوەند ، ئەو وەرزشکردنەیە کە پێستی تێدا سوور بێتەوەو ، جەستە کەمێك شێدار بێت ، بەڵام ئەو وەرزشەی کە ئارەقەیەکی زۆری لە گەڵدا دەکرێ " ئەوە لە ڕادەبەدەرە ، هەر ئەندامێکیش وەرزش پێکردنی زۆربوو بەهێز دەبێ " بەتایبەت لە سەر جۆری ئەو وەرزشە ، بەڵکو هەموو هێزێك ئاوەهایە ، بۆیە هەرکەس زۆر لەبەر بکات توانای لەبەرکردنی زانستەکانی بەهێز دەبێ ، هەرکەس زۆر بیری خستەکار بۆ چارەسەری

گيروگرفتەكان ئەوا تواناى بيركردنەوەى بەهێز دەبێ ، هەموو ئەندامێكيش وەرزشێكى هەيە بەخۆيەوە تايبەتەكراوە ، بۆيە سنگ خوێندنى هەيە ، با سەرەتا بەچاو بيخوێنێتەوەو پاشان كەم كەم بەرزبێتەوە بۆ خوێندنەوە بە دەنگى بەرز ، وەرزشى بيستن بە بيستنى دەنگەكانە ، قسەكردن پلە بە پلە ، لە سوكەوە بچێت بۆ قورستر ، هەروەها وەرزشى زمان لە قسەكردندايە ، هەروەها وەرزشى چاو ، هەروەها وەرزشى ڕێكردن پلە بە پلەو كەم كەم ٠

بەڵام سوارى ئەسپ و ، تيرهاوێشتن و ، زۆرانبازى ، پێشبڕكێ كردن لە سەر پێ ، وەرزشێكە بۆ هەموو جەستە ، كە ڕيشەكێشەرى هەموو نەخۆشيە درێژخايەنەكانە ، وەكو گولیی و ئاوبەنگ و ( القولنج ) ٠

وەرزشى نەفس بە فێربوون و ئەدەب وەرگرتن و ، دڵخۆشى و شادومانى و ، ئارامگرتن و خۆڕاگرى و ، ئازايەتى و سنگ فراوانى و ميهرەبانى و ، ئەنجامدانى كردەوەى خەيرو ، بەو هاوشێوانەيە كە نەفسى پێ ڕادێت و هۆگر دەبێ ، بەڵام گەورەترين وەرزشەكانى : ئارامگرتن و خۆشەويستى و ، ئازايەتى و چاكەكردن وجواميريە ، بە هۆى ئەم وەرزشانەوە بەردەوام ڕادێت و هۆگردەبێ " تا ئەو سيفاتانەى تێدا دەبێ بە شێوازێكى قايم و ، خوونەرێتێكى جێگير ٠

ئەگەر لەم بارەوە ديقەتى ڕێبازى پێغەمبەرى خوا ﷺ بدەيت ، بۆت دەردەكەوێت كە تەواوترين ڕێبازەو تەندروستى و هێزەكان دەپارێزێت و ، بۆ پەيداكردنى بژێوى و پاداشتەكانى ڕۆژى دوايش بە سوودە ٠

گومانى تێدا نى يە كە خودى نوێژ هۆكارێكى بەهێزە بۆ پاراستنى تەندروستى جەستەو ، توانەوەى تێكەڵاو پاشەڕۆكانى مرۆڤ و، سودێكى زۆرى پێ دەگەيەنێت سەرەڕاى ئەوەى كە تەندروستى ئيمان و باوەڕ دەپارێزێت و ، هۆكارى كامەرانيشە لە دونياو ڕۆژى دوايدا ، هەروەها شەونوێژ بەسوودترين هۆكارەكانى پاراستنى تەندروستيە ، لە هەموو شتێكيش

زیاتر قەدەغەی نەخۆشیە درێژخایەنەکان دەکات ، لە هەموو شتێکیش زیاتر جەستەو خوێن و ڕوح و دڵ چالاك دەکاتەوە كَمَا فِي " الصَّحِيحَيْنِ " عَنْ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ : (( يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ إِذَا هُوَ نَامَ ثَلَاثَ عُقَدٍ ، يَضْرِبُ عَلَى كُلِّ عُقْدَةٍ : عَلَيْكَ لَيْلٌ طَوِيلٌ ، فَارْقُدْ ، فَإِنْ هُوَ اسْتَيْقَظَ ، فَذَكَرَ اللَّهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ ، فَإِنْ تَوَضَّأَ ، انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ ثَانِيَةٌ ، فَإِنْ صَلَّى انْحَلَّتْ عُقَدُهُ كُلُّهَا ، فَأَصْبَحَ نَشِيطًا طَيِّبَ النَّفْسِ ، وَإِلَّا أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلَانَ ))([٢٤٦])

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( شەیتان سێ گرێ دەبەستێتە پشتی سەری هەرکەسێکتانەوە ئەگەر نووست ، هەر گرێیەك قایم دەکات و لێی دڵنیا دەبێ بە گووتنی : هێشتا شەو درێژە ، بنوو ، ئەگەر ئەو کەسە بەئاگاهاتەوەو ، ناوی خوای هێنا گرێیەکیان دەکرێتەوە ، ئەگەر دەستنوێژی گرت ، گرێی دووەم دەکرێتەوە ، ئەگەر نوێژی کرد ئەوا هەموو گرێکان دەکرێنەوە ، بەیانیش چالاك و دەروون ئاسودە دەبێ ، ئەگەر ئەوە ئەنجام نەدات بەیانی پەست و خەمبار دەبێت و سەرزەنشتی خۆی دەکات ۰

ڕۆژووگرتنی شەرعی لە هۆکارەکانی پاراستنی تەندروستی و وەرزشی جەستەیی و نەفسی یە ، کە فیترەتی دروست " نکۆڵیی لێ ناکات ۰

بەڵام تێکۆشان لە پێناوی خواداو ئەو جوڵانەوە گشتیانەی کە تیایدایە " لە گەورەترین هۆیەکانی پاراستنی هێزو ، پاراستنی تەندروستی و ، تۆکمەیی دڵ و جەستەو ، دەرهاوێشتنی پاشەڕۆکانێتی ، هەروەها خەم و خەفەت و دڵتەنگی لادەبات ، کارێکی بەسوودە لە ڕاستیدا تەنها ئەو کەسانە دەیزانن کە تیایدا بەشدار دەبن ، هەروەها حەج و ، بەجێهێنانی ڕێ وڕەسمەکانی و ، پێشبڕکێ کردنی ئەسپ سواری و ، ڕم هاوێشتن و ، ڕێکردن بۆ بەجێهێنانی پێویستیەکان و ، بۆ دیدەنی برایان و ، بەجێهێنانی مافەکانیان و ، سەردانی

---

[٢٤٦] _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ٣ / ١٩ ، ٢٢ ) ، ومسلم ( ٧٧٦ ) ۰

نەخۆشەکانیان و ، بەڕێکردنی مردووەکانیان و ، ڕێکردن بۆ مزگەوت بۆ بەجێهێنانی نوێژە فەرزەکان و نوێژی هەینی و ، جوڵانەوەکانی دەستنوێژگرتن و خۆشتن و ، هتد..

ئەمە کەمترین ئەو شتانەیە کە هەر وەرزشێکی دیاریکراو تیایدا بەشدار دەبێ لە پاراستنی تەندروستی و ، دەرهاوێشتنی پاشەڕۆکاندا ، بەڵام ئەوەی شەرع لەم بوارەدا بە شیاوی داناوە " بۆ ئەوەی مرۆڤ پێی بگات بە خێری دونیاو ڕۆژی دوای و ، دورخستنەوەی شەڕو خراپەکانی ، شتێکی ترە .

لێرەدا بۆت دەردەکەوێت کە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بواری پزیشکێتی جەستەو دڵ و ، پاراستنی تەندروستی و ، دورخستنەوەی نەخۆشیەکانیدا " بە سەر هەموو ڕێبازەکانی دیکەوەیە ، لەمە زیاتر ناخەیەنە ڕوو " بۆ ئەو کەسانەی بەڕاستی ئەقڵ و ژیریان ئامادەیە . وبالله التوفيق .

## بەشێك : سەبارەت بە جووتبونی خێزان و ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لەم بارەوە :

سەبارەت بە جووتبونی خێزان ، ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لەم بارەوە تەواوترین وبێ کەم و کوڕیترین ڕێبازەکانە ، تەندروستی پێ دەپارێزرێت ، بەلەزەتی و شادومانی نەفسی پێ تەواو دەبێ ، ئەو مەبەستانەی لە پێناویدا دانراوە پێی بەدەست دەهێنرێن ، چونکە جووتبونی خێزان لە بنەڕەتدا بۆ سێ شت دانراوە کە بریتین لە مەبەستەکانی :

یەکەم : پاراستنی وەچەو ، بەردەوامبوونی جۆر " تا تەواوبونی ئەو ژمارەیەی کە خوای تعالى نوسیویەتی لەم جێهانەدا دەرکەوێت .

دووەم : دەرهێنانی ئەو ئاوەی کە ڕاگیرکردن و تێزانی زیان بە هەموو جەستە دەگەیەنێت

سىٰ يەم : بەجێهێنانى حەزوئارەزوو ، دەستكەوتنى لـەزەت و ، ڕابواردن بـە نيعمەتـەوە ، لە بەهشتدا تەنها ئەم خاڵە كارايەو سودى لىٰ دەبينرێت ، چونكە لەوىٰ وچە خستنەوە نـى يـە ، هيچ ئاو تێزانێكيش نى يە تا بە ئاو دابەزين بكرێتە دەرەوە ٠

## جووتبوون لەو هۆيانەيە كە تەندروستى دەپارێزێت :

بەڕێزانى پزيشكان : وا دەبينن كە جووتبوون يەكێكە لە هۆيەكانى پاراستنى تەندروسـتى ٠ ( جالينوس ) دەڵێت : ئاگرو هەوا بەسەر گەوهـەرى تۆمـاوى نێرينـەدا زاڵـە ، ميزاجـى گـەرمى تەڕە ، چونكە لە خوێنى پاك و پوختە ، كە خۆراكى ئەندامە بنەڕەتيەكانە ، لێرەدا كە فـەزڵى تۆمـاوى نيرينـەت بـۆ ڕوون بويـەوە ، دەبىٰ بزانيـت كـە پێويسـتە دەرنـەهێنرێت " مەگـەر بـۆ ئەوەى وەچەى پىٰ بە دەست بهێنرێت ، يا بۆ دەرهێنانى ئـاوى تێـزراو كۆبـۆوە ، چـونكە ئـەو تۆماوە ئەگەر تێزان و كۆبونەوەى بەردەوام بىٰ ، چـەندين نەخۆشـى خـراپ دروسـت دەكـات ، وەكو : وەسواس و شێتى و پەركەم و ، هتد٠٠

لەوانەيە زۆر جار بەكارهێنانى جووتبوون زۆرێك لەو نەخۆشيانە چارەسـەر بكـات ، چـونكە ئەگەر ماوەيەكى درێژ تۆماوەكە ڕاگيرێت ، خراپ دەبىٰ و دەگۆڕێت بۆ چۆنيەتيەكى ژەهـرين ، كە دەبێت بەهۆى دروستبوونى چەندين نەخۆشى خراپ وەكـو ئامـاژەمـان پێـدا ، بۆيـە ئەگـەر زۆر بوو " ئەوا سروشتى مرۆڤ بە لە خەودا ئاو هاتنەوە ( الأحتلام ) دەيكاتـە دەرەوە " بـەبىٰ جووت بوون ٠

كەسانێكى پێشين گوتويانە : پێويستە مرۆڤ لە نەفسى خۆيـەوە پـەيمان بـدات " كـە سـىٰ شت بە ئەنجام بگەيەنێت : واز لە ڕێكردن نەهێنێت ، بـۆ ئـەوەى ئەگـەر ڕۆژێك پێويسـتى پـىٰ بێت بتوانێت ئەنجامى بدات ، واز لە خواردن نەهێنێت ، چونكە ڕيخۆڵەكانى تەسـك دەبنـەوە ، واز لە جووتبوون نەهێنێت ، چونكە ئەگەر بـير دەرنـەدرێت ولـە قـوڕو ليتـە پـاك نەكرێتـەوە ، ئاوەكەى نامێنێت ٠

( محمد )ى كورِى ( زكريا ) دەڵێت : هەركەس ماوەيەكى درێژ واز لە جووتبوون بهێنێت ، هێزى دەمارەكانى لاواز دەبێ و ، ڕێرەوكانى دەگيرێت و ، ئەندامى زاوزێشى كرژدەبێتەوە . دەڵێت : كەسانێكم بينى وازيان لە جووتبوون هێنا وەكو جۆرێك لە بەتەنگ دونياوە نەهاتن ، ئەوەبوو جەستەيان سارد بۆوە ، جوڵانەوەيان سەخت و ناڕەحەت بوو ، دڵتەنگى وبێزاريەك ڕووى تێكردن بەبێ هيچ هۆيەك ، ئارەزوو شەهوەت و هەرسكردنيشيان كەم بۆوە . قسەكانى تەواو بوو .

لە سوودەكانى : چاو دانواندن ، نەفس پارێزى ، تواناى داوێن پاكى و دوركەوتنەوە لە حەرام و ، هەموو ئەوانە لە خێزانى خۆيدا ئەنجام بدات ، بەو هۆيەوە مرۆڤ سوود بە نەفسى خۆى دەبەخشێت " لە دونياو ڕۆژى دوايداو ، سووديش بە ژن دەگەيەنێت ، بۆيە پێغەمبەرى خوا _ صلى الله عليه وسلم _ بايەخى پێ دەداو خۆشى دەويست و ، دەيفەرموو : (( حُبِّبَ إلَيَّ مِن دُنْيَاكُمْ : النِّسَاءُ والطِّيبُ ))([٣٤٧]) واتە : (( لە دونياكەى ئێوەدا دوو شتم بەلاوە خۆشەويست كراوە : ژنان و بۆنى خۆش )) .

لە كتێبى ( الزهد )ى ئيمامى ( أحمد )دا زيادەيەكى ناسك لەم فەرموودەيەدا هاتووە ، بريتيە لە : ئارام دەگرم بەرامبەر بە خواردن و خوارنەوەو ، ئارام ناگرم بەرامبەر بە ژنان .

هانى ئومەتەكەشى داوە بۆ زەواج كردن و، دەيفەرموو : (( تَزَوَّجُوا ، فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمْ الْأُمَمَ ))([٣٤٨]) واتە : (( زەواج بكەن ، چونكە من شانازى بە زۆرى ژمارەتانەوە دەكەم بەرامبەر بە ئومەتانى ديكە )) .

پێشەوا ( ابن عباس ) _ خواى لە خۆى وباوكيشى ڕازى بێت _ فەرموويەتى : خێردارترين و چاكترين كەسى ئەم ئومەتە ئەو كەسەيە كە زۆرترين ژنى هەبێت .

---

[٣٤٧] _ إسناده صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ٢٨٥ ) ، وصححه الألباني في صحيح الجامع ( ٣١٢٤ ) .

[٣٤٨] _ إسناده حسن : أخرجه أبوداود ( ٢٠٥٠ ) ، وانظر الصحيحة ( ١٧٨٢ ) .

وَقَالَ رسولُ اللهِ ﷺ (( إنّي أتَزَوّجُ النّسَاءَ ، وَأنَامُ وَأقُومُ ، وَأصُومُ وَأُفْطِرُ ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنّتِي فَلَيْسَ مِنّي ))([349]).

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( من ژن دەخوازم ، دەنووم و هەڵیشدەستم بۆ شەو نوێژ ، ڕۆژوو دەگرم و دەشیشکێنم ، هەرکەس پشت لە سوونەتی من هەڵ بکات ، لە ئومەتی من نی یە )) .

وَقَالَ رسولُ اللهِ ﷺ: (( يَا مَعْشَرَ الشّبَابِ مَنْ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوّجْ ، فَإنّهُ أغَضّ لِلْبَصَرِ وَأحْفَظُ لِلْفَرْجِ ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ ، فَعَلَيْهِ بِالصّوْمِ ، فَإنّهُ لَهُ وِجَاءٌ ))([350]).

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ئەی کۆمەڵی لاوان ، هەرکەس لە ئێوە توانای هەبوو با ژن بێنێت ، چونکە چاکترین هۆکاری چاو دانواندن و داوێن پارێزی یە ، هەرکەسیش ناتوانێت ، با ڕۆژوو بگرێت ، چونکە بۆی دەبێ بە قەڵغان )) .

وَلَمّا تَزَوّجَ جَابِرٌ ثَيّبًا قَالَ لَهُ : (( هَلّا بِكْرًا تُلَاعِبُهَا وَتُلَاعِبُكَ ))([351]) .

واتە : کاتێ ( جابر ) _ خوای لە خۆی وبابیشی ڕازی بێت _ بێوەژنێکی خواست پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو : (( ئەی نەدکرا کچێك بێت گەمەت لە گەڵ بکردایەو ، گەمەی لە گەڵ بکردیتایە )) .

---

[349] _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٧ / ٢ ) ، ومسلم ( ٤ / ١٢٩ ) عن أنس .

[350] _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٣ / ٣٤ ) ، ( ٧ / ٣ ) ، ومسلم ( ٤ / ١٢٨ ) كلاهما عن حديث علقمة عن ابن مسعود .

[351] _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٣ / ٨١ ) ، ومسلم ( ٢ / ١٥٦ ) ، ( ٤ / ١٧٦ ) كلاهما من حديث وهب بن كيسان عن جابر بن عبدالله .

وَرَوَى ابْنُ مَاجَهْ فِي " سُنَنِهِ " : مِنْ حَدِيثِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ (( مَنْ أَرَادَ أَنْ يَلْقَى اللَّهَ طَاهِرًا مُطَهَّرًا ، فَلْيَتَزَوَّجْ الْحَرَائِر ))([٣٥٢]).

واته : له ( أنس )ى كوڕى ( مالك )هوه _ خواى لىٚ ڕازى بيٚت _ فهرموويهتى : پيٚغهمبهرى خوا ﷺ فهرمووى : (( ههركهس دهيهويٚت به پاكى و رزگاربوون له تاوانهكانى داويٚن پيسى بگهڕيٚتهوه بوٚ لاى خواى تعالى ، با ژنه ئازادهكان بخوازيٚت )) .

وَفِي " سُنَنِهِ " أَيْضًا مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عَبَّاسٍ يَرْفَعُهُ ، قَالَ : (( لَمْ نَرَ لِلْمُتَحَابَّيْنِ مِثْلَ النِّكَاحِ ))([٣٥٣]).

واته : له ( ابن عباس )هوه _ خوا له خوٚى وبابيشى ڕازى بيٚت _ فهرموويهتى : پيٚغهمبهرى خوا ﷺ فهرمووى : (( هيچ چارهسهريٚكى تر بهچاك دانانيٚين بوٚ دوو خوٚشهويست بهدهر له زهواج كردن )) .

وَفِي " صَحِيحِ مُسْلِمٍ " مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ (( الدُّنْيَا مَتَاعٌ ، وَخَيْرُ مَتَاعِ الدُّنْيَا الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ ))([٣٥٤]).

واته : له ( عبدالله )ى كوڕى ( عمر )هوه _ خواى لىٚ ڕازى بيٚت _ فهرموويهتى : پيٚغهمبهرى خوا ﷺ فهرمووى : (( دونيا خيٚرو خوٚشيه ، چاكترين خيٚروخوٚشى دونياش ژنى چاكه )) .

---

[٣٥٢] _ إسناده ضعيف : أخرجه ابن ماجة ( ١٨٦٢ ) ، وضعفه الألباني في الضعيفة ( ١٤١٧ ) .

[٣٥٣] _ صحيح : أخرجه ابن ماجة ( ١٨٤٧ ) عن طاووس عن ابن عباس فذكره مرفوعاً . وصححه الألباني في صحيح الجامع ( ٥٢٠٠ ) وانظر الصحيحة ( ٦٢٤ ) .

[٣٥٤] _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٢ / ١٦٨ ) ، وعبد بن حميد ( ٣٢٧ ) ، ومسلم ( ٤ / ١٧٨ ) ، وابن ماجة ( ١٨٥٥ ) ، والنسائي ( ٦ / ٦٩ ) كلهم عن أبي عبدالرحمن الحبلي عن عبدالله بن عمر فذكره مرفوعاً .

پێغەمبەری خوا ﷺ ئومەتەکەی هاندەدا بۆ خواستنی کچی جوانی چاك و ، ئاین پەروەر ،
وَفِي " سُنَنِ النّسَائِيّ " عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ : سُئِلَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ أيّ النّسَاءِ خَيْرٌ ؟ قَالَ : (( الّتِي تَسُرّهُ إِذَا نَظَرَ ، وَتُطِيعُهُ إِذَا أَمَرَ ، وَلَا تُخَالِفُهُ فِيمَا يَكْرَهُ فِي نَفْسِهَا وَمَالِهِ ))([355]) .

واتە : لە ( أبي هُريرة )وە _ خوای لیّ ڕازی بێت _ فەموویەتی : لە پیغەمبەری خوایان پرسی ﷺ چ جۆرێکی ژنان خێردارو چاکن ؟ فەرمووی : (( ئەو ژنەیە کە تەماشای بکەیت دڵخۆش بیت ، گوێڕایەڵت بیّ ئەگەر فەرمانت پێکرد ، سەرپێچیت نەکات لەوەی حەزت پیّ نی یە لە نەفس و ماڵتدا )) .

وَفِي " الصّحِيحَيْنِ " عَنْهُ ، عَنْ النّبِيّ ﷺ قَالَ : (( تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِمَالِهَا ، وَلِحَسَبِهَا ، وَلِجَمَالِهَا ، وَلِدِينِهَا ، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ ))([356]) .

واتە : لە ( أبي هريرة )وە _ خوای لیّ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( بۆ چوار مەبەست ژن دەخوازرێت لەبەر ماڵ و سامانەکەی ، یاخود لەبەر بنەماڵەکەی ، یاخود لەبەر جوانیەکەی ، یاخود لەبەر ئاینەکەی ، بۆیە تۆ براوە بە خواستنی ژنی ئایندارى خواناس تا دەستت پڕ بەرەکەت بیّ )) .

پێغەمبەری هانی ئومەتەکەی دەدا بۆ خواستنی ئەو ژنانەی منداڵیان دەبیّ و ، حەزی بە خواستنی ئەو ژنانە نەبوو کە منداڵیان نابیّ ، كَمَا فِي " سُنَنِ أَبِي دَاوُدَ " عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ ، أَنّ رَجُلًا جَاءَ إِلَى النّبِيّ ﷺ فَقَالَ : إِنّي أَصَبْتُ امْرَأَةً ذَاتَ حَسَبٍ وَجَمَالٍ ، وَإِنّهَا لَا تَلِدُ ،

[355] _ إسناده صحيح : أخرجه النسائي ( ٦ / ٦٨ ) ، وصححه الألباني .

[356] _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ٩ / ١١٥ ، ١١٦ ) ، ومسلم ( ١٤٦٦ ) .

أفَأتزوّجُهَا ؟ قَالَ (( لَا )) ثُمّ أتَاهُ الثّانيَةَ ، فنَهَاهُ ، ثُمّ أتَاهُ الثّالثَةَ ، فقَالَ : (( تَزَوّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ ، فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمْ ))([٣٥٧]) .

واته : له ( مَعْقَل )ى كوڕى ( يَسَار )ەوە _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : پياوێك هاتە خزمەتى پێغەمبەرى خوا ﷺ و فەرمووى : من ژنێكى ڕەسەنى وجاخ زادەى جوانم دەستكەوتووە ، بەڵام منداڵى نابىٚ ، ئايا بيخوازم ؟ فەرمووى (( نەخێر )) پاشان بۆ جارى دووەم هاتەوە خزمەتى ، بەڵام قەدەغەى كرد ، پاشان بۆ جارى سىٚ يەم هاتەوە خزمەتى و ئەويش فەرمووى : (( ژنى ڕووخۆشى خۆش ڕەفتارى بەسك و زا بخوازن ، چونكە من شانازى بە ژمارە زۆريتانەوە دەكەم )) .

وَفِي التّرْمِذيّ عَنْهُ مَرْفُوعًا : (( أرْبَعٌ مِنْ سُنَنِ الْمُرْسَلِينَ : النّكَاحُ ، وَالسّوَاكُ ، وَالتّعَطّرُ ، وَالْحِنّاءُ ))([٣٥٨]) رُوِيَ فِي " الْجَامِعِ " بِالنّونِ وَالْيَاءِ وَسَمِعْت أبَا الْحَجّاجِ الْحَافِظَ يَقُولُ الصّوَابُ أنّهُ الْخِتَانُ وَسَقَطَتْ النّونُ مِنْ الْحَاشِيَةِ وَكَذَلِكَ رَوَاهُ الْمَحَامِلِيّ عَنْ شَيْخِ أبِي عِيسَى التّرْمِذِيّ .

واته : پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى : (( چوار شت لە سونەتى پێغەمبەرانن : ژن هێنان ، سواك كردن ، خۆ بۆنخۆش كردن ، خەنەكردن )) .

ئەو شتانەى كە پێويستە پێش جووتبوون ئەنجام بدرێت " يارى و گەمەكردن و ، ماچ كردن و ، مژينى زمانى ژنە ، ئەوەبوو پێغەمبەرى خوا ﷺ يارى و گەمەى لە گەڵ خێزانەكانى دەكردو ، ماچى دەكردن .

وروى أبوداود في سننه : أنه ﷺ كان يُقبِّلُ عائشةَ ، ويمصُّ لِسَانَها([٣٥٩]) .

[٣٥٧] _ حسن صحيح : أخرجه أبوداود ( ٢٠٥٠ ) ، والنسائي ( ٦ / ٦٥ ) كلاهما عن معاوية بن قرة عن معقل بن يسار فذكره .

[٣٥٨] _ إسناده ضعيف : أخرجه الترمذي ( ١٠٨٠ ) ، وضعفه الألباني رحمه الله .

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ ماچی ( عائشة )ی دەکردو ، زمانی دەمژی ٠

ویُذکر عن جابر بن عبدالله قال : : نَهَى رسولُ الله ﷺ عن المُواقعةِ قبلَ المُلاعَبَةِ([360]).

واته : ( جابر )ی کوڕی ( عبدالله ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی جووتبونی خێزانی کردوە پێش دەستبازی و گەمەکردن ٠

جار بە جار پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەڵ هەموو خێزانەکانیدا جووت دەبوو پاشان یەك جار خۆی دەشت ( الغُسل ) ، جار بە جاریش لای هەموو خێزانێکی خۆی دەشت

فَرَوَى مُسْلِمٌ فِي " صَحِيحِهِ " عَنْ أَنَسٍ أَنّ النّبِيّ ﷺ كَانَ يَطُوفُ عَلَى نِسَائِهِ بِغُسْلٍ وَاحِدٍ([361]) واته : لە ( أنس )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر هەموو خێزانەکانیدا دەگەڕاو یەك جار خۆی دەشت ٠

وَرَوَى أَبُو دَاوُدَ فِي " سُنَنِهِ " عَنْ أَبِي رَافِعٍ مَوْلَى رَسُولِ اللّهِ ﷺ أَنّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ طَافَ عَلَى نِسَائِهِ فِي لَيْلَةٍ ، فَاغْتَسَلَ عِنْدَ كُلّ امْرَأَةٍ مِنْهُنّ غُسْلًا ، فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللّهِ لَوْ اغْتَسَلْت غُسْلًا وَاحِدًا ، فَقَالَ : (( هَذَا أَزْكَى وَأَطْهَرُ وَأَطْيَبُ ))([362]).

واته : لە ( أبي رافع )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوێکدا بەسەر هەموو خێزانەکانیدا گەڕا ، لای هەر ژنێکیان خۆی دەشت ، منیش گووتم ئەی

---

٣٥٩ _ ضعيف : أخرجه أحمد ( ٦ / ١٢٣ ، ٢٣٤ ) ، وأبوداود ( ٢٣٨٦ ) وابن خزيمة ( ٢٠٠٣ ) كلهم عن مصدع أبي يحيى عن عائشة فذكرته ٠

٣٦٠ _ موضوع : أورده الألباني في ضعيف الجامع ( ٦٠٥٦ ) وأشار إليه بالوضع ، وانظر الضعيفة ( ٤٣٢ ) ٠

٣٦١ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ٢٢٥ ) ، ومسلم ( ١ / ١٧١ ) من طريق شعبة عن هشام بن يزيد عن أنس فذكره ٠

٣٦٢ _ إسناده حسن : أخرجه أبوداود ( ٢١٩ ) ، وحسنه الألباني في صحيح أبي داود ( ٢٠٣ ) ٠

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر یەك جار خۆت شتبا چاکتر دەبوو ، ئەویش فەرمووی : (( ئەمە پاکیزەترو خاوێنترو چاکترە )) ٠

پێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرمانی داوە بـەو کەسـەی کـە دەیـەوێ جـارێکی تـر بگەڕێتـەوە بـۆ جووتبوون پێش ئەوەی کە خۆی بشوا ، لە نێوان هەردوو جووتبونەکەدا دەستنوێژ بگرێت ٠

كَمَا رَوَى مُسْلِمٌ فِي " صَحِيحِهِ " مِنْ حَدِيثِ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ (( إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ أَهْلَهُ ، ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يَعُودَ فَلْيَتَوَضَّأْ ))([٣٦٣]) ٠

واتە : لە ( أبي سعيد الخُدري )وە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( هەرکات کەسێکتان چووە لای خێزانی و ، پاشان ویستی جارێکی تر بگەڕێتەوە با دەستنوێژ بگرێت )) ٠

خۆشتن و دەستنوێژگرتن پاش جووتبوون هۆکارێکی گەورەیـە بـۆ گەڕانـەوەی چالاکی و ، شادومانبوونی نەفس و ، جێنشینکردنەوەی هەندێ لەوانەی بەهۆی جووتبونەوە شیی بونـەوە ، لە گـەڵ تـەواو پاکبونـەوەو ، کۆبونـەوەی گـەرمی غـەریزی لـە نێـو جەسـتەدا پـاش ئـەوەی بەهۆی جووتبونەوە بڵاوبوبۆوەو ، بەدەستهێنانی ئەو پاکێتیەی خوای تعالى حـەزی پێیـەتی و ، ڕقی لە پێچەوانەکەیەتی ، هەموو ئەمانە لە چاکترین چارەسازیەکانی جووتبونن ، هۆکـارێکی چاکیشن بۆ پاراستنی تەندروستی و ئەو هێزانەی تیایدان ٠

## بەشێك سەبارەت بە چاکترین کاتەکانی جووتبوون و فەزڵ و شێوەکانی

بەسـوودترین جوتبـوون : ئەوەیـە کـە لـە دوای هەرسـبوونی خـۆراك و ، مـام ناوەنـدبوونی جەستە لـە گـەرمی و ساردی و ، ووشـکێتی و شـێداریێتی و ، چـۆڵ بـوون و پڕبونیـدا ئـەنجام

[٣٦٣] _ صحيح : أخرجه مسلم ( ١ / ١٧١ ) عن عاصم الأحول عن أبي المتوكل عن أبي سعيد الخُدري فذكره مرفوعاً ٠

بدرێت ، زیانێشی ئاسانترو کەمترە لە کاتی پڕبوونی جەستەدا بەبەراوردی زیانی لە کاتی چۆڵ بوونیدا ، هەروەها زیانی کەمترە لەکاتی زۆربونی شێدا بەبەراوردی زیانی لەکاتی ووشکێتی جەستەدا ، وە زیانی کەمترە لە کاتی گەرمێتی جەستەدا بەبەراوردی زیانی لە کاتی ساردبونیدا ، لە ڕاستیدا پێویستە مرۆڤ جووتبوون ئەنجام بدات لە کاتی توندبوونی شەهوەت وئارەزوو و ، بڵاوبونەوەی تەواوی بەهەموو جەستەدا " بەبێ ئەوەی زۆر لە خۆی بکات ، یاخود بیر لە وێنەیەك بکاتەوە ، یاخود تەماشایەکی یەك لە دوای یەك بکات.

پێویستە مرۆڤ بەزۆر شەهەوەت و ئارەزوو بۆ خۆی پەیدا نەکات و ، زۆر لەنەفسی نەکات ، بەڵکو پێویستە لەو کاتەدا پەلەی ئەنجامدانی جووتبوون بکات " کە تۆماوی نێرینەی دەوروژێت و ، ئارەزووی دێتە هەژان ، بەڵام با لە جووتبونی ژنی پیر پارێز بکات ، هەروەها با لە جووتبوونی ئەو منداڵانەی کە جووتبونی ناکرێت و ، شەهەوەت و ئارەزوویان نی یە پارێز بکات ، هەروەها با لە جووتبونی ژنانی نەخۆش و ، ناشیرین و ، بێزراو پارێز بکات ، چونکە جووتبونی ئەمانە هێزەکانی جەستە لاواز دەکەن و ، جووتبونیش لاواز دەکات بە خاسیەت ، ئەو پزیشکانەش بەهەڵەداچوونە کە دەڵێن : جووتبونی ژنانی بێوەژن بەسوودترەو ، زیاتریش تەندروستی دەپارێزێت بەبەراوردی جووتبونی کچان ، ئەمە بیروڕایەکی بۆگەنەو ، بەڵام پێدەچێ هەندێکی دیکەی پزیشکان ئاگاداری خەڵکیان کردبێتەوە لە بۆگەنێتی کارە ، هەروەها پێچەوانەی بیروڕای ئاقڵ و ژیرانی خەڵك و ، ئەو ڕێبازەیە کە سروشت و شەریعەت لە سەری ڕێکەوتوون .

جووتبونی کچ چەندین خاسیەتی تێدایە ، کە لە ژنانی بێوەژندا بەدیناکرێت ، وەکو تەواو پەیوەست بوون و هۆگربوونی کچ لە گەڵ ئەو کەسەدا کە جووتی دەبێ ، کچ دڵی لە خۆشەویستی ئەو کەسە پڕ دەبێ و ، مەیل و هەواداریشی لە نێوان ئەو و پیاوێکی تردا دابەش نابێ . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ بە ( جابر )ی فەرموو : ئەی نەدەکرا کچێك بخوازیت ، خوای تعالی شێوەیەکی تەواوی بێ کەم کوڕیی بۆ ژنانی خەڵکی بەهەشت لە (

الحُور العين ) داناوه ، ئەوەيە كە دەستى هيچ كەسێكيان لێ نەكەوتووە پێش ئەو پياوانەی له بەهەشتدا بۆيان دانراون ٠

وَقَالَتْ عَائِشَةُ لِلنَّبِيِّ ﷺ أَرَأَيْتَ لَوْ مَرَرْتَ بِشَجَرَةٍ قَدْ أُرْتِعَ فِيهَا ، وَشَجَرَةٍ لَمْ يُرْتَعْ فِيهَا ، فَفِي أَيِّهِمَا كُنْت تُرْتِعُ بَعِيرَك ؟ قَالَ : (( فِي الَّتِي لَمْ يُرْتَعْ فِيهَا ))([٣٦٤]).

واته : خاتوو ( عائشة ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ به پێغەمبەری خوای ﷺ فەرموو : ئەگەر بەلای درەختێكدا تێپەڕبووی ووشتری لێ لەوەڕابێت و ، بەلای درختێكی تردا تێپەڕبووی لێی نەلەوەڕێنرابێت ، له كام دانەیەندا ووشترەكەت دەلەوەڕێنیت ؟ ئەویش فەرمووی : (( لەوەیاندا كه لێی نەلەوەڕێنراوە )) ٠ مەبەستی ئەوەبوو له خۆی زیاتر كچی تری نەخواستووە ٠

جووتبوونی ژنی خۆشەویست لاوازی جەستە كەم دەكاتەوە " لەگەڵ دەرهاوێشتنی تۆماوێكی زۆردا ، بەڵام جووتبوونی ژنی بێزراو جەستە شیی دەكاتەوەو ، هێزەكان لاواز دەكات و دەرهاوێشتنی تۆماویش كەم دەكاتەوە ، جووتبوونی ژنی بێنوێژیش حەرامە لە هەردوو لایەنی خووی مرۆڤ و شەرعیشەوە ، چونكە زۆر زیانبەخشەو ، تێكڕای پزیشكانیش خەڵكیان له نزیك نەكەوتنەوەی ئەو ژنانە ئاگادار كردۆتەوە ٠

چاكترین شێوەكانی جووتبوون ئەوەیە كە پیاو بەسەردا ژندا بەرزبێتەوە ، پاش دەستبازی و ماچ كردن ڕایخات و بڵاوی كاتەوە ، لەبەر ئەمەیە ژن بە ڕاخەر ناونراوە ، وەكو ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( الوَلَدُ للفِراش ))([٣٦٥]) واتە : (( مندالّ بۆ پیاوە )) چونكە خاوەنی ڕاخەرەكەیە ، ئەمەش ئەوپەڕی سەرپەرشتیارێتی و چاودێرێتی پیاوانە

[٣٦٤] _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٧ / ٦ ) عن هشام بن عروة عن أبيه عن عائشة فذكرته ٠

[٣٦٥] _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ٥ / ٢٧٨ ) ، ومسلم ( ١٤٥٧ ) ٠

بەسەر ژنانەوە ، وەكو ئەوەی خوای تعالی دەفەرمێت : ﴿ الرِّجالُ قَوَّامُونَ على النِّسَاء ﴾[ النسـاء : ٣٤ ] واتـە : پیـاوان سەپەرشـتیارن ( كاربەدەسـتن ) بەسـەر ئافرەتانـەوە (٣٦٦)،
هەروەها شاعیر دەڵێت :

إذا رُمْتُهَا كـــانَتْ فِرَاشـــاً يُقِلُّني وَعِـــنْدَ فَـــرَاغي خَـــادِمٌ يَتَمَلَّق

واتە :

ئەگەر ئارەزووم لێبێ ڕاخەرێكەو هەڵم دەگرێ كاتی تەواوبونیشم خزمەتكاریكەو مەرایم بۆ دەكا

هەروەها خوای تعالی دەفەرمێت : ﴿ هُنَّ لَبـاسٌ لَكُمْ وأنـتُمْ لِبـاسٌ لَهُـنَّ ﴾[ البقـرة : ١٨٧ ] واتە : ﴿ هُنَّ لَباسٌ لَكُ ﴾ ئەوان بۆ ئێوە پۆشاكن ﴿ وأنْتُمْ لِباسٌ لَهُنَّ ﴾ وە ئێـوەش بـۆ ئـەوان پۆشاكن(٣٦٧) ، وە تەواوترین و بێ كەم و كوڕیترین پۆشاك هەر بەم باروحاڵـە دەبـێ ، چـونكە ڕاخەری پیاو لەم بارەدا كە خێزانەكەیەتی پۆشاكە بۆی ، هەروەها داپۆشـەری ژن لـەم بـارەدا كە مێردەكەیەتی پۆشاكە بۆی ، ئەم شێوە جووتبونە بەڕێزە لەم ئایەتەوە وەرگـیراوە · ئەمـە جوانترین شێوەی خواستنە ( الأستعارة ) لە زمانی عەرەبیدا كە هەیەك لە ژن و پیاوی كردۆتـە پۆشاكی ئەویتر ·

هەروەها ڕوویەكی تریشی تێدایە : بەوەی جار بـە جار ژنەكـە وەردەگرێـت بـە سـەریداو ، بەوەش وەكو پۆشاكی لێدێت بۆی ، شاعیر دەڵێت :

إذا مـــا الضَّجِيعُ ثَنَى جِيدَهـــا تَثَنَّتْ فكـــانتْ عَلَيْهِ لِبَاســـاً

واتە :

ئەگەر راكشاو لایەكی بەسەردا چەمانەوە لاردەبێتەوەو دەبێ بە پۆشاك بەسەریەوە

٣٦٦ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ·

٣٦٧ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ·

خراپترین شێوەکانی جووتبون : ئەوەیە ژنەکە بە سەر پیاوەکدا بەرزبێتەوەو ، لە سەر پشت لە گەڵ خێزانەکەیدا جووت بێت ، ئەمە پێچەوانەی ئەو شێوە سروشتیەیە کە خوای تعالی هەریەك لە پیاو و ژنی لەسەر خوڵقاندووە ، بەڵکو کە جۆری نێرو مێی لە سەر خوڵقاندووە بەرەهایی ، ئەم شێوە چەندین خراپی لە خۆدەگرێت ، لەوانە تۆماوی نێرینە بە نارەحەت دەدەچێ ، لەوانەیە هەندێ لەو تۆماوە لە ئەندامی نێرینەدا بمێنێتەوەویەوەش بۆکەن دەبێ و خراپ دەبێ و ، زیان بە پیاو دەگەیەنێت ٠

هەروەها : پێدەچێ هەندێ لە تەڕی و شێی ئەندامی زاوزێی ژن بچێتە نێو ئەندامی نێرینەی پیاوەکەوە ٠

هەروەها : منداڵدانی ژن لەم شێوەیەدا ناتوانێت ئاوەکە بگرێتە خۆی و تیایدا کۆبێتەوەو ، پەیوەست بێت پێوەی بۆ خوڵقاندنی منداڵ ٠

هەروەها : لە ڕاستیدا لە هەردوو لایەنی خوو و شەرعیشەوە ژن کارلێکراوە ، بۆیە ئەگەر بەسەر پیاودا بەرز بێتەوە وەکو بکەری لێدێت و ، ئەمەش پێچەوانەی پێویستیەکانی خوو و شەرعیشە ٠

ئەوەبوو کۆمەڵی ( أهل الكتاب ) تەنها لە سەر یەك شێواز لە گەڵ خێزانەکانیاندا جووت دەبوون ئەویش ڕاکشانی ژنەکە بوو لە سەر پشت و ، دەیانگووت : ئەمە بۆ ژن ئاسانترە ٠

بەڵام ( قريش ) و کۆمەڵی پشتیوانان بەهەموو شێوازێك لە گەڵ خێزانەکانیاندا جووت دەبوون ، ئەوەبوو جولەکەکان عەیبداریان دەکردن ، بۆیە خوای تعالی ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿ نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ ﴾[ البقرة : ٢٢٣ ] واتە : ﴿ نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ ﴾ ژنەکانتان کێڵگەی خۆتانن ﴿ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ ﴾ جا تۆو بوەشێننە ناو کێڵگەکەتانەوە ﴿ أَنَّى

شِئْتُمْ ﴾ بەهەر شێوەیەك دەتانەوێ ( لە شوێنی تایبەتی خۆی كە پێشەوەیە نەك دواوە([٣٦٨]).

وَفِي " الصَّحِيحَيْنِ " عَنْ جَابِرٍ ، قَالَ : كَانَتْ الْيَهُودُ تَقُولُ : إذَا أَتَى الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ مِنْ دُبُرِهَا فِي قُبُلِهَا ، كَانَ الْوَلَدُ أَحْوَلَ ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ : ﴿ نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ ﴾﴿ البقرة: ٢٢٣ ﴾ وَفِي لَفْظٍ لِمُسْلِمٍ : إنْ شَاءَ مُجَبِّيَةً ، وَإِنْ شَاءَ غَيْرَ مُجَبِّيَةٍ ، غيرأَنَّ ذَلِكَ فِي صِمَامٍ وَاحِدٍ([٣٦٩]).

واتە : لە ( جابر )ەوە _ خوای لیٚ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : جولەكەكان دەیانگووت: ئەگەر پیاو لە ڕووی دواوە لە شوێنی منداڵەوە لە گەڵ خێزانەكەیدا جووت بێ ، منداڵەكەیان خێل دەبێ ، بۆیە خوای تعالى ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿ نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ ﴾[ البقرة : ٢٢٣ ] لە بێژەیەكی ئیمامی ( مسلم )دا هاتووە : ئەگەر ئارەزووی لێبوو با پاڵكەوێت لە سەر ڕووی و ، ئەگەر ئارەزووشی لێبوو با بە شێوازی جگە لە پاڵكەوتن بە سەر ڕوودا ، بەڵام لە یەك شوێنەوە ، كە شوێنی كێڵان و منداڵ بوونە .

بەڵام لە كۆمەوە: هەرگیز لە سەر زمانی هیچ پێغەمبەرێك ڕێی پێنەدراوە ، ئەو كەسانەش كە ڕێپێدانی جووتبونی ژن لە كۆمەوە بۆ هەندێ پێشینی چاك دەگەڕێننەوە ، قسەی هەڵەیان داوەتە پاڵیان .

وفي سنن أبي داود عن أبي هريرة ، قال : قال رسول الله ﷺ (( ملعونٌ مَن أتى المرأةَ في دُبُرِها ))([٣٧٠])

---

[٣٦٨] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان .

[٣٦٩] _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ٨ / ١٤٣ ) ، ومسلم ( ١٤٣٥ ) .

[٣٧٠] _ حسن : أخرجه أبوداود ( ٦٢ / ٢ ) عن الحارث بن مخلد عن أبي هريرة فذكره .

واته : له ( أبي هُريرة )ەوه _ خوای لیّ رازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( نەفرین لێکراوه ئەو کەسەی له کۆمەوه دەچێته لای خێزانەکەی )) ٠

وفي لفظ لأحمد وابن ماجة : (( لا يَنْظُرُ اللهُ إلى رَجُلٍ جامَعَ امرأتَه في دُبُرِها ))([٣٧١]).

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( خوای تعالى تەماشای پیاوێك ناکات له کۆمەوه له گەڵ خێزانەکەیدا جووت بوبێت )) ٠

وفي لفظ للترمذي وأحمد : (( من أتى حائضاً ، أو امرأةً في دُبُرِها ، أو كاهناً فَصَدَّقهُ ، فقد كَفَرَ بما أُنْزِلَ على محمد ﷺ ))([٣٧٢]).

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( هەرکەس بچێته لای ژنێکی بێنوێژ ، یاخود له کۆمەوه بچێته لای ژنێك ، یا بچێته لای جادوگەرێك و باوەڕی پیّ بکات ، ئەوا کوفری کردوه بەوەی بۆ محمد ﷺدابەزیوه )) ٠

له بێژەیەکی تری پێشەوا ( البيهقي )دا هاتووه : هەرکەس له کۆمەوه بچێته لای پیاوێك یاخود ژنێك کوفری کردوه ٠

وفي مصنف وكيع : حدّثني زمعةُ بنُ صالح عن ابن طاووس عن أبيه عن عمرو بن دينارٍ عن عبدِالله بنِ يزيدَ قال : قالَ عمرُ بنُ الخطابِ _ رضي الله عنه _ ، قالَ رسولُ الله ﷺ (( إنّ اللهَ لا يستحي من الحق لا تأتوا النّساءَ في أعجازهنَ )) ، وقال مرّة : (( في أدبارهنَ ))([٣٧٣]) ٠

---

[٣٧١] _ إسناده صحيح : أخرجه ابن ماجة ( ١٩٢٤ ) ، وصححه الألباني في صحيح ابن ماجة ( ١٥٦٠ ) ٠

[٣٧٢] _ إسناده صحيح : أخرجه الترمذي ( ١٣٥ ) ، وصححه الألباني في الإرواء ( ٢٠٠٦ ) ٠

[٣٧٣] _ إسناده صحيح : صححه الألباني في الإرواء ( ٢٠٠٥ ) ٠

واته له ( مصنَّف وكيع )دا هاتووه : ( زمْعة )ی كوڕی ( صالح ) بۆی باسكردم ، لـه ( ابـن طاووس )ەوه ، له بابیەوه ، له ( عمرو )ی كوڕی ( دینار )ەوه ، له ( عبدالله )ی كوڕی ( یَزید )ەوه فـەرمووی : ( عمـر )ی كـوڕی ( خطـاب ) _ خـوای لـێ ڕازی بێـت _ فەرموویـەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فـەرمووی : (( خـوای تعـالی لـه گـوتنی هـەق شـەرمەزار نـابێ ، لـه دواوه مەچنه لای ژنان )) ، جارێكیشیان فەرمووی : (( له كۆمەوه )) ٠

وفي الترمذي : عن علي بن طَلَق ، قال : قال رسـول لله ﷺ: (( لا تـأتوا النِّسَـاءَ في أعجـازِهِنَّ ، فإن الله لا يستحى من الحقِّ ))([374]).

واتــه : لــه ( علــي ) كــوڕی ( طَلَــق )ەوه _ خــوای لــێ ڕازی بێــت _ فەرموویـەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( له دواوه مەچنه لای ژنان ، خوای تعالی له گوتنی هـەق شەرمەزار نابێ )) ٠

وفي (( الكامل )) لأبن عديَ من حديثِه عن المحامليَ عن سعيد بن يحيـى الأمـويّ قـال حـدّثنا محمّدُ بنُ حمزةَ عن زيدِ بنِ رفيعِ عن أبي عبيدةَ عن عبدِاللهِ بنِ مسعودٍ يرفعهُ : (( لا تأتُوا النّسـاءَ في أعجازهنّ ))([375])

واته له ( الكامل )ی ( أبن عدی )دا هاتووه : لـه ( المحـامِلي )وه ، لـه ( سـعيد )ی كـوڕی ( يحيى الأموي )وه ، گوتويەتی : ( محمد )ی كوڕی ( حمزة ) ، له ( زيد )ی كوڕی ( رَفيـع )ەوه بۆی باسكردين ، له ( أبي عُبيدة )وه ، لـه ( عبـدالله )ی كـوڕی ( مسـعود )ەوه فەرموويـەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( له دواوه مەچنه لای ژنان )) ٠

---

[374] _ إسناده صحيح : أخرجه الترمذي ( ١١٦٤ ) ، وصححه الألباني في صحيح الجامع ( ٢٤٢٨ ) ٠

[375] _ إسناده ضعيف : ضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٦٠٧ ) ٠

له ( الحسن )ی کوڕی ( علي الجوهريّ )وه ، لـه ( أبـي نـر )ەوه _ خـوای لـێ ڕازی بێـت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( هەرکەس له کۆمەوه بچێته لای پیـاو یـاخود ژن ، کوفری کردوه )) ٠

وروى إسماعيلُ بنُ عيّاشٍ عن سهيلِ بنِ أبي صالحٍ عن محمدِ بنِ المنكدرِ عن جابرٍ يرفعه : (( استحيُو من اللهِ فإنّ اللهَ لا يستحي من الحقّ لا تأتُوا النّساءَ في حُشُوشهنّ ))([٣٧٦]) ، ورواه الدّارقطنيّ من هذهِ الطّريقِ ولفظهُ : (( إن الله لا يستحي من الحقّ لا يحلّ مأتاكَ النّساءَ في حشوشهنّ([٣٧٧])

واته له ( إسماعيل )ی کوڕی ( عيَّاش )ەوه ، له ( سُهيل )ی کوڕی ( أبي صالح )ەوه ، لـه ( محمد )ی کـوڕی ( المنكَدِر )ەوه ، لـه ( جـابر )ەوه _ خـوای لـێ ڕازی بێـت _ لـه فەرموودەیەکدا کـه بـەرزی دەکاتـەوه بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی : (( لـه خـوا شەرم بکەن ، خوای تعالی بەرامبەر به گووتنی هەق شەرمەزار نـابێ ، لـه کۆمـەوه مەچـنه لای ژنان )).

لـه هـەمان ڕێگەشـەوه پێشـەوا ( الـدارقُطنِيُّ ) ئـەو فـەرموودە دەگێڕێتـەوەو ، بێژەکەشـی ئەمەیە (( خوای تعالی بەرامبەر به گـوتنی هـەق شـەرمەزار نـابێ ، حـەڵاڵ نـی یـە لـه کۆمـەوه بچیته لای ژنان )) ٠

---

[٣٧٦] _ إسناده صحيح : صححه الألباني في صحيح الجامع ( ٩٣٤ ) ٠

[٣٧٧] ___ إسناده صحيح : أخرجه أحمد ( ٦ / ٦٧ ) ٠

وقال البغوي : حدّثنا هدبةُ حدّثنا همّامٌ قال : سئل قتادةُ عن الّذي يأتي امرأتهُ في دبرها ؟ فقال حدّثني عمرو بنُ شعيبٍ عن أبيهِ عن جدّهِ أنّ رسولَ اللهِ ﷺ قال : (( تلكَ اللّوطيّةُ الصّغرى ))([378]) ·

واته پێشەوا ( البغویُّ ) فەرموویەتی : ( هُدْبَة ) بۆی باسکردین ، ( هشام ) بۆی باسکردین و ، فەرمووی : لە ( قتادة )یان پرسی سەبارەت بەو کەسەی لە کۆمەوە دەچێتە لای خێزانی ، ئەویش فەرمووی : ( عمرو )ی کوڕی ( شُعَیب ) ، لە بابیەوە ، لە باپیریەوە بۆی باسکردم ، کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ئەوە ( لوط )یەتێکی بچوکە )) ·

وقال أحمد في مسنده : حدَّثنا عبدالرحمن ، قال : حدَّثنا همَّام ، أُخبرنا عن قتادة ، عن عمرو بن شُعيب ، عن أبيه ، عن جده ، فذكره([379])

وفي المسند أيضاً : عن ابن عباس : أنزلت هذه الآية : ﴿ نِساءُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ ﴾﴿ البقرة : ٢٢٣ ﴾ في أُناسٍ من الأنصار ، أتوا رسولَ الله ﷺ، فسألوه ، فقال : (( ائتها على كُلِّ حال إذا كان في الفَرْج ))([380])·

واته : لە ( ابن عباس )ەوە _ خوا لە خۆی وبابیشی ڕازی بێت _ فەرموویەتی : ئەم ئایەتە ﴿ نِساءُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ ﴾[ البقرة : ٢٢٣ ] سەبارەت بە کەسانێك لە پشتیوانان دابەزی ، هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، لێیان پرسی ، ئەویش فەرمووی : (( بەهەموو شێوازێك بچۆ لای ئەگەر تەنها لە ئەندامی زاوزێ وە بوو )) ·

وفي المسند أيضاً : عن ابن عباس ، قال : جاء عمرُ بنُ الخطاب إلى رسول الله ﷺ فقال : يا رسول الله : هلكت · فقال : (( وما الذي أهلكَكَ ؟ )) قال : حَوَّلْتُ رَحْلي البارِحَةَ ، قال : فلم يَرُدَّ

[378] _ إسناده صحيح : صححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب ( ٢٤٢٨ ) ·

[379] _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٢ / ١٨٢ ، ٢١٠ ) كلاهما عن عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده ·

[380] _ إسناده صحيح : أخرجه أحمد ( ١ / ٢٦٨ ) ·

عليه شيئاً ، فأوحى الله إلى رسوله : ﴿ نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ ﴾[ البقرة : ٢٢٣ ] أقْبِلْ وأدْبِرْ ، واتَّقِ الحَيْضَةَ والدُّبرَ([٣٨١]).

واته : له ( ابن عباس )ەوه _ خوا له خۆی وبابیشی ڕازی بێت _ فەرموویەتی : ( عمر )ی کوڕی ( خطاب ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا : تیاچووم ، ئەویش فەرمووی : (( چ بوبە هۆی تیاچونت ؟ )) فەرمووی : دوێنێ زینەکەم گواستەوه ( واتە بە شێوازێکی تر چۆتە لای خێزانەکەی ) ، ( ابن عباس ) فەرمووی : پێغەمبەری خوا ﷺ بەهیچ شتێك وەڵامی نەدایەوه ، بەڵام پاشان خوای تعالی ئەم ئایەتی بۆ نارده خوارەوه : ﴿ نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ ﴾[ البقرة : ٢٢٣ ] له پێش و پاشەوه بچۆره لای خێزانەکەت ، بەڵام خۆت له بێنوێژی و کۆم بپارێزه ٠

وفي الترمذي : عن ابن عباس مرفوعاً : لا يَنْظُرُ اللهُ إلى رَجُلٍ أتى رَجلاً أو امرأةً في الدُّبرِ([٣٨٢]).

واته : له ( ابن عباس )ەوه _ خوا لـه خـۆی و بابیشـی ڕازی بێـت _ فەرموویەتی : خـوای تعالی تەماشای پیاوێك ناكات له كۆمەوه چوبێتە لای پیاوێك یاخود ژنێك ٠

وروينا من حديث أبي علي الحسن بن الحسين بن دُومَا ، عن البَراءُ بن عازِب يرفعه : (( كفر بالله العظيم عشرة من هذه الأمة : القاتلُ ، والسَّاحرُ ، والدَّيُوثُ ، وناكحُ المرأةِ في دُبُرِها ، ومانِعُ الزكاةِ ، ومَن وَجَدَ سَعَةَ ومات ولم يَحُجَّ ، وشاربُ الخَمْرِ ، والسَّاعي في الفتنِ ، وبائعُ السِّلاحِ من أهلِ الحربِ ، ومَن نكحَ ذاتَ مَحْرمٍ منه ))([٣٨٣]).

---

[٣٨١] _ إسناده صحيح : أخرجه الترمذي ( ٢٩٨٤ ) ، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ( ٢٣٨١ ) ٠

[٣٨٢] _ حديث حسن : أخرجه الترمذي ( ١١٦٥ ) ، عن كريب عن ابن عباس فذكره مرفوعاً ٠

[٣٨٣] _ إسناده ضعيف : ضعفه الألباني في الضعيفة ( ٢٠٠٥ ) ٠

واته : ( البَراء )ى كوڕی ( عازب ) _ خوای لێ ڕازی بێت _له فەرموودەیەکدا کە بەرزی دەکاتەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( دە کەسی ئەم ئومەتە کوفریان بە خوای گەورە کردووە : بکوژ ، جادوگەر ، گەواد ، ئەو کەسەی لە کۆمەوە دەچێتە لای خێزانی ، مەی خۆرەوە ، زەکات نەدەر ، ئەو کەسەی دەوڵەمەندیش بوو مردو حەجی نەکرد ، ئەو کەسەی لە کاتی فینەو ئاشوبدا هەوڵ دەدات خراپە بڵاوبکاتەوە ، فرۆشیاری چەك بۆ ئەو کەسانەی لە جەنگدان ، ئەو کەسەی کەسێکی نامەحرەم دەخوازێت )) ٠

( عبدالله )ی کوڕی ( وهب ) دەڵێت : ( عبدلله )ی کوڕی ( لَهيعة ) ، له ( مِشرَح )ی کوڕی ( هاعان )ەوە ، له ( عقبة )ی کوڕی ( عامر )ەوە بۆی باسکردین ، کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( نەفرین لێکراوە ئەو کەسەی لە کۆمەوە دەچێتە لای ژنان )) ٠

له ( مسند )ی ( الحارث )ی کوڕی ( أبي أسامة )دا هاتووە : ( أبي هريرة )و ، ( ابن عباس ) فەرموویان : پێغەمبەری خوا ﷺ پێش مردنی ووتارێکی بۆ خوێندینەوە ، کە کۆتا ووتارەکانی بوو تا گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری _ عزَّ وجلَّ _ و تیایدا فەرمووی : (( هەرکەس لە کۆمەوە بچێتە لای ژنێك یاخود پیاوێك یاخود منداڵێك ، ڕۆژی قیامەت کۆدەکرێتەوەو ، بۆنی لە لاکی بۆنکردو بۆگەنترەو زیان بەخەڵك دەگەیەنێت تا دەچێتە ئاگرەوە ، خوای تعالى کردەوەکانی پوچ دەکاتەوەو ، تەوبەو پەشیمانی قبوڵ ناکات ، دەخرێتە نێو سندوقێکی ئاگرینەوەو ، بە بسماری ئاگرین لێی توند دەکرێت ، ( أبوهريرة ) فەرموویەتی : ئەمە لە بارێکدا ئەگەر تەوبەی نەکردو پەشیمان نەبۆوە ٠

پێشەوا ( أبو نعيم الأصبهاني ) بۆی باسکردوین کە ( خزيمة )ی کوڕی ( ثابت ) لە فەرموودەیەکدا کە بەرزی دەکاتەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( خوای تعالى لە گوتنی هەق شەرمەزار نابێ ، لە کۆمەوە لە گەڵ ژناندا جووت مەبن )) ٠

وقال الشافعيّ : أخبرني عمّي محمّد بنُ عليّ بنِ شافعٍ ٠ قال أخبرني عبدُالله بنُ عليّ بنِ السّائبِ عن عمرو بنِ أحيحةَ بنِ الجلاحِ عن خزيمةَ بنِ ثابتٍ أنّ رجلاً سأل النّبيّ ﷺ عن أتيانِ النّساءِ في أدبارهنّ فقال : (( حلالٌ )) فلما ولّى دعاهُ فقالَ : (( كيفَ قُلت في أيّ الخربتينِ أو في أيّ الخرزتينِ أو في أيّ الخصفتينِ أمن دُبُرها في قُبُلها ؟ فنعم ، أم من دُبُرها في دُبُرها فلا ، إنّ اللهَ لا يستحي من الحقّ ، لا تأتوا النّساءَ في أدبارهنّ ))([٣٨٤]) ٠

پێشەوا ( الشافعي ) فەرموویەتی : مامم ( محمد )ی کوڕی ( علي ) کوڕی ( شافع ) پێی ڕاگەیاندم و ، فەرمووی : ( عبدالله )ی کوڕی ( علي ) کوڕی ( السائب ) ، لە ( عمرو )ی کوڕی ( أحيحة )ی کوڕی ( الجلاح )ەوە ، لە ( خزيمة )ی کوڕی ( ثابت )ەوە پێی ڕاگەیاندم ، کەوا پیاوێك سەبارەت بە جووتبونی ژن لە دواوە لە پێغەمبەری خوای ﷺ پرسی ، ئەویش فەرمووی : (( حەڵاڵە )) ، کە پیاوەکە پشتی پشتی هەڵکردو چوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ جاریکی تر بانگی کردەوەو فەرمووی: (( چۆنت گووت ، لە کام قوڵایەوە ، لە کام کونەوە ، لە کام چاڵایەوە ، ئەگەر لە دواوە بێ بۆ ئەندامی زاوزێی ، بەڵێ ٠ بەڵام ئەگەر لە دواوە بێ بۆ کۆم ، نەخێر ، خوای تعالى لە گوتنی هەق شەرمەزار نابێ ، لە کۆمەوە مەچنە لای ژنان )) ٠

( الربيع ) دەڵێت : بە پێشەوا ( الشافعي )یان گووت : ئەی تۆ چ دەڵێی ؟ فەرمووی : مامم متمانەپێکراوە ( ثقة ) ، ( عبدالله )ی کوڕی ( علي ) متمانەپێکراوەو ، بەخێر باسی ( الأنصاري )کەشی کردووە ، مەبەستی ( عمرو )ی کوڕی ( الجلاح ) بوو ، ( خزيمة )ش لەو کەسانەیە کە گومان لە باوەڕپێکراوی ناکرێت ، بەڵام من ڕێ بەو کارە نادەم ، بەڵکو یاساغ و قەدەغەی دەکەم ٠

دەڵێم _ ابن القيم _ ئالێرەوە خەڵکی بە هەڵەدا چوون و گوفتاری کەسانی پێشین و پێشەوایانیان بەهەڵە لێکداوەتەوە کە ڕیپێدراوێتی ئەو کارە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

---

[٣٨٤] _ إسناده صحيح : صححه الألباني في الإرواء ( ٢٠٠٥ ) ٠

دەگێڕنەوە ، چونكە لە ڕاستیدا ڕێی داوە كە دواوەی ژن وەكو ڕێگەك بەكاربهێنرێت بۆ جووت بوون لە ئەندامی زاوزێ وە ، بەم جۆرە مەبەستی ئەوە نەبوو لە دواوە لە گەڵ ژندا جووت بێ بۆ كۆم ، بەڵكو مەبەستی ئەوەبوو پیاو لە دواوە لە گەڵ ژندا جووت بێ بۆ ئەندامی زاوزێ ، هەروەها بیسەری فەرموودەكەش بە هەڵەدا چووەو ( من ) واتە : ( لە )ی نێو فەرموودەكەی بە ( في ) واتە : بۆ نێو لێكداوەتەوەو نەیزانیوە جیاوازیان لە نێواندا هەیە ، كەوابوو ئەمەیە كە پێشین و پێشەوایان ڕێیان پێداوە ، بەڵام كەسانی تر گوفتارەكانی ئەوانیان بە هەڵەیەكی ناشیرین لێكداوەتەوە ·

خوای تعالی دەفەرمێت : ﴿ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللهُ ﴾ البقرة : ٢٢٢ ﴾ واتە : ﴿ فَأْتُوهُنَّ ﴾ بچنە لایان ﴿ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللهُ ﴾ لەو شوێنەوە كە خوا فەرمانی پێداون ([٣٨٥])، ( مجاهد ) فەرموویەتی : سەبارەت بەو ئایەتە لە ( ابن عباس )م پرسی ، ئەویش فەرمووی : لەو شوێنەوە كە فەرمانت پێكراوە لێ دوركەویتەوە ، مەبەستی شوێنی بێنوێژی بوو · ( علي ) كوڕی ( أبي طلحة ) لە ( ابن عباس )ەوە باس دەكات كەوا ( ابن عباس ) فەرمووی : مەبەستی ئەندامی زاوزێ یەو ، سنوریش مەبەزێنن بۆ شوێنێكی تر ·

ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ حەرامكردنی جووتبونی ژنان لە كۆمەوە لەبەر دوو هۆكار ، یەكەمیان : ڕێی داوە بە جووتبونی ژنان لە شوێنی كێڵانەوە ، كە شوێنی منداڵ بوونە نەك لە كۆمەوە كە شوێنی پیسی و ئازارە · خوای تعالی كە دەفەرمێت : ﴿ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللهُ ﴾[ البقرة : ٢٢٢ ] مەبەستی شوێنی كێڵانە واتە ئەندامی زاوزێی ژنان ، هەروەها ئایەتەكە دەفەرمێت ﴿ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ ﴾[ البقرة : ٢٢٣ ] لێرەدا شێوازی جووتبونی ژنان لە دواوە بەڵام بۆ ئەندامی زاوزێ لەم ئایەتەوە دەستكەوت بووە ، چونكە فەرموویەتی : ﴿ أَنَّى شِئْتُمْ ﴾ واتە : لە هەر كوێ وە ئارەزوتان لێ بوو لە پێشەوە یاخود لە پاشەوە · ( ابن عباس

[٣٨٥] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ·

) _ خوای له خۆی و بابیشی ڕازی بێت _ سەبارەت بە گوفتاری خوای تعالی ﴿ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ ﴾ فەرموویەتی : مەبەستی : ئەندامی زاوزێ یە ٠

ئەگەر خوای تعالی جووتبونی ژنانی لە ئەندامی زاوزێ وە لەبەر زیانێکی کاتی حەرام کردبێت ، وەکو بێنوێژی ، کەوابو باری حەرامێتی کۆم توندترە ، چونکە شوێنی پیسی و ئازاری بەردەوامە ، سەرەڕای خراپەی تر وەکو وەچە بڕین ، لێرەدا ئەمە حەرام کراوە ، بۆ ئەوەی نەبێتە بەهانەو دەرگای خراپەی دیکەش نەکاتەوە بۆ تاوانی گەورەتر ، وەکو ئەوەی ئەم ڕەفتارە لە دواشەوە لە گەڵ منداڵان ئەنجام بدرێ ٠

هەروەها : ژن مافی جووتبونی بەسەر مێردەکەیەوە هەیە ، جووتبونیشی لە کۆمەوە هەقی دەفەوتێنێت و ، حەزو ئارەزووی بەجێ ناهێنێت و ، مەبەستەکانی پێ بەدەست نایەت ٠

هەروەها : کۆم ئامادە نەکراوە بۆ ئەم کارەو ، بۆ ئەوەش نەخولقێنراوە ، بەڵکو لە ڕاستیدا ئەندامی زاوزێ بۆ ئەوە ئامادەکراوە ، بۆیە ئەو کەسانەی وازی لێ دەهێنن و کۆم بەکاردێنن لە حیکمەت و دانایی و شەرعی خوا چونەتە دەرەوە بەگشتی ٠

هەروەها : ئەو کارە زیانبەخشە بۆ پیاو ، بۆیە ئاقڵ و ژیرانی پزیشکان لە فەیلەسوف و کەسانی تریش قەدەغەو یاساغیان کردوە ، چونکە ئەندامی زاوزێی ژنان خاسیەتی ڕاکێشانی ئاوی تێزاو و حەوانەوە پێدانی پیاوی هەیە ، جووتبونیش لە کۆمەوە یارمەتیدەری ڕاکێشانی هەموو ئاوەکە نابێت و ، هەموو ئاوە تێزاوەکەی پیاو دەرناهێنێت ، چونکە پێچەوانەی کاری سروشتیە ٠

هەروەها : لە ڕوویەکی دیکەشەوە زیانبەخشە ، چونکە ئەنجامدانی ئەو ڕەفتارە لە کۆمەوە پێویستی بە جم و جۆڵی ماندوکار هەیە ، لەبەر ئەوەی پێچەوانەکاری سروشتیە ٠

هەروەها : جێگەی پیسی و باوگژەی ناوسکەو ، پیاویش بەڕووی ڕوو بە ڕووی دەبێتەوەو ، تێکەڵی دەبێ ٠

هەروەها : زۆر بۆ ژن زیانبەخشە ، چونکە شتێکەو لە خووی سروشتی مرۆڤەوە نامۆو بەدورە ، ڕقی لێیەتی و چارەی ناوێت ٠

هەروەها : خەم و خەفەت و ، ڕق لێبونەوە بۆ هەردو کەسی بکەرو کارلێکراو دروست دەکات ٠

هەروەها : ڕووی مرۆڤ ڕەش دەکات و ، سنگی تارێك دەکات و ، نورو ڕوناکی دڵی دەکوژێنێتەوەو ، سامناکی و پەستیەك ڕووی دادەپۆشێت " هەرکەسێك کەمترین زانستی ڕووناسی بزانێت " ئەوەی پێوە بەدیدەکات ٠

هەروەها : دورکەوتنەوەو ڕق لێبونەوەیەکی توندو ، لە یەك دابڕان لە نێوان بکەرو کارلێکراودا دروست دەکات٠

هەروەها : باروحاڵی بکەرو کارلێکراو بەجۆرێکی وا خراپ دەکات کە دوای ئەوە هێندەی نامێنێ چیتر هێوای چاك بونەوەی لێنەکرێت ، مەگەر بە تەوبەو پەشیمان بونەوەیەکی وا کە بڕیار بدات چیتر ئەو کارە ئەنجام نەدات ٠

هەروەها : هەموو خوو ڕەوشتێکی چاك و باش لە سەر هەردوکیان لادەبات و ، دژی ئەو ڕەوشتەیان لەبەر دەکات و ، هەموو دۆستایەتی و پەیوەندیەکی دڵسۆزانەی نێوانیان لادەبات و ، تۆوی کینەهەڵگرتن و نەفرین کردنی یەکتریان لە نێواندا دەچێنێ ٠

هەروەها : لە گەورەترین هۆکارەکانی نەمانی نیعمەت و ، دابەزینی خەشم و قین و توڕەبونە ، چونکە نەفەرین و نەویستراوێتی پەروەردگاریان بۆ دروست دەکات و ، ڕوو لە بکەری ئەو ڕەفتارە وەردەگێڕێت و ، بەچاوی سۆزەوە تەماشای ناکات ، بۆیە کەسی بکەر پاش هەموو ئەمانە بەهێوای چ خێرێکەو ، لە چ شەڕێکیش دڵنیابێت ، بۆیە ژیانی بەندەیەك کە نەفرین و خەشم و ڕقی خوای تووش بوبێ دەبێ چۆن بێ ، کە ڕووی لێ وەردەگێڕاوەو ، بەچاوی سۆزیشەوە تەماشای ناکات ٠

هەروەها : شەرم و بەخۆداچونەوە بەگشتی ناهێڵێت ، شەرمیش ژیانی دڵەو ، ئەگەر شەرم لە دڵدا نەمێنێت ، کردەوە ناشیرینەکان بە چاك دادەنێت و ، کردەوە جوانەکانیش بە خراپ دادەنێت ، ئەو کاتە مرۆڤ خراپەی لە دڵدا قایم و جێگیرتر دەبێ ٠

هەروەها : ئەو خوو ڕەوشتانە دەگۆڕێت کە خوای تعالی بۆ مرۆڤی داناوە ، مرۆڤ لە خوو ڕەوشتی خۆی دەردەهێنێت بۆ خوو ڕەوشتێکی تر کە خوای تعالی بۆ هیچ گیانلەبرێکی دانەناوە ، کە خوویەکی هەڵاوەگەڕاوەیەو ، خووش ئەگەر هەڵگێڕدرایەوە ، دڵ و ، کردەوەو ، ڕێبازیش هەڵدەگێڕدرێتەوەو ، ئەوجا هەموو کردەوەو شێوازێکی خراپ بەچاك دادەنێت و ، بەوەش باروحاڵ و کردەوەو گوفتاری بەبێ ویستی خۆی خراپ دەکات ٠

هەروەها : بێ ئابڕویی و بێ شەرمی و زاتکردنێك بۆ مرۆڤ بەجێدەهێڵێت " کە هیچ ڕەفتارێکی تر دروستی ناکات ٠

هەروەها : شورەیی و سووکی و بێ ڕێزی و هیچ و پوچیەك بۆ مرۆڤ بەجێدەهێڵێت " کە هیچ ڕەفتارێکی تر دروستی ناکات ٠

هەروەها : پۆشاکی ڕق و کینە و نەویستراوی و ، هەروەها لاقرتێ و تانوت لێدان و ، ڕیسوابوون و بەسوك تەماشاکردنی خەڵکی لەبەر دەکات ، بە بچوك تەماشای دەکەن " بە ئاستێك ئەوە بەچاو دەبینرێت ٠ بۆیە _ صلاة و سلام _ لەسەر ئەو کەسەی بێ ، کە خۆشی و کامەرانی دونیاو ڕۆژی دوای تەنها بە شوێنکەوتنی ڕێبازەکەیەتی و ، تیاچونی دونیاو ڕۆژی دوای ، بە سەرپێچی کردنی ڕێبازەکەیەتی و ئەوەی کە هێناویەتی ٠

## بەشێك : جووتبوونە زیانبەخشەكانیش : دوو جۆرە ، زیانبەخش لە ڕووی شەرعەوە ، زیانبەخش لە ڕووی خوو ڕەوشتەوە :

ئەوەی زیانەخشە لە ڕووی شەرعەوە : حەرامەكانە ، ئەمە چەندین پلەیەو هەندێكیان لە هەندێكی دیكەیان توندترە · حەرام كراوی كاتیشی ( العارض ) سوكترو ئاسانترە لە حەرامكراوی بەردەوامێتی ( اللازم ) ، وەكو حەرامبوونی جووتبوون لە كاتی ئیحرام بەستندا ، حەرامبوونی جووتبوون لە كاتی ڕۆژوودا ، حەرامبوونی جووتبوون لە كاتی ئیعتكافدا ، حرامبونی ژنی ( الظّهار )([386])لێكراو تا كەفارەت دەدات ، وە حرامێتی جووتبوونی ژن لە كاتی بێنوێژیداو ، بەو هاوشێوانە ، بۆیە سنورێك بۆ ئەم جۆرە جووتبونە نی یە ·

بەڵام حەرامبوونی بەردەوام ( اللازم ) : دوو جۆرە : جۆرێك هیچ ڕێگەیەك بۆ حەلاڵبوونی نی یە : وەكو ژنانی مەحرەم ، دایك و خۆشك وهتد ··· ، ئەم جۆرە جووتبونە كوشتن پێویست دەكات ، وەكو سنورێك بۆ ئەو تاوانە ، بەلای كۆمەڵێك لە زانایانەوە وەكو پێشەوا ( أحمد )ی ( حنبل )و كەسانی دیكەش ، فەرموودەیەكی ( مرفوع )ی ( ثابت )یش لەم بارەوە هەیە([387])·

---

[386] ـ الظّهار : ئەگەر پیاو بە ژنەكەی بڵێت : تۆ وەكو پشتی دایكم وای ؛ یاخود وەكو پشتی خوشكم وای ؛ ئەوە ( الظّهار )ی لە ژنەكەی كردوە ، شەرعیش ئەمەی حەرام كردوە تاوەكو پیاوەكە كەفارەت دەدات ، یاخود تا ماوەی ( الظّهار )ەكە تەواو دەبێ ، بڕوانە : پوختەی فیقهی شەریعەت ، مامۆستا طارق هەمەوندی · وەرگێڕ ·

[387] ـ يشير إلى حديث البَراءِ قالَ : لَقِيتُ خَالِي وَمَعَهُ الرَّايَةُ ، فَقُلْتُ : أَيْنَ تُرِيدُ ؟ قَالَ : أَرْسَلَنِي رَسُولُ اللَّهِ ـ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ـ إِلَى رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةَ أَبِيهِ مِنْ بَعْدِهِ أَنْ أَضْرِبَ عُنُقَهُ أَوْ أَقْتُلَهُ · رواه النسائي ( ١٣٣٣ ) واللفظ له ، ورواه أبوداود ( ٤٤٥٦ ) ، والترمذي ( ١٣٦٢ ) واتە : ( البَراء ) ـ خوای لێ ڕازی بێت ـ فەرموویەتی : چاوم بە خاڵم

دووەم : ئەوەی لە توانادایە حەڵاڵ بكرێت ، وەكو ئەجنەبی ، بۆیە ئەگەر مێردار بێت ، لە جوتبونیدا دوو هەق هەیە : هەقێك بۆ خواو ، هەقێك بۆ مێرد · ئەگەر زۆرلێكراو بێ ، سێ هەقی تێدایە ، ئەگەر كەس و كاری هەبێ و بەو هۆیەوە عەیبدارو لەكەدارین ئەوا چوار هەقی تێدایە ، ئەگەر ژنێكی مەحرەمی بێت ، ئەوا پێنج هەقی تێدا دەبێت · زیانی ئەم جۆرە بە گوێرەی پلەكانێتی لە حەرامیدا ·

بەڵام زیانەخش لە ڕووی خوو ڕەوشتەوە ، دیسان دوو جۆرە : جۆرێك زیانبەخشە بە چۆنیەتیەكەی وەكو ئەوەی پێشتر باسكراو ، جۆرێكیش زیانبەخشە بە زۆركردنی ، ئەم جۆرە هێز دەڕۆخێنێت ، زیان بە دەمار دەگەیەنێت ، لەرزین دروست دەكات ، ئیفلیجی ، كرژبوون ، لاوازبوونی چاو و تێكڕای هێزەكان ، گەرمی غەریزی دەكوژێنێتەوە ، ڕێرەوەكان فراوان دەكاتەوەو ، وای لێدەكات ئامادە بێت بۆ پاشەڕۆ زیانبەخشەكان·

بەسوودترین كاتەكانی جوتبوون : پاش هەرسبوونی خۆراكە لە گەدەداو ، لە زەمەنێكی مام ناوەندا ، نەك لەسەر برسێتی ، چونكە گەرمی غەریزی دەكوژێنێتەوە ، نەك لەسەر تێربونیش ، چونكە نەخۆشیگەلێكی توند دروست دەكات ، هەروەها نە لەسەر ماندووبوون ، نە لە دوای گەرماوكردن ، نە لە دوای دەرهاوێشتن ، نەلە دوای هەست بە جوڵانێكی دەرونیش وەكو خەم و خەفت و دڵتەنگی و شادومانبونێكی بەهێز ·

چاكترین كاتیشی پاش چواریەك یاخود سێ یەكی شەوە ، چونكە لەو كاتەدا ڕێكەوتی هەرسبوونی خۆراك دەبێ ، پاشان خۆی دەشوات و دەنوێت یاخود دەستنوێژ دەگرێت و

---

كەوت و ئاڵاكەی بەدەستەوە بوو ، گووتم : بۆ كوێ دەچی ؟ فەرمووی : پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ ناردومی بۆ لای پیاوێك باوەژنەكەی خۆی خواستووە پاش مردنی بابی بۆ ئەوەی لە ملی بدەم یاخود بیكوژم ·

دەنوێت ، بەوەش هێزەکانی بۆ دەگەڕێتەوە ، با لە پاشیشیدا وەرزش و جوڵانەوەیەکی زۆر نەکات ، چونکە زۆر زیانبەخشە ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەری عیشقدا :

ئەمە نەخۆشیەکە لە نەخۆشیەکانی دڵ ، بە پێچەوانەی هەموو نەخۆشیەکانی ترەوەیە لە خودی خۆی و هۆکارەکانی و چارەسەریدا ، ئەم نەخۆشیە ئەگەر قایم بوو و پتەو تۆکمەبوو ، ئیتر چارەسەری بەلای پزیشکانەوە قورس دەبێ و ، نەخۆشیش ماندوو دەکات ، لە ڕاستیدا خوای تعالی لە قورئانەکەیدا باسی خەڵك دەکات کە عیشقی دوو کۆمەڵ دەبن : ژنان و ، دڵ لێچونی لاوی موو لێدەرنەهاتوو ، باسی ژنەکەی ( عزیز )ی میسر دەکات سەبارەت بە ( یوسف ) ، هەروەها باسی قەومەکەی ( لوط ) دەکات ، خوای تعالی هەواڵی ئەوانمان پێ ڕادەگەیەنێت کاتێ کە پەریەکان هاتنە لای ( لوط )و دەفەرمێت : ﴿ وَجَاءَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ يَسْتَبْشِرُونَ (٦٧) قَالَ إِنَّ هَؤُلَاءِ ضَيْفِي فَلَا تَفْضَحُونِ (٦٨) وَاتَّقُوا اللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ (٦٩) قَالُوا أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ الْعَالَمِينَ (٧٠) قَالَ هَؤُلَاءِ بَنَاتِي إِنْ كُنْتُمْ فَاعِلِينَ(٧١) . لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِي سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ(٧٢) ﴾ [ الحجر : ٦٧ _ ٧٢ ] واتە : ﴿ وَجَاءَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾ جا خەڵكی ( نێربازی ) شارەکە هاتن ( بەرەوماڵی ( لوط )و ) مژدەیان بە یەکتری دەدا ﴿ قَالَ إِنَّ هَؤُلَاءِ ضَيْفِي ﴾ ( لوط ) ووتی دڵنیابن ئەمانە میوانی منن ﴿ فَلَا تَفْضَحُونِ ﴾ دەی ئابڕوم مەبەن ﴿ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ ﴾ و لە خوا بترسن و شەرمەزارو ڕیسوام مەکەن ﴿ قَالُوا أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ الْعَالَمِينَ ﴾ ووتیان ئێمە پێمان نەووتیت نابێ بەرگری لە کەس بکەیت ( نابێ کەس توخنت کەوێ ) ﴿ قَالَ هَؤُلَاءِ بَنَاتِي ﴾ ( لوط ) فەرمووی ئائەوانە کچانی منن ( مارەیان کەن ) ﴿ إِنْ كُنْتُمْ فَاعِلِينَ ﴾ ئەگەر ئێوە ( ئەو کارە ) ئەنجام دەدەن ﴿ لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ ﴾ سوێند بە تەمەن و

ژیانی تۆ ( ئەی محمد ﷺ) بەڕاستی ئەوانە ﴿ لَفِي سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾ لە سەر خۆشی خۆیاندا سەرگەردانن ([388]) •

بەڵام کەسانێك ئەو ڕێزو سەنگینیە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺدانانێن کە شایستەیەتی و واڕادەگەیەنن کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ تووشبووە لە بارەی ( زینب )ی کچی ( جحش )ەوە ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ( زینب )ی بینیوەو فەرموویەتی : ( سُبحانَ مُقَلِّبَ القُلُوب ) واتە : پاك و بێگەردی بۆ خوای هەڵپلێنەرو ئەم دیوو ئەودیوکاری دڵان و ، دڵی لیّ سەندوە ، کەچی بە ( زید )ی کوڕی ( حارثة )ی دەفەرموو : لای خۆت ڕایگرەو بیهێڵەرەوە ، تا خوای تعالی ئەم ئایەتەی بۆ دابەزاند : ﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ ﴾﴿ الأحزاب : ٣٧ ﴾ واتە : ﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ ﴾ ( بیربکەرەوە ) کاتیّ دەدووت بە کەسیّ ( زید )ی کوڕی ( حارثة ) کە خوا بەهرەی بەسەردا ڕشتبوو تۆیش چاکەت لە گەڵدا کردبوو ( بە ئازادکردنی و پەروەردەکردنی ) ﴿ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ ﴾ خێزانت ( زینب ) لای خۆت ڕاگرەو بیهێڵەوە ﴿ وَاتَّقِ اللَّهَ ﴾ وە لە خوا بترسە ﴿ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ ﴾ لە دڵی خۆتدا شتێك دەشاریتەوە کە خوا ئاشکەرای دەکات ﴿ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ ﴾ وە لە ( قسەی ) خەڵك دەترسی لە کاتێکدا خوا شیاوترە کە لێی بترسی([389]) ، کەسانی بانگەشەکارانی ئەو گوفتارانە واگومان دەبەن ئەو ئایەتانە سەبارەت بە خۆشەویستیە ، بۆیە کەسانێکیان کتێبێکی داناوە سەبارەت بە خۆشەویستی ، تیایدا باس لە خۆشەویستی پێغەمبەران دەکات و ، باسی ئەم ڕوداوەش دەکات ، بەڕاستی ئەم کەسە بەرامبەر بە قورئان و بەرامبەر بە پێغەمبەران نەفامە ، چونکە هەستاوە بە لێکدانەوەی ئایەتەکان بە پێچەوانەی مەبەستی ڕاستەقینەی خوای پەروەردگار ، شتگەلێکیشی داوەتە

[388] ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان •

[389] ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان •

پالْ پێغەمبەری خوا ﷺ كه خوای تعالی بەدوری خستۆتەوە لێی ، چونكە ( زینب )ی كچی ( جحش ) خێزانی ( زید )ی كوڕی ( حارثة ) بوو ، پێغەمبەری خواش ﷺ ( زید )ی كردبووە كوڕی خۆی ( تبنّي ) ، ئەوەبوو بە ( زید )ی كوڕی ( محمد ) ناودەبرا ، ( زینب )یش لوتبەرزی و خۆبەرزكردنەوەی بەسەر ( زید )دا دەنواند ، بۆیە ڕاوێژی بە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد سەبارەت بەوەی كە ( زینب ) تەڵاق بدات ، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی دەفەرموو : خێزانەكەت لای خۆت ڕاگرەو بیهێڵەرەوەو لە خوا بترسە ، ئەوەشی لە دڵی خۆیدا شاردەوە كەوا ئەگەر ( زید ) تەڵاقی بدات " بۆی خۆی دەیخوازێت ، لەوەش دەترسا خەڵكی پێی بڵێن ژنی كوڕەكەی خۆی خواستووە ، چونكە ( زید ) بە كوڕی ( محمد ) ناودەبرا ، ئا ئەمە بوو كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دڵی خۆیدا شاردبویەوەی ، ئەوەش ئەو ترسەبوو لە خەڵك كە بەسەریهات ، بۆیە خوای تعالی ئەم ئایەتەی دابەزاندو تیایدا باسی ئەو بەهرەو نیعمەتانە دەكات كە پێی بەخشیوە " نەك سەرزەنشتی بكات ، وە پێشی ڕاگەیاند كە نابێ لە قسەی خەڵكی بترسێت " سەبارەت بەو شتانەی خوای تعالی بۆی حەڵاڵ كردووی ، چونكە خوای تعالی شایستەترە ترست لێبێ ، دەست هەڵنەگرێت لەوەی بۆی حەڵاڵ كردوی " لەبەر قسەی خەڵك ، پاشان پێی ڕاگەیاند كەوا ( زینب )ی لێ مارە دەكات دوای ئەوەی كە ( زید ) پێویستی پێ نەماو و تەڵاقیدا ، بۆ ئەوەی ئومەتەكەی شوێنی كەون و پەیڕەوی بكەن لەوەداو ، پیاو ژنی بەكوڕكراوی خۆی بخوزاێت " نەك ژنی كوڕەكەی خۆی كە لە پشتێتی ، بۆیە خوای تعالی لە ئایەتی حەرامكردندا دەفەرمێت : ﴿ وَحَلَائِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلَابِكُمْ ﴾ واتە : ﴿ وَحَلَائِلُ أَبْنَائِكُمُ ﴾ وە ( حەرامە بۆتان ) هاوسەری كوڕەكانتان ( بووك ) ﴿ الَّذِينَ مِنْ أَصْلَابِكُمْ ﴾ ئەوانەی كە لە پشتی خۆتانن([390]) ، هەروەها خوای تعالی لەم سورەتەدا دەفەرمێت ﴿ مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ ﴾[ سورة الأحزاب:٤٠] واتە : محمد ﷺ باوكی هیچ یەك لە پیاوەكانتان نی یە ، لە سەرەتای سورەتەكەشدا دەفەرمێت : ﴿ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ ذَلِكُمْ قَوْلُكُمْ بِأَفْوَاهِكُمْ ﴾[ الأحزاب : ٤ ] واتە ﴿ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ

---

٣٩٠ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان .

﴿ وه خوا بەكوڕكراوەكانتانى نەكردۆتە كوڕتان ﴿ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَاهِكُمْ ﴾ ئەوە قسەى سەر زارەكى تانە([٣٩١])، كەوابوو تێڕوانە لەم بەرگريكردنە لە پێغەمبەرى خوا ﷺ و ، دورخستنەوەى تانەى تانەداران لەو زاتە پاكە · وبالله التوفيق ·

بەڵێ · پێغەمبەرى خوا ﷺ خێزانەكانى خۆشدەويست و ، لە هەمووشيان بەلايەوە خۆشەويستر ( عائشة ) بوو ، خۆشەويستى هيچ كەسێكيش بەلايەوە نەدەگەشتە خۆشەويستى ( عائشة ) جگە لە خۆشەويستى خواى پەروەردگارى ، بەڵكو بە ( صحيح )ى لە پێغەمبەرى خواوە ﷺ دەگێڕنەوە فەرموويەتى : (( لو كنتُ مُتَّخِذاً من أهلِ الأرضِ خليلاً لاتَّخَذْتُ أبابكر خليلا )) ، وفي لفظ : وإنَّ صَاحِبَكُم خَليلُ الرحمن([٣٩٢]) واتە : (( ئەگەر من لە خەڵكى سەر زەمين خۆشەويستێكم هەڵبژاردايە ( أبوبكر )م بە خۆشەويستى خۆم دەكرد )) ، لە بێژەيەكى تريشدا هاتووە : بەڕاستى هاورێكەتان خۆشەويستى رەحمانە ·

## بەشێك :

لە ڕاستيدا دڵانێك گيرۆدەى خۆشويستنى وێنەو ڕوخسار دەبن ، كە لە خۆشەويستى خواى تعالى بۆش و بەتاڵ بن ، ئەوانەى ڕووى لێوەردەگێڕن و ، بە شتى تر جێگەى پڕ دەكەنەوە ، چونكە ئەگەر دڵ پڕبوو لە خۆشەويستى خواو تامەزرۆى چاوپێكەوتنى بوو ، ئەوا نەخۆشى خۆشويستنى وينەو ڕوخسارى لێ دوردەخاتەوە ، بۆيە خواى تعالى سەبارەت بە ( يوسف ) پێغەمبەر دەفەرمێت : ﴿ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ ﴾ [ يوسف : ٢٤ ] واتە : ﴿ كَذَٰلِكَ ﴾ ئا بەو جۆرە ( بەڵگەمان نيشانى يوسف دا ) ﴿ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ ﴾ بۆ ئەوەى خراپەو داوێن پيسى لێ دوربخەينەوە ﴿ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ ﴾ چونكە بەڕاستى ئەو ( يوسف ) لە بەندە پاك و هەڵبژاردەكانى

---

[٣٩١] ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەى تەفسيرى قورئان ·

[٣٩٢] ــ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ٧ / ١٥ ) ، ومسلم ( ٢٣٨٣ ) ·

ئیمەیە([393]) ، لەم ئایەتەدا ڕوون دەبێتەوە کە دڵسۆزی و هەڵبژێردراوی هۆکارێك بوون بۆ دورخستنەوەی خۆشەویستی و ، ئەو خەراپەو کردەوە ناجۆرانەی کە بەروبوم و ئەنجامین لە ( یوسف ) پێغەمبەر _ علیه السلام _ ، بۆیە وازلێهێنانی هۆکار وازلێهێنانی مایەی هۆکەشە ، کەسانێکی پێشین گوتویانە : خۆشەویستی جوڵانەوەی دڵێکی بۆش و بەتاڵە ، واتە لە خۆشەویستەکەی زیاتر هیچی دیکەی تێدا نی یە · خوای تعالی دەفەرمێت : ﴿ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَى فَارِغًا ﴾[ القصص : ١٠ ] واتە : جا دڵی دایکی موسا خاڵی بوو ( لە هەموو شتێك جگە لە منداڵەکەی ) ([394]) واتە : خاڵی بوو لە هەموو شتێك جگە لە موسی چونکە لەڕادەبەدەر خۆشیدەویست و ، دڵیشی زۆر پێوەی پەیوەندبوو ·

خۆشەویستیش لە دوو شت پێکهاتووە : بەچاك زانینی خۆشویستراو و ، سووربوون لە سەر پێگەشتنی ، بۆیە هەرکات دانەیەکیان نەما خۆشەویستیەکەش نامێنێت ، نەخۆشی خۆشویستن زۆرێك لە ئاقڵ و ژیرانی ماندووکردو ، کەسانێکیشیان تیایدا دواون ، بەڵام قسەکانیان وازی لێدەهێنرێت بۆ شتی ڕاستر ·

دەڵێین _ ابن القیم _ حیکمەت و دانایی خوای تعالی لە دروستکراوان و کاروباریدا جێگیربووە لەسەر بنچینەی سازان و پێکهاتن لە نێوان هاوشێوەکاندا ، هەموو شتێکیش بۆ لای گونجاوی خۆی و بۆلای پێکەوەهەڵکراوی خۆی ڕاکێش دەبێ و ، ڕووی تێ دەکات " وەکو خوویەکی سروشتی ، وە لە جیاوازو لەیەك نەچووی خۆی هەڵدێت ، تا ئەو ئاستەی خۆی لێ دور دەخاتەوە " وەکو خۆیەکی سروشتی ·

بۆیە نهێنی تێکەڵبوون و پەیوەندی کردن بەیەکەوە لە جیهانی بەرزو خواروشدا ، لە ڕاستیدا دەگەڕێتەوە بۆ سێ شت : گونجاوی و پێکاهاتن و وەکیەکبوون ·

---

[393] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ·

[394] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ·

نهێنی جیاوازی و جیابوونەوەش ، لە ڕاستیدا دەگەڕێتەوە بۆ سێ شت : نەگونجاوی و پێکنەهاتن و وەکیەکنەبوون ٠

کەوابوو لە سەر ئەم بنچینانە بەدیهاتن و کاروبار بەڕێوەدەچێت ، بۆیە هاوچەشن هەواداری هاوچەشنی خۆیەتی و ، دەگەڕێتەوە بۆ لای ، دژیش لە دژەکەی هەڵدێت و ، خۆی لێ دووردەخاتەوە ، خوای تعالی دەفەرمێت : ﴿ هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا ﴾[ الأعراف : ١٨٩ ] واتە : ﴿ هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ ﴾( خوا ) ئەو زاتەیە کە ئێوەی دروست کردوە ﴿ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ ﴾ لە یەك کەس ( کە ئادەمە ) ﴿ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا ﴾ هەر لە خۆی هاوسەری بەدیهێنا ﴿ لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا ﴾ تا لای بحەسێتەوە ( ئارام بگرێ )([٣٩٥]) ، لێرەدا خوای تعالی هۆی حەسانەوەو ئارامگرتنی پیاوی لای خێزانەکەی گەڕاندۆتەوە بۆ ئەوەی کە لە جۆرو چەشن و گەوهەری خۆیەتی ، بۆیە حەسانەوەی پیاو لای خێزانەکەی _ کە بریتیە لە خۆشەویستی _ دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لە چەشنی خۆیەتی ، ئەمە بەڵگەیە کە هۆی حەسانەوە بە جوانی وێنەو ڕوخسار نی یە ، هەروەها بە مەبەست و ویست و ، خوڵقاندن و ڕێنمویش نی یە ، ئەگەرچی هەموو ئەوانە لە هۆکارەکانی حەسانەوەو خۆشەویستین ٠

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( الأرواحُ جُنُودٌ مُجَنَّدةٌ ، فما تعارفَ منها ائتلفْ ، وما تناكرَ منها اختَلَفَ )).

واتە : (( ڕوحەکان سەربازی ڕاهێنراون ، ئەوانەیان هاوڕەوشت و هاوبیرن پێکەوە دەگونجێن و ، ئەوانەشیان سروشت و بیروباوەڕیان جیاوازە لە یەك دوور دەکەونەوە )) ٠

وَفِي " مُسْنَدِ الْإِمَامِ أَحْمَدَ " وَغَيْرِهِ فِي سَبَبِ هَذَا الْحَدِيثِ : أَنَّ امْرَأَةً بِمَكَّةَ كَانَتْ تُضْحِكُ النَّاسَ ، فَجَاءَتْ إِلَى الْمَدِينَةِ ، فَنَزَلَتْ عَلَى امْرَأَةٍ تُضْحِكُ النَّاسَ ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: الْأَرْوَاحُ جُنُودٌ

---

[٣٩٥] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

مُجَنَّدَةٌ الْحَدِيثَ([396]) واتـه : لـه ( مسـند )ى ئيمـامى ( أحمـد )و هيتريشـدا هـۆى گـوتنى ئـهم فهرموودهيه هاتووه كهوا : ژنێك له مهككه خهڵكى پێدهكهنان ، ئهوهبوو چووه مهدينـهو ، لـه ماڵى ژنێك دابهزى كه ئهميش ديسان خهڵكى پێدهكهنان ، بۆيه پێغهمبهرى خوا ﷺ فـهرمووى : ڕوحهكان سهربازى ڕاهێنراون ··· فهرموودهكه ·

شـهريعهتى خـواى تعالى جـێگير بـووه لهسـهر ئـهوهى كـه حـوكمى شـتێك وهكـو حـوكمى هاوشـێوهكهيهتى ، شهرعهكهشـى دابـهش ناكرێتـه سـهر دوو لێكچـوداو ههريـهكيان حـوكمى تايبهتى ههبێت ، ههروهها شهرعهكهشى كۆناكرێتهوه له نێوان دوو هـاودژداو هـهردوكيان يـهك حوكميان ههبێت ، ههركهس بۆچونێكى تـرى لهمـه جيـاوازترى هـهبێ ، ئـهوا دهگهڕێتـهوه بـۆ ئهوهى كه زانينى بهرامبهر به شهريعهتى خواى تعالى كهمه ، ياخود كهمتهرخهمه بهرامبهر بـه زانينى لهيهكچوون و جياوازى ، يـاخود شـتگهلێك دهداتـه پـاڵ شـهريعهت كـه فـهرمانى خـواى تعالاى لهسهر نى يه ، بهڵكو له بيروڕاى ههندێ پياوانه · به دانايى و دادپـهروهرى پـهروهردگار بـهديهێنان و شـهريعهتهكى دهركـهوت ، بـه دادهپـهروهرى و كێشـى ووردى پـهروهردگار بهديهێنان و شهريعهتهكهى چهسپاو ڕاست بۆوه ، كه بريتيه له يهكسانكردن و ڕێككردنهوه لـه نێوان دوو لهيهكچوو ، وه جياكردنهوه له نێوان دوو جياوازدا ·

ئهمـهش كـه لـه دونيـادا چهسـپاوه ، لـه ڕۆژى قيامهتيشـدا هـهر ئاوهمايـه · خـواى تعالى دهفهرمێت : ﴿ احْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا وَأَزْوَاجَهُمْ وَمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ. مِنْ دُونِ اللهِ فَاهْدُوهُمْ إِلَى صِرَاطِ الْجَحِيمِ ﴾ [ الصـافات : ٢٢ ] واتـه ﴿ احْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا وَأَزْوَاجَهُمْ ﴾ ( خـوا بـه فريشتهكان دهفـهرموێ ) ئهوانـهى سـتهميان كـرد كۆيـان بكهنـهوه لـه گـهڵ هـاورێ كانيـان ( هاوويێنهكانيان ) ﴿ وَمَا كَانُوا يَعْبُدُو ﴾ له گهڵ ئهوانهى دهيانپهرستن ﴿ مِنْ دُونِ اللهِ ﴾ جگه لـه

[396] _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٢ / ٢٩٥ ، ٢٥٢٧ ) ، والبخاري في الأدب المفرد ( ٩٠١ ) ، ومسلم ( ٨ / ٤١ ) كلهم من حديث أبي صالح عن أبي هريرة فذكره مرفوعاً ·

خوا ﴿ فَاهْدُوهُمْ إِلَى صِرَاطِ الْجَحِيمِ ﴾ ئەنجا ڕێگای دۆزەخیان نیشان دەن ([٣٩٧]) ، پێشەوا ( عمر )ی کوڕی ( خطاب ) _ خوای لێ ڕازی بێت _و پاش ئەویش پێشەوا ( أحمد )ی کوڕی ( حنبل ) _ بەڕەحمەتی خوا بێت _ دەربارەی گوفتاری خوای تعالی ﴿ وَأَزْوَاجَهُمْ ﴾ فەرموویانە : واتە : هاوڕێنەو لێکچوەکان ٠

خوای تعالی دەفەرمێت : ﴿ وإذا النُّفوسُ زُوِّجَتْ ﴾[ التکویر : ٧ ] واتە: ساتێك کە هەر خاوەن کارێك جووتکرایەوە لە گەڵ هاوڕێنەو لێکچووی خۆیدا ، وەکو جووتکردنی دوو کەسی خۆشەویست لەبەر خوای تعالی لە بەهەشتدا ، جووتکردنی دوو خۆشەویستی ملکەچی شەیتان لە دۆزەخدا ، چونکە هەر کەسێك لە گەڵ ئەو کەسەدایە کە خۆشی دەوێ ، بیەوێ یاخود نەیەوێ ، وفي مستدرك الحاكم وغيره عن النبي ﷺ: (( لا يُحِبُّ المَرءُ قَوْماً إلا حُشِرَ مَعَهُم ))([٣٩٨]) واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( هەرکەس قەومێکی خوشویست بەدڵنیایی لە گەڵیاندا کۆدەکرێتەوە )) ٠

خۆشەویستی چەند جۆرێکەو چاکترین و بەڕێزترینیان : خۆشەویستیە لە بەر خواو بۆ خوا ، لێرەدا پێویستە مرۆڤ ئەوانەی خۆشبوێت کە خوای تعالی خۆشی دەوێن و ، هەروەها پێویستە مرۆڤ خواو پێغەمبەرەکەشی خۆشبوێت ٠

دیسان : خۆشویستنی ڕێکەوتن لەسەر ڕێگەیەك ، یا ئاینێك ، یا ڕێباوەڕێك ، یا ڕێبازێك ، یا خزمایەتیەك ، یا پیشەسازیەك ، یا هەر مەبەستێکی تر ٠

دیسان : خۆشەویستیەك بۆ دەستکەوتنی بەرژەوەندی و سوودێك لە کەسی خۆشویستراو ، یا لە پلەو پایەکەی ، یا لە ماڵ و سامانەکەی ، یاخود لە فێرکردن و ڕێنمایەکەی ، یا بۆ

[٣٩٧] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

[٣٩٨] _ إسناده صحيح : أخرجه أحمد ( ٦ / ٤٥ ، ١٦٠ ) ، وصححه الألباني في صحيح الترغيب و الترهيب ( ٣٠٣٧ ) ٠

بەدەستهێنانی خۆشی و ئارەزوویەك ، ئەمانە خۆشەویستی كاتین و نامێنن بە نەمانی ئەو هۆكارانەی دروستی كردوون ، دڵنیابە ئەو كەسەی بۆ كارێك خۆشی دەوێی ، پشتت تێ دەكات و دوردەكەوێتەوە كاتێ كارەكە تەواوبێ ٠

بەڵام خۆشویستنی هاوشێوەیی و گونجاوی كە لە نێوان دوو خۆشەویستدا هەیە ، خۆشویستنێكی بەردەوامەو لەناوناچێت " مەگەر كۆسپ و تەگەرەیەك لایبات ، خۆشەویستی عیشق لەم جۆرەیە ، چونكە پەسەندكردنێكی ڕوحانی و ، تێكەڵبونێكی نەفسانیەو ، ئەو گومان و دودڵیی و لاوازی و بێهێزی و داهێزراوی و سەرقاڵی و پەشێویەی لە خۆشویستنی عیشقدا دا تووشی مرۆڤ دەبێ لە جۆرەكانی دیكەی خۆشویستنەكاندا تووشی نابێت ٠

## بۆ عیشق جار بە جار لە یەك لاومیە :

ئەگەر گووترا : ئەگەر هۆكاری عیشق ئەو پەیوەندی و پەیوەستبوون و لەیەكچوونە ڕوحانیە بێت كە باستان كرد ، كەوابوو بۆ بەردەوام نابێ لەنێوان هەردوو لادا ، بەڵكو بەزۆری تەماشا دەكەیت تەنها لە لایەن ئەو كەسەوەیە كە تووشی عیشق بووە ، بۆیە ئەگەر هۆكاری عیشق ئەو پەیوەندیە نەفسانیەو ئەو تێكەڵبوونە ڕوحانیە بوایە ، ئەوا خۆشەویستیەكەی نێوانیان هاوبەش و لە هەردوو لاوە دەبوو ٠

وەڵام بۆ ئەمە : ئەوەیە كە هۆكار جار بە جار مایەو ئەنجامەكەی دوادەكەوێت لەبەر نەبوونی مەرجێك ، یاخود بوونی كۆسپ و تەگەرەیەك ، دواكەوتنی خوشویستنیش لە لایەنی بەرامبەرەوە دەگەڕێتەوە بۆ یەكێك لەم سێ هۆكارانە :

یەكەم : زەدەیەك ( علِة ) لە خۆشویستنەكەدا ، وە خۆشویستنێكی كاتیەو خۆیی نی یە ، وە مەرج نیە مرۆڤ لە خۆشویستنی كاتیدا هاوبەشی هەبێ ، بەڵكو پێدەچێ دوركەوتنە هەبێ لەلایەن كەسی خۆشویستراوەوە ٠

دووەم : كۆسپێك لـه خـودی كەسـی عاشـقدایه ، كـه قەدەغـەی كەسـی خۆشويسـتراوی بەرامبەر دەكات خۆشی بوێت ، ئەو كۆسپه يا له خوو و ڕەوشتيدايه ، يا له جەستەو ديمـەن و شێوەيدايه ، يا له ڕێبازيدايه ، يا له كردەوەيدايه هتد··

سێيەم : كۆسپێك له كەسی خۆشويستراودايەو ناهێڵێت هاوبەشی كەسـی عاشـق بێـت لـه خۆشەويستيەكەيدا ، ئەگەر ئەو كۆسپه نەبوايه وەكو ئەو خۆشی دەويست ، بۆيـه ئەگـەر ئـەو كۆسپانه نەمێنێت و ، خۆشەويسـتيەكەش خـۆيی بـوو ، ئـەوا بـەدڵنيايی لـه هـەردوو لايەنـەوە دەبێت ·

ئەگـەر كۆسـپی خۆبەگـەورەدانان و ئێرەيـی و ، سـەرگەورەيی و دوشمنايـەتی لـە دڵيـی بێباوەڕاندا نەبوايـه ، بـەدڵنيايی پێغەمبـەرانيان لـه خـودی خۆيـان و كـەس وكـارو سـەرەوەت سامانيش خۆشتر دەويست ، بۆيه كاتێ ئەو كۆسپه له دڵی دەست و پێوەندەكانيانـدا نـەبوو ، بەلايانــەوە خۆشەويســتی پێغەمبــەرانيان لــه ســەروی خۆشويســتنی نــەفس و كەســوكارو سەروەتيشەوە بوو ·

## بەشێك سەبارەت بەوەی كه چارەسەری عيشق بەوە دەكرێت كه عاشق خۆشەويستەكەی بخوازێت

مەبەستيش ئەوەيه : لەبەر ئەوەی عيشق نەخۆشيەكه له نەخۆشيەكان ، بۆيه قبوڵی چارەسەركردن دەكات و ، چەند جۆرێك چارەسەريشی هەيه ، كەوابوو ئەگەر كەسی عاشق هيچ ڕێگەيەكی بەدەستەوە نەبێت بەدەر له دەستكەوتنی خۆشويستەكەی له هەردوو لايەنی شەرع و چارەنوسيشەوە ، ئەوە _ دەستكەوتنی خۆشەويستەكەی _ چارەسەری دەبێ ، كما ثبت في الصحيحين من حديث ابن مسعود _ رضي الله عنه _ ، قال : قال رسول الله ﷺ (( يا معشرَ الشَّباب مَن استطاع منكم الباءةَ فليتزوَّج ، ومَن لم يستطعْ فعليه بالصَّوم ، فإنَّه له

وجاءٌ ))([399]) واته : له ( ابن مسعود )ەوه _ خوای لیّ رازی بیّت _ فەرموویەتی: پیّغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ئەی كۆمەڵی لاوان ، هەركەس له ئیّوه توانای هەیه با ژن بهیّنیّت ، چونكه چاكترین هۆكاری چاو دانواندن و داویّن پاریّزی یه ، هەركەسیش توانای نی یه ، با رۆژوو بگریّت ، چونكه بۆی دەبیّته قەڵغان )) . لیّرەدا پیّغەمبەری خوا ﷺ ریّگەی دوو چارەسەری به عاشق پیشاندا : بنەرەتی _ مارەكردنی خۆشەویست _ ، لەبریی _ رۆژوو گرتن _ . فەرمانیشی پیّكرد بنەرەتیەكه بەكاربیّنیّت ، كه چارەسەریەكه بۆ ئەم نەخۆشیه دانراوه ، بۆیه پیّویسته وازی لیّنەهیّنریّت بۆ چارەسەریّكی تر ، ئەگەر هەر ریّگەیەك هەبوو بۆ بەكارهیّنانی .

وروى ابن ماجة في سننه عن ابن عباس _ رضي الله عنهما _ ، عن النبي ﷺ أنه قال : (( لَمْ نَرَ للمتحابَّينِ مِثْلَ النكاح ))([400]) .

واته : له ( ابن عباس )ەوه _ خوا له خۆی و باببیشی رازی بیّت _ فەرموویەتی : پیّغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( هیچ چارەسەریّكی تر بەچاك دانانیّین بۆ دوو خۆشەویست بەدەر له زەواج كردن )) . ئەمه ئەو مانایەیه كه خوای تعالى ئاماژەی پیّداوه _ پاش ئەوەی ژنانی حەڵاڵ كردووه ، ئازادو كەنیزەك ، له كاتی پیّویستیدا _ به گوفتاری ﴿ يُرِيدُ اللَّهُ أَنْ يُخَفِّفَ عَنْكُمْ وَخُلِقَ الإِنْسَانُ ضَعِيفًا ﴾[ النساء : ٢٨ ] واته : ﴿ يُرِيدُ اللَّهُ ﴾ خوا دەیەویّت ﴿ أَنْ يُخَفِّفَ عَنْكُمْ ﴾ كه ئەركتان له سەر سووك بكات ﴿ وَخُلِقَ الإِنْسَانُ ضَعِيفًا ﴾ چونكه ئادەمی به لاواز دروست كراوه([401]) لەم شویّنەدا خوای تعالى باسی سووكردنەوه دەكات ، وه هەواڵ دان به لاوازی مرۆڤ له ئایەتەكەدا پەنجه رادەكیّشیّت بۆ لاوازی بەرگەنەگرتنی بەرامبەر بەم شەهوەت و ئارەزووه ، وه خوای تعالى ئەوەی بۆ سوككردنەتەوه به حەڵاڵكردنی ژنان

---

[399] _ صحيح : تقدم تخريجه .

[400] _ صحيح : تقدم تخريجه .

[401] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان .

دوو یا سێ یا چوار ، ڕێگەشی داوە بچێتە لای بەندەو کەنیزەکەکانی خۆی ، پاشان ڕێگەشی پێدا ئەگەر پێویست بوو کەنیزەك بخوازێت وەکو چارەسەریەك بۆ ئەم شەهوەت و ئارەزووەو ، بۆ سووکردنەوەی ئەم خووە لاوازەو ، وەکو بەزەیی پیداهاتنەوەش ٠

**بەشێك :**

ئەگەر هیچ ڕێگەیەکیش بەدینەکرا بۆ ئەوەی کەسی عاشق بە خۆشەویستەکەی شادبێتەوە وەکو چارەنووس یاخود وەکو شەرع ، یاخود لێی قەدەغەکرابێت لەهەردوو لاوە ، ئەوا نەخۆشیەکی بێ دەرمانەو ، گرنگترین چارەسەرەکانیشی ، بریتیە لەوەی نەفسی خۆی ئاگادارکاتەوە بەوەی هیوای لێ ببڕێت ، چونکە نەفس هەرکات بێئومێد بوو لە شتێك ، دەحەوێتەوەو ، چیتر ئاوڕی لێ ناداتەوە ، بەڵام ئەگەر لە گەڵ نائومێدیشدا عیشقەکەی هەر بەردەوام بوو ، ئەوا خوو و ڕەوشتی ئەو کەسە تووشی چەوترەویەکی توند بووە ، بۆیە پێویستە بیگۆڕێت بە چارەسەرێکی تر ، کە بریتیە لە چارەسەرکردنی ئەقڵی خۆی ، چونکە دەبێ بزانێ پەیوەسبوونی دڵ بەشتێکەوە کە هێوای دەستکەوتنی ناکرێت جۆرێکە لە شێتی و ، خاوەنەکەشی وەکو کەسێکە عاشقی خۆر بێ و ، ڕوحیی حەزی بەوەبێ کە بۆلای بڵندبێتەوەو ، لە گەڵیدا لە سەر خولگەکەی بسوڕێتەوە ، ئەم کەسە بەلای تێکڕای ئاقڵ و ژیرانەوە شێتەو ، لە کۆمەڵی ئەواندا حیسابی بۆ کراوە ٠

ئەگەر پێگەشتنیشی نەگونجاوبێ وەکو شەرع نەك چارەنووس ، چارەسەرەکەی بریتیە لەوەی دەبێ وەکو نەگونجاویی چارەنووسیی تەماشای بکات ، چونکە شتێك کە خوای تعالی مۆڵەتی نەدابێ ، چارەسەرکردنی مرۆڤ و ڕزگاربوونی تەنها لێ دورکەوتنەوەیەتی ، کەوابوو با نەفسی خۆی ئاگادار بکاتەوە ، کەوا نەبووەو قەدەغەکراوەو ، هیچ ڕێگەیەکی پێگەشتنی نی یەو ، وەکو تێکڕای مەحاڵەکانی دیکەیە ، وە ئەگەر نەفسی ئاژاوەگێڕی هەر لێی دورنەکەوتەوە ، با وازی لێ بێنێت لەبەر یەکێك لەم دوو شتانە ، یەکەم : یا لە ترساندا ، وە یا لە دەستدانی خۆشەویستێکی دیکە کە زۆر بەلایەوە خۆشەویستەو ، بەسودترەو ،

خێردارتریشه ، چێژو پێ شادومانبوونیشی بەردەوامترە ، چونکە کەسی ئاقڵ و ژیر هەرکات بەراوردی کرد لە نێوان دەستکەوتنی خۆشەویستێکی خێرا نەماو بە لەدەستدانی خۆشەویستێك لەو گەورەترو ، بەردەوامترو ، بەسودترو ، بەچێژترو بە پێچەوانەشەوە ، یەکسەر جیاوازی هەردوکیانی بۆ دەردەکەوێت ، بۆیە هەرگیز چێژی بەردەوام کە هیچ مەترسیەکی تێدا نی یە مەگۆڕەوە بە چێژی ساتێك ، کە پاشان بۆ ئازار دەگۆڕێت ، حەقیقەتەکەشی تەنها خەونی کەسێکی نووستووە ، یا ئەندێشەیەکەو جێگیر نابێ ، بۆیە چێژ دەچێت و ، ئەنجام دەمێنێت ، شەهوەت و ئارەزووش نامێنێن و ، بەدبەختی دەمێنێت ٠

دووەم : ڕوودانی خراپەیەکی نەویستراو کە زۆر بەلایەوە قورستر دەبێ بەبەراوردی لەدەستدانی ئەم خۆشەویستە ، ، یاخود هەردوو شتەکەی بۆ کۆدەبێتەوە ، مەبەستم _ ابن القیم _ : لەدەستدانی شتێکی خۆشەویستر بەبەراوردی لەدەستدانی ئەم خۆشەویستەی ، وە ڕودانی بەڵایەکی حەز پێ نەبووی زۆر ئەستەم تر بەبەراوردی لەدەستدانی ئەم خۆشەویستەی ، بۆیە ئەگەر دڵنیابوو کە بەدەستکەوتنی ئەم خۆشەویستە ئەو دوو شتەی تووش دەبێ ، بەلایەوە ئاسان دەبێ وازی لێ بهێنێت ، واش دەبینێت کە ئارامگرتنی بەرامبەر بە لەدەستدانی خۆشەویستەکەی ئاسانترە بەبەراوردی تووشبوونی بەو دوو شتەی سەرەوە ، چونکە ئەقل و ئاین و ، جوامێری و پیاوەتیەکەی ، فەرمانی پێدەکات بەرگەی زیانی کەم بگرێت _ کە خێرا دەشکۆڕێت بۆ چێژو خۆشی و شادومانی _ لە پێناو دوورخستنەوەی ئەو دوو زیانە گەورەیەدا ٠ بەڵام نەفامیەکەی ، ئارەزووەکەی ، ستەمکاریەکەی ، هەڵەشەیەکەی ، سووکیەکەی فەرمانی پێدەدات بە پەسەندێتی ئەم خۆشەویستە بەپەلەیە ، وە بەو کەم و کوڕیەوە کە تیایدایە ، وە لە گەڵ ئەوەی کە بەسەریدا دەهێنێت ٠ پارێزراویش ئەو کەسەیە کە خوای تعالی دەیپارێزێت ٠

ئەگەر نەفسی ئەم دەرمانەی قبوڵ نەبوو ، گوێدێریشی نەکرد بۆ ئەم چارەسەرە ، با تەماشای ئەو خراپە خێراو دەست وبردانە بکات کە شەهوەت و ئارەزوو بەسەریدا دێنێت و ،

ئەو بەرژەوەندیانەی کە لێی قەدەغە دەکات ، چونکە لە هەموو شتێك زیاتر خراپەکانی دونیا بۆ مرۆڤ ئامادەکات و ، گەورەترین هۆکاریشە بۆ پەکخستنی بەرژەوەندیەکانی ، چونکە نامیێڵێت بەندە بەتەواوی هۆش و هەست و ژیری بەکاربێنێت کە کاری پێ ڕادەپەڕێنێت و ، بەرژەوەندیەکانی پێ ڕاست دەکاتەوە ۰

ئەگەر نەفسی ئەم دەرمانەشی قبوڵ نەبوو ، با خراپی هەر گوتەو کردارو شتێکی تری خۆشەویستەکەی بیرخۆی بێنێتەوەو ، ئەوانەش کە وای لێدەکات خۆی لێ بەدوربگرێت ، چونکە ئەگەر بەدوایدا بگەڕێت و تەماشای بکات ، دەبینێت چەندەها ئەوەندەی ئەو خوو ڕەوشتە چاك و باشانەیە کە وای لێکردوە خۆشی بوێت ، سەبارەت بەوەش لێی شاراوەیە با لە دراوسێکانی بپرسێت ، چونکە وەکو چۆن خوو ڕەوشتی چاك وباش هۆکاری خۆشەویستی و ویستنە ، ئاوەهاش ناتەواوی و کەم وکوڕی هۆکاری ڕق لێبونەوەو دووریبونەوەیە ، با بەراوردێکی نێوان هەردوو شتەکە بکات و ، ئەوەی خۆشبوێت کە پێش دەکەوێت و نزیکترین دەروازەشە بۆ ئەو ، با لەو کەسانە نەبێت کە ڕەنگێکی جوانیی بەسەر جەستەیەکی بەڵەکی گولەوە فریوی دابێت ، با چاوەکانی جوانی دیمەن تێپەڕێنێت بۆ خراپی کردەوە ، با لە پەردی جوانی دیمەن بپەڕێتەوە بۆ ئەو خراپانەی کە دڵ هەواڵی پێداوە ۰

ئەگەر تێکڕای ئەم دەرمانانە بێتوانابوون لە چارەسەرکردنیدا ، هیچ ڕێگەیەکی تری نابێت جگە لەوەی پەنا بۆ ئەو زاتە بەرێت کە وەڵامی کەسی ناچارو بێدەرەتان دەداتەوە ، با خۆی فڕێداتە پێش دەستی و لەبەر دەرگاکەیدا ، پەنای بۆ بەرێت ، لێی بپاڕێتەوە ، بەکەساسی ، بە زەبوونی ، بە ملکەچی ، هەرکاتێك ئەوەی بۆ ڕەخسا ، ئەوا لە دەروازەی سەرکەوتنی دلوە ، با ئیتر پاك بێ و دەستهەڵگرێت و خۆی لە گوتەو کرداری نەگونجاو و نەشیاو بپارێزێت و ، شیعری دڵداری بۆ یادکردنەوەی خۆشەویست نەڵێت و ، لە نێو خەڵکیدا ناوی نەزڕێنێت و ، تووشی زیانی نەکات ، چونکە دەبێ بە ستەمکارێکی شەڕفرۆش ۰

با فریونەخوات بەو فەرموودە ( موضوع )ی کە دراوەتـە پـاڵ پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـەوا ( سُوید )ی کوڕی ( سعید ) هەستاوە بە گێڕانـەوەی ، لـە ( علـيّ ) کـوڕی ( مُسـهِر )ەوە ، لـە ( أبي یحیی )ی کوڕی ( القتّات )ەوە ، لە ( مجاهد )ەوە ، لە ( ابن عباس )ەوە _ خوا لـە خـۆی وبابیشـی ڕازی بێـت _ لـە پێغەمبـەری خـواوە ﷺ، هـەروەها ( أبـي مسـهر ) هەسـتاوە بـە گێڕانەوەی ، لە ( هشام )ی کـوڕی ( عـروة )وە ، لـە بابیـەوە ، لـە ( عائشـة )وە _ خـوای لـێ ڕازی بێت _ ، لە پێغەمبەری خـواوە ﷺ، هـەروەها ( الـزُّبير )ی کـوڕی ( بَكّـار ) هەسـتاوە بـە گێڕانـەوەی ، لـە ( عبـدالملك )ی کـوڕی ( عبـدالعزیز )ی کـوڕی ( الماجِشُـون )ەوە ، لـە ( عبدالعزیز )ی کوڕی ( أبي حازم )ەوە ، لە ( ابن أبي نجیح )ەوە ، لە ( مجاهد )ەوە ، لە ( ابـن عباس )ەوە _ خوا لە خۆی وبابیشی ڕازی بێت _ کەوا پێغەمبەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی : (( مَنْ عَشِقَ ، فعَفَّ ، فماتَ فهـو شـهیدٌ وفي روایـة : مَـنْ عَشِـقَ وكتم وعـفَّ وصـبرَ ، غفـر اللهُ لَـهُ ، وأدخلهُ الجنةَ )) واتە : (( هەرکەس خۆشەویستی بکات و ، لە کردارو گوفتـاری نەشـیاو خـۆی گرتەوە ، ئەگەر بمرێت بەشەهید لەقەڵـەم دەدرێـت ، لـە ( ریوایـە )تێکـی تریشـدا : هەرکـەس خۆشەویستی کردو نهێنی پاراست و لە کرداری نەشیاو خۆی پاراسـت و ئـارامی گـرت ، خـوای تعـالی لـێ دەبورێـت و ، دەیخاتـە بەهەشـتەوە )) ٠ ئـەم فەرموودەیـە بـە ( صـحیح )ی لـە پێغەمبـەری خـواوە ﷺ ( ریوایـە )ت نـەکراوەو ، ناگونجێـت لـە فەرمایشـتەکانی ئـەو بێـت ، چـونکە شـەهیدبون پلەیـەکی بـەرزە لای خـوای پـەروەردگار ، جـووتکراوە لـە گـەڵ پلـەی ( الصـدیقیة )دا([٤٠٢])، کـردەوەو باروحـاڵی هەیـە ، کـە مـەرجن بـۆ دەسـتکەوتنی ، دوو جـۆرە : گشتی و تایبەت ٠

تایبەت : شەهیدبوونە لە پێناوی خوادا ٠

---

[٤٠٢] _ الصدیقیَّة : بەرزترین پلەکانی ڕاسگۆیەو بریتیە لە شێوەی تەواوی بێکەموکوڕی گوێدێری و ملکەچی بۆ پێغەمبەر لە گەڵ شێوەی تەواوی بێکەموکوڕی دڵسۆزی بۆ پەیامنێر ، بڕوانە : التفسیر القیم لأبن القیم ، وەرگێڕ .

گشتی : پێنجن و له فەرموودەیەكی ( صحیح )دا باسكراون و عیشق یەكێكیان نی یە ٠ عیشق هاوبەش پەیداكردنه له خۆشەویستیدا ( شرك المحبة )(٤٠٣) ، دڵ خاڵی دەبێ له خوای تعالی ، دەیكا به هی یەكێكی دیكه ، بۆیه خۆشویستنی یەكێكی دیكەی جگه له خوای تعالی پلەی شەهادەتی پێ بەدەست بهێنرێت ، ئەمه شتێكی مەحاڵه ، چونكه عیشق به جۆرێك دڵ تێك دەدات كه له هەموو تێكدانێكی تر خراپتره ، بەڵكو مەی و شەرابی ڕوحەو سەرخۆشی دەكات ، له یادكردنەوەو خۆشویستنی خوای تعالی و، چێژ وەرگرتن له ڕازونیازی و( المناجاة ) ، پێ شادومانبوونی دوری دەخاتەوه ، وادەكات دڵ بەندایەتی یەكێكی دیكەی جگه له خوای تعالی بكات ، چونكه دڵی عاشق بەندایەتی خۆشەویستەكەی دەكات ، بەڵكو عیشق ناوكرۆكی بەندایەتیه ، شیوەی تەواوی بێكەموكوڕی سەرشۆڕی و ، خۆشویستن و ، ملكەچی و بەگەورەدانانه ، باشه ئەو دڵەی بەندایەتی بۆ یەكێكی دیكەی جگه له پەروەردگار دەكات ، چۆن پلەی بەڕێزانی یەكتاپەرستان و داناو زاناو ، وەلی یه تایبەتیەكانی خوای پێ بەدەست بهێنرێت ، بۆیه ئەگەر ( إسناد )ی ئەم فەرموودە وەكو ڕۆژ بوایه ، تەنها هەڵەو خەیاڵ و ئەندێشه دەبوو ، هەرگیز له هیچ فەرموودەیەكی ( صحیح )دا ووشەی عیشق له پێغەمبەری خواوە ﷺ جێگیر نەبووە ٠

پاشان عیشق حەرام و ، حەڵاڵی هەیە ، كەوابوو مرۆڤ نابێ گومانی وابەرێت كه پێغەمبەری خوا ﷺ حوكم بەسەر هەموو عاشقێكدا دەدا بەشەهیدبوون ئەگەر نهێنی پاراست

---

٤٠٣ _ هاوەڵ پەیداكردنی خۆشەویستی ( شرك المحبة ) : واته له گەڵ خوای پەروەردگاردا یەكێكی تری خۆشبوێت وەكو خۆشویستنی بۆ خوای تعالی یا لەو توندترو زیاتر ، ئەمه هەوڵ پەیداكردنی گەورەیه ، خوای تعالی لەم بارەوە دەفەرمێت : [ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَنْدَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ ﴾[ البقرة : ١٦٥ ] واته : ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ ﴾ وە كەسانی وا هەیه له خەڵكی ﴿ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَنْدَادًا ﴾ كه هاوبەشی زۆر بۆ خوا پەیدا دەكەن﴿ يُحِبُّونَهُمْ ﴾خۆشیان دەوێن ﴿ كَحُبِّ اللَّهِ ﴾ وەكو خۆشەویستی ( ئیمانداران بۆ ) خوا ﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ ﴾ بەڵام ئەوانەی بڕوایان هێناوە زۆر زیاتر خوایان خۆش دەوێت _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ، بڕوانه : الإعلام بتوضیح نوقض الإسلام ، وەرگێڕ ٠

و له كردارى نەشياو خۆى پاراست و ئارامى گرت ، بۆيە نابێ بيروباوەڕت وابێ كە هەركەس ژنێكى خۆشويست ، ياخود عيشقى لاوە مووى دەرنەهاتووەكان بوو ، ياخود عاشقى ژنانى داوێن پيس بوو ، بەو عيشقە پلەى شەهادەتى دەستگير دەبێ ، چونكە پێچەوانەى زانراوە بەڵگەنەويستەكانى ئاينە ٠

لەبەر ئەوەى عيشق نەخۆشيەكە لە نەخۆشيەكان و خواى تعالى دەرمانى بۆ داناوە لە هەردوو لايەنى شەرعى و چارەنوسيشەوە ، بۆيە خۆچارەسەركردن لە نەخۆشى عيشق يا( واجب )ە ئەگەر عيشقەكە حەرام بێت ، وەياخود ( مُسْتَحَب )ە واتە سوونەتە ٠

ئەگەر تەماشايەكى ئەو نەخۆشى و بەڵايانە بكەيت كەوا پێغەمبەرى خوا ﷺ حوكمى بەسەر تووشبوانيدا داوە بە شەهيدى ، دەبينيت لەو نەخۆشيانەيە كە چارەسەرى نى يە وەكو تووشبوانى چاوەقوڵەو ، نەخۆشيەكانى سك و ، شێتى و ، سووتاوى ، خنكاوى و ، مردنى ژن بەسەر منداڵەوە ، چونكە بەڵاگەلێكە لە لايەن خواى پەروەردگارەوەو بەندە هيچ دەستێكى لە بونيدا نى يەو ، چارەسەرى نى يە ، هۆكارەكانى دروستبونيشى حەرام نى يە ، وەناشبێت بەهۆى تێكدانى دڵ و ، پەرستنى شتى ديكەى جگە لە خواى تعالى ، وەكو ئەوەى عيشق دروستى دەكات ٠ ئەگەر هەموو ئەمانەى سەرەوەى بەلاوە بەس نەبوو بۆ پوچ كردنەوەى ئەم فەرموودەو گەڕانەوەى بۆ پێغەمبەرى خوا ﷺ با چاولێكەرى زانايانى فەرموودەناس بكات ، ئەوانەى شارەزان بە فەرموودەو زەدەكانى ( عللە ) ، ئەوجا بۆى ئاشكەرا دەبێ كە هەرگيز پێشەوايەك نەبووە شايەتى بۆ ( صحيح )بوون ، ياخود ( حسن ) بوونى ئەم فەرموودەيە بدات ، چونكە زانايان سەرزەنشت و نكۆڵيان لە ( سُويد ) كردووە سەبارەت بە گێڕانەوەى ئەم فەرموودەيەو ، لەبەر ئەمەش بە دروستكردنى بەڵاى گەورەو مەزن تاونباريان كردووە ، تا ئەو ئاستەى هەنديكيان غزاكردنى ئەم پياوەيان بەحەڵاڵ داناوە " لەبەر ئەم فەرموودەيە ٠ پێشەوا ( أبو أحمد )ى كوڕى ( عَدِيٍّ ) لە ( الكامل )دا فەرموويەتى : ئەم فەرموودەيە يەكێكە لەوانەى سەرزەنشت و نكۆڵى لە ( سُويد ) كراوە بە گێڕانەوەى ،

هەروەها پێشەوا ( البيهقي )یش فەرموویەتی : ئەم فەرموودە لەوانەیە کە سەرزەنشت و نکۆڵیی لە ( سوید ) دەکرێت بە گێڕانەوەی ، هەروەها ( أبوطاهر ) لە ( الذخيرة )دا هەمان شتی باسکردووە ، پێشەوا ( الحاكم )یش لە ( تاريخ نيسابور )دا ئەم فەرموودە باس دەکات و دەفەرمێت : من لەم فەرموودەیە سەرم سوڕدەمێنێ ، چونکە لە کەسێکی ترەوە باس نەکراوە جگە لە ( سُوید ) ، کە کەسێکی باوەڕپێکراوە ، پێشەوا ( أبوالفرج )ی کوڕی ( الجوزي ) لە کتێبی ( الموضوعات )دا باسی کردووە ، ( أبو الأزرق ) یەکەم جار لە ( سُوید )ەوە بەرزی دەکردەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام لەو بارەوە سەرزەنشت کرا ، بۆیە ناوی پێغەمبەری خوای ﷺ لابردو چیتر لە ( ابن عباس ) _ خوا لە خۆی و باوکیشی ڕازی بێت _ تێپەڕ نەدەبوو ٠

لەو کارەساتانەی تەحەموول ناکرێت ئەوەیە کە ئەم فەرموودەیە بکرێت بە فەرموودەی ( هشام )ی کوڕی ( عروة ) ، لە باوکیەوە ، لە ( عائشة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ٠ ئەوەی کەمترین شارەزای لە فەرموودەو زەدەکانیدا هەبێ ، هەرگیز ئەمە تەحەموول ناکات ، هەروەها ناگونجێت لە فەرموودەکانی ( الماجشُون ) بێت ، لە ( ابن أبي حازم )ەوە ، لە ( أبي نَجيح )ەوە ، لە ( مجاهد )ەوە ، لە ( ابن عباس )ەوە _ خوا لە خۆی وباوکیشی ڕازی بێت _ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، هەروەها ( موقوف )یشی لە سەر ( ابن عباس ) _ خوا لە خۆی وباوکیشی ڕازی بێت _ پێویستی بە تێڕوانینە ، خەڵکی ( سُوید )ی کوڕی ( سعيد )یان بە بەڵاو کارەساتی گەورە تاوانبار کردووە ، هەروەها ( يحيى )ی کوڕی ( مَعين ) سەرزەنشتی ( سُوید ) دەکات و دەفەرمێت : کەسێکی نامەردی درۆزنە ، ئەگەر ئەسپێك و ڕمێکم بوایە غەزام دەکرد ، پێشەوا ( أحمد )ی کوڕی ( حنبل ) دەفەرمێت : ( متروك الحديث ) ، پێشەوا ( النسائي ) دەفەرمێت : ( ليس بثقة ) ، پێشەوا ( البخاري ) فەرموویەتی : کوێربوو کەسانی تر فەرموودەی تریان پێ دەگوتەوە هی خۆی نەبوو ، پێشەوا ( ابن حبان ) فەرموویەتی : فەرموودەی ( المعضل )ی لە کەسانی باوەڕپێکراوەوە باس دەکرد ، بۆیە پێویستە فەرموودەکانی پشت گوێ بخرێت ٠

چاكترين ئەو گوفتارانەش كە دەربارەی ( سُويد ) گوتراوە گوفتاری ( أبوحاتم الرازي )ە كە فەرموويەتی : ( إنه صدوق كثير التدليس ) ، هەروەها گوفتارەكەی پێشەوا ( الدَّارَقُطنيٌ )ە كە فەرموويەتی : كەسێكی باوەڕپێكراوە بەڵام كە بەتەمەن بوو پێدەچێ فەرموودەی یان بۆ باسكردايە هەندێ ( النكارة )ی تێدا بوايە ، كەچی ڕێی پێ دەدا ٠ تەواوبوو ٠

وە پێشەوا ( مسلم )یان عەیبدار دەكرد كە هەڵدەستا بە ( تخريج )كردنی فەموودەكانی ( سُويد )و ، ئەوەش حاڵ وباری بوو ، بەڵام ئیمامی ( مسلم ) ئەو فەرموودانەی لێوە وەگێڕایەوە كە كەسانی تر ( متابعة )یان كردبێ و ، تەنهاش نەبوبێتەوە لە گێڕانەوەیداو ، وە فەرموودەیەكی ( منكر )و ( شاذ )یش نەبێت بە پێچەوانەی ئەم فەرموودەیە ٠ والله أعلم ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پاراستنی تەندروستیدا بە خۆبۆنخۆشكردن :

بۆنی خۆش خۆراكی ڕوحەو ، ڕوحیش ئەوەیە كە هەموو هێزەكانی لەسەر سوار دەكرێت ، هێزەكانیش بە بۆنی خۆش زیاد دەكەن ، زۆریش بەسوودە بۆ مێشك و دڵ و ، هەموو ئەندامە ناوەكیەكانی تر ، دڵ شادومان دەكات ، خۆشی بە نەفس دەدات و ، ڕوح فراوان دەكات و ، باشترین شتە بۆ ڕوح و ، لە هەموو شتێكیش بۆی لە بارترەو ، لە نێوان ئەو و ڕوحدا پەیوەندیەكی نزیك هەیە ، لەبەر هەموو ئەو هۆیانەی سەرەوە بۆنی خۆش یەكێك بوو لە دوو خۆشەویستەكەی دونیا بەلای پێغەمبەری خواوە ﷺ

وفي صحيح البخاري : أنه ﷺ كان لا يَرُدُّ الطِّيبَ([404]).

واتە : بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆنی خۆشی نەدەگەڕاندەوە ٠

[404] ـ صحيح : أخرجه البخاري ( ٣ / ٢٠٥ ) ، ( ٧ / ٢١١ ) عن عروة بن ثابت عن ثمامة عن أنس فذكره

وفي صحيح مسلم عنه ﷺ : (( من عُرِضَ عليه رَيْحانٌ ، فلا يَرُدَّهُ فإنه طَيِّبُ الرِّيح ، خَفِيفُ المَحْمَلِ ))([405]).

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( هەرکەس ڕەیحانەی درایە ، با نەیگەڕێنێتەوە چونکە بۆنی خۆشەو ، هەڵگرتنیشی سووکە )) .

وفي سنن أبي داود والنسائي ، عن أبي هريرة _ رضي الله عنه _ ، عن النبيِّ ﷺ: (( مَنْ عُرِضَ عليه طِيبٌ ، فلا يَرُدَّهُ ، فإنَّه خَفيفُ المَحْمَلِ طَيِّبُ الرَّائحةِ ))([406]) .

واته : له ( أبي هُريرة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ ، له پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی : (( هەرکەس بۆنی خۆش درایە ، با نەیگەڕێنێتەوە ، چونکە هەڵگرتنی سووکەو بۆنیشی خۆشە )) .

وفي مسند البزّارِ : عن النَبيِّ ﷺ أنَّه قال : (( إِنَّ الله طَيِّبٌ يُحِبُّ الطِّيبَ ، نَظِيفٌ يُحِبُّ النَّظَافَةَ ، كَرِيمٌ يُحِبُّ الْكَرَمَ ، جَوَّادٌ يُحِبُّ الْجُودَ ، فَنَظِّفُوا أفناءكُم و ساحاتكُم ، وَلاَ تَشَبَّهُوا بِالْيَهُودِ يجمعُونَ الأُكُبَّ في دورهم ))([407]).

واته له ( مسند )ی ( البَّزار )دا هاتووه : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : خوای تعالى چاکەو حەزی بە بۆنی خۆشە ، پاکەو پاکی خۆش دەوێ ، میهرەبانەو میهرەبانی خۆش دەوێ ، بەخشندەیەو بەخشندەی خۆش دەوێ ، حەوشەو گۆڕەپانەکانتان پاك بکەنەوەو ، خۆتان بە جولەکەکان مەچوێنن کە خۆڵ و خاشاکەکەیان لە ڕێگەکانیاندا کۆدەکەنەوە .

---

[405] _ صحيح : أخرجه مسلم ( ٧ / ٤٨ ) عن الأعرج عن أبي هريرة فذكره .

[406] _ إسناده صحيح : أخرجه أبوداود ( ٤١٧٢ ) ، وصححه الألباني في صحيح الجامع ( ٦٣٩٣ ) .

[407] _ إسناده ضعيف : أخرجه الترمذي ( ٢٨٠٠ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ١٦١٦ ) .

( ابن أبي شيبة ) دەگێڕێتەوە : کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ جۆرێك لە بۆنی خۆشی هەبوو خۆی پێ بۆنخۆش دەکرد ·

وَصَحّ عَنْهُ أَنّهُ قَالَ : (( إِنّ لِلّهِ حَقّا عَلَى كُلّ مُسْلِمٍ أَنْ يَغْتَسِلَ فِي كُلّ سَبْعَةِ أَيّامٍ ، وَإِنْ كَانَ لَهُ طِيبٌ أَنْ يَمَسّ مِنْه ))(٤٠٨)·

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( خوای تعالى ماف بەسەر هەموو موسڵمانێکەوە هەیە کەوا لە هەر حەوت ڕۆژدا خۆی بشوات و ، ئەگەر بۆنی خۆشیشی هەبوو خۆی پێ بۆنخۆش بکات )) ·

بۆنی خۆش چەندین خاسیەتی تێدایە ، لەوانە پەریەکان خۆشیان دەوێ ، شەیتانەکان لێی دوردەکەونەوە ، چونکە خۆشترین شت بەلایانەوە بۆنی ناخۆشی بەدڕنە ، ڕوحە چاکەکان بۆنی خۆشیان خۆش دەوێ و ، ڕوحە پیسەکانیش بۆنە ناخۆشەکانیان بەلاوە خۆشە ، بۆیە هەموو ڕوحێك هەواداری گونجاوی خۆیەتی ، ئافرەتانی ناپاك بۆ پیاوانی ناپاك ، پیاوە پیسەکان بۆ ئافرەتە پیسەکان ، ئافرەتە پاکەکان بۆ پیاوە پاکەکان ، وە پیاوە پاکەکان بۆ ئافرەتە پاکەکان ، هەرچەند ئەم گوفتارە بۆ پیاوان و ئافرەتانە ، بەڵام کردەوەو گوفتارەکان و ، خواردن و خواردنەوەکان و ، پۆشاك و بۆنەکانیش دەگرێتەوە ، یا بە گشتێتی گوفتار ( عموم لفظه ) ، یا بەگشتێتی ماناکەی ·

٤٠٨ _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٢ / ٣ ) ، ومسلم ( ٣ / ٣ ) كلاهما عن عمرو بن سليم عن أبي سعيد الخدري ·

## بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پاراستنی تەندروستی چاودا :

روى أبوداود في سننه : عن عبدالرحمن بن النُّعمان بن معبد بن هَوْذَةَ الأنصاري ، عن أبيه ، عن جده _ رضي الله عنه _ ، أنَّ رسولَ اللهِ ﷺ أمَرَ بِالإثمِدِ المُروَّحِ عِنْدَ النَّوْمِ وقال : (( لِيتَّقِهِ الصَّائِمُ ))([409]).

واتە : لە ( عبدالرحمن )ی کوڕی ( النُّعمان )ی کوڕی ( معبد )ی کوڕی ( هَوْذَةَ الأنصاري )وە ، لە باببیەوە _ لە باپیریەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ دەگێڕێتەوەو دەفەرمێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بەبەکارهێنانی کلی بۆنخۆشکراو بە میسك لە کاتی نووستنداو فەرمووی : (( با ڕۆژووان خۆی لێ بپارێزێت )) ٠

هەروەها پێشەوا ( ابن ماجة ) لە ( سنن )ەکەیداو کەسانی تریش لە ( ابن عباس )ەوە _ خوا لە خۆی وبابیشی ڕازی بێت _ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ کلدانێکی هەبوو چاوی پێ دەڕشت ، سێ جار بۆ هەر چاوێك ٠

وفي الترمذي : عن ابن عباس _ رضي الله عنهما _ ، قال : كان رسول الله ﷺ إذا اكتحل يجعلُ في اليمنَى ثلاثاً ، يبتدىء بها ، ويختم بها ، وفي اليُسْرى ثنتين([410]) .

---

[409] _ إسناده ضعيف : أخرجه أبوداود ( ٢٣٧٧ ) ، وضعفه الألباني في الإرواء ( ٩٣٦ ) ٠

[410] _ صحيح : أخرجه أحمد ( ١ / ٣٥٤ ) ، وعبد بن حميد ( ٥٧٣ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٩٩ ) ، والترمذي ( ١٧٥٧ ) ، ( ٢٠٤٨ ) ، وفي الشمائل ( ٤٩ ) ، ( ٥٠ ) كلهم عن طريق عباد بن منصور عن عكرمة عن ابن عباس ٠

واته : له ( ابن عباس )ەوه _ خوا له خۆی وبابیشی ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر چاوی بڕەشتایه سێ جار کلی دەکردە چاوی ڕاستی ، لەوەوە دەستی پێ دەکردو ، لەویشەوە کۆتایی پێ دەهێنا ، دوو جاریش بۆ چاوی چەپی ٠

وقد روى أبوداود عنه ﷺ: (( مَنْ اكتَحَلَ فَلْيُوتِرْ ))([411]).

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( هەرکەس چاوی ڕەشت با تاك بیڕێژێت )) ٠

باشه ئایا بەتاك ڕەشتن بۆ هەردوو چاوه ، سێ جار بۆ چاوی ڕاست و ، دوو جار بۆ چاوی چەپ ، وه چاوی ڕاست شایستەتر بێ بە دەست پێکردن و پێشخستن ، یاخود بەتاك ڕەشتنەکه بۆ هەر چاوێکه ، سێ جار بۆ چاوی ڕاست و ، سێ جاریش بۆ چاوی چەپ ، ئەمه دوو گوفتاری ئیمامی ( أحمد )و کەسانی دیکەیه٠

کل تەندروستی چاو دەپارێزێت ، ئەو نورو ڕوناکیەی که هۆکاری بینینه بەهێزی دەکات ، پاکیان دەکاتەوه ، ماده خراپەکان نەرم و نیان دەکاتەوەو دەیانکاتە دەرەوه ، هەندێ جۆری کل جوانیەك دەبەخشێتە چاو ، کاتی نووستن سوودو چاکەکانی زیاتر دەبن ، چونکه ئەگەر کل بەکارهێنراو ، پاشان سرەوتن و لە جوڵەکەوتنی زیانبەخشی بەدواوەبوو ، سروشتیش کاری خۆی کرد ، ئەوا سودێکی زیاتر بەچاو دەبەخشێت ، کلی ( الإِثْمِد )یش لەو بارەوه خاسیەتێکی تایبەتی تێدایه ٠

وفي سنن ابن ماجة عن سالم ، عن أبيه يرفعه : (( عليكُمْ بالإِثْمِد ، فإنَّه يَجْلُو البَصَر ، ويُنْبِتُ الشَّعرَ ))([412]) ٠

واته : لە ( سالم )ەوه ، لە بابیەوه لە پێغەمبەری خواوه ﷺ فەرموویەتی : (( کلی ( بالإِثْمِد ) بەکاربێنن ، چونکه بینین بەهێزو چاك دەکات و ، مووی برژانگ دەدەچێنێت )) ٠

---

[411] _ إسناده ضعيف : أخرجه أبوداود ( ٣٥ ) ، وضعفه الألباني في الضعيفة ( ١٠٢٨ ) ٠

[412] _ إسناده صحيح : أخرجه ابن ماجة ( ٣٤٩٥ ) ، وصححه الألباني في صحيح الجامع ( ٤٠٥٦ ) ٠

وفي (( كتاب أبي نعيم )) : (( فإنّهُ منبتةُ للشّعرِ مذهبةٌ للقذى مصفاةُ للبصر ))([٤١٣])٠

واته له كتێبەكەی ( أبي نُعيم ) یشدا بـەم شـێوە هـاتووە : (( دەرهێنـەری مـووە ، لابـەری ڕیپۆقە ، پاكەرەوەی چاوە ))٠

وفي سنن ابن ماجة أيضاً : عن ابـن عبـاس _ رضـي الله عنهمـا _ يرفعـه : (( خـيرُ أكْحـالِكم الإثْمِد ، يجلُو البَصَرَ ، ويُنبت الشَّعرَ ))([٤١٤]) واتـه : ( ابـن عبـاس ) _ خـوا لـه خـۆی وبابیشـی ڕازی بێت _ له فەرموودەیەكدا كه بەرزی دەكاتەوە بۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموويـەتی : (( خێرترین چاوڕشـتنانان بـه كلـی ( الإثْمِـد )ە ، چـونكە چـاو بـەهێز دەكـات و ، مـووی بـرژانگ دەدەچێنێ )) ٠

[٤١٣] _ إسناده صحيح : صححه الألباني في صحيح الترغيب و الترهيب ( ٢١٠٦ ) ٠

[٤١٤] _ إسناده صحيح : أخرجه ابن ماجة ( ٣٤٩٧ ) ، وصححه الألباني في صحيح الجامع ( ٣٣٠٥ ) ٠

# بەشی سێ یەم

## بەشێك : لە باسكردنی ئەو دەرمان و خۆراكە تاكانەدا كە لە زاری پێغەمبەری خواوە ﷺ پێمان گەشتووەو ڕیزكراوە بە پێی پیتە هیجائیەكان :

### پیتی هەمزە ( أ ) :

إثمد : بەردێكی كلی ڕەشە ، لە ( أصبهان )ەوە دەهێنرێت و ، لە هەموو جۆرەكانی دیكەی چاكترە ، هەروەها لە ڕۆژئاواشەوە دەهێنرێت ، چاكترینیشی ئەوەیە كە زوو وورد دەبێ و ، ووردەكەشی تروسكەدارە ، ناوەكەشی نەرمولوسەو هیچ پیسیەكی تێدا نی یە ٠

میزاجی ساردی ووشكەو بۆ چاو بەسوودەو بەهێزی دەكات ، دەمارەكانی بەهێزو پتەو دەكات ، تەندروستی دەپارێزێت ، گۆشتی زیادی نێو برینەكان ناهێڵێت و سارێژی دەكاتەوە ، پیسیەكانی پاك دەكاتەوە ، بەهێزی دەكات ، ئەگەر لە گەڵ هەنگوینی ئاویی ڕووندا ( العسل المائي الرقيق ) بكرێتە چاو سەرئێشە ناهێڵێت ، ئەگەر كوتراو تێكەڵ بەهەندێ بەزی نەرم و تازە ( الشحوم الطرية ) كراو ، شوێنی سووتاوی تێهەڵسوێنرێت ، چینە ووشكەكەی بەسەرەوە دروست نابێت پاش سارێژبوونەوەی برینەكە ، هەروەها بەسوودە بۆ ئەو بلّق و تلۆقانەی بەهۆیەوە دروست دەبێت ، باشترین كلەكانی چاوە بەتايبەت بۆ مرۆڤە بەتەمەنەكان و ، ئەوانەی چاویان لاواز بووە ئەگەر كەمێك ( المسك )ی تێكەڵ بكرێت ٠

أُتْرُج ([415]): ثبتَ في الصحيح عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أنّهُ قَالَ : (( مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرأُ الْقُرآنَ كَمَثَلِ الأُتْرُجَّةِ ، طَعْمُهَا طَيِّبٌ وَرِيحُهَا طَيِّبٌ ))([416]).

واتـه لـه فەرموودەيـەكى ( صـحيح )دا پێغەمبـەرى خـوا ﷺ فەرموويەتى:((نموونـەى ئـەو بڕوادارەى قورئان دەخوێنێت ، وەكو نموونەى (أُتْرُج )ە، تامى خۆشەو ، بۆنيشى خۆشە )).

( أُتْرُج ) سوودێكى زۆرى تێدايە ، لە چوار شت پێكهـاتووه ، توێكڵ ، ناوكـەرە ، ترشـى ، تۆو ، هەر دانەيەكيان ميزاجێكى تايبەتى هەيە ، بۆيە توێكڵەكەى گەرمى ووشكە ، ناوكـەرەى گەرمى تەڕە ، ترشيەكەى ساردى ووشكە ، تۆوەكەى گەرمى ووشكە .

لە سوودەكانى توێكڵەكەى : ئەگەر لە نێو پۆشـاكدا دابنرێـت ئـەوا قەدەغـەى مۆرانـەى لـێ دەكات ، بۆنەكەى خراپى هەوا هەروەها درم چـاك دەكـات ، ئەگـەر لـە دەمـدا ڕاگيرێـت بـۆنى خۆش دەكات ، باى نێو سك شيى دەكاتەوە ، ئەگەر بكرێتە نێـو چێشـتەوە وەكـو بـەهارات ، يارمەتى هەرسكردن دەدات ، دانەرى ( القانون ) دەڵێت :

گوشراوى توێكڵەكەى ئەگەر بخورێتەوە بۆ گەزتنى مار بەسوودە ، وە توێكڵەكەشـى وەكـو دەرمانێك دەخرێتە سەر برين ، سووتێنراوى توێكڵەكەى تـێ هەڵسويەكى باشـە بـۆ نەخۆشـى بەڵەكى . گوفتارەكانى تەواوبوو .

---

[415] ـ أترج : درەختێكە لە مزرەمەنيەكان ، درێژێكەى دەگاتە پێنج مەتر ، لق و گەڵاكانى نەرمن ، گوڵەكانى سپيەو ، بەرەكانى لە لیمۆ دەچێت بەڵام زۆر گەورەترە ، ڕەنگێكى پرتەقاڵى زێڕينى هەيە ، بۆنێكى خۆشى هەيەو ئاوەكەى ترشە . بڕوانە : ar.wikipedia.org/wik .

[416] ـ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ٨ / ٥٩ ) ، ومسلم ( ٧٩٧ ) .

بەڵام ناوگەرەی : گەرمی نێو گەدە سووك دەكاتەوە ، بۆ تووشبوان بە ( المِرَّة الصفراء ) بەسوودە ، دامركێنەری هەڵمە گەرمەكانە . ( الغافقي ) دەڵێت : خواردنی ناوگەرەی بۆ تووشبوان بە نەخۆشی مایەسیری بەسوودە .

بەڵام ترشیەكەی : قەبزكارەو شكێنەری ( الصفراء )ە ، هێمنكەرەوەی دڵ لێدانی خێرایە ، بەسوودە بۆ زەردووی وەكو خواردنەوەو وەكو چاو پێ ڕەشتنیشی ، ڕشانەوەی زەردوای دەوەستێنێت ، دڵكەرەوەیە بۆ خواردنی زیاتر ، هێمنكەرەوەیە بۆ سروشت ، بۆ تووشبوان بە نەخۆشی ڕەوانی زەرداوی بە سوودە ، گوشراوە ترشەكەی شەهوەت و ئارەزووكردنی كۆنترۆڵ نەكراو بەرامبەر بە ژنان ( غلمة النساء ) هێمن دەكاتەوە ، ئەگەر دەم و چاوی تێ هەڵسوی پەڵەكانی ناهێڵێت ، نەخۆشی ووشك هەڵاتو و قڵێشانی پێست و نەمانی تووك و موو بەسەریەوە ناهێڵێت ، بەبەڵگەی لابردنی ئەو مەرەكەبەی دەكەوێتە سەر پۆشاك ، هەروەها هێزێكی نەرم و نیان كەرەوەو ، لابردن و نەهێڵان و ، ساردكەرەوەی تێدایە ، گەرمی جگەر دوكوژێنێتەوە ، گەدە بەهێز دەكات ، تیژی ( المِرّة الصفراء )و ، ئەو خەمەی بەهۆیەوە تووشی مرۆڤ دەبێت ناهێڵێت ، تینوێتی هێمن دەكاتەوە .

بەڵام تۆوەكەی : هێزێكی شیی كەرەوەی ووشكەرەوەی هەیە . ( ابن ماسوية ) دەڵێت : خاسیەتی تۆوەكەی بەسوودە بۆ ژەهرە كوشندەكان ئەگەر بە كێشی مسقاڵێك بخورێتەوەو توێكڵەكەی لابرابێت بە ئاوێكی شلەتێن ، بە كوڵاندن ڕوویێكی بە سوودی هەیە ئەگەر بكوترێت و بخرێتە شوێنی گەزتنەوە ، بۆی بەسوود دەبێ ، بۆن و بەرام خۆش دەكات و ، زۆربەی ئەم كارنەش لە توێكڵەكەیدایە .

كەسانی دیكەش گوتویانە : خاسیەتی تۆوەكەی بۆ پێوەدانی دووپشك بە سوودە ، ئەگەر بەكێشی دوو مسقاڵ بخورێتەوەو توێكڵەكەی لابرابێت لە ئاوێكی شلەتێندا ، هەروەها ئەگەر كوتراو خرایە سەر جێگەی گەزتن بە سوود دەبێ .

كەسانی تریش گوتویانە : تۆوەكەی بەسوودە بۆ تێكڕای ژەهەرەكان ، هەروەها بەسوودە بۆ گەتنی تێكڕای جانەوەران ٠

باسكراوە كەوا یەكێك لە كیسراكان توورەبوو بەرامبەر بە كۆمەڵێك لە پزیشكان و ، فەرمانیدا بخرێنە بەندیخانەوەو ، سەرپشكی كردن پێخۆرێك هەڵبژێرن و لەوە زیاتریان نادرێتی ، ئەوانیش( أُتْرُج )یان هەڵبژارد ، پێیان گوترا : بۆ ئەمەتان لە جێگەی هەموو خواردنەكانی تر هەڵبژارد ؟ ئەوانیش گوتیان : چونكە لە باری ئێستادا ڕەیحانە ، دیمەنی دڵخۆشكارە ، توێكڵەكەی بۆنی خۆشە ، ناوكەرەی میوەیە ، ترشەكەی پێخۆرە ، تۆوەكەی دژەژەهرە ، چەوریشی تێدایە ٠

بۆیە شتێك ئەمە سوودەكانی بێت بەڕاستی شایستەیە كەوا پاڵاوتەو پوختی بونەوەرانی پێ بچوێنرێت ، ئەویش ئەو بڕوادارەیە كە قورئان دەخوێنێت ، كەسانێكی پێشینی چاك حەزیان دەكرد تەماشای بكەن چونكە تەماشاكردنی دیمەنەكەی دڵ خۆشی دەكردن ٠

أُرُز : واتە : برنج ، دوو فەرموودەی پۆچی ( موضوع )ی لە بارەوە هاتووە :

یەكەمیان : بەڕاستی ئەگەر پیاو بوایە ، میهرەبان دەبوو ٠

دووەم : هەموو شتێك لە زەوی دەرهاتبێ نەخۆشی و دەرمانێكی تێدایە جگە لە برنج : بەڕاستی شیفایەو نەخۆشی تێدا نیە ٠ لێرەدا ئەم دوو فەرموودەیەمان باس كردوە بۆ ئاگاداركرنەوە نەوەكو بدرێتە پاڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ٠

دوای ئەوەش برنج گەرمی ووشكە ، لە دوای گەنم چاكترین خۆراكە ، خەڵتەیەكی چاك دروست دەكات ، سك توند دەكات بە توندكردنێكی كەم ، گەدە بەهێز دەكات ، خۆشەی دەكات و ، تیایدا دەمێنێتەوە ، پزیشكە هندیەكان وارادەگەینن كە چاكترین و بەسوودترین

خۆراكه ئەگەر بە شیری مانگاوه لێنرا ، جەستە بەفرو چاك دەكات ، تۆماوی نێرینە زۆر دەكات ، خۆراكیكی چاك به جەسته دەبەخشێت ، ڕەنگ ڕوون دەكاتەوه ٠

أَرْزٌ ، بفتح الهمزة وسكون الراء ، واته : درەختی كاژ : پێغەمبەری خوا ﷺ لەم فەرموودەیەدا باسی كردووه : (( مَثَلُ الْمُؤْمِنِ كَمَثَلِ الْخَامَةِ مِنَ الزَّرْعِ ، تُفَيِّئُهَا الرِّيَاحُ ، تُقيمُها مَرَّةً ، وتُميلُها أُخْرَى ، ومَثَلُ الْكَافِرِ مَثَلُ الأَرْزَةِ التي لا تزَالُ قائِمةً عَلَى أَصْلِهَا حَتَّى يَكُونَ انْجِعافُهَا مَرَّةً وَاحِدَةً ))([417]) ٠

واته : (( نموونەی بڕوادار نموونەی ڕوەكێكی تەڕو پاراوه ، با دەیجولێنێت ، جاریَ ڕاستی دەكاتەوەو ، جارێكیش لاری دەكاتەوه ، نموونەی كەسی دووڕووش نموونەی درختێكی كاژه كه بەردەوام له سەر بنەڕەتەكەی سەقامگیره تا بەیەك جار له ڕیشه هەڵدەكەنرێت )) ٠

تۆووی كاژ گەرمی شێداره ، خاسیەتەكانی پێگەیاندن و نەرم كردنەوەو ، شیی كردنەوەی تێدایه ، هەروەها سیفەتی چوزانەوەی تێدایه بەڵام به خوساندنی له ئاودا لادەچێت ، دەڕنگ هەرسه ، خۆراكێكی زۆر دەبەخشێت ، بۆ كۆكه باشه ، شیَ و تەڕیەكانی كۆئەندامی هەناسه پاك دەكاتەوه ، تۆماوی نێرینە زۆر دەكات ، ژانه سك دروست دەكات و ، دەرمانەكەشی هەناری مزره كه چاكی دەكات ٠

إِذْخِرٌ : ثبت في الصحيح ، عنه ﷺ أنه قال في مكةَ : لا يُختَلَى خَلاهَا ، فقال له العباس _ رضي الله عنه : إلا الإذخِر يا رسولَ الله فإنه لِقَيْنِهم ولبيوتهم ، فقال : إلا الإذخِر([418]) ٠

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە مەككه فەرمووی : ڕووەكی تەڕی نابڕدرێت ، ( عباس ) _ خوا له خۆی وبابیشی ڕازی بێت _ پێی فەرموو : جگه له ( ألإذخِرْ ) ئەی

[417] _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ١٠ / ٩٢ ) ، ومسلم ( ٢٨١٠ ) ٠
[418] _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ٤ / ٤٠ ) ، ومسلم ( ١٣٥٣ ) ٠

پێغەمبەری خوا ﷺ چونکە بۆ ماڵ و بۆ پیشەسازیەکانیانە ، ئەویش فەرمووی : جگە لە ( الإذخِرْ ) ٠

( الإذخِرْ ) گەرمە لە دووەمدا ، ووشکە لە یەکەمدا ، نەرم ونیانە و کونیلە داخراوەکان و ، دەمی ڕەگەکان دەکاتەوە ، مێزو خوێنی بێنوێژی زۆر دەکات ، بەرد وەرد دەکات ، ئاوسانی ڕەقی نێو گەدەو جگەرو گورچیلە شیی دەکاتەوە بەخواردنەوەو بەخستنەسەرو بەپێچانیش ، ڕیشەکانیشی کۆڵەکەی ددان و گەدە بەهێز دەکات ، دڵ تێکەڵ هاتن هێمن دەکاتەوە ، سك دەگرێتەوە ٠

## پیتی باء ( ب ) :

بطیخ ، واتە : کاڵەك : روى أبوداود والترمذي ، عن النبيِّ ﷺ، أنه كان يأكل البِطيخَ بالرُّطَبِ ، يقول : نَكْسِرُ حَرَّ هَذا بِبَرْدِ هذا ، وبَرْدَ هَذا بِحَرِّ هذا([419]).

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ کاڵەك و خورمای ڕوتابی تازەپێگەیوی بەیەکەوە دەخوارد ، دەیفەرموو : گەرمی ئەمە بەسەردی ئەمە دەشکێنین و ، سەردی ئەمەش بە گەرمی ئەمە ٠

سەبارەت بە کاڵەك چەند فەرموودەیەك هاتووە جگە لەم فەرموودەیە ئەوانی تر (صحیح ) نین ، مەبەستیش بەکاڵەك جۆرە سەوزەکەیەتی ، ساردی تەڕوشێدارە ، پاك کەرەوەیە ، بەبەراوردی کالیارو خەیار زۆر بەخێرای لە گەدەوە لێژ دەبێتەوە ، زۆر بەخێرایی دەگۆڕێت بۆ هەر تێکەڵاوێك ڕێکەوتی بێت لە گەدەدا ، ئەگەر کەسێك تای هەبێ و بیخوات سودێکی زۆری لێ دەبینێت ، بۆ ئەو کەسەش پلەی گەرمی جەستەی دابەزیووەو سەرمای بووە ئەگەر کەمێك زەنجەفیل و بەو هاوشێوانەی تێکەڵ بکات زیانی نابێت ، پێویستە پێش خۆراك بخورێت و ، پاشان خۆراکەکە بخورێت ، ئەگینا تووشی دڵ تێکەڵ هاتن و ڕشانەوە دەبێت.

---

[419] ــ إسناده صحيح : أخرجه أبوداود ( ٣٨٣٦ ) ، والترمذي ( ١٨٤٤ ) ، وصححه الألباني في الصحيحة ( ٥٧ ) ٠

كەسانێك لە دانایان دەڵێن : ئەگەر پێش خۆراك بخورێت سك بەجوانی دەشواتەوەو ، لە بنەڕەتەوە نەخۆشیەكە ناهێڵێت ٠

بَلَحٌ، واتە : خورمای پێنەگەیوو ، روى النسائي وابن ماجة في سننهما : من حديث هشام بن عروة ، عن أبيه ، عن عائشة _ رضي الله عنهما _ قالت : قال رسول الله ﷺ : كُلُوا البلحَ بالتَّمرِ ، فإنَّ الشيطانَ إذا نظرَ إلى ابن آدمَ يأكُلُ البَلَحَ بالتَمرِ يقولُ : بَقيَ ابنُ آدمَ حتى أكلَ الحَديثَ بالعَتَيق ([420]).

واتە : لە خاتوو ( عائشة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : خورمای پێنەگەیو بە خورماوە بخۆن ، چونكە ئەگەر شەیتان تەماشای نەوەی ئادەم بكات كە خورمای پێنەگەیو بە خورماوە دەخوات دەڵێت : نەوەی ئادەم مایەوە تا نوێی بە كۆنەوە خوارد ٠

لە ( ریوایە )تێكی تریشدا : كُلُوا البَلَحَ بالتَّمرِ ، فإنَّ الشَّيطانَ يحزَنُ إذا رأى ابنَ آدمَ يأكُلُهُ يقولُ : عاشَ ابنُ آدمَ حتى أكل الجَديَدَ بالخَلَقِ ٠ رواه البزار في مسنده ، وهذا لفظه ، واتە : شەیتان دڵگران دەبێ ئەگەر تەماشای نەوەی ئادەم بكات ئەو دوانە بەیەكەوە دەخوات و دەڵێت : نەوەی ئادەم ژیا تاوەكو نوێی بە كۆنەوە خوارد٠

دەڵێم _ ابن القيم _ ( باء )ی ووشەی ( بِالتَّمر ) بەمانای : لەگەڵ دێت ، واتە : ئەمە لە گەڵ ئەمەدا بخۆن٠ هەندێ لە پزیشكە موسڵمانەكان گوتویانە : لە ڕاستیدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی داوە بە خواردنی خورمانی پێنەگەیوو بە خورماوە ، چونكە خورمای پێنەگەیو ساردی ووشكەو ، خورماش گەرمی تەڕوشێدارەو ، هەردوكیان یەكتر چاك دەكەنەوە ، بەڵام فەرمانی نەداوە بە خواردنی ئەو خورمایەی تازە شیرینی تێكەوتووە ( البُسر ) بە خورماوە ،

[420] _ موضوع : أخرجه ابن ماجة ( ٣٣٣٠ ) ، وضعفه الألباني في الضعيفة ( ٢٣١ ) ، بلفظ : ( الجديد بالخلق )

چونكه هەريەكێكيان گەرمن ، ئەگەرچى خورما گەرمى زۆرتـره ، چـونكه لـه ڕووى پزيشكەوه نابێ نێوان دوو گەرم ياخود دوو سارد كۆبكرێتەوه ، وەكو پێشتريش ئاماژەى پێدراوه ٠

ئەم فەرموودەيه : ڕاستێتى بنچينەى پيشەسازى پزيشـكيتێمان بـۆ ڕوون دەكاتـەوه ، لـه گەڵ چاودێريكردنى ئەو چارەسازيەى بەكاردێت و چاكه بۆ دورخستنەوەى چۆنيەتى خـۆراك و دەرمانەكان هەندێكيان به هەندێكى تر ، له گەڵ چاودێرى كردنى ئـەو ياسـا پزيشـكێتيەى كـه تەندروستى پىێ دەپارێزرێت ٠

خورمـاى پێنەگـەيوو ( الـبلح ) سـاردى و ووشـكێتى تێدايـەو ، بـۆ دەم و پـووك و گـەدە بەسوودە ، بەڵام بۆ سنگ و سييەكان باش نى يـه بـەهۆى ئـەو زبـرى و ڕقيـەى تيايدايـه ، لـه گـەدەدا خـاوەو خـۆراك بەخشـينى كەمـه ، خورمـاى پێنەگـەيوى دارە خورمـا ( بلـح ) وەكـو بەرسيلەى ( الحِصْرِم ) درەختى تـرێ يـه ، كـه هـەردوكيان بـاو ، قوڕەقـوڕەو ، سك ئاوسـان دروست دەكەن ، بەتايبەت ئەگەر ئاويان بەسەردا خورايەوه ، بۆ دورخسـتنەوەى ئـەو زيانانـه خورما ، ياخود هەنگوێن ياخود كەرەى له گەڵدا دەخورێت ٠

بُسْرٌ : ثبت في الصحيح : أنَّ أباهيثم بن التَّيهان ، لما ضافه النبيُّ وأبوبكر وعمر _ رضي الله عنهما _ ، جاءهم بِعذْقٍ _ وهو من النخلة كالعُنقُودِ من العنب _ فقال له : هلا انتقَيتَ لنا من رُطَبِه فقال : أحببتُ أن تَنْتَقُوا من بُسرهِ ورُطَبِهِ([٤٢١]).

واته : له فەرموودەى ( صحيح )دا هاتووه : كاتێك كه پێغەمبەرى خوا ﷺ بەهاوڵێتى ( أبوبكر ) و ( عمر ) بوون به ميوانى ( أبا الهيثم )ى كوڕى ( التَّيهان ) ، هێشويەكى فەريكه خورماى بۆ هێنان و داينا ، پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : بۆ خورماى پێگەشتوت بۆ

[٤٢١] _ إسناده صحيح : أخرجه الترمذي ( ٣٣٧٠ ) ، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ( ١٩٣١ ) ٠

هەڵنەبژاردوین گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ویستم بە ئارەزووی خۆتان لەو خورمایەی تازە شیرینی تێکەوتووەو ( بُسرِه ) لە خورما ڕوتابە پێگەیووەکەی هەڵبژێرن ٠

خورمای تازە شیرینی تێکەوتوو ( البُسر ) گەرمی ووشکە ، ووشکیەکەی لە گەرمیەکەی زۆرترە ، شێ و تەڕی ووشك دەکاتەوە ، گەدە خۆشە دەکات ، قەبزبوون دروست دەکات ، بۆ دەم و پووك باشە ، بەسوودتریشنیشی ئەوەیە کە نەرم و شیرینە ، بەڵام زۆر خواردنی هەردوو جۆری خورمای پێنەگەیو و ئەوەی کە تازە شیرینی تێکەوتووە لە هەناودا کونیلە دەبەستن ٠

البَیْضُ ، واتە : هێلکە ، پێشەوا ( البیهقي ) لە کتێبی ( شُعَبِ الإیمان )دا ( أثر )ێکی ( مرفوع ) باس دەکات : کەوا پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران سکاڵای لاوازیی بردە لای خوای تعالی ، ئەوبوو فەرمانی پێدا هێلکە بخوات ٠ بەڵام ( صحیح )ی ( أثر )ەکە جێگەی تێڕوانینە ٠

لە هێلکەدا نوێ هەڵدەبژێردرێت بەسەر کۆنداو ، هێلکەی مریشك بەسەر تێکڕای باڵندەکانی دیکەدا ، مام ناوەندەو کەمێك مەیلی ساردی دەکات ٠

دانەری کتێبی ( القانون ) دەڵێت : زەردینەی هێلکە : گەرمی تەڕو شێدارەو ، خوێنێکی تەندروستی چاك دروست دەکات و ، خۆراکێکی کەم دەبەخشێت ، ئەگەر نەرم بێ بەخێرایی لە گەدەوە لیژ دەبێتەوە ٠

کەسانی دیکەش گوتویانە : زەردێنەی هێلکە : دامرکێنی ئازارە ، سافکاری گەرو و بۆڕی سیی یەکانە ، بۆ گەرو و کۆکەو برینەکانی سیی و گورچیلەو میزڵدان بەسوودە ، زبری ناهێڵێت ، بەتایبەت ئەگەر لە گەڵ ڕۆنی بادەمی شیریندا ( دهن اللوز الحلو ) بەکارهێنرا ، پێگەیەنەری خەڵتەکانی سنگە ، نەرمیان دەکاتەوە ، زبری گەرو نەرم دەکاتەوە ، سپینەی هێلکە ئەگەر بکرێتە چاوێکی ئاوساوی گەرمی بەئازار ، ساردی دەکاتەوەو ، ئازارەکەی

دادەمرکێنێت ، ئەگەر جێگەی سوتاوی تێهەڵسوێنرێت، تلۆقەو بلقی ئاوی دروست ناکات ، ئەگەر دەم و چاوی تێهەڵسوێنرێت ناهێڵێت بەهۆی گەرمی هەتاوەوە بسوتێت ، ئەگەر لە گەڵ ( الكُنْدُر )دا([٤٢٢]) تێکەڵ کراو نێوچاوانی تێهەڵسوێنرا ، بۆ سەرماو هەڵامەت بەسوودە ٠

دانەری کتێبی ( القانون ) لە ڕیزی دەرمانەکانی دڵدا باسی کردووەو ، پاشان گوتویەتی : ئەگەرچی لە دەرمانە ڕەهاکان نی یە بەڵام کارێکی زۆر لە بەهێزکردنی دڵ دەکات ، دەڵێت : مەبەستم زەردێنەکەیەتی ، ئەوەش بۆ سێ هۆکار دەگەڕێتەوە : خێرا گۆڕینی بۆ خوێن ، کەمی پاشماوەی ، ئەو خوێنەی لێی دروست دەبێ چونیەکی ئەو خوێنەیە کە دەچێت بۆ دڵ و سووکەو بە پەلە تێکەڵی دەبێ ، بۆیە گونجاوترین شتێکە کە ڕووی بە ڕووی ئەو نەخۆشیانە دەکرێتەوە کە گەوهەری ڕوح و خوێن شیی دەکەنەوە ٠

بَصَلٌ ، واتە : پیاز ، روى أبوداود في سننه : عن عائشة _ رضي الله عنها ، أنها سُئِلَتْ عن البصل ، فقالت : إنَّ آخرَ طعام أكلَهُ رسولُ الله ﷺ كان فيه بَصَل([٤٢٣])

[٤٢٢] _ الكُندُر : ناوی کەتیرەی درەختۆکەیەکی دڕکاویە نزیکەی دوو مەتر بەرز دەبێتەوە ، گەڵاو دەنکی زۆر لە مۆرد دەچێ ، لە شوێنی گەرم دەڕوێت وەکو وەڵاتەکانی عەممان و یەمەن ، باشترین جۆری ئەوەیە کە تازەو نەرم بێت ، ڕووی دەرەوەی سپی دیارەو بە ئاسانی ناشکێ ، کەشکاندت ناوەکەی چەسپی ڕەنگ زەردی زێڕیە ، یەکێکی تر لە نیشانەکانی ( الكُندُر )ی پوخت ئەوەیە کە بەجوانی دەسوتێ ، بەڵام ئەوەی کە کتیرەی عەرەبی و صنەوبەری تێکەڵ کرابێت ناسوتێت ، هەرچی کەتیرەی عەرەبیە ناسوتێ و کەتیرەی صنەوبەریش تەنها دوکەڵ دەکات و گڕ ناگرێت ٠ بەم جۆرە بەکار دێت : سەرەتا لە نێو ئارەقی ڕازیانە بخوسێ ئەگەر دەتەوێت لە گەڵ مەڵحەمی بخەیت ئەوا لە ناو سرکەدا بیخوسێنە ٠ کە بەتەنها بخورێ دوو تاوەکو پێنج گرام بۆ یەکجارە ، بڕوانە کتێبی : سروشت و تەندروستی ، صالح عبدالله ابراهیم ٠ وەرگێڕ ٠

[٤٢٣] _ حسن : أخرجه أحمد ( ٦ / ٨٩ ) ، وأبوداود ( ٣٨٢٩ ) ، كلهم عن أبي زياد خيار بن سلمة عن عائشة فذكرته ٠

واته : سەبارەت بە پیاز لە خاتوو ( عائشة )یان پرسی _ خوای لیَ ڕازی بێت _ ، ئەویش فەرمووی : کۆتا ئەو خۆراکانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ خواردی پیازی تێدا بووە ٠

لە ( الصحیحین )دا جێگیربووە: کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە ئەو کەسانەی پیاز دەخۆن بچنە مزگەوتەوە ٠

پیاز گەرمە لە سیَ پەمدا ، تەڕی و شێیەکی زیادی تێدایە بەسوودە بۆ گۆڕانی ئاو ، با ژەهراویەکان دوردەخاتەوە ، شەهوەت و ئارەزوو دەکاتەوە ، گەدە بەهێز دەکات ، ئارەزووی جووتبوون دەوروژێنێت ، تۆماوی نێرینە زیاد دەکات ، ڕەنگ جوان دەکاتەوە ، بەڵغەم ناهێڵێت ، گەدە پاك دەکاتەوە ، تۆوەکەی نەخۆشی بەڵەکی ناهێڵێت ، دەهێنرێت بە چوار دەوری نەخۆشی تووك وەرانی دەردە ڕێویدا ، زۆر بۆی بەسوود دەبێت ، لە گەڵ خوێدا بالووکە هەڵدەکەنێت ، ئەو کەسەی دەرمانێکی ڕەوانکاری خواردبێت و بۆنی پیاز بکات ناهێڵێت تووشی ڕەشانەوەو دڵ تێکەڵ هاتن بێت و بۆنی ئەو دەرمانەش ناهێڵێت ، ئەگەر ئاوەکەی بکرێتە لووت ، سەر پاك دەکاتەوە ، دەکرێتە گویَ بۆ قورس بیستن و زرنگانەوەو کێم و ، ئەو ئاوەی لە گویکاندا دروست دەبیَ ، بەسوودە بۆ ئەو ئاوەی کە لە چاودا دروست دەبیَ بەوەی تۆوەکەی لە گەڵ هەنگوێندا چاوی پیَ دەڕێژرێت بەسەر سپیای چاودا ، کووڵاوی پیاز خۆراکێکی زۆری تێدایەو بۆ زەردووی و کۆکەو ، زبری سنگ بەسوودە ، میز زیاد دەکات ، خوو نەرم ونیان دەکاتەوە ، بەسوودە بۆ گەزتنی سەگی ناهار ئەگەر لە گەڵ سپەندو ( السذاب )([٤٢٤]) خوێدا تێکەڵ کراو بەسەر ئەو جێگەیەدا چکێنرا ، ئەگەر هەڵبگیرێت ، دەمی مایەسیری دەکاتەوە ٠

٤٢٤_ السذاب : ڕووەکێکی گیایەو ، ( ٥٠ _ ١٠٠ سم ) درێژ دەبێتەوە ، قەدێکی ڕەق و ووشك هەیە ، لقەکانی گەڵایەکی چڕی سەوزی مەیلەو شینی پێوەیە ، کۆتایی لقەکان کۆمەڵە گوڵێکی زەردی بۆنداری بەهێز هەڵدەگرن ، لە کۆتایی وەرزی هاوێندا دەرچوونی گوڵەکان تەواو دەبیَ ، ئەم ڕووەکە گەڵاکانی بەکاردێن و ،

زيانەكانى : نەخۆشى شەقيقە دروست دەكات ، سەر دەيەشێنێت ، با دروست دەكات ، چاو تارێك دەكات ، زۆر خواردنى نەخۆشى بيرچوون دروست دەكات ، ئەقلْ خراپ دەكات ، بۆنى دەم ناخۆش دەكات ، زيان بەو كەسە دەگەيەنێت كە لە گەڵتدا دانيشتووە ، هۆكارى بێزاربوونى پەريەكانە ، بەڵام ئەگەر كوڵێندرا ئەم زيانانەى لىٚ دور دەخاتەوە ٠

لە ( السنن )ەكاندا هاتووە كەوا پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمانى داوە بەو كەسانەى سيرو پياز دەخون بيانمرێنن بە كوڵاندن ٠

جوينى هەندىٚ لە گەڵاى سپەند بۆنەكەى ناهێڵێت ٠

باذنجان ، لە فەرموودەيەكى ( موضوع )ى هەڵبەستراودا بەدەمى پێغەمبەرى خواوە ﷺ هاتووە : بايجان بۆ چارەسەركردنى هەر نەخۆشيەكە كە لە پێناويدا بخورێت ، ئەم قسەيە بە ناشيرين دادەنرێت بدرێتە پاڵ تاكە تاكەى ئاقڵ و ژيران ، سەرەڕاى پێغەمبەرانيش ، بايجان دوو جۆرە : سپى و ڕەش ، جياوازى لە نێوان زاناياندا هەيە سەبارەت بەوەى ئايا گەرمە ياخود ساردە ؟ ڕاستيش : گەرمە ، ( السوداء )و مايەسيرى ، كونيلەى داخراو شيرپەنجەو گولى دروست دەكات ، ڕەنگ خراپ دەكات و ڕەشى دەكاتەوە ، زيان بە بۆنى ناخۆشى دەم دەگەيەنێت ، بەڵام جۆرە سپيەكەى هيچ كام لەوانەى تێدا نى يە ٠

---

ئێستا لە چياو ، دۆلْ و ، نزيك بە ماڵان و ، ئەم لاو ئەو لاى ڕێگاكاندا لە زۆربەى وەڵاتانى جيهان دەڕوێت ، وە چەندين سوودى پزيشكى هەيە ٠ بڕوانە : www.khayma.com/hawaj/sothab.htm ، وەرگێڕ ٠

## پيتى تاء ( ت )

تَمْرٌ ، واته : خورما ، ثبت في الصحيح عنه ﷺ مَن تَصَبَّحَ بِسَبْعِ تَمْرَاتٍ وفي لفظٍ : مِن تَمْر العَالية لم يَضُرُّه ذلك اليَوْمَ سُمٌّ ولا سِحْرٌ([٤٢٥]).

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : هەرکەس بەیانیان حەوت خورما ، لە بێژەیەکی تریشدا : لە خورمای ( عالية ) _ شوێنێکە لە مەدینەی پیرۆز _ بخوات ئیتر ئەو ڕۆژە ژەهرو جادوو زیانی پیّ ناگەیەنن ٠

وثبت عنه أنه قال : بيتٌ لا تَمْرَ فيه جِيَاعٌ أهلُهُ([٤٢٦]).
واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ماڵێك خورمای تێدا نەبیّ دانشتوانی لە برسێتیدان ٠

هەروەها جێگیربووە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ خورمای بە کەرێ وە خواردووە ، خورمای بە نانەوە خواردووە ، بەتەنهاش خواردویەتی ٠

خورما گەرمە لە دووەمدا ، وە ئایا تەڕی شێدارە لە یەکەمدا ، یاخود ووشکە ؟ لەم بارەوە دوو گوفتار هەیە٠ جگەر بەهێز دەکات ، خووی مرۆڤ نەرم و نیان دەکاتەوە ، ئارەزووی جووتبوون زیاد دەکات ، بەتایبەت لە گەڵ تۆوی کاژدا( حب الصنوبر ) ، زبری گەروو چاك دەکاتەوە ، بەڵام ئەو کەسانەی لەسەری ڕانەهاتوون وەکو دانیشتوانی وەڵاتە ساردەکان کونیلەی داخراویان ( السّدد ) بۆ دروست دەکات ، زیان بەددان دەگەیەنێت ، سەرئێشە دەورووژێنێت ، بۆ دورخستنەوەی زیانەکانی بادەم و خەشخاشی( اللوز والخشخاش ) لە گەڵدا بەکاردێت ، زیاتر لە هەموو میوەکانی تر خۆراك دەبەخشێتە جەستە بەهۆی ئەو گەوهەرە

---

[٤٢٥] _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ١٠ / ٢٠٣ ، ٢٠٤ ) ، ومسلم ( ٢٠٤٧ ) ٠

[٤٢٦] _ صحيح : أخرجه مسلم ( ٢٠٤٦ ) ٠

گەرمە شێدارەی کە تیایدایە ، خواردنی پێش نان خواردنی بەیانی کرم دەکوژێت ، چونکە لە گەڵ گەرمیەکەیدا هێزێکی دەرمانی دروست دەکات ، ئەگەر بەردەوام پێش نان خواردنی بەیانی بەکارهێنرا ، مادەی کرم سووك دەکاتەوە ، لاوازیان دەکات و کەمیان دەکاتەوە ، یاخود دەیانکوژێت ، خورما میوەو خۆراکە ، دەرمان و خواردنەوەو شیرینیە ٠

تِينٌ ؛ واتە : هەنجیر ، لەبەر ئەوەی هەنجیر لە زەوی حیجازو مەدینەی پیرۆزدا نی یە ، ناویشی لە سوونەتدا نەهاتووە ، چونکە خاکێکی جیاوازی پێویستە بەبەراوردی خاکی دارەخورما ، بەڵام خوای تعالی لە قورئاندا سوێندی پێ خواردووە ، لەبەر زۆری سوودو کەڵکی ، ڕاستیش : ئەو هەنجیرەی خوای تعالی سوێندی پێ خواردووە : هەنجیرە ناسراوەکەیە ٠

هەنجیر گەرمە ، سەبارەت بە تەڕی و ووشکیەکەی دوو گوفتار هەیە ، چاکترینی : سپیەکەیەتی کە توێکڵەکەی پێگەیووە ، لمی نێو گورچیلەو میزڵدان پاك دەکاتەوە ، دژ بە ژەهرەکانە ، زیاد لە هەموو میوەکانی تر خۆراك دەبخشێ و بۆ زبری گەرو و سنگ و ، هەروەها بۆ بۆڕی هەوا بەسوودە ، گورچیلەو سپڵ دەشواتەوە ، خەڵتەی بەڵغەمی لە گەدەدا پاك دەکاتەوە ، خۆراکێکی چاك بە جەستە دەبەخشێت ، بەڵام ئەگەر زۆری لێ خورا ئەسپێ دروست دەکات ٠

ووشکەکەی خۆراك بەخشەو ، بۆ دەمارەکان بەسوودە ، ئەگەر لە گەڵ گوێزو بادەمدا بخورێت چاکترە ٠ ( جالینوس ) دەڵێت : ئەگەر لە گەڵ سپەندو ( السذاب ) گوێزدا خورا پێش ژاهراوی بوون ، بەسوود دەبێ و ، لە زیانیش دەیپارێزێت ٠

ويذكرُ عن أبي الدّرداءِ أهديَ إلى النبيّ ﷺ طبقٌ من تينٍ فقال : (( كُلُوا )) وأكل منهُ وقال : (( فلو قلتُ إن فاكهةً نزلت من الجنةِ قلت : هذه لأنّ فاكهةَ الجنةِ بلا عجمٍ ، فكُلُوا منها فإنّها تقطعُ البواسيرَ وتنفعُ من النّقرس ))([427]) وفي ثبوت هذا نظر ٠

واته له ( أبي الدرداء )ەوه _ خوای لیّ ڕازی بێت _ باسکراوه : کەوا سینیەك هەنجیر بەخشرایە پێغەمبەری خوا ﷺ ، فەرمووی : (( بخۆن )) ، خۆشی لێی خواردو ، فەرمووی : (( ئەگەر بڵێم : میوەیەك لە بەهەشتەوە دابەزیوە دەڵێم ئەمەیە ، چونکە میوەی بەهەشت بێ ناوکە ، بۆیە لێی بخۆن مایەسیری ناهێڵێت و ، بۆ نەخۆشی جومەگە ژان بەسوودە )) ٠

٠ بۆ ئەو کەسانەی پلەی گەرمی جەستەیان بەرەزەو تایان هەیە تینوویان دەکات ، ئەو تینویەتیە دەشکێنێت کە بەهۆی بەڵغەمی سوێرەوە دروست دەبێ ، بۆ کۆکەی درێژخایەن بەسوودە ، میز زیاد دەکات ، کونیلە داخراوەکانی جگەرو سپڵ دەکاتەوە ، بۆ گورچیلەو میزڵدان گونجاوە ، ئەگەر پێش نانی بەیانی بخورێت سودێکی سەرسوڕمێنی هەیە بۆ کردنەوەی ڕێڕەوەکانی خۆراك ، بەتایبەت ئەگەر لەگەڵ گوێزو بادەمدا خورا ، بەڵام خواردنی لە گەڵ خۆراکە چڕەکاندا زۆر خراپە ، تووی سپی ( التوت الأبيض ) زۆر لە هەنجیرەوە نزیکە ، بەڵام کەمتر خۆراك دەبەخشێ و زیانیشی بۆ گەدە زۆرترە ٠

<u>تَلبینـةٌ</u> : پێشتر ئامارەمان پێداوە کەوا ئاوی جۆی هاڕاوە ، هەستاین بە باسکردنی سودەکانی و ، ئەوەشمان خستەڕوو کەوا بۆ خەڵکی حیجاز لە ئاوی جۆی نەهاڕاو چاکترە.

[427] _ إسناده ضعيف : ضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٤٢٠١ ) ٠

## پیتی ثاء ( ث ) :

ثلج ، واته : بەفر ، ثبت في الصحيح عن النبي ﷺ أنَّه قال : (( اللَّهُمَّ اغْسِلْني مِنْ خطايايَ بالماءِ والثَّلجِ والبَرَدِ ))([٤٢٨]).

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( پەروەردگارا بە ئاو بەفرو تەرزە لە تاوانەکانم بمشۆوە )) ٠

ئەو مەسەلە فیقهیانەی لەم فەرموودەیدا بەدیدەکرێت ئەوەیە کە نەخۆشی بە دژەکەی چارەسەر دەکرێت ، بۆیە تاوانەکان جۆرە گەرمی و سووتانێکی تێدایەو بەفرو تەرزەو ، ئاوی ساردیش دژیی ئەو گەرمیەن ، بۆیە نابێ بگوترێت : ئاوی گەرم چاکترە بۆ لابردنی پیسی ، بەڵکو ئەو ڕەقکردن و پتەوکردن و بەهێزکردنەی ئاوی سارد لە جەستەدا دروستی دەکات ، ئاوی گەرم دروستی ناکات ، تاوانەکانیش دوو شت دروست دەکەن : پیسکردن و خاوکردنەوە ، بۆیە پێویستە بە شتێك چارەسەر بکرێن کە دڵ پاك بکەنەوەو پتەو قایمی بکەن ، باسکردنی ئاوی ساردو بەفرو تەرزەی نێو فەرموودەکەش ئاماژە بۆ ئەو دوانە دەکەن ٠

پاشان ٠ بەفر ساردە بەپێی ڕاسترین بۆچوون ، ئەو کەسانەش بەهەڵەدا چوونە کە گوتویانە : گەرمە ، گومانەکەشیان ئەوەیە کە گیانلەبەرانی تێدا لە دایك دەبێ ، بەڵام ئەمە بەڵگەی گەرمبوونی نی یە ، چونکە لە میوە ساردەکان و ، لە سرکەشدا دەبێت ، بەڵام تینوکردنی ، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی گەرمی دەوروژێنێ نەك بۆ گەرمی خودی خۆی ، زیان بە گەدەو دەمار دەگەیەنێت ، ئەگەر ددان ئێشان بەهۆی گەرمیەکی لەڕادەبەدەرەوە بێت ، ئێشەکەی لێ دور دەخاتەوە ٠

---

[٤٢٨] ــ صحيح : أخرجه البخاري ( ١ / ١٨٩ ) ، ومسلم ( ٢ / ٩٨ ، ٩٩ ) عن أبي زرعة عن أبي هريرة فذكره٠

ثُومٌ ، واته : سير ، له پيازهوه نزيكه ، وفي الحديث : (( من أكلهما فليُمتهُما طبخاً ))[٤٢٩]
واته له فهرموودهدا هاتووه : (( ئهو كهسهى دهيخوات با به كولاندن بيمرێنێت )).

وأهديَ إليه طعامٌ فيهِ ثومٌ فأرسل بهِ إلى أبي أيّوبَ الأنصاريّ فقال يا رسول اللهِ تكرهُهُ وترسلُ بهِ إليّ ؟ فقال : (( إنّي أناجي من لا تناجي ))[٤٣٠] .

واته ئهوهبوو پێغهمبهرى خوا ﷺ خواردنێكى بهديارى درايه سيرى تێدابوو ، ئهويش ناردى بۆ ( أبي أيوب الأنصاري ) _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ ، ( أبي أيوب )يش فهرمووى : ئهى پێغهمبهرى خوا تۆ حهزت پێى نى يهو بۆ منى دهنێرى ؟ فهرمووى : (( من ڕازونياز له گهڵ زاتێكدا دهكهم تۆ ڕازونيازى له گهڵ ناكهى )) .

پاشان سير گهرمى ووشكه له چوارهمدا ، گهرم دهكات بهگهرمكردنێكى بههێز ، ووشك دهكات به ئهوپهڕى ووشكردنهوه ، بهسووده بۆ ئهو كهسانهى زۆر سهرمايان دهبىٚ ، بهسووده بۆ ئهو كهسانهى ميزاجيان بهڵغهميه ، ، بهسووده بۆ ئهو كهسانهى نزيكن له ئيفليجيهوه ، تۆماوى نێرينه ووشك دهكاتهوه ، كونيله داخراوهكان دهكاتهوه ، با چرِهكان شيى دهكاتهوه ، خۆراك ههرس دهكات ، تينويهتى دهشكێنێت ، سك ڕهوان دهكاتهوه ، ميز زياد دهكات ، بۆ گهزتنى جانهوهران و تێكڕاى ئاوسانه سارده بىٚ ئازارهكان جێگهى ( ترياق ) دهگرێتهوه ، ئهگهر بكوترێت و بخرێته سهر شوێنى گهزتنى مارو ، پێوهدانى دووپشك بهسوود دهبىٚ و ژههرهكانيان ڕادهكێشێت ، جهسته گهرم دهكات ، گهرميهكهشى زياد دهكات و ، بهڵغهم دهوهستێنێت ، باى نێو سك شيى دهكاتهوه ، گهروو پاك و ساف دهكاتهوه ، تهندروستى زۆربهى جهستهكان دهپارێزێت ، بهسووده بۆ گۆڕانى ئاو ، كۆكهى درێژخايهن ، به كاڵى و كوڵاوى و برژاويش دهخورێت ، بۆ ئازارى سنگ كه بههۆى

---

[٤٢٩] _ صحيح : أخرجه مسلم ( ٥٦٧ ) .

[٤٣٠] _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ٢٨٢ ) ، ومسلم ( ٥٦٤ ) .

سەرمابوونەوە دروست دەبیّ بەسوودە ، زاروو لە گەرووداد دەردەهیّنیّت ، ئەگەر لە گەلّ سرکەو( الخل ) خویّ و هەنگوینـدا بکوتریّت و ، پاشـان بخریّتـە سـەر ددانـە خـرِیّ کلـۆرو داخوراوەکان ، ووردی دەکات و دەیکەویّنیّت ، ئەگەر بەو جۆرە بخریّتە سەر ددانە خریّ بەئازارەکان ، ئازارەکەی ناهیٚلّیّت ، ئەگەر بە ئەندازەی کیّشی دوو دیرهەمی لیّ بکوتریّت و ، لە گەلّ ئاوی هەنگویّندا ( ماء العسل ) بخوریّتـەوە ، بەلّغەم و کرم دەکاتە دەرەوە ، ئەگەر تیّکەلّ بە هەنگویّن بکریّت و جەستەی تووشبوی بەنەخۆشی بەلّەکی تیّهەلّسویّنریّت ، بۆی بەسوود دەبیّ ٠

لە زیانەکانی : سەر دەئیّشیّنیّت ، زیان بە میّشك و چاوەکان دەگەیەنیّت ، هیّزەکانی بیـنین و جووتبـوون لاواز دەکـات ، تینـوو دەکـات ، ( الصـفراء ) دەوروژیّنیّت ، بۆنی دەم ناخۆش دەکات ، بەلّام ئەگەر گەلّای سپەندی( السذاب ) بەدوادا بجویّت ئەو بۆنە ناخۆشە ناهیٚلّیّت ٠

ثريد ، واتە : تلّیت کە نانیّکە گوشرابیّتە خواردنیّکی شلەبەگۆشتەوە ، ثبت في الصحيحين عنه ﷺ (( فضل عائشة على النساء كفضل الثريد على سائر الطعام ))([٤٣١]).

واتـە : پیّغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتی : (( بەڕاستی ڕیّزی ( عائشـة ) بەسـەر ژنـانی دیکەدا ، وەکو ڕیّزی شلەبەگۆشتە بەسەر خواردنەکانی تردا )) ٠

تلّیت خواردنیّکی ئاویّتەیەو ، لە نان و گۆشت پیّکهاتووە ، نانیش چاکترین خۆراکەکانەو ، گۆشتیش سەرداری پیّخۆرەکانە ، بۆیە ئەگەر کۆبنەوە ئیتر هیچ شتیّکی تر نابیّت جیّگەی دلّ تیّچونی مرۆڤ بیّ ٠

---

[٤٣١] ـ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ٧ / ٨٣ ) ، ومسلم ( ٢٤٤٦ ) ٠

خەڵكیش كێشمەكێشمیان تێكەوتووە سەبارەت بەوەی كامیان چاكترە ؟ ڕاستیش ئەوەیە كە پێویستبوون بەنان زۆرترو گشتیترە ، گۆشتیش بەڕێزترو چاكترەو ، زیاد لە هەموو شتەكانی دیكە لە گەوهەری جەستە دەچێت و ، خۆراكی خەڵكی بەهشتە ، خوای تعالی سەبارەت بەوانەی داوای سەوزەوات و ترۆزیی و ، گەنم و سیرو ، نیسك و ، پیازیان دەكرد فەرموویەتی ﴿ أَتَسْتَبْدِلُونَ الَّذِي هُوَ أَدْنَى بِالَّذِي هُوَ خَيْرٌ ﴾[ البقرة : ٦١ ] واتە : ( موسى ) فەرمووی : ئایا داوای ئەو شتە خراپانە دەكەن لە جیاتی شتی باشتر لەوان (٤٣٢) ، كەسانێكی پێشینیش گوتویانە مەبەست بە ( الفوم ) واتە : گەنم ، بۆیە لە ڕوانگەی ئەم ئایەتەوە گۆشت لە گەنم باشترە ٠

## پیتی جیم ( ج ) :

جُمَّار ، ناوكرۆكی دارەخورما : ثبت في الصحيحين : عن عبدالله بن عمر قال : بَيْنَا نَحْنُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ جُلُوسٌ ، إِذَا أُتِيَ بِجُمَّارِ نَخْلَةٍ ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ (( إِنَّ مِنْ الشَّجَرِ شَجَرَةً مثل الرجل المسلم لا يَسقُطُ وَرَقُها٠٠٠ الحديث ))(٤٣٣) .

واتە : لە ( عبدالله )ی كوڕی ( عمر )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : لە كاتێكدا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دانیشتبوین ، ناوكرۆكی دارەخورمایەكیان بۆ هێنا ، ئەوەبوو فەرمووی : (( لە درەختەكاندا درختێك هەیە وەكو پیاوی موسڵمانە كە گەڵاكانی ناوەرێت ٠٠٠ تا كۆتایی فەرموودەكە )) ٠ ناوكرۆكی دارەخورما : ساردی ووشكە لە یەكەمدا ، برین سارێژ دەكاتەوە ، بۆ ئەو برینانەی خوێنیان لێدێت بەسوودە ، بۆ سكچون و ، زاڵبوونی ( المرة الصفراء )و ، ووروژانی خوێن بەسوودە ، كیمۆسی خراپ نی یە ، خۆراكێكی كەم بە

---

٤٣٢ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

٤٣٣ _ صحيح : أخرجه البخاري ( ١ / ٢٦ ) ، ( ٣ / ١٠٣ ) ، ( ٧ / ١٠٣ ، ١٠٤ ) ، ومسلم ( ٨ / ١٣٧ ) عن مجاهد عن ابن عمر فذكره ٠

جەستە دەبەخشێت ، بەقورسی هەرس دەبێ ، درەختەکەی هەرهەمووی سوودو کەڵکە ، بۆیە پێغەمبەری خوا _ چواندویەتی بە پیاوی موسڵمان لەبەر زۆری خێرو سوودەکەی ٠

جبن ، پەنێر : في السنن عن عبدالله بن عمر قال : أتي النبي ﷺ بجبنة في تبوك ، فدعا بسكين ، وسمى وقطع ٠ رواه أبوداود([٤٣٤]) .

واتە : لە ( عبدالله )ی کوڕی ( عمر )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : لە ( تبوك ) پێغەمبەری خوا ﷺ پەنێرێکی بۆ هێنرا ، ئەوەبوو داوای چەقۆیەکی کردو ، ناوی خوای هێناو دەستی بەبڕینی کرد ٠ هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شام و ، عێراق خواردوویانە ، جۆرە تەڕە بێ خوێکەی بۆ گەدە باشە ، بەئاسانی دەچێتە نێو ئەندامەکانی جەستەوە ، گۆشت زیاد دەکات ، سك نەرم دەکاتەوە بەنەرمکردنێکی مام ناوەند ، جۆرە سوێرەکەی خۆراکێکی کەم دەبەخشێت بەبەراوردی تەڕەکەی ، بۆ گەدە خراپە ، بۆ ڕیخۆڵە زیانبەخشە ، جۆرە کۆنەکەی سك دەگرێتەوە ، هەروەها جۆرە برژاوەکەشی ، بۆ برین چاکەو ، قەدەغەی سکچوون دەکات ، ساردی تەڕە ، ئەگەر وەکو برژاو بەکاربێت ، گونجاوی میزاجێتی ، چونکە ئاگر چاکی دەکات و ڕێکی دەکاتەوەو ، گەوهەری نەرم و نیان دەکاتەوە ، تام و بۆنی خۆش دەکات ، جۆرە کۆنە سوێرەکەی ، گەرمی ووشکە ، وە برژاندن چاکی دەکاتەوە بەوەی گەوهەری نەرم و ناسك دەکاتەوەو ، توندو کەسکونیشی دەشکێنێت چونکە ئاگرەکە لە بەشە گەرمە ووشکەکەی پەنێر بۆ خۆی ڕادەکێشێت کەوا گونجاوی خۆیەتی ، جۆرە سوێرەکەی لاواز دەکات و ، بەردی نێو گورچیلەو میزڵدان دروست دەکات ، بۆ گەدە خراپە ، وە تێکەڵکردنیشی لە گەڵ هێمن کەرەوەکاندا خراپترە چونکە دەبێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی گوزەری بکاتە نێو گەدەوە ٠

---

[٤٣٤] _ حسن الإسناد : أخرجه أبوداود ( ٣٨١٩ ) من طريق عمرو بن منصور عن الشعبي عن ابن عمر فذكره ٠

## پیتی الحاء ( ح ) :

حناء : پێشتر چەندین فەرموودەمان سەبارەت بە چاكێتی و ، باسكردنی سوودەكانیدا هێناوەتەوە ، بۆیە پێویست بە دووبارەبوونەوە ناكات ٠

حبة السوداء ، ڕەشكە ، ثبت في الصحيحين : من حديث أبي سلمة ، عن أبي هريرة _ رضي الله عنه _ ، أن رسول الله ﷺ قال : (( عليكم بهذه الحبة السوداء ، فإن فيها شفاء من كل داء إلا السام )) ٠ والسام : الموت([٤٣٥]) ٠

واتە : لە ( أبي هريرة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( ئەم ڕەشكە بەكاربێنن ، چونكە شیفای تێدایە بۆ هەموو نەخۆشیەك جگە لە مردن )) ٠

( الحبة السوداء ) واتە : ڕەشكە لە زمانی فارسەكاندا بە ( الشونيز ) ناودەبرێت ، هەروەها بە ( الكمون الأسود ) و ( الكمون الهندي )یش دەناسرێت ، ( الحربي ) لە ( الحسن )ەوە دەڵێت : ( الخردل )ە([٤٣٦]) ( الهروي )یش دەڵێت : قەزوانە ( الحبة الخضراء ثمرة البطم )ە ، بەڵام بۆچۆنی هەردوكیان هەڵەیەو ، ڕاستیش : ( الشونيز )ە ٠

سوودەكانی زۆر زۆرە ، فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ ( شفاء من كل داء ) واتە : شیفایە بۆ هەموو نەخۆشیەك ، وەكو فەرمایشتی خوای پەروەردگارە ﴿ تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ

---

[٤٣٥] _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ١٠/ ١٢١ ) ، ومسلم ( ٢٢١٥ ) ٠

[٤٣٦] _ الخردل « ڕووەكێكی گیای وەرزیە ، لە وەرزە بارانیەكاندا درێژیەكەی بە مەترێك دەگات ، ئەم ڕووەكە لق و پۆپێكی چڕی لێ دەبێتەوە ، ڕەنگی گەڵاكانی سەوزێكی كاڵە ، گوڵەكانی بە زۆری زەردن ، بەرەكەی شێوەیەكی لولەكی هەیەو تۆوێكی خڕی تێدایە كە تیرەكەی نزیكەی ٢ ملیمەترە ٠ بڕوانە : 0www.shakwmakw.com

رَبِّهَا ﴾[ الأحقاف : ٢٥ ] • واته : بەفەرمانی پەروەردگاری هەموو شتێك دەڕۆخێنێ[٤٣٧]
واته : هەموو ئەو شتانەی قبوڵی ڕۆخاندن دەکەن و هاوشێوەکانی ، بۆ هەموو نەخۆشیە ساردەکان بەسوودە ، بەشدار دەبێ لە چارەسەرکردنی نەخۆشیە گەرمە ووشکەکاندا بە کاتی ( بالعرض ) ، وە لە بەر ئەوەی گوزەرکردنی خێرایە بۆیە بە باشی هێزی دەرمانە ساردە شێدارەکانی پێدەگەیەنێت

بۆ نموونە دانەری کتێبی ( القانون )و کەسانی تریش بڕیاریان داوە لەسەر بەکارهێنانی زافەران لە قورصی ( الكافور )دا[٤٣٨] چونکە بەخێرا گوزەری پێ دەکات و هێزی دەگەیەنێت ، هاوشێوەی ئەمەش زۆرەو شارەزایانی ئەم بوارە دەیزانن ، بەدوریش دانانرێت گەرم لە نەخۆشیە گەرمەکاندا سوودی هەبێ بەخاسیەت ، چونکە لە زۆر دەرماندا ئەو شتە دەبینرێت ، : لەوانە ( الأنزروت )ە[٤٣٩] کە دەرمانەکانی دیکەی چاو ئێشەی تێکەڵ دەکرێت ، وەکو شەکرو شتی تریش لە تاکە گەرمەکان ، چاوئێشەش ئاوسانێکی گەرمە بە ڕێکەوتنی پزیشکان ، هەروەها بەسوودبوونی گۆگردی گەرم بۆ گەڕی •

---

[٤٣٧] ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان •

[٤٣٨] ــ الكافور : مادەیەکی کریستاڵی سپی ڕوونەو ، بۆنێکی توندی هەیە ، بە هەڵمبوونی ئاسانە لە پلەی گەرمی ئەو ژورەی تیایدایە ، بەڵام بە قورسی لە ئاودا دەتوێتەوە ، ئەم مادە لە دڵۆپاندنی داری درەختی کافورەوە بەدەست دێ ، دەرختی کافور درەختێکی هەمیشە سەوزی ناسراوە ، نزیکەی ( ٥٠ ) متر بەرزە ، داری درختەکە زۆر سپیەو بۆنێکی خۆشی هەیە ، مادەی کافور لە نێو دارو قەدی درەختەکەدایە ، بڕوانە : Arabic.rt.com

[٤٣٩] ــ الأنزروت : کەتیرەی دارێکی دڕکاویە ، تاڵەو ، سپی و سوری هەیەو ، لە چیاکانی وەڵاتی فارسدا هەیە ، هەموو ئاوساوکان هێمن دەکاتەوە ، بۆ داهاتن و ڕیپۆقی چاو بەسوودە ، بەڵغەمی چڕ نەرم دەکاتەوە ، بڕوانە : نهاية الأرب في فنون الأدب ، وەرگێڕ •

شونێز گەرمی ووشکە لە دووەمدا ، بای سك ناهێڵێت ، ( حبة القرع )([440]) دەکاتە دەرەوە ، بۆ ئەو تايەی لە چوارەم ڕۆژدا تووشی نەخۆش دەبێ و ، هەروەها بۆ تای بەڵغەمی بەسوودە ، کونیلە داخراوەکان ( السدد ) دەکاتەوە ، باکان شیی دەکاتەوە ، تەڕی و شێی گەدە ووشك دەکاتەوە ، ئەگەر کوتراو تێکەڵ بە هەنگوێن کراو ، لە گەڵ ئاوی گەرمدا خورايەوە ، بەردی گورچیلەو مێزڵدان دتوێنێتەوە ، میزو ، بێنوێژی و ، شیر هێنەرە ئەگەر بەردەوام چەند ڕۆژێك بیخواتەوە ، ئەگەر لە گەڵ سرکەدا ( الخل ) گەرم بکرێت و ، سکی تێ هەڵسوێنرێت ، کرمی ( حب القرع ) دەکوژێت ، ئەگەر لە گەڵ ئاوی گۆژاڵکی تەڕ یاخود کوڵاودا ( ماء الحنظل الرطب أو المطبوخ ) بشێلدرێت ، ئەوا کاریگەری بەهێزتر دەبێ لە دەرکردنی کرمدا ، وە پاك دەکاتەوەو دەبڕێت و ، شیی دەکاتەوە ، ئەگەر بکوترێت و بکرێتە نێو پەڕۆیەکەوەو ، بەردەوام بۆن بکرێت هەڵامەتی سارد چارەسەر دەکات ·

ڕۆنەکەی بۆ ( داء الحية )و([441])، بالوکەو خاڵ بەسوودە ، ئەگەر مسقاڵێکی لە گەڵ ئاودا بخورێتەوە ، بۆ هەناسەبڕکێ و تەنگەنەفەسی بەسوودە ، بە شێوەی بپێچانیش سوود بە سەرئێشەی سارد دەگەیەنێت ، ئەگەر حەوت دانەی بە ژمارە لە شیری ژناندا بخوسێندرێت و ، کەسی توشبوو بە نەخۆشی زەردووی ( اليرقان ) بیکاتە لووتی ، سودێکی زۆری پێ دەگەیەنێت ·

ئەگەر لە گەڵ سرکەدا بکوڵێندرێت و ، پاشان لە دەم وەربدرێت ، بەسوود دەبێ بۆ ئەو ددان ئێشانەی لە ئەنجامی سەرماوە تووشی مرۆڤ دەبێ ، ئەگەر بە هاڕاوی بکرێتە لووت ،

---

[440] ـ حبة القرع : جۆرێکە لە کرمە درێژە گەورە خڕە بەرهەڵستەکان ، بڕوانە : القانون في الطب لأبن سينا ، فصل في الديدان ، وەرگێڕ

[441] ـ داء الحية : نەخۆشیەکە لە نەخۆشی ( داء الثعلب ) دەچێت ، بەڵام جیاوازی نێوانیان ئەوەیە کە نەخۆشی ( داء الحية ) تەنها مووی سەر ناوەرێت بەڵکو پێستێکی تەنکی سەریشی لە گەڵدا دادەماڵرێت وەکو ئەو کاژە تەنکەی لە مار دەکرێتەوە ، بڕوانە : القانون في الطب لآبن سينا ، وەرگێڕ ·

بەسوود دەبیٚ بۆ ئەو ئاوەی لە چاوەکاندا دروست دەبیٚ ، ئەگەر لە گەلٚ سرکەدا بە شێوەی پێچان ( ضماد ) بەکاربێت ، زیپکەو گەڕیی کێماوی هەلٚدەکەنێت و ، ئاوسانە بەلٚغەمیە درێژخایەنەکان و ، ئاوسانە ڕەقەکان شیی دەکاتەوە ، ئەگەر ڕۆنەکەی بکرێتە لووت بۆ نەخۆشی دەم خواربوون ( اللقوة ) بەسوودە ، ئەگەر نیو مسقالٚ تا مسقالێکی بخورێتەوە ، بۆ گەزتنی جالٚجالۆکە زیانبەخشەکان ( الرتيلاء ) بەسوودە ، ئەگەر بهاڕدرێت و تێکەلٚ بە ڕۆنی قەزوان ( دهن الحبة الخضراء ) بکرێت و ، پاشان سیٚ تکی بتکێنرێتە گویٚ ، بۆ ئەو سەرمایەی کە تووشی بووەو ، هەروەها بۆ باو کونیلە داخراوەکانی بەسوود دەبیٚ ٠

ئەگەر ببرژێندرێت و ، پاشان بکوترێت بەزۆر وردی و ، لە زەیتدا بخوسێندرێت و ، سیٚ تك یاخود چوار تکی لە لووت بتکێنرێت ، بۆ ئەو هەلاٚمەتەی پژمینێکی زۆری لە گەلٚدایە بەسوودە ٠

ئەگەر بسوتێنرێت و تێکەلٚ بە مێوی تواوەبوو ( الشمع المذاب ) لە ڕۆنی ( السَوْسَن )([٤٤٢]) ، یاخود ڕۆنی خەنە ( دهن الحناء ) بکرێت و ، برینەکانی قاچی پیٚ چەور بکرێت پاش شتنی بە سرکە ، سوودی پیٚ دەگەیەنێت و برینەکانی لادەبات ٠

---

[٤٤٢] ـ السَوْسَن : گولەشلێر ، ڕووەکێکە شەصت سانتمەتریك بەرز دەبێتەوەو گولێك یاخود چەند گولێکی هەیەو ، هەریەکەیان لە غونچەیەکەوە پەیدا دەبن و دەپشکوێن ، هەیە سپی هەیە شین هەیە زەردە هەیە سوورە ، ڕوەکێکی تەمەن درێژەو هەندیٚ جۆری بە بۆنی خۆش بەناوبانگە چونکە ڕوەکێکی عەتر ئامێزە ، کێوی و باخچەی هەیەو باخچەیەکەشی دوو جۆرە ، ( الأَزادُ ) کە سپی یەو ، وە ( الإيرِساءُ ) ، بۆ ئاویەنگ بەسوودە ، هێمنکاری ماددە چڕەکانە ، جۆری ( الأَزادُ )ی بەسوودە بۆ نەخۆشیە ساردەکانی مێشك و ، با چرە کۆبۆکانی نێوی شیی دەکاتەوە ، گەلاٚکانی بەسوودە بۆ سوتاوویی ئاوی گەرم ، هەروەها بەسوودە بۆ گەزتنی جانەوەران و دووپشك بەتایبەت ، بڕوانە : فەرهەنگی دەریا ، قاموسی ڕستە ، القاموس المحيط ، وەرگێڕ ٠

ئەگەر لە گەڵ سرکەدا بهاڕدرێت و ، نەخۆشیەکانی ( البرص ) و ( البهاق الأسود )و([443]) سەری کرێشاوی تێ هەڵسوێنرێت ، سوودی پێ دەگەیەنێت و ، چاکیان دەکاتەوە ئەگەر وورد بهاڕدرێت و ، هەموو ڕۆژێك بە ئەندازەی کێشی دوو دیرهەمی بە ئاوی ساردەوە لێ قووت بدرێ ، بە سوود دەبێ بۆ ئەو کەسانەی سەگی هار گەستونی پێش ئەوەی لە ئاو خاڵی بێت ، وە دڵنیاش دەبێ کە تیاناچێت ، ئەگەر ڕۆنەکەشی بکرێتە لووت ، بۆ نەخۆشیەکانی ئیفلیجی ( الفالج ) و ( كُزاز )([444]) بە سوود دەبێ و ، مادەکانیان دەوەستێنێت ، ئەگەر دووکەڵیشی پێ بکرێت ، جانەوەران دوردەخاتەوە ۰

ئەگەر ( الأنزروت ) لە ئاودا بتوێنرێتەوەو ، ناوەوەی ئەڵقەکەی تێ هەڵسوێنرێت و ، پاشان ( الشونیز )ی بەسەردا بپرژێنرێت ، ئەوا دەبی بە پرژێنەرێکی بەسوودی سەرسوڕمێن بۆ مایەسیری ، سوودەکانییشی چەندەها ئەوەندی ئەمەیە کە باسکرا ، خواردنەوەشی بە ئەندازەی دوو دیرهەمە ، کەسانیکیش وایان ڕاگەیاندووە کە زۆری بەکارهێنانی کوشندەیە ۰

<u>الحریر</u> : پێشتر ئامـاژەی پـێ درا کـەوا پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕێـی داوە بـە ( الـزبیر )و ( عبدالرحمن )ی کوڕی ( عـوف ) ئاورێشـم بپۆشـن " بـەهۆی خورویەکـەوە کـە لـە جەستەیاندا هەبوو ، هەروەها باسی سوودو میزاجیمان کرد ، بۆیە پێویست بەدووبارە بوونەوە ناکات ۰

---

[443] ـ البرص : سپێتیەکە تووشی جەستە دەبێ ۰
البهاق : سپێتیەکەو ناگات بە ئاستی سپێتیەکەی ( البرص )و تووشی جەستە دەبێ و خەت خەت ڕەشی تێکەڵە ، بڕوانە : لسان العرب ، وەرگێڕ ۰

[444] ـ الكُزاز : نەخۆشیەکی قورسە تووشی مرۆڤ دەبێ و تووشی کرژبونی جەستە دەبێ بەهۆی سەرماوە ، بڕوانە : المخصص لأبن سيدة ، ص٤٦٦ ، وەرگێڕ ۰
بواری پزیشکێتی نوێش دەڵێت : الكزاز : نەخۆشیەکی قورسەو هۆکاری دەگەڕێتەوە بۆ پیسبوونی برینەکان بەو میکرۆبانەی کە spores هەڵدەگرن و ، لە هەمان بریندا گەشە دەکەن و ، ژەهرێکی بەهێز دەردەن کە کرژبونەوەیەکی توند لە ماسولکەکاندا دروست دەکات ، ئەم نەخۆشیە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر ناگواسترێتەوەو ، لەوانەیە کەسی تووشبوو بمرێت ۰ بڕوانە : ar.wikipedia.org/wiki ، وەرگێڕ ۰

حُرْفٌ ، تەڕەتیزە : ( أبوحنیفة الدَّیْنَوَري ) دەڵێت : ئەمە ئەو تۆوەیە کە چارەسەری پێ دەکرێت ، هەروەها بە ( الثفاء )یش ناوبراوەو لە فەرموودەی پێغەمبەری خوادا ﷺ باسکراوە ، ڕوەکەکەشی بە ( الحُرْف ) ناودەبرێت و ، ڕەمەکی خەڵکیش پێ دەڵێن ( الرشاد ) واتە : تەڕەتیزە ، ( أبوعبید ) دەڵێت ( الثفاء ) واتە : ( الحُرْف ) •

دەڵێم _ ابن القیم _ ئەو فەرموودەی ئاماژەی بۆ کردوە ، ( أبوعبید )و کەسانی تریش لە ( ابن عباس )ەوە _ خوا لە خۆی وبابیشی ڕازی بێت _ دەیگێڕنەوە ، کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئای لە هەردوو تاڵەکەدا چ شیفایەك هەیە ، ( الصَّبِرْ )و تەڕەتیزە • ئیمامی ( أبوداود ) لە ( المراسیل )دا باسی دەکات •

هێزی گەرمی و وشکێتی لە پلە سێ یەمدایە ، گەرم دەکات ، سك شل دەکات ، کرم و ( حب القرع ) دەکاتە دەرەوە ، ئاوسانەکانی سپڵ شیی دەکاتەوە ، شەهەوەت و ئارەزووی جووت بوون دەجوڵێنێت ، گەڕی کێماوی و ، قڵیشانی پێست و بەهۆیەوە هەڵوەرینی موو تووك پاك دەکاتەوە •

ئەگەر لە گەڵ هەنگوێندا پێچەرێکی ( ضماد ) لێ دروست بکرێت ، ئاوسانی سپڵ شیی دەکاتەوە ، ئەگەر لە گەڵ خەنەدا ( الحناء ) بکوڵێندرێت پاشماوەکانی سنگ دەکاتە دەرەوە ، ، خواردنەوەشی بۆ پێوەدان و گەزتنی جانەوەران بەسوودە ، ئەگەر لە شوێنێکدا بسوتێنرێت و دووکەڵی پێ بکرێت ، جانەوەرانی لێ دووردەخاتەوە ، هەروەها کەوتنی مووی سەر دەوەستێنێت ، ئەگەر تێکەڵ بە ئاردی جۆو سرکە بکرێت و ( سویق الشعیر والخل ) ، پێچەرێکی ( الضماد ) لێ دروست بکرێت ، بەسوودە بۆ نەخۆشی دەردەلاقە ( عرق النسا )و ، ئاوسانە گەرمەکانیشی شیی دەکاتەوە لە کۆتایەکەیدا •

ئەگەر لە گەڵ ئاو و خوێدا بپێچرێتە سەر دومەڵەوە پێی دەگەیەنێت ، بەسوودە بۆ هەموو ئەو ئەندامانەی شلی و خاویان تێکەوتووە ، ئارەزووی جووتبوون زیاد دەکات ، دڵکەرەوەیە

بۆ خواردنی زیاتر ، بۆ نەخۆشی تەنگەنەفەسی و ، هەناسەسواری و ، چرپوونی سپڵ بەسوودە ، سیی پاك دەكاتەوە ، خوێنی بێنوێژی زیاد دەكات ، بۆ ئازاری ئەو چاڵایەی سەری ئێسقانی ڕانی تێدایەو لە ئەنجامی هاتنە دەرەوەی پاشماوە زیادەكاندا دروست دەبێ بەسوودە ، ئەگەر بخورێتەوە یاخود بە حوقنە هەڵبگیرێت ، وە بەڵغەمە لینجەكانی سینگ و سیی كانیش دەكاتە دەرەوە ٠

ئەگەر بهاڕدرێت و پاشان بە ئەندازەی پێنج دیرهەمی لێ بخوریتەوە لە گەڵ ئاوی گەرمدا ، سروشتی مرۆڤ نەرم ونیان دەكاتەوەو ، بایەكانیش شیی دەكاتەوەو ، بۆ ئازاری ( القولنج ) كە هۆكاری دەگەڕێتەوە بۆ سەرمابوون بەسوودە ، ئەگەر بهاڕدرێت و بخورێتەوە بۆ نەخۆشی بەڵەكی بەسوودە ٠

ئەگەر لە گەڵ سركەدا نەخۆشیەكانی بەڵەكی ( البرص ) و ( البهق الأبیض ) تێ هەڵسوێنرێت ، سوودیان پێ دەگەیەنێت ، هەروەها بەسوودە بۆ ئەو سەرئێشەی بەهۆی سەرماو بەڵغەمەوە تووشی مرۆڤ دەبێ ، ئەگەر بكوڵێندرێت و ، بخورێتەوە ، خوو هێمن دەكاتەوە بەتایبەت ئەگەر نەهاڕدرابێ چونكە لینجیەكەی بەكوڵان شیی دەبێتەوە ، ئەگەر بەئاوەكەی سەر بشۆردرێت ، لە پیسی و شێ لینجەكان پاكی دەكاتەوە ٠

( جالینوس ) دەڵێت : هێزی وەكو هێزی تۆوی خەرتەلەیە ( بزر الخردل ) ، بۆیە لەوانەیە ئازارەكانی ڕانی پێ گەرم بكرێت كە بە ( عرق النسا ) ناسراوەو ، هەروەها ئازارەكانی سەرو ، هەریەك لەو نەخۆشیانەش كە پێویستیان بە گەرم كردن دەبێ ، بەهاوشێوەی تۆوی خەرتەلە ( بزر الخردل ) كە گەرم دەكات ٠ پێدەچێ تێكەڵ بەهەندێ ئەو دەرمانانە بكرێت كە تووشبووی تەنگەنەفەسی دەیخواتەوە چونكە زانراوە كە تێكەڵە چڕەكان دەوەستێنێت بەباشی ، هەروەكو ئەوەی كە تۆوی خەرتەلە دەیوەستێنێت ، چونكە لە هەموو ڕوویەكەوە لەو دەچێت ٠

الحُلْبَةُ ، شملّی : باسکراوه کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە چووە سەردانی ( سعد )ی کوڕی ( أبي وقاص )و ، فەرمووی : پزیشکێکی بۆ بانگ بکەن ، بۆیە ( الحارث )ی کوڕی ( کلدة )ی بۆ بانگ کرا ، تەماشایەکی کردو گووتی : هیچ مەترسیەکی لەسەر نی یە ، شملّی و خورمای ( عجوة )ی تازەپی گەیوو بەیەکەوە بکوڵێنن و با هەڵی قوڕێنێت ، ئەوەبوو ئەوەیان بۆ ئەنجامداو ، چاك بۆوە ٠

هێزی شملّی لە گەرمیدا لە پلە دوودایە ، لە ووشکیدا لە پلەی یەکەمدایە ، ئەگەر بە ئاوەوە بکوڵێندرێت ، قورگ و سینگ و سك نەرم دەکاتەوە ، کۆکەو ، زبری و ، تەنگەنەفەسی و ، هەناسە برکێ هێمن دەکاتەوە ، شەهوەت و ئارەزووی جووتبوون زیاد دەکات ، بۆ باو ، بەڵغەم و ، مایەسیری بەسوودە ، دابەزێنەری کیموسە ئاڵۆزەکانە لە ڕیخۆڵەدا ، بەڵغەمی لینجی سینگ شیی دەکاتەوە ، بۆ ئەو دوومەڵانەی لەناو سکدا پەیدا دەبێ و بۆ نەخۆشیەکانی سیی بەسوودە ، بۆ ئەم نەخۆشیانەی هەناو لە گەڵ ڕۆن و ( الفانيذ )دا([٤٤٥]) بەکاردەهێنرێت ٠

ئەگەر لە گەڵ کێشی پێنج دیرهەمی ( الفوة )دا([٤٤٦]) بخورێتەوە ، خوێنی بێنوێژی دەهێنێنت ، ئەگەر بکوڵێندرێت و ، پرچی سەری پێ بشۆردرێت لول دەبێ ، ( الحزاز )([٤٤٧])

---

٤٤٥ _ الفانيذ : جۆرێکە لە حەلوا لە قەندو نیشاستە دروست دەکرێت ، بڕوانە : تهذيب اللغة ، ج٣ ، ص١٨٩ ، وەرگێڕ ٠

٤٤٦ _ الفوة : ڕەگی ڕوەکێکی ڕەنگ سوورەو بۆیەچیەکان بەکاریدەهێنن ، هەندێکی خۆڕسکەو هەندێکیشی دەچێنرێت ، لقەکانی چوارگۆشەی درێژی زبرن گەڵای پێوەیەو بەرێکی خڕی هەیە ، لە سەرەتای دەرچونیدا ڕەنگیان سەوزەو پاشان سووردەبن و ، کاتێکیش پێ بگەن ڕەش دەبن ، دەرمانێکی تاڵەو جگەرو سپڵ پاك دەکاتەوە ، میز هێنەرە ، خوێنی بێنوێژی زیاد دەکات ، بڕوانە : الجامع لمفردات الأدوية والأغذية لأبن البيطار ، وەرگێڕ ٠

٤٤٧ _ الحزاز : ئازارێکە لە دڵدا پەیدا دەبێ بەهۆی خواردنێکەوە کە لە گەدەدا ترش دەبێ ، بڕوانە : تاج العروس ، للمرتضى الزَّبيدى ، وەرگێڕ ٠

ناهێڵێت ، هاڕاوەکەی ئەگەر تێکەڵ بە ( النطرون )و[448] سرکە کراو ، بە شێوەی پێچەر ( الضماد ) بەکارهات ، ئاوسانی سپڵ شیی دەکاتەوە ، ئەگەر ژنان لە ئاوێکدا دانیشن شملی تێدا کوڵێنرابێت ، سوودی لێ دەبینن بۆ ئەو ئازارەی لە منداڵداندا و بەهۆی ئاوسانێکەوە پەیدابووە ، ئەگەر بپێچرێتە سەر ئاوسانە ڕەقە کەم گەرمەکانەوە ، شیی دەکاتەوەو سوودی بۆ دەبێ ، ئەگەر ئاوەکەی بخورێتەوە بۆ ئەو پێچ بەسکدا هاتنانە باشە کە بەهۆی باوە تووشی مرۆڤ دەبێ ، وە ڕیخۆڵەکانیش خزو لووس دەکات ٠

ئەگەر بەخورماوە ، یا هەنگوینەوە ، یا هەنجیرەوە بکوڵێندرێت و پێش نانی بەیانی بخورێت ، ئەوا بەڵغەمی لینجی سینگ و گەدە شیی دەکاتەوەو ، بەسوودیش دەبێ بۆ ئەو کۆکە درێژخایەنەی بەهۆیەوە تووشی مرۆڤ دەبێ ٠

بۆ ئەو کەسانەی تووشی ڕیخۆڵەگیران بوونەو پیسایان بۆ نایەتە دەرەوە بەسوودەو ، سکیان ڕەوان دەکاتەوە ، ، ئەگەر ڕۆنەکەی ( دهنه ) تێکەڵ بەمێو ( الشمع ) بکرێت بۆ ئەو درزو قلێشانەی بەهۆی سەرماوە دروست دەبێ بەسوودە ، سوودەکانیشی چەندەها ئەوەندەی ئەمەیە کە باسکرا ٠

---

[448] _ النطرون : جۆرە خوێیەکەو لە ئاوی گەرمدا بەئاسانی دەتوێتەوەو لە ئاوی ساردا بەقورسی ، ( الَورق )یشی پێ دەڵێن ، بڕوانە : المعجم الوسيط ، إبراهيم الزيات ، وەرگێڕ ٠

له ( القاسم )ی كوڕی ( عبدالرحمن )ەوه دەگێڕنەوە كە گوتويەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( استشفوا بالحلبة ))([449]) واته : خۆتان بەشملی چارەسەر بكەن ٠ كەسانێك لە پزيشكان دەڵێن : ئەگەر خەڵك سوودەكانيان بزانيبا بە كێشی خۆی بە زێڕ دەيانكڕی ٠

## پيتی خاء ( خ ) :

الخُبز ، نان : ثُبتَ في الصحيحين ، عن النَّبيُّ ﷺ ، أنَّه قالَ : (( تَكُونُ الأَرْضُ يَوْمَ الْقِيامَةِ خُبْزَةً وَاحِدَةً يَتَكَفَّؤُهَا الْجَبَّارُ بِيَدِهِ كَمَا يَكْفَأُ أَحَدُكُمْ خُبْزَتَهُ فِي السَّفَرِ ، نُزُلا لأَهْلِ الْجَنَّةِ ))([450]).

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموويەتی : (( لە ڕۆژی قيامەتدا زەوی دەبێت بە يەك نان و خوای تعالی وەريدەگێڕێت لەم دەستەوە بۆ ئەو دەست تا ڕاست و ڕێك بێتەوە وەكو چۆن كەسێكتان نانەكەی لە سفرەكەدا وەردەگێڕێت ، چونكە دەيكات بە خوانێك و بۆ خەڵكی بەهەشت ئامادەی دەكات )) ٠

وروى أبوداود في سننه : من حديث ابن عباس _ رضي الله عنهما _ ، قال : كان أحبَّ الطعامِ إلى رسولِ الله ﷺ الثريدُ من الخُبز ، والثريدُ من الحيس([451]).

واته : له ( ابن عباس )ەوه _ خوا له خۆی وبابيشی ڕازی بێت _ فەرموويەتی : خۆشەويسترين خواردنەكان بەلای پێغەمبەری خواوە ﷺ تلێتی نان و ، تلێتی ( الحَيْس ) بوو.

[449] _ لم أجده بهذا اللفظ ، وروي في فضل الحلبة أحاديث موضوعة وباطلة ، انظر الأسرار المرفوعة في الأخبار الموضوعة ( ١ / ٣٨٨ ) ، تنزيه الشريعة عن الأخبار الشنيعة الموضوعة ( ٢ / ٢٤٦ ) ، الفوائد المجموعة في الأحاديث الموضوعة للشوكاني ( ١ / ٤٨٩ ) ٠

[450] _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ١١ / ٢٣١ ) ، ومسلم ( ٢٧٩٢ ) ٠

[451] _ ضعيف : أخرجه أبوداود ( ٣٧٨٣ ) عن عكرمة عن ابن عباس فذكره ، قال أبوداود : وهو ضعيف ٠( الحَيْس ) تريتی خورماو كەشك و ڕۆنەو تێكەڵ بەيەك دەكرێن ، بڕوانە : القاموس المحيط للفيروزئابادي ، وەرگێڕ ٠

وروى أبوداود أيضاً ، من حديث ابْنِ عُمَر _ رضي الله عنه _ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ : (( وَدِدْتُ لَوْ أَنَّ عِنْدَنَا خُبْزَةً بَيْضَاءَ مِنْ بُرَّةٍ سَمْرَاءَ مُلَبَّقَةٍ بِسَمْنٍ وَلَبَنٍ )) ، فقام رَجُلٌ مِنَ القوم فَاتَّخَذَهُ ، فَجَاءَ بِهِ ، فَقَالَ : (( فِي أَيِّ شَيْءٍ كَانَ هَذَا السَّمْنُ ؟ )) فقَالَ : فِي عُكَّةِ ضَبٍّ ٠ فقَالَ : (( ارفَعْهُ ))([٤٥٢]).

واته : له ( ابن عمر )ەوه _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : (( حەزم پێیەتى ئەگەر نانێکى سپیمان لە گەنمێکى بۆرى چاك تێکەڵ کرلو بە ڕۆن و ماست هەبوایە )) ، ئەوەبوو پیاوێك لە خەڵکەکە هەستاو ئامادەى کردو ، هێناى ، پێغەمبەرى خواش ﷺ فەرمووى : (( ئەم ڕۆنە لە چ شتێکدا بوو ؟ )) پیاوەکەش فەرمووى : لە هیزەیەکى بزن مژەدا بوو ٠ بۆیە پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : (( لاییبەرە )) ٠

وَرَوَى الْبَيْهَقِيّ مِنْ حديث عَائِشَةَ _ رضي الله عنها _ ترفعه : (( أَكْرِمُوا الْخُبْزَ ، وَمِنْ كَرَامَتِهِ أَنْ لَا تَنْتَظِرَ بِهِ الْأُدْمَ ))([٤٥٣]).

واته : خاتوو ( عائشة )ەوه _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ لە فەرموودەیکدا کە بەرزى دەکاتەوە بۆ پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى : (( ڕێزى نان بگرن ، ڕێزەکەشى ئەوەیە کە بخورێت و چاوەڕێى هاتنى پێخۆر نەکرێت )) ٠ پێشەوا ( ابن القيم ) دەفەرمێت : ئەم فەرموودەیە لە ( موقوف ) دەچێت و ، بەرزکردنەوەى ئەم فەرموودەیەو ، هى پێشووش بۆ پێغەمبەرى خوا ﷺ جێگیر نەبووە ٠

بەڵام ئەو فەرموودەیەى کە باسى قەدەغەکردنى بڕینى نان دەکات بە چەقۆ ، فەرموودەیەکى پووچەو هیچ بنەڕەتێکى لە پێغەمبەرى خواوە ﷺ بۆ جێگیر نەبووە ، لە

---

[٤٥٢] _ إسناده ضعيف : أخرجه أبوداود ( ٣٨١٨ ) ، وابن ماجة ( ٣٣٤١ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف أبي داود ( ٨٢٣ ) ٠

[٤٥٣] _ إسناده ضعيف : أخرجه الألباني في الضعيفة ( ٢٨٨٤ ) ٠

ڕاستیدا فەرموودەیەکی دیکە هاتووە سەبارەت بە قەدەغەکردنی بڕینی گۆشت بەچەقۆ ، کەچی ئەمەش ( صحیح ) نی یە ٠

( مُهَنَّا ) دەڵێت : لە ( أحمد )م پرسی سەبارەت بەو فەرموودەیەی کە ( أبي معشرٍ ) ، لە ( هشام )ی کوڕی ( عروة )وە ، لە بابیەوە ، لە ( عائشة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەیگێڕێتەوەو فەرموویەتی : (( لا تقطعوا اللَّحْمَ بالسِّكِّين فإنَّ ذلك من فعل الأعاجم ))([٤٥٤]) ٠ واتە : (( گۆشت بەچەقۆ مەبڕن ، چونکە ئەوە کرداری عەجەمەکانە )) ٠ ( أحمد )یش فەرمووی : فەرموودەیەکی ( صحیح ) نی یەو ، ئەمەش نەناسراوە ، بەڵکو فەرموودەکەی ( عمرو )ی کوڕی ( أُميَّة )و ، فەرموودەکەی ( المغيرة ) پێچەوانەی ئەمەن ٠ مەبەستی بە فەرموودەکەی ( عمرو )ی کوڕی ( أُميَّة ) ئەوەیە کە فەرموویەتی : (( كان النبيُّ ﷺ يحتزُّ مِن لحم الشاة ))([٤٥٥]) واتە : (( پێغەمبەری خوا ﷺ لە گۆشتی مەڕەکەی دەبڕی )) ٠ مەبەستی بە فەرموودەکەی ( المغيرة )ش ئەوەیە کە فەرموویەتی : (( أنه لمَّا أضافه أمَرَ بجَنْبٍ فشُوِيَ ، ثم أخذَ الشَّفرةَ ، فجعل يَحُزّ([٤٥٦]) واتە : (( کاتێ ( المغيرة ) بوبە میوانی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا لایەك ببرژێنن ، پاشان چەقۆ گەورەکەی هەڵگرت و ، دەستی کرد بەبڕینی گۆشتەکە بۆ میوانەکەی )) ٠

---

[٤٥٤] _ إسناده ضعيف : أخرجه أبوداود ( ٣٧٣٨ ) ، وضعفه الألباني ٠

[٤٥٥] _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٤ / ١٣٩ ، ١٧٩ ) ، ( ٥ / ٢٨٧ ، ٢٨٨ ) ، والدارمي ( ٧٣٣ ) ، والبخاري ( ١ / ٦٣ ، ١٧٢ ) ، ( ٤ / ٥١ ) ، ( ٧ / ٩٦ ، ٩٨ ، ١٠٧ ) ، ومسلم ( ١ / ١٨٨ ) ، وابن ماجة ( ٤٩٠ ) ، والترمذي ( ١٨٣٦ ) ، كلهم عن طريق الزهري قال : أخبرني جعفر بن عمرو بن أمية عن أبيه فذكره ٠

[٤٥٦] _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٤ / ٢٥٢ ، ٢٥٥ ) ، وأبوداود ( ١٨٨ ) ، والترمذي في الشمائل ( ١٦٦ ) ، كلهم من طريق مسعر عن أبي صخرة جامع بن شداد ، عن المغيرة بن عبدالله ، فذكره عن المغيرة بن شعبة ٠

# بەشێك : سەبارەت بە جۆرەکانی نان :

چاكترين جۆرەكانی نان ئەوەيە كە بەچاكی شێلدرابێ و هەڵهاتبێ ، پاشان نانی تەنوور بەچاكترين جۆری نان دادەنرێت و ، پاش ئەوەش نانی فڕنە ، پاشان نانی ( المَلَّة )([457]) لە پلەی سێ يەمدايە ، چاكترينيشی ئەوەيە كە لە گەنمی نوێ دروست كرابێ ·

زۆرترين ئەو جۆرانەشی كە خۆراك بەخشە نانی ( السَّميذ )ە([458])، كە درەنگ هەرسە لەبەر زۆر پاكی و نەبونی هيچ كەپەكێك تيايدا ، بەدواشيدا نانی ( الحُوَّارَى )([459]) ، پاشانيش ( الخشكار )([460]) ·

چاكترين كاتی خواردنيشی كۆتايی ئەو ڕۆژەيە كە دروست كرابێت ، نەرمەكەشی زياتر نەرم دەكات و خۆراك دەبەخشێ و تەڕ دەكات و بەخێراش دادەبەزێ ، ووشكەكەش بە پێچەوانەوەيە ·

ميزاجی نانی گەنم گەرمە لە نێوەندی پلە دوودا ، نزيكی ناوەندە لە شێداری و ووشكێتيدا ، ووشكێتی زاڵە بەسەر ئەوەدا كە ئاگر ووشكی كردۆتەوە ، شێداريش بەسەر پێچەوانەكەيدا ·

---

[457] ـ خبز المَلَّة : نانی ( الْمَلَّةِ ) لە نێو خۆڵەمێشی گەرمدا دەبرژێندريت و بەلای دەشتەكيەكانەوە ناسراوە ، بڕوانە : مختصر خليل للخرشي ، ج١٦ ص٣٠٨ • وەرگێڕ ·

[458] ـ خبز السَّميذ : نانێكە لە ئاردێك دروست دەكرێت كە چەند جارێك بێژرابێت ( سفر ) ، بڕوانە : تاريخ دمشق ، ج٥٥ ص٤٩ • وەرگێڕ ·

[459] ـ خبز الحُوَّارى : ئەو نانەيە كە لە پوخت و پاڵفتەی ئاردی سپی دروست دەكرێت ، بڕوانە : مجلة المنار ، ج ٢١ ، ص٤٩٨ ، وەرگێڕ ·

[460] ـ خبز الخشكار : نانی ئەسمەرە كە لە ئاردێك دروست دەكرێت كە كەپەكەكەی تێدا بێ و پاك نەكرابێت ، بڕوانە : المعجم الوسيط ، وەرگێڕ ·

نـانى گـەنم خاسـيەتێكى تێدايـە ، بريتيـە لـەوەى خێـرا قەڵـەو دەكـات ، نـانى ( القطـائف )يش([٤٦١]) خەڵتەيەكى چڕ دروست دەكات ، ووردكراويشى با دروست دەكات و درەنـگ هەرسـە ، ئەوەش بە ماست دروسـت دەكرێـت خـۆراكيكى زۆر دەبەخشـێت و ، درەنـگ لـە گـەدە ليـژ دەبێتـەوە ٠

نانى جۆ ساردو ووشكە لە يەكەمدا ، بەبەراوردى گەنم خۆراكێكى كەمتر دەبەخشێت ٠

خَلٌ ، سركە : وعن جابر – رضي الله عنه – : أنَّ النَّبيَّ ﷺ سَأَلَ أَهْلَهُ الأُدْمَ ، فقالوا : مَا عِنْدَنَا إلاَّ خَلٌّ ، فَدَعَا بِهِ ، فَجَعَلَ يَأْكُلُ ، ويقول : (( نِعْمَ الأُدْمُ الخَلُّ ، نِعْمَ الأُدْمُ الخَلُّ ))([٤٦٢]).

واتە : لە ( جابر )ەوە _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : پێغەمبەرى خوا ﷺ داواى پێخۆرى لە خێزانەكانى كرد ، ئەوانيش فەرموويان : جگە لە سركە هيچى ترمان نى يە ، ئەوەبوو فەرمانيدا بۆى بێنن ، بۆيە دەستى كرد بەخواردنى و دەيفەرموو : (( چاكترين پێخۆر سركەيە ، چاكترين پێخۆر سركەيە )) ٠

وفي سنن ابن ماجة عن أُمِّ سعد _ رضي الله عنها عن النبيِّ ﷺ : (( نِعْـمَ الْـإِدَامُ الْخَـلُّ ، اللَّهُـمَّ بَارِكْ فِي الْخَلِّ ، فَإِنَّهُ كَانَ إِدَامَ الْأَنْبِيَاءِ قَبْلِي ، وَلَمْ يَفْتَقِرْ بَيْتٌ فِيهِ خَلٌّ ))([٤٦٣]).

واتە : لـە ( أُمِّ سـعد )ەوە _ خـواى لـىٚ ڕازى بێـت _ فەرموويـەتى : پێغەمبـەرى خـوا ﷺ فەرمووى : (( چاكترين پێخۆر سركەيە ، پەروەردگارا فرەو بەرەكەت بخەرە سـركەوە ، چـونكە پێخۆرى پێغەمبەرانى پێشم بووە ، ئەوماڵەش سركەى تێدابىٚ هەژار ناكەوێت )) ٠

---

[٤٦١] _ خبز القطائف : پارچە هەويرێكن بە بچكۆلە لول دەكرێن و بەكەوانەيى سوردەكرێنەوەو ناواخن دەكرێن بە كاكڵە گوێزو شتى تر ، بڕوانە : قاموسى رستە ، وەرگێڕ ٠

[٤٦٢] _ صحيح : أخرجه مسلم ( ٦ / ١٢٥ ، ١٢٦ ) عن أبي سفيان طلحة بن نافع عن جابر فذكره ٠

[٤٦٣] _ موضوع : أخرجه ابن ماجة ( ٢٣١٨ ) ، وحكم عليه بالوضع الشيخ الألباني في ضعيف الجامع ( ٥٩٦١ ) ٠

سرکه له گەرمی پێکهاتووه ، ساردی بەسەردا زاڵە ، ووشکه له سێ یەمدا ، بەهێز ووشك دەکاتەوه ، قەدەغەی تێرژانی مادەکان دەکات ، سروشت نەرم ونیان دەکاتەوه ، سرکەی مەی و شەراب ( خل الخمر ) بۆ گەدەی گرگرتوو بەسووده ، ( الصفراء ) کپ دەکاتەوه ، زیانی دەرمانه کوشندەکان دوردەخاتەوه ، شیرو خوێن ئەگەر لە هەناودا بەسترلن شی یان دەکاتەوه ، سوود به سپڵ دەگەیەنێت ، گەده خۆشه دەکات ، سك دەگرێتەوه ، تینویەتی دەوەستێنێت ، قەدەغەی ئاوسان دەکات لە هەر جێگەیەك ویستی دەرچوونی هەبێ ، یارمەتی هەرسکردن دەدات ، دژ به بەڵغەمه ، خۆراکه چەرەکان نەرم ونیان دەکاتەوه ، خوێن ڕوون و ناسك دەکاتەوه ٠

ئەگەر بەخوێ وە بخورێتەوه ، بەسووده بۆ ئەو کەسەی قارچکی کوشندەی خواردبێت ، ئەگەر هەڵقورێندرێت ، زارووی پەیوەست به بنەڕەتی مەڵاشووه دەبڕێت ، ئەگەر به گەرمی لە دەم وەردرێت ، بۆ ئازاری ددان بەسوودەو ، پوکیش بەهێز دەکات ٠

به شێوەی تێ هەڵسوان بۆ نەخۆشی ( الدَّاحس )و([٤٦٤]) ٠ ئەو برینانەی لە لاکانی مرۆڤدا پەیدادەبن و ئاوسانه گەرمەکان و ، سووتان بەئاگر بەسووده ، دڵ دەکاتەوه بۆ خواردن ، گەده چاك و بۆن خۆش دەکات ، بۆ لاوێتی چاکەو ، لە هاوینیشدا بۆ دانیشتوانی وەڵاته گەرمەکان چاکه ٠

خلالٌ : ددان پاکەوکار : دوو فەرموودەی لەبارەوه هاتوون ( صحیح ) نین ، یەکەمیان : يُروى من حديث أبي أيوب الأنصاري يرفعه : يا حَبَّذا المُتَخَلِّلونَ من الطَّعام ، إنه ليس شيءٌ أشدَّ على المَلَكِ من بَقيَّةٍ تَبْقى في الفمِ من الطعامِ([٤٦٥]) وفيه واصلُ بن السائب ، قال البخاري

---

[٤٦٤] _ الدَّاحس : زیپکەیەکە لە نێوان نینۆك و گۆشتەکەدا دەردەچێت و بەهۆیەوە نینۆکەکە دەکەوێت ، بڕوانه: المعجم الوسيط ، ج١ ، ص٥٦٧ ٠ وەرگێڕ ٠

[٤٦٥] _ إسناده ضعيف : أخرجه أحمد ( ٥ / ٤١٦ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الترغيب والترهيب ( ١٥١ ) ٠

والرازي : منكر الحديث ، وقال النسائي والأزْدِي : متروك الحديث · واته : له ( أبي أيوب الأنصاري )وه _ خواى لىٚ رِازى بێت _ فەرموويەتى : پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى : (( چەند چاكە ئەو كەسانەى بە ددان پاكەوكار ددانەكانيان پاش خۆراك خواردن پاك دەكەنەوە ، بەرِاستى هيچ شتێك بە لاى فريشتەوە قورستر نى يە لە پاشماوەى ئەو خۆراكەى لە زاردا دەمێنێتەوە )) ·

دووەم : يروى من حديث ابنِ عبّاسٍ ، قال عبدُاللهِ بنُ أحمدَ : سألت أبي عن شيخٍ روى عنه صالحٌ الوحاظيّ يقال لهُ محمد بنُ عبدِالملكِ الأنصاريّ حدّثنا عطاءٌ عن ابنِ عبّاسٍ قالَ : نهى رسول الله ﷺ أن يُتَخَللَ باللّيط والآس ، وقال : إنهما يسقيان عُروقَ الجُذَام .

واته : پێغەمبەرى خوا ﷺ قەدەغەى كردووە ددان پاك بكرێتەوە بە توێكلى رِەقى قاميش و ( الآس )و([٤٦٦]) فەرمووى : رِەگەكانى نەخۆشى گولى دەبوژێننەوە ، ئەوەبوو ( عبدالله )ى ( أحمد ) فەرمووى : بابم فەرمووى : ( محمد )ى كورِى ( عبدالملك )م بينى كوێر بوبو كەچى فەرموودەى هەڵبەستراوى دادەناو درۆى دەكرد ·

پاشان · ددان پاكەوكار بەسوودە بۆ پووك و ددان ، تەندروستيان دەپارێزێت ، بۆ گۆرِينى بۆنى زار بەسوودە ، چاكترين جۆريشى ئەوەيە كە لە دار چوكڵەكانى پاككردنەوەو ، هەروەها

[٤٦٦] _ الآس : بريتيە لە درەختۆكەيەكى هەميشە سەوز ، بەزۆرى لە شوێنە شێدارو سێبەريەكاندا دەرِوێت ، لقێكى زۆرى پێوەيەو ، بۆنێكى خۆشى هەيە ، لقەكان گوڵگەلێكى رِەنگ سپى مەيلەو پەمەيى هەڵدەگرن ، بەرێكى رِەشى هەيەو ، لە كاتى پێگەشتنيدا دەخورێت و هەروەها ووشك دەكرێتەوەو دەيكەن بە بەهارات ، هەموو رِووەكەكە بەكار دەهێنرێت ، سەرەرِاى بۆنە خۆشەكەى · برِوانە : www0khayma.com ·

له دارەكانی زەیتون و بیی ( الخلاف ) وەرگیرابیّ ، بەڵام پاككردنەوە بە قامیش و ( الآس )و ڕێحانەو ( الباذروج )([٤٦٧]) زیانبەخشە ٠

## پیتی دال ( د ) :

دُهْنٌ ، ڕۆن : روى الترمذي في كتاب الشمائل من حديث أنس بن مالك _ رضي الله عنهما _ قال : كان رسول الله ﷺ يُكثِرُ دُهْنَ رأسِهِ ، وتسريحَ لِحيته ، ويكْثِرُ القِناعَ كأن ثَوْبَه ثَوبُ زَيَّاتٍ([٤٦٨]).

واته : له ( أنس )ى كوڕى ( مالك )ەوە _ خوای لیّ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺبەزۆری سەری چەور دەكردو ، ڕیشی دادەهێناو ، پارچە پەڕۆیەكی بەسەردا دەدا پاش چەوركردن وەكو ئەوەی پۆشاكەكەی پۆشاكی ڕۆن فرۆش بێت ٠

ڕۆن كونیلەكانی جەستە دادەخات ، قەدەغەی شیی بوونەوەی مادەكان دەكات ، دوای خۆشتن بەئاوی گەرم ئەگەر بەكارهات ، چاكی و جوانی شێداری بە جەستە دەبەخشیّ ، ئەگەر پرچی پیّ چەوەر بكرێت چاكی و جوانی پیّ دەبەخشیّ و درێژی دەكات ، بۆ سورێژە بەسوودەو ، زۆرترین بەڵاكانی لیّ دوردەخاتەوە ٠

وفي الترمذي : من حديث أبي هريرة _ رضي الله عنه _ مرفوعاً : (( كُلُوا الزَّيتَ وادَّهِنُوا به ))([٤٦٩]) ٠

واته : له ( أبي هريرة )وە _ خوای لیّ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ: (( زەیت بخۆن و خۆتانی پیّ چەور بكەن )) ٠

---

[٤٦٧] _ الباذروج : نبات طيب الرائحة : بڕوانه : لسان العرب ، وەرگێڕ ٠

[٤٦٨] _ أخرجه الترمذي في الشمائل ( ٣٣ ) ، ( ١٢٦ ) عن يزيد الرقاش عن أنس بن مالك فذكره٠

[٤٦٩] _ إسناده ضعيف : أخرجه الترمذي ( ١٨٥٤ ) ، وأحمد ( ٣ / ٤٩٧ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٤٢٠٣ ) ٠

ڕۆن لــه وه‌ڵاتــه گه‌رمــه‌كانی وه‌كــو _ حیجــازو هاوشــێوه‌كانیدا _ لــه گــه‌وره‌ترین هۆكاره‌كانی پاراستنی ته‌ندروستی و چاكردنی جه‌سته‌یه‌و ، زۆر پێویسته بۆ ئه‌وان ، به‌ڵام دانیشتوانی وه‌ڵاته سارده‌كان ئه‌وه‌یان پێویست نی یه ، زۆر به‌كارهێنانیشیی له سه‌ردا بۆ چاو مه‌ترسی تێدایه ٠

چـاكترین ڕۆنـیش ســاده‌كانه وه‌كــو : زه‌یتــی زه‌یتــون ، پاشـان ڕۆن و ، پاشـانیش ڕۆنـی كۆنجیه ٠

به‌ڵام ئاوێته‌كان : هه‌ندێكیان ســاردی تــه‌ڕو شــێدارن ، وه‌كــو ڕۆنــی گــوڵی وه‌نه‌وشــه‌( دهـن البنفسج ) كه بۆ سه‌رئێشه‌ی گه‌رم به‌سووده ، ئه‌و كه‌سانه ده‌نوێنێت كه به‌شه‌و نـاتوانن بنـون ، مێشك شێدار ده‌كاته‌وه ، بۆ قڵیشانی ده‌ست و پێ و ده‌م ولێو بـه‌هۆی ســه‌رماوه یـا بـه‌هۆی نه‌خۆشیه‌وه به‌سووده ، هه‌روه‌ها بۆ زاڵبونی ووشكێتی به‌سه‌ر جه‌ستـه‌دا به‌سـووده ، گـه‌ڕێتی و ، خوروی ووشكی تــیَ هه‌ڵده‌ســوێنرێت و ســوودی لــیَ وه‌رده‌گرن ، جوڵانـه‌وه‌ی جومگـه‌كان ئاسان ده‌كاته‌وه ، بۆ كه‌سانی خاوه‌ن میزاجی گه‌رم لـه هاوینـدا به‌سـووده ، دوو فـه‌رمووده‌ی پوچیشی له‌باره‌وه هاتوون و هه‌ڵبه‌ستراوه به زاری پێغه‌مبه‌ری خواوه ﷺ:

یه‌كه‌م : فضلُ دُهن البَنَفْسَج على سائرِ الأدهان ، كَفَضْلي على سائرِ الناس ° واته : فـه‌زڵ و چاكی ڕۆنی وه‌نه‌وشـه به‌ســه‌ر تێكـڕای ڕۆنه‌كانـدا ، وه‌كـو فـه‌زڵ و چـاكی منـه به‌سـه‌ر هـه‌موو خه‌ڵكدا ٠

دووه‌م : فضلُ دُهن البنفسَج على سائر الأدهان ، كفضل الإسلام على سائر الأديـان ° واتـه : فه‌زڵ و چاكه‌ی ڕۆنی وه‌نه‌وشـه به‌ســه‌ر تێكـڕای ڕۆنه‌كانـدا ، وه‌كـو فـه‌زڵ و چـاكی ئیسـلامه به‌سه‌ر هه‌موو ئاینه‌كاندا ٠

هەندیٚ لە ئاویٚتەکانیش : گەرمی تەڕو شێدارن ، وەکو ڕۆنی ( البان )[٤٧٠] ، بەڵام نەك ڕۆنی گوڵەکەی ، بەڵکو ڕۆنی تووەکەی کە سپی یەو مەیلەو خاکیە وەکو فستق ، ڕۆن و چەوریەکی زۆری تیٚدایەو ، بەسوودە بۆ ئەستورو ڕقیٚتی دەمارو ، نەرمی دەکاتەوە ، بۆ پەڵە سپیٚکانی سەر نینۆك و ، پەڵەکانی سەر پیٚست کە جیاوازن لە ڕەنگی ئاسای پیٚست و ، پڵەو خاڵ و سورایەکانی سەر دەم وچاو و ، بەڵەکی بەسوودە ، بەڵغەمی چڕ نەرم دەکاتەوەو ، ژیٚ ووشکەکان نەرم دەکاتەوە ، دەمار گەرم دەکات ، فەرموودەیەکی پووچیشی لەبارەوە هەڵبەستراوە کە هیچ بنەڕەتیٚکی نی یە بەم بیٚژەیە : (( ادَّهنوا بالبانِ ، فإنه أحظى لكم عند نسائكم )) واتە : (( بەڕۆنی ( البان ) خۆتان چەور بکەن ، چونکە بەڕیٚزترو خۆشەویستر دەبن بەلای خیٚزانەکانتانەوە )) ٠ لە سوودەکانی تریشی ددانەکان پاك دەکاتەوە ، جوانی و گەشداری پیٚ دەبەخشیٚ و ، تەڵخ و بەڵخەکانی پاك دەکاتەوە ، هەرکەس دەم وچاوو لاکانی پیٚ چەور بکات تووشی پیٚچ بەسکدا هاتن و قڵیشانی دەم وچاو لیٚو و پیٚ نابیٚت ، ئەگەر نیٚوان هەردوو ڕانی و ئەندامی نیٚرینەی پیٚ چەور بکات ، بۆ ساردی گورچیلەو ، میٚزەچرتیٚ بەسوودە ٠

---

٤٧٠ ــ البان : درەختیٚکە بەرزیٚکی بەرز دەبیٚتەوەو ، لقەکانیشی ڕیٚك و کەمن ، دریٚژی ئەم درەختە نزیکەی ( ٦ ) متر دەبیٚ ، گوڵیٚکی چڕی جوانی پەمەیی پیٚوەیەو ، پیٚش دەرچوونی گەڵاکان دەردەچن لە نیٚوان مانگەکانی مارس و نیساندا ، پاشان گوڵەکان بەریٚکی دریٚژ دەدەن کە بریتیە لە بەرگیٚگ و هەر بەرگیٚکیش چەند دانە تۆویٚکی تیٚدایە لە یەك ڕیزدا ، تۆوەکان گەورەن و تا ڕادەیەك لە فستق دەچن ، بڕوانە ٠

## پیتی ذال ( ذ ) :

ذريرة : ناوى گیایەكى بۆنخۆشە : ثبت في الصحيحين : عن عائشة _ رضي الله عنها _ قالت : طَيَّبتُ رسولَ الله ﷺ بيدي ، بذَرِيرَةٍ في حَجَّةِ الوَدَاعِ لِحلِّه وإحرامِهِ([471]).

واتە : لە دایكە ( عائشة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : بەدەستەكانی خۆم پێغەمبەری خوام ﷺ لە حەجیماڵئاوایدا بە ( ذريرة ) بۆنخۆش كرد ، كاتێ كە ئیحرامی بەست و كە ئیحرامیشی كردەوە پێش تەواف كردن ٠

پێشتر باسی ( ذريرة )مان كردو سوودەكانیشمان خستەڕوو ، بۆیە پێویست بە دووبارەكردنەوە ناكات ٠

ذُبَابٌ ، مێش : لە فەرموودەكەی ( أبي هريرة )دا كە فەرموودەیەكی ( المتفق عليه )ە باسی ئەوە كراوە كە مێش ئەگەر كەوتە خواردن و خواردنەوەوە نقومی شتەكە دەكرێت ، بۆ بەدەستهێنانی شیفا كە لە باڵێكیدایە ، چۆنكە وەكو ( الترياق )ە بۆ ئەو ژەهرەی لە باڵەكەی دیكەیدایەو ، سوودەكانی مێشیشمان پێشتر خستە ڕوو ٠

ذَهَبٌ ، زێڕ : روى أبوداود ، والترمذي : أنَّ النبيَّ ﷺ رَخَّصَ لِعَرْفَجَةَ بنِ أسْعَدٍ لَمَّا قُطِعَ أنْفُهُ يومَ الكُلاب ، واتَّخَذَ أنفاً من وَرِقٍ ، فأنْتَن عليه ، فأمَرَه النبيُّ أنْ يَتَّخِذَ أنْفاً مِنْ ذَهَبٍ([472]).

واتە : كاتێ ( عَرْفَجَةَ )ی كوڕی ( أسْعَدٍ ) لە ڕۆژی جەنگی ( الكُلاب )دا لووتی بڕاو ، لوتێكی زیوینی بۆ خۆی دروست كرد ، بۆگەنی كرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدایە كە لووتێكی زێڕین بەكاربێنێت ٠ ( عَرْفَجَةَ )ش جگە لەم تەنها فەرموودەیە هیچی تری نی یە ٠

---

[471] _ صحيح : تقدم تخريجه ٠

[472] _ حسن : أخرجه أحمد ( ٢٣١٥ ) ، وأبوداود ( ٤٢٣٣ ) ، والترمذي ( ١٧٧٠ ) ، والنسائي ( ٨ / ١٦٣ ، ١٦٤ ) كلهم من طريق عبدالرحمن بن طرفة عن عرفجة بن أسعد فذكره ٠

زێـڕ : بـۆ ڕازاوەیـی دونیـا بـەکاردێت ، تەڵسـەمی بوونیەتیـە ، شـادی هێنـی نەفسـە ، بەهێزکاری دەرکەوتنە ، نهێنی خوایە لە زەمینەکەیدا ، میزاجی لـە تێکڕای چۆنیەتیەکانیدایە ، گەرمیـەکی نـەرم ونیـانی تێدایـە بەشـدار دەبـێ لـە تێکـڕای شـتە شـادی هێنەرەکانـدا ، نێوەنجیترین و بەرێزترین کانزاکانە بەڕهایی ٠

لـە خاسـیەتەکانی ئەوەیـە کـە ئەگـەر بخرێتـە ژێـر خاکـەوە ، ئـەو خاکـە هـیچ زیـانی پـێ ناگەیەنێت و ، هیچی لێ کەم ناکاتەوە ، ئەگەر ووردەو خاکەکەی ( برادتە ) تێکـەڵ بـەدەرمان بکرێت ، بـۆ لاوازبـوونی دڵ و ، لـەرزین کـە بـەهۆی زاڵبـوونی ( السـوداء )ەوە دروسـت دەبـێ بەسوودە ، بۆ وورپینەو ، دلگرانی و ، خەم و ، ترسان و توقین و ، عیشق بەسـوودە ، جەسـتە قەڵەو دەکات و ، بەهێزی دەکات ، زەردووی لادەبات ، ڕەنگ وبۆ چاك وجوان دەکاتـەوە ، بـۆ گولی و ، تێکڕای ئازارو نەخۆشیە ( السَّوداویَّة )کان بەسوودە ، لـە نەخۆشـیەکانی ( داءالثعلـب )و ، ( داء الحیـة )دا بەخاسـیەت بەشـدارە ، بەخواردنـەوەو تـێ هەڵسـووان ، چـاوەکان پـاك دەکاتـەوەو بـەهێزی دەکـات ، بـۆ زۆرێـك لـە نەخۆشـیەکان بەسـوودەو ، هـەموو ئەندامـەکان بەهێزی دەکات ٠ بۆگەنی دەم ناهێڵێت ئەگەر تیایدا ڕاگیرا ، ئەو کەسـەی نەخۆشـیەکی هـەبێ و پێویست بەداخکردن بکـات و ، بـەزێڕ داخـی بکـات ، شـوێنەکەی تڵۆقـە دروسـت ناکـات و ، بەخێراش سارێژ دەبێتەوە ، هەرکەس کلچێوکێکی زێڕین بۆ ڕەشتنی چاو بەکاربێنێت ، چـاوی بەهێز دەکات و پاکی دەکاتەوە ، ئەگەر ئەنگوسـتیلەیەکی لـێ دروسـت بکرێـت و نقێمەکەشـی هەر لـە خـۆی بـێ و گـەرم بکرێـت و ، پـەڕە گـەورەکانی پێشـەوەی کـۆتری پـێ داخ بکـرێ ، هۆگری هێلانەکەی دەبێ و ، جێگەکەی ناگۆڕێت ٠

خاسیەتێکی سەرسوڕمێنی تێدایە لە ورە بەرزکردنەوەدا ، بۆیە ڕێی پێدراوە لە جەنگدا بەکاربهێنرێت و لە چەکیشدا بەکاربێت بەئەندازەی ئەوەی ڕێی پێدراوە ، وقد روی الترمذي

من حديث مَزِيدَة العَصَري _ رضي الله عنه _ ، قال : دخل رسولُ اللهِ ﷺ يومَ الفَتْح ، وعلى سيفِهِ ذَهَبٌ وفِضةٌ([٤٧٣]).

واته : له ( مَزِيدَة العَصَري )وه _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : پێغەمبەرى خوا ﷺ له ڕۆژى ڕزگاركردندا چووه مەككەوەو ، شمشێرەكەى زێڕو زيوى بەسەرەوە بوو ٠

زێڕ خۆشەويستى نەفسەو هەركات دەستى كەوت ، ئاسوودەى پىٚ دەبەخشىٚ و چيتر ئاوەڕ له خۆشەويستەكانى ديكە ناداتەوە ، ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ والخَيْلِ المُسَوَّمَةِ والأنْعَامِ وَالحَرْثِ ﴾[ آل عمران : ١٤ ] واته : ﴿ زُيِّنَ ﴾ جوان كراوه ﴿ لِلنَّاسِ ﴾ بۆ خەڵكى ( دونيا پەرست ) ﴿ حُبُّ الشَّهَوَاتِ ﴾ خۆشى و ئارەزوواتى نەفسى ﴿ مِنَ النِّسَاءِ ﴾ له ئافرەتان ﴿ وَالْبَنِينَ ﴾ وكوڕان ﴿ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ ﴾ ودارای زۆرى كەڵەكە كراو ﴿ مِنَ الذَّهَبِ ﴾ له ئاڵتون و زێڕ ﴿ وَالْفِضَّةِ ﴾ وزيو ﴿ والخَيْلِ ﴾ وئەسپ و ماينانى ﴿ المُسَوَّمَةِ ﴾ نيشانەدار ( بەسپێتى ناوچاوان و هەر چوار پەلى ﴿ والأنْعَامِ ﴾ هەروها ئاژەڵ وچوارپێيان ﴿ وَالحَرْثِ ﴾ و كشتوكاڵ([٤٧٤])٠

وفي الصحيحين : عن النبي ﷺ : (( لو كان لابن آدمَ وادٍ من ذَهبٍ لابتغى إليه ثانياً ، ولو كان له ثانٍ ، لابتغى إليه ثالثاً ، ولا يملأ جَوفَ ابن آدمَ إلا التُّرابُ ، ويتوبُ اللهُ على مَن تابَ ))([٤٧٥]).

واته : پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى : (( ئەگەر نەوەى ئادەم شيوێك زێڕى هەبوايە ، ئارەزووى دووەمى دەكرد ، ئەگەر دووانى هەبوايە ، ئارەزووى سىٚ يەمى دەكرد ، بەدەر له

[٤٧٣] _ ضعيف : أخرجه الترمذي ( ١٦٩٠ ) بإسناده عن هود بن عبدالله بن سعد ، عن جده مزيدة فذكره ، قال الترمذي : هذا حديث حسن غريب ، وجد هود اسمه مزيدة العصري ٠

[٤٧٤] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەى تەفسيرى قورئان ٠

[٤٧٥] _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ١١ / ٢١٦ ) ، ومسلم ( ١٠٤٨ ) ٠

خاكيش هيچى تر سكى نەوەى ئادەم پڕ ناكات و ، پەروەردگاريش تەوبەو پەشيمانى ئەو كەسە قبولْ دەكات كە داواى تەوبە دەكەن و پەشيمان دەبنەوە )) ٠

زێڕ گەورەترين كۆسپ و جياكارى نێوان بەندەكان و نێوان سەركەوتنى گەورەيە لە رۆژى قيامەتدا ، گەورەترين شتێكيشە كە سەرپێچى خواى تعالاى پىێ كرابىێ ، هەر زێريش بو بە هۆكارى بڕينى پەيوەندى خزمايەتى و ، خوێن ڕشتن و ، حەرامكراوەكان حەڵاڵ كران و ، قەدەغەى مافەكان كراو ، بەندەكان ستەميان لە يەكتر كرد ، هۆكارى ويستنى دونياو ، وازهێنانە لە ڕۆژى دواى و ئەوەى خواى تعالى بۆ خۆشەويستانى خۆى ئامادەى كردووە ، چەندەها ماف بەزێر پێشێل كراو ، هەر بەزێڕيش چەندەها پۆچى زيندو كرانەوەو ، چەندەها ستەمكار سەرخران و ، چەندەها ستەملێكراو بەزێنران ، چەند جوانە ئەوەى ( الحريرى ) لەم بارەوە گوتويەتى :

تبّاً لهُ من خادعٍ مُماذقِ ... أصْفَرَ ذي وجْهَيْنِ كالمُنــافِــقِ
يَبدو بوَصْفَينِ لعَينِ الرّامِقِ ... زينَةِ معْشوقٍ ولوْنِ عاشِــقِ
وحُبّهُ عندَ ذَوي الحَقائقِ ... يدْعو الى ارتِكابِ سُخْطِ الخــالِقِ
لوْلاهُ لمْ تُقْطَعْ يَمينُ سارِقِ ... ولا بدَتْ مظْلِمَةٌ منْ فاسِــقِ
ولا اشْمأزّ باخِلٌ منْ طارِقِ ... ولا شكا المَمطولُ مطلَ العائِقِ
ولا استُعيذَ منْ حَسودٍ راشِقِ ... وشرّ ما فيهِ منَ الخــلائِقِ
أنْ ليسَ يُغْني عنْكَ في المَضايِقِ ... إلاّ إذا فرّ فِرارَ الآبِــقِ

واته :

خـــــــوا له ناوى بەرێت چ فيلاويەكى قەڵپە
زەردەو دووڕووە وەكـــــــــو كەســـــــــــى دووڕوو
بەدوو وەسف بۆ چاوى بينەر دەردەكـــــەوێت
خشلێكى خۆشــــــــــــــەويست و ڕەنگى ئاشـــــــــق
خۆشەويشتيى بەلاى كەسانى هەقيقەت زانـــەوە
دەبێ بەهۆى تـــــــــــووڕەبوونى پەروەردگـــــــــــــار
ئەگەر ئەو نەبوايە دەستە ڕاستى دز نەدەبڕدراو
ســــــتەميش لە كەســـــــى خراپەوە دەرنەدەكـــــــــەوت
دەست قوچاويش بێزى لە لێدەرى دەرگا نەدەبـــۆوەو
كەسى دواخەريش سكالآى كۆسپى نەدەكرد بۆ ئەوەى لەئەستۆيدايە
پەناش نەدەگيرا لە كەسى ئێرەيى بەرى چاوتێبرو
شـــــــــــــەڕى ئەو بەديهێنراوانەى لە ســــــــــەر زەويدان
لە تەنگانەشدا هيچى تر جێگەى تۆ نـــــاگرێتەوە
مەگـــــــەر هەڵبێت وەكـــــــو هەڵهـــــــــــــــــاتنى كوێلە

## پيتى الراء ( ر ) :

رُطَبٌ ، خورماى ڕوتابى تازە پێگەيوو : قـال الله تعـالى لمـريمَ ﴿ وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا فَكُلِي وَاشْرَبِي وقَرِّي عَيْنا ﴾[ مريم : ٢٥ ] واته : ﴿ وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ ﴾ قەدى ئـەو دارخورمايـەش بـۆ لاى خـۆت ڕاوەشـێنە ﴿ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ﴾ خورماى تازە پێ گەييوەت بەسەردا دەبارێ ﴿ فَكُلِي وَاشْرَبِي ﴾ ئينجا ( لـەو خورمـا ) بخـۆ و ( لەو ئاوەش ) بخۆرەوە ﴿ وقَرِّي عَيْنا ﴾ چاوو دڵ ڕۆشن بە ([٤٧٦]).

[٤٧٦] ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەى تەفسيرى قورئان .

وفي الصحيحين عن عبدالله بن جعفر ، قال : رأيتُ رسول الله ﷺ يأكُلُ القِثَّاءَ بالرُّطَبِ(٤٧٧).

واتـه : لـه ( عبـدالله )ى كـوڕى ( جعفـر )ەوه _ خـواى لـىٚ ڕازى بيٚـت _ فەرموويـەتى : پيٚغەمبەرى خوام بينى ﷺ كاليارو خورمارى ڕوتابى تازه پيٚگەيوى بەيەكەوه دخوارد ·

وفي سنن أبي داود ، عن أنس قال : كان رسولُ الله ﷺ يُفطِرُ على رُطَباتٍ قبلَ أن يَصلِّيَ ، فإنْ لم تكُن رُطباتٍ فتمراتٍ ، فإن لم تكن تَمراتٍ ، حَسَا حسْوَاتٍ من ماءٍ(٤٧٨) ·

واته : له ( أنس )ەوه _ خواى لىٚ ڕازى بيٚت _ فەرموويەتى : پيٚغەمبەرى خوا ﷺ ڕۆژووى به چەند خورمايەكى ڕوتابى تازه پيٚگەيوو دەشكاند ، پيٚش ئەوەى نويٚژى بكردبا ، ئەگەر خورماى ڕوتابى تازه پيٚگەيو نەبوايه چەند خورمايەكى دەخوارد ، ئەگەر خورماش نەبوايه ، چەند قوميٚكى ئاوى دەخواردەوه ·

ميزاجى خورماى ڕوتابى تازه پيٚگەيوو وەكو ميزاجى ئاوەو گەرمى تەڕو شيٚداره ، گەدەى سارد بەهيٚز دەكات و گونجاويٚتى ، ئارەزووى جووتبوون زياد دەكات ، جەسته چاك و بەپيت دەكات ، گۆنجاوه بۆ خاوەن ميزاجه ساردەكان و ، خۆراكيٚكى زۆر دەبەخشيٚت ·

گونجاوترين ميوەيه بۆ دانيشتوانى مەدينەى پيرۆزو وەڵاتانى ديكەش كه ميوەى سەرەكيانه ، بۆ جەستەش بەسووده ، ئەگەرچى ئەوەى پيٚى ڕانەهاتبىٚ بەخيٚرا له جەستەيدا بۆگەن دەكات و ، خويٚنيٚكى خراپى ليٚوه دروست دەبىٚ ، بەزۆر خواردنيشى سەرئيٚشەو (

---

٤٧٧ _ صحيح : تقدم تخريجه ·

٤٧٨ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ١٦٤ ) ، وأبوداود ( ٢٣٥٦ ) ، والترمذي ( ٦٩٦ ) كلهم عن ثابت أنه سمع أنس ابن مالك فذكره ·

السوداء ) دروست دەكات ، زيان بەددلن دەگەيەنێت ، بە ( السَّكَنجَبين )و([479]) شتى ترى بەو هاوشێوانە چاك دەكرێت ٠

كە پێغەمبەرى خوا ﷺ بە خورمايى ڕەتابى تازە پێگەيوو ، ياخود بەخورما ، ياخود بەئاو ڕۆژوو دەشكێنێت ، لەبەر نهێنيەكى نەرم ونيانە ، چونكە ڕۆژوو گەدە لە خۆراك خالّى دەكاتەوە ، جگەريش شتێكى واى تێدا بەديناكات ڕايكێشێت و بينێرێت بۆ هێزو ئەندامەكانى جەستە ، شيرينيش لە هەموو شتێك خێراتر بە جگەر دەگات و ، لە هەمووشتێكيش بەلايەوە خۆشەويسترە ، بەتايبەت ئەگەر خورماى ڕەتابى تازە پێگەيو بێت ، زياتر قبولّى دەكات و ، خۆى و هەموو هێزەكانى تريش سوودى لىٚ دەبينن ، ئەگەر خورماى ڕەتابى تازە پێگەيوش نەبوو ، ئەوا خورما ئەو ڕۆلّە دەبينێت ، ئەگەر خورماش نەبوو ، قومە ئاوەكان گڕى گەدەو ، گەرمى ڕۆژوو دەكوژێننەوەو ، پاشان ووريا دەبێتەوە بۆ خۆراك و ، بە حەزو ئارەزووە وەريدەگرێت ٠

رَيْحانٌ ، ڕێحانە : قال تعالى : ﴿ فَأَمَّا إِنْ كَانَ مِنَ الْمُقَرَّبِينَ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّةُ نَعِيمٍ ﴾[ الواقعة : ٨٨ ] واتە : ﴿ فَأَمَّا إِنْ كَانَ مِنَ الْمُقَرَّبِينَ ﴾ ئەنجا ئەگەر ئەو ( كەسەى لە گيانەڵايە ) لە نزيكان بىٚ ( لەخوا ) ﴿ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّةُ نَعِيمٍ ﴾ ئەوە حەسانەوەو بۆن خۆشى و بەهەشتى پڕ لە نازونيعمەتى بۆ هەيە([480]) ٠ وقال تعالى : ﴿ والحَبُّ ذُو العَصْفِ والرَّيْحانُ ﴾[

[479] ــ السكنجبين : دەرمانێكى دێرينى چاخە دێرينەكانەو ووشەيەكى فارسيەو بنەڕەتى ووشەكە ( سركا ــ انگبين )ە واتە سركە ــ هەنگوێن ٠٠ چونكە ئەم دەرمانە لە تێكەڵەيەكى سركەو هەنگوێن پێكهاتووەو ، هەندىٚ مەوادى خۆشى ترى تێدەكرێت ، پاشان ئەم ووشەيە بەكارهێنرا بۆ هەر شەرابێك لە شيرينى و ترشى پێكهاتبێت ، بڕوانە : الشامل في الصناعة الطبية ، ابن النفيس ، وەرگێڕ ٠

[480] ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەى تەفسيرى قورئان ٠

الرحمن : ١٢ ] وه دانەوێڵەی خاوەن کاو پەل و پۆدارو رِیحانة[٤٨١]٠ وفي صحيح مسلم عن النبيِّ ﷺ: (( مَن عُرِضَ عليه رَيْحَانٌ ، فَلا يَرُدَّهُ ، فإنَّه خَفيفُ المَحْمَلِ طَيِّبُ الرَّائِحَةِ ))[٤٨٢] .

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( هەرکەس رێحانەی پێشکەش کرا ، با نەیگەڕێنێتەوە ، چونکە هەڵگرتنی سووکەو بۆنیشی خۆشە )) ٠

وفي سنن ابن ماجة : من حديث أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ _ رضي الله عنه _ عن النبي ﷺ أنه قال : (( أَلَا مُشَمِّرٌ لِلْجَنَّةِ ، فَإِنَّ الْجَنَّةَ لَا خَطَرَ لَهَا ، هِيَ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ ، نُورٌ يَتَلَأْلَأُ ، وَرَيْحَانَةٌ تَهْتَزُّ ، وَقَصْرٌ مَشِيدٌ ، وَنَهَرٌ مُطَّرِدٌ ، وَ ثَمَرَةٌ نَضِيجَةٌ ، وَزَوْجَةٌ حَسْنَاءُ جَمِيلَةٌ ، وَحُلَلٌ كَثِيرَةٌ فِي مَقَامٍ أَبَدًا ، فِي حَبْرَةٍ وَنَضْرَةٍ ، فِي دُورٍ عَالِيَةٍ سَلِيمَةٍ بَهِيَّةٍ )) ، قَالُوا : نعمْ يا رسول الله ، نَحْنُ الْمُشَمِّرُونَ لَهَا ، قَالَ : (( قُولُوا : إِنْ شَاءَ اللَّهُ تعالى )) ، فقال القوم : إنْ شاء الله[٤٨٣].

واته : له ( أُسامة )ی کوڕی ( زَید )ەوه _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ئایا کەسێك نی یه بۆ بەهەشت تێکۆشێت ، چونکه بەهەشت هاوشێوەی نی یه ، سوێند بەخوای کەعبه ، نورو ڕوناکیەکەو دەدرەوشێتەوه ، ڕێحانەیەکی جوڵاوەیه ، تەلارێکی جوانیی دروست کراوه ، ڕوبارێکه یەك سینه ڕێ دەکات ، بەرێکی پێگەشتووه ، هاوسەرێکی جوانه ، خۆشی و ڕازەوەیەکی زۆرەو ، له جێگەیەکی هەتا هەتایدایه ، له نیعمەت و خۆشی و ڕوخسار جوانیدایه ، له ماڵێکی بەرزی جواندایه )) ، کوتیان : بەڵی ئەی پێغەمبەری خوا ، ئێمه هەوڵی بۆ دەدەین ، فەرمووی : (( بڵێن : إن شاء الله تعالى )) ٠

---

[٤٨١] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

[٤٨٢] _ صحيح : تقدم تخريجه ٠

[٤٨٣] _ إسناده ضعيف : أخرجه ابن ماجة ( ٤٣٣٢ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٢١٨٠ ) ٠

ڕێحانه هەموو ڕووەکێکی بۆن خۆشه ، خەڵکی هەر وەڵاتێکیش بە شتێکەوە تایبەتی دەکەن ، بۆیە خەڵکی ڕۆژئاوا بە ( الآس )ەوە تایبەتی دەکەن و ، بریتیە لە جۆری ئەو ڕێحانەی کە عەرەب دەیناسێ ، بەڵام خەڵکی عێراق بە ( الحَبَق )ەوە[٤٨٤] تایبەتی دەکەن ٠

بەڵام ( الآس ) ، میزاجی سارده لە یەکەمدا ، ووشکە لە دووەمدا ، لە گەڵ ئەوەشدا لە چەندین هێزی بەرهەڵستی پێکهاتووە ، بەزۆری گەوهەری خاکی ساردی تێدایە ، شتێکیش لە گەرمی ناسکی تێدایە ، وبەهێز ووشك دەکاتەوە ، بەشەکانی نزیکن لە هاوهێزیەوە ، هێزێکی وەستێنەری قەدەغەکاری هەیە لە ناوەوەو دەردەوەدا ٠

( الإسهال الصفراوی ) دەوەستێنێت ، پاڵنەری هەڵمی گەرمی شێدارە ئەگەر بۆن بکرێت ، زۆر بەهێز دڵ شادومان دەکات ، بۆنکردنی ڕێحانە درم و نەخۆشی قەدەغە دەکات ، هەروەها ئەگەر لەماڵیشدا ڕاخرا ٠

ئاوسانی بۆڕیەکانی میز چاك دەکاتەوە ئەگەر بخرێتە سەری ، ئەگەر بەتەڕی گەڵاکانی کوتراو لەگەڵ سرکەدا خرایە سەر سەر ، خوێن بەربونی لووت دەوستێنێت ، ئەگەر بەووشکی گەڵاکانی هاڕدراو ، پرژێنرایە سەر برینی تەڕو شێدارەوە سوودی پێ دەگەیەنێت ، ئەگەر وەکو بەستەرێك ( الضماد ) بخرێتە سەر ئەندامە کزولاوازەکان بەهێزیان دەکات ، بۆ نەخۆشی ( الداحس ) بەسوودە ، ئەگەر پرژێنرایە سەر زیپکەو برینەکانی دەست و پێ ، سوودی پێ دەگەیەنێت ٠

ئەگەر بخشێنرێتە جەستەدا ئارەقە دەوەستێنێت و ، شێ زیدەکانی جەستە ووشك دەکاتەوەو ، بۆنە ناخۆشەکانی بندەست لادەبات و ، دانیشتن لە سەر کوڵێندراوی ، سوود بە

٤٨٤ ـ الحبق : ڕەیحانەی ( الحبق ) جۆرێکە لە جۆرەکانی ڕەیحانە ، ڕووەکێکی وەرزیەو ، نزیکەی ( ٥٠ )سم لە زەمین بەرز دەبێتەوە ، گەڵاکانی هیلکەیی دەرەوشاوەیە ، قەدەکەی چوارگۆشەیەو ، گوڵەکانی سپی بچوکن٠ بڕوانە : http://www.snble.com/herablslist.php ٠

دوومەڵی کۆم و منداڵدان و ، خاوبونەوەی جومگەکان دەگەیەنێت ، ئەگەر ڕژێنرایە سەر ئێسکی شکاوی یەك نەگرتوودا ، سوودی پێ دەگەیەنێت ٠

کرێش و برینە تەڕو شێدارەکانی سەرو ، زیپکەکانی پاك دەکاتەوە ، ناهێڵێت پرچ بکەوێت و ڕەشیشی دەکاتەوە ، ئەگەر گەڵاکانی بکوترێت و ، ئاوێکی کەمی بەسەردا بکرێت و ، تێکەڵ بەهەندێك لە زەیتی زەیتون یاخود ڕۆنی گوڵ ( دهن الورد ) بکرێت و ، پێچەرێکی ( الضماد ) لێ دروست بکرێت ، بۆ برینە تەڕەکان و ، ئەو برین و زام و زیپکانەی کە لاکانی جەستەدا دەردێن و ، سووربوونەوەو هەڵزڵەپینی پێست و ، ئاوسانە توندو خراپەکان و ، ئەو زیپکەو برینانەی بەسەر پێستەوە دەردێن و خورانێکی توندی لێدەکەوێتەوەو ، مایەسیری بەسوودە ٠

تۆوەکەی بەسوودە بۆ فرێدانی خوێن لە سنگ و سیی کانەوە ، گەدە خۆشەدەکات و هیچ زیانێکی بۆ سنگ و سیی کان نی یە چونکە سیفەتی پاك کردنەوەو سافکردنی تێدایە ، بەخاسیەت سوودێکی باشی هەیە بۆ سکچون کە کۆکەی لە گەڵدابێ و ئەمەش خاسیەتێکی دەگمەنە لە دەرمانەکاندا ، میز زیاد دەکات ، بۆ چوزانەوەی میزڵدان و ، گەزتنی جاڵجاڵۆکەی زیانبەخش و ، پێوەدانی دووپشك بەسوودە ، بەڵام ددان ئاژنین بە ڕەگەکەی زیانبەخشەو ، وورپای بن ٠

بەڵام ڕێحانەی فارسی کە بە ( الحَبَق ) ناودەبرێت ، میزاجی گەرمە بەپێی یەکێك لە دوو گوفتارەکان ، ئەگەر ئاوپرژێن کراو بۆن کرا ئەوا سوود بە سەرئێشەی گەرم دەگەیەنێت ، فێنك دەکاتەوەو ، شێدار دەکات بە کاتی ٠ بەپێی گوفتارەکەی دیکەش ساردە ، بەڵام ئایا تەڕو شێدارە یاخود ووشکە ؟ دوو گوفتاری لەبارەوە هاتووە ٠ ڕاستیش : هەرچوار ( الطبائع )ەکەی تێدایە ، خەوهێنەرە ، تۆوەکەی ڕەوانی زەرداوی دەوەستێنێت ، پێچ بەسکا هاتن هێمن دەکاتەوە ، بەهێزکاری دڵە ، بۆ نەخۆشیە ( السوداويّة )کان بەسوودە ٠

رُمَّانٌ ، هەنار : خوای تعالى دەفەرمێت : ﴿ فِيهِما فَاكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ ﴾[ الرحمن : ٦٨ ] واتە : لەو دوو ( باخە )دا میوەهات هەیە نەخوازەڵاّ دارەخورماو هەنار ([٤٨٥])٠ لە ( ابن عباس )ەوە _ خوا لە خۆی وبابیشی ڕازی بێت _ بە ( مرفوع )ی و بە ( موقوف )ی دەگێڕنەوە فەرموویەتی : هەر هەنارێك لە هەنارەکانی ئێوە پیتێنراوە بە دەنکە تووێك لە هەنارەکانی بەهەشت ٠ فەرموودەکەش لە ( موقوف ) دەچێت ٠ ( حَرِبٌ )و کەسانی تریش لە ( علي )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی : هەنار بە کرۆکەوە بخۆن ، چونکە گەدە خۆشە دەکات ٠

هەناری شیرین گەرمی تەڕو شێدارە ، باشە بۆ گەدە ، بەهێزی دەکات بەو قەبزە ناسکەی کە تیایدایە ، بۆ گەروو سنگ و سیی بەسوودە ، بۆ کوکین باشە ، ئاوەکەی سك نەرم دەکاتەوە ، هێندێك خۆراکی باش بە جەستە دەبەخشێت ، بەخێرا شیی دەبێتەوە چونکە ناسك و نەرم و نیانە ، باو گەرمیەکی کەم لە گەدەدا دروست دەکات ، بۆیە یارمەتی جوتبوون دەدات ، بۆ تادارو لەش گەرم باش نی یە ، خاسیەتێکی سەرسوڕمێنیشی هەیە بەوەی ئەگەر لە گەڵ ناندا خورا ناهێڵێت لە گەدەدا بۆگەن و خراپ بێت ، تەرشەکەشی ساردی ووشکە ، قابزێکی کەمە ، بۆ گەدەی گڕگرتوو بەسوودە ، لە هەموو جۆرەکانی تری هەنار زیاتر میزهێنەرە ، ( الصفراء ) هێمن دەکاتەوە ، سکچونی دەوەستێنێت ، ڕشانەوە قەدەغە دەکات ، پاشماوەکان نەرم ونیان دەکاتەوە ، گەرمی جگەر دادەمرکێنێتەوە ، ئەندامەکان بەهێز دەکات ، بۆ ئازارەکانی دڵ و ، دەمی گەدە بەسوودە ، گەدە بەهێز دەکات و ، پاشماوەکانی دەکاتە دەرەوە ، ( المرَّة الصفراء )و خوێن دادەمرکێنێتەوە ٠

ئەگەر ئاوەکەی دەرهێنراو لەگەڵ ناوەڕکەکەیدا ، بەکەمێك هەنگوینەوە کوڵێندرا تا وەك مەرهەمی لێدێت و ، چاوی پێ ڕەژێنرا ، زەردووی لە چاو دەبڕێت و ، لە تەڕی و شێ چڕەکان پاکی دەکاتەوە ، ئەگەر پۆکی تێ هەڵسوێنرێت ، بەسوود دەبێ بۆ ئەو خۆرەیەی ( الأكلة )

[٤٨٥] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

تووشی دەبێ ، ئەگەر ئاوەکەی دەرهێنراو لە گەڵ ناوەڕۆکەکەیدا ( شحمها ) خورایەوە ، سك ڕەوان دەکات و ، تەڕی وشێ بۆگەنە تاڵەکان لیژ دەکاتە خوارەوەو ، بەسوود دەبێ بۆ تا ڕۆژ نا ڕۆژە درێژخایەنەکان .

بەڵام هەناری مەزر ، لە هەردوو لایەنی میزاج و کردارێشەوە نێوەندی هەردوو جۆرکەیە ، توندی ترشیەکەی کەمێك کەمترە ، دەنکەکانی هەنار لە گەڵ هەنگوێندا تێ هەڵسوویەکی چاکە بۆ نەخۆشی ( الداحس )و برینە پیسەکان ، برینەکان دادەمرکێنێتەوە ، گووتویانە : هەرکەس سێ گوڵە هەنار لە ساڵێکدا قووت بدات ، تێکڕای ساڵەکە چاو ئێشەو چاو داهاتنی تووش نابێ .

## پیتی زای ( ز ) :

زَيْتٌ ، زەیتی زەیتون : خوای تعالی دەفەرمێت : ﴿ يُوقَدُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لا شَرْقِيَّةٍ وَلا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَار ﴾ [ النور : ٣٥ ] واتە : ﴿ يُوقَدُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ ﴾ ( ئەو چرایە ) دائەگیرسێ بە ( ڕۆنی ) درەختێکی زەیتونی بەفرو بەرەکەت ﴿ لا شَرْقِيَّةٍ وَلا غَرْبِيَّةٍ ﴾ کە نە ڕۆژهەڵاتی بێ نە ڕۆژئاوای بێ ( سێبەر نایگرێ نەکاتی هەڵهاتنی خۆرو نەکاتی ئاوابوونی ) ﴿ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ ﴾ ( ڕۆنەکەی ئەوەندە پاك بێت ) نزیکە ڕۆنەکەی داگیرسێ ﴿ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَار ﴾ با ئاگریشی بەر نەکەوێ ([٤٨٦]) .

وفي الترمذي وابن ماجة من حديث أبي هريرة _ رضي الله عنه _ ، عن النبيِّ ﷺ أنه قال : (( كُلُوا الزَّيتَ وادَّهِنُوا به ، فإنَّه من شَجَرَةٍ مُبارَكَةٍ ))([٤٨٧]) .

واتە : لە ( أبي هريرة )وە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( زەیتی زەیتون بخۆن و خۆتانی پێ چەوریکەن ، چونکە لە درەختێکی پیرۆزە )).

---

[٤٨٦] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان .

[٤٨٧] _ تقدم تخريجه .

وللبيهقي وابن ماجة أيضاً : عن ابن عمر _ رضي الله عنه _ ، قال : قال رسول الله ﷺ: (( ائْتَدِمُوا بالزَّيتِ ، وادَّهِنُوا به ، فإنه من شَجَرَةٍ مُباركةٍ ))([488]) .

واته : له ( ابن عمر )ەوە _ خوای لیٚ ڕازی بیٚت _ فەرموویەتی : پیٚغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( زەیتی زەیتون بکەن بەپیٚخۆرو ، خۆتانی پیٚ چەوەر بکەن ، چونکە لە داریٚکی پیرۆزە )) .

زەیتی زەیتون گەرمی تەڕو شیٚدارە لە یەکەمدا ، ئەو کەسانە کە گوتویانە : ووشکە بەهەڵەدا چوونە ، زەیتیش بە گویرەی زەیتونەکەیەتی ، بۆیە گوشراوی لە زەیتونی پیٚگەیوو ڕیٚکترین و چاکترینیٚتی ، بەڵام لە زرکی نەگەیوو " جۆرە ساردی و ووشکیٚتیەکی تیٚدایە ، زەیتی زەیتونی سووریش نیٚوەندی ئەو دوو زەیتەیە ، زەیتی زەیتونی ڕەشیش بەمامناوەندیٚتی گەرم دەکات و شیٚدار دەکات ، بۆ ژەهرەکان و ، ڕەوانبوونی سك و ، دەرهیٚنانی کرم بەسوودە ، زەیتونی کۆن سیفەتی گەرم کردن و شیی کردنەوەی زیاترە ، ئەوەی بەئاو لیٚی دەدەهیٚنریٚت ، گەرمی کەمترەو ، نەرم ونیانترو ناسکترەو سوودیٚکی زۆرتریش دەبەخشیٚ ، سەتاپای جۆرەکانی زەیتوون ڕووی پیست نەرم دەکەنەوەو ، پیربوون دوادەخەن .

ئاوی زەیتونی سویٚر ناهیٚلیٚت تلۆقەی پڕ ئاوی سووتانی ئاگر دروست بیٚ ، پووك بەهیٚز دەکات ، گەڵاکانی بۆ سووربوونەوەو هەڵزلەپانی پیٚست و ، ئەو برینانەی لە لاکاندا دیٚنەدەرو ، برینە پیسەکان و ، زیپکەو برینەکانی سەرپیست کە خورانیٚکی توندی لە گەڵدایە بەسوودە ، قەدەغەی ئارەقەکردن دەکات و ، سوودەکانی چەندەها ئەوەندەی ئەمانەیە کە باسمان کرد .

[488] _ إسناده صحيح : أخرجه ابن ماجة ( ٣٣١٩ ) ، وصححه الألباني في صحيح ابن ماجة ( ٢٦٨٢ ) .

زُبْدٌ ، كەرێ :   روى أبوداود في سننه ، عن ابنَي بُسْرٍ السُّلَمِيَّيْن – رضي الله عنهما – قالا: دخل علينا رسول الله ﷺ ، فقدَّمنا إليه زُبدا وتمرا ، وكان يُحبُّ الزُّبْدَ والتمر([489]).

واتە : لە هەردوو کوڕەکەی ( بُسْرٍ السُّلَمِيَّيْن )ەوە _ خوایان لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ دیدەنی کردین و ، خورماو کرێمان خستە پێش دەستی و ، حەزی بە خورماو کرێ بوو ٠

کەرێ گەرمی شێدارە ، سوودو کەڵکێکی زۆری تێدایە ، لەوانە پێگەیاندن و شیی کردنەوە ، بەسوودە بۆ ئەو ئاوسانانەی کە لە لاکانی گوێ و بوڕیەکانی مێزو ، زاردا دێنەدەر ، بەسوودە بۆ هەموو ئەو ئاوسانانەی کە لە جەستەی ژنان و منداڵاندا دێنەدەر ئەگەر بەتەنها بەکارهات ، ئەگەر لستراییەوە ، بۆ ئەو خوێنەی لە سیەکانەوە دێنەدەر بەسوودەو ، ئاوسانەکانیشی پێدەگەیەنێت ٠

نەرم ونیانکاری سروشت و دەمارو ئەو ئاوسانانەی کە بەهۆی ( المِرَّة السوداء )و بەڵغەمەوە دروست دەبن ، بۆ ئەو ووشکێتیەی تووشی جەستە دەبێ بەسوودە ، ئەگەر جێگەی دەرهاتنی ددانەکانی منداڵی پێ چەوەرکرێت ، یارمەتی گەشەی ددانەکانی و دەرهاتنیان دەدات ، بەسوودە بۆ ئەو کۆکەی بەهۆی سەرماوە تووشی مرۆڤ دەبێ ، بۆ نەخۆشی ووشك هەڵاتووی و قڵشانی پێست و هەڵوەرینی تووك بەسەریەوە بەسوودە ، بەڵام حەزو ئارەزووی خواردن کەم دەکاتەوەو ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر چەند دانایەك نێوان کەرێ و خورمای کۆکردۆتەوە " لە خواردندا " وەکو چاکردنی هەر دانەیەکیان بەویتر ٠

[489] _ صحيح : أخرجه أبوداود ( ٣٨٣٧ ) ، وابن ماجة ( ٣٣٣٤ ) كلاهما عن سليم بن عامر عن ابني بسر السلميين فذكراه ٠

زَبِيبٌ ، مێوژ : دوو فەرموودەی لەبارەوە هاتووە ( صحيح ) نين :

یەکەمیان : چاکترین خۆراك میوژە ، بۆنی زار خۆش دەکات و ، بەڵغەم دتوێنێتەوە ٠

دووەم : چاکترین خۆراك مێوژە چونکە نەخۆشی لادەبات و ، دەمار بەهێزو توند دەکات و ، تووڕەبوون دادەمرێکێنێتەوەو ، ڕەنگ وبۆ جوان دەکات و ، بۆنی زار خۆش دەکات ٠ ئەمەشیان ( صحيح ) نی یە ٠ پاشان ٠ چاکترین مێوژ ئەوەیە کە قەبارەی گەورە بێ و ، ناوەڕۆکی قەڵەو بێ ، توێکلی تەنك بێ و ، ناوکی دەرهێنرابێ و ، تۆوەکەی بچوك بێ ، تەنی مێوژ گەرمی شێدارە لە یەکەمدا ، تۆوەکەی ساردی ووشکە ، ئەویش وەکو ترێ یە : شیرینی هەیەو گەرمیشی هەیە ، ترشەکەی قەبزکارو ساردە ، سپێکەشی لە هەموو جۆرەکانی تر قەبزکارترە ، ئەگەر ناوکرۆکی بخورێت ، بۆ بۆڕی سیی کان گونجاو دەبێ ، بۆ کۆکەو ، ئازاری گورچیلەو ، میزڵدان بەسوودە ، گەدە بەهێز دەکات و ، سك نەرم دەکاتەوە ٠

شیرینەکەی خۆراکێکی زیاتر دەبەخشێت بەبەراوردی ترێ ، بەڵام بەبەراوردی هەنجیری ووشك خۆراك بەخشینەکەی کەمترە ، هێزێکی پێگەیەنەری هەرسکاری قەبزکاری شی کردنەوەی مامناوەندی هەیە ، بەگشتی گەدەو جگەرو سپڵ بەهێز دەکات ، بۆ ئازارەکانی گەروو سینگ و سیی کان و گورچیلەو میزڵدان بەسوودە ، چاکترینیشیان ئەوەیە کە بەبێ تۆوەکەی بخورێت ٠

خۆراکێکی باشی چاك دەبەخشێت ، کونیلەی داخراو ( السُدد ) دروست ناکات وەکو ئەوەی کە خورما دروستی دەکات ، ئەگەر لە گەڵ تۆوەکەیدا بخورێت سوودێکی زۆرتر بە گەدەو جگەرو سپڵ دەبەخشێت ، ئەگەر ناوەڕۆکەکەی لکێنرایە نینۆکی جوڵاوەوە خێراتر هەڵیدەکەنێت ، شیرینەکەی کە ناوکی نی یە بەسوودە بۆ ئەو کەسانەی تەڕی و بەڵغەمیان هەیە ، مێوژ جگەر چاك و پیتدار دەکات و بە خاسیەت سوودی پێ دەگەیەنێت ٠

بۆ زیادکردنی توانای لەبەرکردنیش سوودی هەیە : پێشەوا ( الزهري ) فەرموویەتی : هەرکەس حەزی بەلەبەرکردنی فەرموودەیە با مێوژ بخوات · ( المنصور ) لە ( عبدالله )ی کوڕی ( عباس )ی باپیرەیەوە دەگێڕێتەوە دەگێڕێتەوە کەوا : تۆوەکەی نەخۆشیەو ، ناوەڕۆکەکەشی دەرمانە ·

زَنْجَبيلٌ ، زەنجەفیل : خوای تعالی دەفەمێت : ﴿ وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنْجَبِيلا ﴾[ الإنسان : ١٧ ] واتە : لە بەهەشتدا شەرابیان لە پەرداخێکدا پێ دەنۆشرێ کە زەنجەفیلی تێکەڵاوە([٤٩٠])

پێشەوا ( أبونُعيم ) لە کتێبی ( الطب النبوي )دا دەگێڕێتەوە کەوا ( أبوسعيد الخُدري ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پادشای ڕۆم گۆزەیەك زەنجەفیلی بەدیاری دایە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش هەر مرۆڤێك پارچەیەکی دایەو ، پارچەیەکیشی دایە من ·

زەجەفیل گەرمە لە دووەمدا ، تەڕو شێدارە لە یەکەمدا ، گەرمکارەو یارمەتی هەرسکردنی خۆراك دەدات ، بەمامناوەندی سك نەرم ونیان دەکاتەوە ، بۆ کونیلە داخراوەکانی ( السُدد ) جگەر کەبەهۆی سەرماو تەڕی وشێ وە دروست دەبێ بەسوودە ، بۆ تاریکبوونی چاو کەبەهۆی تەڕی و شێ وە دروست دەبێ بەسوودە بەهەردوو ڕێگەی خواردن و چاو ڕەشتنیشەوە ، یارەمەتی جووتبوون دەدات ، بایە چڕەکان شیی دەکاتەوە کە لە گەدەو ڕیخۆڵەدا دروست دەبێ ·

بەگشتی · چاکە بۆ جگەرو گەدەی میزاج سارد ، ئەگەر بەکێشی دوو دیرهەم لە گەڵ شەکردا تێکەڵ بەئاوی گەرم کراو ، پاشەڕۆ لینجە لیکیەکان نەرم و ئاسان دەکاتەوە ، لەو دەرمانانەدا بەشدار دەبێ کە بەشێوەی هەویر دەشێلدرێن و بۆ توانەوەو شیی کردنەوەی بەڵغەم بەکاردێت .

---

[٤٩٠] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ·

مزرەکەشی گەرم و ووشکەو ئارەزووی جووتبون دەوروژێنێت ، تۆماوی نێرینە زیاد دەکات ، گەدەو جگەر گەرم دەکات ، خواردن خۆش و بەلەزەت دەکات ، هەڵدەستێت بە ووشکردنەوەی ئەو بەڵغەمەی زاڵ دەبێ بەسەر جەستەدا ، توانای لەبەرکردن زیاد دەکات ، گونجاوە بۆ جگەرو گەدەو ، ئەو تەڕیەی بەهۆی خواردنی میوەوە تووشی دەبێ لادەبات ، بۆنی زار خۆش دەکات ، زیانی خۆراکە چرە ساردەکانی پێ دوردەخرێتەوە٠

## پیتی سین ( س ) :

سَنا ، پێشتر باسکراو ، باسی ( سَنُوت )یش کراو ، ئەوەش خرایە ڕوو کە بە حەوت شت لێك دراوەتەوە :

یەکەم : هەنگوێنە ٠

دووەم : خۆشاوی هیزەی ڕۆنە کە بە شێوەی خەتگەلێکی ڕەش بە سەر ڕۆنەکەوە دەردەکەوێت ٠

سێ یەم : تۆوێکە لە تۆوی ڕەشکە ( کمون ) دەچێت بەڵام ( کمون )یش نی یە ٠

چوارەم : ( الكمون الكرمانی ) یە ٠

پێنجەم : ڕازیانەیە ٠

شەشەم : شویتە ٠

حەوتەم : خورمایە ٠

هەشتەم : ئەو هەنگوێنەیە کە لە نێو هیزەی ڕۆندایە ٠

سَفَرْجَلٌ ، بەهێ : روى ابن ماجة في سننه : من حديث إِسْمَعِيلُ بْنُ مُحَمَّدٍ الطَّلْحِيُّ ، عن نُقَيْبُ بْنُ حَاجِبٍ ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ الزُّبَيْرِيِّ ، عَنْ طَلْحَةَ بن عُبيدالله _ رضي

الله عنه _ قَالَ : دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَبِيَدِهِ سَفَرْجَلَةٌ ، فَقَالَ : (( دُونَكَهَا يَا طَلْحَةُ ، فَإِنَّهَا تُجِمُّ الْفُؤَادَ ))([491]).

واته : له ( طَلْحَةَ )ى كوڕى (عُبيدالله )ەوه _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : چوومە خزمەتى پێغەمبەرى خوا ﷺ بەهىٚ يەكى بەدەستەوە بوو ، ئەوەبوو فەرمووى : (( ئەى ( طلحة ) بيبە ، چونكە دڵ دەحەوێنێتەوەو چاكى و چالاكى تەواو دەكات )) .

هەروەها پيشەوا ( ابن ماجة ) لە ڕێگەيەكى ديكەشەوە دەيگێڕێتەوە ، فەرموويەتى : چوومە خزمەتى پێغەمبەرى خوا ﷺ كە لە نێوان چەند هاوەڵانێكيدا دانيشتبوو ، بەهىٚ يەكى بەدەستەوە بوو ئەم ديو ئەو ديوى پێدەكرد ، كە دانيشتم ، دەستى بۆ بڵاوكردمەوەو فەرمووى : (( ئەى ( أبا ذَرًّا ) بيبە چونكە دڵ بەهێز دەكات و ، نەفس شادومان دەكات و ، خەم و خەفتى سينگ لادەبات )) .

سەبارەت بە بەهىٚ چەند فەرموودەيەكى تريش ( رواية )ت كراوە ، ئەمە چاكترينيانەو ، ( صحيح )يش نين .

بەهىٚ ساردى ووشكە ، لەم بارەشەوە بە گۆڕينى تامى دەگۆڕێت ، هەمووشى ساردى قەبزكارە ، بۆ گەدە چاكە ، شيرينەكەى ساردى و ووشكێتى كەمترە ، مەيلى لاى مامناوەندێتى دەكات ، ترشەكەى قەبزكردن و ووشكێتى و ساردىی زۆرە ، هەمووشى تينويەتى دەشكێنێت و ڕەشانەوە قەدەغە دەكات ، ميز هێنەرە ، خوو نەرم دەكاتەوە ، بۆ برينى ڕيخۆڵەو ، خوێن دەردان و ، كولێرا بەسوودە ، بۆ دڵ تێكەڵ هاتن بەسوودە ، ئەگەر

[491] _ ضعيف الإسناد : أخرجه ابن ماجة ( ٣٣٦٩ ) بإسناده عن عبدالملك الزُّبيري عن طلحة فذكره .

پاش خۆراك بەكارهێنرا قەدەغەی بەرزبوونەوەی هەڵمەكان دەكات ، سوتێنراوی لق و پۆپ و گەڵا شۆراوەكەی وەكو ( التوتياء )ە([492]) لە كاركردنیدا ٠

خۆراكێكی كەم بەجەستە دەبەخشێت و قەبز دەكات ، پاشان خوو نەرم ونیان دەكاتەوە ، لیژبوونەوەی نیشتووەكان خێراتر دەكات ، زۆر خواردنی بۆ دەمار زیانبەخشە ، ( القولنج ) دروست دەكات ، ( المِرّةَ الصفراء )ی دروستبووی نێو گەدە دادەمركێنێتەوە ٠

ئەگەر برژێنرا زبری و ڕەقێتی كەم دەبێتەوەو ، سووكیش دەبێ ، ئەگەر ناوەڕاستی هەڵكۆڵرێت و ، تۆوەكانی دەرهێنرێت و ، هەنگوێنی تێ بكرێت و ، بە هەویر سواخ بدرێت و ، بخرێتە نێو خوڵەمێشی گەرمەوە ، سوودێكی زۆر دەبەخشێت ٠

چاكترینیشی ئەوەیە كە بە برژاوی یاخود بە كوڵێندراوی بەهەنگوێنەوە بخورێت ، تۆوەكەی بۆ زبری و وشكی گەرو ، بۆڕیەكانی سیی ، زۆرێك لە نەخۆشیەكان بەسوودە ٠

ڕۆنەكەشی قەدغەی ئارەقەكردن دەكات ، گەدە بەهێز دەكات ، مرەباشی گەدەو جگەر بەهێز دەكات ، دڵ بەهێز دەكات ، شادومانیش بەنەفس دەبەخشێت ٠

فەرمایشتی : ( تُجِمُّ الفؤادَ ) واتە : دەیحەوێنێتەوە ٠ هەروەها گووتراوە : دەیكاتەوەو فراوانی دەكات ، ڕستە عەرەبیەكەش لە ( جمام الماء )ەوە هاتووە ، واتە : فراوانبوونی ئاو و زۆربوونی ٠ ووشەی ( الطّخاء ) بۆ دڵ وەكو هەورە بەسەر ئاسمانەوە ٠ ( أبوعُبید ) دەڵێت :

---

[492] ــ التوتياء : بەردێكە دەهاڕدرێ و دەكرێ بەكل و چاوی پێ دەڕێژرێت ، جۆرەكانی سەوزو زەردو سپین ، لە كەنارەكانی هەندەوە دەهێنرێت ٠ چاكترین جۆری سپیە سووكەكەیەتی پاشان زەردەكەو پاشانیش فستقیە تەنكەكەی ، بەردێكی ساردی ووشكەو قەدغەی گوزەركردنی پاشەڕۆكان دەكات بۆ ڕەگەكانی چاوو چینەكانی ، بۆ تەڕی و شێ بەسوودە ، فرمێسك ووشك دەكاتەوە ، بۆگەنی جەستە لادەبات ، بڕوانە : قاموسی رستە ، مەلا محمودی كەڵاڵەیی و ، هەروەها بڕوانە : خريدة العجائب و فريدة الغرائب ، ابن الوردي ، ص ٧٩ ، وەرگێڕ ٠

ووشەی ( الطَّخاء ) واتە : قورسی و داپۆشین ، لە زمانی عەرەبیدا دەگوترێت : ( ما في السماء طخاءٌ ) ، واتە : هەورو تاریکی بە ئاسمانەوە نی یە ·

سوَاكٌ : في الصحيحين عنه ﷺ (( لولا أن أَشُقَّ على أُمَّتي لأمَرْتُهُمْ بالسِّواكِ عند كلِّ صلاةٍ ))([493])·

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( ئەگەر ئومەتەکەمم تووشی ناڕەحەتی نەکردایە فەرمانم پێدەدان لە کاتی هەموو نوێژێکدا سیواک بکەن )) ·

وفيهما : أنه ﷺ كان إذا قامَ من الليل يَشُوصُ فَاهُ بالسِواكِ([494])·

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکات هەستایە بۆ شەونوێژ ددانی بەسیواک پاك دەکردەوە·

وفي صحيح البخاري تعليقاً عنه ﷺ: (( السِّواكُ مَطْهَرَةٌ لَلْفَمِ ، مَرْضَاةٌ للرَّبِّ ))([495])·

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( سیواك هۆکاری پاکردنەوەیە بۆ زارو ، مایەی ڕەزابوونی پەروەردگاریشە )) ·

وفي صحيح مسلم : أنه ﷺ كان إذا دَخَلَ بيته ، بدأ بِالسِّواكِ([496])·

واتە : هەرکات پێغەمبەری خوا ﷺ بچوایەتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی ، بەسیواک دەستی پێدکرد·

لەبارەی سیواك کردنەوە فەرمووده زۆرە ، وصَحَّ عنه من حديث أنه استاك عند موته بسواك عبدالرحمن بن أبي بكر ، وصَحَّ عنه قال : (( أكثرتُ عَلَيْكُم في السوَاكِ ))([497]) ·

---

[493] _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ٢ / ٣١٢ ) ، ومسلم ( ٢٥٢ ) ·

[494] _ صحيح : أخرجه البخاري ( ١ / ٧٠ ) ، ( ٢ / ٥ ، ٦٤ ) ، ومسلم ( ١ / ١٥٢ ) كلاهما عن أبي وائل عن حذيفة فذكره ·

[495] _صحيح : أخرجه البخاري ( ٤ / ١٣٧ ) ·

[496] _ صحيح : أخرجه مسلم ( ٢٥٣ ) ·

واته : به ( صحيح )ى ( ريوايه )ت كراوه كەوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەمەرگیدا بە سیواكەكەی ( عبدالرحمن )ی كوڕی ( أبي بكر ) سیواكی كردوە ، هەروەها بە ( صحیح )ی هاتووە كەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( زیدەڕۆیم كرد لە داواكردنی بەكارهێنانی سیواك لێتان و هاندانی بەكارهێنانی )) ٠

چاكترین ئەو درختانەی سیواكی لێ وەرگیراوە درەختی ( الآراك )و بەو هاوشێوانەیە ، پێویستە لەهیچ درەختێكی دیكە وەرنەگیرێت ، چونكە لەوانەیە ژەهری بێت ، پێویستە بەمامناوەندی بەكاربهێنرێت ، چونكە ئەگەر زێدەڕۆی لە بەكارهێنانیدا بكرێت ، لەوانەیە جوانی و ڕێك و پێكی و ساف و لوسی ددان لابەرێت و ، ئامادەی بكات بۆ قبولبوونی هەڵمە بەدەرهاتوەكان لە گەدەوە ، هەروەها ئامادەی دەكات بۆ قبولبونی پیسی ، بەڵام هەركات بەمامناوەندو ڕێك و پێكی بەكارهات ، ددانەكان پاك دەكاتەوە ، ستونەكەی بەهێز دەكات ، زمان دەكاتەوە ، كلۆربوون قەدەغەدەكات ، بۆنی زار خۆش دەكات ، مێشك پاك و ساف دەكات ، خۆراك بەلەزەت دەكات ٠

چاكترین سیواكیش ئەوەیە كە تەڕكرابێ بە ئاوی گوڵ ( ماء الورد ) ، لە هەمووشی بەسوودتر بنەڕەتەكانی گوێزە ( أصول الجوز ) ٠ دانەری ( التيسير ) دەڵێت : وایان ڕاگەیاندووە كە ئەگەر مرۆڤ هەموو پێنجەم ڕۆژێك سیواكی پێ بكات ، سەر پاك دەكاتەوە ، هەستەكان ساف دەكاتەوە ، بیروهۆش تیژ دەكات ٠

سیواك چەندین سوودی تێدایە : بۆنی زار خۆش دەكات ، پووك بەهێز دەكات ، بەڵغەم ناهێڵێت ، چاو ڕوون دەكاتەوە ، كلۆربوون ناهێڵێت ، گەدە تەندروست دەكات ، دەنگ ساف دەكات ، یارمەتی هەرس كردنی خۆراك دەدەات ، ڕێڕەوەكانی قسەكردن ئاسان دەكات ،

---

[497] ـ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ١٤٣ ، ٢٤٩ ) ، والدارمي ( ٦٨٧ ) ، ( ٦٨٨ ) ، والبخاري ( ٢ / ٥ ) ، والنسائي ( ١ / ١١ ) كلهم عن شعيب فذكره مرفوعاً ٠

چالاكی بەمرۆڤ دەبەخشێ بۆ خوێندن و ، زیكرو نوێژكردن ، نووستن دووردەخاتەوە ، پەروەردگار ڕازی دەكات ، پەریەكان دڵخۆش دەكات ، چاكەكانی مرۆڤ زۆر دەكات ٠

## ئەو كاتانەی بەكارهێنانی چاكە :

لە هەموو كاتێكدا بەچاك دادەنرێت ، زیاتریش جەختی لەسەر دەكرێتەوە لە كاتی نوێژو دەستنوێژو ، بەئاگاهاتنەوە لە نووستن و ، گۆڕینی بۆنی زاردا ، هەروەها بەچاك دادەنرێت بۆ ئەو كەسانەی كە ڕۆژویان شكاندوەو ئەو كەسانەش بەڕۆژوون لەبەر هەموو ئەو فەرموودانەی لەم بارەوە هاتوون و ، لەبەر پێویستێتی ڕۆژووان بە سیواك كردن ، هەروەها لەبەر ئەوەی بەهۆكارێك دادەنرێت بۆ بەدەستهێنانی ڕەزابونی خوای تعالى ، چونكە هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی ڕەزابوونی خوای تعالى لە كاتی بەڕۆژووبوندا زۆر زیاترە بەبەراوردی كاتی بەڕۆژوونەبوون ، هەروەها هۆكارێكە بۆ پاكردنەوەی زارو ، خۆپاكردنەوەش بۆ ڕۆژووان لە چاكترین كردەوەكانێتی ٠

وفي السنن : عن عامر بن ربيعة _ رضي الله عنه _ ، قال : رأيتُ رسولَ الله ﷺ ما لا أُحْصي يَستاكُ ، وهو صائمٌ([498]).

واتە : لە ( عبدالله )ی كوڕی ( عامر )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوام بینی ﷺ ئەندازەیەكی زۆر كە توانای ژماردنیم نی یە سیواكی دەكردو ، بەڕۆژووش بوو ))٠

[498] _ ضعيف : أخرجه الحميدي ( ١٤١ ) ، وأحمد ( ٣ / ٤٤٥ ، ٤٤٦ ) ، وعبد بن حميد ( ٣١٨ ) ، وأبوداود ( ٢٣٦٤ ) ، والترمذي ( ٧٢٥ ) ، وابن خزيمة ( ٢٠٠٧ ) كلهم من طريق عاصم بن عبيدالله عن عبدالله بن عامر عن أبيه فذكره ٠

پێشەوا ( البخاري ) فەرموویەتی : ( ابن عمر ) فەرموویەتی : سەرەتاو کۆتایی ڕۆژ سیواکی دەکرد ٠

خەڵکی کۆڕان لەسەر ئەوەی ڕۆژووان دەتوانێت ئاو لە دەمی وەردا وەکو ( واجب ) و ( أستحباب )یش ، کەچی ئاو لە دەم وەردان بەجێ و تەواوترو کاریگەرترە بەبەراوردی سیواك کردن ، خوای تعالاش هیچ مەبەستێکی نی یە کە بەندە لێی نزیك بێتەوە بە بۆنی ناخۆش ، هەروەها لە ڕەگەزی ئەو کردەوانەش نییە کە دانراوە بۆ ئەوەی پەرستنی خوای پێ بکرێت ، کە باسی بۆنی ناخۆشی نێو دەمی ڕۆژووان دەکات و دەڵێت لە ڕۆژی قیامەتدا بەلای پەروەردگارەوە خۆشە ، لە ڕاستیدا تەنها بۆ هاندانی بەندەکانی خوایە بۆ ڕۆژووگرتن نەك بۆ هێڵانەوەی بۆنی ناخۆش ، بەڵکو ڕۆژووان پێویستیەکی زیاتری بەسیواکردن هەیە بەبەراوردی ئەو کەسەی بەڕۆژوو نابێت ٠

هەروەها ڕازی بوونی پەروەردگار زۆر گەورەترە لە بەلاوە خۆشبوونیی بۆنی ناخۆشی دەمی ڕۆژووان ٠

هەروەها خۆشەویستی خوای تعالی بۆ سیواك زۆر گەورەترە لە خۆشەویستیەکەی بۆ مانەوەی بۆنی ناخۆشی دەمی ڕۆژووان ٠

لە ڕاستیدا سیواك کردن کاتێ کە بۆنی ناخۆشی ناو دەمی ڕۆژووان لادەبات ، قەدەغەی ئەوە ناکات کە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو بۆنە ناخۆشە بە لای خوای تعالاوە خۆش بێت ، کە بۆنی ناخۆشی دەمی ڕۆژووان لە بۆنی میسك خۆشترە ، لە ڕاستیدا بۆ ئەوەیە کە نیشانەیەکی تەواو بێت بۆ بەڕۆژووبونی مرۆڤ ، با بەسیواکیش لاییات ، وەکو ئەو بریندارەی کە لە ڕۆژی قیامەتدا دێت و ، ڕەنگی خوێنەکەی ڕەنگی خوێنەو ، بۆنەکەی بۆنی میسکە ، کەچی فەرمانی پێدراوە لە دونیادا خوێنەکە لابەرێت ٠

هەروەها بۆنی ناخۆشی دەمی ڕۆژووان بە سیواك كردن لاناچێت ، چونكە هۆكارەكەی ماوە ، كە بریتیە لە خاڵی بوونی گەدە لە خۆراك ، بەڵكو لەڕاستیدا تەنها شوێنەوارەكەی لادەچێت ، كە پەیوەستە بە ددان و پۆكەوە ٠

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی ڕێی پێدراوەو ، ئەوەش كە نەویستراوەو ڕێی پێنەدراوە لە كاتی بەڕۆژوونەبوندا فێری ئومەتەكەی كردووە ، بەڵام سیواك كردنی نەخستۆتە ڕیزی ئەو كارانەی كە نەویستراوەو ڕێی پێ نەدراوە لە كاتی بەڕۆژووبوندا ، كە چاكیش دەیزانی خەڵكی ئەنجامی دەدەن ، بەڕاستی هانیشی داون بۆ سیواك كردن بە تەواوترین و بەجێترین و كاریگەرترین ووشەكانی گشتێتی و گرتنەوەو داپۆشین ، دەشیان بینی چەندەها جار سیواكی دەكردو بەڕۆژووش بوو كە لە ژماردن نەدەهات و ، دەشیزانی پەیڕەوی دەكەن ، كەچی تەنها ڕۆژێكیش پێی نەفەرموون : دوای لاربونەوەی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان سیواك مەكەن و ، خۆشمان باش دەزانین دواخستنی ڕوونكردنەوەی هەر مەسەلەیەك لە كاتی پێویستی خۆیدا قەدەغەكراوە ٠ والله أعلم ٠

سَمْنٌ ٠ ڕۆن : روى محمد بن جرير الطبري بإسناده ، من حديث صُهيب يرفعُه : (( عليكم بألبان البقرِ ، فإنها شفاءٌ ، وسَمْنُها دَواءٌ ، ولُحومُها داء ))([499]) ٠ رواه عن أحمد ابن الحسن الترمذي ، حدَّثنا محمد ابن موسى النسائي ، حدَّثنا دَفَّاع بن دَغْفَلٍ السَّدوسي ، عن عبدالحميد بن صَيفي بن صُهيب ، عن أبيه ، عن جده ، ولا يثبت ما في هذا الإسناد ٠

واته : ( محمد )ی كوڕی ( جرير الطبري ) دەگێڕێتەوە كەوا ( صُهيب ) لە فەرموودەیەكدا كە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ( رفع ) دەكات ، فەرموویەتی : (( بەرهەمی سپیایی مانگا بەكار بێنن ، چونكە شیفایەو ، ڕۆنەكەشی دەرمانەو ، گۆشتەكەشی نەخۆشیە )) ٠ بەڵام ئەوەی لەم ( الإسناد )ەدایە جێگیر نەبووە٠

---

[499] ـ إسناده صحيح : أخرجه الحاكم ( ٤ / ٤٠٤ ) ، وصححه الألباني في صحيح الجامع ( ٤٠٥٩ ) ٠

ڕۆن گەرمی تەڕو شێداره له یەكەمدا ، پاك دەكاتەوه به كەمی ، نەرم ونیانەو ئاوسانه بەدەرهاتووەكانی جەستە ناسكەكان دەنیشێنێتەوه ، له كەرێ بەهێزتره بۆ پێگەیاندن و نەرمكردنەوه ، ( جالینوس ) باس دەكات كەوا چارەسەری ئەو ئاوسانانەی پێكردووه كه له گوێ و ، سەرەوەی لوتدا بەدردێن ، ئەگەر جێگەی ددانەكانی پێ چەوەر بكرێت ، زوو گەشەدەكەن و بەدەردێن ، ئەگەر تێكەڵ بەهەنگوێن و بادەمی تاڵ ( اللوز المر ) بكرێت ، سینگ و سی یەكان و ، كیمۆسە چڕه لینجەكان پاك دەكاتەوه ، بەڵام زیانبەخشه بۆ گەده ، بەتایبەت ئەگەر میزاجی ئەو كەسە بەڵغەمی بێت ·

بەڵام ڕۆنی مانگاو بزن ، ئەگەر له گەڵ هەنگوێندا خورایەوه بەسوود دەبێ بۆ ژەهری كوشندەو ، گەزتنی مارو دوپشك ، له كتێبەكەی ( ابن السُّني )دا هاتووه : له ( علي ) كوڕی ( أبي طالب )ەوه _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : خەڵكی هیچ شتێكی له ڕۆن چاكتریان بۆ خۆ چارەسەركردن بەكارنەهێناوه ·

سَمَكٌ ، ماسی : روى الإمام أحمد بن حنبل ، وابن ماجة في سننه : من حديث عبدالله بن عمر ، عن النبيِّ ﷺ أنه قال : أُحِلَّتْ لنا مَيْتَتانِ ودَمَانِ : السَّمَكُ والجَرَادُ ، والكَبِدُ والطِّحَالُ(٥٠٠).

واته : له ( عبدالله )ی كوڕی ( عمر )ەوه _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( دوو مردوو وه دوو خوێنداریشمان بۆ حەڵاڵ كراوه : ماسی و كوله ، جگەرو سپڵ )) ·

جۆرەكانی ماسی زۆرن ، چاكترینیان ئەوەیه كه تامی بەلەزەته ، بۆنی خۆشه ، كێشی مامناوەنده ، توێكڵی تەنكه ، گۆشتەكەی ڕەق نەبێ و ووشكیش نەبێ ، له ئاوێكی شیریندا بێ و بەسەر چەو زیخدا ڕێ بكات ، ڕووەك بخوات نەك پیسی ، چاكترین

---

٥٠٠ _ إسناده صحيح : أخرجه أحمد ( ٥٧٢٣ ) ، وابن ماجة ( ٣٢١٨ ) ، وصححه الألباني في الصحيحة ( ١١١٨ )

شوێنەکانیشی ئەوەیە لە ڕووبارێکدا بێ ئاوەکەی چاك بێ و ، پەنا بەرێتە بەر جیگە تاوێریەکان و ، پاشان لمیەکان و ، ئەو ئاوە شیرینە ڕێکردوانەی کە پیسی تێدا نەبێ ، قوڕو لیتەیی نەبێ ، وە ئەو ئاوەش کە شڵژاوەو زۆر شەپۆلاویە ، دانەپۆشراو و کراوەیە بۆ هەتاو بایەکان ماسیەکەی چاکترە ٠

ماسی دەریایی نیعمەتێکی گەورەیە ، ستایشکراوە ، پاراو نەرم و شلەکەی ساردی تەڕو شێدارە ، درەنگ هەرسە ، بەڵغەمێکی زۆر دروست دەکات ، بەدەر لە دەریایی و ( إلا البحريَ ) بەو هاوشێوانە ، کە خەڵتەیەکی ستایشکراو دروست دەکات ، جەستە چاك و پیتدار دەکات ، تۆماوی نیرینە زۆر دەکات ، خاوەن میزاجە گەرمەکان چاك دەکاتەوە ٠

بەڵام ماسی سویراو ، چاکترینیان ئەوەیە کە بەم نزیکانە خەریکە سوێر دەبێ ، کە گەرم و ووشکە ، بە کۆن بوون و کات تێپەڕبوون گەرمی و ووشکیەکەی زیاتر دەبێ ، ماسیە دریایەکەشی ( السِّلور )([501]) لینجاوێکی زۆری پێوەیەو ، بە ( الجِرِّيَّ ) ناو دەبرێت و ، جولەکەکان نایخۆن ٠ ئەگەر بەپاراوی بخورێت ، سك نەرم دەکاتەوە ، ئەگەر سوێر کراو ماوەیەك دانراو خورا ، بۆری سیی کان پاك دەکاتەوە ، دەنگ چاك دەکات ، ئەگەر گوتراو لە دەرەوە دانرا ، وێڵاش و پاشەڕۆ لە قوڵایی جەستەوە دەهێنێتەدەر چونکە هێزی ڕاکێشانی هەیە ٠

بۆ ئەو کەسانەی برینی ڕێخۆڵەیان هەیە ئەگەر لە سەرەتای نەخۆشیەکەدا لە ئاوی سوێری ( الجِرِّيَّ )دا دانیشن ، گونجاوی دەبێ چونکە ماددەکان بۆ ڕووی دەرەوەی جەستە ڕادەکێشێت ، ئەگەر وەکو حوقنە بەکاری بێنێت ، نەخۆشی دەردەلاقە ( عرق النسا ) چاك دەکاتەوە ٠

---

٥٠١ ــ السِّلور : ڕەگەزێکە لە ماسی دەریای نزیکەی سێ متر درێژ دەبێ ، بڕوانە : المعجم الوسيط ، ص ٩٢٦ ، وەرگێڕ ٠

چاكترين شـوێنى ماسـى ئەوەيـە كـە نزيكـى كۆتايەكـەى دەبێتـەوە ، پـاراو نـەرم و قەڵەوەكەشى بە گۆشت و چەوريەوە جەستە چاك و پيتدار دەكات ٠

وفي الصحيحين من حديث جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ _ رضي الله عنه _ قالَ : بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ في ثَلَاثَمِائَةِ رَاكِبٍ ، وأَمِيرُنَا أَبُو عُبَيْدَةَ بن الجرَّاح ، فَأَتَيْنَا السَّاحِلَ ، فَأَصَابَنَا جُوعٌ شَدِيدٌ ، حتَّى أَكَلْنَا الْخَبَطَ ، فَأَلْقَى لَنَا الْبَحْرُ حوتاً يُقَالُ لَهَا : الْعَنْبَرُ ، فَأَكَلْنَا مِنْهُ نِصْفَ شَهْرٍ ، وَائتدمنا بودَكه حَتَّى ثَابَتْ أَجْسَامُنَا ، فَأَخَذَ أَبُو عُبَيْدَةَ ضِلَعًا مِنَ أَضْلَاعِهِ ، وحمل رَجُلاً على بَعِيره ، ونصبهُ ، فَمَرَّ مِنْ تَحْتِهِ.

واته : له ( جابر )ى كوڕى ( عبدالله )ەوە _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : پێغەمبەرى خوا ﷺ ناردينى لە گەڵ سێ سەد سواردا و ، ئەميرەكەشمان ( أَبُو عُبَيْدَةَ )ى كوڕى ( الجرَّاح ) بوو ، ئەوەبوو گەشتينە كەنارى دەرياكە ، تووشى برسێتيەكى زۆر بووين ، تا ئەو ئاستەى گەڵاى درەختەكانمان دەخوارد ، پاشان دەريا نەهەنگێكى بۆ فڕێداين پىٚ دەگوترا : عەنبەر ، نيو مانگ لێمان خوارد ، ڕۆنەكەشمان كردە پێخۆر تا قەڵەو بوين ، ( أَبُو عُبَيْدَةَ ) پەراسويەك لە پەراسوەكانى بردو ، پياوێكى سوارى ووشترەكەى كردو ، دايچەقاندو ، بەژێريدا تێپەڕ بوو ٠

سلْقٌ ٠ سلق : روى الترمذي وأبوداود ، عَنْ أُمِّ الْمُنْذِرِ بِنْتِ قَيْسٍ ، قَالَتْ : دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَمَعَهُ عَلِيٌّ _ رضي الله عنه _ ، وَلَنَا دَوَالٍ مُعَلَّقَةٌ ، قالت : فَجعلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْكُلُ وعَلِيٌّ معهُ يَأْكُلُ ، فقالَ رسولُ الله ﷺ: مَهْ يا عليُّ فإِنَّكَ نَاقِهٌ ، قَالَتْ : فجعلتُ لهم سِلْقًا وشعيراً ، فقَالَ النَّبِيُّ ﷺ يا عَلِيّ فأَصِبْ من هذا ، فإنه أوفقُ لَكَ([502])٠قال الترمذي : حديث حسن غريب ٠

---

[502] _ سبق تخريجه ٠

واته : له ( أُمِّ الْمُنْذِرِ )ی کچی ( قَيْسٍ )ەوه _ خوای لیّ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ به هاوڕێیەتی ( علي ) _ خوای لیّ ڕازی بێت _ دیدەنیان کردم و ، ئێمەش هێشووکەلێکی خورمای هەڵواسراومان هەبوو ، ( أُمِّ الْمُنْذِرِ )فەرمووی : پێغەمبەری خوا ﷺدەستیکرد به خواردنی و (علی )یش له گەڵیدا دەیخوارد ، پێغەمبەری خوا ﷺفەرمووی : (( ئەی ( علي ) وازبێنه ، تۆ بەم نزیکانه چاك بویتەتەوه له نەخۆشی )) ٠ ( أُمِّ الْمُنْذِرِ ) فەرمووی : پاشان سلّق و جۆم بۆ لێنان ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( ئەی ( علي ) لەمەبخۆ ، ئەمه بۆ تۆ گونجاوتره )) ٠

سلّق گەرمی ووشکه له یەکەمدا ، گوتراوه : تەڕو شێداره تیایدا ، هەروەها گوتراوه : لەو دووانه پێکهاتووه ، ساردیەکی هێمنکەرەوەی تێدایه ، هەروەها شیی دەکاتەوه ، جۆره هێزێکی کردنەوەشی تێدایه ، ڕەشەکەشی قەبزدەکات و بۆ ( داء الثعلب )و ، ئەو پەلانەی له ڕوودا دەردەکەون و ، کرێشی سەرو ، بالووکه ئەگەر به ئاوەکەی چەور بکرێت بەسووده ، ئەسپیّ دەکوژێ ، بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی ووشك هەڵاتووی و قلّیشانی پێست و هەڵوەرینی مۆکەی لە گەڵ هەنگوێندا تێکەڵ دەکرێت و پێی چەور دەکرێت ، کونیله داخراوەکانی ( السُدد ) جگەرو سپڵ دەکاتەوه ٠

ڕەشەکەی سك قەبز دەکات ، بەتایبەت لە گەڵ نیسکدا ، هەردوکیان خراپن ، بەڵام سپێکەی له گەڵ نیسکدا ڕەوان دەکاتەوه ، ئاوەکەشی وەکو حوقنه بەکار دێت بۆ ڕەوانبوون ، له گەڵ ( المري )و بهاراتدا بۆ ( القولنج ) بەسووده ٠

خۆراکیکی کەم بەجەسته دەبەخشێ ، کیمۆسی خراپه ، خوێن دەسوتێنێ ، بەکارهاتنی له گەڵ سرکەو خەرتەلەدا ( الخل و الخردل ) چاکی دەکاتەوه ، زۆرخواردنی قەبزی دروست دەکات ٠

## پيتى شين ( ش ) :

شونيز : رەشكەيەو ، پێشتر باسمان كردووە ٠

الشُبْرُمّ : روى الترمذي وابن ماجة في سننهما : من حديث أسماء بنت عُمَيسْ ، قالت : قال رسول الله ﷺ: بماذا كُنتِ تَسْتَمشينَ ؟ قالت : بالشُبْرُمِ ٠ قال : حارٌ جار[٥٠٣].

واته : ( أسماء )ى كچى ( عُمَيْس ) _ ڕەزاى خواى لێبێت _ فەرموويەتى : پێغەمبەرى خوا ﷺ پێى فەرمووم : بە چ شتێك خووى خۆت نەرم ونيان دەكەيتەوە ؟ ( أسماء ) فەرمووى : بە ( الشّبْرُم ) ، ئەويش فەرمووى : گەم و توونە ٠

( الشُبْرُمّ ) درەختێكە بچوك و گەورەشى هەيە ، بەرزى بە ئەندازەى بالآى پياوێك و زياترە ، لقەكانى سوورن و بەرەو سپى دەدرەوشێنەوە ، كۆمەڵێك گەڵا بەسەر لقەكانەوەيەو ، گولگەلێكى زەردى بەرەو سپى پێوەيە ، دەكەون و تۆوێك دەردەكات وەكو تۆوى درەختى قەزوانە ، لە قەبارەدا ، ڕەنگى سوورە ، ڕەگەكانى بەتوێكلێكى سوور داپۆشراوە ، ئەوەشى بەكاردێت ڕەگەكان و توێكڵەكەو ، شيرى لقەكانێتى ٠

گەرمى ووشكە لە پلە چواردا ، ( السوداء )و ، كيمۆسە چرەكان و ، ئاوى زەردو ، بەڵغەم ڕەوان دەكات ، ناڕەحەتكارە ، دڵى مرۆڤ تێكەڵ دەدات ، زۆر بەكارهێنانى كوشندەيە ، بۆ بەكارهێنان پێويستە شەوو ڕۆژێك لە شيردا بخوسێندرێت ، پێويستە لە ڕۆژێكدا دوو ياخود سێ جار شيرەكەى بگۆڕدرێت ، دەردەهێنرێت ، لە سێبەردا ووشك دەكرێتەوە ، گوڵ و ( الكَثيراء )ى[٥٠٤] تێكەڵ دەكرێت و ، لە گەڵ ئاوى هەنگوێن ، ياخود شەربەتى ترێدا

---

[٥٠٣] _ سبق تخريجه ٠

[٥٠٤] _ الكثيراء : دەرختێكى هەميشە سەوزەو ، نزيكەى مەترێك بەرز دەبێتەوە ، دەرختێكى دڕكاويە ، گەڵاكانى شێوەيەكى سونبوليان هەيە ، گوڵەكانى زەردێكى مەيلەو زيرينن ، دەتوانين بڵێين ڕۆژهەڵاتى ئاسيا

دەخورێتەوە ، خواردنەوەشی بە ئەندازەی دوو تاوەکو چوار( دانق )ە([505]) بەپێی هێز ، ( حُنَـيْن ) دەڵێت : بەڵام شیری ( الشُبْرُمّ ) ، هیچ خێرێکی تێدا نی یەو ، وادەبینم بەهیچ شێوەیەك نەخورێتەوە ، چونکە پزیشکە صوفیە نەفامەکان خەڵکێکی زۆریان پێ کوشتووە ٠

شَعِيرٌ ، جۆ : روى ابن ماجة : من حديث عَائِشَةَ ، قَالَتْ : كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَخَذَ أَهْلَهُ الْوَعْكُ ، أَمَرَ بِالْحَسَاءِ مِنَ الشعيرِ ، فَصُنِعَ ، ثُمَّ أَمَرَهُمْ فَحَسَوْا مِنْهُ ، ثُمَّ يَقُولُ : إِنَّهُ لَيَرْتُو فُؤَادَ الْحَزِينِ وَيَسْرُو عَنْ فُؤَادِ السَّقِيمِ كَمَا تَسْرُو إِحْدَاكُنَّ الْوَسَخَ بِالْمَاءِ عَنْ وَجْهِهَا([506]).

واتە : لە خاتوو ( عائشة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر یەکێك لە کەس وکاری لەرزوتای هەبوایە ، فەرمانی دەدا شۆربایەك لە جۆ دروست بکرێت و ، پاشان فەرمانی پێدەدان لێی هەڵقوڕێنن ، دەشیفەرموو : دڵی خەمبار توندو بەهێز دەکات و ئێش و ئازار لە سەر دڵی نەخۆش لادەبات وەکو چۆن کەسێکتان بەئاو چڵك و پیسی لەسەر دەم و چاوی لابات ٠

فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ : ( یرتوە ) واتـە : توندو بەهێزی دەکـات ٠ وە ( يَسْـرو ) واتە : لابردن و نەمان ٠

---

نیشتمانی ئەم درەختەیە بەتایبەت ناوچە شاخاویەکان ٠ ڕێگەی بەدەستهێنانی ماددەکەش بەوە دەبێ کە درزێك لە قەدی درەختەکەوە هەڵکەنرێ و بەو جۆرە شلەیەکی سپی لێوە بەدەست دێت ٠ بڕوانە : www.snble.com ٠

[505] _ دانق : جۆرە کێشێك بووە ، کە هەر یەك کێشی دانق ، بەئەندازەی هەشت دانە جۆ و دوو لە سەر پێنجی دەنکێك بووە ، بڕوانە : المصباح المنير في غريب الشرح الكبير للرافعي ، وەرگێڕ ٠

[506] _ إسناده ضعيف : أخرجه الترمذي ( ٢٠٤٠ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٤٥ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف ابن ماجة ( ٧٥٢ ) ٠

پێشتر ئاماژەی پێ درا کە ئەوە ئاوی جۆی کوڵاوە ، خۆراکێکی زیاتریش دەبەخشێ بەبەراوردی ئاردەکەی ، بۆ کۆکین و ، زبری گەروو بەسوودە ، بۆ هێمن کردنەوەی تیژی پاشەڕۆکان بەسوودە ، میزهێنەرە ، گەدە پاك دەکاتەوە لەوەی کە تیایدایە ، تینویەتی دەشکێنێت ، گەرمی دەکوژێنێتەوە ، بەو هێزەی کە تیایدایە پاك دەکاتەوەو نەرم و نیان دەکاتەوەو شیی دەکاتەوە ٠

سیفەتی لێنانیشی : ئەوەیە ئەندازەیەك لە جۆی کوتراو بەکاربهێنرێت و ، پێنج ئەوەندەی خۆی ئاوی تێبکرێت و ، بخرێتە مەنجەڵێکی پاکەوەو ، بەئاگرێکی مامناوەند بکوڵێندرێت تا دوو لەسەر پێنجی دەمێنێتەوە ، پاشان دەپاڵێورێت و ، ئینجا شیرین دەکرێ و بەئەندازەی پێویست بەکاردەهێنرێت ٠

شِوَاءٌ ، برژاو : خوای تعالی سەبارەت بەو زیافەتەی کە پێغەمبەر ( إبراهیم ) _ علیه السلام _ بۆ میوانەکانی ئەنجامیدا دەفەرمێت : ﴿ فَمَا لَبِثَ أَنْ جَاءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ ﴾[ هود : ٦٩ ] واتە : ﴿ فَمَا لَبِثَ ﴾ ئینجا ئەوەندەی نەبرد ﴿ أَنْ جَاءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ ﴾ ( ئیبراهیم ) گوێرەکەیەکی برژاوی هێنا بۆیان([٥٠٧])٠

ووشەی ( الحَنيذُ ) واتە : برژاو لە سەر بەردی زۆر گەرمکراو ٠

وفي الترمذي : عن أُمِّ سلمة _ رضي الله عنها _ : أنها قرَّبتْ إلى رسول الله ﷺ جنباً مشوياً ، فأكل منه ثم قام الى الصلاة ولم يتوضأ([٥٠٨]) قال الترمذي : حديثٌ صحيح ٠

واتە : لە ( أُمِّ سلمة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ : کە لایەکی برژاوی خستبووە پێش دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش لێ خوادوو پاشان هەستا بۆ نوێژو دەستنوێژی نەگرت ٠

---

[٥٠٧] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

[٥٠٨] _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٦ / ٣٠٧ ) ، والترمذي ( ١٨٢٩ ) كلهم من طريق عطاء بن يسار أن أم سلمة أخبرته بالحديث المذكور ٠

وفيه أيضاً : عن عبدالله بن الحارث ، قال : أكلنا مع رسول الله ﷺ شِواءً في المسجد([509]).

واته : له ( عبدالله )ى كوڕى ( الحارث )ەوە _ خواى لىٚ ڕازى بيٚت _ فەرموويەتى : له گەلٚ پيٚغەمبەرى خوادا ﷺ برژاويٚكان له مزگەوتدا خوارد ٠

وفيه أيضاً : عن المغيرَة بن شُعبة قال : ضِفتُ مع رسول الله ﷺ ذات ليلة ، فأمر بجنبٍ ، فشُوِيَ ، ثم أخذ الشِفْرَة ، فجعل يَحُزُّ لي بها منه ، قال : فجاء بلال يُؤذِّن للصلاة ، فألقى الشِّفرَة فقال : مَا لَه تَرِبَتْ يَدَاهُ([510]).

واته: له ( المغيرَة )ى كوڕى ( شُعبة )ەوە _ خواى لىٚ ڕازى بيٚت _ فەرموويەتى : شەويٚك بووم به ميوانى پيٚغەمبەرى خوا ﷺ ، فەرمانيدا لايەك ببرژيٚنن ، پاشان چەقۆ گەورەكەى هەلٚگرت و ، دەستيكرد به بڕينى گۆشتەكە بۆ من ، ( المغيرة ) فەرمووى : ئەوەبوو ( بلال ) هات و هەوالٚى هاتنى كاتى نويٚژى دايە ، بۆيە چەقۆكەى فڕى داو فەرمووى : ئەمە چيٚتى هەژار كەويٚت ٠

بەسوودترين برژاو برژاوى مەڕى يەك سالٚەيە ، پاشان گويٚرەكەى جوانى نەرم ونيانى قەلٚەوە كە ميزاجيٚكى گەرمى تەڕو شيٚدارى بەرەو ووشكيٚتى هەيە ، ( السوداء )يٚكى زۆر دروست دەكات و ، خۆراكى بەهيٚزان و كەسانى تەندروست و وەرزشكارانە ٠ گۆشتى كولٚيٚنراو بەسوودترو سوكتريشە بۆ سەر گەدە ، لەويش و له سورەوەكراويش تەڕترە ٠

---

[509] _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٤ / ١٩٠ ) ، وابن ماجة ( ٣٣١١ ) ، والترمذي في الشمائل ( ١٦٥ ) كلهم من طريق سليمان بن زياد عن عبدالله بن الحارث فذكره ٠

[510] _ إسناده صحيح : أخرجه أبوداود ( ١٨٨ ) ، وأحمد ( ٤ / ٢٥٢ ) ، وصححه الألباني في صحيح أبي داود ( ١٧٣ ) ٠

له هەمووشی خراپتر ئەوەیە لەبەر هەتاو برژێنرابێت ، برژێنراوی سەر پشکۆو سکڵ کە بە ( الحنیذ ) ناودەبرێت لە برژاوی سەر ئاگر باشترە ٠

شَحْمٌ ، بەز ، چەوری هەناوی ئاژەڵ : ثبت في المسند عن أنس أن يهودياً أضاف رسولَ الله ﷺ ، فقدَّم له خُبزَ شَعيرٍ ، وإهالَةً سَنِخَةً[٥١١].

واتە : لە ( أنس )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : جولەکەیەك زیافەتی پێغەمبەری خوای ﷺ کرد ، ئەوەبوو نانی جۆو ، بەزو پیوی تواوەی بۆن گۆڕاوی خستە پێش دەستی ٠

وثبت في الصحيح : عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ، قَالَ : دُلِّيَ جِرَابٌ مِنْ شَحْمٍ يَوْمَ خَيْبَرَ ، فَالْتَزَمْتُهُ وقُلْتُ لاَ أُعْطِي مِنْ هَذَا أَحَدًا الْيَوْمَ شَيْئًا ، فَالْتَفَتُّ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَضْحَكُ ، ولم يقل شيئاً[٥١٢].

واتە : لە ( عَبْدِ اللَّهِ )ی کوڕی ( مُغَفَّلٍ )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : لە ڕۆژی جەنگی خەیبەردا هیزەیەکی بەزو چەوری شۆڕکرایەوە ، منیش لە باوشم گرت و گووتم : سوێند بەخوا بەشی کەسی لێ نادەم ، کە ئاوڕم دایەوە ، تەماشا دەکەم پێغەمبەری خوا ﷺ پێدەکەنێ و ، هیچی نەفەرموو ٠

چاکترین بەزو پیو ئەوەیە کە لە ئاژەڵێکی تەواو و پێکهاتوو بەدەست هێنرابێت ، بەزو پیو گەرمی تەڕو شێدارە ، بەڵام تەڕی و شێیەکەی لە هی ڕۆن کەمترە ، بۆیە ئەگەر بەزو ڕۆن بتوێنرێنەوە دەبینین بەزەکە خێراتر دەیبەستێ ٠

---

٥١١ _ أخرجه أحمد ( ٣ / ٢١٠ ، ٢٣٢ ، ٢٧٠ ) بإسناده عن قتادة عن أنس فذكره ٠

٥١٢ _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٤ / ١١٦ ) ، ( ٥ / ١٧٢ ) ، ( ٧ / ١٢٠ ) ، ومسلم ( ٥ / ١٦٣ ) كلاهما من طريق حميد ابن هلال عن عبدالله بن مغفل فذكره ٠

بۆ زبری گەروو بەسوودە ، خاو دەكاتەوەو بۆگەن دەكات ، زیانی بەلیمۆی سوێركراو( الليمون المملوح ) ، زەنجەفیل لادەبرێت ، بەزو پێوی بزن قەبزترین بەزەكانە ، بەزی سابرێنیش لە هەمووی زیاتر شیی دەكاتەوەو ، بۆ برینەكانی ڕیخۆڵە بەسوودە ، لەو بوارەدا بەزی مێ بزن بەهێزترە ، بۆیە وەكو حوقنە بەكاردێت بۆ چارەسەری ڕووشانی كۆم و نەخۆشی ( الزَّحير )([٥١٣]) .

## ڤیتی صاد( ص )

صَلاةٌ ، نوێژ : خوای تعالى دەفەرمێت : ﴿ وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى الْخَاشِعِينَ ﴾[ البقرة : ٤٥ ] واته : ﴿ وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ ﴾ پەنا ببنەبەر ئارام گرتن و نوێژ ( بۆ گەیشتن بەمەبەست ) ﴿ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ ﴾ وە بێ گومان نوێژ ( ئەركێكی ) گەورەو گرانە ﴿ إِلَّا عَلَى الْخَاشِعِينَ ﴾ مەگەر لای ئەوانە نەبێ كە لە خوا ئەترسن ( خۆیان بەزل نازانن )([٥١٤]) .

هەروەها دەفەرمێت : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴾[ البقرة : ١٥٣ ] واته : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ﴾ ئەی ئەو كەسانەی كە بڕواتان هێناوە ﴿ اسْتَعِينُوا ﴾ پشت ببەستن ﴿ بِالصَّبْرِ ﴾ بەخۆڕاگرتن ﴿ وَالصَّلَاةِ ﴾ ونوێژ ( كردن ) ﴿ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴾ بەڕاستی خوا لە گەڵ خۆڕاگرانە([٥١٥]) .

هەروەها خوای تعالى دەفەرمێت : ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا لَا نَسْأَلُكَ رِزْقًا نَحْنُ نَرْزُقُكَ وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَى ﴾[ طه : ١٣٢ ] واته : ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ ﴾ ( ئەی محمد ﷺ ) فەرمان بدە

[٥١٣] ــ الزَّحير : نەخۆشیەكە مرۆڤ بە سەختی پیسایی بۆ دەكرێت و لە گەڵ پیسایەكەدا كێم و خوێن لە كۆمی دێتە دەرەوە ، بڕوانە : قاموسی ڕستە ، مەلا محمودی كوڵاڵەیی ، وەرگێڕ .

[٥١٤] ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان .

[٥١٥] ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان .

بـه ئەنـدامانی خێزانەکـەت ﴿ بِالصَّـلاةِ وَاصْـطَبِرْ عَلَيْهَـا ﴾ بەنوێـژکردن و خۆشـت خـۆڕاگرو بەردەوام بە لەسەر بەجێ هێنانی ﴿ لا نَسْأَلُكَ رِزْقًـا ﴾ ئێمـە داوای ڕۆزیـت لـێ ناکـەین ﴿ نَحْـنُ نَرْزُقُكَ ﴾ بەڵکو ئێمە ڕسق و ڕۆزی تۆ دەدەین ﴿ وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَى ﴾ وە سـەرەنجامی چاك بـۆ پارێزکاران و خواناسانە([516])٠

پێشتر ئاماژەمان پێدا کە نوێژ بەکار دەهێنرێت وەکو هۆکارێك بـۆ چارەسـەرکردنی هـەموو نەخۆشیەکان پێش ئەوەی نەخۆشیەکان جێگیربن و قایم بن ٠

نوێژ ڕۆزی دەهێنێـت ، تەندروسـتی دەپارێزێـت ، زیـان دوردەخاتـەوە ، نەخۆشـیەکان ناهێڵێت ، دڵ بەهێز دەکات ، ڕوو سپی دەکاتـەوە ، نـەفس شـادومان دەکـات ، تەمـەبڵی ناهێڵێت ، ئەندامەکانی جەستە چالاك دەکاتەوە ، یارمەتیدەری هێزەکانـە ، سنگ فـراوان دەکات ، خۆراك بەخشی ڕوحـە ، دڵ ڕوونـاك دەکاتـەوە ، نیعمـەت دەپـارێزێ ، ڕق وقـین لادەبـات ، فـرو بەرەکـەت دەهـێنێ ، لـە شـەیتان دووردەخاتـەوە ، لـە ڕەحمـان نزیکـت دەخاتەوە٠

بەگشـتی ٠ گاریگەریـەکی سەرسـوڕمێنی لـە پاراسـتنی تەندروسـتی جەسـتەو دڵ و ، هێزەکانیدا هەیە ، مادە پیسەکانی لێ دوور دەخاتەوە ، ئەگەر دوو کەس تووشـی نەخۆشـی و بەڵاو کارەساتێك هاتبن بەدڵنیایی بەشی کەسـی نوێـژکار لـەوەدا کـەم بـوەو ، دەرەنجامیشـی بێوەیتر بووە ٠

هەروەها نوێژ کاریگەریەکی سەرسوڕمێنی لە دورخستنەوەی شەڕوخراپەی دونیـادا هەیـە ، بەتایبەت ئەگەر هەقی خۆی پێدرا بەتەواوکردن و ئـەنجام دان لـە دەرەوەو ناخیشـەوە ، بۆیـە هـیچ شـتێك نـی یە بـەکارهێنرابێت بـۆ دورخسـتنەوەی شـەڕوخراپەی دونیـاو ڕۆژی دوای و ،

---

[516] ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

دەســتكەوتنى بەرژەوەنديــەكانى وەكــو نوێــژ ، چــونكە نوێــژ پەيوەنديكــە بــەخواى پەروەردگارەوە ، بەئەندازەى پەيوەندى بەندە بە پەروەردگاريـەوە دەروازەكـانى خـەيرى بۆ دەكرێتەوەو ، شەڕو خراپەو هۆكارەكانيشى لـێ دوردەخرێتـەوەو ، مادەكـانى سـەركەوتن و ، تەندروسـتى چـاك و ڕەنـگ وبـۆ ، دەسـتكەوتن و دەوڵەمەنـدى ، حەوانـەوەو نازونيعمـەت ، دڵخۆشى و شادى هەمووى ئامادە دەبن و ، بەخێرا ڕووى تێدەكەن ٠

صَبْرٌ ، ئـارامگرتن ، خـۆڕاگرتن : ئـارامگرتن نيـوەى ئيمـان و بـاوەڕە([517])، بەڕاسـتى ناوەڕۆكێكە لە ئارامگرتن و سوپاسگوزارى پێكهاتووە ، كەسانێك لە پێشين گوتويانـە : ئيمـان و بـاوەڕ دوو نيوەيـە : نيوەيـەك ئـارامگرتن و ، نيوەيـەكيش سوپاسـگوزاريە ، خـواى تعـالى دەفەرمێت : ﴿ إِنَّ فِي ذلك لآيات لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾[ إبراهيم : ٥ ] واتـە : ﴿ إِنَّ فِـى ذلـك لآيات ﴾ بەڕاستى لەو ( بيرخستنەوە )دا پەندو بەڵگەى زۆر هەيـە ﴿ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾ بۆ هەموو خۆڕاگرێكى سوپاسگوزار([518])

پەيەوندى ئارامگرتن بە ئيمان و باوەڕەوە وەكو پەيوەنـدى سـەرە بەجەسـتەوە ، ئەمـەش سێ جۆرە : ئارامگرتنێك لەسەر بەجێهێنانى فەرزەكانى خواى تعالى ، بەجۆرێك پشـت گوێيـان نەخات ، ئارامگرتنێك لەسەر حـەرامكراوەكانى خـواى تعـالى ، بـەجۆرێك نـەيانكات و توخنيـان نەكەوێت ، ئـارامگرتنێكيش لەسـەر قـەزاو قـەدەرو چارەنوسـى خـواى تعـالى ، بـەجۆرێك لێـى ناڕازى نەبێ ، بۆيە هەركەس ئەم سێ پلەى بەتەواوى بـەجێهێنا ، ئـەوا ئـارامگرتنێكى تـەواوى بەجێهێناوە ، لەزەت و نيعمـەتى دونيـاو ڕۆژى دواى دەسـتگير بـووە ، سـەركەوتن و براوەيـى دونياو ڕۆژى دوايى بەدەست هێناوە ، هيچ كەسێكيش تواناى پێگەشتنى ئەوانـەى نيـە مەگـەر بەسەر پردى ئارامگرتندا تێپەڕبێ ، وەكو چۆن هيچ كەس تواناى پێگەشتنى بەهەشتى نـى يـە

[517] ـ إسناده منكر : أخرجه أبونعيم في الحلية ( ٥ / ٣٤ ) ، وانظر الضعيفة ( ٤٤٩ ) ٠

[518] ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەى تەفسيرى قورئان ٠

مەگەر بەسەر ( الصراط )دا تێپەڕ بێ ، پێشەوا ( عمر )ی کوڕی ( خطاب ) فەرموویەتی : خێرترین و چاکترین گوزەرانمان بە ئارامگرتن دەستکەوت ٠

ئەگەر بیرێك لە پلەکانی تەواویی ( الکمال ) بەدەستهاتوو لە جیهاندا بکەیتەوە ، دەبینی هەرهەمووی وابەستەی ئارامگرتنە ، بەڵام ئەگەر بیرێك لە ناتەواوی بکەیتەوە کە زەمی خاوەنەکەی دەکرێت لەسەری ، چونکە لە ژێر تواناو دەستەڵاتی خۆیدایە ، دەبینی هەرهەمووی لە ئارامنەگرتنەوەیە ، لێرەدا ئازایەتی و داوێن پاکی و ، بەخشندەیی و خۆ ڕەنجان بۆ بەرامبەر ، هەرهەمووی بەرهەمی ئارامگرتنی ساتێکە ٠

فالصَّبرُ طِلَّسَمٌ على كَنْزِ العُلى     مَنْ حَلَّ ذا الطَّلَّسْمَ فازَ بِكَنْزِهِ

واتە :

ئارامگرتن تەلسەمێکە بەسەر گەنجی بڵندەوە     هەرکەس دەریهێنێت و بیکاتەوە گەنجەکە دەباتەوە

زۆربەی نەخۆشیەکانی جەستەو دڵ ، لە ڕاستیدا لە ئارام نەگرتنەوە دروست دەبێ ، بۆیە نەتوانراوە بەهیچ شتێکی تری هاوشێوەی ئارامگرتن تەندروستی دڵ و جەستەو ڕوحەکان بپارێزرێت ، بۆیە ئارامگرتن جیاکەرەوەی هەرە گەورەی هەق و پوچیە ، ( الترياق )ی گەورەیە ، ئەگەر هیچی تریشی تێدا نەبێ تەنها ئەوە نەبێ کە خوای تعالی لە گەڵ ئارامگرتواندایە ، چونکە بەدڵنیای خوای تعالی لە گەڵ ئارامگرتواندایەو خۆشی دەوێن ، خوای تعالی بەڕاستی ئارامگرتوانی خۆش دەوێ ، ئارامگرتوان سەردەخات ، چونکە سەرکەوتن لەگەڵ ئارامگرتندایە ، چاکترین شتیشە بۆ خاوەنەکانی ، خوای تعالی دەفەرمێت : ﴿ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ ﴾[ النحل : ١٢٦ ] واتە : ﴿ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ ﴾ وە ئەگەر ئارام بگرن ﴿ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ ﴾ ئەوە باشترە بۆ ئارامگران([519]) ٠ هەروەها ئارامگرتن هۆکاری سەرکەوتنە ، خوای تعالی دەفەرمێت : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اصْبِرُوا وَصَابِرُوا وَرَابِطُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ [ آل عمران : ٢٠٠ ] واتە : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ﴾ ئەی ئەوانەی کە

[519] ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

بڕواتان هێناوه ﴿ اصْبِروا ﴾ خۆگربن ﴿ وَصَابِرُوا ﴾ و ( لـه خـۆگری دوژمـن ) خـۆگرترین ﴿ وَرَابِطُوا ﴾ و له سه‌نگه‌ردا ئێشك بگرن ﴿ وَاتَّقُوا اللَّهَ ﴾و له‌خوا بترسن ﴿ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ بـۆ ئه‌وه‌ی ڕزگار ببن ([٥٢٠]).

صَبِرٌ: ڕووه‌كێكه : ( بـۆ تـه‌ماشـاكردنی وێنه‌كـه‌ی بگـه‌ڕێره‌وه بـۆ باسـی ( الحـرف ) روى أبوداود في كتاب المراسيل من حديث قيس بن رافع القَيْسي ، أنَّ رسولَ الله ﷺ قال : (( مـاذا في الأمَرَّين من الشفاء ؟ الصَّبرُ والثُّفّـاءُ ))([٥٢١]) واتـه : پێغه‌مبـه‌ری خـوا ﷺ فه‌رموویـه‌ی : (( لـه‌و شیفایه‌ی كه له‌دوو تاڵه‌كه‌دا هه‌یه ؟ ( الصَّبِر )و ته‌ڕه‌تیزه )) .

وفي السنن لأبي داود : من حديث أُم سلمة ، قالت : دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ تُوُفِّيَ أَبُو سَلَمَةَ ، وَقَدْ جَعَلْتُ عَلَيَّ صَبْرًا ، فَقَالَ : مَا (( ماذَا يَا أُمَّ سَلَمَةَ ؟ )) فَقُلْتُ : إِنَّمَا هُوَ صَبْرٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، لَيْسَ فِيهِ طِيبٌ ، قَالَ : (( إِنَّهُ يَشُبُّ الْوَجْهَ ، فَلَا تَجْعَلِيهِ إِلَّا بِاللَّيْلِ )) ونهى عنهُ بالنهارِ([٥٢٢]).

واته : له ( أُم سلمة )ه‌وه _ خوای لێ ڕازی بێت _ فه‌رموویه‌تی : پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ دیده‌نی كرم ، له‌و كاته‌دا كه ( أبو سلمة ) مرد ، ( صَبْرُ )م له خۆم دابوو ، ئه‌وه‌بوو فه‌رمووی : (( ئه‌مه چی یه ئه‌ی ( أُمَّ سَلَمَةَ ) ؟ )) منیش گووتم : له‌ڕاستیدا ئه‌وه ( صَبْرُ )ه ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ، بۆن خۆشی تێدا نی یه ، فه‌رمووی : (( به‌ڕاستی ڕوو چاك و جوان ده‌كاته‌وه ، به‌ڵام له شه‌ودا نه‌بێ به‌كاری مه‌هێنه ))و قه‌ده‌غه‌ی كرد به‌ڕۆژ به‌كاربهێنرێت .

---

[٥٢٠] _ مه‌لا محمد مه‌لا صالح ، پوخته‌ی ته‌فسیری قورئان .

[٥٢١] _ إسناده ضعيف : ضعفه الألباني في السلسلة الضعيفة ( ٤٤٤٢ ) .

[٥٢٢] _ ضعيف : رواه أبوداود ( ٢ / ٢٩٢ ) ، ( ٢٣٠٥ ) ، والنسائي ( ٦ / ٢٠٤ ) ( ٣٥٣٧ ) ، والبيهقي في الكبرى ( ٣ / ٣٩٦ ) ، ( ٥٧٣١ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف أبوداود ( ٥٠٢ )

( صَبْرٌ ) سوودى زۆره ، بەتايبەت هنديەكەى ، پاشەڕۆ ( الصفراوية )كـان كـه لـه مێشك و دەمارەكانى بينيندا هەن پاك دەكاتەوە ، ئەگەر لە گەڵ ڕۆنى گوڵدا ( دهـن الـورد ) ناوچـاوان ولاجانگى پىٚ چەور بكرێت ، بۆ سەرئێشه بەسووده ، بۆ برينەكانى دەم و لووت بەسوودە ، ( السوداء )و ( المالينخوليا )([٥٢٣]) ئاسان دەكاتەوە ٠

( الصَبْرُ )ى فارسى ئەقڵ زيرەك دەكاتـەوە ، كۆمـەكى و يارمـەتى دڵ دەكـات ، پاشـەڕۆ ( الصفراوية )كان و بەڵغەميـەكان لـه گـەدەدا پـاك دەكاتـەوە ئەگـەر بەئەنـدازەى دوو كەوچـكى بەئاوەوە بخورێتەوە ، شەهوەت و ئارەزووى پـوچ و خـراپ دەگەڕێنێتـەوە ، ئەگـەر لـه كـاتى سەرمادا بخورێتەوە ، ترسى ئەوەى لێدەكرێت ڕەوانى خوێن بكات ٠

صَـوْمٌ ، ڕۆژوو : ڕۆژوو قەڵغانـه بەرامبـەر بـه نەخۆشـيەكانى ڕوح و جەسـتەو دڵ ، سوودەكانى لـه ژمـاردن نايـەت ، كاريگەريـەكى سەرسوڕمێنى لـه پاراستنى تەندروستى و ، توانەوەى پاشەڕۆكان و ، ڕاگرتنى نەفس بەرامبەر بە خواردنى زيان پێگەيەنەرەكانيدا هەيـه ، بەتايبەت ئەگەر بەچاكى و ڕێك و پێكى لە چاكترين كاتە شـەرعيەكانيدا ئـەنجام دراو ، بـەپێى پێويستى جەستەش بەكارهێنرا ٠

پاشان ئەندازەيەكى تەواوى حەسانەوە بـه هێزەكـان و ئەندامـەكان دەبەخشێت " كە لـه ئەنجامدا هێزەكانى دەپارێزێت ، خاسيەتێكى تايبەتى تێدايه واپێويست دەكات كه ڕۆژووگـرتن بەردەوام بەكاربهێنرێت ، بريتيه لەوەى كه لـه كـاتى ئێسـتاو دوايشـدا دڵ شـادومان دەكـات ، ڕۆژووگـرتن بەسـوودترين شـتە بـۆ خـاوەن ميزاجـه سـاردو ، تـەڕەكان و ، لـه پاراسـتنى تەندروستياندا كاريگەريەكى گەورەى هەيه ٠

---

[٥٢٣] ـ المالينخوليا : بەڕاى پزيشكه كۆنەكان : جۆرێكه له شێتى له ئاكامى خراپى بيركردنەوەوه تووشى مرۆڤ دەبێ ، خەمبارى و ترس بەسەريدا زاڵ دەبێ و پێدەچێ باسى ئەو بيركردنەوە خراپانەش بكات و قسەكانيشى تێكەڵ و پێكەڵ بێت ، بڕوانه : فقه اللغة ، الثعالبي ٠

ڕۆژووگرتن بەشدارە لە دەرمانە ڕوحانی و سروشتیەکاندا ، وە ئەگەر کەسی ڕۆژووان تیایدا چاودێری ئەوانە بکات " کە پێویستە لە هەردوو لایەنی خوو و شەرعیشەوە چاودێری بکرێن ، ئەوا دڵ و جەستەی سوودێکی گەورەی لێ دەبینن و ، هەڵدەستێت بە بەرگیری کردن بەرامبەر بەو مادە نامۆ و خراپانەی کە لە ئامادەباشیدایە بۆی ، ماددە خراپەکانیش لادەبات " بەگوێرەی کەمالی ڕۆژووەکەو و ناتەواویەکەی ، ڕۆژووان دەپارێزێت بەرامبەر بەوانەی پێویستە ڕۆژووانی لێ بپارێزرێت ، یارمەتی دەدات بۆ هەستان بە مەبەستەکانی ڕۆژوو و نهێنی و هۆکارە نادیارەکانی ، چونکە مەبەست بەڕۆژوو شتێکی تری گەورەو بەڕێزە " کە لە پشتی وازهێنانی خواردن و خواردنەوەوەیە ، بۆیە لە نێوان هەموو کردەوەکاندا تایبەت کرا بەوەی کە بۆ خوای پەروەردگارە ٠ لەبەر ئەوەی ڕۆژوو پارێزەرو قەڵغانێکە لە نێوان بەندەو ئەو شتانەدا کە زیان بە دڵ و جەستەی دەگەیەنن " لە ئێستاو دوایدا ، بۆیە خوای تعالی دەفەرمێت : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾[ البقرة : ١٨٣ ] واتە : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ ﴾ ڕۆژووتان لەسەر نوسراوە ﴿ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ ﴾ هەروەك نووسراوە لەسەر ئەوانەی لە پێش ئێوەدا بوون ﴿ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ بۆ ئەوەی خۆتان بپارێزن ([٥٢٤])٠

یەکێك لە مەبەستەکانی ڕۆژوو قەڵغان و پاراستنە ، کە پارێزێکی زۆر بەسوودە ، مەبەستەکەی دیکەش : کۆبونەوەی دڵ و هیمەتە بۆ خوای تعالی ، کۆکردنەوەی هێزەکانی نەفسە بۆ خۆشەویستی خوای تعالی و گوێڕایەڵی ٠ پێشتریش سەبارەت بەهەندێ لە نهێنیەکانی ڕۆژوو دواین لە : بەشێك سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژووگرتندا.

٥٢٤ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

## پیتی ضاد ( ض )

ضَبٌّ ، بزن مژه : ثبت في الصحيحين من حديث ابن عباس ، أن رسول الله ﷺ سُئِل عنه لَمّا قُدِّمَ إِلَيْه ، وامتنعَ مِن أكله : أحَرَامٌ هو ؟ فقَالَ : (( لَا ، وَلَكِنْ لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِ قَوْمِي ، فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ )) ، وأُكِلَ بينَ يَديهِ وعلى مائدته وهو يَنْظُرُ([٥٢٥]).

واته له ( ابن عباس )هوه _ خوا له خۆی و بابیشی ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکرا کاتێ بزن مژەی خرایە پێش دەست و ، قایل نەبوو بیخوات : ئایا حەرامە ؟ فەرمووی : (( نەخێر ، بەڵام لە خاکی قەومەکەمدا نەبووە ، بۆیە تەماشا دەکەی دڵم بەسەری ناچێت )) ، بەڵام لە پێش دەستی و لەسەر سوفرەکەشی خوراو خۆشی تەماشای دەکرد ٠

وفي الصحيحين من حديث ابن عمر _ رضي الله عنهما _ ، عنه ﷺ قال: (( لا أُحِلُّهُ ولا أُحَرِمُه ))([٥٢٦]).

واته : له ( عبدالله )ی کوڕی ( عمر )هوه _ خوای تعالی له خۆی و بابیشی ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( نە حەڵاڵی دەکەم و نە حەرامیشی دەکەم )).

میزاجی گەرمی ووشکە ، شەهەوت و ئارەزووی جووتبوون زیاد دەکات ، ئەگەر بکوترێت و ، بخرێتە سەر نەخۆشی ( الشوكة ) ڕایدەکێشێت ٠

---

[٥٢٥] _ صحيح : تقدم تخريجه ٠

[٥٢٦] _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٧ / ١٢٥ ) ، ومسلم ( ٦ / ٦٦ ) كلاهما عن عبدالله بن دينار عن عبدالله بن عمر يرفعه ولفظه : (( لست بآكِلِهِ ولا بِمُحَرِّمه )) ٠

ضِفْدِعٌ ، بۆق : ئیمامی ( أحمد ) فەرموویەتی : بۆق حەڵاڵ نی یە بکرێت بەدەرمان ، پێغەمبەری خوا ﷺ کوشتنی بۆقی قەدەغە کردووە ، مەبەستی بەو فەرموودەیە کە لە ( مسند )ەکەیدا دەیگێڕێتەوە : عن عثمان بن عبدالرحمن _ رضي الله عنه _ أنَّ طبيباً ذكر ضِفدعاً في دواء عندَ رسول الله ﷺ فنهاه عن قتلها([٥٢٧]).

واتە : لە ( عثمان )ی کوڕی ( عبدالرحمن )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ دەیگێڕێتەوە کەوا پزیشکێك لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ باسی بۆقی کرد لە دەرمانێکدا ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکرد بۆق بکوژێت ٠

دانەری ( القانون ) دەڵێت : هەرکەس خوێنی بۆق یاخود لە لەشی بخوات ، جەستەی دەئاوسێت و ، ڕەنگی دەپەڕێت و ، تۆماو فڕێ دەدات تاوەکو دەمرێت ، بۆیە پزیشکان لە ترسی زیانەکانیدا وازیان لە بەکارهێنانی بۆق داوە ٠

بۆق دوو جۆرە : ئاوی و خاکی ، خواردنی خاکیەکەی کوشندەیە ٠

## پیتی طاء ( ط )

طيبٌ ، بۆنی خۆش : ثُبِتَ عن رَسُولُ اللّهِ ﷺ أنه قالَ : (( حُبِّبَ إِلَيَّ مِنْ الدُّنْيَا النِّسَاءُ وَالطِّيبُ ، وَجُعِلَ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلَاةِ ))([٥٢٨]).

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( لە دونیادا ژن و بۆنی خۆشم لا خۆشەویست کراوەو ، چاو ڕوونکەرو خۆشی هێنیشم خراوەتە نوێژەوە ))٠

---

[٥٢٧] _ تقدم تخريجه ٠

[٥٢٨] _ تقدم تخريجه ٠

پێغەمبەری خوا ﷺ بەزۆری بۆنی خۆشی بەکاردەهێناو ، بۆنی ناخۆشی بەلاوە قورس بوو ، دەیخستە ناڕەحەتیەوە ٠

بۆنی خۆش خۆراکی ڕوحە " کە هەموو هێزەکانی جەستەی لەسەر سوار دەکرێت ، هێزەکانی جەستە بەبۆنی خۆش دەبوژێنەوەو دوو ئەوەندەو زیاتر دەبن ، هەر وەك ئەوەی کە بە خواردن و خواردنەوە ، خۆشگوزەرانی و شادومانی ، تێکەڵاوبونی خۆشەویستان ، ڕودانی کاروبارە بەلاوە خۆشەکان ، نادیاربوونی ئەو کەسانەی کە نادیاربوونیان بەلای مرۆڤەوە خۆشە ئەو هێزانە زیاد دەبن ٠

چونکە تەماشاکردنی ئەو جۆرە کەسانە ڕوحی مرۆڤ بارقورس دەکات ، وەکو خەڵکە ڕەزا قورس و بیزارەکان ، بەڕاستی تێکەڵاوبونی ئەم جۆرە کەسانە هێزەکان لاواز دەکات و ، خەم و خەفەت دەهێنێت ، کەوابوو ڕۆڵی ئەم جۆرە کەسە ڕەزا قورسانە " بۆ ڕۆحی مرۆڤ " وەکو ڕۆڵی تاو و گەرمیەکی زۆرە بۆ جەستە ، هەروەها تێکەڵاوبونی ئەو جۆرە کەسە ڕەزاقورسانە وەکو ئەوەیە کە بۆنێکی ناخۆشت بە سەردا هاتبێ ، بۆیە خوای تعالى هاوەڵانی خۆشەویست کردبوو بەوەی کە قەدەغەی کردبوون بەبۆنی ناخۆشەوە تێکەڵی پێغەمبەری خوا بن ﷺ چونکە بیزار دەبوو ، خوای تعالى دەفەرمێت : ﴿ ولكن إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانْتَشِرُوا وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنْكُمْ وَاللَّهُ لا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ ﴾[ الأحزاب : ٥٣ ] واته : ﴿ ولكن إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا ﴾ بەڵام ئەگەر بانگ کران ( بۆ نان خواردن ) ئەوسا بڕۆنە ژورەوە ﴿ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانْتَشِرُوا ﴾ ئینجا ئەگەر خواردنەکەتان خوارد بڵاوەی لێ بکەن ﴿ وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ ﴾ وە مەمێننەوە بۆ قسەکردن ﴿ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي ﴾ چونکە بەڕاستی ئەو ( مانەوەتان ) ئازاری پێغەمبەری ﷺ

دەدات ﴿ فَيَسْتَحْيِي مِنْكُمْ ﴾ ئەویش شەرم دەكات لێتان ( كە بێ دەنگە ) ﴿ وَاللَّهُ لا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ ﴾ بەڵام خوا لە ( ووتنی ) هەق شەرم ناكات([٥٢٩]) ٠

مەبەست ئەوەیە كە بۆنی خۆش لە هەموو شتێك زیاتر بەلای پێغەمبەری خواوە ﷺ خۆشەویستر بوو ، وە كاریگەریەكی باشی لە پاراستنی تەندروستی و ، دورخستنەوەی زۆرێك لە ئازارو هۆكارەكانیدا هەیە ، بەهۆی هێزی سروشت تیایدا ٠

طِينٌ ، قوڕ : لە هەندێ فەرموودەی هەڵبەستراودا هاتووەو هیچ كامیان ( صحیح ) نین وەكو فەرموودەی : مَنْ أكل الطِّينَ ، فقد أعان على قتل نفسه واتە : هەركەس قوڕ بخوات ، یارمەتی كوشتنی نەفسی خۆی داوە ٠ ومثل حديث : (( يا حميراءُ لا تأكلي الطّينَ فإنَـهُ يعصـمُ البطنَ ويصفّرُ اللّونَ ويذهبُ بهاءَ الوجه ))([٥٣٠])

واتە هەروەها فەرموودەی : (( ئەی ژنی سورو سپی قوڕ مەخۆ چونكە سك دەگرێت و ، ڕەنگ زەرد هەڵدەگەڕێنێت و ، جوانی روو لادەبات )) ٠

هەموو فەرموودەیەك سەبارەت بە قوڕ هاتبێت ( صحیح ) نی یەو ، هیچ بنەڕەتێكی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ نی یە ، بەڵام خراپ و زیانبەخشەو ، ڕێڕەوی ڕەگەكان دەبەستێت ، میزاجی ساردی ووشكە ، بەهێز ووشك دەكاتەوە ، قەدەغەی ڕەوانبوونی سك دەكات ، دەبێ بەهۆی خوێن دەردان و دروستبوونی برینی نێو دەم ٠

طَلْحٌ ، مۆز ، خوای تعالى دەفەرمێت : ﴿ وَطَلْحٍ مَنضُودٍ ﴾[ الواقعة : ٢٩ ] سەبارەت بە ووشەی ( طَلْحٍ ) زۆریەی زانایانی تەفسیر فەرموویانە : مۆزە ، ( المَنْضودُ ) واتە : ڕیزكراو یەك لە سەر یەك ، وەكو شانە ٠ هەروەها گووتراوە ووشەی ( طَلْحٍ ) واتە : درەختی دڕكاوی ،

---

[٥٢٩] ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

[٥٣٠] ـ إسناده ضعيف : ضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٥٤٧٤ ) ٠

كه له جێگەی هەر درکێك بەرێك دەرکەوتبێت ، بۆیە بەری دارەکە یەك لەسەر یەك ڕیزدەبن ، ئەمەش دەچوێنرێت بە مۆز ، ئەم گوفتارەش راسترە ، بۆیە کە پێشین باسی مۆزیان کردووە مەبەستیان چواندن بووە نەك تایبەت کردن ٠ والله أعلم ٠

میزاجی گەرمی تەڕو شێدارە ، چاکترینی پێگەیوی شیرینە ، بۆ زبری سینگ و سیی و کۆکەو ، برینەکانی گورچیلەو میزلّدان بەسوودە ، میزهێنەرە ، تۆماوی نێرینە زۆر دەکات ، شەهەوەت و ئارەزووی جووتبوون دەجولّێنێت ، سك نەرم و شل دەکاتەوە ، پێش خۆراك دەخورێت ، بۆ گەدە زیانبەخشە ، ( الصفراء )و بەلّغەم زیاد دەکات ، بەشەکر یاخود بەهەنگوێن زیانەکانی دوردەخرێتەوە ٠

طَلْعٌ ، ڕوانگە : خوای تعالی دەفەرمێت : ﴿ وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ لَهَا طَلْعٌ نَضِيدٌ ﴾[ ق : ١٠ ] ، ( طَلْعُ النخيل ) واتە : ڕوانگەی دارەخورما : سەرەتاو یەکەم دەرکەوتنی چرۆی بەری دارەخورمایە ، ئەو توێکلّەش کە چرۆکەی تێدایە لە زمانی عەرەبیدا ( الكُفُرَّى )ی پێ دەلّێن ، ( النَضيد ) : ڕیزکراو یەك لە سەر یەك ، لە ڕاستیدا تەنها چرۆکە لە نێو بەرەگەکەیدا ( النَضيد )ی پێ دەگوترێت واتە : ڕیزکراو یەك لە سەر یەك ، بەلّام کە چرۆکان گەورەرەبوون و لە توێکلّەکە هاتنە دەرەوە چیتر ( النَضيد )ی پێ ناگوترێت ، چونکە یەك لە سەر یەك ڕیزنەکراون ٠ هەروەها خوای تعالی دەفەرمێت : ﴿ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴾[ الشعراء : ١٤٨ ] ( الهَضيم ) واتە : چرۆی بەری دارەخورماکە لە نێو بەرگەکەدا ڕێکخراوە هەندێکی لەپالّ هەندێکی تردا ، ئەمەش وەکو( النَضيد )ە کە واتای ڕیزکردن دەبەخشێت بە یەك لە دوای یەك ، لێرەدا ( الهَضيم )ی پێ دەگوترێت تاوەکو لە نێو بەرگە ( الكُفُرَّى )کەدا بێت ، بەلّام کە لەبەرگە ( الكُفُرَّى )کە هاتە دەرەوە چیتر ( الهَضيم )ی پێ ناگوترێت ٠

ڕوانگەی دارەخورماش دوو جۆرە : نێرو مێ : موتوربەکردنیش ئەویە کە ڕوانگەی نێری دارەخورماکە دەبردرێت کە وەکو ئاردی گەنمەو دەکرێتە نێو دارەخورما مێ کەوە ، کە لە

زمانی عەرەبیدا دیسان ( التأبیر )یشی پێ دەگوترێت ، ئەوەش لە جێگەی پیتکێ یە لە نێوان نێرو مێکەدا .

وقد روى مسلم في صحيحه : عن طلحة بن عُبيدالله _ رضي الله عنه _ ، قال : مررتُ مع رسول الله ﷺ في نخل ، فرأى قوماً يُلَقِّحُونَ ، فقال : (( مايصنعُ هؤلاء ؟ )) قالوا : يأخذون من الذكر فيجعلونه في الأنثى . قال : (( ما أظُنُّ ذلك يُغني شيئاً )) ، فبلغهم ، فتركوه ، فلم يَصْلُحْ ، فقال النبيُّ ﷺ: (( إنما هُوَ ظَنٌّ ، فإن كان يُغني شيئاً ، فاصنَعوه ، فإنَّما أنا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ ، وإنَّ الظَنَّ يُخطِيءُ ويُصيبُ ، ولكنَ ما قلتُ لكم عنِ الله عزَّ وجلَّ ، فلن أكذِبَ على الله ))([٥٣١]).

واتە : لە ( طلحة )ی کوڕی ( عُبيدالله )ەوە _ خوای لیّ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : بەیاروەری پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای باخێکی دارەخورمادا تێپەڕیووین ، تەماشای کرد کەسانێك موتوربە دەکەن ، فەرمووی : (( ئەمانە چ دەکەن ؟ )) گووتیان : لە ڕوانگەی نێرەکە دەبن و دەیکەنە نێو مێ کەوە ، فەرمووی : (( واگومان دەبم هیچ سوودێکی نەبێ )) ، گوفتارەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە خەڵکەکە گەشت ، بۆیە وازیان لە موتوربەکردن هێنا ، ئەوبوو دارەخورماکان بەریان نەگرت ، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لە ڕاستیدا ئەوە تەنها گومانە ، ئەگەر سوودێکی هەیە ، ئەنجامی بدەن ، چونکە منیش تەنها مرۆڤێکی وەکو ئێوەم ، گومانیش بەهەڵەدا دەچێت و دەپێکێت ، بەڵام ئەوەی پێم گووتن لە خوای تعالاوەیەو ، درۆ بە دەم خواوە ناکەم )) .

ڕوانگەی دارەخورما بەسوودە بۆ جووتبوون و ، زیادی دەکات ، ئەگەر ژنان ئاردی ڕوانگەکەی پێش جووت بوون هەڵگرن یارمەتی سك پڕبوون دەدات ئەوپەڕی یارمەتیدان ،

[٥٣١] _ صحيح : أخرجه أحمد ( ١ / ١٦٢ ، ١٦٣ ) ، وعبد بن حميد ( ١٦٢ ) ، ومسلم ( ٧ / ٩٥ ) ، وابن ماجة ( ٢٤٧٠ ) ككلهم من طريق موسى بن طلحة عن أبيه فذكره .

ميزاجى له ساردى و ووشكێتيدا له پله دوودايه ، گەده بەهێز دەكات و ووشكى دەكاتەوە ، هەڵچونى خوێن هێمن دەكاتەوە له گەڵ چڕى و دەرەنگ هەرسيدا ٠

بەدەر له كەسانى ميزاج گەرم كەسانى تر بەرگەى ناگرن ، ئەو كەسەى بەزۆرى بەكارى دەهێنێ پێويستە هەندێك له دانەوێڵە گەرمەكانى ( الجاروشات الحارة ) بەدوادا بەكار بێنێت ، خوو هێمن دەكاتەوە ، هەناو بەهێز دەكات ، ناوكرۆكى دارەخورماو ، هەروەها خورما سەوزە پێنەگەشتووەكان( البَلح )و ، ئەوەش تازە شيرينى تێكەوتووە ( البُسر ) هەمان ڕۆڵى ڕوانكەكان دەبينن ، بەڵام زۆر بەكارهێنانى زيان بە گەدەو سينگ دەگەيەنێت ، وە پێدەچێ نەخۆشى( القولنج ) دروست بكات ، دەتوانرێت بەڕۆن چاك بكرێت ياخود بەو شتانەى پێشتر باسكرا ٠

## پيتى عين ( ع )

عنَبٌ ، ترێ : في الغيلانيات([٥٣٢]) من حديث حَبيب بن يَسار ، عن ابن عباس _ رضي الله عنه قال : رأيت رسول الله ﷺ يأكل العنب خَرطاً.

واته : له ( ابن عباس )ەوە _ خوا له خۆى وبابيشى ڕازى بێت _ فەرموويەتى : بينيم پێغەمبەرى خوا ﷺ هێشوە ترێكەى دەخستە زارى و تۆوەكەى فرێدەداو دەيخوارد ٠

( أبو جعفر العقيلي ) دەڵێت : ئەم فەرموودەيە هيچ بنەڕەتێكى ڕاستى نى يە ، گوتم _ ابن القيم _ : ( داود )ى كوڕى ( عبدالجبار أبو سليم الكوفي ) له ( سَند )ەكەيدايە ، كە پێشەوا ( يحيى )ى كوڕى ( مَعين ) فەرموويەتى : درۆى دەكرد ٠

هەروەها له پێغەمبەرى خواوە ﷺ باسكراوە : كەوا حەزى بە ترێ و كاڵەك بووە ٠

---

٥٣٢ _ الغيلانيات : كۆمەڵێكى زۆرى فەرموودەيەو له يازدە بەشدا كۆكراوەتەوەو بە ( تخريج )ى پێشەوا ( الدَّارَقُطْنِيِّ )يە ، بڕوانە : تاج العروس في جواهر القاموس ، وەرگێڕ ٠

خواى تعالى له شەش شوێنى قورئانەكەيدا باسى ترێى كردوه لە كۆى ئەو نيعمەت و بەهرانەى بە بەندەكانى خۆى بەخشيوه لەم دونيايەو لە بەهەشتيشدا · ترێ چاكترين ميوەيەو لەهەمووشيان بەسوودتره ، كە بە تەڕى و ووشكى و ، سەوزى و پێگەيشتووش دەخورێت ، ميوەيەكه لە ميوەكان ، خواردنێكه لە خواردنەكان ، پێخۆرێكه لە پێخۆرەكان ، دەرمانێكه لە دەرمانەكان ، خواردنەوەيەكه لە خواردنەوەكان ، ميزاجى ميزاجى تۆوەكانە : گەرمى و تەڕى ، چاكترينيى هەره گەورەو ئاودارەكانە ، سپێكەى لە ڕەشەكەى ستايشكراوتره ئەگەر يەكسان بوون لە شيرينيدا ، وازلێهێنراو دواى كردنەوه بەدوو تا سێ ڕۆژ ستايشكراوتره لەوەى كە لە ڕۆژى كردنەوەيدا بەكاردەهێنرێت ، چونكه لە ڕۆژى كردنەوەيدا سك دەئاوسێنێت ، هەڵواسراو تاوەكو توێكڵەكەى دەچێتەوەيەك كرژ دەبێتەوه خۆراكێكى چاكى تێدايه ، بەهێزكارى جەستەيه ، خۆراكى وەكو خۆراكى هەنجيرو مێوژه ، ئەگەر بەبێ ناوك بخورێت لە هەمووى زياتر سروشت نەرم ونيان دەكاتەوه ، زۆر خواردنى سەر دەئێشێنێت ، زيانەكانى بەهەنارى مزر( الرمان المز ) لادەبرێت ·

سوودى ترێ لەوەدايه كە خوو نەرم ونيان دەكاتەوه ، قەڵەو دەكات ، خۆراكێكى چاك دەبەخشێت ، يەكێكه لەو سێ ميوەيەى كە بەپاشاى ميوەكان دادەنرێت : ترێ و ، خورماى ڕەتابى تازه پێگەيوو ، هەنجير ·

عَسَلٌ ، هەنگوێن : پێشتر سوودەكانى باسكرا ·

( ابن جُرَيجُ ) دەڵێت : پێشەوا ( الزهري ) فەرموويەتى : هەنگوێن بەكاربێنە ، چونكه چاكه بۆ لەبەركردن ·

چاكترينيشى پاكترين و سپيترينێتى ، ئەوەى تيژێتيكەى نەرم و نيانتره ، شيرينيەكەى ڕاستگۆتره ، ئەوەى لە چياو دەرختەكانەوه وەردەگيرێت ، بەچاكتر دادەنرێت بەبەراوردى

ئەوەی لە شانەکانەوە وەردەگیرێت ، ئەمەش بەگوێرەی ئەو شوێنەیە کە هەنگەکەی تێدا بەخێو دەکرێت ٠

عَجْوَةٌ ، جۆرێکە لە چاکترین جۆرەکانی خورمای شاری مەدینەی پیرۆز : في الصحيحين : من حديث سعد بن أبي وقّاص _ رضي الله عنه _ ، عن النبيِّ ﷺ أنه قال : (( مَن تَصَبَّحَ بِسَبْعِ تَمَراتٍ عَجْوَةً ، لمْ يَضُرُّهُ ذلك اليومَ سُمٌّ ولا سِحْرٌ ))([٥٣٣]).

واتە : لە ( سعد )ی کوڕی ( أبي وقّاص )ەوە _ خوای لیٚ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( هەرکەس بۆ خواردنی بەیانی حەوت خورمای ( عَجْوَة ) بخوات ، چیتر ئەو ڕۆژە ژەهرو جادوو زیانی پیٚ ناگەیەنن )) ٠

وفي سنن النسائي وابن ماجة من حديث جابر ، وأبي سعيد _ رضي الله عنهما _ ، عن النبيِّ ﷺ (( العجوةُ من الجنة ، وهي شفاء من السُّمِّ ، والكمأة من المنِّ ، وماؤها شِفَاء للعين ))([٥٣٤]).

واتە : لە (جابر )و ، ( أبي سعيد )ەوە _ خوایان لیٚ ڕازی بێت _ دەفەرمن : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ( العجوة ) لە بەهەشتەوەیە ، شیفایە بەرامبەر بە ژەهر ، دوومەڵانیش لە ( المَنْ )ەو ، ئاوەکەشی شیفایە بۆ چاو )) ٠

[٥٣٣] _ سبق تخريجه ٠

[٥٣٤] _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ٤٨ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٥٣ ) كلهم من طريق شهر بن حوشب عن جابر بن عبدالله وأبي سعيد الخُدري فذكره مرفوعاً ، وأخرجه ابن ماجة ( ٣٤٥٣ ) بإسناده عن أبي نضرة عن أبي سعيد الخُدري فذكره مرفوعاً ٠

( المَنْ ) واتە : لەو بەخشینانەیە کە خوای تعالى بە بەندەکانی خۆی بەخشیوە بەبیٚ هیچ ماندوبونێك ، یاخود پێدەچیٚ مەبەست بەو گەزۆیەی ( بنی إسرائيل ) بێت کە وەکو شەونم و خوناوك دەکەوتە سەر دەرختەکان و ئەوانیش کۆیان دەکردەوەو دەیان خوارد ، لێرەدا تەنها چواندویەتی بەو گەزۆیە لە ڕووی دەستکەوتنەوە ، چونکە مرۆڤ هەردوو شتەکەی دەست دەکەوێت بەبیٚ هیچ ماندوو بونێك ، بڕوانە :

گوتراوه : مەبەست بەو ( العجوة )یە خورما پیرۆزەکەی مەدینەیە ، کە جۆرێکە لە جۆرەکانی خورمای شاری مەدینەی پیرۆز ، کە چاکترین جۆری خورمای حیجازە بەگشتی ، جۆرێکی پیرۆزە ، بەلەزەتە ، پتەو تۆکمەیە بۆ جەستەو هێز ، لە هەمووی نەرم ونیانترو خۆشترو بەلەزەترە ·

پێشتر لە پیتی ( تاء )دا باسی خورماو میزاج و سوودەکەمان کرد ، هەروەها ئەوەمان روونکردەوە کە ( العجوة ) بە چ شێوازێك ژەهرو جادوو دوردەخاتەوە ، بۆیە پێویست بەدوبارە بوونەوە ناکات ·

عَنبَر([٥٣٥]): تقدم في الصحيحين من حديث جابر ، في قصة أبي عَبيدةَ ، وأكلهم من العنبر شهراً ، وأنهم تزوَّدوا من لحمه وشَائق الى المدينة ، وأرسلوا منه إلى النبيِّ ﷺ ([٥٣٦]).

واته : پێشتر فەرموودەکەی ( جابر )مان باسکرد ، سەبارەت بە چیرۆکەکەی ( أبي عُبيدةَ )و ، خواردنیان لە نەهەنگە ( العنبر )ەکە یەك مانگ ، پاشان بەووشکراوەیی و نیوەکوڵاوی چەند پارچە گۆشتێکیشیان لێ هەڵگرت لە سەفەری گەڕانەوەیاندا بۆ مەدینەو ، هەندێکیشیان نارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەمەش یەکێکە لەو بەڵگانەی کە پەنجە ڕادەکێشێت بۆ حەڵاڵبوونی ئەوەی لە دەریادا هەیەو تایبەتیش نی یە تەنها بە ماسیەوەو ، هەموو مردووەکانی حەڵاڵن.

---

[٥٣٥] __ العنبر : جۆرە نەهەنگێکە لە زەریاکاندا دەژی و ، هەموو جۆرێکی زیندەورەی زەریایی دەخوات ، ماددەی ( العنبر ) ڕشانەوەی نەهەنگەکەیە کە لە سکیەوە دێتەدەرێ ، بریتیە لە ماددەیەکی مێوینی ڕەنگ خۆڵەمێشی یا سپی یا زەرد یا ڕەشە ، بە زۆری زیاتر لە یەك ڕەنگە · ئەو دەریاوانەی پارچەیەکی دەستکەوێت ، ئەوا خۆشبەخترین مرۆڤە چونکە نرخەکەی زۆر گرانە ، گەورەترین پارچەی ( العنبر ) دۆزرابێتەوە کێشەکەی ( ٢٤٨ ) ڕەتڵ بووەو خاوەنەکەی بە ( ١٣٠٠٠ ) جونیهی ئیستەرلینی فرۆشتویەتی ، هەموو بۆنە یەکجار بە نرخەکانی جیهان بەشێك لە بۆنی عەنبەری تێدایەو ، خودی بۆنەکەش لە بۆنی میسك دەچێت ، ئەم نەهەنگە سەرێکی زۆر گەورەی هەیەو ، پڕە لە زەیت و ڕۆن · بڕوانە : www.y_nas .com · وەرگێڕ ·

[٥٣٦] __ صحيح ، تقدم تخريجه ·

بەرپەرچی ئەو قسانەشمان دراوەتەوە بەوەی کە گوایە دەریاکە بەزیندووی فرێی دایە دەرەوە ، پاشان ئاوەکەی لێ نیشتەوەو ، مرد ، ئەمەش حەڵاڵە ، چونکە مردنەکەی بەهۆی ئەوەوە بوو کە لە ئاوەکە دوورکەوتەوە ، بەڵام ئەم بۆچونەیان ڕاست نی یە ، چونکە ئەوان بەمردووی لە ڕۆخی دەریاکەدا دۆزیانەوە ، نەشیان بینی بەزیندووی لە ئاوەکە بێتە دەرەوەو ، پاشان ئاوەکەی لێ بنیشێتەوەو بمرێت ٠

هەروەها : ئەگەر زیندوو بوایە دەریاکە فڕێی نەدەدایە دەرەوە بۆ ڕۆخەکەی ، چونکە زانراوە دەریا تەنها گینلەبەرە مردووەکانی فڕێ دەداتە دەرەوە نەك زیندووەکان ٠

هەروەها : ئەگەر وادابنرێت ئیحتمالی بۆچونەکەی ئەوان بکات ، دیسان شیاو نی یە قسەکانیان مەرجێك بێت بۆ حەڵاڵبونی ، چونکە شت حەڵاڵ نابێ لە گەڵ بوونی گومان لە هۆکاری حەڵاڵ بونەکەیدا ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد نێچیرەوان لە نێچیرەکەی بخوات ئەگەر بەخنکاوی لە ئاودا دۆزیبێتیۆەی چونکە گومان لە هۆکاری مردنەکەیدا هەیە ، ئایا مردنی بەهۆی ئامێرەکەوە بوو یاخود بەهۆی ئاوەکەوە بوو ؟

بەڵام ( العنبر ) کە جۆرێکە لە بۆنە خۆشەکان ، نایابترین بۆنە لە پاش ( المسك ) ، ئەو کەسانەی لە پێشی ( المسك )ەوە دایدەنێن بەهەڵەدا چوونە ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ( المسك )ی بەگەورەی بۆنە خۆشەکان داناوە([٥٣٧]) ، بە ( صحیح )ی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ جێگیربووە کەوا سەبارەت بە ( المسك ) فەرموویەتی : بۆن خۆشترین بۆنە خۆشەکانە ، پاشان ـ إن شاء الله تعالی ـ ئەو خاسیەت و سوودانەی تایبەت کراوە بە ( المسك )ەوە دەخەینە ڕوو ، تا ئەو ئاستەی بۆنی خۆشی بەهەشتە ، ئەو گردەش کە نیشتەگەی ڕاستگۆیانە ( الصِّدِّيقين ) لە بەهەشتدا لە ( المسك )ە نەك لە ( العنبر ) ٠

---

[٥٣٧] ـ حسن صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ٣١ ، ٣٦ ، ٤٧ ، ٦٢ ، ٨٧ ) ، وأبوداود ( ٣١٥٨ ) ، والترمذي ( ٩٩١ ) ، ( ٩٩٢ ) ، والنسائي ( ٤ / ٣٩ ، ٤٠ ) كلهم من طريق أبي نضرة عن أبي سعيد الخُدري مرفوعاً : (( أطيب الطيب المسك )) ٠

ئەو شتەی فریوی ئەو کەسەی داوە ( العنبر ) بخاتە پێش ( المسك )ەوە ، ئەوەیە کە گوایە گۆڕانی بەسەردا نایەت بە درێژایی زەمەن ، لەم ڕووەوە لە زێڕ دەچێت ، بەڵام ئەمە بەڵگە نی یە بۆ ئەوەی لە ( المسك ) چاکتر بێ ، چونکە بەم تەنها خاسیەتە توانای بەرەنگاربوونەوەی خاسیەتە زۆرەکانی ( المسك )ی نی یە ٠

پاشان : جۆرەکانی ( العنبر ) زۆرەو ، ڕەنگەکانیشی دیسان زۆرن ، وەکو سپی ، ڕەش بۆر ، سوور ، زەرد ، سەوز ، شین ، ڕەش ، جۆرەها ڕەنگ ٠

چاکترینیشی : ڕەش بۆرو ( الأشهب ) ، شین و ، زەردە ٠ خراپترینیشی : ڕەشە ٠

خەڵکیش جیاوازبوونە سەبارەت بەدیاریکردنی توخم و ڕەچەڵەکی بۆنی ( العنبر ) ، ئەوبوو تایەفەیەك گوتویانە : ڕووەکێکە لە بنی دەریادا دەڕوێت و ، هەندێ لە گیانلەبەرانی دەیخۆن و ، ئینجا کە لێی مەست دەبن وەکو تەرس فڕێی دەدەن و ، دەریاش بۆ ڕۆخەکەی فڕێی دەدات ٠

هەروەها گوتراوە : شەونمێکە لە ئاسمانەوە دادەبەزێتە سەر دورگەکانی دەریاو ، شەپۆلەکانیش بۆ ڕۆخی دەریاکە فڕێی دەدەن ٠

هەروەها گوتراوە : تەرسی گیانلەبەرێکی دەریایە لە مانگا دەچێت ٠

هەروەها گوتراوە : بەڵکو خەڵتەیەکە لە خەڵتەکانی دەریا ، واتە : کەفێکی سەر دەریایە ٠

دانەری ( القانون ) دەڵێت : واگومان دەبرێت لە کانیەکی دەریاوە هەڵدەقوڵێت ، کە دەشڵێن ، خەڵتەیەکی دەریایە ، یاخود تەرسی گیانلەبەرێکە لە راستیەوە بەدوورە ٠

قسەکانی تەواوبوو ٠

ميزاجـى گـەرمى ووشـكە ، بـەهێزكارى دڵ و ، مێشـك و ، هەسـتەكان و ، ئەندامـەكانى جەستەيە ، بۆ نەخۆشيەكانى ئيفليجى و دەم خواربوون و ، نەخۆشيە بەڵغەميەكان و ، ئازارە ساردەكانى گەدەو ، بايە چڕەكان بەسوودە ، بەسوودە بۆ كونيلە داخراوەكـان ( السـدد ) ئەگەر خورايەوە ، يا لـە دەرەوەوە پێـى چەوەر بكرێـت ، ئەگـەر هەڵمەكـەى هەڵمـژرێت بۆ هەڵامەت و سەرئێشەو ، شەقيقەى سارد بەسوودە ٠

عُودٌ ، العود الهندى : ئەمەش دوو جۆرە :

يەكەميان : لە دەرماندا بەكاردێت و بـە ( الكُست ) ناسـراوە ، هـەروەها پێشـى دەڵـێن : ( القِسط ) پاشان لە پيتى ( قاف )دا باسى دەكەين ٠

دووەم : بۆ بۆنى خۆش بەكاردێت و بە ( الألُوَّة ) ناودەبرێت ٠

وقد روى مسلم في صحيحه : عن ابن عمر _ رضي الله عنهما _ ، أنه كان يَسْتَجمِرُ بالألُوَّةِ غير مُطَرَّاةٍ ، وبكافورٍ يَطرَحُ معها ، ويقول : هكذا كانَ يَسْتَجْمِرُ رسول الله ﷺ (٥٣٨).

واتە : ( ابن عمر ) _ خواى لێ ڕازى بێت _ بە ( الألُوَّةِ )ى تێكەڵ نەكراو بەبۆنى تر خۆى بۆنخۆش دەكردو ، بەكافوريش كە تێكەڵى دەكرا و ، دەيفەرموو : بەم شێوە پێغەمبەرى خوا ﷺ خۆى بۆنخۆش دەكرد ٠

بە ( صحيح )ى لـە پێغەمبـەرى خـواوە ﷺ جێگيربـووە كـەوا سـەبارەت بـە سيفەتى ئـەو نازونيعمەتەى خەڵكى بەهەشت تيايدان فەرموويەتى : (( مجامِرُهُمْ الألُوَّةِ ))(٥٣٩).

واتە : (( خۆ بۆنخۆش كردنيان بە ( الألُوَّةِ )يە )) ٠

---

٥٣٨ _ صحيح : أخرجه مسلم ( ٧ / ٤٨ ) ، والنسائي ( ٨ / ١٥٦ ) كلاهما من طريق ابن وهب قال : أخبرني مخرمة عن أبيه عن نافع فذكره عن ابن عمر ٠

( الألُوَّةِ ) : جۆرێكە لە بۆنى خۆش ٠

٥٣٩ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٢ / ٣١٦ ) ، والبخاري ( ٤ / ١٤٣ ) ، ومسلم ( ٨ / ١٤٧ ) ، والترمذي ( ٢٥٣٧ ) كلهم من طريق معمر عن همام بن منبه عن أبي هريرة فذكره مرفوعاً

له زمانی عەرەبیدا ووشەی ( المجامر ) کۆی ووشـەی ( مجمـر )ە واتـە : ئـەو شـتـەی مرۆڤـ خۆی پێ بۆنخۆش دەکات وەکو ( عود ) _ جۆرە بۆنێکە _ یاخود شتی تـر ئەمـەش چـەند جۆرێکە : چاکترینی : هندی ، پاشان چینی ، پاشان ( القَماري ) ، پانیش المنْدَلي([٥٤٠]).

چاکترینیشی : ڕەش و شینە ڕەقە هێمنـە چـەورەکەیەتی ، کەمترینیشیان لـە چاکێتیدا : ئەوەی سووکەو سەر ئاو دەکەوێت .

دەگوترێت : درەختێکـە دەبڕدرێت و یـەك سـاڵ بـەژێر خاکـەوە دەکرێت ، لـەو ماوەیـەدا خاکەکـە بەشـە بێسـوودەکانی دەخـوات و ، تـەنها ( عـود )ە بۆنخۆشـەکە دەمێنێتـەوە ، کـە خاکەکە ناتوانێت کـاری تێبکـات ، هـەروەها توێکڵەکـەی و ئـەوەی بـۆنی خۆشـی نـی یە لـەو ماوەیەدا بۆگەن دەکەن .

میزاجـی گـەرمی ووشـکە لـە سـێ یەمـدا ، کونیلـە داخراوەکـان ( السُـدد ) دەکاتـەوە ، بـا دەشکێنێت ، پاشماوەی شێ ناهێڵێت ، هەناو و دڵ و بـەهێز دەکـات و شـادومانیان دەکـات ، بۆ مێشك بەسوودە ، هەستەکان بەهێز دەکات ، سك دەگرێت ، بـۆ مێـزە چـرتکێی دروستبوو بەهۆی ساردی مێزڵدانەوە بەسوودە .

( ابن سمجون ) دەڵێت : ( عود ) چـەندین جـۆرەو نـاوی ( الألُـوَّةِ ) کۆیـان دەکاتـەوە ، لـە ناوەوەو دەرەوشەوە بـەکاردەهێنرێت ، مرۆڤـ بەتـەنهاو تێکـەڵ کـردن لـە گـەڵ بـۆنی خۆشـی دیکەدا خۆی پێ بۆنخۆش پڕژێن دەکات ، بۆنخۆش پڕژێنیش خۆی بۆ خۆی چاودێری گەوهـەری

---

٥٤٠ _ القَماري : جۆرە بۆنێکی خۆشە دەگەڕێتەوە بۆ دەڤەری ( القَمار )ی وەڵاتی هند ، بڕوانە : المبدع شرح المقنع ، ص١٧ .

( المنْدَلي ) : جۆرە بۆنێکی خۆشە دەگەڕێتەوە بۆ دەڤەری ( المنْدَل )ی وەڵاتی هند ، بڕوانە : الروض المعطار في خبر الأقطار ، ص ٥٥٠ ، وەرگێڕ .

هەواو چاكردنێتی ، چونكە یەكێكە لەو شەش شتە زەروریەی كە ئەگەر چاك بن جەستەش چاك دەبێت ٠

عَدَسٌ ، نیسك : چەند فەرموودەیەكی پوچی هەڵبەستراوی لەبارەوە هاتووە هیچ كامیان ( صحیح ) نین و ، پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفرموون ، وەكو فەرموودەی : پیرۆز كراوەو ڕێزی لێنراوە لەسەر زاری حەفتا پێغەمبەر ٠

هەروەها فەرموودەی : دڵ نەرم دەكات و ، فرمێسك زۆر دەكات و ، بەڕاستی خۆراكی پیاوچاكانە ٠ بەڵام بەرزترین شتێك لەبارەیەوە هاتبێت ، ئەوەیە كە شەهەوەت و ئارەزووی جولەكەیە كە پەسەندێتیان داوە بەسەر گەزۆو ( المن ) و شیلاقەدا( السلوى ) ، نیسك كراوە بە هاوەڵی سیرو پیاز لە بواری باسكردنەوە ، سروشتی وەكو سروشتی مێ یە ، ساردی ووشكە ، دوو هێزی پێچەوانە بەیەكتری تێدایە:

یەكەمیان : سروشت دەبەستێت ( یعقل الطبیعة ) ٠

دووەم : دەیكاتەوە( یطلقها ) ، میزاجی توێكڵەكەی گەرمی ووشكە لە سێ یەمدا ، توونەو سك ڕوان دەكات ( تریاق )ەكەی لە توێكڵەكەیدایە ، بۆیە نەهاڕاوی لە هاڕاوی باشترەو ، بۆ سەر گەدەش سووكترەو ، زیانیشی كەمترە ، چونكە ناوەڕۆكی درەنگ هەرسە لەبەر ساردی و ووشكیەكەی ، ( السوداء ) دروست دەكات ، زیانێكی ئاشكرا بە نەخۆشی ( المالیخولیا ) دەگەیەنێت ، هەروەها زیان بە دەمارو هێزی بینین دەگەیەنێت ٠

خوێن چڕ دەكاتەوە ، پێویستە تووشبوانی ( السوداء ) خۆیانی لێ بەدوور بگرن ، چونكە هەستانیان بە زۆر خواردنی نەخۆشی گەلێكی پیسیان بۆ دروست دەكات وەكو : دودڵی و ، گولی و ، چواریەڕۆ ، بەڵام سڵق و ، سپێناخ و ، زۆر ڕۆنكردنی زیانی كەم دەكاتەوە ،

خراپترینیشی ئەوەیە بە ( النمكسود )ەوە([541]) بخورێت ، با شیرینیشی تێکەڵ نەکرێت ، چونکە کونیلەی داخراو ( السُدد ) لە جگەردا دروست دەکات ، خواردنی بەبەردەوامی چاو تاریك دەکات لەبەر بەهێزی ووشك کردنەوەی ، میزکردن نارەحەت دەکات ، ئاوسانی ساردو ، بای چڕ دروست دەکات ٠ چاکترین جۆری نیسك سپی قەڵەوەکەیە ، کە خێرا پێدەگات ٠

بەڵام کە نەفامان وای بۆ دەچن نیسك ئەو خۆراکە بوو کە پێغەمبەر ( إبراهیم ) بووە کە پێشکەشی میوانەکانی کردووە ، درۆو دەلەسەیەو ، ئەو میوانداریەی بۆ میوانەکانی دروستی کردبوو برژاو بوو ، کە بریتی بوو لە گوێرەکەیەکی برژاو ٠

پێشەوا ( البیهقي ) لە ( إسحاق )ەوە دەگێڕێتەوە : کەوا لە ( ابن المبارك )یان پرسی سەبارەت بەو فەرموودەیەی لەبارەی نیسکەوە هاتووە کە گوایە پیرۆز کراوە لە سەر زاری حەفتا پێغەمبەر ، ئەویش فەرمووی: لە سەر زاری یەك پێغەمبەریش باس نەکراوە ، بەراستی نیسك زیانبەخشی ئاوسێنەرە ، کێ بۆی باسکردوون ؟ گوتیان : ( سَلم )ی کوڕی ( سالم ) ، فەرمووی : لە کێ وە ؟ گوتیان : لە تۆوە ٠ فەرمووی : لە منەوە باسی کردووە ؟!

## پیتی غین ( غ ) :

غَیْثٌ ، باران : لە چەندین شوێنی قورئاندا باسکراوە ، ناوێکی بەلەزەتە لە سەر گوێ ، ناونراوێکی بەلەزەتە لەسەر ڕوح و جەستە ، بەباسکردنی بیسەران دەگەشێنەوە ، دڵان شادومان دەبن ، ئاوی چاکترین و ، ناسکترین و بەسوودترین و بەرەکەت دارترین ئاوە ، بەتایبەت ئەگەر لە هەورێکی بە گرمە گرمەوە بێت و ، لە گۆلاوی چیاکانیشدا کۆبێتەوە ٠

---

[541] _ النمكسود : گۆشتێکە چین چین دەبڕدرێت و خوێدار دەکرێت و بڵاو دەکرێتەوە تا ئاوەکەی دەچێت و ووشك دەبێتەوە ، پاشان هەرکات پێویست بوو شتێکی بەکاربێت ، بەئاو تەڕ دەکرێت و چاك دەکرێت و بەکار دەهێنرێت ، ئەمەش بۆ کاتی سەفەرکردنە بۆ ئەوەی خراپ نەبێت ، بڕوانە : الحصري ، جمع الجواهر في الملح و النوادر ، ص ٩٠ ، وەرگێڕ ٠

له هەموو ئاوەكانی تر تەڕو شێدارتره ، چونكه مانەوەی لەسەر زەوی درێژەی نەكێشاوه ، به ئاستێك له ووشكێتیەكەی وەرگرێت و ، هیچ گەوهەرێكی ووشكی تێكەڵ نەبووه ، بۆیه لەبەر ناسكی و خێرا كارتێكراوبوونی بەخێرایی دەگۆڕێت و بۆگەن دەبێ ٠

بەڵام ئایا بارانی بەهاری له بارانی زستانی نەرم ونیان تره یاخود بە پێچەوانەوەیه ؟ دوو گوفتاری تێدایه ٠

ئەوانەی كه بارانی زستانی بەنەرم ونیان تر دادەنێن دەڵێن : گەرمی خۆر له كاتی زستاندا كەمتره ، بۆیه تەنها ئاوی دەریای سازگاری نەرم و نیان ڕادەكێشێت و ، جەویش پاكەو خاڵیه له هەر شێیەكی دوكەڵیی و ، گەردی تێكەڵ بەئاو ، هەموو ئەمانه هۆكارگەلێك دەبن بۆ نەرم ونیانی و پاكێتی ئاوەكەی و ، خاڵیی بونی له هەر تێكەڵاوێك ٠

ئەوانەش كه بارانی بەهاری بەنەرم و نیانتر دادەنێن دەڵێن : گەرما شێ چڕەكان شیی دەكاتەوه ، هەوا ناسك و نەرم ونیان دەكات ، بەوەش ئاوەكە سووك دەبێ و ، بەشە زەمینیەكانی كەم دەبنەوەو ، ڕێكەوتی كاتی ژیانی ڕووەك و درەختەكان و خۆشی هەوا دەكات ٠

وذكر الشافعي رحمه الله عن أنس بن مالك _ رضي الله عنهما ، قال : كُنَّا مَعَ رسولِ الله ﷺ ، فأصابنا مطرٌ ، فَحَسَرَ رسولُ اللهِ ﷺ عَنْ ثَوْبِهِ ، وقَالَ : (( إِنَّهُ حَدِيثُ عَهْدٍ بِرَبِّهِ ))([542]).

واته : له ( أنس )ی كوڕی ( مالك )ەوه _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : له خزمەتی پێغەمبەری خوادا بوین ﷺ، كه باران لێی داین ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاكەكەی لادا تا بارانەكه لێی بدات و ، فەرمووی : (( تازه له لایەن پەروەردگارەكەیەوه نێردراوه )) ٠ پێشتر له بەشی ئاوخوازیدا باسی داوای باران و ، داوای فرداری بە ئاوی باران له سەرەتای دابەزینیدا كرا ٠

---

[542] _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٤ / ١٣٣ ، ٣٦٧ ) ، والبخاري في الأدب المفرد ( ٥٧١ ) ، ومسلم ( ٣ / ٢٦ ) ، وأبوداود ( ٥١٠٠ ) ، والنسائي ( ٢٦٣ تحفة ) كلهم من طريق جعفر بن سليمان عن ثابت عن أنس فذكره ٠

## پیتی فاء ( ف ) :

فاتحَةُ الكتاب : سورەتی ( الفاتحـة ) : وه ( أُمُّ القـرآن )و ، ( السبعُ المثـاني )و ، شـيفای تـەواو ، دەرمـانی بەسـوودو ، کلیلـی دەوڵەمەنـدی و سـەرکەوتن و ، پـارێزەری هێـزو ، دورخەرەوەی خەم و خەفەت و ترس و دڵگرانیه بـۆ هـەر کەسێك ڕێـزی بزانـێ و هـەقی خـۆی بـداتێ و ، بەچـاکی دایبەزێنێتـە سـەر نەخۆشـیەکەی و ، بزانـی چـۆن بـەکاری دەهـێنێ بـۆ شیفاخوازی و خۆتیمارکردن ، ئەو نهێنیەش بزانێ کە لە پێناویدا ئاوەهایە٠

بۆیە کاتێ کەسانێك لە هاوەڵان ئەوەیان بۆ دەرکەوت ، وەکـو دوعایـەك بـەکاریان هێنـا بـۆ چارەسەری گەزتن و ، یەکسەر چاك بۆوە ٠ ئـەوەبوو پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی : (( ومـا أدراك أنَّها رُقْيّة ))([٥٤٣]) واتە : فەرمووی : (( تۆ چۆن دەزانی ئەوە دوعایە )) ٠

هەرکەس سەرکەوتن یارمەتیداو ، بـەنورو ڕونـاکی زرنگیـی و کارامەیـەوە تێڕوانێـت تـا ئـەو ئاستەی نهێنیەکانی ئەم سورەتەی بـۆ دەرکـەوێت ، ئـەوا بـۆی ئاشـکەرا دەبێـت ئـەم سـورەتە جۆرەکـانی یەکتاپەرسـتی تێدایـە ، هـەروەها زانینـی زات و نـاوو سـیفات و کردەوەکـان و ، جێگیرکردنـی شـەرع و قـەدەرو گەڕانـەوە لـەخۆ دەگرێـت ، تەنهاکردنـەوەی جۆرەکـانی یەکتاپەرستی پەروەردگارێتی و پەرستنێتی و ، شـێوەی تـەواوی پشـت بەسـتن و دەسـتەڵات پێدانی تێدایە بۆ ئەو زاتەی کە هەموو کاروبارەکانی بەدەستە ، هـەموو سـوپاس و ستایشـێك بۆ ئەوە ، هەموو خێرێکی بەدەستە ، هەموو کاروبارێك دەگەڕێتەوە بۆ لای ، مرۆڤـ پێویسـتی بـەو زاتەیـە بـۆ داواکردنـی ڕێنمـویی کـە بنچینەی کامـەرانی دونیـاو ڕۆژی دوایـە ، بـەزانینی پێکەوەبەنـدی ماناکـانی بەرژەوەندیـەکان دەهێنێـت و ، خراپـەکان دووردەخاتـەوە ، ئاکـام و دەرەنجامی ڕەهای تەواو و نیعمەتی تەواوی پێوە بەستراوە ، لەسەر دەسـتکەوتنی وەسـتاوە ، ئەگەر بەتەواوی لەوانەی سەرەوە تێگەشت چیتر پێویستی بەزۆرێك لە دەرمـان و دوعـای تـر

[٥٤٣] ــ صحيح : تقدم تخريجه ٠

نابێ ، بەم سورەتە دەتوانێ چەندین دەروازەی خەیر بکاتەوەو ، چەندین دەروازەی شەڕیش دوربخاتەوە ·

ئەمەش کاروبارێکە پێویستی بە سروشت و فیترەتێکی ترو ، ئەقلێکی ترو ، بڕوایەکی تر هەیە ، سوێند بەخوا

بەرپەرچدانەوەیەکی تەواو ، بەنزیکترین و ڕاسترین و ڕوونترین ڕێگەی پوچکردنەوەی تێدایە بۆ هەموو گوفتارێکی بۆگەن و ، بیدعەیەکی پوچ ، هیچ دەروازەیەك نی یە لە دەروازەکانی زانستە خواوەندیەکان و ، کردەوەو نەخۆشیەکانی دڵ مەگەر ئەم سورەتە کلیلی کردنەوەیەتی و ، پەنجەی بۆ ڕادەکێشێت و ، هیچ پلەیەك نی یە لە پلەکانی ڕێکردوان ( منازل السائرین ) بۆ خوای تعالی مەگەر سەرەتاو کۆتای لەم سورەتەدایە ·

سوێند بەخوا پلەو پایەی لەوەش گەورەترەو ، لەسەرووی ئەوەشەوەیە ، بۆیە هەر بەندەیەکی خوا بەجێی بهێنێت و ، پەنای بۆ بەرێت و ، تێبگات لەو شتانەی ئایەتەکە لەبارەوەیەوە دەدوێ و ، وەکو هۆکاری شیفادان و ، خۆپاراستن لە گوناەو تاوان و ، نورو ڕووناکیەکی ڕۆشنکار بەکاری بێنێت و ، لێی تێبگات و لە پێویستیەکانی تێبگات بەشێوەیەکی دروست ، ئەوا ئەگەر تووشی هەر بیدعەو هاوەڵ پەیداکردنێك بێت ، یاخود تووشی هەر نەخۆشیەك لە نەخۆشیەکانی دڵ بێت ، تووشبونەکەی ناو بە ناو دەبێ و ، جێگیر نابێ و ماندووی ناکات ·

ئەمەو · ئەم سورەتە کلیلی هەرەگەورەی گەنجی زەمینە ، هەروەها کلیلی گەنجی بەهەشتە ، بەڵام هەموو کەسێك ناتوانێت بە چاکی ئەم کلیلە بەکاربێنێت بۆ کردنەوە ، بەڵام ئەگەر داواکارانی گەنج نهێنی ئەم سورەتەیان بزانیباو ، لە ماناکانی تێگەشتبان و ، بۆ ئەم کلیلە چەند ددانێکیان دابنایەو ، بەچاکی پێیان بکردایەوە ، ئەوا گەنجەکانیان دەستگیر دەبوو بە ئاسانی و بەبێ هیچ کۆسپ و تەگەرەیەك ·

ئەمەشمان نەگوتووە نەبە هەڵەشەیی و نەبە خواستن ، بەڵكو حەقیقەتە ، بەڵام خـوای تعالی حیکمەتێکی بڵندی هەیە لە پەنهان کردنی ئەم نهێنیەدا لە زۆربەی جیهانیان ، وەکـو چۆن حیکمەتێکی بڵندی هەیە کاتێ گەنجەکانی زەمینیان لێ پەنهان *دەکات* ، ئەو گەنجـە پەنهانانەش ڕوح گەلێکی پیسی زیانبەخشی بەسـەرەوە دانـراوە ناهێڵێـت دەسـتی مرۆڤـی بگاتێ ، ئەو ڕوحە پیسانەش تەنها لە لایەن ڕوح گەلێکی بەرزی بەڕێزەوە نەبێ نابەزێنرێن ، کـە زاڵ دەبـن بەسـەر ئـەو ڕوحـە پیسـانەدا بـەو بـارە ئیمانیـەی لـە دڵیاندایـە ، لـەم سورەتەوە چەکێکیان پێیە کە شەیتانەکان توانای بەرهەڵستیان نی یە ، زۆربـەی نەفسـی خەڵكیش بەم جۆرە نی یە ، کە لە توانایدا بێت بەرگیری لەو ڕوحانە بکـات و بیانبـەزێنێت ، ناشتوانێت زەفەر بەوە بەرێت کە شتێکی لێ بەزۆر لێ زەوت کردووە ، چونکە هەرکەس یەکێکی کوشت بۆی هەیە شتومەکەکانی بەرێت ٠ ئـەو ڕوحـە پیسـانەش تۆیـان کوشـتووە بۆیە ناتوانیت بەرهەڵستیان بێتەوە ٠

فَاغيَةٌ ، ( نورُ الحنّاءِ ) ، شکۆفەی خەنە : کە وەکو بۆنخۆشترین جۆرەکانی ڕێحانە ، پێشەوا ( البیهقي ) لە کتێبی ( شُعَب الإيمان )دا دەگێڕێتەوە : لە ( عبدالله )ی کوڕی ( بُرَيدة )ەوە ، لە بابیەوە _ خوای لێ رازی بێت _ لە فەرموودەیەکدا کە بەرزی دەکاتەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمێت : سەرگەورەی ڕێحانەکانی دونیاو ڕۆژی دوای شکۆفەی خەنەیە ، هەروەها پێشەوا ( البیهقي ) لە هەمان کتێبدا دەگێڕێتەوە : عن أنس بن مالك _ رضي الله عنه _ ، قال : كان أحَبُّ الرَّياحين إلى رسول الله ﷺ الفَاغِيةُ([٥٤٤])والله أعلم بحال هذين

---

[٥٤٤] _ ضعيف : أورده الألباني في ضعيف الجامع ( ٤٣٠٩ ) وضعفه ، وعزاه السيوطي للطبراني في الكبير ، والبيهقي في الشعب ، وانظر الضعيفة ( ١٧٥٧ ) ٠

نور الحناء : واتە شکۆفەی خەنە : درەختی خەنە تەمەن درێژەو ، زیاتر لە دوو مەتر بەرز دەبنەوە ، گەڵایەکی چڕی سەوزی تێری پێوەیە ، کە دواتر کۆدەکرێنەوەو دەکرێن بە خەنە ، ئەم درەختە گوڵەکانی سپین و بۆنێکی زۆر خۆشی عەتر ئامێزیان هەیەو ، بۆ چارەسەری زۆر نەخۆشی بەکار دێن ٠ ئەم گوڵانە لە زمانی عەرەبیدا پێی دەگوترێت ( الفاغية ) واتە شکۆفە ٠ بڕوانە : www.startimes.com ، وەرگێڕ ٠

الحديثين ، فلا نشهد على رسول الله ﷺ بما لا نعلم صحته • واته : له ( أنس )ى كورِى ( مالك )ەوه _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : خۆشەويسترين ڕێحانەكان بەلاى پێغەمبەرى خواوه ﷺ شكۆفەى خەنە بوو ٠

ناوەندە لە گەرمى و ووشكێتيدا ، كەمێ قەبزى تێدايە ، ئەگەر بخرێتە پێچ و قەدەكانى پۆشاكە خوريەكانەوه لە مۆرانە دەيپارێزێ ، بەشدارە لە مەڵحەمەكانى ئيفليجى و ( التمدد )دا ، ڕۆنەكەشى ئەندامەكان خاو دەكاتەوه ، دەمارەكان نەرم دەكاتەوه ٠

فضة • زيو : ثبت أنَّ رسولَ الله ﷺ كان خاتَمُه من فِضَّة ، وفَصُّه منه([٥٤٥]).

واته : جێگيربووه كەوا ئەموستيلەكەى پێغەمبەرى خوا ﷺ لە زيو بوو ، نقێمەكەشى بەشێكى خۆى بوو ٠ دەسكى شمشێرەكەى زيوو بوو ، بە ( صحيح )ى هيچ شتێك لە پێغەمبەرى خواوه ﷺ جێگير نەبووه سەبارەت بە قەدەغەكردنى پۆشينى زيو و خۆ ڕازاندنەوه بە زيوو ، بەڵام بە ( صحيح )ى لە پێغەمبەرى خواوه ﷺجيگير بووه كەوا قەدەغەى خواردنەوەى كردووه لە جامى زيودا ، بەڵام دەروازەى جامى زيو لە دەروازەى پۆشاك و خۆڕازاندنەوه تەسكترە ، بۆيە بۆ ژنان حەڵاڵ كراوه خۆيانى پىٚ برازێننەوه بەڵام لێيان حەرام كراوه لە جامى زيودا ئاو شلەمەنى بخۆنەوه ، چونكە كە خواردنەوه لە جامى زيودا حەرام كراوه ماناى ئەوه نى يە پۆشينيشى حەرام بێت ٠

وفي السنن عنه : وأما الفِضَّةُ فالعبوا بها لَعِباً([٥٤٦]).

---

[٥٤٥] _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ٢٦٦ ) ، والبخاري ( ٧ / ٢٠١ ) ، وأبوداود ( ٤٢١٧ ) ، والترمذي ( ١٧٤٠ ) وفي الشمائل ( ٨٩ ) ، والنسائي ( ٨ / ١٧٣ ، ١٧٤ ، ١٩٣ ) كلهم من طريق حميد عن أنس فذكره ٠

[٥٤٦] _ إسناده صحيح : أخرجه أحمد في المسند ( ٢ / ٣٣٤ ) ، وأبوداود ( ٤٢٣٤ ) ، وصححه الألباني في صحيح أبي داود ( ٣٥٦٥ ) ٠

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : بەڵام زیو یاری پێ بکەن بە یاری کردن · قەدەغەکردن پێویستی بەبەڵگەیە " بیسلەمێنیّ کە قەدەغەیە ، وەکو دەقێك یا ( إجماع )ێك ، ئەگەر یەکێکیان جێگیربوون ئەوا چاکە ، ئەگینا دڵ شتێکی تێدایە سەبارەت بە حەرامبوونی بۆ پیاوان ، والنبي ﷺ أمسك بیده ذهباً ، وبالأخرى حریراً ، وقال : هذان حرامٌ علی ذکور أمتي ، حِلٌ لإناثهم([٥٤٧]) واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستێکی زێڕی هەڵگرت و ، بەدەستەکەی تریشی ئاورێشم و ، فەرمووی : ئەم دووانە حەرامن بۆ نێرینەی ئومەتەکەم و ، حەڵاڵن بۆ مێینەکانیان ·

زیو نهێنیەکە لە نهێنیەکانی خوای تعالی لە سەر زەمینداو تەڵسەمی پێویستیەکانە ، چاکەی خەڵکی دونیایە لە نێوان خۆیاندا ، خاوەنەکەی بەچاو ناسراوە لە نێوانیاندا ، لە نەفسەکاندا بەڕێزو شکۆمەندە ، دەکرێ بە گەورەو دەمڕاست لە نیشتگەکاندا ، دەروازەکانی لێ داناخرێت ، بیزار نابن لە دانیشتن و ، تێکەڵاوبوونیدا ، شوێنەکەی بارگرانی دروست ناکات ، پەنجەی بۆ ڕادەکێشرێت ، چاوان تەنها سنووربەندی ئەو دەکەن ، ئەگەر قسە بکات قسەکانی دەبیسترێت ، ئەگەر تکاکاری بکات تکاکاریەکەی وەردەگیرێت ، ئەگەر شایەتی بدات شایەتیەکەی وەردەگیرێت و بە شیاو دادەنرێت ، ئەگەر ووتاریدا لێهاتووەو بەتوانایەو سەرزەنشت ناکرێت ، ئەگەر لە ڕیشیدا سپێتیەك هەبێ لە جوانی لاوان جوانترە ·

زیو لە دەرمانە دڵخۆشکارە بەسوودەکانە بۆ خەم و خەفەت و دڵگرانی و ، لاوازی دڵ و دڵەکوتێی ، بە خاسیەتی خۆی توانای ڕاکێشانی ئەو تێکەڵاوە خراپانەی هەیە کە لە دڵدا دروست دەبێ ، بەتایبەت ئەگەر هەنگوێنی پاك و ، زافەرانی تێکەڵ کرا ·

میزاجی زیو مەیلی لای ووشکی و ساردی دەکات ، لە ئەنجامی بەکارهێنانەوە تا ڕادەیەك گەرمی و شێداری دروست دەکات ، ئەو بەهەشتانەی خوای تعالی بۆ خۆشەویستانی لە ڕۆژی

---

[٥٤٧] _ إسناده صحيح : صححه الألباني في صحيح الجامع ( ٢٢٧٤ ) ·

قیامەتدا ئامادەی دەكات ، چوارە ، دوو بەهەشت لە زێڕ ، دوو بەهەشت لە زیو ، هەروەها هەموو قاپ و جام و ئامرازەكانی خۆ رازاندنەوەش كە تیایاندایە ٠

وقد ثبت عنه ﷺ في الصحيح من حديث أم سلمة أنه قال : (( الذي يشربُ في أنيةِ الذَّهبِ والفِضَّة إنَّما يُجَرْجِرُ في بَطْنِه نارَ جَهَنَّمَ ))([٥٤٨]).

واتە : لە ( أُم سلمة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : (( ئەو كەسەی لە قاپی زیودا بخواتەوە ، لە ڕاستیدا ئاگری دۆزەخ لە نێو سكیدا قوڵتە قوڵتی دێت )) ٠

وصح عنه ﷺ أنه قال : (( لا تشربوا في آنيةِ الذَّهبِ والفِضَّةِ ، ولا تأكُلُوا في صَحَافِهما ، فإنها لَهُم في الدُّنيا ولكم في الآخِرَةِ ))([٥٤٩]).

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( لە دەفری زێڕو زیودا مەخۆنەوەو ، لە لەگەنەكانیشیدا مەخۆن ، چونكە بەڕاستی لە دونیادا بۆ ئەوانەو لە ڕۆژی دوایشدا بۆ ئێوەیە )) ٠

گوتراوە : هۆكاری ئەم حرامكردنە دەگەڕێتەوە بۆ تەسك كردنەوەی دراو ، چونكە ئەگەر بۆ دەفەرو قاپ بەكارهێنرا ئەوا ئەو حیكمەتەی لە پێناویدا دانراوە لەدەست دەچێت كە بریتیە لە هەڵسوڕاندنی بەرژەوەندیەكانی نەوەی ئادەم ، هەروەها گوتراوە : هۆكاری حەرامبوونی دەگەڕێتەوە بۆ شانازی و كەشوفش كردن ٠ هەروەها گوتراوە : هۆكاری حەرامبوونی دەگەڕێتەوە بۆ دڵ شكاندنی هەژاران و كەمدەستان ئەگەر تەماشایان كردو بینیان ٠

---

[٥٤٨] _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ١٠ / ٨٤ ) ، ومسلم ( ٢٠٦٥ ) ٠

[٥٤٩] _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٧ / ٩٩ ) ، ( ١٤٦ ) ، ( ١٩٣ ) ، ( ١٩٤ ) ، ومسلم ( ٦ / ١٣٦ ) كلاهما من طريق عبدالرحمن بن أبي ليلى عن حذيفة فذكره ٠

بـەڵام حـەرامبوونی زیـو لەبـەر ئـەم هۆکارانـە هێشـتا جێگـەی تێڕوانینـە ، چـونکە ئەگـەر هۆکـاری حـەرامبوونی زیـو گەڕێندرایـەوە بـۆ تەسـك کردنـەوەی دراو ، ئـەوا دەبـێ قەدەغـەی بەکارهێنانیشی بکرێت بۆ خۆڕازاندنەوە یاخود داڕێژرێت و لە قاڵب بدرێت بۆ هەر شتێکی تـری جگـە لـە قـاپ و دراو ، شـانازی و کەشـوفش کـردنیش حەرامـە بەهـەر شـێوەیەك بێـت ، دڵشکاندنی هەژاران و کەمدەستانیش هیچ ڕێکخەرێکی نی یە ، چونکە دڵیان بە ماڵ و خـانووی فراوان و ، باخچەی سەرسوڕمێن و ، ئامرازی گواستنەوەی جوان و ، جل وبـەرگی نایـاب و ، خواردەمـەنی بەلـەزەت و ، چـەندین شـتی ڕێپێـدراوی حـەڵاڵی تـر دەشـکێ ، هـەموو ئەمانـە هۆکارگەلێکن کاریان پێ ناکرێت ، چونکە هۆکار ( علة ) هەیە ، بـەڵام ئـەنجام و پاسـاو دراو ( معلول ) دوادەکەوێت ٠

راستیش ئەوەیە کە هۆکاری حەرامبوونی زیو _ والله أعلم _ دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بەکارهێنانی زیو شێوازو دیمەنێك بەسەر دڵدا دەهێنێت بە ئاشکەرا دژبە بەندایەتی کردنە بۆ خوای تعالی ، بۆیە پێغەمبەری خـوا ﷺ هۆکـاری حـەرامبوونی ڕوونکـردەوە بـەوەی لـە دونیادا بۆ بێباوەڕانە ، چونکە هیچ بەشێکیان لە بەندایەتی کردندا نی یە بـۆ خـوای تعـالی بۆ ئەوەی بە هۆیـەوە نیعمـەتی ڕۆژی دوایـان دەسـت کـەوێت ، کـەوابوو چـاك نـی یـە بـۆ بەندەکانی خوا لە دونیادا بەکاربهێنرێت ، چونکە لە دونیادا ئەو کەسانە بەکاری دێـنن کـە لە بەندایەتی خـوای تعـالی چـونەتە دەرەوەو ، لـە جیـاتی ڕۆژی دوایـی بـەدونیاو خۆشـیە هەنوکەیە نەماوەکانی ڕازی بوون ٠

## پیتی قاف ( ق ) :

قُرآنٌ : خـوای تعـالی دەفـەمێت : ﴿ وَنُنـزِلُ مِـنَ الْقُـرْآنِ مَـا هُـوَ شِـفَاءٌ وَرَحْمَـةٌ لِلْمُـؤْمِنِينَ ﴾[ الإسراء: ٨٢ ] واتە : ﴿ وَنُنزِلُ مِنَ الْقُرْآنِ ﴾ وە لـەم قورئانـەدا دەنێرینـە خـوارەوە ﴿ مَـا هُـوَ

شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾ ئەوەی کە هۆی شیفاو میهرەبانیە بۆ بڕواداران([550]) ٠ ڕاستیش ئەوەیە کە ووشەی ( مِن )ی نێو ئایەتەکە بۆ ڕەگەزە نەك بۆ هێند ، واتە لە ڕەگەزی ئەم قورئانە دەنێرینە خوارەوە بۆ ئەوەی شیفا بێت بۆ بڕواداران ، بەڵام مانای ( مِن )ی نێو ئایەتەکە ئەوە نی یە کە هێندێکی ئەم قورئانە شیفا بێت بەڵکو هەمووی شیفابەخشە ٠

هەروەها خوای تعالی دەفەرمێت : ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُمْ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ ﴾[ يونس: ٥٧ ] واتە : ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ ﴾ ئەی خەڵکینە ﴿ قَدْ جَاءَتْكُمْ ﴾ بێ گومان بۆتان هاتووە ﴿ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ ﴾ ئامۆژگاری ( قورئان ) لە لایەن پەروەردگارتانەوە ﴿ وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ ﴾ وە شیفاو چارەیە بۆ ئەوەی لە نێو دڵ و دەرونتان دایە ([551])٠ قورئان شیفایە بۆ تێکڕای نەخۆشیەکانی دڵ و جەستە ، نەخۆشیەکانی دونیاو ڕۆژی دوای ، هەموو کەسێکیش لێهاتووی و سەرکەوتنی پێ نادرێت قورئان وەکو هۆکاری شیفادان بەکاربێنێت ، ئەگەر نەخۆش بەچاکی قورئانی وەکو هۆکاری تیمارکردن بەکارهێناو ، بەڕاستگۆیی و ئیمانێکی تەواو و ، قبوڵبونێکی تەواو و ، بیروباوەڕێکی تەواو و ، مەرجەکانی بەدی بێنێت ، ئەوا هەرگیز نەخۆشیەکە توانای بەرگریکردنی قورنانی نابێ ٠

باشە چۆن نەخۆشی توانای بەرگریکردنی گوفتاری خوای پەروەردگاری زەمین و ئاسمانەکانی دەبێ کە ئەگەر دابەزێنرایە سەر چیاکان ، کەرتیان دەکات ، ئەگەر دابەزێنرایە سەر زەمین لەتی دەکات ، هیچ نەخۆشیەك لە نەخۆشیەکانی دڵ و جەستە نی یە مەگەر قورئان ئاماژە بە دەرمان و هۆکەی دەکات و ، چونیەتی خۆپارێزی ، بۆ ئەو کەسانەی تێگەشتنێکی تەواویان لە قورئاندا پێدراوە ٠

---

٥٥٠ ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

٥٥١ ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

پێشتریش كه سەرەتا باسی پزیشكیتیمان كرد ، ئاماژەمان بەوەدا كه قورئانی پیرۆز باسی بنەڕەت و كۆبەندیەكانی دەكات ، كه بریتیه له پاراستنی تەندروستی و خۆپارێزی و ، دەرهاوێشتنی زیانبەخش و ، ئەو شتەش دەكاته بەڵگه بۆ تێكڕای تاكەكانی ئەم جۆرانه.

بەڵام نەخۆشیەكانی دڵ ، بەدرێژی باسیان دەكات ، باسی هۆی ئەو نەخۆشیانەو چارەسەریەكانی دەكات · خوای تعالی دەفەرمێت : ﴿ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ يُتْلَى عَلَيْهِمْ ﴾ [ العنكبوت: ٥١ ] واته: ﴿ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ ﴾ ئایا بۆ ئەوان بەس نی یه ﴿ أَنَّا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ ﴾ كه ئێمه قورئانمان ناردۆته خوارەوه بۆ سەر تۆ ﴿ يُتْلَى عَلَيْهِمْ ﴾ دەخوێنرێتەوه بەسەریاندا (٥٥٢)، بۆیه ئەو كەسەی قورئان شیفابەخشی نەبێت ، خوا شیفای نەدات ، ئەو كەسەش قورئانی بەس نی یه ، خوا هیچی بۆ بەس نەكات ·

القثَّاءُ : وفي السنن : من حديث عبدالله بن جعفر _ رضي الله عنه _ : أنَّ رسول الله ﷺ كانَ يأكُلُ القِثَّاءَ بالرُّطَبِ (٥٥٣)ورواه الترمذي وغيره.

واته : له ( عبدالله )ی كوڕی ( جعفر )ەوه _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ كالیارو خورماری ڕۆتابی تازه پێگەیوی بەیەكەوه دخوارد ·

كالیار ساردی تەڕو شێداره له پله دوودا ، گەرمی گەدەی گرگرتوو دەكوژێنێتەوه ، درەنگ تیایدا خراپ دەبێ ، بۆ ئازاری میزڵدان بەسووده ، بۆنەكەی ناهێڵێت بورانەوه ڕووبدات ، تۆوەكەی میزهێنەره ، گەڵاكانی ئەگەر بكرێته بەستەر ( ضماد ) ، بۆ گەزتنی سەگ بەسووده ·

---

٥٥٢ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ·

٥٥٣ _ تقدم تخريجه ·

بەهێواشی لە گەدە دێتە خوارەوە ، ساردیەکەی زیانبەخشە بۆ هێندێکی ، بۆیە پێویستە ئەو خۆراکانەی لە گەڵدا بخورێت کە چاکی دەکات و ساردی و شێداریەکەی دەشکێنێت ، هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی دەدا کە بەخورمای ڕەتابی تازە پێگەیووە دەیخوارد ، ئەگەر لە گەڵ خورما یاخود مێوژ یاخود هەنگوێندا بخورێت ڕاستی دەکاتەوە ٠

قُسْطٌ وكُسْتٌ : یەك مانایان هەیە : بڕوانە : : وفي الصّحيحَيْنِ من حديث أنس _ رضي الله عنه _ عن النبيِّ ﷺ : (( خَيْرُ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الْحِجَامَةُ ، وَالْقُسْطُ الْبَحْرِيّ ، وَلَا تُعَذِّبُوا صِبْيَانَكُمْ بِالْغَمْزِ مِنْ الْعُذْرَةِ )) ([٥٥٤]).

واتە لە ( أنس )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( چاکترین شتێك بەکاری بێنن بۆ خۆچارەسەرکردن کەڵەشاخ گرتن و ، ( القُسْطُ البَحْري )یە ، منداڵەکانیشتان ئازار مەدەن بە دەست لێدانی زمانە چکۆلەی منداڵەکەنتان ئەگەر بە نەخۆشی ( العُذرة ) تووش بوبون ))

وفي المسند : من حديث أُمِّ قيس ، عن النبيِّ ﷺ (( عليكم بهذا العُود الهنديِّ ، فإنَّ فيه سَبْعَةَ أشْفِيةٍ منها ذاتُ الجَنْب ))([٥٥٥]) واتە : لە ( أُمِّ قيس ) ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی : (( ئەم ( العُود الهنديِّ )ە بەکاربێنن ، چونکە شیفای حەوت نەخۆشی تێدایە یەکێکیان ( ذاتُ الجَنْب )ە )) ٠

( القُسْط )یش : دوو جۆرە : یەکەمیان : سپێکەیە کە ( البحري ) پێ دەگوترێت ٠

ئەویتریان : هندێکەیە ، کە گەرمترینیانەو ، سپێکەش نەرمترینیانەو ، سوودەکانیشی زۆر زۆرن ٠

---

[٥٥٤] _ تقدم تخريجه ٠

[٥٥٥] _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٧ / ١٦١ ، ١٦٤ ، ١٦٥ ، ١٦٦ ) ، ومسلم ( ٧ / ٢٤ ) كلاهما من طريق ابن شهاب عن عبيدالله بن عبدالله بن عتبة عن أم القيس بن محصن الأسدية فذكرته ٠

ئەم دووانە گەرم و ووشكن لە سێ پەمدا ، بەڵغەم ووشك دەكەنەوە ، هەڵامەت ناهێڵن ، ئەگەر بخورێنەوە ، بۆ لاوازی جگەرو گەدەو بۆ ساردبونیان بە سوود دەبن ، بۆ تای ( الدَّوْر )و تای چواربەڕۆ بە سوودن ، بۆ ( وجَعُ الجنب )([556]) و ، ژەهرەكان بەسوودن ، ئەگەر تێكەڵ بە ئاوو هەنگوین بكرێت و وەكو هەویرێك دەم و چاوی تێ هەڵسوێنرێت شڵی و بەڵكی هەڵدەكەنێت ٠

( جالینوس ) دەڵێت : بۆ نەخۆشیەكانی ( الكُزاز ) ، ( وجَعُ الجنب ) بەسوودن ، كرمی ( حب القرع ) دەكوژێت ٠

بەلای پزیشكە نەفامەكانەوە سوودی كوست بۆ نەخۆشی ( ذات الجنب ) نادیار بووە ، بۆیە لەم بارەوە نكۆڵیان لێ كردووە ، بەڵام ئەو نەفامانە ئەگەر ئەم گوفتارانەی ( جالینوس )یان دەستكەوتایە وەریاندەگرت و دەیانخستە پلەی دەقە وەرگیراوەكانەوە ، بەڵام دەبێ ئەو قسانە وەرگرێت ، چونكە زۆربەی پزیشكە پێشكەوتووەكان بڕیاریان لەسەر ئەوە داوە كە ( القُسْط ) بەسوودە بۆ جۆری بەڵغەمی ( ذات الجنب ) ، ئەم گوفتارە ( الخطَّابيُّ ) لە ( محمد )ی كوڕی ( الجَهْم )ەوە باسی كردووە ٠

پێشتر ئامازەمان پێداوە كە پزیشكێتی پزیشكان بەبەراوردی پزیشكێتی پێغەمبەران كەمترە لە ئاستی پزیشكێتی سۆفیە نەفامەكان بەبەراوردی پزیشكێتی پزیشكان ، جیاوازیەكی زۆریش بەدیدەكرێت لە نێوان ئەوەی بە سروش و وەحی وەردەگیرێت و ، ئەوەی كە بە تاقیكردنەوەو ( القیاس ) وەردەگیرێت ٠

---

[556] ــ وجعُ الجَنب : دەستەواژەیەكە بۆ هەموو ئازارێك لە لاكانی مرۆڤدا بەكار دێت ، وەرگێر ٠

ئەگەر ئەم نەفامانە دەرمانێکی بڕیار لە سەر دراویان لە لایەن جولەکەو گاورو بێباوەڕانەوە دەستکەوتایە ، بە قبوڵبوون و ملکەچیەوە پێشوازیان دەکردو ، لەسەر تاقیکردنەوەی نەدەوەستان .

بەڵێ . ئێمە ــ ابن القيم ــ نکوڵی لەوە ناکەین کە نەریت کاریگەری خۆی دەبێ بۆ سوود وەرگرتن و وەرنەگرتن لە دەرمانەکان ، ئەو کەسەی پێی ڕاهاتبێت وەکو دەرمان و خۆراك ، سودێکی زۆری لێ وەردەگرێت و ، زۆریش بۆی گونجاوتر دەبێ بەبەراوردی ئەو کەسەی پێی ڕانەهاتبێت ، بەڵکو پێدەچێ ئەوەی پێی ڕانەهاتبێت سوودی لێ وەرنەگرێت.

گوفتاری پزیشکە بەڕێزەکان ئەگەرچی ڕەهاش بێت ، بەڵام بە گوێرەی میزاجەکان و زەمەنەکان و ، شوێنەکان و دەرەنجامەکانە ، بۆیە ئەگەر چاکبوونەوە لە نەخۆشی پابەندی ئەو میزاج و زەمەن و شوێنانە بێت و ، ئەمەش هیچ دژایەتی و زەمێکی بۆ قسەی ئەو پزیشکە بەڕێزانەی تێدا نەبێ ، کەوابوو چۆن گوفتاری پێغەمبەری ڕاستگۆی بەڕاست دانراو عەیبدار بکرێت . بەڵکو نەفسی ئادەمیزادە کە نەفامی و ستەمی تێدایە ، بەدەر لەو کەسانەی خوای تعالى بەڕوحی ئیمان پشتگیری کردوون ، چاوەکانیشی بەنورو ڕووناکی ڕێنمووییی ڕووناك کردۆتەوە .

قَصَبُ السُّكَّر ، قامیشی شەکر : جاء في بعض ألفاظ السُّنَّة الصحيحة في الحَوض : ماؤه أحلى من السُّكَّر([557]).

[557] ــ لم أجده ، وأخرج الترمذي ( ٢٤٠٤ ) قال : حدثنا سويد ، قال : أخبرنا ابن المبارك قال : أخبرنا يحيى بن عبيدالله ، قال : سمعت أبي يقول : سمعت أبا هريرة يقول : قال رسول الله ــ صلى الله عليه وسلم ــ : (( يَخْرُجُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ رِجَالٌ يَخْتِلُونَ الدُّنْيَا بالدِّينِ ، يَلْبَسُونَ لِلنَّاسِ جُلُودَ الضَّأْنِ مِنَ اللِّينِ ، أَلْسِنَتُهُمْ أَحْلَى مِنَ السُّكَّر ، وَقُلُوبُهُمْ قُلُوبُ الذِّئَاب . يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ : أَبِي يَغْتَرُّونَ ، أَمْ عَلَيَّ يَجْتَرِئُونَ ؛ فَبِي حَلَفْتُ لأَبْعَثَنَّ عَلَى أُولَئِكَ مِنْهُمْ فِتْنَةً تَدَعُ الْحَلِيمَ مِنْهُمْ حَيْرَانَ )) واتە : لە ( أبي هريرة )ەوە ــ خوای لێ ڕازی بێت ــ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ــ صلى الله عليه وسلم ــ

واته : له هەندێ ووشەكانی سوونەتی ( صحيح )ی پێغەمبەری خوادا ﷺ سەبارەت بە ( الحَوض )ەكە هاتووه : كەوا ئاوەكەی لە شەكر شیرینترە · نەشمبینیوە شەكر لە فەرموودەدا هاتبێ لەم شوێنە · شەكر مادەیەكی نوێ یەو پزیشكانی پێشتر باسیان نەكردووەو ، نەشیان ناسیوەو ، وەسفیشیان نەكردووە لە خواردنەوەكانیاندا ، لەڕاستیدا تەنها هەنگوێنیان دەناسی و ، دەیانخستە نێو دەرمانەكانەوە ·

قامیشی شەكر گەرمی شێدارەو بۆ كۆكین بەسوودە ، شێ و میزڵدان و ، بۆڕی سیی كان پاك دەكاتەوە ، قامیشەكەی لە شەكرەكە زیاتر نەرم ونیانتر دەكاتەوە ، یارمەتیدەرە بۆ ڕشانەوە ، ، میزهێنەرە ، توانای جووتبوون زیاد دەكات ، ( عثمان )ی كوڕی ( مسلم الصفّار ) دەڵێت : هەركەس پاش خۆراك خوارن قامیشی شەكر بمژێت ، بەدرێژایی ئەو ڕۆژە لە شادومانیدا دەبێ · گوفتارەكەی تەواوبوو ·

ئەگەر ببرژێنرێت بۆ زبری سینگ و گەروو بەسوود دەبێ ، با دروست دەكات ، بەڵام ئەگەر توێكڵەی لێكرایەوەو بەئاوی گەرم شۆرایەوە با دروست ناكات ·

شەكر گەرمی شێدارە بەپێی ڕاسترین بۆچوون ، گوتراوە : ساردە · چاكترینی شەكری ( الطَّبَرْزَد )([558]) ی سپیە ڕوونەكەیە ، كۆنی لە تازەی نەرم و نیانترو چاكترە ، ئەگەر بكولێندرێت و كەفەكەی لابرێت ، تینویەتی و كۆكین هێمن دەكاتەوە ، بۆ ئەو گەدەیەی (

---

فەرمووی : (( لە كۆتایی زەمەندا پیاوانێك دەردەچن بە ئاینداری دەربڕینی خۆیان فێڵ لە خەڵكی دەكەن ، بۆ سەرنج ڕاكێشانی خەڵك و نەك لەبەر خاتر خوا پۆشاكی خوری مەڕ دەپۆشن بۆ ئەوەی نەرم ونیانی و بێدەستەڵاتی بۆ خەڵك دەربڕن و لە دوایشدا ببن بە موریدو لاینگریان ، زمانیان لە شەكر شیرینترەو ، دڵیان دڵی گورگە · خوای تعالی دەفەرمێت : ئایا بە مۆڵەتدانی من سەركەش دەبن و لێم ناترسن و لە كردەوە خراپەكانیان پەشیمان نابنەوە ، یاخود بەسەرپێچی من دەوێرن ، سوێند بەخۆم فیتنەو كارەساتێكیان بۆ دەنێرم كەسانی میهرەبانیان سەرسام بكات )) · وهو ضعيف جداً كما قال الشيخ الألباني ·

[558] ـ ووشەیەكی فارسیە مانای شەكر دەبەخشێ ، بڕوانە : لسان العرب ، وەرگێڕ ·

الصفراء ) دروست دەكات زيانبەخشە چونكە دەگورێت بۆ ئەو ( الصفراء )يە ، زيانەكانى بە ئاوى ليمۆ ياخود نارنج ، ياخود هەنارى ( الرّمان اللفّان ) كەم دەكرێتەوە ٠

كەسانێك شەكر لە هەنگوێن بەباشتر دادەنێن لەبەر كەمى گەرمى و نەرميەكەى ، ئەمەش لايەنگرتنێكى ناڕەواى شەكرەو فەزڵ دانێتى بەسەر هەنگوێندا ، چونكە سوودەكانى هەنگوێن چەندەها ئەوەندەى سوودەكانى شەكرە ، بەڕاستى خواى تعالى كردويەتى بە شيفاو دەرمان ، پێخۆرو شيرينى ، سوودەكانى شەكر لە چ ئاستێكى سوودەكانى هەنگوێندايە كە : گەدە بەهێز دەكات ، خوو نەرم و نيان دەكاتەوە ، بينين بەهێز دەكات و ، تاريكى ناهێڵێت ، نەخۆشى ( الخوانيق )([559]) دوردەخاتەوە ئەگەر غەرغەرەى پێ بكرێت ، نەخۆشيەكانى ئيفليجى و دەم خواربوون ( الفالج واللقوة ) چاك دەكاتەوە ، بەسوودە بۆ تێكڕاى ئەو نەخۆشيەساردانەى لە جەستەدا ڕوودەدەن بەهۆى تەڕى وشىَ وە ، لە قوڵايى جەستەو ، تێكڕاى جەستەوە ڕاياندەكێشێت ، تەندروستى جەستە دەپارێزێت و قەڵەوى دەكات و گەرمى دەكات ، تواناى جووتبوون زياد دەكات ، كارى شيى كردنەوەو پاك كردنەوە دەكات ، كردنەوەى دەمى ڕەگەكان ، پاكردنەوەى ڕيخۆڵە ، هێنانە خوارەوەى كرم ، قەدەغەى ئينتەلاكردن و بۆگەنبونەكانى تر دەكات ، پێخۆرێكى بەسوودە ، گونجاوى ئەو كەسانەيە كە بەڵغەم بەسەرياندا و زاڵ بووە ، هەروەها پياوانى بەتەمەن و خەڵكانى ميزاج سارد ، بەگشتى : هيچ شتێك نيە ئەوەندەى هەنگوێن بەسوود بێ بۆ جەستە ، بۆ چارەسەركردن و لە كاتى بێتوانابوونى دەرمانەكانى تر ، تەندروستى جەستە دەپارێزێت و ، گەدە بەهێز دەكات و چەندەها ئەوەندەى ترى ئەم سوودانە ، باشە شەكر ئەم سوودو خاسيەتانەى لە كوێ يە يا هەرنەبێ نزيك بەم خاسيەتانە بێ ٠

---

[559] ـ الخوانيق : نەخۆشيەكە دەدات لە گەروو ناهێڵێت هەناسە بەباشى بگات بە سيى كان ، بڕوانە : لسان العرب ، وەرگێڕ ٠

## پیتی كاف ( ك ) :

كتَابٌ للحُمَّى ، نووسراوێك بۆ تا : ( المرْوَزِيُّ ) فەرموویەتی : هەواڵم گەشتە ( أبا عبدالله ) كەوا تام لێهاتووە ، بۆیە بەرامبەر بەتا نوسراوێكی بۆ نوسیم : بسم الله الرحمن الرحيم ، بسم الله ، وبالله ، محمدٌ رسول الله ، ﴿ قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلامًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ ٠ وَأَرَادُوا بِهِ كَيْدًا فَجَعَلْنَاهُمُ الأَخْسَرِينَ ﴾[ الأنبياء : ٦٩ _ ٧٠ ] ، اللَّهُمَّ ربَّ جبرائيلَ ، وميكائيلَ ، وإسرافيلَ ، اشفِ صاحبَ هذا الكتابِ بِحَوْلِك وقُوَّتِكَ و جَبَرُوتِكَ ، إلـه الحق آمين ، واتە : بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان ، بەناوی خوا ، پشت بەخوا ، محمد پێغەمبەری خوایە ، ﴿ قُلْنَا﴾ ( كە ئیبراهیمیان خستە ئاگرەكەوە ) ووتمان ﴿ يَا نَارُ ﴾ ئەی ئاگر ﴿ كُونِي بَرْدًا وَسَلامًا ﴾ سارد بەرەوەو بێ زیان بە ﴿ عَلَى إِبْرَاهِيمَ ﴾ بۆ ئیبراهیم ٠ ﴿ وَأَرَادُوا بِهِ كَيْدًا ﴾ ئەوان ویستیان پیلان بگێڕن لە ئیبراهیم ( بەسووتان لە ناوی بەرن ) ﴿ فَجَعَلْنَاهُمُ ﴾بەڵام ئێمە ئەوانمان كردە ﴿ الأَخْسَرِينَ ﴾( زەرەرمەندترین ( دۆڕاوترین ) كەس([٥٦٠]) ، پەروەردگارا ئەی پەروەردگاری ( جبرائيلَ ) و ( ميكائيلَ ) و ( إسرافيلَ ) ، شیفای خاوەن ئەم نووسراوە بدە بە تواناو هێزو گەورەیی خۆت ، خواوەندی هەق ئامین ٠

پێشەوا ( المرْوَزِيُّ ) فەرموویەتی : گوێبیستی ( أبو المُنذر عمرُو )ی ( مجمع ) بووم ئەمەی بۆ ( أبو عبدالله ) دەخوێندەوە : ( يونس )ی كوڕی ( حِبَّانَ ) بۆی باسكردین و ، فەرمووی : لە ( أبا جعفر )ی كوڕی ( محمد )ی كوڕی ( علي )م پرسی ، سەبارەت بەوەی نوشتە هەڵواسم ، فەرمووی : ئەگەر نووشتەكە لە قورئانەكەی خوا بێ یاخود گوفتارێك بێ لە پێغەمبەری خواوە ئەوا هەڵیواسەوەو بێكە بە هۆكاری شیفا وەرگرتن چەند لە تواناتدایە ٠ ( المرْوَزِيُّ ) دەفەرمێت : منیش گووتم : ئایا بۆ تای چواربەڕۆ ئەمە بنووسم : بسم الله الرحمن الرحيم ، بسم الله ، وبالله ، محمدٌ رسول الله ، تاوەكو كۆتا ؟ فەرمووی : بەڵێ ٠

---

[٥٦٠] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

پێشەوا ( أحمد ) لە خاتوو ( عائشة ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ وە لە کەسانی تریشەوە دەگێڕێتەوە ، کەوا ئاسانکاریان لەوەدا کردووە ٠

( حرب ) دەڵێت : پێشەوا ( أحمد )ی کوڕی ( حنبل ) ئاسانکاری تێدا دەکرد ٠ پێشەوا ( أحمد ) فەرموویەتی : ( ابن مسعود ) زۆر حەزی بەکردنی نەبوو ، لە پێشەوا ( أحمد )یان پرسی سەبارەت بەوەی نوشتەو چاوەزار ( التمائم ) هەڵواسرێت پاش ئەوەی بەڵاکە دادەبەزێ ؟ فەرمووی : ئومیدەوارم هیچی تێدا نەبێ ٠

( الخَلّال ) دەڵێت : ( عبدالله )ی کوڕی ( أحمد ) بۆی باسکردین ، فەرمووی : بینیم بابم نوشتەی بۆ کەسی تۆقیو دەنووسی ، بۆ ( تا )شی دەنوسی پاش ئەوەی بەڵاکە دادەبەزی ٠

<u>کتاب لعُسْر الولادة</u> ٠ نووسراوێك بۆ قورسی و ئاستەمی منداڵبوون : ( الخَلّال ) دەڵێت : ( عبدالله )ی کوڕی ( أحمد ) بۆی باسکردم و ، فەرمووی : بینیم بابم بۆ ئەو ژنەی منداڵبوونەکەی ئاستەم بووە لە جامێکی سپیدا ، یاخود لە شتێکی پاکدا ، فەرموودەکەی ( ابن عباس )ی دەنووسی : لا إله إلا الله الحليمُ الكريمُ ، سبحان الله ربِّ العرش العظيم ، الحمد لله رَبِّ العَالَمِين : واتە : هیچ خوایەك نی یە جگە لە خوای میهرەبانی بەخشندە ، پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری عەرشی مەزن ، سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان ، ﴿ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوا إِلا سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ بَلاغٌ ﴾[ الأحقاف : ٣٥ ] واتە : ﴿ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا ﴾ ئەو ڕۆژەی کە ( سزای ) بەڵێن پێدراویان دەبینن وادەزانن ﴿ لَمْ يَلْبَثُوا إِلا عَشِيَّةً ﴾ تەنها ساتێك لە ڕۆژ لە دنیادا ماونەتەوە ﴿ بَلاغٌ ﴾ ( ئەم قورئانە ) ئاگاداری یە([٥٦١]) ٠ ﴿ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوا إِلا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَاهَا ﴾[ النازعات : ٤٦ ] واتە : ﴿ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا ﴾ بێ بڕواکان کە ئەو ڕۆژە دەبینن وادەزانن ﴿ لَمْ يَلْبَثُوا إِلا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَاهَا ﴾ کە نەماونەتەوە ئێوارەیەك یا چێشتەنگاوێك نەبێ لە

[٥٦١] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

دونیادا ([٥٦٢])٠ ( الخَلّال ) دەڵێت : ( أبوبكر المرْوَزِيُّ ) پێی ڕاگەیاندین : كەوا پیاوێك هاتە خزمەتی ( أبا عبدالله )و گووتی : ئەی ( أبا عبدالله ) نووشتەیەك دەنوسی بۆ ژنێك كە دوو ڕۆژە مندالْبونەكەی ئاستەم بووە ؟ ئەویش فەرمووی : پێی بڵێ : با جامێكی فراوان و ، زافەران بێنێت ، بینیشم بۆ چەندەها كەسی دەنووسی ٠

( عِكرمةَ ) ، لە ( ابن عباس )ەوە دەگێڕێتەوەو ، دەفەرمێت : ( عیسی ) پێغەمبەر ـ صلی الله علی نبیِّنا وعلیه وسلَّم ـ بەلای مانگایەكدا تێپەڕیوو بچكەكەی لە سكیدا مابۆوەو نەدەهاتە دەرەوە ، مانگاكەش گووتی : ئەی ( كلمة الله ) لە خوا بپاڕێرەوە بۆ ئەوەی ڕزگارم بكات لەوەی من تیایدام ٠ ( عیسی ) پێغەمبەریش فەرمووی : یا خالقَ النفسَ مِنَ النفسِ ، ویا مخلِّصَ النفسَ مِنَ النفسِ ، ویا مُخْرِجَ النفسَ مِنَ النفسِ ، خَلِّصْهَا ٠ قال : فرمتْ بولدها ، فإذا هي قائمة تَشَمَّه ٠ واتە : ئەی خولْقێنەری نەفس لە نەفس ، ئەی ڕزگاركاری نەفس لە نەفس ، ئەی بەدەرهێنەری نەفس لە نەفس ، ڕزگاری بكە ٠ فەرمووی : مانگاكە بچكەكەی فڕیدا ، ئەوبوو یەكسەر هەستاو بۆنی دەكرد ٠ فەرمووی: ئەگەر ژنان مندالْبونیان ئاستەم بوو ، ئەمەیان بۆ بنووسە ٠ هەموو ئەو نووشتانەش كە تێپەڕیوون ، بەڕاستی نووسینیان بەسوودە٠

كۆمەڵێك لە پێشینی چاك ڕێیان داوە هەندێك لە قورئان بنوسرێت و بخورێتەوە ، بۆ بەدەستهێنانی ئەو شیفایەی كە خوای تعالی خستویەتیە نێو قورئانەوە ٠

نووسینی نووشتەیەكی تر بۆ ئاستەمی مندالْبوون : لە دەفرێكی پاكدا دەنووسرێت : ﴿ إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ * وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ * وَإِذَا الأَرْضُ مُدَّتْ * وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ * وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ ﴾[ الأنشقاق : ١ ـ ٤ ] واتە : ﴿ إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ ﴾ كاتێك كە ئاسمانەكان لەت دەبن ﴿ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ ﴾ وە ملكەچی كرد بۆ پەروەردگاری و دەبێ واش بێ ﴿ وَإِذَا الأَرْضُ مُدَّتْ ﴾ و ساتێك كە زەوی ڕاكێشراو پانكرایەوە ( راخرا ) ﴿ وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ ﴾

[٥٦٢] ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

وه ئەوەی تیابوو فرێی داو هیچی لەناودانەما ﴿ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ ﴾ وه ملکەچی کرد بۆ پەروەردگاری و دەبێ واش بێ(٥٦٣)٠ پاشان ژنی دووگیان لێی دەخواتەوەو ، دەپرژێنرێت بەسەر سکیدا ٠

كتاب للرعاف ، نووسینی نووشتەیەك بۆ خوێن بەربوونی لووت : شیخی ئیسلام ( ابن تیمیة ) _ ڕەحمەتی خوای لێبێت _ ئەم ئایەتەی لە نێوچاوانی ئەو کەسە دەنووسی : ﴿ وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ وَيَا سَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ وَقُضِيَ الأَمْرُ ﴾[ هود : ٤٤ ] واتە ﴿ وَقِيلَ يَا أَرْضُ ﴾ ئەوسا وترا ئەی زەوی ﴿ ابْلَعِي مَاءَكِ ﴾ ئاوەکەت هەڵمژە ﴿ وَيَا سَمَاءُ أَقْلِعِي ﴾ و ئەی ئاسمان باران مەبارێنە ﴿ وَغِيضَ الْمَاءُ ﴾ ئیتر لافاوەکە ڕۆچو بەناخی زەویدا ﴿ وَقُضِيَ الأَمْرُ ﴾ کارەکە ( خنکانیان ) تەواو بوو(٥٦٤) ٠ پێشەوا _ ابن القيم _ دەفەرمێت : گوێبیستی شیخی ئیسلام ( ابن تیمیة ) بووم _ ڕەحمەتی خوای لێبێت _ دەیفەرموو : بۆ چەندەها کەسم نووسیوەو چاك بۆنەتەوە ، هەروەها دەیفەرموو : نابێ بە خوێنی لووت بنوسرێت ، هەروەك نەفامەکان ئەنجامی دەدەن ، چونکە خوێن پیسەو ( نجس ) نابێ گوفتارەکانی خوای پێ بنوسرێتەوە ٠

نوسینی نووشتەیەکی تر خوێن بەربونی لووت : ( موسى ) پێغەمبەر _ عليه السلام _ بە عەبایەکەوە چووە دەرەوە ، سەرچاوەیەکی بەدیکرد ، ئەوەبوو بە عەباکەی توند بەستی ﴿ يَمْحُو اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِنْدَهُ أُمُّ الْكِتَابِ ﴾[ الرعد : ٣٩ ] واتە : ﴿ يَمْحُو اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ ﴾ ئەوەی خوا بیەوێ دەیسڕێتەوەو ( ئەوەش بیەوێ ) دەیهێڵێتەوە ﴿ وَعِنْدَهُ أُمُّ الْكِتَابِ ﴾ سەرچاوەی کتێبەکان لای ئەو ( خوایە کە اللوح المحفوظ )ە(٥٦٥)

---

٥٦٣ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

٥٦٤ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

٥٦٥ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

كتاب ( الحَزاز ) نووسينى نووشتەيەك بۆ( الحَزاز ) : تيايدا دەنوسرێت ﴿ فَأَصَابَهَا إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَاحْتَرَقَتْ ﴾[ البقرة : ٢٦٦ ] بحول الله وقوتە ٠ واتە : ﴿ فَأَصَابَهَا إِعْصَارٌ ﴾ ئينجا گەردەلولێكى لێ هەڵبكات ﴿ فِيهِ نَار ﴾ گڕو سەموومى تێدا بێ ﴿ فَاحْتَرَقَتْ ﴾ يەكسەر باخەكە بسوتێ[٥٦٦] ، بەهێزو توانای خوای تعالى ٠

نووسينى نووشتەيەكى تر بۆ ( الحَزاز ) : لە كاتى زەردبونەوەی خۆردا لەسەری دەنوسرێت : ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَآمِنُوا بِرَسُولِهِ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِنْ رَحْمَتِهِ وَيَجْعَلْ لَكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾[ الحديد : ٢٨ ] واتە : ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ﴾ ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە ﴿ اتَّقُوا اللَّهَ وَآمِنُوا بِرَسُولِهِ ﴾ لە خوا بترسن و باوەڕبێنن بە پێغەمبەرەكەی ﴿ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِنْ رَحْمَتِهِ ﴾ دوو بەشتان لە ڕەحمەت و بەخششى خۆی پێ دەبەخشێ ﴿ وَيَجْعَلْ لَكُمْ نُورًا ﴾ وە ڕووناكيەكتان دەداتێ ﴿ تَمْشُونَ بِهِ ﴾ كە ڕێ نموونی پێ بكەن ﴿ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ﴾ وە لێتان خۆش دەبێت ﴿ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ وە خوا لێخۆشبووی ميهرەبانە[٥٦٧]

كتابٌ للحمى المثلثة : نووسينى نووشتەيەك بۆ تای سێ بەڕۆ : لە سێ گەڵای نەرم و نيان دەنوسرێت : بسم الله فرَّت ، بسم الله مرَّت ، بسم الله قلَّت ٠ واتە : بەناوی فڕی ، بەناوی تێپەڕی ، بەناوی خوا كەم بۆوە ، پاشان هەموو ڕۆژێك گەڵايەكی دەخاتە دەمی و ، بە ئاو قوتی دەدات ٠

كتاب لعرق النسا : نووسينى نووشتەيەك بۆ دەردەلاقە : بسم الله الرحمن الرحيم ، اللهمَّ رب كل شيء ، ومليك كل شيء ، وخالق كل شيء ، أنت خلقتني ، وأنت خلقت النَّسا ، فلا تسلطه علي بأذى ، ولا تسلطني عليه بقطع ، واشفني شفاء لا يغادر سقماً ، لا شافي إلا أنت

---

[٥٦٦] ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسيری قورئان ٠

[٥٦٧] ـ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسيری قورئان ٠

* واته : بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان ، پەروەردگارا ئەی پەروەردگاری هەموو شتێك ، پادشای هەموو شتێك ، خولقێنەری هەموو شتێك ، تۆ منت خولقاندو ، دەردەلاقەشت خولقاندووە ، بەزیان بەسەرمدا زاڵی مەکە ، زاڵیشم مەکە بەسەریدا بەبڕین ، شیفام بدە شیفایەك نەخۆشی تێنەپەڕێنێت ، بەدەر لە تۆ هیچ شیفادەرێك نی یە ٠

كتابٌ للعرق الضاربْ: نووسینی نووشتەیەك بۆ ڕەگی لێدەر : روى الترمذي في جامعه : من حديث ابن عباس _ رضي الله عنهما _ : أن رسول الله ﷺ كان يعلمهم من الحمى ، ومن الأوجاع كلها أن يقولوا : (( بسم اللّه الكبير ، أعوذ باللّه العظيم مِنْ شَرِّ كلِّ عِرْقٍ نَعّارٍ ، ومن شرِّ حَرِّ النار ))([568]).

واته : لە ( ابن عباس )ەوە _ خوا لە خۆی و بابیشی ڕازی بێت _ : کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ تا لێهاتن و ، هەموو ئازارەکان فێری دەکردن کەوا بڵێن : (( بەناوی خوای مەزن و شکۆدار ، پەنادەگرم بەخوای گەورە لە شەڕی هەر ڕەگێك کە بەهوروژم خوێنی لێدێت و ، لە شەڕی گەرمی ئاگر )) ٠

كتابٌ لوجع الضرس: نووسینی نووشتەیەك بۆ ددان ئێشە : لەسەر ئەو لا ڕوومەتەی کە ددانە بەئازارەکەی لە ژێردایە دەنوسرێت : بسم الله الرحمن الرحيم : ﴿ قُلْ هُوَ الَّذِي أَنْشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ قَلِيلا مَا تَشْكُرُونَ ﴾[ الملك : ٢٣ ] واته : ﴿ قُلْ هُوَ الَّذِي أَنْشَأَكُمْ ﴾ ( ئەی محمد _ صلى الله عليه وسلم ) بڵێ : هەر خوایە کە دروستی کردوون ﴿ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ ﴾ وە گوێ و چاو دڵی پێ داون ﴿ قَلِيلا مَا تَشْكُرُونَ ﴾ زۆر بەدەگمەن سوپاسی ( ئەم بەهرانە ) دەکەن([569]) ٠ ئەگەر ئارەزووشی لێ بوو با بنووسێت : ﴿ وَلَهُ مَا سَكَنَ فِي اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾[ الأنعام : ١٣ ] واته : ﴿ وَلَهُ مَا سَكَنَ

---

[568] _ إسناده ضعيف : أخرجه الترمذي ( ٢٠٧٦ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٤٥٨٧ ) ٠

[569] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

فِي اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ﴾ وه هەر بۆ خوایه ئەوەی ئارامی گرتووه لە شەو و ڕۆژدا ﴿ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ وه هەر ئەو بیسەری زانایە([570])

كتابٌ للخُراج: نووسینی نووشتەیەك بۆ دومەڵ : لە سەری دەنووسرێت : ﴿ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْجِبَالِ فَقُلْ يَنْسِفُهَا رَبِّي نَسْفًا ۰ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا لا تَرَى فِيهَا عِوَجًا وَلا أَمْتًا ﴾[ طه : ١٠٥ _ ١٠٧ ] واته: ﴿ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْجِبَالِ ﴾ ( ئەی محمد _ صلى الله عليه وسلم _ ) پرسیارەت لێدەكەن سەبارەت بە شاخەكان ﴿ فَقُلْ يَنْسِفُهَا رَبِّي نَسْفًا ﴾ تۆش بڵێ پەروەردگار لە بیخیان دێنێ و وردو و خاشیان دەكات ئینجا با پرژو بڵاویان دەكاتەوە ۰ ﴿ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴾ ئینجا ڕێك و ساف و بێ ئاوو گژوگیا دەیهێڵێتەوە ﴿ لا تَرَى فِيهَا ﴾ نابینی تێیدا ﴿ عِوَجًا وَلا أَمْتًا ﴾ هیچ جۆرە لاری و بەرزی و نزمیەك([571])

كمأة: دوومەڵان : ثبت عن النبي ﷺ أنه قال : (( الكمأة من المن وماؤها شفاء للعين ))([572]) أخرجاه في الصحيحين.

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( دوومەڵان لە گەزۆیەو ئاوەكەشی بۆ چاو شیفایە )) ۰

دوومەڵان لە زەویدایە بەبێ ڕواندن ، بە ( الكمأة ) ناونراوە چونكە خۆی وون كردووەو لە ژێر زەویدا خۆی شاردۆتەوە ، بۆیە لە زمانی عەرەبیدا دەگوترێت : ( كمأ الشهادة ) واته : شایەتیەكەی پەنهان كردو هەستا بە شاردنەوەی ، دوومەڵانیش( الكمأة ) وون و شاراوەیە لە ژێر خاكداو هیچ گەڵاو قەدێكی نی یە ، مادەكەی لە گەوهەرێكی زەمینی هەڵمیەو ، لە زەمینەوە بەرەو ڕووی هەڵتۆقیوە ، بەساردی زستان و ، گەشەسەندی بارانی بەهار

[570] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ۰

[571] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ۰

[572] _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ١٠ / ١٣٨ ) ، ومسلم ( ٢٠٤٩ ) ۰

هەڵدەتۆقێت ، ئەوجا دروست دەبێ و بەرەو ڕووی زەمین دەردەپەڕێ و تەنێکی دیار دەبێ ، بۆیە لە زمانی عەرەبیدا پێی گوتراوە ( جدري الأرض ) واتە ئاوڵەی زەوی ، وەکو چواندنێك بە ئاوڵە لە شێوەو مادەشدا ، چونکە مادەی ئاوڵە تەڕی و شێیەکی خوێنیەو ، بەزۆری لە تەمەنی گەشەکردندا هەڵدەتۆقێت ، لە سەرەتای زاڵبوونی گەرمی و ، گەشەکردنی هێزدا.

دوومەڵان لە بەهاردا دەردەچێت و ، بە کاڵی و کوڵاویش دەخورێت ، عەرەبەکان بە ( نبات الرعد ) ی ناودەبن واتە : ڕووەکی هەورەگرمە چونکە لە کاتی زۆربوونی هەورەگرمەدا زۆر دەبێ و ، زەویەکە بۆ دوومەڵانەکە درز دەبا ، دومەڵان لە خۆراکی دەشتەکیەکانەو ، لە زەوی عەرەبدا زۆرە ، چاکترین خاکیشی خاکی لمینی کەم ئاوە ٠

دوومەڵان چەندین جۆرە : جۆرێکیان کوشندەیەو ڕەنگی مەیلی لای سووری دەکات و هەناسەسواری و خەنکان دروست دەکات ٠

دوومەڵان ساردی تەڕوشێدارە لە پلە سێدا ، خراپە بۆ گەدەو ، درەنگ هەرسە ، ئەگەر بەزۆری بخورێت ، نەخۆشیەکانی ( القولنج ) ، ( السكتة ) ، ئیفلیجی ، گەدەئێشان ، قورسی میزکردن دروست دەکات ، تەڕوشێدارەکەی لە ووشکەکەی زیانی کەمترەو هەرکەسیش ویستی خواردنی هەبوو با بیخاتە نێو قوڕی تەڕەوە ، ئینجا لە گەڵ ئاو و خوێ و جاترەدا ( الصعتر )([٥٧٣]) بیکوڵێنێ و ، بەزەیتی زەیتون و بەهاراتی گەرمەوە بیخوات ، چونکە گەوهەرەکەی زەمینیی چڕەو ، خواردنیشی خراپە ، بەڵام گەوهەرێکی ئاوی نەرم و نیانی

[٥٧٣] ـ الصعتر : ڕووەکێکی تەمەن درێژی بچوکەو ، گەڵاکانی بۆنێکی عەتر ئامێزی توندیان هەیە ، لقێکی زۆری چڕی لێدەبێتەوەو ، بەسەر زەویدا وەکو ڕاخەر خۆی ڕادەخات ، نزیکەی ( ١٢ ) بوصە بەرز دەبێتەوە ، گوڵگەلێکی پەمەیی و ئەرخەوانی پێوەیەو لە نیوەی وەرزی هاویندا دێنەدەرێ ، وە لەبەر ئەوەی چیاکان بۆن خۆش دەکات ، بۆیە پێی گوتراوە ( دڵخۆشکاری چیا ) ، لە چیای ( الأخضر )ی وەڵاتی لیبیاو لە وەڵاتانی دیکەشدا ئەم ڕووەکە زۆرە ، تامێکی گەرمی کەمێ تاڵی هەیە ، گەڵاو گوڵ و قەدەکەی بەکاردەبرێت ٠ بڕوانە : http://ar.wikipedia.org/wiki/ ، وەرگێڕ ٠

تێدایە پەنجە بۆ سوکی ڕادەکێشێت ، ئەگەر چاوی پێ بڕێژرێت بۆ تـاریکی چـاو و چاوئێشـەی گەرم بەسوودە ، پزیشکە بەڕێزەکان دانیان بەوەدا نـاوە کـە ئاوەکـەی چـاو پـاك دەکاتـەوە . ئەوانەی کە باسیان کردووە ( المسيحيُّ )و ، دانەری ( القانون )و ، کەسانی تریشن .

فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ: (( الكَمْأة من المَنِّ )) دوو گوفتاری لەبارەوە هاتوون :

یەکەمیان : ئەو گەزۆیەی کە بۆ نەوەی ئیسرائل دابەزی ، تەنها ئەم جۆرە شـیرینە نـەبوو ، بەڵکو چـەندەها جـۆری خواردەمـەنی بـوو " کـە خـوای تعـالی بـە سـەریدا ڕشـتن ، وەکـو ئـەو ڕووەکەی کە بەخۆڕسکی دەست دەکەوێت ، بەبێ کارو چارەسەرو کێڵـان ، چونکە ووشـەی ( المَنْ ) چاوگە بەمانای ( المفعول ) " واتە ئەو ( المن )ە خـۆراکێکی خـەڵاتکراو بـوو لـە لایـەن پەروەردگارەوە ، کەوابوو خوای تعالی هەر شـتێکی کردبـێ بـەڕۆزی بـۆ بەنـدەکانی بـە خـۆڕاو بـەبێ کـارکردن و بـەبێ چارەسـەر ، ( المَـنْ )ێکـی پوختـە ، ئەگەرچـی هـەموو نیعمەتـەکانی پەروەردگار بۆ بەندەکانی خۆی خەڵات و بەخششە ، بەڵام لێرەدا شـتەکە تایبـەت کـراوە بـەو نیعمەتـەوە کـە بـەبێ کـارکردن بەدەسـت دێـت ، مـرۆڤیش بـەناوی ( المَـنْ )ەوە دروسـتی نـەکردووە ، بـەڵکو هـەر بـۆ خـۆی ( المَـنْ )ە بـەبێ ئـەوەی مـرۆڤ دەسـتی لـە بونیـدا هـەبێ ، ئەوەبوو خوای تعالی خۆراکی بۆ کردبون بە شتێکی شـاراوە کـە دۆمەڵانـە ، کـە جێگـەی نـانی دەگرتەوە ، پێخۆری بۆ کردبوون بە باڵنـدەی شـێلاقە ( السـلوى ) ، کـە جێگـەی گۆشـتی بـۆ دەگرتنەوە ، حەلوای بۆ کردبـوون بـە ( الطـلَّ ) کـە دادەبەزێتـە سـەر درەختـەکان و جێگـەی شیرینی و حەلوای بۆ دەگرتنەوە ، بەم شێوە ژینی بۆ تەواو کردبوون .

تەماشای فەرمایشتی پێغەمبەری خوا بکە ﷺ: دۆمەڵان لەو گەزوانەیە کە خوای تعالی بۆ نەوەی ئیسرائلی دابەزاند · لێرەدا تەماشا دەکەیت دۆمەڵانی کردووە بە تەنها بەشێك لە کۆی ئەو هەموو گەزووانەی کە دایبەزاند بۆ نەوەی ئیسرائیل و ، تاکێك لە تاکەکانی گەزۆ ، کەوابوو گەزۆ تەنها جۆرێك نی یە ، ( الترنجبين )یش کە دەکەوێتە سەر درەختەکان تەنها جۆرێکە لە گەزۆ ، بەڵام پاشان بەکارهێنانی ووشەی ( المَنْ )ی بەسەردا زاڵ بوو وەکو نەرێتێکی تازە بەدیهێنراو ·

گوفتاری دووەم : دۆمەڵانی چواندووە بە گەزۆی دابەزیو لە ئاسمانەوە ، چونکە کۆدەکرێتەوە بەبێ ماندووبوون و تێچوون و چاندنی تۆو و ئاودان ·

ئەگەر گوتت : ئەگەر ئەمە پایەی دۆمەڵان بێت ، کەوابوو ئەو زیانە چی یە تیایدا ، لە کوێ وە ئەوەی بۆ هاتووە ؟

بزانە خوای تعالی بەووردی و لێهاتووی هەموو شتێکی دروست کردووە ، بەچاکی و جوانی هەموو شتێکی خوڵقاندووە ، لە سەرەتای خوڵقاندنیدا هیچ بەڵاو نەخۆشیەکی تێدا نی یە ، سوودو کەڵکێکی تەواوی هەیە بۆ ئەوەی لە پێناویدا ئامادەکراوەو خوڵقێنراوە ، کەچی پاشان بەهۆی چەندین هۆکاری دیکەوە بەڵاو نەخۆشی تووش دەبێ " وەکو نزیکی و لەپاڵ یەکدابوون ، یاخود تێکەڵبوون ، یاخود چەندین هۆکاری تر کە خراپی دەکات ، بۆیە ئەگەر لە سەر سروشت و خوڵقاندنە بنەڕەتەکەی بمایەتەوە بەبێ تێکەڵاوبوونی لە گەڵ ئەو هۆیانەدا کە خراپی دەکەن ، خراپ نەدەبوو ·

هەرکەس زانیاری سەبارەت بە باروحاڵی جیهان و سەرەتای دروستبوونی هەبێ ، دەزانی هەموو ئەو خراپبوونەی لە ئاوهەواو ڕووەك و گیانلەبەران و باروحاڵی دانیشتوانیدا هەیە ، دوای خوڵقاندن تووشیان بووە بەهۆکارگەلێکی جیاواز ، بەردەوام کردەوەکانی نەوەی ئادەم و سەرپێچیان بۆ پێغەمبەران خراپەی جۆراوجۆری گشتی و تایبەت دروست دەکەن و ،

بەوەش تووشی جۆرەها ئازارو ، نەخۆشی و ، دەردو ، چاوەقوڵە ( طاعون )و ، بێ بارانی و ووشکێتی و ، قات و قڕی و ، هەڵگرتنی فڕداری خاك و ، بەروبوم و ، ڕووەك و ، هەڵگرتنی سوودەکانیان ، یاخود کەم کردنەوەیان دەبن ، هەموو ئەمانە کاروبارێکن یەك بەدوای یەکدا ڕوو دەدەن ٠

ئەگەر زانستیشت ئەوەندە فراوان نەبوو جێگەی ئەوانەی سەرەوەی تیا بێتەوە ، با ئەم ئایەتی خوای پەروەردگارت بەس بێت : ﴿ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ﴾[ الروم : ٤١ ] واتە : ﴿ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾ خراپە ( بەڵاو شێوان و دەرد ) لە ووشکانی ( زەوی ) و دەریادا دەرکەوتووە ﴿بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ﴾ بەهۆی ئەو خراپانەی خەڵکی کردویانە([٥٧٤]) ، ئەم ئایەتە لە سەر باروحاڵی جیهان دابەزیووە ، پێگ گرتنی بۆ کردووە لە نێوان ئەوەی لە واقیعدا ڕوودەدەن و لە نێوان فەسادو خراپەدا ، تۆش تەماشا دەکەیت چۆن ئەو بەڵاو نەخۆشیانە هەموو کاتێك لە بەروبووم و ڕووەك و ئاژەڵاندا ڕوودەدەن ، لەو بەڵایانەشەوە چەندین بەڵای دیکەی پەیوەندیدار ڕوودەدەن و ، ملی یەکتریان گرتووە ، هەرچەند خەڵکی ستەم و کردەوەی ناشیرین و داوێن پیسی زیاتر ئەنجام بدەن ، ئەمەندە خوای پەروەردگاریش بەڵاو نەخۆشیان بۆ بەدیدەهێنێت " لە خۆراك و میوەو ، هەواو ئاو و ، جەستەو سروشت و ، وێنەو شێوەو ڕەوشتیاندا " وەکو کەمکردنەوە لە خۆراك و ، دەردو بەڵاهێنان بەسەردا ، بەجۆرێك ڕیکی کردەوەو ستەم و کردەوناشیرینەکانی ئەوان بێت ٠

پێشتر دانەوێڵەی وەکو گەنم و شتی تریش زۆربووە بەبەراوردی ئەمڕۆ ، هەروەها فڕداریشی گەورەتر بووە ٠ پێشەوا ( أحمد )ی کوڕی ( حنبل ) دەگێڕێتەوە : کەوا لە گەنجینەکانی ( بني أمية )دا توورەکەیەك دۆزرایەوە گەنمی تێدا بوو هەر دانەیەکی بەئەندازەی ناوکە خورمایەك دەبوو ، لە سەری نووسرابوو : ئەمە لە ڕۆژانی دادپەروەریدا

[٥٧٤] ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

دەڕوا ، ئەم چیرۆکەی لە ( المسند )ەکەیدا گێڕاوەتەوە لە میانەی فەرموودەیەکدا لەم بارەوە باسی کردووە ٠

زۆربەی ئەم نەخۆشی و بەڵا گشتیانە پاشماوەی سزایکن نەتەوەکانی ڕابردووی پێ سزا دەدرا ، پاشان هێندێکی وەکو چاودێر مایەوە ، بۆ ئەو کەسانەی کە هێندێ لە کردەوی خراپی ئەو نەتەوانەی تێدایە ، وەکو حوکمێکی بەدادو ، فەرمانێکی دروست ، پێغەمبەری خواش ﷺ ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە کە فەرموویەتی : ئەوە پاشماوەی بەڵا یاخود سزایەکە نێردرایە سەر نەوەی ئیسرائیل ٠

ئەوەبوو خوای تعالی بای بەسەر قەومێکدا زاڵ کرد ، بۆ ماوەی حەوت شەو هەشت ڕۆژ ، پاشان هێندێکی لەو بایە لە جیهاندا هێڵایەوە ، لەو ڕۆژانەدا ، کەوابوو ئەمانە چەندین پەندو ئامۆژگاری تێدایە ٠

خوای تعالی کردەوکانی مرۆڤی چاك و مرۆڤی خراپەکاری کردووە بەهۆکاری تووشبوون بە نەخۆشی و دەردو بەڵا لەم جیهانەدا ، وەکو فەرمانێکی ناچاری ٠

بۆیە خەڵکی کە چاکەکردن و زەکات و خێروچاکەداری ناکەن و قەدەغەی دەکەن ، خوای تعالاش بارانی ئاسمانیان لێ قەدەغە دەکات و ، ووشکێتی و ، قات و قڕیان بە سەردا دەهێنێ ٠

کە خەڵکی ستەم لە هەژاران و کەمدەستان دەکەن و ، لە کێشانەو پێوانەدا گزی دەکەن و کەمی دەکەنەوە ، وە بەهێزان دەست درێژی لە بێهێزان و لاوازان دەکەن ، خوای تعالاش جەوری پادشایان و کاربەدەستانیان بەسەردا زاڵ دەکات ، ئەو پاشایانەی کە هیچ ڕەحم و بەزەیەکیان بە مرۆڤدا نایەتەوە کاتێ داوای ڕەحم و بەزەیان لێدەکرێت ٠

له راستيدا ئەوان كردەوەكانى ميللەتن بەڵام لە ڕوخسار و شێوەی كاربەدەستەكانياندا بۆيان دەركەوتوون ، چونكە خوای تعالی به دانايی و دادپەروەری خۆی كردەوەكانی خەڵك بۆ خودی خەڵكەكە بەقاڵب و شێوەيەك بەدەردەخات " كە گونجاويان بێت ٠

جارێك به كەم بارانی و قات و قڕی ، جارێك به دوژمن ، جارێك به كاربەدەستانی ستەمكار ، جارێك بەنەخۆشيه گشتيەكان ، جارێك بەخەم و خەفەت تووشيان دەبێ و لێيان نابێتەوە ، جارێك بەقەدەغەكردنی فرِو بەرەكەتی ئاسمان و زەوی ، جارێك بەزاڵكردنی شەيتان كە هانيان دەدات بۆ هۆكارەكانی تاوانكردن ، بۆ ئەوەی بڕياری پەروەردگاريان بە سەردا بچەسپێ ، هەموو كەسێكيش بچێتەوە سەر ئەوەی بۆ خولقێنراوە ٠ ئاقڵ و ژيريش چاوی بەنێو هەرێمە جياوازەكانی جيهاندا دەگەرێنێت ، دەيانبينێ و ، تەماشای جێگەی دادپەروەری خواو دانايەكەی دەكات و ، ئەوكات بۆی دەردەكەوێت كەوا پێغەمبەران و شوێنكەوتوانيان بەتايبەت لە سەر ڕێگەی راستی ڕزگارين ، بەڵام هەموو خەڵك بەڕێگای تياچووندا دەچن و ، بەرەوماڵێكی وێرانبوون مل دەنێن ، بەڕاستی خوای تعالی كارو فەرمانی خۆی بەئەنجام دەگەيێنێ ، كەسيش ناتوانی فەرمانی خوای تعالی بگۆڕێ يا هەڵيوەشێنێتەوە ، هيچ بەرگری كارێكيش نی يه بۆ فەرمانی خوا ٠ وبالله التوفيق ٠

فەرمايشتی پێغەمبەری خوا ﷺ : ( وماؤها شفاء للعَيْنِ ) واته : ئاوەكەی بۆ چاو شيفايه ، به سێ گوفتار لێكدراوەتەوە :

يەكەميان : ئاوەكەی تێكەڵ بەدەرمانی تر دەكرێت كه چاوی پێ چارەسەر دەكرێت ، نەك خۆی بەتەنها بەكاربێت ، ئەمه بۆچۆنی ( أبوعبيد )ە ٠

دووەم : بەپوختی بەكاردەهێنرێت پاش برژاندنی و ، دلۆپاندنی ئاوەكەی ، چونكه ئاگر نەرمونيانی دەكات و پێی دەگەيەنێت و ، تەڕی و پاشەڕۆو زيانبەخشەكانی دەتوێنێتەوەو ، تەنها سوودەكانی دەمێنێتەوە ٠

سێ یەم : مەبەست بەئاوەکەی ئەو ئاوەیە کە لە ئەنجامی بارانەوە تیایدا دروست دەبێ ، کە بریتیە لە یەکەم دڵۆپەکانی باران کە دادەبەزێتە سەر زەوی ، بۆیە خستنەسەرەکە ( إضافة ) خستنەسەری جووتکردنە ، نەك خستنەسەری بەش ، ئەمەش بۆچۆنی پێشەوا ( ابن الجوزي )یە کە دورترین و لاوازترین بۆچونەکانە٠

گوتراوە : ئەگەر ئاوەکەی بۆ ساردکردنەوەی ئەوەی لە چاودایە بەکارهێنرا ، ئەوا ئاوەکەی بەتەنها خۆی بۆ خۆی شیفایە ، بەڵام ئەگەر بۆ شتی تری جگە لەوە بوو ، ئەوا دەبێ لەگەڵ شتی تردا تێکەڵ بکرێت ٠

( الغافقي ) دەڵێت : ئاوی دوومەڵان چاکترین دەرمانەکانی چاوە ئەگەر لە گەڵ کلدا بشێلدرێت و چاوی پێ برێژرێت ، پێڵوەکانی چاو بەهێز دەکات و ، ڕوحە بینەرەکە زیادو بەهێزو تیژ دەکات و ، دابەزینی نەخۆشیەکانی لێ دوردەخاتەوە ٠

كَبَاث([٥٧٥]) في الصحيحين : من حديث جابر بن عبدالله _ رضي الله عنه _ ، قال : كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نَجْنِي الْكَبَاثَ ، فَقَالَ : (( عَلَيْكُمْ بِالأَسْوَدِ مِنْهُ ، فَإِنَّهُ طَيِّبُه ))([٥٧٦]).

واتە : لە ( جابر )ی کوڕی ( عبدالله )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ پێکەوە ( الكَبَاثُ )مان لێدەکردەوە ، ئەوەبوو فەرمووی : (( ڕەشەکەی لێکەنەوە ، چونکە بەلەزەترو بەسوودترە )) ٠

---

[٥٧٥] _ كَبَاثٌ : بەروبومی پێگەیوی درەختی ( الآراك )ە ، لە هەنجیر دەچێت و مرۆڤ و ئاژەڵیش دەیخۆن ، بڕوانە : صحيح البخاري بتحقيق مصطفى ديب ، ج٣ ٠
دەنکی بەری ئەم درەختە کەمێك لە دەنکی کوزبورە گەورەترە ، بڕوانە : قاموسی ڕستە ، مەلا محمودی کەلالەی ، وەرگێڕ٠

[٥٧٦] _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ٩ / ٤٩٨ ) ، ومسلم ( ٢٠٥٠ ) ٠

( الكَبَاثُ ) ، بفتح الكاف ، والباء الموحدة المخففة ، والثاء المثلثة ؛ بەروبومی درەختی ( الآراك )ە . لە خاكی وەڵاتی حیجازدا زۆرەو ، میزاجی گەرمی ووشكە ، سوودەكانی وەكو سوودەكانی ( الآراك )ە : گەدە بەهێز دەكات ، هەرس كردن چاك دەكات ، بەڵغەم پاك دەكاتەوە ، بۆ ئازارەكانی پشت بەسوودە ، زۆرێك لە نەخۆشیەكانی تر .

( ابن جُلجُل ) دەڵێت : ئەگەر ئاردەكەی بخورێتەوە ، میزهێنەرەو ، میزڵدان پاك دەكاتەوە ، ( ابن رضوان ) دەڵێت : گەدە بەهێز دەكات و ، سروشت ڕادەگرێت .

كَتَمْ : روى البخاريُّ في صحيحه : عن عثمان بن عبدالله بن مَوْهَب ، قال : دخلنا على أُمِّ سَلَمة _ رضي الله عنها _ ، فأخرجت إلينا شعراً من شعر رسول الله ﷺ مخضوبٌ بالحِنَّاء والكَتَمِ([577]).

واتە : لە ( عثمان )ی كوڕی ( عبدالله )ی كوڕی ( مَوْهَب )ەوە ، فەرموویەتی : چوینە دیدەنی ( أُمِّ سَلَمة ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ ئەوەبوو تاڵە موویەكی لە پرچی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ دەرهێناین بە خەنەو ( الكَتَم ) ڕەنگ كرابوو .

وفي السنن الأربعة : عن النبيِّ ﷺ أنَّه قال : (( إنَّ أحسنَ ما غيَّرْتُم به الشَّيبَ الحِنَّاءُ والكَتَمُ ))([578]).

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( چاكترین شتێك سەرسپی بوونی پێ بگۆڕن خەنەو ( الكَتَم )ە )) .

[577] _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٦ / ٢٩٦ ، ٣١٩ ، ٣٢٢ ) ، والبخاري ( ٧ / ٢٠٧ ) ، وابن ماجة ( ٣٦٢٣ ) كلهم من طريق عثمان بن عبدالله بن موهب عن أم سلمة فذكرته .

[578] _ إسناده صحيح : أخرجه أحمد ( ٥ / ١٤٧ ) ، وصححه الألباني في صحيح الجامع ( ١٥٤٦ ) .

له ( الصحيحين )دا : له ( أنس )ەوه _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : ( أبـابكر ) _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ به خەنەو ( الكَتَم ) ڕەنگى دەكرد ٠

وفي سنن أبي داود : عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ _ رضي الله عنهما _ قَالَ : مَرَّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ رَجُلٌ قَدْ خَضَبَ بِالْحِنَّاءِ ، فَقَالَ : (( مَا أَحْسَنَ هَذَا ؟ )) ، فَمَرَّ آخَرُ قَدْ خَضَبَ بِالْحِنَّاءِ وَالْكَتَمِ ، فَقَالَ : (( هَذَا أَحْسَنُ مِنْ هَذَا )) ، فَمَرَّ آخَرُ قَدْ خَضَبَ بِالصُّفْرَةِ ، فَقَالَ : (( هَذَا أَحْسَنُ مِنْ هَذَا كُلِّهِ ))([٥٧٩]).

واته : له ( ابن عباس )ەوه _ خوا له خۆى وباب‌يشى ڕازى بێت _ فەرموويەتى : پياوێك بەلاى پێغەمبەرى خوادا ﷺ تێپەڕبوو سەرى بەخەنه ڕەنگ كردبوو ، فەرمووى : (( ئەمە چەند چاكە ، )) ، يەكێكى تر تێپەڕبوو سەرى به خەنەو ( الكَتَم ) ڕەنگ كردبوو ، فەرمووى : (( ئەمە له ئەمە چاكترە )) ، يەكێكى تر تێپەڕبوو سەرى به زەرد سەرى ڕەنگ كردبوو ، ئەوەبوو فەرمووى (( ئەمە له هەمووى چاكترە )) ٠

( الغافقي ) دەڵێت : ( الكَتَم ) ڕووەكێكە لە دەشتەكاندا دەڕوێت ، گەڵاكانى نزيك بە گەڵاى زەيتونە ، له باڵا زياتر بەرز دەبێتەوە ، بەرێكى هەيە لەبەرى بيبەر ( الفُلفُل ) دەچێت ، ناوكى له نێودايە ، ئەگەر بكوترێت ڕەش دەبێتەوە ، ئەگەر گوشراوى گەڵاكەى دەربهێنرێت و ، به ئەندازەى ( أُوقية )يەكى([٥٨٠]) لىٚ بخورێتەوە ، بەهێز دەڕشێنێتەوەو ، بۆ گەزستنى سەگيش بەسوود دەبىٚ ٠ بنەڕەتەكەشى ئەگەر له گەڵ ئاودا بكوڵێندرێت دەبىٚ به مەرەكەب و بۆ نووسين بەكاردێت ٠

[٥٧٩] _ إسناده ضعيف : أخرجه أبوداود ( ٤٢١١ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف أبي داود ( ٩٠٢ ) ٠

[٥٨٠] _ أُوقية : كێشى ( ١١٩ ) غەرام زيوە ، بڕوانە : فتاوى الشبكة الإسلامية بإشراف د ٠ عبدالله الفقيه ، ٢٦٦٧٥ تحديد الأوزان والمكاييل ، وەرگێڕ ٠

( الكِنـدي ) دەڵێـت : تـۆوی ( الكَـتَم ) ئەگـەر بـۆ ڕەشـتنی چـاو بـەکاربهێنرێت ، ئـاوی دروستبوو لە چاودا شیی دەکاتەوەو چاکی دەکاتەوە ٠

هەندێ خەڵك واتێگەشتوون ( الكَتَم ) وەسمەیە ، کە بە گەڵای نیل ناودەبرێت ، ئەمە بۆچونێکی هەڵەیە ، چونکە وەسمە ڕووەکێکی دیکەیەو ( الكَتَم ) نی یە ٠ دانەری ( الصحاح ) دەڵێت : ( الكَتَم ) بالتحريك : ڕووەکێکە تێکەڵ بە وەسمە دەکرێت و بۆ ڕەنگکردنی پرچ بەکاردێت ٠ گوتراوە : وەسمە ڕووەکێکە گەڵایەکی درێژی هەیەو ڕەنگی مەیلەو شینەو لە گەڵای درەختی بیی ( شجر الخلاف ) گەورەترەو ، لە گەڵای لوبیا دەچێت و ، لەو گەورەترە ، لە وەڵاتەکانی حیجازو یەمەنەوە دەهێنرێت ٠

فإن قيل : قد ثبت في الصحيح عن أنس _ رضي الله عنه _ أنه قال : لم يختضب النبي ﷺ ([٥٨١]).واتە : ئەگەر گوترا : بە ( صحیح )ی لە ( أنس )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺپرچی ڕەنگ نەدەکرد ٠

دەگوترێت : پێشەوا ( أحمد )ی کوڕی ( حنبل ) وەڵامی ئەمەی داوەتەوەو فەرموویەتی : کەسانی دیکەی جگە لە ( أنس ) شایەتیان داوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ پرچی ڕەنگ دەکرد ٠ وە ئەو کەسەی بینیویەتی لە پلەی ئەو کەسەدا نی یە کەوا نەیبینیوە ، بەڵکو پلەکەی بەرزترە ، پێشەوا ( أحمد )ی کوڕی ( حنبل ) جێگیری دەکات کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ پرچی ڕەنگ دەکرد ، کۆمەڵێکی تری فەرموودەناسانیشی لە گەڵدایە ، بەڵام ئیمامی ( مالك ) نکۆڵیی لێ کردووە ٠

فإن قيل : قد ثبت في صحيح مسلم النهي عن الخِضاب بالسواد في شأن أبي قُحافةَ لَّما أُتيَ به ورأسُه ولحيتُه كالثَّغامة بياضاً ٠ فقال : (( غَيِّروا هذا الشَّيبَ وجَنِّبُوهُ السَّواد ))([٥٨٢]) ٠ والكَتَمُ يُسَوِّد الشعرَ

---

[٥٨١] _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ٢١٦ ، ٢٦٦ ) ، ومسلم ( ٧ / ٨٥ ) ، والنسائي ( ٨ / ١٤١ ) كلهم من طريق المثني بن سعيد ، عن قتادة ، عن أنس فذكره ٠

واته : ئەگەر گوترا : له ( صحيح )ی ئیمامی ( مسلم )دا قەدەغەکردنی ڕەنگ کردن بەڕەش جێگیربووە سەبارەت بە ( أبي قُحافةَ ) کاتێ هێنرایە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و سەری و ڕیشی وەکو درەختی ( الثغامة ) سپی بوو ٠ ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ئەم سپێتیە بگۆڕن بە ڕەنگێکی ترو ، بەدوریشی بگرن لە ڕەنگی ڕەش )) ٠ ( الکَتَمُ )یش پرچ ڕەش دەکات ٠

وەڵامی ئەمە بەدوو ڕوو دەدرێتەوە :

یەکەمیان : قەدەغەکردنەکە بۆ ڕەشکردنی پەتیە ، بەڵام ئەگەر خەنەکە شتێکی تری تێکەڵ کرا ، وەکو ( الکَتَمُ )و بەو هاوشێوانە ، ئەوا هیچی تێدا نی یە ، چونکە خەنەو ( الکَتَمُ ) ڕەنگێك بەپرچ دەبەخشن لە نێوان سورو ڕەشدایە بەپێچەوانەی وەسمە ، کە ڕەنگێکی ڕەشی خەڵووزی بەپرچ دەبەخشێ ، ئەمە ڕاسترینی هەردوو وەڵامەکەیە ٠

وەڵامی دووەم : ئەو ڕەنگ کردن بەڕەشەی قەدەغەکراوە ڕەنگ کردنی گزی و فێڵە ، وەکو ئەوەی کچ و کەنیزەك و ، ژنی بەتەمەن ، مێردو گەورەکەی هەڵدەخەڵەتێنێ ، سەر ڕەنگ کردنی پیاوی بەتەمەن بۆ ئەوەی ژنی پێ هەڵخەڵەتێنێ ، هەموو ئەمانە گزی و فێڵ و هەڵخەڵەتاندنە ، بەڵام ئەگەر مەبەست بەپرچ ڕەنگ کردنەکە گزی و فێڵ و هەڵخەڵەتاندن نەبوو ، ئەوا بە ( صحیح )ی لە پێشەوایانمان ( الحسن ) و ( الحسین )ەوە _ خوایان لێ ڕازی بێت _ دەگێڕنەوە کەوا پرچیان بەڕەش ڕەنگ کردووە ، ئەم گوفتارە پێشەوا ( ابن جریر ) لە کتێبی ( تهذیب الأثار )دا باسی کردووە ، هەروەها لە ( عثمان )ی کوڕی ( عفان )و ، ( عبدالله )ی کوڕی ( جعفر )و ، ( سعد )ی کوڕی ( أبي وقاص )و ، ( عُقبةَ )ی کوڕی ( عامر )و ، ( المغیرة )ی کوڕی ( شعبة )و ، ( جریر )ی کوڕی ( عبدالله )و ، ( عمرو )ی کوڕی ( عاص )ەوە باسی کردووە ٠

---

٥٨٢ _ صحيح : أخرجه مسلم ( ٢١٠٢ ) ٠

هەروەها لە کۆمەڵێك لە ( التابعين )ەوە باسی دەکات وەکو ، ( عمرو )ی کوڕی ( عثمان )و ، ( علي ) کوڕی ( عبدالله )ی کوڕی ( عباس )و ، ( أبوسلمة )ی کوڕی ( عبدالرحمن )و ، ( عبدالرحمن )ی کوڕی ( الأسود )و ، ( موسى )ی کوڕی ( طلحة )و ، ( الزُّهْري )و ، ( أيوب )و ، ( إسماعيل )ی کوڕی ( معدي كرب )ەوە ٠

هەروەها پێشەوا ( ابن الجوزي ) لە ( محارب )ی کوڕی ( دِثار )و ، ( يزيد )و ، ( ابن جريج )و ، ( أبي يوسف )و ، ( أبي إسحاق )و ، ( ابن أبي ليلى )و ، ( زياد )ی کوڕی ( عَلاقة )و ، ( غيلان )ی کوڕی ( جامع )و ، ( نافع )ی کوڕی ( ابن جُبير )و ، ( عمرو )ی کوڕی ( علي المُقَدَّمي )و ، ( القاسم )ی کوڕی ( سلام )ەوە باسی دەکات ٠

كَرْمٌ ، درەختی ترێ ، کە لە زمانی عەرەبیدا بە ( الحَبَلَةُ )ش ناودەبرێت واتە : مێو ، ( مکروه )یشە بە ( الكَرْمُ ) ناوبرێت ، لەبەر ئەو فەرموودەیەی ئیمامی ( مسلم ) لە ( صحيح )ەکەیدا دەیگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( لا يقولَنَّ أحدُكم للعِنَبِ الكَرْمَ ، الكَرْمُ : الرَّجُلُ المُسْلِمُ )) ٠ وفي رواية : (( إنَّما الكَرْمُ قَلبُ المُؤْمن )) ، وفي أخرى : (( لا تقولوا : الكُرمُ ، وقُولُوا : العِنَبَ والحَبَلَةُ ))([583])

واتە : (( با هيچ کەس بە ترێ نەڵێ ( الكَرْمُ ) ، ( الكَرْمُ ) پیاوی موسڵمانە )) ٠ لە ( ريوايە )تێکی تردا : (( لە ڕاستیدا ( الكَرْمُ ) دڵی باوەڕدارە )) ، لە ( ريوايە )تێکی تردا : (( مەڵێن : ( الكَرْمُ ) ٠ بڵێن : ترێ و مێو )) ٠

دوو ماناش لەمەدا بەدیدەکرێت :

یەکەمیان : عەرەب درەختی ترێی بە ( الكَرْمُ ) ناودەبرد واتە : ڕێزدار ، بەهۆی زۆری سوودو کەڵك و خێرییەوە ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ناقایل بوو بەناوێك ناوبرێت نەفسەکان

[583] _ صحيح : أخرجه مسلم ( ٧ / ٤٦ ) عن أبي هريرة فرفعه ٠

بجولێنێت بۆ خۆشویستنی و خۆشویستنی ئەو شەرابە سەرخۆشکارەی لێی دروست دەکرێت ، کە دایکی هەموو پیسیەکانە ، بۆیە ناقایل بوو بنەڕەتی بە چاکترین ناو " کە لە هەموو ناوێکی تر کۆکاری خەیرە " ناوبرێت ٠

دووەم : ئەمە دەکەوێتە چوارچێوەی فەرمایشتی پێغەمبەری خواوە ﷺ : (( لَيْسَ الشَّدِيدُ بِالصُّرَعَةِ ))([584]) واتە : (( بەهێزی ڕاست ئەو پیاوە نی یە کە سەردەکەوێ و پیاوان دەدا بە زەویدا )) ٠ هەروەها دەچێتە چوارچێوەی فەرمایشتی پێغەمبەری خواوە ﷺ : (( لَيْسَ المِسْكِينُ بِالطَّوَّافِ ))([585]) (( ئەو کەسەی بەسەرتاندا دەگەڕێت دەستکورتی ڕاست نی یە )) ٠ واتە : ئێوە درەختی ترێ بە( الكَرْمُ ) ناودەبن لەبەر سوودە زۆرەکانی ، بەڵام دڵی بڕوادار یاخود پیاوی موسڵمان لە درەختی ترێ بەم ناوە شایستەترە ، چونکە بڕوادار هەرهەمووی خێرو کەڵکە ، هەموو ئەمانە دەچێتە چوارچێوەی ئاگادارکردنەوەو ناساندن بەو خێرو ، بەخشین و ، باوەڕو ، نورو ، ڕێنمووی و ، لەخوا ترسان و ، سیفاتانەی لە دڵی باوەرداردایەو ، بەهۆیە شایستە دەبێ بەم ناوە ، زیاتر لە شایستەبوونی مێو بەم ناوە ٠

پاشان ٠ هێزی مێو ساردی ووشکە ، گەڵاو خۆ هەڵواسەکانی ساردکارە لە کۆتای پلە یەکدا ، ئەگەر بکوترێت و پێچەرێکی ( ضماد )ێکی لێ دروست بکرێت سەر ئێشەو ، ئاوسانە گەرمەکان و ، هەڵئاوسانی گەدە ئارام دەکاتەوە ، گوشراوی لقەکانی ئەگەر بخورێتەوە ڕشانەوە ئارام دەکاتەوەو ، سك دەگرێتەوە ، هەروەها ناوەڕۆکە تەڕەکەی و ، گوشراوی گەڵاکانی ، بۆ برینی ڕیخۆڵە بەسوودەو ، خوێن و کێماو دەردەدات و ، ئازاری گەدە ناهێڵێت ٠ ئەو ئاوە فرمێسکیەی کەبەسەر لقەکانیەوە هەڵگیراوەو ، وەکو کەتیرەیە ئەگەر بخورێتەوە بەرد دەکاتە دەرەوە ، ئەگەر نەخۆشیەکانی ووشك هەڵاتووی و قلێشانی پێست و نەمانی موو

---

[584] ــ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ١٠ / ٤٣١ ) ، ومسلم ( ٢٦٠٩ ) ٠

[585] ــ صحيح : أخرجه مالك في موطئه ( ٥٧٥ ) ، والبخاري ( ٢ / ١٥٤ ) ، ومسلم ( ٣ / ٩٥ ) ، والنسائي ( ٥ / ٨٥ ) كلهم من طريق أبي الزناد عن الأعرج عن أبي هريرة فذكره مرفوعاً .

بەسەریەوەو ، گەڕی و نەخۆشیەکانی تری تێهەڵسوێنرێت چاکیان دەکاتەوە ، بەڵام پێش بەکارهێنان پێویستە ئەندامەکە بە ئاو و ( النطرون ) بشۆردرێت ، ئەگەر لە گەڵ زەیتی زەیتوندا شوێنە تووکنەکانی جەستەی پێ بسڕێت دەیتاشێت و لایدەبات ، خۆڵەمێشی لقەکانی ئەگەر لە گەڵ سرکەو ڕۆنی گوڵ و( دهن الورد ) سپەندا ( سذاب ) پێچەرێکی ( ضماد ) لێ دروست بکرێت ئەوا بۆ ئەو ئاوسانانەی تووشی سپڵ دەبێ بەسوودە ، هێزی ڕۆنی گوڵی مێو ( دهن زهرة الكرم ) قبزکارەو لە هێزی ڕۆنی گوڵ ( دهن الورد ) دەچێت ، سوودو کەڵکەکانی ئەمەندە زۆرن نزیك بە سوودەکانی دارەخورمایە ٠

<u>كَرَفْس</u> ، کەرەوز : لە فەرموودەیەکدا کە ( صحيح ) نی یە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( مَن أكَلَهُ ثم نامَ عليه ، نام ونَكْهتُهُ طَيِّبَةٌ ، وينامُ آمناً من وَجَعِ الأضراسِ والأسنانِ )) واتە : (( ئەگەر هەرکەس خواردی و پاشان نووست ، دەنوێت و بۆنی خۆشەو ، دەنوێت و بێوەی دەبێ لە ئازاری ددانە خڕێکان و ددان )) ٠ ئەم فەرموودە پوچەو بەدەمی پێغەمبەری خواوە ﷺ هەڵبەستراوە ،

بەڵام جۆرە ( البُسْتانيُّ )کەی زۆر بۆن خۆش دەکات ، ئەگەر بنەڕەتی بەملەوە هەڵواسرێت بۆ ئازاری ددان بەسوودە ٠

کەرەوز گەرمی ووشکە ، گووتراوە : تەڕو شێدارەو کونیلە داخراوەکانی ( سُداد ) جگەرو سپڵ دەکاتەوە میزهێنەرە ، خوێنی بێنوێژی هێنەرە ، بەرد وورد دەکات و ، تۆوەکەشی لەو بارەوە بەهێزترە ، ئارەزووی جوتبوون دەوروژێنێت ، بۆ نەهێشتنی هەموو بۆنێکی ناخۆش بەسوودە ٠ ( الرازيُّ ) دەڵێت : پێویستە نەخورێت ئەگەر ترسی پێوەدانی دووپشك لە ئارادابوو ٠

<u>كُرَّاثٌ</u> ، کەوەر : فەرموودەیەکی لەبارەوە هاتووە ( صحيح ) نی یەو بەدەمی پێغەمبەری خواوە هەڵبەستراوەو پووچە : (( مَن أكَلَ الكُرَّاث ثم نامَ عليه نام آمناً مِنْ ريح البَوَاسيرِ واعتَزَلَهُ

الملَكُ لِنَتَنِ نَكْهَتِه حتـى يُصْبحَ )) واتـه : (( هەركـەس كـەوەر بخـوات و پاشـان بنـوێ بێـوەی دەبێ لە بای مایەسیری و پەریەکەش لێ دور دەکەوێتەوە تا ڕۆژ دەکاتەوە )) ٠

**کەوەر دوو جۆرە :**

( النَبَطيُّ ) : ئەو جۆرەیە کە لە سوفرە دادەنرێت ٠

( الشـاميُّ ) : ئەوەیـە کـە سـەری هەیـە، گەرمـەو ووشـکەو سەردەئێشـێنێت ، ئەگـەر بکوڵێندرێت و بخورێت ، یاخود ئاوەکەی بخورێتەوە ، بۆ مایەسیری سارد بەسوودە ، ئەگەر تۆوەکەی بهاڕدرێت و ، لە گەڵ ( القطران )([٥٨٦]) بشـێلدرێت و ، بۆن و هەڵمەکـەی بـدرێ لـەو ددانانەی کرمی تێدایە بڵاوی دەکاتەوەو دەردیدەهێنێت و ، ئازارە کاتیەکەی دادەمرکێنێتـەوە ، ئەگەر دوکەڵی تۆوەکەی لە کۆم بدرێ مایەسیریەکەی سووك دەبێتـەوە ، هـەموو ئەمانـە لـە کەوری ( النَبَطيُّ )دایە ٠

لە گەڵ ئەمەشدا ددان و پۆك خراپ دەکات و ، سەر دەئێشێنێت و ، خەونگـەلێکی نـاخۆش بۆ مرۆڤ دروست دەکات و ، چاو تاریـك دەکـات و ، بـۆنی دەم نـاخۆش دەکـات ، بـەڵام میـزو بێنوێژی زیاد دەکات ، ئارەزووی جوتبوون زیاد دەکات ، بەڵام درەنگ هەرسە.

**پیتی لام ( ل ) :**

لَحْمٌ ، گۆشت : خوای تعالی دەفەرمێت : ﴿ وَأَمْدَدْنَاهُمْ بِفَاكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِمَّا يَشْتَهُونَ ﴾[ الطور : ٢٢ ] واتە : ﴿ وَأَمْدَدْنَاهُمْ بِفَاكِهَةٍ وَلَحْمٍ ﴾ وە بەردەوام هەموو جۆرە میوەو گۆشـتێکیان پـێ دەدەن ﴿ مِمَّا يَشْتَهُونَ ﴾ لەوەی ئارەزووی دەکـەن ٠ هـەروەها خـوای تعـالی دەفـەرمێت : ﴿

[٥٨٦] ـ القطران : گوشراوی دوو درەختی ( الأرز ) و ( الأبهل )ە ، یاخود مادەیەکی ڕەش و لینج و شلەمەنیە لە درەخت و خەڵوزو شتی وا دەردەهێنرا ، بروانە : لسان العرب ، وەرگێڕ ٠

وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴾[ الواقعة : ٢١ ] واتـه : وه گۆشـتى هـەر باڵندەيـەك كـە حـەزى لـىٚ بكەن[٥٨٧] .

وفي سنن ابن ماجة من حديث أبي الدرداء ، عن رسول الله ﷺ: (( سَيِّدُ طَعامِ أهْلِ الدُّنيا وأهْلِ الجَنَّةِ اللَّحمُ ))[٥٨٨] .

واته : پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى : (( سەرگەورەى خۆراكى خەڵكى دونياو خەڵكى بەهەشت گۆشتە )) .

ومن حديث بُريدةَ يرفعه : (( خَيْرُ الإدامِ في الدُّنيا والآخِرةِ اللَّحْمُ ))[٥٨٩] .

واتـە : ( بُريـدة ) _ خـواى لـىٚ ڕازى بێـت _ لـە فەرموودەيەكدا كـە بـەرزى دەكاتـەوە بۆ پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى : (( خێردارترين پێخۆرى دونياو ڕۆژى دواى گۆشتە )) .

وفي الصحيح عنه ﷺ (( فضلُ عائشةَ على النِّساءِ كفضلِ الثَّريدِ على سائرِ الطَّعَامِ ))[٥٩٠] .

(( بەڕاستى ڕێزى ( عائشة ) بەسەر ژنانى ديكەدا ، وەكو ڕێزى شلەبەگۆشتە بەسەر خواردنەكانى تردا )) .

( الثريد ) واته : نان و گۆشته . شاعير دەڵێت :

ذَا مـــــا الخُبْزُ تَـــــــأدُمهُ بِلَحْـــمٍ        فَـــــــذَاكَ أمَـــــانةَ اللهِ الثَرِيدُ

واته :

ئەگەر نان پێخۆرەكەى بكـەى بە گۆشت        باشەو ئەمانەتى خواش شلەبەگۆشـتـە

---

٥٨٧ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەى تەفسيرى قورئان .

٥٨٨ _ إسناده ضعيف جداً : أخرجه ابن ماجة ( ٣٢٠٥ ) ، وانظر الضعيفة ( ٣٧٢٤ ) .

٥٨٩ _ ضعيف جداً : أورده الألباني في ضعيف الجامع ( ٢٨٧٩ ) وقال : ضعيف جداً ، وعزاه السيوطي إلى البيهقي في الشعب عن أنس ، وانظر الضعيفة ( ٢٥٧٤ ) .

٥٩٠ _ سبق تخريجه .

پێشەوا ( الزُّهْري ) دەفەرمێت : خواردنی گۆشت حەفتا هێز زیاد دەكات ، ( محمد )ی كوڕی ( واسع ) دەڵێت : گۆشت هێزی چاو زیاد دەكات ، لە ( علي ) كوڕی ( أبي طالب )ەوە _ خوای لێ رازی بێت _ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : گۆشت بخۆن ، بەڕاستی ڕەنگ ساف دەكات و ، سك خاڵی دەكاتەوەو ، ڕەوشت جوان دەكاتەوە ، ( نافع ) دەفەرمێت : ئەگەر مانگی ڕەمەزان بهاتایە ( ابن عمر ) گۆشتی لە دەست نەدەچوو ، ئەگەر سەفەریشی بكردایە دیسان گۆشتی لەدەست نەدەچوو · لە ( علي )ەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی : هەركەس چل ڕۆژ گۆشت نەخوات ڕەوشتی خراپ دەبێت ·

بەڵام فەرموودەكەی خاتوو ( عائشة ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ ، كە ئیمامی ( أبوداود ) بە ( مرفوع )ی دەیگێڕێتەوە : (( لا تَقْطَعَوا اللَّحْمَ بالسكّين ، فإنه من صَنيعِ الأعَاجِم ، وانْهشُوهُ ، فإنه أهْنَأ وأمرأُ ))([591]) واتە : (( گۆشت بە چەقۆ لەت مەكەن ، چونكە لە كردەوەی عەجەمەكانە ، بەڵكو قەپێ پێدابكەن ، چونكە خۆشترو بەتامترە )) · ئیمامی ( أحمد ) بەدوو فەرموودەی ( صحيح ) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ كە تیایدا هاتووە كەوا گۆشتی بەچەقۆ لەت كردووە بەرپەرچی فەرموودەكەی سەرەوە دەداتەوە ، كە پێشتر باسمان كردووە ·

گۆشتیش چەندین ڕەگەزو جۆرە دەگۆڕێت بە جیاوازی بنچینەو سروشتی گۆشتەكە ، ئێمەش حوكمی هەر ڕەگەزو جۆرێك لە گەڵ سروشت و سوودو زیانەكانیدا ڕوون دەكەینەوە.

لحمُ الضأن ، گۆشتی خوریدار ( مەڕو بەران ) : گەرمە لە دووەمدا ، تەڕوشێدارە لە یەكەمدا ، چاكترینی ئەوەیە ساڵێكی تەواو كردبێ ، خوێنێكی ستایشكراوی بەهێز دروست دەكات بۆ ئەو كەسانەی بەباشی هەرسی دەكەن ، بۆ كەسانی خاوەن میزاجی ساردی مامناوەند چاكە ، هەروەها بۆ وەرزشكارانی تەواو لە جێگەو وەرزە ساردەكاندا بەسوودە ،

[591] _ سبق تخريجه ·

بۆ كەسانى خاوەن ( المرّة السوداء ) بەسوودە ، بیرو هزرو توانای لەبەرکردن بەهێز دەکات ، گۆشتی مەڕی زۆر پیرو لاوازو خراپە ، هەروەها گۆشتی مێینەش ( النِّعاج ) ، بەڵام چاکترینی : گۆشتی نێری ڕەشە ، چونکە سووکترو بەلەزەترو بەسوودترە ، ( الخصيُّ ) گوونەکانیشی بەسوودترو چاکترە ، ئاژەڵی سووری قەڵەو سووکترەو خۆراکێکی چاکیشە ، بزنی دوو ساڵە خۆراکێکی کەم سوود دەبەخشێت و ، سەر گەدەش دەکەوێت ٠

چاکترین گۆشتیش ئەو گۆشتەیە کە بە ئێسکەوەیە ، لای ڕاست لە لای چەپ سووکترو چاکترە ، بەشی پێشەوە لە بەشی دواوە چاکترە ، خۆشترین گۆشتی مەڕ بەلای پێغەمبەری خواوە ﷺ بەشی پێشەوەی بوو ، بەشی پێشەوەی مەڕ جگە لە سەر لە بەشی دواوە سووکترو چاکترە ، ( الفرزدق ) پارەی دایە پیاوێك گۆشتی بۆ بکڕێت و پێی گووت : بەشی پێشەوە بکڕەو ، دورکەوەرەوە لە سەرو سك ، چونکە نەخۆشیان تێدایە ٠

گۆشتی مل چاك و بەلەزەتە ، سووك و خێرا هەرسە ، گۆشتی دەست سووکترین و بەلەزەترین و نەرم و نیانترین گۆشتەو لەهەمووشی لە زیانەوە دورترە ، لەهەمووشی خێرا هەرسترە ٠

وفي الصحيحين : أنه كان يُعجِب رسول الله ﷺ[٥٩٢] ) ٠
واتە : لە ( الصحيحين )دا هاتووە : پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی لێبوو ٠

گۆشتی پشت خۆراکێکی زۆری تێدایە ، خوێنێکی ستایشکراو دروست دەکات ، وفي سنن ابن ماجة مرفوعاً : (( أَطْيَبُ اللَّحْمِ لَحْمُ الظَّهْرِ ))([٥٩٣]) ٠
واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( خۆشترین گۆشت گۆشتی پشتە )) ٠

---

٥٩٢ _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٤ / ١٦٣ ، ١٧٢ ) ، ( ٦ / ١٠٥ ) ، ومسلم ( ١ / ١٢٧ ، ١٢٩ ) كلاهما عن أبي هريرة فذكره في حديث طويل ٠

٥٩٣ _ إسناده ضعيف : أخرجه ابن ماجة ( ٣٣٠٨ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف ابن ماجة (٧١٦ ) ٠

لحمُ المَعْز • گۆشتی بزن : گەرمیی کەمە ، ووشکە ، ئەو تێکەڵاوەی لێوە دروست دەبێ باش نی یەو هەرسکردنیشی چاك نی یە ، خۆراکێکی ستایشکراو نی یە ، گۆشتی سابرێن خراپە بەڕەهایی ، زۆر ووشکە ، بەد هەرسە ، خەڵتەی ( السوداوي ) دروست دەکات ٠

( الجاحظ ) دەڵێت : پزیشکێکی بەڕێز پێی گووتم : ئەی ( أبا عثمان ) دورکەوەرەوە لە گۆشتی بزن ، چونکە خەم و خەفەت دروست دەکات ، ( السوداء ) دەجوڵێنێت ، لەبیرچوونەوە دروست دەکات ، خوێن خراپ دەکات ، سوێند بەخوا مندالّ شێت دەکات ٠

هەندێ لە پزیشکان گووتویانە : لە ڕاستیدا ئەوەی زەم دەکرێت گۆشتی بزنی پیرە ، بەتایبەت بۆ بەساڵاچووان ، هیچ خراپیەکی تێدا نی یە بۆ ئەوانەی پێی ڕاهاتوون ، ( جالینوس ) بزنی یەك ساڵەی بە خۆراکە مامناوەندە ڕێکخەرەکانی کیمۆسی ستایشکراو داناوە ، مێینەشی لە نێرینە باشترە ٠

وقد روى النسائي في سننه : عن النبيِّ ﷺ: (( أحْسِنوا إلى الماعِزِ وأمِيطُوا عنها الأذى ، فإنها من دواب الجنَّةِ )) وفي ثبوت هذا الحديث نظرٌ • واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( چاکەکاربن لە گەڵ بزنداو ، پیسی لێ دوربخەنەوە ، چونکە لە گیاندارانی بەهەشتە )) ٠ پێشەوا _ ابن القيم _ دەفەرمێت : بەڵام جێگیربوونی ئەم فەرموودە جێگەی تێڕوانینە ٠

پزیشکان حومی زیانبەخشینیان داوە بەسەر گۆشتی بزندا بە جوزئی نەك بە گشتی ، ئەمەش بەگوێرەی گەدەی لاوازو ، میزاجی لاوازە کە پێی ڕانەهاتوون و ، بە خۆراکی مام ناوەندی چاکی نەرم و نیان ڕاهاتوون ، ئەوانەش خەڵکانی خۆشگوزەرانن لە خەڵکی شاران ، کە کەمێکی خەڵکن ٠

لحمُ الجَدْي • گۆشتی کاریلە : نزیکی مامناوەندە ، بەتایبەت تاوەکو شیرەخۆرە بێت ، بەو مەرجەی بەم نزیکانە لە دایك نەبوبێت ، خێرا هەرس دەبێ بەهۆی هێزی ئەو شیرەوە کە

تيايدايە ، خوو نەرم ونيان دەكاتەوە ، گونجاوى زۆربەى خەلكە لە زۆربەى باروحالەكاندا ، لە گۆشتى ووشتر نەرم ونيانترە ، خوێنێكى مام ناوەند دروست دەكات ·

لحم البَقَر « گۆشتى مانگا : ساردى ووشكە ، درەنگ هەرسە ، بەهێواشى لە گەدە ليژ دەبێتەوە ، خوێنێكى ( سوداوي ) دروست دەكات ، باش نى يە تەنها بۆ ئەو كەسانە نەبێ كە ماندووبوون و هيلاكيەكى زۆر دەكێشن ، زۆر خواردنى نەخۆشيە ( سوداوي )كانى ، وەكو بەلەكى و گەڕى و ، ووشك هەلاتووى و قلێشانى پيست و نەمانى تووك بەسەريەوەو گولى و ، ئاوسانى دەست و پێ و ، سەرەتان و ، دودلێى و ، تاى چواربەڕۆو ، زۆرێك لە ئاوسانەكان دروست دەكات ، ئەمە بۆ ئەو كەسانەى پێى ڕانەهاتوون ، يا زيانى گۆشتەكەيان بە بيبەرو سيرو دارچين و زەنجەفيل و بەو هاوشێوانە لانەبردووە ، بەلام گۆشتى گا ساردیی كەمترەو ، گۆشتى مانگاش ووشكى كەمترە ·

گۆشتى گوێرەكە بەتايبەت قەلەو چاكترين و ناوەنديترين و خۆشترين و بەلەزەترين و ستايشكراوترين گۆشتە ، گۆشتێكى گەرمى تەڕو شێدارە ، ئەگەر بەباشى هەرس بێت خۆراكێكى بەهێز دەبەخشێت ·

لحم الفَرَس « گۆشتى ئەسپ : ثبت في الصحيح عن أسماء _ رضي الله عنها _ ، قالت : نَحرْنا فرساً فأكلناه على عهدِ رسول الله ﷺ ([٥٩٤]).

واتە : لە ( أسماء )ەوە _ خواى لێ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : لە زەمەنى پێغەمبەرى خوادا ﷺ ئەسپێكمان سەبڕى و خواردمان ·

---

[٥٩٤] _ صحيح : أخرجه الحميدي (٣٢٢ ) ، وأحمد ( ٦ / ٣٤٥ ، ٣٤٦ ، ٣٥٣ ) ، وعبد بن حميد ( ١٥٧٣ ) ، والدارمي ( ١٩٩٨ ) ، والبخاري ( ٧ / ١٢١ ، ١٢٣ ) ، ومسلم ( ٦ / ٦٦ ) ، وابن ماجة ( ٣١٩٠ ) ، والنسائي ( ٧ / ٢٢٧ ، ٢٣١ ) كلهم من رواية فاطمة بنت المنذر عن أسماء بنت أبي بكر فذكرته ·

وثبت عنه ﷺ أذن في لحوم الخيل ، ونَهى عن لحوم الحُمُر . أخرجاه في الصحيحين([٥٩٥]).

واته : به ( صحيح )ى له پێغەمبەری خواوه ﷺ هاتووه : كەوا ڕێی داوه به گۆشتی ئەسپ بخورێت و ، خواردنی گۆشتی گوێدرێژی قەدەغە كردووه .

بەڵام ئەو فەرموودەیەی ( المقدام )ی كوڕی ( معدي كرب ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ دەیگێڕێتەوه كه گوایه پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی خواردنی گۆشتی ئەسپی كردووه ( صحيح ) نیه. پێشەوا ( أبو داود )و كەسانی فەرموودەناسی دیكەش ئەمەیان فەرمووه .

كاتێ خوای تعالى له قورئاندا ئەسپ لە گەڵ قاترو گوێدرێژدا جووت دەكات و بەیەكەوه باسیان دەكات ، بەڵگە نی یه لەسەر ئەوەی حوكمی گۆشتی ئەسپ وەكو حوكمی گۆشتی ئەو دوانه بێت به هەر ڕووەیەك بێت ، هەروەها بەڵگە نیه كەوا حوكمی له بەشی دەستكەوتەكانی جەنگدا حوكمی ئەسپ بێت ، خوای تعالى له كاتی باس كردندا جار به جار هاوشێوەكان جووت دەكات و ، جار به جار جیاوازەكان و ، جار به جاریش دژ بەیەكەكان.

خوای تعالى كه له قورئاندا دەفەرمێت ﴿ لِتَرْكَبُوهَا ﴾[ النحل : ٨ ] واته : بۆ ئەوەی سواریان بن([٥٩٦]) ، قەدەغەی خواردنی گۆشتەكەی نەكردووه ، هەروەها قەدەغەی نەكردووه جگە له سواربوون سوودی دیكەی لێ وەرگیرێت ، بەڵكو تەنها باسی بەرێزترین سوودەكانی دەكات ، كه سواربوونه ، هەردوو فەرموودەكەش سەبارەت به حەڵاڵبونی گۆشتی ئەسپ ( صحيح )ن و بەرهەڵستكاریان نی یه . پاشان . گۆشتی ئەسپ گەرمی ووشكه ، چڕو ( سوداويٌّ ) زیانبەخشەو بۆ جەستە نەرم و نیانەكان چاك نی یه .

---

[٥٩٥] _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ٣٦١ ، ٣٨٥ ) ، والدارمي ( ١٩٩٩ ) ، والبخاري ( ٥ / ١٧٣ ) ، ( ٧ / ١٢٣ ) ، ومسلم ( ٦ / ٦٥ ) ، وأبوداود ( ٣٧٨٨ ) ، والنسائي ( ٧ / ٢٠١ ) كلهم من طريق حماد بن زيد عن عمرو بن دينار عن محمد بن علي عن جابر فذكره .

[٥٩٦] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان .

لحم الجَمَل ، گۆشتی ووشتر : جیاوزیەکە لە نێوان ڕێباوەڕەکانی سوونەو شیعەدا ، هەروەها یەکێکە لە جیاوازیەکانی نێوان جولەکەو موسڵمانان · جولەکەو شیعە زەمی دەکەن و نایخۆن ، بەڵام لە ئاینی ئیسلامدا حەڵاڵبونی زانراوەو ، چەندەها جار پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بەڕێز لە ماڵ و لە سەفەریشدا خواردویانە ·

گۆشتی بەچکە ووشتر بەلەزەترین و خۆشترین گۆشتە ، خۆراکێکی بەهێز بەجەستە دەبەخشێت ، بۆ ئەو کەسانەی پێی ڕاهاتوون لە جێگەی گۆشتی خوریدارەکانی وەکو مەڕو بەرانەو هیچ زیانێکیان پێ ناگەیەنێت و ، هیچ نەخۆشیەکیان بۆ دروست ناکات ، لەڕاستیدا هەندێ لە پزیشکان زەمیان کردووە بەتایبەت بۆ خەڵکانی خۆشگوزەران وەکو خەڵکی شاران ئەوانەی پێی ڕانەهاتوون ، چونکە گەرمی و ووشکێتی تیدایە ، ( السَّوداء ) دروست دەکات ، دەرەنگ هەرسە ، هێزێکی ناستایشکراوی تێدایە ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی داوە بەدەستنوێژ گرتن ئەگەر خورا ، ئەوە لە دوو فەرموودەی ( صحیح )دایە کە بەرهەڵستکاریان نی یە ، وە نابێت فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەم بارەوە تەنها بەدەست شتن لێك بدرێتەوە ، چونکە پێچەوانەی دەستنوێژی زانراوە کە باسی دەستنوێژ دەکات ، چونکە جیاوازی کردووە لە نێوان گۆشتی ووشترو گۆشتی مەڕدا ، بۆ گۆشتی مەڕ مرۆڤی سەرپشك کردووە لە نێوان دەستنوێژگرتن و نەگرتنیدا ، بەڵام بۆ گۆشتی ووشتر دەستنوێژگرتنی پێویست کردووە · بۆیە ئەگەر لێرەدا دەستنوێژگرتن تەنها بە دەستشتن لێك بدرێتەوە ، دەبێ فەرمایشتەکەی دیکەی پێغەمبەری خوا ﷺ (( مَن مسَّ فَرجَهُ فَلْيَتَوَضأ ))([597]) بەم شێوە لێك بدرێتەوە واتە : (( هەرکەس دەستی بەر ئەندامی زاوزێی کەوت با دەست بشوات )) ، بەڵام مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ لێرەدا دەست شتن نی یە بەڵکو دەستنوێژگرتنە بۆیە لێکدانەوەی فەرموودەیە ئاوەهایە : (( هەرکەس دەستی بەر ئەندامی زاوزێی کەوت با دەستنوێژبگرێت )) ·

---

٥٩٧ _ إسناده صحيح : أخرجه أحمد ( ٦ / ٤٠٦ ) ، وصححه الألباني في الإرواء ( ١١٧ ) ·

هەروەها : کەسی بخۆری گۆشتی ووشتر پێدەچێ بەدەستی خۆی گۆشتەکە نەخوات" بەڵکو پێدەچێ بکرێ بە دەمیەوە ، کەوابوو لێرەدا ئەگەر مەبەست بەدەستنوێژگرتنەکە تەنها شتنی دەستەکان بوایە ، ئەوا شتەکە دەبویە گاڵتەکردن و ، ئەوجا گوفتاری دانەری شەرعیش بەشێوەیەك لێك دەدرایەوە کە مەبەستی ڕاست و زانراو نی یەو" بەپێی نەریتی باویش نی یە ٠

هەروەها نابێ هیچ بەرهەڵستاکارێکی بۆ دروست بکرێت بەتایبەت بەو فەرموودەیەی کە هاوەڵان فەرموویانە : (( کۆتا هەردوو کارەکە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ئەوەبوو کە واز لە دەستنوێژگرتن بهێنرێت سەبارەت بە خواردنی ئەو شتانەی کە ئاگریان بەرکەوتووە )) ، لە بەر چەند هۆکارێك :

یەکەمیان : ئەمە فەرموودە گشتی یەو ، فەرمانکردن بە دەستنوێژگرتن لە ئەنجامی خواردنی گۆشتی ووشترەوە تایبەتە ٠

دووەم : لایەنەکان جیاوازە ، چونکە فەرمانکردن بەدەستنوێژگرتن لە بەر ئەو لایەنەیە کە گۆشتی ووشترە ، با کاڵ و نەکوڵاو بێ ، یاخود کوڵاوبێ ، یاخود ووشکرابێتەوەو ، لێرەدا ئاگر هیچ پەیوەندیەکی بەدەستنوێژگرتنەکەوە نی یە ٠ بەڵام کاتێ واز لە دەستنوێژگرتن دەهێنرێت لە کاتی خواردنی ئەو شتانەدا کە ئاگری بەرکەوتووە ، والێکدراوەتەوە کە ئاگر هۆکار نی یە بۆ دەستنوێژگرتن ٠ کەوابوو لێرەدا جێگەی خۆیەتی بگوترێت پەیوەندی ئەمە بەوەوە چی یە ؟ ئەمە جێگیرکردنی هۆکاری دەستنوێژگرتنەکەی تێدایە ، چونکە گۆشتی ووشترەو ، ئەوەش نەفی کردنی هۆکاری دەستنوێژگرتنی تێدایە ، کە گوایە ئاگری بەرکەوتووە ، بۆیە هیچ بەرهەڵستکاریەکیان لە نێواندا نی یە ٠

سێ یەم : ئەم فەرموودە باسی بێژەو گوفتارێکی گشتی تێدا نەکراوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووبێتی ، بەڵکو هەواڵی دوو ڕووداومان بۆ دەگێڕێتەوە ، کە ڕووداوێکیان پێشی

ئەویتر کەوتووە ، لە فەرموودەکەدا هەردوو ڕووداوەکە بەم جۆرە باسکراوە : گۆشتیان خستە پێش دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەبوو خواردی وپاشان کاتی نوێژ هات ، ئەوەبوو دەستنوێژی گرت و نوێژی کرد ، پاشان جارێکی تر گۆشتیان خستە پێش دەستی ئەویش خواردی و پاشان نوێژی کردو دەستنوێژی نەگرتەوە ، کەوابوو کۆتا هەدوو شتەکە ئەوە بوو کە وازی لە دەستنوێژگرتن هێنا بۆ ئەوانەی بەری ئاگر کەوتوون ، ئابەم شێوازە فەرموودەکە هاتووە · ئەو کەسەش کە فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە کورتی کردۆتەوە تەنها بۆ جێگەی بەلگەهێنانەوە ، باشە لەم ڕووداوەدا چ شتێك بەدیدەکرێت شایستەبێ بکرێ بەبەلگە بۆ ( نسخ )کردنەوەی فەرمان کردن بەدەستنوێژگرتن لە کاتی خواردنی گۆشتی ووشتردا ، تا ئەو ئاستەی ئەگەر فەرموودەکە بێژەو گوفتارێکی گشتی دواتری بەرهەلستیکاریش بێ ، هەر بۆ ( نسخ )کردن ناشێ و ، هەر پێویستە تایبەتیی پێش بخرێت ، ئەمەش لەوپەڕی ڕوونیدایە ·

لحم الضَّب ، گۆشتی بزن مژە : پێشتر باسی حەلالێتیمان کردوە ، گۆشتەکەی گەرمی ووشکە ، شەهوەت و ئارەزووی جووتبوون دەجولێنێت ·

لحم الغزال ، گۆشتی ئاسکە نێرینە([598]) : چاکترین نێچیرو ستایشترین گۆشتی هەیە ، گەرمی ووشکە ، هەروەها گوتراوە : زۆر چاك و مامناوەندە ، بۆ جەستە مامناوەندە تەندروستەکان بەسوودە ، چاکترینیشی بێچووەکانە ·

لحم الظبي ، گۆشتی ئاسکە مێینە : گەرم و ووشکە لە یەکەمدا ، جەستە ووشك دەکاتەوە ، بۆ جەستە تەڕو شێدارەکان چاکە ، دانەری کتێبی ( القانون ) دەلێت : چاکترین گۆشتی ئاژەلە کێویەکان گۆشتی ئاسکە مێینەیە ، ئەگەرچی مەیلی لای ( السوداوي ) دەکات ·

---

598 _ پێشەوا ( النووي ) لە کتێبی ( المجموع شرح المهذب )دا فەرموویەتی : ( إمام الحرمين ) دەفەرمێت : ڕاست ئەوەیە کە لە زمانی عەرەبیدا ووشەی ( الغزال ) بۆ نێرینەی ئاسك بەکاردەهێنرێت و ، ووشەی ( الظبي )یش بۆ مێینەکانیان · بڕوانە سایتی : www.ahlalhdeth.com ، وەرگێڕ ·

لحم الأرانب ، گۆشتی کەروێشك : ثبت في الصحيحين : عن أنس بن مالك ، قال : أَنْفَجْنا أرنباً فَسَعَوْا في طلبها ، فأخذوها ، فبعث أبوطلحة بِوَرِكِهَا إلى رسول الله ﷺ فَقَبِلَهُ[٥٩٩].

واتە : لە ( أنس )ی کوڕی ( مالك )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ ، فەرموویەتی : کەروێشکێکمان لە شوێنی خۆی هەڵسان و خەڵکی بەدوایدا ڕایان کردو ، بردیان ، ( أبو طلحة ) ڕانەکەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ناردو ئەویش قبوڵی کرد ٠

گۆشتی کەروێشك : مامناوەندە بۆ گەرمی و ووشکێتی ، ڕانیشی لە هەمووی خۆشترە ، ستایشترین خواردنی گۆشتەکەی بەبرژاندنە ، سك ڕادەگرێت ، میزهێنەرە ، بەرد وورد دەکات ، خواردنی سەری بۆ نەهێشتنی لەرزین بەسوودە ٠

لحم حمار الوحش ، گۆشتی گوێدرێژی کێوی : ثبت في الصحيحين : من حديث أبي قتادة _ رضي الله عنه _ : أنهم كانوا مع رسول الله ﷺ في بعض عُمَرِه ، وأنه صادَ حَمَارَ وحش ، فأمَرهُم النبيُّ ﷺ بأكله وكانوا مُحْرَمِين ، ولم يكن أبوقتادة مُحْرِماً[٦٠٠].

واتە : لە ( أبي قتادة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ : کەوا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بوون ﷺ لە عومرەیەکیدا ، ( أبي قتادة )ش گوێدرێژێکی کێوی ڕاوکرد ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێدان بیخۆن و ئیحرامیشیان بەستبوو ، بەڵام ( أبي قتادة ) ئیحرامی نەبەستبوو ٠

وفي سنن ابن ماجة : عن جابر قال : أكلنا زمنَ خيبرَ الخيلَ وحُمُر الوحش[٦٠١].

---

٥٩٩ _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٣ / ٢٠٢ ) ، ( ٧ / ١١٤ ، ١٢٥ ) ، ومسلم ( ٦ / ٧١ ) كلاهما من طريق هشام بن زيد عن أنس فذكره ٠

٦٠٠ _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٤ / ٤٩ ) ، ( ٧ / ١١٥ ) ، ومسلم ( ٤ / ١٥ ) كلاهما من طريق نافع مولى أبي قتادة عن أبي قتادة فذكره ٠

واته : له ( جابر )ەوه _ خوای لیّ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : له زەمەنی جەنگی ( خیبر )دا گۆشتی ئەسپ و گوێدرێژی کێویمان خوارد ٠

گۆشتەکەی گەرمی ووشکە ، خۆراکێکی زۆر بەجەستە دەبەخشێت ، خوێنێکی چڕی ( سوداوي ) دروست دەکات ، بەڵام بەزوپێوی لە گەڵ ڕۆنی ( القُسط )دا بۆ پشت ئێشەو بای چڕی شلکەرەوەی گورچیلە بەسوودە ، هەروەها بەزوپێوی بۆ سوورهەڵگەڕان و شەڵی بەسوودە بەتێهەڵسووان ، بەگشتی گۆشتی ئاژەڵە کێویەکان هەرهەمووی خوێنێکی چڕی ( سوداوي ) دروست دەکەن و ، چاکترینیان گۆشتی ئاسکەو ، پاشان کەروێشك ٠

لحوم الأجنة ، گۆشتی کۆرپەڵەی سکی دایك : چاك و ستایشکراو نی یە چونکە خوێنی تێدا کۆبۆتەوە ، بەڵام حەرام نی یە چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( ذَكَاةُ الجَنِين ذَكاةُ أُمِّه ))([٦٠٢]) واته : (( سەربڕینی کۆرپەڵەی سکی دایك سەربڕینی دایکیەتی )) ٠

خەڵکی عێراق قەدەغەی خواردنیان کردووە " مەگەر بەزیندووی پێی بگەن و سەری بڕن ، فەرموودەکەشیان واڵێکداوەتەوە کەوا مەبەست بەم جۆرەیە : سەربڕینی وەکو سەربڕینی دایکێتی ٠ گووتیان : ئەمە بەڵگەیە لەسەر حەرامبوون ، بەڵام ئەمە گوفتارێکی پوچە ، چونکە سەرەتای فەرموودەکە ئەوەبوو کە لە پێغەمبەری خوایان پرسی ﷺ و ، گووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مەڕ سەردەبڕین و ، کۆرپلەی لە سکدا دەبینین ، ئایا بیخۆین ؟ ئەویش فەرمووی : ئەگەر ئارەزووتان لیّ بوو بیخۆن چونکە سەبڕینی سەربڕینی دایکێتی ٠

هەروەها : ( القیاس )یش حەڵاڵبوونی دەچەسپێنیّ ، چونکە تاوەکو لە سکی دایکدا هەڵگیرابێت بەبەشێك لە بەشەکانی دایك دادەنرێت ، سەربڕینی دایکیش سەربڕینە بۆ هەموو

---

[٦٠١] _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٣ / ٣٢٢ ، ٣٥٦ ، ٣٦٢ ) ، ومسلم ( ٦ / ٦٦ ) ، وأبوداود ( ٣٧٨٩ ) ، وابن ماجة ( ٣١٩١ ) ، والنسائي ( ٧ / ٢٠١ ، ٢٠٥ ) كلهم من طريق أبي الزبير عن جابر فذكره ٠

[٦٠٢] _ إسناده صحيح : أخرجه أبوداود ( ٢٨٢٧ ) ، وصححه الألباني في الإرواء ( ٢٥٣٩ ) ٠

بەشـەكانیى ، ئـا ئەمەیـە كـە دانـەرى شـەرع ئامـاژەى پێـداوە بەفەرمایشـتى : سـەربڕینى سـەربڕینى دایكێتـى ، هـەروەك سـەربڕینى سـەربڕینە بـۆ تێكـڕاى بەشـەكانى ، بۆیـە ئەگـەر سوونەتى ئاشكەراش نەهاتبا سەبارەت بە خواردنى ، بەدڵنیایى ( القیاس )ى ڕاست و دروست حەڵاڵبونى پێویست دەكرد ٠

لحم القَديد : گۆشتى ووشك : في السنن : من حديث ثَوْبَانَ _ رَضِىَ اللَّهُ عَنْهُ _ قال : ذبحتُ لرَسُولَ اللَّـه ﷺ شـاةً ونحـن مسـافرون ، فقَـالَ : (( أَصْلِحْ لَحْمَهَـا )) فَلَـمْ أَزَلْ أُطعمُـه منـه الى الْمَدِينَة([٦٠٣]).

واتە : لە ( ثوبان )ەوە _ خواى لێ ڕازى بێت _ فەرموویەتى : لە سەفەردا بـووین مـەڕێكم بۆ پێغەمبەرى خوا ﷺ سەربڕى ، فەرمووى : (( گۆشـتەكەى چـاك بكـە )) ئـەوەبوو بـەردەوام پـێم دەدا بیخـوات تـاوەكو گەشـتینەوە مەدینـە ٠ القدیـد : لـە ( النمكسـود ) بەسـوودترە ، جەستەكان بەهێز دەكات ، ئالۆشى و خورو دروسـت دەكـات ، بـەڵام زیانـەكانى بـە بـەهاراتى سـاردى تـەڕو شـێدار ( الأبـازیر ) دوردەخرێتـەوە ، میزاجـە گەرمـەكان چـاك دەكاتـەوە ٠ النمكسودُ : گەرم و ووشكە و هەروەها ووشكاریشە ، چكترینى ئەوەیە لـە قەڵـەوى تەڕوشـێدار بێ ، زیان بە نەخۆشـى ( القـولنج ) دەگەیـەنێت ، بەكوڵانـدن لـە گـەڵ شـیرو ڕۆنـدا زیانـەكانى دوردەخرێتەوە ، بۆ خاوەن میزاجى گەرمى تەڕو شێدار چاكە ٠

## بەشێك : سەبارەت بە گۆشتى باڵندە :

خواى تعالى دەفەرمێت : ﴿ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّـا يَشْـتَهُونَ ﴾[ الواقعـة : ٢١ ] واتـە : وە گۆشـتى هەر باڵندەیەك حەزى لێ بكەن([٦٠٤])٠

---

[٦٠٣] _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٥ / ٢٧٧ ، ٢٨١ ) ، والدارمي ( ١٩٦٦ ) ، ومسلم ( ٦ / ٨١ ، ٨٢ ) ، وأبوداود ( ٢٨١٤ ) ، كلهم من طرق جبير بن نفير عن ثوبان فذكره ٠

وفي مسند البزار وغيره مرفوعاً : (( إنك لَتَنْظُرُ إلى الطَّيرِ في الجَنَّةِ ، فَتَشْتَهيهِ ، فيَخِرُّ مشويّاً بين يَدَيْكَ ))([٦٠٥])

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( تۆ لە بەهەشتدا تەماشای باڵندە دەکەیت و ، حەز بەخواردنی دەکەیت ، بۆیە یەکسەر بە برژاوی دێتە پێش دەستت )) ٠

گۆشتی باڵندە بەشێکی حەڵاڵەو ، بەشێکیشی حەرامە ٠

حەرام : چڕنووکداری وەکو : هەڵۆ و ، باز و ، شاهین([٦٠٦])٠ ئەوانەش کە لاکی ئاژەڵانی تۆپیو دەخۆن وەکو داڵ ، ( الرَّخم )([٦٠٧]) ٠ لەق لەق ، (العقعق )([٦٠٨]) ٠ قەلەڕەشی پەڵاوی و ، ڕەشی گەورە ، ئەوانەش کە قەدەغەی کوشتنیان کراوە وەکو پەپوسلێمانکەو ، بازوڕ( الصُرد )([٦٠٩]).

---

[٦٠٤] ــ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

[٦٠٥] ــ إسناده ضعيف : ضعفه الألباني في ضعيف الترغيب والترهيب ( ٢٢٠٧ ) ٠

[٦٠٦] ــ ئەمانە جۆرێکن لە باڵندە بۆ ڕاوکردن بەکاردێن ، بڕوانە : لسان العرب ٠ وەرگێڕ ٠

[٦٠٧] ــ الرَّخم : باڵندەیەکە پەڕوپۆی زۆرە ، ڕەنگی سپییەو خالخاڵی ڕەشی تێدان ، دەندوکی درێژو کەوانەیی کەمەو ڕەنگی خاکی مەیلەو سوورە ، لە شێوەدا وەکو داڵ وایە ، بڕوانە : قامووسی ڕستە ، مەلا محمودی کەڵاڵەیی ٠ هەروەها بڕوانە : لسان العرب ٠ وەرگێڕ ٠

[٦٠٨] ــ العقعق : ڕەنگی ڕەش و سپی یەو کلکی درێژە ئەو کەسەی لە ئیحرامدایە دەتوانێت بیکوژێت چونکە جۆرێکە لە قەلەڕەش ، بڕوانە : لسان العرب ٠ وەرگێڕ ٠

[٦٠٩] ــ بازوڕ ( الصُرد ) : باڵندەیەکە لە چۆلەکە گەورەترە سەری گەورەیەو ژێر سکی سپی یەو سەرپشتی سەوزەو پەلەوەری بچوک ڕاو دەکات ، بڕوانە : فەرهەنگی دەریا ٠ وەرگێڕ ٠

حەڵاڵیش : چەندین جۆرە ، لەوانە :

الدجاج ، مریشك : ففي الصحيحين من حديث أبي موسى أنَّ النبيَّ ﷺأكل لحم الدَّجاج([610]).

واتە : لە ( أبي موسى )ەوە _ خوای لیّ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ گۆشتی مریشكی خوارد ٠

گۆشتی مریشك گەرم و تەڕە لە یەكەمدا ، بەسەر گەدەوە سووكە ، خێرا هەرسە ، خەڵتەكەی چاكە ، مێشك دەكاتەوە ، تۆماوی نێرینە زیاد دەكات ، دەنگ ساف دەكاتەوە ، ڕەنگ وبۆ جوان دەكاتەوە ، ئەقڵ بەهێز دەكات ، خوێنێكی چاك دروست دەكات ، مەیلی لای تەڕی و شێداری دەكات ، گوتراوە : زۆر خواردنی نەخۆشی جومگەژان دروست دەكات ، بەڵام ئەمە جێگیر نەبووە ٠

لحم الديك ، گۆشتی كەڵەشێر : میزاجی گەرمترە ، تەڕی وشێداری كەمترە ، كەڵەشێری بەتەمەنی گەورە دەرمانێكەو بۆ نەخۆشیەكانی وەكو ( القولنج )و ، تەنگەنەفسی ( الربو )و ، بای چڕ بەسوودە ئەگەر لە گەڵ ( ماء القرطم )و ([611]) ( الشبث )([612])دا بكوڵێندرێت ،

---

[610] _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٤ / ١٠٩ ) ، ( ٥ / ٢١٨ ) ، ( ٧ / ١٢٢ ) ، ( ٨ / ١٦٤ ، ١٧٢ ، ١٨٣ ) ، ( ٩ / ١٩٦ ) ، ومسلم ( ٥ / ٨٣ ، ٨٤ ) كلاهما من طريق زهدم الجرمي عن أبي موسى فذكره ٠

[611] _ القرطم : ڕووكێكی گیایی وەرزیەو ، نزیكی مەترێك بەرز دەبێتەوە ، ڕەنگی گوڵەكانی لە نێوان زەردێكی كاڵ و سورێكی كاڵدایە ، تۆوەكانی لولەكیەو ، گوڵ و كۆسپ و زەیت و تۆوەكانی بەكاردێت ٠ بڕوانە سایتی : www.snbl.com ، وەرگێڕ ٠

[612] _ الشبث : ڕووەكێكی وەرزیەو ، نزیكەی ( ٢٠ _ ٦٠ )سم بەرز دەبێتەوە ، ڕەنگی گوڵەكانی مەیلەو زەردن ، گەڵاكانی دەزوولەیەو ، تۆوەكەی بچوكەو ، بەشی بەكارهاتوش تۆوەكەیەتی ٠ بڕوانە : www.snbl.com ، وەرگێڕ ٠

گوونەکانیشـی ( خصـیُّها ) خـواردنێکی ستایشـکراوە ، خێـرا هەرسـە ، فرووجـەکانیش خێـرا هەرسە ، خوو نەرم ونیان دەکاتەوە ، ئەو خوێنەی لێوە دروست دەبیٚ خوێنێکی نـەرمونیانی چاکە ٠

لحم الدُّرَّاج ، گۆشتی سوێسکە : گەرم و ووشکە لە دووەمدا ، سووك و نەرم ونیانـە ، خێـرا هەرسە ، خوێنێکی مامناوەندی چاك دروست دەکات ، زۆر خواردنی چاو تیژ دەکات ٠

لحم الحَجَل ، گۆشتی پۆڕ : خوێنی چاك دروست دەکات و ، خێرا هەرسە ٠

لحم الإِوَزِّ ، گۆشتی قاز : گەرمی ووشکە ، خۆراکێکی خراپ دەبەخشـیٚ بـۆ ئـەو کەسـانەی لەسەری ڕاهاتوون و بەبەردەوامی دەیخۆن و ، پاشەڕۆشی زۆر نی یە ٠

لحـم البَطِّ ، گۆشـتی مـراوی ، سۆنە : گـەرمی تـەڕو شێدارە ، پاشـەڕۆی زۆرە ، درەنـگ هەرسە ، گونجاوی گەدە نی یە ٠

لحم الحُبارَى ، گۆشتی چێرگ : في السنن من حديث بُرَيَّة بن عمر بن سَفينةَ ، عن أبيـه ، عـن جدِّه _ رضي الله عنه _ قال : أكلتُ مع رسول الله ﷺ لَحْمَ حُبَارَى([613]).

واتـە : ( بُرَيَّـة ) ، لـە بابیـەوە ، لـە باپیریـەوە _ خـوای لـیٚ ڕازی بێـت _ دەگێڕێتـەوە فەرموویەتی : لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ گۆشتی چێرگمان خوارد ٠

گۆشتەکەی گـەرمی ووشـکە ، درەنـگ هەرسـە ، بـۆ وەرزشـوانان و ئەوانـەی ئـیش وکـاری ماندووبوون دەکەن بەسوودە ٠

---

٦١٣ _ ضعيف : أخرجه أبوداود ( ٣٧٩٧ ) ، والترمذي ( ١٨٢٨ ) ، وفي الشمائل ( ١٥٥ ) كلاهما من طريق عمر بن سفينة عن سفينة فذكره ٠

لحم الكُرْكيِّ ◆ گۆشتی قولینگ : ووشك و سووكه ، سەبارەت بە میزاجی گەرمی و ساردی گۆشتەكەی جیاوازی هەیە ، خوێنێكی ( سوداوی ) دروست دەكات ، بۆ ئەوانەی ڕەنج و ماندوبونێكی زۆر دەدەن لە ئیش و كارەكانیاندا بەسوودە ، پێویستە پاش سەربڕین ڕۆژێك یاخود دوو ڕۆژ وازی لێ بهێنرێت و ، پاشان بخورێت ٠

لحم العصافير والقَنابر ◆ گۆشتی چۆلەكەو كلاوكوڕە : روى النسائي في سننه : من حديث عبد الله بن عمرو رضي الله عنه أن النبيَّ ﷺ قال : (( ما من إنسانٍ يَقتُل عُصفورا فما فوقَهُ بغيرِ حَقِّهِ إلا سألَهُ الله _ عز و جل _ عنها ، قيل : يا رسول الله ! وما حقُّه ؟ قال : تَذْبحُه فتأكُلُهُ ولا تَقْطَعُ رأسهُ وتَرْمي به ))([٦١٤]).

واته : له ( عبدالله )ی كوڕی ( عمرو )ەوه _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( هەر مرۆڤێك چۆلەكەیەك و لەویش بەرزتر بكوژێت بەبێ ئەوەی هەقی خۆی بدات ، مەگەر خوای _ عزَّوجلَّ _ لێی دەپرسێتەوە ، گوترا : ئەی پێغەمبەری خوا ! هەقەكەی چی یە ؟ فەرمووی : سەری بڕێت و بیخوات نەك سەری لە لەشی جیاكاتەوەو فڕێی بدات )) ٠

وفي سننه أيضا : عن عمرو بن الشَّريد ، عن أبيه قال : سمعتُ رسولَ الله ﷺ يقول : (( مَنْ قَتَلَ عُصْفوراً عَبَثاً ، عَجَّ الى الله يقولُ : يا ربِّ إنَّ فُلاناً قَتَلَني عَبثاً ، ولم يَقْتُلْني لِمَنْفَعَته ))([٦١٥]).

---

[٦١٤] _ إسناده ضعيف : أخرجه النسائي ( ٧ / ٢٠٧ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٥١٥٧ ) ٠

[٦١٥] _ إسناده ضعيف : أخرجه أحمد في المسند ( ٤ / ٣٨٩ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الترغيب والترهيب ( ٦٨٠ ) ٠

واته : له ( عمرو )ى كوڕى ( الشَّريد )هوه _ خواى لىٛ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : گوێبيستى پێغەمبەرى خوا بووم ﷺ دەيفەرموو : (( هەركەس بەخۆڕا چۆلەكەيەك بكوژێت ، دەنگى بۆ لاى خواى تعالى بەرزدەكاتەوەو دەڵێت : ئەى پەروەردگارم بەڕاستى فلان كەس بە خۆڕا كوشتمى و بۆ سوودى خۆى نەيكوشتم )) ٠

گۆشتيان گەرم و ووشكە ، خوو ڕادەگرێت ، ئارەزووى جووتبوون زياد دەكات ، شلەكەى خوو نەرم ونيان دەكاتەوە ، بۆ جوومگە بەسوودە ، ئەگەر مێشكيان لە گەڵ زەنجەفيل و پيازدا بخورێت ، شەهوەت و ئارەزووى جووتبوون دەوروژێنێت ، وە خەڵتەيان ستايشكراو نى يە ٠

<u>لحم الحمام</u> ، گۆشتى كۆتر : گەرمى تەڕو شێدارە ، هەناوى شێداريى كەمترە ، جوجكەكانى شێدارترە بەخاسيەت ، ئەوەى لە ماڵەكاندا بەخێو دەكرێت و ئەوەش كە تازە باڵەكانى دەكاتەوە بۆ ئەوەى بفڕێت گۆشتيان لەهەمووى سووكترەو ، خۆراكێكى ستايشكراويش بەجەستە دەبەخشىٛ ، گۆشتى نێرينەى بۆ سستى و ، لاوازى و ، سڕى و ، لەش داهێزان و ، ( السكتة )و ، لەرزين شيفايە ، هەروەها بۆنكردنى نەفەسەكانيشى لەو بارەوە بەسوودە ، خواردنى جوجكەكانى يارمەتيدەرێكى باشى ژنانە ، بۆ گورچيلە بەسوودە ، خوێن زۆر دەكات ، فەرموودەيەكى پوچيش سەبارەت بە كۆتر هاتووەو بەدەمى پێغەمبەرى خواوە هەڵبەستراوە كە گوايە : پياوێك تەنهايى خۆى لاى پێغەمبەرى خوا ﷺ سكاڵا كرد ، ئەويش پێى فەرموو : جووتىٛ كۆتر لاى خۆت ڕاگرە ٠ بەڵام لەم فەرموودە باشترو چاكتر ئەم فەرموودەيە : أنَّه ﷺ رأى رجلاً يتبعُ حمامة ، فقال : (( شَيْطانٌ يتْبَعُ شَيْطانَةً ))([٦١٦]) واتە : پێغەمبەرى خوا ﷺ پياوێكى بەديكرد بەدواى كۆترێكەوە بوو ، فەرمووى : (( شەيتانێكە دواى شەيتانێك كەوتووە )) ٠

٦١٦ _ إسناده صحيح : أخرجه أبوداود ( ٤٩٤٠ ) ، وصححه الألباني رحمه الله ٠

پێشەوا ( عثمان )ی کوڕی ( عفان )یش لە ووتارەکانیدا فەرمانی دەکرد بە گوشتنی سەگ و سەبڕینی کۆتر ٠

لحم القَطَا ، گۆشتی قەتێ ، کوڕکوڕە : ووشکە ، ( السوداء ) دروست دەکات ، خوو دەگرێت ، لە خراپترین خۆراکەکانە ، بەڵام بۆ نەخۆشی ئاوبەنگ بەسوودە ٠

لحم السُّمَاني ([617]) ، گۆشتی شێلاقە : گەرم و ووشکە ، بۆ جومگە بەسوودە ، بۆ ئازاری گەرمی جگەر زیانبەخشە ، بە سرکەو ( الكُسْفَرَة )([618]) زیانەکانی دوردەخرێتەوە ، پێویستە مرۆڤ خۆی بەدور بگرێت لە گۆشتی ئەو باڵندانەی کە لە شوێنە زەلکاوەکان و پیسەکاندا دەژین ٠

گۆشتی باڵندە بەگشتی لە گۆشتی مەڕو ماڵات خێرا هەرسترە ، ئەوەشی لەهەمووی خێرا هەرسترە لەهەمووی کەمتر خۆراك بەجەستە دەبەخشێ " وەکو مل و باڵەکان ، مێشکیان لە مێشکی مەڕوماڵات ستایشکراوترو چاکترە.

---

[617] ـ ئەم باڵندەیە لە زمانی عەرەبیدا دوو ناوی هەیە کە بریتین لە ناوەکانی ( السلوى ) و ( السمان ) ، بەڵام لە قورئانی پیرۆزدا بە ناوی ( السلوى )وە هاتووە . وەرگێڕ ٠

[618] ـ الكسفرة أو كوزبرة : ڕووەکێکی گیایی وەرزی بێستانیە ، بۆنێکی عەتر ئامێزی توندی هەیە ، نزیکەی ( ٥٠ )سم بەرز دەبێتەوە ، ڕەنگی کوڵەکانی سپین یاخود مێخەکین ، بەرێکی خڕی بچوکی ڕەنگ زەردی مەیلەو قاوەیی هەیەو ، یەکێکە لە بەهاراتە بەناوبانگەکان ٠ بڕوانە : www.snbl.com ، http://ar.wikipedia.org/wik ٠ وەرگێڕ ٠

الجراد ، كولله : في الصحيحين : عن عبدالله بن أبي أوفى قال : غزونا مع رسول الله ﷺ سبعَ غَزَواتٍ ، نأكُلُ الجَرَادَ([619]).

واته : له ( عبدالله )ى كوڕى ( أبي أوفى )ەوه _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : له خزمەتى پێغەمبەرى خوادا ﷺ حەوت غەزامان كرد ، كوللەمان دەخوارد ٠

وفي المسند عنه : أُحِلَتْ لنا مَيْتَتَانِ ودَمَانِ : الحُوتُ والجرادُ ، والكَبِدُ والطِّحالُ([620]) ٠

واته : له هەمان هاوەڵەوه _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ فەرموويەتى : دوو مردوو و دوو خوێنمان بۆ حەڵاڵ كراوه : ماسى و كولله ، جگەرو سپڵ ٠

كولله گەرم و ووشكه ، خۆراكێكى كەم دەبەخشێت ، بەردەوام خواردنى مرۆڤ لاواز دەكات ، بەهەڵماندنى ( تُبُخِّرَ به ) سودى بۆ ميزەچورتكىٚ و ئاستەمى ميزكردن دەبىٚ ، هەروەها هەڵماندنى ( يُتَبُخِّرَ به ) پىٚ دەكرێت بۆ مايەسيرى ، قەڵەوەكانى بۆ پێوەدانى دوپشك دەبرژێنرێت و دەخورێت ، زيانبەخشە بۆ تووشبوان بەنەخۆشى پەركەم ، خەڵتەيەكى خراپى هەيە ٠

سەبارەت بەڕێدان بە خواردنى ئەو كوللەيەى كە بەبىٚ هۆ مردووه ، دوو گوفتار لە ئاراداية : جەماوەر لە سەر حەڵاڵ بونين ، ئيمامى ( مالك )يش بەحەرامى داناوه ، بەڵام هيچ جياوازيەك لە نێوان زانایاندا نى يە سەبارەت بە خواردنى ئەو كوللەيەى كە بە هۆكاريكى وەكو پەستاوتن و سوتاندن و بەو هاوشێوانە دەمرن ، بۆيە خواردنيان شياوه ٠

---

[619] ـ صحيح : أخرجه البخاري ( ٧ / ١١٧ ) ، ومسلم ( ٦ / ٧٠ ، ١٧١ ) كلاهما من طريق أبي يعفور سمعت ابن أبي أوفى فذكر الحديث ٠

[620] ـ سبق تخريجه ٠

## بەشێك : سەبارەت بە زیانی بەردەوامبوون لەسەر خواردنی گۆشت

پێویستە بەردەوام نەبن لەسەر گۆشت خواردن ، چونکە چەندین نەخۆشی خوێنی و ئیمتلائی و ، تای توند دروست دەکەن ، پێشەوا ( عمر )ی کوڕی ( خطاب ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : دورکەونەوە لە خواردنی گۆشت ، چونکە زیانمەندیەکی هەیە وەکو زیانمەندی مەی وشەراب ، خوای پەروەردگاریش ڕقی لە ماڵی گۆشت خۆر دەبێتەوە · ئیمامی ( مالك ) لە ( الموطأ )دا دەیگێڕێتەوە ·

( أبقراط )یش دەڵێت : سکتان مەکەن بە گۆڕستانی ئاژەڵ ·

## بەشێك : سەبارەت بە بەرهەمی سپیایی

<u>اللَّبن</u> « شیر : خوای تعالى دەفەرمێت : ﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُسْقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهِ مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِلشَّارِبِينَ ﴾[ النحل : ٦٦ ] واتە : ﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الأَنْعَامِ ﴾ وەبەڕاستی لە ئاژەڵ و ماڵاتیشدا بۆ ئێوە پەند وەرگرتن هەیە ﴿ نُسْقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهِ ﴾ لەوەی لە ناو سکیدایە بە ئێوەی دەنۆشین ﴿ مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَنًا خَالِصًا ﴾ لە نێوان سروان و خوێنیدا شیرێکی پاکی بێ خەوشی ﴿ سَائِغًا لِلشَّارِبِينَ ﴾ ڕەوان بۆ نۆشەرانی([٦٢١]) · خوای تعالى سەبارەت بە بەهەشتیش فەرموویەتی ﴿ فِيهَا أَنْهَارٌ مِنْ مَاءٍ غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِنْ لَبَنٍ لَمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ ﴾[ محمد : ١٥ ] ﴿ فِيهَا أَنْهَارٌ ﴾ چەندەها ڕووباری تێدایە ﴿ مِنْ مَاءٍ غَيْرِ آسِنٍ ﴾ لە ئاوی سازگاری تام و بۆن نەگۆڕاو ﴿ وَأَنْهَارٌ ﴾ وە چەندەها ڕووبار ﴿ مِنْ لَبَنٍ لَمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ ﴾ لە شیر کە تامی نەگۆڕاوە([٦٢٢])·

---

[٦٢١] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ·

[٦٢٢] _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ·

وفي السنن مرفوعاً : (( مَنْ أَطْعَمَهُ اللهُ طَعَامًا فَلْيَقُلِ : اللهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَارْزُقْنَا خَيْرًا مِنْهُ ، وَمَنْ سَقَاهُ اللهُ لَبَنًا فَلْيَقُلِ : اللهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَزِدْنَا مِنْهُ فَإِني لاَ أَعْلَمُ مَا يُجْزِئُ مِنَ الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ إِلاَّ اللبَنُ ))([٦٢٣]) .

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( هەرکەس خوای تعالی خۆراکێکی دایە بیخوات بابڵێت : پەروەردگارا بەرەکەتمان بۆ بڕژە نێوی و ، لەم خواردنەش چاکترمان بدەریٚ · وەهەرکەس خوای تعالی شیری دایە بیخواتەوە بابڵێت : پەروەردگارا بەرەکەتمان بۆ بڕژە نێوی و ، لەمەشمان بۆ زیاد بکە ، چونکە هیچ شتێك نی یە جێگەی خۆراك و خواردنەوە بگرێتەوە مەگەر شیر ·

شیر : ئەگەرچی بەهەستیش سادەبیٚ ، بەڵام بەسروشتی خۆی و لە بنەڕەتی دروستبونیدا لە سێ گەوهەر پێکهاتووە: پەنێری ، ڕۆنی ، ئاوی · پەنێری : ساردی تەڕوشێدارە ، خۆراك بەجەستە دەبەخشیٚ · ڕۆنی : مامناوەندە لە گەرمی و تەڕی و شێداریداو بۆ جەستەی مرۆڤیی تەندروست و ساغ گونجاوە ، سودێکی زۆری تێدایە · ئاوی : گەرمی تەڕە ، سروشتی مرۆڤ دەکاتەوە ، جەستە شێدار دەکات ·

شیر _ بەگشتی _ لە ئاستی مامناوەند کەمێ ساردترو تەڕو شێدارترە · گوتراوە : هێزی لە کاتی دۆشینیدا گەرمی و تەڕی و شێداریە ، هەروەها گوتراوە : مامناوەندە لە گەرمی و ساردیدا ·

چاکترین دۆخەکانی شیریش لە کاتی دۆشینیدایە ، پاشان بەردەوام چاکێتیەکەی کەم دەبێتەوە " بەپێی تێپەڕبوونی کات ، بۆیە لە کاتی دۆشینیدا کەمتر ساردەو ، زیاتر تەڕو شێدارە ، ترشەکەشی بەپێچەوانەوەیە ، پاش ئەوەی ئاژەڵەکە بێچوەکەی لە دایك دەبیٚ

---

[٦٢٣] _ سبق تخريجه ·

بەچل ڕۆژ ئەوجا شیرەكەی هەڵدەبژێردرێت و بەكاردەهێنرێت ، چاكترین شیریش ئەوەیە كە سپێتیەكەی زۆر بێ ، بۆنی خۆش بێ ، تامی بەلەزەت بێ ، شیرینیەكی كەمی تێدابێ ، چەوریەكەی مامناوەند بێ ، پێكهاتەی لە ناسكی و چڕیدا مامناوەند بێ ، لە ماڵاتێكی تەمەن كەمی تەندروست دۆشرابێ ، گۆشتی مامناوەندی چاك بێ و ، لەوەڕو ئاوێكی ستایشكراوی خواردبێ ٠

شیر ستایشكراوەو خوێنێكی چاك دروست دەكات ، جەستەی ووشك شێدار دەكاتەوە ، خۆراكێكی چاك بەجەستە دەبەخشێ ، بۆ نەخۆشیەكانی دودڵیی و خەم و خەفەت و نەخۆشیە ( السوداوية )كان بەسوودە ، ئەگەر لە گەڵ هەنگوێندا بخورێتەوە برینە ناوەكیەكان لە خەڵتە بۆگەنەكان پاك دەكاتەوە ٠ خواردنەوەشی لە گەڵ شەكردا ڕەنگ وبۆ جوان دەكاتەوە ٠

شیر زیانەكانی جووتبوون دەكات كەم دەكاتەوە ، بۆ سینگ و سیی گونجاوە ، بۆ تووشبووان بەنەخۆشی سیل چاك وبەسوودە ، بۆ سەرو گەدەو ، جگەرو سپڵ خراپە ، زۆرخواردنی زیان بەددان و پووك دەگەیەنێت ، بۆیە پاش خواردنەوەی پێویستە ئاو لە دەم وەردرێت ، وفي الصحيحين : أنَّ النبيَّ ﷺ شرب لبناً ، ثم دعا بماء فتمضمض وقال : (( إنَّ لَهُ دَسَماً ))([٦٢٤]) واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ شیری خواردەوەو ، پاشان داوای ئاوی كردو وەریدا لە دەمی و فەرمووی : (( چەوری تێدایە )) ٠

بۆ تاداران و ، ئەوانەی سەریان دەئێشێ خراپە ، بۆ مێشك و ، سەری لاواز زیانبەخشە ، بەردەوام خواردنی تاریكی چاو و ، جومگە ئێشان و ، توندبوونی جگەرو ، ئاوسان لە گەدەو هەناودا دروست دەكات ، بەڵام بە تێكەڵ كردنی هەنگوێن و زەنجەفیلی مورەبا و بەو هاوشێوانە چاك دەكرێت ، هەموو ئەوانەش بۆ كەسانێكە پێی ڕانەهاتبێت ٠

---

[٦٢٤] ـ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ١ / ٢٧٠ ) ، ومسلم ( ٣٥٨ ) ٠

لبن الضَّأن • شيرى مەڕ : چڕترين شيرەكانەو لەهەمووشى زياتر تەڕترو شێدارترە ، چەوريكى تێدايە لە شيرى بزن و مانگادا نى يە ، پاشەڕۆيەكى بەلْغەمى دروست دەكات ، سپێتيەك لە پێستدا دروست دەكات ئەگەر بەبەردەوامى بەكاربهێنرێت ، بۆيە پێويستە ئەم شيرە تێكەڵ بەئاو بكرێت بۆ ئەوەى جەستە ڕێژەيەكى كەمتر لەم شيرەى دەستكەوێت و ، خێراتريش تينويەتى بشكێنێت و ، زياتريش سارد بكاتەوە •

لبن المَعْز • شيرى بزن : نەرم وناسك و مامناوەندە ، سك ڕەوان دەكاتەوە ، جەستەى ووشك شێدار دەكاتەوە ، بۆ برينەكانى گەروو ، كۆكينى ووشك ، خوێن بەربوون بەسوودە.

شيرى پەتى چاكترين خواردنەوەكانە بۆ جەستەى مرۆڤ " لەبەر ئەو خۆراك بەخشين و ماددە خوێنيەى تيايدا كۆبۆتەوەو ، لەبەر ئەوەش كە لە كاتى مندالْيدا جەستەى مرۆڤى لەسەر ڕاهاتووەو ، هاو سازى فيترەتى بنەڕەتيشە •

وفي الصحيحين : أن رسولَ الله ﷺ أُتيَ لَيلةَ أُسْرِيَ به بقدَحين من خمر ولَبَن ، فنظر إليهما ثم أخذ اللَّبنَ ، فقال له جبريل _ عليه السلام _ : الحمد لله الذي هداك للفِطرَة ، ولو أخذتَ الخمرَ غوَت أُمَّتُك (٦٢٥).

واتە : پێغەمبەرى خوا ﷺ لە شەوڕەويەكەيدا دوو پەرداخ مەى و شيرى بۆ هێنرا ، ئەوەبوو تەماشاى كردن و شيرەكەى برد ، ( جبريل )يش _ عليه السلام _ فەرمووى : سپاس و ستايش بۆ خوا كە ڕێنمووى كردى بۆ ئيسلام و ڕێگەى ڕاست ، چونكە ئەگەر مەى و شەرابەكەت هەلْگرتايە ئومەتەكەت گومڕا دەبوون •

ترشەكەشى بەلاى مرۆڤەوە بەلەزەت نابێ تا دواى ماوەيەك ، شيرێكى بزركاوەو بۆنەكەى ناخۆشە ، ، گەدەى گەرم هەرسى دەكات و سودى لێ وەردەگرێت •

---

[٦٢٥] _ سبق تخريجه •

لحم البَقَر • شیری مانگا : خۆراك بەجەستە دەبەخشێ و ، پیتدارو چاکی دەکات ، سك ڕەوان دەکاتەوە بەنێوەنجی ، ناوەندیترین شیرو چاکترینیانە لە نێوان شیرەکانی مەڕو بزندا ، لە بواری نەرم و ناسکی و چڕی و چەوریدا •

وفي السنن : من حديث عبدالله بن مسعود يرفعه : (( عليكم بألبانِ البَقَرِ ، فإنها تَرُمُّ من كُلِّ الشَّجَرِ ))([626]).

واتە : ( عبدالله )ی کوڕی ( مسعود ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ لە فەرموودەیەکدا کە بەرزی دەکاتەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( شیری مانگا بەکاربێنن ، چونکە لە هەموو درۆەختێك کۆدەکاتەوەو دەخوا )) •

لبن الإبل • شیری ووشتر : لەسەرەتای بەشەکەدا ئاماژەی پێدرا ، سوودەکانی باسکرا ، بۆیە پێویست بەدووبارەبونەوە ناکات •

لُبَانٌ ، الكُندُر • : فەرموودەیەکی لەبارەوە هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( ماڵەکانتان بە ( لُبَانٌ ) بۆنخۆش بکەن )) بەڵام ئەم فەرموودەیە بە ( صحیح )ی لە پێغەمبەری خواوە ( ریوایە )ت نەکراوە •

لە ( علي )یشەوە دەگێڕنەوە کەوا پیاوێك سکاڵای بیرچوونەوەی لە خزمەتیدا باس کرد ئەویش پێی فەرموو : ( لُبَانٌ ) بەکاربێنە ، چونکە دڵ بەهێز دەکات و ، بیرچونەوە ناهێڵێت.

لە ( ابن عباس )یشەوە _ خوا لە خۆی وبابیشی ڕازی بێت _ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : خواردنەوەی لەگەڵ شەکردا پێش نان خواردنی بەیانی بۆ میز و بیرچونەوە چاکە •

---

[626] _ إسناده صحيح : صححه الألباني في الصحيحة ( ٥١٨ ) •

له ( أنس )يشەوە دەگێڕنەوە کەوا پیاوێك سكاڵای له خزمەتيدا باس کرد ئەویش فـەرمووی : ( الكُندُر ) بەکاربێنەو هەر لـە شـەوەوە بیخوسـێنە ، ئەگـەر ڕۆژت لـێ بوویـەوە ، پـێش نـان خواردنی بەیانی لێی بخورەوە ، چونکە بۆ بیرچوونەوە بەسوودە ٠

ئەمە هۆیەکی سروشتی ئاشکەرای هەیـە ، چـونکە ئەگـەر بیرچـوونەوە بـەهۆی میزاجێکـی خراپی ساردی شێدارەوە بێ و بەسەر مێشکدا زاڵ بـێ ، ئـەوا کـاری خـەزنکردن و پاراسـتنی زانیاریەکان ئەنجام نادات ، لێرەدا ( لُبَانٌ )ی زۆر بۆ بەسوود دەبێ ٠

بەڵام ئەگەر بیرچونەوەکە بەهۆی زاڵبـوونی شـتێکی کاتیـەوە ( عـارض ) بـێ ، دەتوانرێـت بیرچوونەوەکە بەو شتانە لابرێت کە دەتوانن مێشك شێدار بکەنەوە ٠

جیاوازی نێـوان ئـەم دوو لـە بیرچـوونەوەیە بـەم جۆرەیـە : لـە بیرچـوونەوە بـەهۆی شـتی کاتیەوە ( العارض ) جۆرێکی ووشکەو ، نیشانەکانیشی بریتە لە شـەو بێداری و خـەزنکردن و پاراستنی زانیاریە ڕابردووەکان بەتەنها " بەڵام زانیاری نوێ و هەنووکەیی خەزن ناکات.

بەڵام لـە بیرچـوونەوە بـەهۆی مـاددەی تـەڕو شـێدارەکانەوە " بـە پێچـەوانەی یەکەمـە بـە تەواوی ٠

پێدەچێ هەندێ شت بەخاسـیەت بیرچـوونەوە دروسـت بکـات ، وەکـو کەڵەشـاخگرتن لـە چاڵەکەی پشتە ملداو ، بەردەوامبوون لەسەر خواردنی ( الكُسْفُرة )ی تـەڕو ، سـێوی تـرش و ، زۆری خـەم و خەفـەت و ، تەماشـاکردنی ئـاوی وەسـتاوو ، میزتێکردنـی و ، تەماشـاکردنی لـە خاچ دراوو ، زۆر خوێندنەوەی تابلۆی سـەر گۆڕەکـان و ، تەماشـاکردنی دوو وشـتری پێکـەوە بەستراو ، فڕێدانی ئەسپێ بە خوێنی بێنوێژیەوە ، خواردنی پاشماوەی مشك ، زۆربەی ئەمانـە بە تاقیکردنەوە زانراون ٠

مەبەستیش ئەوەیە کە : ( لُبَانٌ ) گەرمکارە لە پلە دوودا ، ووشکارە لە پلە یەکدا ، قەبزێکی کەمی تێدایە ، سوودەکانی زۆرن ، زیانەکانی کەمن ، لە سوودەکانی : بەسوودە بۆ فڕێدان و خوێن بەربوون ، ئازاری گەدە ، ڕەوانبوونی سك ، خۆراك هەرس دەکات ، با دەکاتە درەوە ، برینە کێماوەکانی چاو پاك دەکاتەوە ، گۆشت دەڕوێنێتەوە لە هەموو برینەکاندا ، گەدەی لاواز بەهێز دەکات و ، گەرمی دەکات ، بەڵغەم ووشك دەکات ، تەڕی و شێکانی سینگ ووشك دەکاتەوە ، تاریکی چاو لادەبات ، ناهێڵێت برینە کیماوە پیسەکان بڵاوە بکەن ، ئەگەر بەتەنها ، یاخود لەگەڵ جاترەی فارسیدا بجوێنرێت بەڵغەم دەردەهێنێت و ، بۆ زمان گیران بەسوود دەبێ و ، بیروهۆش زیاد دەکات و پەرەی پێ دەدا ، ئەگەر لە ئاودا بهەڵمێنرێت ، بۆ پەتا بەسوودەو ، بۆنی هەوا خۆش دەکات ٠

## پیتی المیم ( م ) :

ماءٌ ، ئاو : ماددەی ژیانە ، سەرگەورەی خواردنەوەکانە ، یەکێکە لە پایەکانی جیهان ، بەڵکو پایەی بنەڕەتە ، چونکە ئاسمانەکان لە هەڵمەکەی دروستکراون و ، زەمینیش لە کەفەکەی دروستکراوە ، خوای پەروەردگاریش هەموو شتێکی زیندووی لە ئاو دروست کردووە ٠

زانایان سەبارەت بەئاو جیاواز بوونە : ئایا خۆراك بەجەستە دەبەخشێ ، یا تەنها خۆراك بۆ ئەندامەکانی جەستە گوزەر پێ دەکات ؟ بە دوو بۆچوون ، پیشتر ئاماژەمان پێداو ، گوفتاری راست و بەڵگەکەشمان خستە ڕوو ٠

ئاو ساردو تەڕە ، گەرمی دادەمرکێنێتەوە ، تەڕی و شێداری جەستە دەپارێزێت و ، جێگەی ئەوەش دەگرێتەوە کە لە جەستە شیی بۆتەوە ، خۆراك نەرم ونیان دەکاتەوەو ، بۆ ڕەگەکان گوزەریان پێ دەکات ٠

**چاكێتی ئاو بەدە ڕێگەوە دەزانرێت :**

یەكەمیان : بەڕەنگەكەی بەوەی ساف بێت ٠

دووەم : بەبۆنی بەوەی بەهیچ شێوەیەك بۆنی نەبێت ٠

سێ یەم : بەتامەكەی بەوەی تامەكەی خۆش و شیرین و سازگار بێت ، وەكو ئاوی ڕووبارەكانی نیل و فورات٠

چوارەم : بەكێشی بەوەی سووك و پێكهاتە ناسك بێت ٠

پێنجەم : بەڕێڕەوی ، بەوەی ڕێڕەو و ڕێگەكەی چاك بێت ٠

شەشەم : بەسەرچاوەی هەڵقوڵانی بەوەی سەرچاوەی هەڵقوڵانی دوور بێت ٠

حەوتەم : بەدەركەوتنی بۆ هەتاو و با ، بەوەی لە ژێر زەویدا گوم نەبێ و هەتاو و با نەیگاتی ٠

هەشتەم : بە جوڵانەوەی بەوەی خێرا ڕێ بكات و بجوڵێتەوە ٠

نۆیەم : بەزۆریەكەی بەوەی زۆربێت و پاشەڕۆ تێكەڵ بووەكانی دووربخاتەوە ٠

دەیەم : لە ئاوڕێژگەیەوە بەوەی لە باكورەوە بۆ باشور ، یاخود لە ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات بڕوات ٠

بۆیە ئەگەر ڕەچاوی ئەم وەسفانە بكرێت ، ئەوا ئەو خاڵانە بەتەواوی بەدیناكرێت تەنها لە چوار ڕووبارەكەدا نەبێ ، نیل و ، فورات و ، سیحون و ، جیحون ٠

وفي الصحيحين من حديث أبي هُريرة _ رضي الله عنه _ قال : قال رسول الله ﷺ : (( سَيْحَانُ ، وجَيْحَانُ ، والنِّيلُ ، والفُرَاتُ ، كُل من أنهار الجنَّة ))(٦٢٧) .

---

٦٢٧ _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٢ / ٢٨٩ ، ٤٤٠ ) ، ومسلم ( ٨ / ١٤٩ ) كلاهما من طريق حفص بن عاصم عن أبي هريرة مرفوعاً ٠ ولم أجده في صحيح البخاري ولعله وهم من المصنف رحمه الله ٠

واته : له ( أبي هريرة )ەوه _ خوای لیٚ ڕازی بیّت _ فەرموویەتی : پیٚغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( سَيْحَانُ و ، جَيْحَانُ و ، والنِّيلُ و ، والفُرَاتُ ، هەریەکەیان ڕووباریٚکی بەهەشتن)).

**سووکیٚتی ئاو بە سیٚ ڕوو دەزانریٚت :**

یەکەمیان : ئاوەکە خیٚرا گەرمی و ساردی وەرگریٚت ۰ ( أبقراط ) دەلیٚت : ئەو ئاوەی بەخیٚرا گەرم دەبیٚ و ، بەخیٚراش سارد دەبیٚ سووکترین ئاوه ۰

دووەم : بەتەرازوو ۰

سیٚ یەم : دوو لۆکەی کیٚش یەکسان بەدوو ئاوی جیاواز تەڕ دەکریٚن ، پاشان بەتەواوی ووشك دەکریٚنەوه ، پاشان دەکیٚشریٚن ، هەرکامیان سووکتر بوو ، ئاوەکەشی ئاوەهایە ۰

ئاو ئەگەرچی له بنەڕەتدا ساردی تەڕ بیٚ ، بەلاّم هیٚزەکەی دەگوازریٚتەوەو دەگوڕدریٚت به چەندین هۆکاری کاتی ، بۆیه ئەو ئاوەی سەرنەگیراوەو دانەپۆشراوەو تەنها بای شەمالٚ لیٚی دەدات و ، بای هیچ لایەکی تر لیٚی نەدات ، ئەو ئاوه سارد دەبیٚ و ، جۆره ووشکیٚتیەکی تیٚدایە له بای شەمالەوه وەریگرتووه ، حوکمی هەموو باکانی تریش بەو شیٚوه دەزانریٚت ۰

ئەو ئاوەی له سەرچاوەیەکی کانزایەوه هەلّدەقولیٚت بە گویٚرەی سروشتی ئەو کانزایە دەبیٚ ، بەگویٚرەی کاریگەری ئەو کانزایەش کاریگەری دەخاته سەر جەسته ۰

ئاوی سازگاری شیرینی خۆش بۆ نەخۆش و کەسانی تەندروست و لەش ساغیش بەسووده ، ساردەکەشی بەسوودترو بەلەزەتره ۰ پیٚویسته لەسەر سك خالّیٚتی ، پاش جووتبوون ، کاتی بەئاگاهاتنەوه له نووستن ، پاش خۆشتن ، پاش خواردنی میوه ئاو نەخوریٚتەوه ، پیٚشتریش ئاماژەمان پیٚداوه ۰ بەلاّم لەسەر خواردن ، هیچی تیٚدا نی یه " ئەگەر ناچاری بوو ، وه پیٚویسته زۆر نەخواتەوه ، بەلّکو کەمیٚکی هەلّدەمژیٚ به هەلّمژین ، ئەوه زیانی پیٚ

ناگەیەنێت ، بەڵکو بە پێچەوانەوە گەدە بەهێز دەکات و ، شەهەوت و ئارەزوو هەڵدەسێنێت و ، تینویەتی لادەبات.

ئاوی شلەتێن دەئاوسێنێت و کرداری‌گەلێکی دژ بەوەی باسکرا ئەنجام دەدات ، ئەو ئاوەی دەمێنێتەوە لە ئاوی تازە چاکترە . ئاوی سارد لەو ناوەوە سوودێکی زیاتر دەبەخشێت بەبەراوردی سوودی دەرەوەی ، گەرمیش بەپێچەوانەوەیە ، ئاوی سارد بۆ بۆگەنبوونی خوێن و ، بەرزبونەوەی هەڵمەکان بۆ سەر بەسوودە ، خەڵتە بۆگەنەکان لادەبات و ، بۆ میزاج و ساڵ و زەمەن و شوێنە گەرمەکان گونجاوە ، کەچی ئاوی سارد بۆ هەموو باروحاڵێك پێویست بە پێگەیاندن و شیی بونەوەی ماددە زیانبەخشەکان بکات زیانبەخشە ، وەکو هەڵامەت و هەڵاوسانەکان ، زۆر ساردیش زیان بە ددانەکان دەگەیەنێت ، بەردەوامبوون لەسەر خواردنەوەی ئاوی سارد خوێن بەربوون و کۆکەو هەڵامەت و ، ئازاری سینگ دروست دەکات .

ئاوی ساردو گەرمی لەڕادەبەدەر زیان بە دەمارو زۆربەی ئەندامەکان دەگەیەنێت ، چونکە یەکێکیان شیی دەکاتەوەو ، ئەویتریان چڕ دەکاتەوە ، ئاوی گەرم چوزانەوەی تێکەڵاوە تیژەکان هێمن دەکاتەوە ، شیی دەکاتەوەو پێدەگەیەنێت ، پاشەڕۆکان دەکاتە دەرەوە ، تەڕوشێدار دەکات و گەرم دەکات ، کەچی خواردنەوەی ئاوی گەرم بەزۆری هەرسکردن خراپ دەکات ، پاڵ بەخواردنەکانەوە دەنێت بۆ سەرەوەی گەدەو نەرم و سستی دەکاتەوە ، بەخێرا تینویەتی ناشکێنێت ، جەستە سیس و لاواز دەکات ، دەبێ بەهۆی دروستبوونی چەندین نەخۆشی خراپ و ، زیان بەزۆربەی نەخۆشیەکان دەگەیەنێت ، بەڵام خواردنەوەی ئاوی گەرم بۆ مرۆڤی بەتەمەن و ، تووشبووان بەنەخۆشی پەرکەم و ، سەرئێشەی ساردو ( الصداع البارد ) ، چاوئێشە بەسوودە ، بەسوودترین بەکارهێنانەکانیشی ئەوەیە لە دەرەوەوە بەکاربێت .

هیچ فەرموودەیەك یاخود ( أثر )ێكی ( صحیح ) نەهاتووە سەبارەت بەئاوی گەرمبووی بەر هەتاو ، هیچ یەكێك لە پزیشكانی دێرین ناقایلێتیان بەرامبەر بەم ئاوە دەرنەبڕیوەو ، عەیبداریشیان نەكردووە ، ئاوی زۆر گەرم بەزی گورچیلە دەتوێنێتەوە ·

پێشتر لە پیتی غین ( غ )دا باسی ئاوی بارانمان كرد ·

ماء الثَّلج والبَرَد ؛ ئاوی بەفرو تەرزە : ثبت في الصحيحين : عن النبيٌّ ﷺأنه كان يدعو في الأستفتاح وغيره : (( اللَّهُمَّ اغْسِلني من خطاياي بماء الثَّلجِ والبَرَدِ ))([٦٢٨])

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( پەروەردگارا لە تاوانەكانم بمشۆوە بەئاوی بەفرو تەرزە )) ·

بەفر لە خودی خۆیدا چۆنیەتیەكی دووكەڵی و هەڵمی هەیە ، ئاوەكەشی هەر ئاوەهایە ، پێشتر باسی دانایی داواكردنی پاكردنەوەمان لە تاوانەكان كرد " بە ئاوی بەفرو باران " لەبەر ئەوەی دڵ پێویستی بە ساردكردنەوەو قایم كردن و بەهێزكردن هەیە ، ئەمەش بنچینەی پزیشكێتی جەستەو دڵانی لێ وەردەگیرێت و ، چارەسەری نەخۆشیەكان بەدژەكانیان دەكرێت ·

ئاوی تەرزە لە ئاوی بەفر نەرم وناسكترو بەلەزەترە ، بەڵام ئاوی بەستوو كە بە سەهۆڵ دەناسرێت بەگوێرەی بنچینەكەیەتی ، بەفر چۆنیەتی ئەو چیاو زەویە وەردەگرێت كە بەسەریدا دەبارێت " سەبارەت بە هەردوو لایەنی چاكێتی و خراپی ، وە پێویستە مرۆڤ دوركەوێتەوە لە خواردنەوەی بەفراو پاش خۆشتن ، جووتبوون ، وەرزش ، خواردنی گەرم ، تووشبوان بە كوكین ، ئازاری سینگ ، لاوازی جگەر ، خاوەن میزاجە ساردەكان ·

[٦٢٨] ــ سبق تخريجه ·

ماء الآبار والقُنيِّ ؛ ئاوى بيرو كاريز : ئـاوى بـير نـەرمى وناسـكى وخۆشـى كـەمترە ، ئـاوى كاريزى ژێر خاك قورسە ، چونكە ئەوەى لە ژێر زەويدا وەستاوە لە بۆگـەنى بـەدەر نـى يـەو ، ئەويتريشيان هەواى پىّ ناگات ، بۆيە پێويستە يەكسەر نەخورێتەوە تـاوەكو بەتـەواوى هـەواى پىّ دەگات و ، شەوێكى بەسەردا تێپەرێت ، خراپترينيشـى ئەوەيـە ڕێرەوەكـەى لـە قورقۆشـم بىّ ، ياخود بيرەكەى لە كاركەوتو بىّ ، بەتايبەت ئەگەر خاكەكەى خراپ بىّ ، بۆيـە ئـەو ئـاوە دەرداوى و بەزيانە ٠

ماء زمزمَ ؛ ئاوى زەمزەم : سەرگەورەى ئاوەكان و بەڕێزترين و لەهەمووشـى پايـەدارترە ، لەهەمووشى بـەلاى نەفسـەكانەوە خۆشەويسـترەو ، لـە هەمووشـى بـەنرخترەو ، لەهەمووشـى بەلاى خەلّكەوە ڕێزدارترە ، ( جبريل ) پێيەكانى كێشا بەزەويداو ئاوى زەمزەم هـەلّقولاّ ، ئـەو ئاوە بوو كە خواى تعالى بۆ خواردەنەوەى ( إسماعيل ) هەلّيقولاّند ٠

وثبت في الصحيح : عن النبيِّ ﷺ أنه قـال لأبـي ذرّ وقـد أقـام بـين الكعبـة واسـتارِهَا أربعـينَ مابين يوم وليلةٍ ، ليس له طعامٌ غيرُها فقال النبيُّ ﷺ: (( إنهـا طَعَـامُ طُعْـمٍ )) ٠ وزاد غـيرُ مسـلم بإسناده : وشفاءُ سُقْمٍ ([629]).

واتە : بە ( صحيح )ى لە پێغەمبەرى خواوە ﷺ هاتووە كەوا بە ( أبي ذرّ )ى فەرموو كـاتىّ كە لە نێوان كەعبەو ديوارەكانيدا چل مايەوە لە نێوان شەو و ڕۆژدا ، بەدەر لـە ئـاوى زەمـزەم هيچ خۆراكێكى ترى نەبوو ، ئەوەبوو پێغەمبەرى خـوا ﷺ فـەرمووى : (( ئـەوە خۆراكـەو ئـەو كەسەى دەيخواتەوە تێر دەبىّ وەكو ئەوەى خۆراك تێرى دەكـات )) ٠ كەسـانى ديكـەى جگـە لە ئيمامى ( مسلم ) بەهەمان ( إسناد ) ئەمەشيان بۆ زياد كردووە : (( شيفاى نەخۆشيە)).

---

[629] _ صحيح : أخرجه أحمد ( ٥ / ١٧٤ ، ١٧٥ ) ، والدارمي ( ٢٥٢٧ ) ، ( ٢٦٤٢ ) ، والبخاري في الأدب المفرد ( ١٠٣٥ ) ، ومسلم في صحيحه ( ٧ / ١٥٢ ، ١٥٥ ، ١٧٦ ) ، والنسائي في عمل اليوم والليلة ( ٣٣٩ ) كلهم من رواية عبدالله بن الصامت عن أبي ذر فذكره في حديث طويل ٠

وفي سنن ابن ماجة : من حديث جابر بن عبدالله ، عن النبيِّ ﷺ أنه قال: (( ماءُ زَمْزَمَ لَما شُرِبَ له ))([630]).

واته : له ( جابر )ى كوڕى ( عبدالله )ەوه _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ ، له پێغەمبەرى خواوه ﷺ دەگێڕێتەوەو فەرموویەتى : (( ئاوى زەمزەم بۆ ئەو نیازەیە بۆى دەخورێتەوه )) ٠ كۆمەڵێك ئەم فەرموودەیە بە ( ضعیف ) دادەنێن بەهۆى ( عبدالله )ى كوڕى ( المؤمَّل )ەوه كە لە ( محمد )ى كوڕى ( المنكدر )ەوه دەگێڕێتەوه ٠ بۆمان ( ریوایە )ت كراوه كەوا ( عبدالله )ى كوڕى ( المبارك ) كاتێ چووه حەج ، چووه سەر بیرى زەمزەم و ، فەرمووى : پەروەردگارا ( ابن أبي الموالى ) له ( محمد )ى كوڕى ( المنكدر )ەوه بۆى باسكردین ، لە ( جابر )ى كوڕى ( عبدالله )ەوه _ خواى لىٚ ڕازى بێت _ ، له پێغەمبەرى خواوه ﷺ فەرمووى : (( ئاوى زەمزەم بۆ ئەو نیازەیە بۆى دەخورێتەوه )) ، بۆیە منیش دەیخۆمەوه بۆ تینوێتى ڕۆژى قیامەت ٠ ( ابن أبي الموالى )ش باوەڕپێكراوه ( ثقة ) ، بۆیە فەرموودەكە ( حسن )ە ، هێندێكیشیان فەرموودەكەیان بە ( صحیح ) لەم قەڵەم داوه ، هێندێكیش گوتویانە ( موضوع )ە ، هەردوو گوفتارەكەش هەوڵێكى نامسۆگرن ٠

من و كەسانى تریش ئاوى زەمزەمان تاقیكردۆتەوه " بۆ خۆ چارەسەركردن و ، شتگەلێكى سەرسوڕمێنمان لىٚ بینیوه ، خۆشم بەكارم هێناوه بۆ خۆچارەسەركردن " لە گەلێك نەخۆشى و ، بەئیزنى خواى تعالى چاك بومەتەوه ، كەسانێكیشم بینیوه ، لە جیاتى خۆراك نزیكەى نیو مانگ ، یاخود زیاتر ، تەنها ئاوى زەمزەمیان دەخواردەوەو ، برسیشیان نەدەبوو ، وەكو یەكێكى ئەو خەڵكە تەوافى دەورى كەعبەشى دەكرد ، پێشى ڕاگەیانم كەوا پێدەچىٚ چل ڕۆژ لەسەر ئەو باروحاڵە توانای مانەوەى هەبىٚ ، هێزیشى تێدابوو بۆ جووتبوون لە گەڵ خێزانەكەیداو ، ڕۆژوشى دەگرت و ، چەندین جاریش تەواف دەكرد ٠

[630] _ إسناده صحيح : أخرجه ابن ماجة ( ٣٠٦٢ ) ، وصححه الألباني في الإرواء ( ١١٢٣ ) ٠

ماء النيل ، ئاوى ڕووبارى نيل : يەكێكە لە ڕووبارەكانى بەهەشت ، بنچينەو بنەڕەتى دەگەڕێتەوە بۆ چياكانى ( القمر )ى ئەوپەڕى وەڵاتى ( الحبشة ) بەهۆى ئەو بارانانەوە كە لەوێدا كۆدەبێتەوەو ، لافاوگەلێكى يارمەتيدەر هەندێكيان بەهەندێكى تر ڕوودەدات ، تاوەكو خواى تعالى دەينێرێت بۆ زەويەكى ووشكانى كە هيچ ڕووەكێكى تێدا نى يەو ، بەهۆى ئەو ئاوەشەوە كشتوكاڵ دەڕوێت و ، ئاژەڵ و ئادەميزاديش لێى دەخۆنەوە ٠

لەبەر ئەوەى ئەو زەويەى ئاوى ڕووبارى نيلى بەسەردا تێدەپەڕێت زۆر ڕەقەو ، ئەگەر بارانى ئاساى بەسەردا ببارێت تێر ئاو ناخواتەوەو ، بۆ كشتوكاڵكردن ئامادە نابێت ، وە ئەگەر سەرو ئاستى ئاسايى ببارێت ، زيان بە ماڵ و دانيشتوان و ماڵات دەگەيەنێت و ، ژيان و گوزەران و بەرژەوەنديەكان پەك دەخات ، بۆيە خواى تعالى ئەو بارانەى بەڕووبارێكى گەوردا بۆ ئەم زەويە ناردووە ، هەروەها خواى تعالى ئاوى نيل لە كاتانێكى دياريكراودا زياد دەكات ، بەو ئەندازەيەى كە بۆ ئاودانى ئەو وەڵاتە بشێت و بەسيشى بێت ، ئينجا پاش ئاودانى وەڵات بەگشتى ، خواى تعالى مۆڵەت بە كەمبونەوەو دابەزينى ئاوەكە دەدات ، بۆ تەواوكردنى بەرژەوەندى ، تاوەكو خەڵكى توانای وەبەرهێنانى كشتوكاڵەكەيان هەبێ ٠ ئەو دە خاڵەى ئاوى باشى پێ دەناسرێتەوەو پێشتر ئاماژەى پێدرا لە ئاوى نيلدا كۆبۆتەوە ، ئاوى نيل ناسكترين و سووكترين و خۆشترين و شيرينترين ئاوە ٠

ماء البحر ، ئاوى دەريا : ثبت في الصحيح عن النبيِّ ﷺأنه قال في البحر: (( هو الطَّهور ماؤُوهُ الحِلُّ مَيْتَتُه ))(٦٣١)-

واته : پێغەمبەرى خوا ﷺ سەبارەت بەئاوى دەريا فەرموويەتى : (( ئاوى دەريا پاكەرەوەيەو مردووكانى نێويشى حەڵاڵە )) ٠

---

٦٣١ ـــ حسن صحيح : أخرجه أحمد في مسنده ( ٣ / ٣٧٣ ) ، وابن ماجة ( ٣٨٨ ) ، وابن ماجة ( ١١٢ ) كلهم من طريق عبيدالله بن مقسم عن جابر فذكره ٠

خـوای تعـالی ئـاوی دەریـای کـردووە بـە خوێـدارێکی سـوێری تـاڵی نـەخوراوە ، لەبـەر بەرژەوەندی هـەموو ئەوانـەی لەسـەر زەویدا دەژیـن " لـە مرۆڤـ و ئاژەڵـان ، چونکە ئـاوێکی بەردەوامی وەستاوەو ، گیانلەبەرانێکی زۆری تێدا دەژی ، هەموو ئەو گیانلەبەرانە لە نێو ئـەو ئاوەدا دەمرن و نانێژرێن ، بۆیە ئەگەر دەریاکە شیرین بوایـە " بـەدڵنیایی ئاوەکە دەگـەنی ، بـەهۆی زۆری مانـەوەی ئاوەکـەو ، مردنـی ئاژەڵـەکانیی لـە نێـو خۆیـدا ، پاشـان هـەوای چواردەوری جیهانیش ئەوەی وەردگرت و ، دەگەنی و بۆنی دەکردو ، جیهانیش خـراپ دەبـوو ، بۆیە خوای تعالی بەدانایی خۆی کردویەتی بەخوێدان ، کە ئەگـەر هـەموو لاشـەی بـۆنکردوی جیهـان و مردوانـی تـێ فرێـدەیت ، تۆسـقاڵێك گـۆڕانی بەسـەردا نایـەت ، بەدرێـژای مانـەوەی نەگۆڕاوە ، لەو کاتەوەی کە خولقێنراوەو ، تا ئەو کاتەش کە خوای تعالی جیهـان دەپێچێتەوە ، ئەمە هۆکاری غائی پەیوەندیدارە بەسروشتەوە کـە واپێویسـت دەکـات سـوێر بێـت ٠ بـەڵام هۆکاری بکەری ، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی زەویەکەی شۆرەکاتە.

پاشان ٠ خۆشتن بەئاوەکەی بۆ گـەلێك لـە نەخۆشـیەکانی ڕووی پێسـت بەسـوودە ، بـەڵام خواردنەوەی بۆ ناوەوەو دەرەوەی جەسـتە زیانبەخشـە ، سـك ڕەوان دەکاتـەوە ، ئاڵوشـی و خوروی و گەڕی و ، ئاوسان و تینویەتی دروست دەکات ، هەرکەس ناچاری خواردنـەوەی بـوو ، ئەوا چەند ڕێگەیەکی چارەسەرکردنی هەیە کە زیانەکانی دوردەخاتەوە.

لەو ڕێگایانە : ئاوی دەریا دەکرێتـە نێـو مەنجـەڵێك و ، چـەند قامیشـێکی دەخرێتـە سـەرو پارچەیەکی خوری تازەی پاکی شیکراوەی بژیشی دەخرێتە سەرو ، لە ژێر مەنجەڵەکـەدا ئـاگر دادەگیرسێنرێت ، تا هەڵمی ئاو نێو مەنجەڵەکە بەرزدەبێتـەوەو لـە خوریەکـەدا کۆدەبێتـەوە ، ئینجا کە هـەڵمێکی زۆر لـە خوریەکـەدا کۆبـۆوە دەیگوشـێت و ، بـەردەوام ئـەو کـارە دوبـارە دەکاتـەوە " تـا ئـەو ئـاوەی بـۆ کۆدەبێتـەوە کـە دیـەوێ ، بـەم ڕێگەیـە هـەڵمی سـازگار لـە خوریەکەدا کۆدەبێتەوەو ، سوێراوەکەش لە مەنجەڵەکەدا بەجێ دەمێنێت ٠

ڕێگایەکی دیکە : چاڵێکی فراوان لە کەناری دەریاکە هەڵبکەنرێت ، بۆ ئەوەی ئاوی دەریاکەی تێپاڵورێت ، پاشان بەتەنیشتیەوە یەکێکی تر هەڵبکەنرێت ئاوی چاڵی یەکەمی تێپاڵیورێت و ، هەمیسان یەکێکی تر هەڵبکەنرێت ئاوی چاڵی دووەمی تێپاڵورێت و بەجۆرە تا ئاوەکە بەتەواوی سازگارو خۆش دەبێ٠ ئەگەر مرۆڤ ناچار بوو ئاوی لێل بخواتەوە ، ئەوا پێش خواردنەوە ئاوەکە بەم ڕێگایانە چارەسەر دەکرێ :

١. ناوکە قەیسی بخرێتە نێو ئاوکە ٠
٢. پارچەیەك لە داری ساج ٠
٣. پشکۆیەکی گڕگرتوو بخرێتە نێو ئاوەکە تاوەکو تیادا دەکوژێتەوە ٠
٤. قوڕی ( أرْمَنِياً ) ٠
٥. ئاردی سفری گەنم ٠

لە هەموو ئەم بارانەدا لێڵاوی ئاوەکە دەنیشێت ٠

مسْكٌ : ثبت في صحيح مسلم ، عن أبي سعيد الخُدريُّ _ رضي الله عنه _ ، عن النبيِّ ﷺ أنه قال : (( أطيبُ الطِّيبِ المِسْكُ ))( ٦٣٢ ) ٠

: لە ( أبي سعيد الخُدريُّ )وە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( بۆنخۆشترینی بۆنەکان میسکە )) ٠

وفي الصحيحين عن عائشة _ رضي الله عنها _ : كنتُ أُطيِّبُ النبيَّ ﷺ قبلَ أن يَحْرِمَ ويومَ النَّحْرِ قبل أن يطوفَ بالبيت بطيبٍ فيه مِسْكٌ( ٦٣٣ ) ٠

٦٣٢ _ صحيح : أخرجه مسلم ( ٢٢٥٢ ) ٠

واته : له خاتوو ( عائشة )ەوه _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوام ﷺ بۆنخۆش دەكرد بەبۆنێك میسكی تێدا بوو پێش ئەوەی ئیحرام ببەستێ و لە ڕۆژی قوربانی سەربڕینیشدا پێش ئەوەی تەوافی دەوری كەعبەی بكردایە ٠

میسك : پادشای هەموو جۆرە بۆنخۆشەكان و ، بەڕێزترین و بۆنخۆشترینیانە ، ئەو بۆنەیە كە وەكو نموونەی باڵا دەهێنرێتەوە ، بۆنی تری پێ دەچوێنرێت و ، ناچوێنرێت بەهیچ بۆنێكی تر ، گردی بەهەشتە ٠

میزاجی گەرم و ووشكە لە دووەمدا ، نەفس شادومان و بەهێز دەكات و ، هەموو ئەندامە ناوەكیەكان بەهێز دەكات " بەخواردنەوەو بۆنكردن ، ئەگەر بخرێتە سەر ئەندامەكانی دەرەوەش بەهێزیان دەكات ، بۆ بەساڵاچوان و ، ئەوانەی سەرمایان بووە ، بەتایبەت لە كاتی زستاندا بەسوودە ، بۆ بوارنەوەو دڵەكوتێ چاكە ، بۆ لاوازی هێز چاكە " چونكە گەرمی غەریزی دەبوژێنێتەوە ، سپێتی چاو ( بياض العين ) لادەبات ، تەڕی وشێكانی ووشك دەكاتەوە ، بای نێوی و هەموو ئەندامەكانی تریش دەكاتە دەرەوە ، كاری ژەهرەكان پوچ دەكاتەوە ، بۆ گەزتنی مار بەسوودەو ، سوودەكانیشی گەلێك زۆرن و ، بەهێزترین دڵخۆشكارەكانە ٠

مَرْزَنْجُوش ([634])، چەویر : سەبارەت بە چەویر فەرموودەیەك هاتووە ( صحيح )یمان بۆ دەرنەكەوتووە : (( عليكم بالمَرْزَنْجُوش ، فإنه جيدٌ لِلخُشام ))([635]) .

---

[633] ـ صحيح : أخرجه مسلم ( ٤ / ١٢ ) عن عائشة ـ رضي الله عنها ـ قالت : كأني أنظر الى وبيص المسك في مفرق رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ وهو محرم . ولم أجده باللفظ المذكور في الصحيحين .

[634] ـ مرزنجوش : ڕووەكێكی تەمەنداری درێژی عەتر ئامێزە ، نزیكەی ( ٣٠ ـ ٦٠ )سم بەرزدەبێتەوە ، ڕەنگە گوڵەكانی سورێكی كاڵن و ، تۆوەكەی لە تۆوی ڕەیحان دەچێت ، بەزۆری گوڵەكانی بەكاردێن ٠ بڕوانە سایتی : essam581.blogs ، وەرگێڕ ٠

واته : (( چەویر بەکاربێنن ، چونکە بۆ هەڵامەت چاکە )) ٠ میزاجی چەویر گەرمە لە سێیەمداو ووشکە لە دووەمدا ، بۆنکردنی بۆ سەرئێشەی ساردو ، ئەوەی بەهۆی بەڵغەم و ، ( السوداء )و ، هەڵامەت و ، بای چرەوە ڕوودەدات بەسوودە ، کونیلە داخراوەکانی ( السُدد )سەرو هەردوو کونی لووتدا دەکاتەوە ، زۆربەی هەڵئاوسانە ساردەکان شیی دەکاتەوە ، بۆیە بۆ زۆربەی ئاوسان و ئازارە ساردە تەڕوشێدارەکان بەسوودە ، ئەگەر هەڵبگیرێت ، خوێنی بێنوێژی زیاد دەکات و ، یارمەتیدەر دەبێ بۆ سك پڕی ، ئەگەر گەڵا ووشکەکەی بکوترێت و ، بخرێتە نێو پارچە پەڕۆیەکی گەرمکراوەوە ، ئاسەواری خوێنی کاتی ژێر چاو لادەبات ، ئەگەر لە گەڵ سرکەدا بەستەرێکی ( الضماد ) لێ دروست بکرێت ، بۆ پێوەدانی دووپشك بەسوودە ، ڕۆنەکەی بۆ ئازاری پشت و هەردوو ئەژنۆ بەسوودە ، ماندووبوون ناهێڵێت ، هەرکەس بەبەردەوامی بۆنی بکات ئاو دانابەزێتە چاوەکانی ، ئەگەر ئاوەکەی لە گەڵ ڕۆنی بادەمی تاڵدا ( دهن اللوز المر ) بتکێنرێتە هەردوو لووت ، کونیلە داخراوەکانی ( السُدد ) لووت دەکاتەوە ، بەسوودیش دەبێ بۆ ئەو بایەی تووشی بووەو ، تووشی سەریش بووە ٠

ملحٌ ، خوێ : روى ابن ماجة في سننه : من حديث أنس يرفعه : (( سَيِّدُ إدامِكُم المِلحُ ))([636]) واتە : ( أنس ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ لە فەرموودەیەکدا کە بەرزی دەکاتەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( سەرگەورەی پێخۆرتان خوێ یە )) ٠ سەرگەورەش ئەوەیە : کە بەرامبەر چاك دەکات و ، سەرەوکاری دەکات ، بێ گومان زۆربەی پێخۆرەکانیش لەڕاستیدا بەخوێ چاك دەکرێت ٠

---

[635] _ ضعيف : أورده الألباني في ضعيف الجامع ( ٣٧٧٧ ) وضعفه ، ونسبه السيوطي الى ابن السني وأبي نعيم في الطب عن أنس ٠

[636] _ إسناده ضعيف : أخرجه ابن ماجة ( ٢٣١٥ ) ، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع ( ٣٢١٥ ) ٠

وفي مسند البزّار مرفوعاً : (( سَيُوشِكُ أن تكونوا في النَّاس مِثْلَ المِلْحِ في الطَّعَام ، ولا يَصلُحُ الطَّعَامُ إلا بالمِلْحِ ))([٦٣٧]) .

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( نزیکە ئێوە لە نێو خەڵکیدا وەکو خوێتان لێ بێت لە نێو چێشتدا ، چێشتیش چاك نابێت مەگەر بەخوێ )) ٠

پێشەوا ( البغويُّ ) لە تەفسیرەکەیدا دەگێڕێتەوە : عن عبدالله بن عمر _ رضي الله عنهما _ مرفوعاً : إنَّ اللهَ أنزلَ أربعَ بركاتٍ من السَّماء إلى الأرض : الحديد ، والنار ، والماء ، والملح٠ والموقوف أشبه ٠

واته : ( عبدالله )ی کوڕی ( عمر ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ لە فەرموودەیەکدا کە بە بەرزی دەکاتەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمێت : خوای تعالی چوار فرە بەرەکەتی لە ئاسمانەوە دابەزاندە سەر زەمین : ئاسن ، ئاگر ، ئاو ، خوێ ٠ بەڵام فەرموودەکە لە ( موقوف ) دەچێت ٠

خوێ جەستەو خۆراکی خەڵك چاك دەکات ، هەموو شتێك چاك دەکات ئەگەر تێکەڵی بێت تەنانەت زێڕو زیویش ، چونکە هێزێکی تێدایە زەردیەکی زیاتر بەزێڕو ، سپێتیەکی زیاتر بەزیو دەبەخشێت ، هێزی پاکردنەوەو لابردن و شیی کردنەوەی تێدایە ، تەڕی و شێی چڕ ناهێڵێت و ، ووشکی دەکاتەوە ، جەستە بەهێز دەکات و ، قەدەغەی بۆگەنبوون و خراپبوونی دەکات ، بۆ گەڕی کێماوی بەسوودە ، ئەگەر چاوی پێ بڕێژرێت ، گۆشتی زیاد لە چاودا هەڵدەکەنێت ، نەخۆشی ( الظَّفَرَة )([٦٣٨]) هەڵدەکەنێت ٠ خوێی ( الأندراني )([٦٣٩]) چاکتر ئەو کارانە ئەنجام

---

[٦٣٧] _ إسناده صحيح : صححه الألباني في صحيح الجامع ( ١٣٥٢ ) ٠

[٦٣٨] _ الظفرة : ئەم نەخۆشیە بریتیە لە هەڵتۆقاوێکی مێخی یاخود سێگۆشەیی کە لە ( الملتحمة )و لە نزیکی سێگۆشەی چاو لە شوێنی بەیەکگەشتنی هەردوو پێڵاوەکانی چاودا دێتەدەرێ ٠ بڕوانە : www.islamol.net ، وەرگێڕ ٠

دەدات ، قەدەغەی بڵاوبونەوەی برینە پیسەکان دەکات ، پیسی دێنێتە خوارەوە ، ئەگەر بە سەر سکی کەسانی تووشبوو بەنەخۆشی ئاوبەنگدا بهێنرێت ، سودیان پێ دەگەیەنێت ، ددانەکان پاك دەکاتەوە ، بۆگەنیان لێ دوردەخاتەوە ، پووك توندو بەهێز دەکات ، سوودەکانی گەلێك زۆرن .

## پیتی النون ( ن ) :

نَخْلٌ ، دارەخورما : زیاتر لە یەك شوێنی قورئاندا باسکراوە ، وفي الصحيحين : عن ابن عمر _ رضي الله عنهما _ ، قال : بيْنا نحن عند رسول الله ﷺ، إذ أُتِيَ بجُمَّارِ نخلة ، فقال النبيُّ ﷺ : (( إنَّ مِن الشَّجَرِ شَجَرَةً مَثَلُها مَثَلُ الرَّجُلِ المسلِمِ لا يَسقُطُ وَرَقُها ، أخْبِرُوني ماهي ؟ )) فوقع الناسُ في شجر البوادي ، فوقع في نفسي أنها النخلة ، فأردتُ أن أقول : هي النخلة ، ثم نظرتُ فإذا أنا أصغرُ القومِ سناً ، فسكتُّ ، فقال رسول الله ﷺ : (( هي النَّخْلَةُ )) ، فذكرتُ ذلك لعمرَ ، فقال : لأن تكونَ قُلْتَهَا أحبُّ إليَّ من كذا وكذا([٦٤٠]).

واتە : لە ( ابن عمر )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : لە کاتێکدا ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دانیشتبوین ، ناوکرۆکی دارەخورمایەکیان بۆ هێنا ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : (( بەڕاستی لە درەختەکاندا درەختێك هەیە نموونەی وەکو نموونەی پیاوی موسڵمانەو گەڵاکانی ناوەرێت ، پێم ڕاگەیەنن چی یە ؟ )) ئەوەبوو خەڵکەکە دەستیانکرد بەناوهێنانی درەختی بیابانەکان ، منیش کەوتە دڵمەوە کە بەڕاستی دارەخورمایە ، بۆیە ویستم بڵێم : درەختەکە دارەخورمایە ، پاشان تەماشایەکم کردو بۆم دەرکەوت من بچوکترینی خەڵکەکەم لە تەمەندا ، بۆیە بێدەنگ بووم ، ئەوەبوو پێغەمبەری

---

٦٣٩ _ ملح الأندراني : جۆرە خوێ یەکە به شێوەیەکی سروشتی لە هەندێ کانگاکانی سەر زەوێدا هەیە ، وەکو تاوێری خۆیی کریستاڵی ، بڕوانە : www.khayma.com ، وەرگێڕ .

٦٤٠ _ متفق عليه : أخرجه البخاري ( ٩ / ٤٩٥ ) ، ومسلم ( ٢٨١١ ) .

خوا ﷺ فەرمووی : (( درەختەکە دارەخورمایە )) ، منیش ئەوەم بۆ ( عمر ) باسکرد ، ئەویش فەرمووی : ئەگەر باستکردایە لە ئاوەهاو ئاوەها پێم خۆشتر بوو ٠

سوودی فەرموودەکە لەوەدایە کە :

١. زانا مەسەلەکەکان دەخاتە بەر دیدی هاوەڵانی بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو زانستەی پێیانە
٢. شیاوێتی هێنانەوەی قسەی نەستەق و پەندو چواندنی تێدایە ٠
٣. بەدەرخستنی شەرمی هاوەڵان بەرامبەر بە سەرگەورەکانیان و ڕێزگرتنیان و وازهێنان لە قسەکردن لە پێش دەستیاندا ٠
٤. شادومانبوونی پیاو کاتێ کوڕەکەی دەپێکێت و ، بۆ ڕاستی سەردەکەوێت ٠
٥. ئاسایە کوڕ لە کاتی ئامادەبونی بابیدا وەڵام بداتەوە بەوەی دەیزانێت ، با بابیش وەڵامەکە نەزانێت ، ئەوەش هیچ بێ ڕەوشتیەك نانوێنێت بەرامبەر بە باب ٠
٦. چواندنی موسڵمانی تێدایە بەدارەخورما لەبەر زۆری خێری و ، بەردەوامی سێبەری و ، خۆشی بەروبومی و ، هەبوونی بەبەردەوامی ٠

بەری دارەخورما بەتەڕی و ووشکی ، پێنەگەشتوو و پێگەشتووی دەخورێت ، خۆراکە ، دەرمانە ، بژێویە ، حەلوایە ، خواردنەوەیە ، میوەیە ، قەدی دارەکەشی بۆ بیناسازی و ئامیرو دەفر بەکاردێت ، گەڵاو پەلکەکەشی حەسیرو ، زەمبیلەو ، دەفرو ، باوەشێنی و ، هیتریشی لێ دروست دەکرێت ، ڕێشاڵەکانیشی دەکرێ بە حەبل و ناوئاخنی پشتی و لێفەو هیتر ، ناوکەکەشی کە کۆتای بەشەکانێتی دەکرێ بە ئالفی ووشتر ، هەروەها بەشداریش دەبێ لە دەرمان و چاو ڕەشتندا ٠

پاشان جوانی بەروبومی ، ڕووەکی ، شێوەی ، دیمەنی ، ، چاکی ڕێکخستنی بەرەکەی ، دروستکردنی ، گەشانەوەی ، ، شادومانبونی دڵ لە کاتی بینینیدا ، کار لە نەفسی مرۆڤ دەکەن ٠

بەبینینی دروستکارو خولْقێنەر ، دروستکردنە سەرسوڕمێنەکەی ، توانای تەواوی خوای تعالى ، تەواوی حیکمەت و دانایی پەروەردگار بیری مرۆڤ دەخاتەوە ٠

بۆیە هیچ شتێکی تر بەدیناکرێت لە دارەخورما بچێت جگە لە موسڵمانی باوەڕدار ، چونکە هەمووی خەیرە ، هەمووشی سوودە لەدەرەوەو ناوەوە ٠

دارەخورما ئەو درەختەیە کە قەدەکەی سۆزی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە جۆش و بیری کرد " کاتێ ڕۆشت و لێی جیابۆوە ، چونکە تامەزرۆی نزیکی و گوێبیستی گوفتارەکانی بوو ، ئەو درەختەیە کە ( مریم )ی لە ژێردا دابەزی کاتێ ( عیسى )ی بوو _ علیە السلام _ ٠

لە فەرموودەیەکدا کە ( إسناد )ەکەی جێگەی تێڕوانینە هاتووە : (( أكرموا عَمَّتَكُم النخلَةَ ، فإنها خُلِقَتْ من الطِّين الذي خُلق منه آدم ))([٦٤١]) واتە : (( ڕێز لە پورە دارەخورماتان بگرن ، چونکە دروست کراوە لەو قوڕەی ئادەمی لێ دروست کراوە )) ٠

خەڵکیش بەدوو گوفتار جیاوازبوونە سەبارەت بەپێشخستن و پەسەندی بوونی بەسەر درەختی تردا یاخود بەپێچەوانەوە ، خوای تعالى لە قورئانی پیرۆزدا لە چەندین جێگەدا بەیەکەوە جووتی کردوون و باسی کردوون ، ئای کە هەریەکیان لە هاوەڵەکەیەوە نزیکە ، ئەگەرچی هەریەکیان لە جێگەی فرامانڕەوای و سەوزبونی خۆیدایەو ، ئەو خاکەشی بۆ چاکترو بەسوودترە کە گونجاوێتی ٠

نرجس ، نێرگز : فەرموودەیەکی لەبارەوە هاتووە ( صحیح ) نی یە : (( عليكم بِشَمِّ النَّرجِس فإنَّ في القَلْبِ حَبَّةَ الجنونِ والجُذامِ والبَرَصِ ، لا يقطعُها إلا شمُّ النَّرجِسَ )) واتە : ((

[٦٤١] _ موضوع : أورده الألباني في ضعيف الجامع ( ١١٣٦ ) وقال : موضوع ، ونسبه السيوطي الى أبي يعلى وابن أبي حاتم والعقيلي في الضعفاء ، وابن عدي في الكامل ، وابن السني ، وأبي نعيم في الطب عن علي ، وانظر الضعيفة ( ٣ ) .

بۆنی نێرگز بکەن چونکە دڵ تۆوێکی شێتی و گوڵی و بەڵەکی تێدایە ، بەدەر لە بۆنکردنی نێرگز هیچ شتێکی تر نایبڕێت )) .

نێرگز گەرم و ووشکە لە دووەمدا ، بنەڕەتەکەی برینە بەقوڵاچووەکان بۆ دەمار سارێژ دەکاتەوە ، هێزێکی شتنێتی ، پاکاریی ، ڕاکێشەری هەیە ، ئەگەر بکوڵێندرێت و ئاوەکەی بخورێتەوە ، یا بە کوڵاوی بخورێت ، ڕشانەوە دەوروژێنێت و ، تەڕی و شێداری لە بنی گەدەوە ڕادەکێشێت ، ئەگەر لە گەڵ ( الكِرْسنَّة )([٦٤٢])هەنگوێندا بکوڵێندرێت ، پیسی برینەکان پاك دەکاتەوەو ، ئەو دوومەڵانەش بە ئاستەم دەتەقێنێت ، گوڵەکەی مامناوەندە لە گەرمیدا ، ناسکەو بۆ هەڵامەتی سارد بەسوودە ، شیی کردنەوەیەکی بەهێزی تێدایە ، کونیلە داخراوەکانی ( السُدد ) مێشك و کونی لووت دەکاتەوە ، بۆ سەرئێشەی تەڕو ( السَّوداوي ) بەسوودە ، سەری گەرم دەئێشێنێت ، هەرکەس بەبەردەوامی لە زستاندا بۆنی بکات لە هاویندا تووشی ( البرسام ) نابێ ، بەسودە بۆ ئازارەکانی سەر کە بەهۆی بەڵغەم و ( المرة السوداء ) دروست دەبێ ، بۆندارەو دڵ و مێشك بەهێز دەکات و ، بۆ زۆرێك لە نەخۆشیەکانیان بەسوودە ، دانەری کتێبی ( التيسير ) دەڵێت : بۆنکردنی ڤێ و پەرکەمی منداڵان لادەبات .

<u>نُورَةٌ</u> ، موو لابەر : روى ابن ماجة : من حديث أُمِّ سلمة _ رضي الله عنها _ ، أنَّ النبيَّ ﷺ كان إذا اطّلى بدأ بعورتِه ، فطَلَاها بالنُّورَة ، وسائِرَ جسدهِ أهلُه([٦٤٣]).

واته : لە ( أُمِّ سلمة )وە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر تێهەڵسوونی بکردایە لە عەورەتیەوە دەستی پێدەکردو ، لە موو لابەری هەڵدەسوو ، خێزانەکانیشی تێکڕای تری جەستیان بۆ دەکرد.

---

[٦٤٢] _ الكِرْسنَّة : ڕووەکێکی یەك ساڵەی بچوکەو ، تا ڕادەیەك لە ڕووەکی نیسك دەچێت ، قەدەێکی بتەوی نی یەو ، نزێکەی ( ٣٠ _ ٤٠ )سم لە زەمین بەرز دەبێتەوە ، بڕوانە : www.snbl.com ، وەرگێڕ .

[٦٤٣] _ ضعيف : أخرجه ابن ماجة ( ٣٧٥١ ) بإسناده عن حبيب بن أبي ثابت عن أم سلمة فذكرته .

**بنەڕەتی مادەی موو لابەر : قسلێ دووبەش ، زرنیخ بەشێك ، تێکەڵ بەئاو دەکران ، لەبەر هەتاو یاخود گەرماودا بەجێدەهێڵرا بەئەندازەی پێگەشتنی و ، تەواو شین بوونەوەی · پاشان لە جەستیان هەڵدەسوو ، سەعاتێکیش دادەنیشتن تا ئەوەندەی کاری خۆی دەکردو ، ئاویان لێ نەدەدا ، پاشان دەشۆردراو ، جێگەکەشی لە خەنە هەڵدەسوێنرا بۆ ئەوەی شوێنەواری گەرمیەکەی نەمێنێت ·**

**نَبقُ ، کونار : پێشەوا ( أبو نعيم ) لە کتێبی ( الطب النبوي )دا لە فەرموودەیەکدا کە بەرزی دەکاتەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺدەفەرمێت : کاتێ ئادەم دەبەزێنرایە سەر زەمین بەری یەکەم شتێکی خواردبێت کونار بوو ·**

**پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکدا باسی کوناری کردووە : (( أنه رأى سِدْرَةَ المُنتهى ليلةَ أُسْرِيَ به ، وإذا نَبِقُها مِثْلُ قِلالِ هَجَر ))([٦٤٤]) واتە : (( پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەو ڕەویەکەیدا درەختی ( سِدْرَةَ المُنتهی )ی بینی و ، تەماشای کرد بەرەکەی بەئەندازەی مەرکانەو کوپە گەورەگانی دێی ( هَجَر )ی نزیك بەشاری مەدینە بوو )) ·**

**کونار : بەری درەختی کونارە سروشت ڕادەگرێت و ، بۆ نەهێشتنی ڕەوانبوون بەسوودە ، گەدە خۆشدەکات ، ( الصفراء ) دادەمرکێنێتەوە ، خۆراك بەجەستە دەبەخشێت ، ئارەزووی خواردن دەکاتەوە ، بەڵغەم دروست دەکات ، درەنگ هەرسە ، ئاردەکەی هەناو بەهێز دەکات ، میزاجە ( الصفراوية )کان چاك دەکاتەوە ، بەهەنگوێن زیانەکانی دووردەخرێتەوە · جیاوازی دروست بووە سەبارەت بەوەی ئایا تەڕوشێدارە**

---

[٦٤٤] _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٤ / ١٣٣ ، ١٨٥ ، ١٩٩ ) ، ( ٥ / ٦٦ ) ، ومسلم ( ١ / ١٠٣ ، ١٠٤ ) كلاهما من طريق أنس بن مالك عن مالك بن صعصعة فذكره في حديث طويل·

یـاخود ووشـکه ؟ بـەدوو گوفتـار ٠ راسـترینیان : تـەڕو شـێدارەکەی سـاردو تـەڕەو ، ووشکەکەشی ساردی ووشکە ٠

## پیتی هاء ( ه ) :

هنْـدَبَاء([٦٤٥]) ٠ تالیشـکە : لـە پێغەمبـەری خـواوە ﷺ سـێ فـەرموودە سـەبارەت بـە تالیشکە هاتوون بـەڵام ( صـحیح ) نـین و ، جێگیر نەبوونـە ، بـەڵکو فەرموودەگـەلێکی ( موضوع )ن ٠

یەکەمیان : (( كُلُوا الْهِنْدَبَاءَ وَلَا تَنْفُضُوهُ ، فَإِنَّهُ لَيْسَ يَوْمٌ مِنْ الْأَيَّامِ إِلَّا وَقَطَرَاتٌ مِنْ الْجَنَّةِ تَقْطُرُ عَلَيْهِ )) واتە : (( تالیشکە بخۆن و مەیتەکێنن ، چونکە ڕۆژێك نی یە لە ڕۆژان مەگەر دڵۆپکەلێکی لە بەهەشتەوە دەتکێتە سەر )) ٠

دووەم : (( وَمَنْ أَكَلَ الْهِنْدَبَا وَنَامَ عَلَيْهِ لَمْ يَحِلَّ فِيهِ سُمٌّ وَلَا سِحْرٌ )) واتـە : (( هەرکـەس تالیشکە بخوات و لەسەری بنوێ ئەوا تووشی ژەهرو جادو نابێ )) ٠

سێ یەم : (( مَا مِنْ وَرَقَةٍ مِنْ وَرَقِ الْهِنْدَبَا إِلَّا وَعَلَيْهَا قَطْرَةٌ مِنْ الْجَنَّةِ )) واتـە : (( هـیچ گەڵایەك لە گەڵاکانی تالیشکە نی یە مەگەر دڵۆپێکی بەهەشتی بەسەرەوەیە )) ٠

پاشان ٠ میزاجی تالیشکە دەگۆڕێت و ، بەگوێرەی ورزە جیاوازەکانی ساڵ گۆڕانکـاری بەسەردا دێت ، بۆیە لە زستاندا سـاردو تـەڕە ، لـە هاویـندا گـەرم و ووشـکە ، لـە بـەهارو پایزدا مامناوەندە ، لە زۆربەی باروحاڵەکانیشیدا مـەیلی لای سـاردی و ووشـکی دەکـات ،

[٦٤٥] ــ الهندباء : ڕووکێکی گیایی وەرزیە ، نزیکەی ( ٤٠ )سم بەرز دەبێتەوە ، گەڵاکانی لە گەڵای کاهو دەچێت ، گوڵەکانی زەردن و ، جۆرێکی تریشی هەیە گوڵەکانی شینە ، تۆوەکەی بچوکە ٠ بڕوانە : www.snbl.com ، وەرگێڕ ٠

تاليشكه قەبزكارو ساردكاره ، چاكه بۆ گەده ، ئەگەر لە گەڵ سركەدا بكولێندرێت و بخورێت ، سك ڕادەگرێت بەتايبەت كێويەكەى ، كە چاكتره بۆ گەدەو ، زۆرتريش قەبزكاره ، بەسووديشه بۆ لاوازيەكەى ٠

ئەگەر پێچەرێكى ( الضماد ) لىَ دروست بكرێت ، هەڵئاوسانى كاتى له گەدەدا ناهێلێت و ، بەسووديشە بۆ جومگەزان و ، هەڵئاوسانە گەرمەكانى چاو ، ئەگەر لە گەڵاو بنەڕەتەكەى پێچەرێكى لىَ دروست بكرێت ، بەسوود دەبىَ بۆ پێوەدانى دووپشك ٠ گەدە بەهێز دەكات ، كونيلە داخراوەكانى جگەر دەكاتەوه ، بۆ ئازاره گەرم و ساردەكانى بەسووده ، كونيله داخراوەكانى سپڵ و ڕەگ و هەناو دەكاتەوه ، ڕێڕەوەكانى گورچيله پاك دەكاتەوه ٠

بەسوودترينى بۆ جگەر تاڵترينيانە ، ئاوه گوشراوەكەى بۆ ( اليرقان السدّي ) بەسووده ، بەتايبەت ئەگەر تێكەڵ بەناوى ڕازيانەى تەڕ ( الرازيانج الرطب ) بكرێت ، ئەگەر گەڵاكەى بكوترێت و ، بخرێته سەر هەڵئاوسانە گەرمەكان سارديان دەكاتەوەو شى يان دەكاتەوه ، گەده پاك دەكاتەوه ، گەرمى خوێن و ( الصفراء ) دادەمركێنێتەوه ٠

چاكترينيشى ئەوەيە بەبىَ شتن و تەكاندن بخورێت ، چونكه بەشتن و تەكاندن هێزەكەى نامێنێت ، له گەڵ ئەوەشدا هێزێكى ( ترياق )ى تێدايه كه بۆ هەموو ژەهرەكان بەسووده ٠

ئەگەر چاوى پىَ برێژرێت ، بۆ شەوكوێرى بەسوود دەبىَ ، گەڵاكەى لە ( ترياق )دا بەشداره ، بۆ پێوەدانى دووپشك بەسووده ، بەرگرى زۆربەى ژەهرەكان دەكات ، ئەگەر ئاوەكەى بگوشرێت و ، زەيتى زەيتونى تێكرا ، مرۆڤ لە دەرمانە كوشندەكان ڕزگار

دەكات ، ئەگەر بنەڕەتەكەی بگوشرێت و ، ئاوەكەی بخورێتەوە ، بۆ گەزتنی مارو دووپشك و زەردەواڵە بەسوودە ، شیری بنەڕەتەكەشی سپێیای چاو ناهێڵێت ٠

## پیتی واو ( و ) :

وَرْسٌ ٠ گژوگیای ئەسپەك : پێشەوا ( الترمذي ) لە ( الجامع )ەكەیدا : لە ( زید )ی كوڕی ( أرْقَمَ )ەوە دەگێڕێتەوە كەوا پێغەمبەری خوا ﷺ زەیتی زەیتون و گیای ئەسپەكی وەسف دەكرد بۆ كەسانی تووشبوو بەنەخۆشی ( ذات الجنب ) ، ( قتادة ) دەڵێت : دەكرێ بەدەمیەوەو ، لەو لایەوە دەكرێ بەدەمیەوە كە ئازارەكەی هەیە ٠

وروى ابن ماجة في سننه من حديث زيد بن أرقم أيضاً ، قال : نعتَ رسولَ اللهِ مِن ذَاتِ الجَنْبِ وَرْساً وقُسْطاً وزيتاً يُلَدُّ به([٦٤٦]) .

واته : دیسان لە ( زید )ی كوڕی ( أرقم )ەوە _ ، فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ نەخۆشی ( ذات الجنب ) ئەسپەك و ( القسط )و زەیتی زەیتونی وەسف دەكرد بۆ ئەوەی بكرێت بەدەمیەوە ٠

وصحَّ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ _ رضي الله عنها _ قَالَتْ : كَانَتْ النُّفَسَاءُ تَقْعُدُ بَعْدَ نِفَاسِهَا أَرْبَعِينَ يَوْمًا ، وَكَانَت إحدانا تَطْلِي الوَرْسَ عَلَى وُجْهِهَا الْوَرْسَ مِنْ الْكَلَفِ([٦٤٧]).

---

[٦٤٦] _ ضعيف : أخرجه أحمد ( ٤ / ٣٦٩ ، ٣٧٢ ) ، وابن ماجة ( ٣٤٦٧ ) ، والترمذي ( ٢٠٧٨ ) ، ( ٢٠٧٩ ) ، كلهم من طريق ميمون أبي عبدالله عن زيد بن أرقم فذكره ٠

[٦٤٧] _ حسن صحيح : أخرجه أحمد ( ٦ / ٣٠٠ ، ٣٠٢ ، ٣٠٤ ، ٣٠٩ ) ، والدارمي ( ٩٦٠ ) ، وأبوداود ( ٣١١ ) ، وابن ماجة ( ٦٤٨ ) ، والترمذي ( ١٣٩ ) كلهم من طريق مسة الأزدية عن أم سلمة فذكرته ٠

واته : له ( أُمِّ سلمة )ەوه _ خوای لیّ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : ژنان پاش منداڵبوون چل ڕۆژ دادەنیشتن ، هەر یەکێکیشمان دەم و چاوی بە ئەسپەك چەور دەکرد بەهۆی ئەو پەڵەو سورهەڵگەڕانەی تووشمان دەبوو .

( أبوحنيفة اللُّغويُّ ) دەڵێت : ئەسپەك بە چاندن دەچێنرێت و ، کێوی نی یە ، جگە لـە خاکی عەرەبدا لە هیچ شوێنێکی تر نەم ناسیوەو ، لە خاکی عەرەبیشدا تەنها لـە یەمەندا بینیومە · هێزی لە گەرمی و ووشکێتیدا لە سەرەتای پلـە دوودایـە ، چاکترینیشـی سـورە نەرمەکەیەتی لە نێو دەستدا ، کە کەپەکی کـەمترە ، بەسـوودە بـۆ پەڵـەو ، ئاڵووشـی و ، زیپکـەی ڕووی جەسـتە ئەگـەر تێـی هەڵسـوێنرێت ، هێزێکـی قـەبزکاری هەیـە ، ئەگـەر بخورێتەوە بۆ پەڵـەی سپی ( الوَضَح ) بەسـوودەو ، ئەنـدازەی خواردنەوەشـی بەکێشـی دیرهەمێکە ، میـزاج و سـوودی ئەسـپەك نزیـك بەسـوودی ( القُسْـط البحـريّ )یـە ، ئەگـەر بەڵـەکی و ئاڵوشـی و زیپکـەو هەڵزڵـەپانی تێهەڵسـوێنرێت سـوودیان پـێ دەگەیـەنێت ، پۆشاکی بۆیەکراو بە ئەسپەك هێزی جووتبوون زیاتر دەکات ·

<u>وسْمَةٌ</u> ، ڕووەکی خەنە _ بڕوانە الكتم _ : گەڵای درەختی نیلـە ، پـرچ ڕەش دەکـات ، بەم نزیکانە باسی جیاوازی نێوان زانایمان کرد سەبارەت بە شـیاوێتی پـرچ ڕەش کـردن و ئەوەی دەیکات ·

## <u>پیتی الياء ( ی ) :</u>

<u>يَقْطينٌ</u> ، کولەکە : لە زمانی عەرەبیدا دیسان بە ( الدُّباء ) و ( القرع )یـش ناسـراوە ، ئەگەرچی ووشەی ( اليقطين ) گشتیترە ، چونکە لە ڕووی زمانەوە : هەموو درەختێکە کە لە سەر قەدێك نەوەستێ ، وەکـو کاڵـەك و کالیـارو خـەیار · خـوای تعـالى دەفـەرمێت : ﴿ وَأَنْبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِنْ يَقْطِينٍ ﴾[ الصـافات : ١٤٦ ] واتـە : وە درەختێکی کولەکـەمان

بەسەریدا ڕواند(٦٤٨)٠ ئەگەر گوترا : لە زمانی عەرەبیدا ئەوەی لەسەر قەدێك نەوەستێ بە ( نَجْم ) ناودەبرێت نەك بە ( شجر ) ، چونكە ( شجر ) : بریتیە لەوەی قەدی هەبێ _ زمانەوانان گووتویانە _ ، باشە چۆن لێرەدا خوای تعالى دەفەرمێت ﴿ وَأَنْبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِنْ يَقْطِينٍ ﴾ واتە : ووشەی ( شجرة )ی بەكارهێناوە بۆ كولەكە كەچی خۆی ڕووەكە ٠ وەڵام : لە زمانی عەرەبیدا ئەگەر ووشەی ( شجر ) بەكارهێنرا ، مەبەست بەوانەیە كە قەدیان هەیەو لەسەری دەوەستن ، بەڵام ئەگەر ووشەی ( شجر ) بەسترا بەشتێكەوەو لەگەڵیدا بەكارهات ئەوا پابەندی ئەوە دەبێ ، بۆیە جیاوازی كردن لە نێوان ڕەهاو پابەندكراو لە ناوەكاندا دەروازەیەكی گرنگی بەسوودە بۆ تێگەشتن و ، پلەكانی زمان ٠

( اليقطين )ی باسكراو لە قورئاندا : بریتیە ڕووەكی كولەكەو ، بەرەكەشی بە كولەكە ناو دەبرێت ٠ **وقد** ثبت في الصحيحين : من حديث أنس بن مالك ، أنَّ خياطاً دعا رسولَ الله ﷺ لطعام صنَعه ، قال أنسٌ _ رضي الله عنه _ : فذهبتُ مع رسولِ الله ﷺ، فقرَّب إليه خُبزاً من شعير ، ومرَقاً فيه دُبَّاءٌ وقَديدُ ، قال أنس : فرأيت رسول الله ﷺ يَتَتَبَّعُ الدُّبَّاء من حوالي الصَّحْفَةِ ، فلم أزل أُحِبُّ الدُّباءَ من ذلك اليوم(٦٤٩).

واتە : لە ( أنس )ی كوڕی ( مالك )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : بەرگ دروویەك پێغەمبەری خوای ﷺ بانگ كرد بۆ خواردنێك دروستی كردبوو ، ( أنس ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرمووی : منیش لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ چووم ، ئەوەبوو نانی جۆو ، شلەیەك كە كولەكەو گۆشتی ووشكراوەی تێدا بوو خستە پێش

---

٦٤٨ _ مەلا محمد مەلا صالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ٠

٦٤٩ _ صحيح : أخرجه البخاري ( ٣ / ٧٩ ) ، ( ٧ / ٨٩ ، ١٠١ ، ١٠٢ ) ، ومسلم ( ٦ / ١٢١ ) كلاهما من طريق إسحاق ابن عبدالله بن أبي طلحة عن أنس بن مالك فذكره ٠

دەستی ، ( أنس ) فەرمووی : پێغەمبەری خوام بینی ﷺ بەدوای کولەکەی دەوروبەری لەگەنەکەدا دەگەڕا ، بۆیە منیش لەو ڕۆژەوە بەردەوام حەزم لە کولەکەیە ٠

قال أبوطالوت : دخلتُ على أنس بن مالك _ رضي الله عنه _ وهو يأكل القَرْع ، ويقول : يالكِ من شجرةٍ ما أحبَّك إليَّ لحُبِّ رسول الله ﷺ إيَّاك([٦٥٠])

( أبو طالوت ) دەڵێت : چوومە دیدەنی ( أنس )ی کوڕی ( مالك ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ لەو کاتەدا کولەکەی دەخواردو دەیفەرموو : ئای کە درەختێکی خۆشەویستی بەلامەوە لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشی دەوێ ٠

لە ( الغَيّلانيَّات )دا هاتووە : لە ( هشام )ی کوڕی ( عروة )ەوە ، لە باببیەوە ، لە خاتوو ( عائشة )ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم : ئەی ( عائشة ) ئەگەر مەنجەڵێکت کوڵاند ، کولەکەی زۆر تێبکە ، چونکە دڵی خەمبار بەهێز دەکات ٠

کوولەکە : ساردو تەڕە ، خۆراکێکی کەم بەجەستە دەبەخشێت ، خێرا دێتە خوارەوە ، ئەگەر پێش هەرسکردن خراپ نەبێ ، خەڵتەیەکی ستایشکراوی چاکی لێ دروست دەبێ ، لە خاسیەتەکانی تری ئەوەیە کە خەڵتەیەکی ستایشکراوی چاك بەهاوشێوەی ئەوەی لە گەڵیدایە دروست دەکات ، بۆیە ئەگەر لە گەڵ خەرتەلەدا ( الخردل ) بخورێت ، خەڵتەیەکی توونی لێ دروست دەبێ ، لە گەڵ خوێدا خەڵتەیەکی سوێر ، لە گەڵ قەبزکاردا قەبزکار ، ئەگەر لە گەڵ بەهێدا بخورێت خۆراکێکی چاك بەجەستە دەبەخشێ ٠

---

[٦٥٠] _ ضعيف الإسناد : أخرجه الترمذي ( ١٨٤٩ ) بإسناده عن أبي طالوت فذكره ٠

كولەكە نەرم وناسكەو خۆراكێكی تەڕی بەڵغەمی بەجەستە دەبەخشێ ، بۆ لەش گەرم و تاداران بەسوودەو ، بۆ ئەوانەی تووشی سەرما بوونەو ، ئەوانەش کە بەڵغەمیان بەسەردا زاڵ بووە گونجاو نی یە ، ئاوەکەی تینویەتی دەشکێنێت ، سەرئێشەی گەرم لادەبات ئەگەر بخورێتەوە یا خود سەری پێ بشۆردرێت ، سك ڕەوان دەکاتەوە هەرچۆنێك بەکار بێت ، لەش گەرم وتاداران بەهیچ شتێکی تری وەکو کولەکە چارەسەر ناکرێن و ، هیچ شتێکیش وەکو ئەو خێرا سوود ناگەیەنێت ٠ لە سوودەکانی : ئەگەر هەویری تێهەڵسوێنرێت و ، لە فڕن یاخود لە تەنوردا ببرژێنرێت و ، ئاوەکەی دەرهێنرێت و لە گەڵ هەندێ خواردنەوەی ناسك و خۆشدا بخورێتەوە ، تای گەرم دادەمرکێنێتەوەو ، تینویەتی دەشکێنێت و ، خۆراکێکی چاك بەجەستە دەبەخشێت ، ئەگەر لە گەڵ ( ترنجبین )و([٦٥١]) مورەبای بەهێدا بخورێتەوە ( صفراء )ی پەتی ڕەوان دەکاتەوە ٠

ئەگەر کولەکە بکوڵێندرێت و ، ئاوەکەی لە گەڵ هەندێك لە هەنگوین و ، کەمێك لە ( نطرون )دا بخورێتەوە ، بەڵغەم و ( مِرَّة ) بەیەکەوە دەکاتە دەرەوە ، ئەگەر بکوترێت و پێچەرێکی ( ضماد ) لێ دروست بکرێت و بخرێتە سەر تەپڵی سەر ، بۆ هەڵئاوسانە گەرمەکانی مێشك بەسوود دەبێ ٠

ئەگەر توێکڵەکەی بگوشرێت و ، ئاوەکەی لە گەڵ ڕۆنی گوڵدا ( دهن الورد ) تێکەڵ بکرێت و ، بتکێنرێتە گوێ ، بۆ هەڵئاوسانە گەرمەکان بەسوود دەبێ ، توێکڵەکەی

---

٦٥١ ـ ترنجبين : شەونمێکە لە ئاسمانەوە دادەبەزێ و لە هەنگوین دەچێ ، ووشکەو خۆشەو زیاتر بەسەر درەختی ( الحاج )دا دەبارێت کە لە شام و خۆراسان دەڕوێت ، ئەم درەختە گەڵاکانی سەوزن و گوڵەکانی سورن و بەر ناگرێت ، چاکترینیشی سپیە خوراسانیەکەتی کە مامناوەندە لە گەرمی و ساردیدا ، بەسوودە بۆ تا زۆر گەرمەکان ، سینك شێدار دەکات و ، بۆ لەش گەرم وتاداران بەسوودە ئەگەر بخرێتە نێو ئاوی هەڵوژەو ترێ وە ، بڕوانە : الجامع لمفردات الأدوية والأغذية ، ابن البيطار • وەرگێڕ ٠

بەسوودە بۆ هەڵئاوسانە گەرمەكانى چاو و ، جومگەژانى گەرم ، زۆر بەسوودە بۆ خاوەن میزاجە گەرمەكان و لەش گەرم و تاداران ، هەركات ڕێكەوتى خەڵتەیەكى خراپى نێو گەدەى كرد ، دەگۆڕێت بۆ سروشتى ئەو تێكەڵاوە خراپەو ، خراپ دەبێ و ، لە جەستەدا خەڵتەیەكى خراپ دروست دەكات و ، زیانەكانیشى بە سركە ( المرّيّ ) دوردەخرێتەوە ٠

بەگشتى : كولەكە نەرم وناسكترین خۆراكەكانەو ، لە هەمووشى زیاتر كارتێكراو دەبێ ، لە ( أنس )ەوە _ خواى لێ ڕازى بێت _ دەگێڕنەوە فەرموویەتى : پێغەمبەرى خوا ﷺ بەزۆرى دەیخوارد٠

# چەند بەشێكى جیاواز :

## لە ئامۆژگارى بەسوود دەربارەى چارەسەركردن و چارەسازى :

وام بەلاوە چاك بوو باسكردنى ئەم دەروازەیە بەبەشێكى كورتى زۆر بەسوود لە پارێزو ، ئامۆژگارى گشتى بەسوود كۆتاى پێ بێنم بۆ ئەوەى سوودى كتێبەكە تەواو بێت ٠

بەشێكم لە كتێبى ( المحاذير )ى ( ابن ماسَوَيْه ) بینى بەبێژەى خۆى دەینوسمەوە ، دەڵێت :

هەركەس چل ڕۆژ پیازى خواردو تووشى پەڵەو سورهەڵگەڕان بوو ، با تەنها سەرزەنشتى نەفسى خۆى بكات ، هەركەس خوێنى گرت و ، پاشان شتى سوێرى خواردو تووشى بەڵەكى و گەڕى بوو ، با تەنها سەزەنشتى نەفسى خۆى بكات ٠

هەركەس لە گەدەیدا هێلكەو ماسى كۆكردەوەو ، تووشى ئیفلیجى یاخود دەم خواربوون بوو ، با تەنها سەرزەنشتى نەفسى خۆى بكات ٠

هەرکەس شیرو ( النبیذ )ی لە گەدەیدا کۆکردەوەو ، تووشی بەڵەکی و جومگەژان بوو ، با تەنها سەرزەنشتی نەفسی خۆی بکات ٠

هەرکەس خەونی بینی و ، خۆی نەشت تا لە گەڵ خێزانەکەیدا جووت بوو ، پاشان منداڵێکی شێت یاخود ناتەواوی بوو ، با تەنها سەرزەنشتی نەفسی خۆی بکات ٠

هەرکەس هێلکەی کوڵیوی سارد بۆوەی خوارد ، تا تێر بوو ، پاشان تووشی نەخۆشی تەنگەنەفسی ( ربو ) بوو ، با تەنها سەرزەنشتی نەفسی خۆی بکات ٠

هەرکەس لە گەڵ خێزانەکەیدا جووت بوو و ئارامی نەگرت تاوەکو بەتەواوی خاڵی بێتەوەو ، تووشی بەرد بوو ، با تەنها سەرزەنشتی نەفسی خۆی بکات ٠

هەرکەس بەشەو تەماشای ئاوێنەی کردو ، تووشی دەم خواربوون بوو ، یا تووشی دەردێك بوو ، با تەنها سەرزەنشتی نەفسی خۆی بکات ٠

## بەشێك : سەبارەت بە ئاگاردارکردنەوە
## لە کۆکردنەوەی نێوان هێلکەو ماسی :

( ابن بَخْتَيْشُوع ) دەڵێت : پارێزبکە لەوەی هێلکەو ماسی لە خواردندا کۆبکەیتەوە ، چونکە نەخۆشیەکانی ( القولنج ) و مایەسیری و ددان ئێشە دروست دەکات ٠

بەردەوام خواردنی هێلکە پڵەو سورهەڵگەڕان لە دەم و چاودا دروست دەکات ، خواردنی سوێری و ماسی سوێرو خوێن گرتن پاش خۆشتن بەڵەکی و گەڕی دروست دەکەن ٠

بەردەوام خواردنی گورچیلەی مەڕ میزڵدان پەك دەخات ٠

خۆشتن بەئاوی سارد پاش خواردنی ماسی پاراو و تازە ئیفلیجی دروست دەكات ٠

جووتبوونی ژنی بێنوێژ نەخۆشی گولیی دروست دەكات ٠

جووتبوون بەبێ ئەوەی لە پاشیدا خۆی بشوات بەرد دروست دەكات ٠

دریژی مانەوە لە درەچەدا نەخۆشی قورس دروست دەكات ٠

( أبقراط ) دەڵێت : كەمكردنەوەی زیانبەخش ، لە زۆر بەكارهێنانی شتی بەسوود چاكترە ، هەروەها دەڵێت : تەندروستی خۆتان بەردەوام بكەن بەوازهێنان لە تەمەبەڵی بەرامبەر بە ماندووبوون ، هەروەها بەوازهێنان لە سك پڕكردن لە خواردن و خواردنەوە ٠

كەسانێك لە دانایان گوتویانە : ئەو كەسەی تەندروستی دەوێ ، با خۆراكەكانی چاك بكات ، با لەسەر پاكی و برسێتی بخوات ، لەسەر تینویەتی ئاو بخواتەوە ، با كەم ئاو بخواتەوە ، لە دوای خواردن با ڕاكشێت ، لە دوای خواردنی شێوان با ڕێ بكات ، نەنوێت تا دەچێتە ئاودەست ، با وریابێ پاش تێربوون نەچێتە گەرماوەوە ، وە جارێك لە هاویندا لە دەجاری زستان چاكترە ، خواردنی گۆشتی ووشكراوە بەشەو یارمەتیدرە بۆ نەمان ، جووتبوونی پەكەوتووان تەمەنی زیندووان پیر دەكات و ، جەستەی تەندروستان نەخۆش دەخات ٠

ئەمانەی سەرەوە لە ( علي )ی كوڕی ( أبي طالب )ەوە باسكراوە ، بەڵام ( صحيح ) نی یەو ، لەڕاستیدا هێندێكی گوفتاری ( الحارث )ی كوڕی ( كَلَدَة )ی پزیشكی عەرەب و ، كەسانی دیكەیە ٠

( الحارث ) دەڵێت : هەركەس مانەوەی پێخۆشە _ مانەوەش نی یە _ با زوو خـوارنی نیـوەڕۆ بخـوات ، پەلـەی خـواردنی شـێوان بكـات ، بـا پۆشـاكەكانی سـووك بكـات ، جووتبوونی ژنان كەم بكاتەوە ٠

( الحارث ) دەڵێت : چوار شت جەستە دەڕۆخێنێت : جووتبـوون لـە سـەر زۆرخـۆری ، گەرماوكردن پاش تێربوون ، خواردنی گۆشتی ووشكراوە ، جووتبوونی بەساڵاچوو ٠ كاتێ ( الحارث ) هاتە سەرەمەرگ خەڵك لە چواردەوری كۆبۆونـەوەو ، پێیـان گـووت : فـەرمانی شتێكمان پێ بكە پاش تۆ سوودی لێ ببینین ٠ گـووتی : لـە ژنـان بـەدەر لـە كیـژی لاو و شۆخ و شەنگ مەخوازن ، میوە مەخۆن تـەنها لـە كـاتی پێگەشـتنیدا نـەبێ ، با كەسـتان چارەسەر نەكات هەتاوەكو جەسـتەی توانـای بەرگـەگرتنی نەخۆشیەكەی هەیـە ، هـەموو مانگێك گەدەتان پاك بكەنەوە ، چونكە بەڵغەم دەتوێنێتەوە ، ( المِرَّة ) ناهێڵێـت ، ئەگـەر كەسێكتان خـواردنی خـوارد ، پـاش خواردنەكـەی بـا سـەعاتێك بنـوێ ، ئەگـەر خـورادنی شێوانی خوارد با چل هەنگاو ڕێ بكات ٠

پاشایەك بە پزیشكەكەی گووت : پێدەچێ تۆ بۆ من نـەمێنیت ، وەسـفێكم بـۆ بكـە بـۆ ئەوەی لە تـۆوە وەریگـرم ، پزیشـكەكەش گـووتی : بـەدەر لـە كچـی لاوو شـۆخ و شـەنگ مەخوازە ، بـەدەر لـە گۆشـتی ئـاژەڵی تەمـەن كـەم و پـارو گۆشـتی تـر مـەخۆ ، دەرمـان مەخۆرەوە مەگەر بۆ نەخۆشی ، میوە مەخۆ مەگەر پاش پێگەشتنی ، خۆراك چـاك بجـوو ، ئەگەر بەڕۆژ خۆراكت خوارد هیچی تێدا نی یـە بنـووی ، ئەگـەر بەشـەو خۆراكـت خـوارد مەنوو تا ڕێ دەكەیت ئەگەرچی پەنجا هەنگاویش بێت ، خۆراك مەخۆ تـا برسـیت دەبـێ ، خۆت ناچار مەكە بۆ جووتبوون ، میـز ڕامـەگرە ، لـە گـەرماو وەرگـرە پـێش ئـەوەی لێـت وەرگرێت ، خواردن مەخۆ و گەدەت خۆراكی تێدا بێ ، دوركەوەرەوە لە خـواردنی ئـەوەی ددانەكانت توانای جوواندنی نی یەو ، پاشان گەدەشت توانای هەرسكردنی نـابێ ، هـەموو

هەفتەیەك جارێك خۆت بڕشێنەرەوە بۆ پاككردنـەوەی جەسـتەت ، چـاكترین گەنجینـەی جەستەت خوێنە ، بۆیە لە كـاتی پێویـستیدا نـەبێ دەری مەهێنـە ، بچۆرە گـەرماوەوە ، چونكە شتگەلێك لە چینەكانەوە دەردەهێنێت كە دەرمانەكانی پێ ناگات بۆ دەرهێنانیان.

پێشەوا ( الشافعي ) فەرموویەتی : چوار شت جەستە بەهێز دەكەن : خواردنی گۆشت ، بۆنكرنی بۆنی خۆش ، زۆر خۆشتن بەبێ جووت بوون ، پۆشینی كەتان ٠

چـوار شـت جەسـتە لاواز دەكـەن : زۆر جووتبـوون ، زۆری خـەم و پـەژارە ، زۆری ئاوخواردنەوە بەسكی خاڵی ، زۆر خواردنی شتی ترش ٠

چوار شت چاو بەهێز دەكەن : دانیشـتن بەرامبـەر بـە كەعبـە ، چـاو ڕەشـتن لـە كـاتی نووستندا ، تەماشاكردنی سەوزایی ، پاككردنەوەی شوێنی دانیشتن ٠

چوار شت چاو لاواز دەكەن : تەماشاكردنی پیسی ، لەخاچدراو ، ئەندامی زاوزێـی ژن ، دانیشتن بە پشتێكردنی كەعبە ٠

چوار شت جووتبوون زیاد دەكەن : خواردنی مـەلی بچـووك و چـۆلەكە ، ( الأطریفـل ) ، فستق ، ( الخروب )([٦٥٢])٠

چوار شت ئەقڵ وژیـری زیـاد دەكـەن : وازهێنـان لـە گوفتـاری زیـاد ، سـیواك كـردن ، دانیشتن لە گەڵ پیاوچاكاندا ، دانیشتن لە گەڵ زانایاندا ٠

---

[٦٥٢] ــ الخروب : درەختێكی هەمیشە سەوزەو ، نزیكەی ( ١٥ )متر بەرز دەبێتەوە ، درێژی بەری ئەم درەختە هەندێ جار دەگاتە ( ٣٠ )سم ، بەری ئەم دەرختە كە پێدەگات دەخورێت و ، دەشكرێت بە شەربەت و ، لە هەندێ وەڵاتانیش دەكرێتە ئاردو ، سوودو كەڵكی ئێجگار زۆرە ، بڕوانە : http://www.thapro.net ، وەرگێڕ٠

( أفلاطـون ) دەڵێـت : پێـنج شـت جەسـتە لاواز دەكـەن و لەوانەشـە بكـوژن : دەسـت كـورتی ، جیابوونـەوە لـە خۆشەویسـتان ، ڕق و خـەم وخـەفت خـواردن ، قبوڵنـەكردنی ئامۆژگاری ، پێكەنینی نەفامان بە ئاقڵ وژیران ٠

پزیشكەكەی ( المأمون ) دەڵێت : چەند خەسڵەتێك بەكاربێنەو ، ئەو كەسەی بپارێزێت شایستەی نەخۆش نەكەوتنە جگە لە مردن : خۆراك مەخۆ لە كاتێكدا خۆراكی تر لە گەدەتدا بوو ، دووركەوەرەوە لە خواردنێك ددانەكانت لە جووینیدا ماندوو بێت و ، پاشان گەدەشت بێتوانابێ لە هەرسكردنیدا ، دوركەوەرەوە لە زۆر جووتبوون ، چونكە نورو ڕۆشنایی ژیان دەكوژێنێتەوە ، دوركەوەرەوە لە جووتبوونی بەساڵاچوو ، چونكە مردنی كوتوپڕت تووش دەكات ، دوركەوەرەوە لە خوێن گرتن ( الفصد ) مەگەر لە كاتی پێویستیدا ، لە هاویندا خۆت بڕشێنەرەوە ٠

لە گۆفتارە كورت و مانا زۆربەخشەكانی ( أبقراط ) : هەموو زۆرێك دوشمن و ناحەزی سروشتە ٠

بە ( جالینوس )یان گووت : بۆ نەخۆش ناكەوی ؟ ، گووتی : چونكە نێوان دوو خۆراكی خراپم كۆنەكردۆتەوە ، خۆراكێكم نەخواردووە بەسەر خۆراكێكی تردا ، خۆراكێكم لە گەدەمدا ڕانەگرتووە ئەگەر هەستم كردبێ تووشی زیانم دەكات ٠

چوار شت جەستە نەخۆش دەخەن : زۆر قسەكردن ، زۆر نووستن ، زۆر خواردن ، زۆر جووتبوون ٠

چونكە زۆر قسەكردن : هەڵدەستێ بە كەمكردنەوەی مۆخ و كرۆكی مێشك و لاوازكردنی

زۆر نووستن : دەم و چاو زەرد هەڵدەگەڕێنێت ، دڵ كوێر دەكات ، چاو دەوروژێنێت ، تەمبەڵ دەكات بەرامبەر بەكاركردن ، تەڕوشێداری لە جەستەدا دروست دەكات ٠

زۆر خواردن : دەمی گەدە خراپ دەكات ، جەستە لاواز دەكات ، بای چڕو ، نەخۆشی گران دروست دەكات ٠

زۆر جووتبوون : جەستە دەڕوخێنێت ، هێزەكان لاواز دەكات ، تەڕی و شێی جەستە ووشك دەكاتەوە ، دەمار شلّ دەكاتەوە ، كونیلەی داخراو دروست دەكات و ، زیانەكانی هەموو جەستە دەگرێتەوە ، بەتایبەت بەمێشك لەبەر زۆری ئەو ڕوحە نەفسانیەی لێی شێیی دەكاتەوە ، لاوازكردنەكەی لە لاوازكردنی هەموو دەرهاوێشتەكانی تر زۆرترەو ، لە گەوهەوری ڕوحیش شتێكی زۆر دەكاتە درەوە ٠

چاكترینیشی ئەوەیە ئەگەر شەهەوەت و ئارەزووی ڕاستی مرۆڤ ڕێكەوتی وێنەو شێوەیەكی جوانی لاوی شۆخ و شەنگی حەڵاڵ بكات ، هەروەها میزاجی گەرم و تەڕو شێدار بێت ، ماوەیەك بێت جووتبوونی ئەنجام نەدابێ ، دڵی لە دڵەڕاوكێ و مەشغولبوونی نەفس خاڵی بێت ، زێدەڕۆی تێدا نەكات ٠

پێویستە جووتبوونەكەی لە گەڵ ئەم كارانەدا ئەنجام نەدات ، وەكو سك پڕكردنی زۆر ، برسێتی و سك خاڵی بوون ، دەرهاوێشتن ، وەرزشێكی تەواو ، زۆر گەرمابوون ، سەرمابونێكی زۆر ، بۆیە ئەگەر ئەم دە شتەی تێدا ڕەچاو كرد ، سوودێكی زۆری لێوەردەگرێت ، هەر دانەیەكیش لەوانەی سەرەوە ڕەچاو نەكرا زیانێكی تووش دەبێ بەگوێرەی ڕەچاونەكردنی ئەو شتە ، ئەگەر هەمووشی یاخود زۆربەی ڕەچاونەكرا ، ئەوا تیاچونێكی دەستوبردە ٠

## بەشێك : سەبارەت بەوەی كە پارێزكردنی زۆر وەكو تێكچونە لە نەخۆشیدا :

پارێزكردنی زۆر لە تەندروستیدا ، هاوشێوەی تێكچونە لە نەخۆشیدا ، بەڵام پارێزكردنی مامناوەند بەسوودە٠

( جالینوس ) بەهاوەڵانی خۆی گووت : دووركەونەوە لە سێ شت و ، چوار شت بەكاربێنن ، ئیتر ناچاری پزیشك نابن : دوركەونەوە لە گەردوخۆڵ ، دووكەڵ ، بۆنكردوو ٠ چەورو ، بۆن خۆش و ، حەلواو ، گەرماویش بەكاربێنن ، لە سەرووی تێربونتانەوە مەخۆن ، بە ( الباذروج )و ڕێحانە ددان پاك مەكەنەوە ، بە ئێواران گوێز مەخۆن ، ئەو كەسەی هەڵامەتی هەیە با لەسەر پشتی نەنوێت ، ئەو كەسەی خەمبارە با شتی ترش نەخوات ، ئەو كەسەی خوێنی گرتووە با خێرا ڕێنەكات ، چونكە دەیخاتە مەترسی مردنەوە ، ئەو كەسەی چاو دەیەشێت بەخۆی نەڕشێنێتەوە ، لە هاویندا گۆشتی زۆر مەخۆن ، كەسی تووشبوو بەتاو لەرز با لەبەر هەتاو دانەنیشێت ، دوركەونەوە لە بایجانی كۆنی تۆودار ، ئەو كەسەی بەزستانان پەرداخێك ئاوی گەرم بخواتەوە ، لە نەخۆشی وە بەدور دەبێ ، ئەو كەسەی لە گەرماودا توێكڵی هەنار بەجەستەیدا بهێنێت ، لە گەڕی و ئاڵووشی بەدور دەبێ ، ئەو كەسەی پێنج گوڵی شلێر ( سَوْسِنات ) لە گەڵ ( مصطكي رومي )و ، عودی خاوو ( عود خام ) ، میسكدا بخوات ، بەدرێژای تەمەنی گەدەی لاواز نابێ و خراپیش نابێ ، هەركەس تۆوی كاڵەك لە گەڵ شەكردا بخوات ، بردی نێو گەدەی پاك دەكاتەوەو ، سوتانەوەی میز ناهێڵێت ٠

## بەشێك : سەبارەت بەهەندێ پارێزو ئامۆژگاری پزیشكی :

چوار شت جەستە دەڕۆخێنن : خەم ، دڵگرانی ، برسێت ی ، شەوبێداری ·

چوار شت دڵ شادومان دەكات : تەماشاكردنی سەوزایی ، تەماشاكردنی ئاوێك كە ڕێ دەكات ، خۆشەویست ، بەروبوم ·

چوار شت چاو تاریك دەكات : ڕێكردن بەپێی پەتی ، ڕۆژكردنەوەو ئێواركردن بەڕووی بێزراوو ڕەزەقورس و دوژمن ، زۆر گریان ، زۆر تەماشاكردنی خەتی وورد ·

چوار شت جەستە بەهێز دەكات : پۆشینی پۆشاكی نەرم ، چونە گەرماوی مامناوەندەوە ، خواردنی خۆراكی چەورو شیرین و خۆش ، بۆنكردنی بۆنی خۆش ·

چوار شت دەم و چاو ووشك دەكەن و ، جوانی و گەشاوەیی و ڕێك و پێكی ناهێڵن : درۆ ، بێ ئابڕووی ، زۆر پرسیاركردن بەبێ زانین ، زۆر داوێن پیسی ·

چوار شت سەربەرزی و گەشاوەیی دەم و چاو دروست دەكەن : پیاوەتی ، وەفاداری ، بەخشندەیی ، لەخواترسان ·

چوار شت ڕقین و قین و نەویستراوی دەهێنن : خۆبەزلزانین ، ئێرەیی بردن ، درۆكردن ، فیتنەیی وكاری قسەهێنان و بردن ·

چوار شت ڕۆزی دەهێنن : شەونوێژی ، زۆری ئیستغفارو داوای لێخۆشبوون لە بەرەبەیاندا ، زۆری خێروچاکەداری کردن ، زیکرو یادکردنەوەی خوای تعالى لە سەرەتاو کۆتای ڕۆژدا ٠

چوار شت ڕۆزی قەدەغە دەکەن : بەیانی خەو ، کەمی نوێژکردن ، تەمبەڵی ، خیانەت کردن ٠

چوار شت زیان بەتێگەشتن و ئەقڵ دەگەیەنن : بەردەوام خواردنی شتی ترش و میوە ، نووستنی سەر پشت ، خەم ، خەفەت ٠

چوار شت تێگەشتن زیاد دەکەن : ئارمی و خاڵیبونی دڵ ، کەمی سك پڕکردن لە خواردن و خواردنەوە ، چاکی چارەسازی خۆراك بە شتە خۆش و شیرین و چەورەکان ، کردنە دەرەوەی پاشەڕۆ قورسکارەکانی جەستە ٠

ئەوانەی زیان بە ئەقڵ دەگەیەنن : بەردەوام خواردنی پیاز ، پاقلە ، زەیتون ، بایجان ، زۆر جووتبوون ، تەنیایی ، بیرکردنەوەکان ، سەرخۆشی ، زۆر پێکەنین ، خەم ٠

کەسانێك لە چاودێران گووتویانە : لە سێ کۆڕ بڕام ، هیچ هۆیەکم بۆ ئەوە نەدۆزیەوە بەدەر لەوەی لە یەکێکی ئەو ڕۆژانەدا زۆر بایجانم خواردبوو ، ڕۆژێکیشیان زۆر زەیتونم خواردبوو ، زۆر پاقلەشم خواردبوو لە سێ یەمدا.

## بەشێك : سەبارەت بە نهێنی و ڕاستیگەلێك كە هیچ كەس ئەندازەو ڕێزی نازینێت بەدەر لە كەسانێك كە تێگەشتنێكی چاكیان هەیە :

كۆمەلێكی بەسوودمان لە بەشەكانی پزیشكێتی زانستی و كرداریمان خستەڕوو ، لەوانەیە كەسی بینەر تەنها لەم كتێبەدا نەبێ زۆرێكی دەست نەكەوێت ، نزیكی نێوان ئەوەو شەریعەتیشمان پێ پیشانداى ، وە نیسبەتی پزیشكێتی پزیشكان بە پزیشكێتی پێغەمبەری خوا ﷺ كەمترە لە نیسبەتی پزیشكێتی نازان و بەساڵاچووان بە پزیشكێتی پزیشكان ٠

كارەكە لەسەرووی ئەوەوەیە كە باسمان كرد ، زۆر گەورەتریشە لەوەی وەسفمان كرد ، بەڵام ئەوەی باسمان كردووە ئاگاداركردنەوەیەكە بەكەم بۆ ئەو شتە زۆرانەی لە دواوەیەوە دێت ، ئەو كەسەی خوای تعالى زرنگی و كارامەیی پێنداوە لەسەر وردەكاری ، با ئەو جیاوازیە گەورەیەی كە لە نێوان هێزی پشتگیریكراو بە سروش لە لایەن خوای پەروەردگارەوەو ، ئەو زانستەی بە پێغەمبەرانی بەخشیوەو ، ئەو ئەقڵ و زرنگیەی پێی بەخشیون و لە نێوان هێزی كەسانی ئاسایی دیكەدا بزانێت ٠

پێدەچێ كەسانێك بڵێن : پەیوەندی ڕێنمای و ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، باسكردنی هێزی دەرمان و ، یاساكانی چارەسەرو ، چارەسازیی كاروباری تەندروستی بەم دەروازەیەوە چیە ؟

ئەم گوفتارە كەمتەرخەمی ئەم كەسە دەنوێنێت سەبارەت بە تێگەشتنی ئەوەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتی ، چونكە بەڕاستی ئەمەو دوو ئەوەندەو ئەوەندەو

ئەوەندەش تەنها بەشێکی کەمە لەوەی هێناویەتی و ، ڕێنمای و چاوساغی بۆ کردوەو ، سەلماندویەتی و ڕێی نیشان داوین بۆ پەی پێبردنی ، چاکی تێگەشتن لە خواو پێغەمبەرەکەیەوە ، بەشێکە لەو نیعمەتانەی کە خوای گەورە بەئارەزووی خۆی بەهەندێ کەسی دەبەخشێ ٠

پاشان هەر سێ بنچینەکانی پزیشکیمان لە قورئاندا بۆ خستیتەڕوو ، چۆن نکۆڵیی لەوە دەکەی کە شەریعەتی نێردراو بۆ چاکەکاریی دونیاو ڕۆژی دوای " چۆنیەتی چارەسەری جەستەش لەخۆ بگرێت ، وەکو ئەوەی کە چۆنیەتی چارەسەری دڵانیش لەخۆ دەگرێت ، دڵنیابن شەریعەت ڕێی پاراستنی تەندروستی و ، چۆنیەتی دورخستنەوەی نەخۆشێکانمان پێشان دەدات " بەڕێگەگەلێکی گشتی ، وردەکاریەکەشی بۆ ئەقڵ و ژیریی راست و تەندروست و ، فیترەتی پاکی خەڵك هێشتۆتەوە ، شەریعەت ئەومان بە بەکارهێنانی ڕێگاکانی ( القیاس )و ئاگادارکردنەوەو ئاماژەبۆکردن بۆ دەخاتەڕوو ، وەکو ئەوەی لە زۆر مەسەلەی لقەکانی فیقهدا پیادەی کردووە ، بۆیە لەو کەسانە مەبە کە ئەگەر شتێکیان نەزانی دژایەتی دەکەن ٠

ئەگەر کەسێك خوای تعالی تێگەشتن و دانایی تەواوی لە کتێبی خواو سونەتی پێغەمبەرەکەیدا پێبەخشی ، لە گەڵ تێگەشتنی تەواو لە دەقەکان و پێویستیەکانیاندا ، ئەوا چیتر پێویستی بە گوفتارێکی تری جگە قورئان و سوونەت نابێ و ، دەشتوانێت تێکڕای زانستە ڕاست و دروستەکان لەوانە هەڵهێنجێنێت ٠

تەوەری تێکڕای زانستەکان لە سەر ناسینی خواو فەرمان و خوڵقاندنی وەستاوە ، ئەوەش بە پێغەمبەران سپێردراوە _ صلوات الله وسلامه علیهم _ ، چونکە ئەوان زاناترین

خەڵکی خوای گەورەن بەخواو فەرمان و خوڵقاندن و حیکمەت و دانایی لە بەدیهێنراوان و کاروبارێدا ٠

پزیشکێتی شوێنکەوتوانیان : لە پزیشکێتی کەسانی دیکەی جگە لەوان ڕاسترو بەسوودترە ، وە پزیشکێتی کۆتاو سەرگەورەو پێشەوایان محمد _ صلوات الله وسلامه علیه و علیهم _ : تەواوترین پزیشکێتی و ڕاسترین و بەسوودترینیانە ٠

هیچ کەسیش ئەمە نازانێت تەنها ئەو کەسانە نەبێ کە پزیشکێتی خەڵکانی تر دەزانی و پزیشکێتی پێغەمبەریش دەزانێ و ، پاشان تەماشا دەکات تا بزانێت کامیان سەنگینترە ، ئەوکاتە جیاوازی نێوانیانی بۆ دەردەکەوێت ، شوێنکەواتوانی پێغەمبەر ڕاسترین و تەندروستیترین ئومەتان بوون لە ڕووی ئەقڵ و فیترەتەوە ، زانستیشیان لەهەمووی گەورەترە ، لەهەمووشی لە هەقەوە نزیکترن ، چونکە لە نێو ئومەتاندا چاکترین بەدیهێنراوانی خوای گەورەن ، وەکو چۆن پێغەمبەرەکەشیان چاکترینی پێغەمبەرانە ، ئەو زانستەی پێی بەخشیون و ، ئەو میهرەبانی و دانایەی پێی داوەن هیچ کەسی تر ناتوانێت بگات بە ئاستیان.

وقد روى الإمامُ أحمد في مسنده : من حديث بَهْزُ بْنُ حَكِيمٍ ، عَنْ أَبِيهِ ، عَنْ جَدِّهِ _ رضي الله عنه _ قَالَ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ : (( إِنَّكُمْ تُوَفُّونَ سَبْعِينَ أُمَّةً أَنْتُمْ خَيْرُهَا وَأَكْرَمُهَا عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ))(٦٥٣).

واتە : لە ( بَهْزُ )ی کوڕی ( حَكِيمِ )ەوە ، لە باببیەوە ، لە باپیریەوە _ خوای لێ ڕەزای بێت _ فەرموویەتی : (( ئێوە لە پاش حەفتا ئومەتەوە هاتوون ئێوە لە هەمووی

٦٥٣ _ إسناده حسن : أخرجه أحمد ( ٥ / ٥ ) ، والترمذي ( ٣٠٠١ ) ، وحسنه الألباني في صحيح الجامع ( ٢٣٠١ ) .

خێرترو بەرێزترن بەلای خوای _ عزَّوجلَّ _ەوە )) ٠ لێرەوە شوێنەواری ڕێزی ئەم ئومەتە بەلای خوای گەورەوە لە بوارەکانی زانست و ئەقڵ و ، میهرەبانی و فیترەتەوە دەردەکەوێت ، ئەو ئومەتەیە کە زانست و ئەقڵ و ، کردەوەو پلەی ئومەتانی پێشویان خرایە پێش دەست و ، بەوەش زانست و میهرەبانی و ئەقڵیان زیاد بوو سەرەڕای ئەوەی خوای تعالى پێی بەخشیون.

بۆیە میزاج و ، سروشتی خوێنی ، بوبە بەشیان و ، بەوەش ئەقڵ و ئازایەتی وتێگەشتن و فریاکەوتن و دڵشادی و شادومانیشیان بەسەر عەرەبدا زاڵ بوو ، ( الصفراوي )یش بوبە بەشی جولەکەو ، و بەوەش خەم و خەفەت و دڵتەنگی و سووکی و ڕیسوای بەسەر جولەکەدا زاڵ بوو ، بەڵغەمیش بوبە بەشی گاورەکان و بەوەش تووشی گێلی و ، کەم تێگەشتن کەم زیرەکی بوون ٠

ئەمەش نەهێنی و ڕاستیگەلێکە لە ڕاستیدا تەنها ئەو کەسانە ئەندازەو ڕێزی دەزانن کە تێگەشتنێکی چاك و ، ئەقڵێکی وردو ، زانستێکی زۆری هەیەو ، دەزانی خەڵکی چیانەو لە چیدان ٠ وبالله التوفيق.

**کتێبی ((الطب النبوي )) دانراوی پێشەوای بەناوبانگ (ابن القيم الجوزية ) تەواو بوو**
**بە فەزڵ و پشتیوانی خوای تعالى**

L4
L5
S1
جذور الأعصاب
عرق النسا

عرق النسا جذور المشكلة
العديد من الأعصاب "يشترك" لتشكيل العصب الوركي في الرجل.
المناطق الملونة في الصورة، هي مناطق الإحساس بالألم، عندما يتأثر جذر عصبي.

ڕووەکی السنا www.dahsha.com



( الكمون ) ، سايتى ( سنابل الخير للأعشاب )

ڕووەكى ( الشاهترج ) www.snbl.com .



ar.wikipedia.org ڕووەکی ( الزنجبیل)




ڕەگی ( الزنجبیل ) ئەو بەشەیە کە بەکاردێت



قاميشى ( الذريرة ) سايتى : جريدة الرياض

( غصن المصطكي المثمر ) ar.wikipedia.org/wiki



( فصوص المصطكى المتداولة كبهار ) ar.wikipedia.org/wiki

سىَ بەرى ( أُترُج )



الحُلْبَة http://www.rjeem.com



ڕووەکی ( الفوة ) aber.com٢elm٧http://www.



الباذروج ( ووشەیەکی فارسیەو جۆرێکە لە جۆرەکانی ڕەیحانە ) :
http://www.nazaralqatari.net




دره‌ختى ( البان ) www.pepy.com



درختۆكه‌ى ( الآس )www0khayma.com




به‌رى ( البان ) www.pepy.com





ڕەیحانەی ( الحبق )




درەختی ( الآراك ) کە سیواکی لێ دروست دەکرێت



ماددەى ( الكثيراء ) www.lakii.com




( طلع )ى دارەخورما http://www.kulifi.com/v/t٣٩٨٧٣.htm



رسم علمي تفصيلي لنبتة الصعتر الشائع

.thisisagreatidea.com؛http://sub







( الكباث ) بەری درەختی ( الأراك ) كە سیواكی لێ دروست دەكرێ

http://www.alriyadh.com



بزن مژەکی ( وەڵاتی سعودیا )



بەم شێوەش لێدەنرێت



لە سعودیا بزن مژەك بەم شێوە دەفرۆشرێت



جۆرەکانی ( الصقر ) گۆشتیان حەرامە http://ar.wikipedia.org/wi



( الباز ) گۆشتی حەرامە http://ar.wikipedia.org/wik



( النسر ) گۆشتی حەرامە http://ar.wikipedia.org/wik



( العقعق ) گۆشتی حەرامە http://ar.wikipedia.org/wik




( الحدأة ) فەرمان بە کوشتنی کراوە http://www.hafralbatin.com




بالّندەی ( الصرد ) کوشتنی قەدەغەکراوە www.mishkat.com




( الدَّراج ) http://www.uobabylon.edu.iq

لە وەڵاتی سعودیا بەم شێوە کوللە دەخورێت ، لە شاری ( بورەیدە )ش بازاڕێکی بۆ دانراوە

Foum.te3p.com



ڕووەکی ( الكرسنة ) www.snbl.com

# ناوەڕۆك

پێشـــەوا ( ابـــن القـــيم )..............................................................(9)
بەشێك : سەبارەت بەوەی پزیشكێتی جەستە دوو جۆرە.......................(18)
بەشێك : سەبارەت بەڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خۆ چارەسەركردنداو فەرمان پێكردنی(21)
بەشێك : سەبارەت بەو فەرموودانەی هاتی تیمارکردن دەدات و و بەستنی هۆ بە مایەی هۆوە
...............................................................(25)
بەشێك : بەشێك : سـەبارەت بـە ڕێبـازی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە خۆپـارێزیی بەرامبـەر بـە زۆرخواردن و ، خواردنی زیـاد لـە ئەنـدازەی پێـویست و ئـەو یاسـایەی کـە پێویـستە ڕەچـاو بكرێــت لــە خــواردن و خواردنــەوەدا.........................................(33)
چەند بەشێك : سەبارەت بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆشەكانی بـە دەرمانـە سروشـتیەكان چارەســـــەر دەكـــــرد.....................................................(41)
بەشی یەكـەم : بریتیـە لـە چارەسـەركردن بـە دەرمانـە سروشـتیەكان.................(43)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لـە چارەسـەركردنی( تـا )دا..........(43)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسـەركردنی سكچووندا: ......(55)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێبـازی پێغەمبـەری خـوا ﷺلـە نەخۆشـی چـاوەقوڵەداو ( الطـاعون ) ، چارەسـەركردنی و ، چـوونیەتی خۆپاراسـتن لـەم نەخۆشـیە..........................(62)
بەشێك : پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی چوونە نێـو ئـەو زەویانـەی كردووە كە تـاعونی تێدا بڵاوبۆتەوە یـا دەرچـوون لـەو زەویانـەی كـە تـاعونی تێدا بڵاوبۆتـەوە.......................(70)
بەشــێك : ســەبارەت بــە ڕێبــازی پێغەمبــەری خــوا ﷺ لــە نەخۆشــی ئاوبەنگــداو چارەســـــــــەركردنی.....................................................(75)
بەشێك : سـەبارەت بـە ڕێبـازی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە چارەسـەری بڕین و خوێن بـەربوونی لووتـــــــدا : ...............................................(81)

بەشێك : سەبارەت بەڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بواری چارەسەركردندا بە خواردنەوەی هەنگوێن و هەروەها بە كەڵەشاخ و داخكردن.....................(82)
بەشێك : سەبارەت بە سوودەكانی كەڵەشاخ گرتن.....................(89)
بەشێك : سەبارەت بە جێگەكانی كەڵەشاخ گرتن و كاتەكانی.....................(94)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە كاتەكانی كەڵەشاخ گرتندا.....................(95)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بڕینی ڕەگەكان و داخكردندا....(103)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەركردنی فێدا..........(108)
بەشێك : سەبارەت بەو فێیانەی بەهۆی تێكەڵاوەكانی جەستەوە دروست دەبن......(114)
بەشێك : سەبارەت بەڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەری نەخۆشی دەردەلاقەدا ( عرق النسا ).....................(116)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەركردنی وشكیی خوو وە چۆنیەتی نەرم و نیان كردنەوەی.....................(118)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەركردنی خوروی و ئەوەی ئەسپێ دروست دەكات.....................(123)
بەشێك : سەبارەت بە بواری پزیشكی ئاورێشم.....................(126)
بەشێك:سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺلە چارەسەركردنی نەخۆشی....... (131)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێنمایەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بواری چارەسەركردنی سەرئێشەو نیوەسەر ئێشەدا ( الشقیقە ) .....................(135)
بەشێك : سەبارەت بە هۆكارەكانی سەرئێشەی ( الشقیقة ) .....................(137)
بەشێك : سەبارەت بە چارەسەركردنی سەرئێشەی ( الشقیقة ) .....................(138)
بەشیك : سەبارەت بە خەنەو سوودو خاسیەتەكانی.....................(140)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەركردنی نەخۆشیدا بە وازهێنان

لەوەی ئەو خواردن و خواردنەوانەوە بدرێ بە نەخۆش کە حەزی پێ نی یەو ، ناچاریشی ناکرێـــت بـــە خـــواردنی............................................(142)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەرکردنی نەخۆشی ( العُذرة )چارەسەرکردن بە دەرمان کردنە لـووت..................................(147)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەرکردنی دڵ ئێشە دا ...(150)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوورخستنەوەی زیانی خۆراك و میوەکان و ، چاکردنیان بە جۆرێك زیانیان لابەرێت و ، سوودیان بەهێز بکات.........(157)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پارێزکردندا.................(159)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەرکردنی چاوئێشەدا بە نەرم ونیانی و لە سەرخۆیی و و وازهێنان لە جوڵانەوەو پارێزکردن لەوەی دەبێت بە هۆی وروژانی چاوئێشـــــــەکە.........................................................(165)
بەشێك : سەبارەت بە سڕبوونی گورچیلە کە لە گەڵیدا جەستە ڕەق دەبێت..........(170)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چاکردنی ئەو خۆراکەدا کە مێشی تێدەکەوێت و ڕێنماییەکانی سەبارەت بە دوورخستنەوەی زیانەکانی ژەهرەکان بە دژەکانیــــــان.......................................................(171)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەرکردنی زیپکەدا........(174)
بەشێك : سەبارەت بە چارەسەرکردنی ئاوساو دومەڵەکان بە هەڵدرین و دەرهێنانی کێم و ئاوەکــــــەی.......................................................(175)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خۆراك پێدانی مرۆڤ بە ناسکترین و بەتامترین ئەو خۆراکانەی لە سەری ڕاهاتووە.................................(177)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەرکردنی نەخۆشدا بە خۆشکردنی نەفسیان و بەهێزکردنی دڵیــان...................................(181)
بەشێك : سەبارەت بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چارەسەرکردنی جەستەکاندا بە پێدانی

